ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
ژمارەی بڵاوکراوە:

AWER
Nawandi Awer

# یاخیبوون

بابەت: یادەوەری
نووسینی: میناحیم بیگن
وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: شەفیقی حاجی خدر
تایپ: وەرگێڕ
دیزاینی ناوەوە: کارژین خەلیل هیدایەت مام شێخ
بەرگ: تەیب موعتەسەم
چاپی یەکەم: ٢٠١٦
شوێنی چاپ: چاپخانەی ڕۆژهەڵات/ هەولێر
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ (١٢٠٠٠)
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردنی (٤٥٣)ی ساڵی ٢٠١٦ پێدراوە.

ناوەندی ئاوێر
بۆچاپ و بڵاوکردنەوە
ناونیشان: هەولێر-پشت پاریزگا-بەرانبەر دەرگای قەڵات

ژمارەی موبایل: 07504209495 07504242101

ئیمەیل Nawendi.awer@yahoo.com
فەیس بووک www.facebook.com/nawendiAwer

# ناوەڕۆک

## پاخیبووە ....................................................................................................................

## بۆ ئەم کتێبە؟

ئەم کتێبە دەبێتە چوارەمین وەرگێڕانم دەربارەی گەلی جوولەکە و دەوڵەتی ئیسرائیل. ڕەنگبێ هەبن بپرسن بۆ؟

وەڵامەکەشی لە چیرۆکێک دەچێ.

هەرچەندە کاتی خۆی جوو لە کوردستان هەبوون و لە ساڵەکانی 1951 و 1952 بە زۆر کۆچیان پێکرایە ئیسرائیل. 170.000 کەسیان لەو دوو ساڵەدا لە کوردستان و عێراق کۆچیان بەرەو دەوڵەتە تازە دامەزراوەکەی خۆیان کرد. وەک لە باب و خزمە بە تەمەنەکانم بیست، لەو ژمارەیەدا یازدە ماڵێکیش لە دەڤەرەکەمان (لە گوندی ڕوست) دەژیان. زیاتر بە کارە دەستییەکانیان خەرک بوون. باسی مالمیکیشیان دەکرد، گوایە بەهاران خۆی شێت دەکرد، بەو دەمامکەیەوە باروبووی لە هاودیینەکانی کۆدەکردەوە و بۆ فەلەستینی دەنارد. هەروەها ئەو هەڵمەتە دژ و ئاگرینییەی ڕژێمی بەعس و نەتەوەپەرستانەی عەرەبیشمان لەبیرە، چۆن بە تەمای ئەوەبوون وەک خۆیان دەیانگوت "ئەو ناکەسبەچانە" فڕێ بدەنە نێو دەریا!

دیارە وەک دەرسێکی زمانی ئینگلیزیش لە پۆلی پێنجەم و شەشەمی ئامادەیی ئەو کاتیش(هەشتاکان و نۆهەدەکان) دوو کتێبی بچووکمان بە ناوی چیرۆکی ئۆلیڤەر تویست و بازرگانی ڤینیسیاوە وەک لایەنە ئەدەبییەکەی زمانی ئینگلیزی هەبوو، تیایدا وێنای دوو کەس، دوو پیرەمێردی جوولەکەی پیسکە و جانەوەری تێدابوو. هەڵبەتە مەبەستی ڕژێمیش نیشاندانی ئەو لایەنە بوو. چیرۆکەکانیش؛ یەکەمیان ڕۆمانێکی چالس دیکنز و ئەوی دیکەشیان شانۆنامەیەکی بەناوبانگی شەکسپیر بوو، بەڵام ئەوەندە هەیە هیچ کامیان شاکاری نووسەرەکانیان نەبوو، بەڵام ڕژێمی بەعس بە مەبەست هێنابوونیە نێو کتێبەکانی قوتابخانە.

بێجگە لەوە هەر شتێکمان دەربارەی ئەو گەل و نەتەوە بزانیبایە، هەر لەسەرچاوە عەرببییەکانەوە بوو، ئاشکراشە ئەوان بە چ زمانێک و مەبەستێک نووسیبوویان.
ساڵ هات و چوو.. من گەورە بووم و خوێندی زانکۆشم لە بەغدا تەواوکرد، ڕاپەڕین هات و چەپەڵۆکی بەعسیش دوور کەوتەوە. بەڵام دیاربوو پاشخانە بەعسییەکەی هەر خۆم کوێخام، هەوری ڕەشی براکوژی بە سەر ساڵەکانی دوای ڕاپەڕیندا هێنا، ئیدی لە دوای کارەساتەکە، لە هاوینی ١٩٩٧دا گەیشتمە هۆڵەندا و کاروباری مافی پەنابەرێتیم لە ماوەی سێ چوار مانگێکدا تەواوبوو، ئێمەیان لە گوندێکی باشوری وڵاتەکەدا، لە زێیلاند (ئاردنبورگ- Aardenburg ) ئاکنجی کرد، لەوێ بۆ فێربوونی زمانی هۆڵەندی ڕەوانەی خولێکی زمان کراین.
لەوێ لەبەر ئەوەی لە گوندێک بووین هیچ کوردی لێنەبوو، لە تامەزرۆیی بۆ فێربوونی زمانەکە، هەر هیچ نەبێ بۆ تێگەیشتن لەو نامە زۆرانەی هەفتانە دەخزێندرانە نێو کونی دەرگای مال... بۆیە بە جدی سەرقاڵی ئەلف و بێی زمانەکە بووین، بەڵام ئەمجارەیان زمان و ڕێزمانێکی تەواو نامۆ (وەک بە خۆیان دەگوت چینی ئەوروپای!). هەرچەندە لەگەڵ ئەو خانمە بەڕێزەی بۆ پەیوەندی نێوان ئێمە و شارەوانیان تەرخان کردبوو، بەو شرە ئینگلیزییەی کاتی خۆی لە قوتابخانە فێری بووین، دەدواین، بەڵام دەرەقەتی نەدەهاتین. بۆیە بە هۆکاری ناچاری و تامەزرۆیی، ڕۆژ و شەومان کردە یەک و هەرچۆنێک بێ، لە چەند مانگێکدا سەروسەکوتی زمانەکەمان شکاند و بە تێکەڵیەک لەگەڵ ئینگلیزی، هەندێ لە کاروباری ڕۆژانەمان بەسەر دەبرد.
دوای ئەی دارا دوو داری دی زمانەکەمان تەواو کرد، توانیم هەندێ نووسینی سادە حینجە بکەم و لە ڕێی فەرهەنگەوە لە واتاکەیان حاڵی ببم، کەڵکەڵەی خوێندنەوە سەری هەڵدایەوە. ئەوێ دەمێ لە یەک دوو کتێبی کوردی زیاتر لەبەردەستمدا دانەبوون... بۆیە وێرای بەشە خوێندنی خولەکە، خۆشم لە ماڵ ملم لە فێربوونی زمان نا... تا توانیم هەم خولەکە و هەم خولێکی ساڵێک خوێندنی هۆڵەندی تەواو بکەم و بڕوانامەی زمانی هۆڵەندی وەک زمانی دووهەم وەربگرم و دواتریش خولێکی ساڵ و نیوی وەرگێران هەر لەهەمان دەڤەرەکە لە قوتابخانەی باڵادا ببرم.

لەو کاتەی کە سەرەداوێکی خوێندنەوەی زمانێکی دیکەی بیانیم کەوتە دەست، کەوتمە نێو دەریای خوێندنەوەی کتێبان... سەرەتا زیاتر بەو کتێبانەی کە کاتی خۆی بە کوردی و بە عەرەبی وەرگێڕانەکەیانم خوێندنبووە وەک هەندێ ڕۆمان، پاشان یەک دوو کتێبی لەسەر گەلی جوو، لەسەر ئیسرائیل و بە تایبەتیش یاداشتی سەرکردەکانیانم کەوتە بەردەست و ئیدی سەرم بە سەردا گرتن و وشە نوێکانیشم لە فەرهەنگەکان دەردەهێنا.

هەر کاتێ بەندێکم لەو کتێبانە دەخوێندەوە، پەرۆش بووم هەرچی زوو بەندی دوای ئەوە بخوێنمەوە تا تەواوی کتێبەکە خەتم بکەم. لەوێدا دوو شتی سەرنجراکێشم بۆ دەرکەوتن، یەکەمیان ئەوەی تازە دەمخوێندەوە تەواو پێچەوانەی ئەو باسوخواسە کۆنانە بوو کە لە ڕێی زمانی عەرەبیەوە خوێندبوومەوە، دووهەمیشیان کارانگازبوونم بە ڕەوتی خەباتی ئەوان و دڵسۆزی و لێهاتووی سەرکردەکانیان. پرسی سەرکردە بۆ من شتێکی سەرنجراکێش بوو، ئاخر ئێمە لەوەتەی هەین لەو بوارەدا لە قەیرانی قووڵ داین.

هەینی، هێشتا دەرەقەتی وەرگێران نەدەهاتم، بەڵام بەو برادەرانەی پێشتر لەوێ بوون، لێم دەپرسین کە هەقە مشووری شتێکی وا بخۆن. دواتر وردە وردە توانیم بەسەر زمانەکەشیانادا زاڵ بم، ئیدی لە خۆم دەپرسی باشە کە من ڕایەکی وام دەربارەی ئەو جۆرە کتێبانە هەبێ، بۆچی هەمان زانیاری لەگەڵ برادەرەکانمدا بەش نەکەم، ئاخۆ ئەوان چی دەڵێن؟ ئیدی ملم لێنا، سەرەتا چەند دێڕ و بڕگەیەک، پاشان یەک دوو بەندی کتێبان، دوای قسەکردن لەگەڵ ئەوانەی کورتە وەرگێڕانەکەی منیان دەخوێندەوە، خۆمئاسا پێیەوە کاریگەر بوون، ئەوانیش هانیان دام بەڵکو هەوڵەکەم لە چوارچێوەی تایبەتی خۆم و ئەواندا نەهێڵمەوە، بەڵکو تەقەللایەکی بەرفراوانتری لێبکەوێتەوە، کورتە وەرگێڕانەکە ببێتە کتێبێکی تەواو.

کاتێک بەم جۆرەم بینی، لە دڵی خۆمدا گوتم باشە گەر بکرێ بۆچی خوێنەری کوردیش بە ئەوەی بیری لێدەکەمەوە ئاشنا نەبێ؟ ئیدی ئەوە بوو دوای هێنان و بردنێکی زۆر یەکەمین کارم، وەرگێڕانی کتێبەکەی "نهێنییەکانی مۆساد"ی لێکەوتەوە، کە دەنگدانەوەیەکی باشی هەبوو، وەک یەکەمین کتێبێک لەو بارەوە، زۆر باش ناسرا.

بەقەولی مام هێمن، منیش دەڵێم ئەو کارانەی تا ئێستا لەبواری وەرگێڕاندا کردوومن، هەوڵی تاکەکەسی بوون، نە منەتن بەسەر خوێنەر نە بەسەر

کتێبخانەی کوردی. بۆ ئەوەش نەبوون کە بڵێم لەسەر ڕەفەکانی کتێبخانی کوردیدا کەلێنێک هەیە دەبێ پڕ بکرێنەوە، منیش بەو ئەرکە ڕادەبم. نەخێر، بەڵکو هەوڵێکن گەر شکستیان هێنا خۆم بەرپرسم، گەر بڕشتیشیان هێنا، ئەوا بەختەوەرم.

پاش کتێبەکەی نهێنییەکانی مۆساد کە لەماوەی چەند مانگێدا ڕەنگدانەوەیەکی باشی دایەوە و خوێندرایەوە.. مجێزم لەکاری دیکەش لەسەر هەمان تەوەر و شتی جیاش پەیدا کرد تا کار گەیشتە ئەمڕۆ. بەڵام ئەوەی لەسەر دەوڵەتی ئیسرائیل و گەلی جوو کردبێتم سێ کتێب بوون، دووانیان لەسەر سەرکردە ناودارەکانیان بوون کە داود بنگۆریۆن و گۆلدا مایەر بوون. هەر دووکیان لە حزبە سۆشیالیستەکەی زایۆنزمی بوون، هەرچی ئەم یاداشتەی مێناحیم بێگنە، ئاراستەی حزبییانەی جیاوازترە.. هەروەها بیروڕای بێگن و ڕێکخراوەکەی پێش جەنگی سەربەخۆی و دواتریش، ڕووەکەی دیکەی دۆزەکەیانە.

ئەوەی گرنگ بێ دوو کتێبی بێگنم خوێندوونەتەوە، یەکەمینیان بە ناوی (شەوە سپییەکان) باسی چۆنیەتی گرتن و زیندانەکانی پۆلۆنیا و دواتر سیبیریای ڕووسی دەکا کە بۆ خۆی کتێبێکی نایابە، لەگەڵ ئەمەی بەردەست. دوای خوێندنەوە نەوەک هەر بۆئەوەی ڕووەکەی دیکە، ڕووە لیبرالییەکی زایۆنیزم بزانم، بەڵکو ناوەڕۆکی کتێبەکە خۆی هانی دام کە تا زووە دەستوبردی لێبکەم. ئاخر ئەو چالاکیی، ئەو بڕوا و گیان و ورەیە، ئەو هەوڵ و تەقەڵلایەی لە دوو توێی کتێبەکەدایە، ئەوە پەیڕەوەی ڕێکخراوە میلیشیاکەی (ئیرگون زڤای لیومی) لەسەر ڕۆیشتووە، دەرەقەتی زۆر شت دێ، دەرەقەتی بوژاندنەوەی نەتەوەیەک، ڕێنیشاندەری گەلێک بۆ سەربەخۆی، ئامرازی بەرخودان و دەرسی سەرکردایەتی و ڕابەرایەتیکردنی کۆمەڵە و نەتەوە و هتد... ئیدی ئێمە وەک چ وەک تاک، چ وەک کۆمەڵ حەوجەداری خوێندنەوەی ئاراستەگەلێکی واین.

بەڵام بەر لە کۆتایی ئەم چەند دێرانە، دەبێ پێ لەوە بنێم کە کارێکی وا، وەک هەمیشەش لە وەرگێرانەکانی دیکەدا ڕووبەڕووم بۆتەوە، هەر کارێک نەبووە، تەنیا و تەنیا هونەرەکەی بۆ خۆم گەڕابێتەوە، بەڵکو چەند برادەرێکی خۆشەویست لەپاڵ مندا، گەر لەمن زیاتریش نەبێ، بەقەد من پێیەوەی ماندووبوون، بۆیە پێویستە ئاماژەیان پێبکەم.

لەسەرەتاوە دەبێ سوپاس و پێزانینم بۆ بۆبرای خۆشەویست و هاوگوندییەکەم، کاک **یونس حاجی گرتکی** کە لە ڤێرجینیای ئەمریکاوە، کۆمەڵە کتێبێکی بە دیاری بۆ ناردم، لەوانە ئەم کتێبەی بەردەستەیە.

وەک هەر وەرگێڕانێکی دیکە، من کێشەم لەگەڵ دەستخەتەکەم هەیە، بۆیە زەحمەتە یەکێکی دیکە بتوانێ بە ئاسانی دەستخەتە ناخۆشەکەم بخوێنێتەوە، کەواتە بە ناچاری هەردەبێ خۆم تایپی بکەم، ئیدی لێرەشدا کۆمەڵێ هەڵەی گەورە و بچووکی تێدەکەوێ، هەرچەند جارێکیش بەسەریدا بچمەوە، هەندێ هەڵە هەن، چاوم لە ئاستیاندا هەر نابینایانە بە سەریاندا گوزەر دەکا. بۆیە ئەرکی ڕاستکردنەوەی هەڵەکان، دواتر شێوەی زمان، ڕێزمان و ڕێنووس لە ڕێی ئەم برادەرانەی خوارەوەدا وەک ئێستای لێهات.

هەر کاتێک لە بەندێک دەبوومەوە، یەکسەر بۆ کاک **شێخ شەماڵ گەزنەییم** دەنارد، ئەویش هەندێ هەڵەی بەرچاو و ناقۆلای لێدەگرتن و بۆی دەناردمەوە، بەلام لەپاڵ ئەوەشدا هەر جارێک بە کورتە نامەیەک، دەستخۆشی لێدەکردم، وشەگەلێکی وای دەنووسین کە دەبووەوە دەراوی هاندان بۆ زیاتر لەسەر ڕۆیشتن و بەردەوامبوون. بۆ نموونە لەسەر دوا بەندی دەستنووسەکە ئەمەی خوارەوەی بۆ نووسیمەوە: "***هیوادارم دوا سلاوم نەبێت، لە درێژەپێدانی کاروانی وەرگێرانەکانت، بە تایبەتیش لەو چەشنە پەرتووکانە... هیواخوازم بە بەردەوامی نەک بێڵ بەڵکو باشترین شۆفەڵت پێ بێ بۆ ئەوەی بەردەوام بیت لە وەرگێڕان و وەریبگێرە، کاکە وەریبگێرە..***

***برایەکەم پێموانیە ئەو کەسانەی کە پێدا دەچنەوە بە چاوی من بیخوێنەوە، کە دەیخوێنمەوە دەمباتە دنیایەکی سەیروسەمەرە، دەمباتەوە بەرەکانی جەنگ، دەمباتە ڕۆژانی سەختی خەباتی ڕووت .... ناتوانم کتومت مەفهومەکەی بخەمە سەر کاغەز بەلام دەمباتە قووڵایی ڕووداوەکان وا هەست دەکەم خۆم کە لە وێم.. سەرەنجیش لە باری فیکری ، سیاسی یان ستراتیژی و ئایدۆلۆژی نووسەر دەدەم. بیرم لەوە دەکردەوە ئاخر گەلۆ بە خۆزیا نابێت و ناکرێ ئەگەرنا دەمگوت خۆزیا ئێمەش ڕێبەرێکی ئاوامان دەبوو بۆ ئەمڕۆ ئینجا بزانە ئێستا سەربەخۆیی خۆمان دەبوویان نا ؟...***"

پاش چاکردنەوەی ئەو هەڵە تایپە زەق و زۆپانە، برای خۆشەویستم کاک **لوقمان شلانی** بە سەریدا دەچۆوە، ئەویش وەک خوێنەرێکی باش و سەلیقەدار، لە کۆمەڵێک هەڵەی دیکەی بژار دەکرد و هەندێ تێبینیشی سەبارەت بە هەندێ

دەســتەواژە بــۆ دەنووســیمەوە، ئەویــش ســەرنجە کارانگازییەکــانی خــۆی نەدەشاردەوە.
مایەی ئاماژە پێکردنە هەم خۆم، هەم کاک شەماڵ و لوقمانیش، ئەوە تێبینییەمان لەسەر دوا دوو بەندەکە بەتایبەتی بەندی سێیەم بۆ پەیدا بوو، لەبەر قووڵی ناوەڕۆکەکەی و کە گەر بکرێ ببێتە بەندی یەکەم، یان دووجار بنووسرێتەوە لە سەرەتا و کۆتایی، بۆ ئەوەی خوێنەر دووجاران بیخوێنێتەوە، یان هەر هیچ نەبێ ئاماژەیەکی پێبدرێ.
ئەوسا ئەدیب و چیرۆکنووسی ئازیز کاک **سابیر ڕەشید** بەسەر وەرگێڕانە پاکنووسکراوەکەدا چوویەوە، ئەویش وێڕای هەندێ هەڵەی تایپی بەجێماو، لە بارەی ڕێنووسیشەوە کۆمەڵێ تێبینی گرنگی دان، بە تایبەت سەبارەت بە واوەکان، هەر بۆ خۆشیش پێیدەگوتم تۆ دەردە کەمی واوەکانت هەن! ئیدی لەژێر ڕۆشنایی تێبینیەکانی ئەو ڕێنووسەکەی ئەم وەرگێڕانەم لەگەڵ ئەوانی دیکە جیاواز بوو.
وەک دەڵێن مسکی کۆتاییش بەر برای بەڕێز و خۆشەویستم کاک **کاروان عارف** کەوت، بە ڕاستی ئەویش ڕوانینێکی دەوڵەمەندانەی بۆ سەر ڕێنووس و وشەدانی وەرگێڕانەکەم هەبوو... هەر بەڕاستیش لە بن چاکەی ئەو هاواکارانەم دەرناچم.
لە کۆتاییشدا هەردەبێ سوپاس و پێزانینم بۆ کنێر جەمیلی هاوسەر و کاکەڕای جگەرگۆشەکەم بکەم، چونکە ئەگەر ئەوان لە دەرفەتپێدان کۆمەکیان نەکردبام، بەو ماوەیە بۆم دەرنەدەچوو. هەندێ جارانیش لەسەر چەند وشەیەک، دەستەواژەیەکی نێو کتێبەکە بێنە و بەردەمان لێ پەیدا دەبوو.
ئیدی بە هەوڵ و هیمەتی ئەو ئازایزانەم ئەم وەرگێڕانە بەم شێوە دەکەوێتە بەردەستتان، هیوادارم لای ئێوەی بەڕێزیش جێی خۆی بگرێ.

**ش.ح.خ**
**هەولێر،30-06-2016**

## پێشەکی سەرنووسەر

ئەم کتێبە لە لایەن کەسێکەوە نووسراوە، لەوانەیە لە هەموو کەسە هاوچەرەخەکان، زیاتر لە سەرهەڵدانی دەوڵەتی سەروەری جوولەکە لە ئیسرائیل بەرپرسیارتر بێ. ئەم کتێبە بەڵگەنامەیەکی مێژوویی و سیاسییانەی گرنگە. لەنێو ئەو چەند ڕاستییە قووڵانەی تێیدایە، ئەو وانانەمان فێردەکا، چۆن جوامێرانە هانی پێواژۆی چیرۆکی پیاوێکی داوە، کە ورە و هۆشێکی سەرکەوتووانەی بەسەر بێئومێدییە سەیرەکاندا هەبووە.
مستەر بێگن پێی لە جەرگی خۆی ناوە کە دەڵێ: "ئەم کتێبە مێژووی شۆڕشی عیبری نییە". ئەو بە ئەنقەست خۆی بە کێشەگەلێک پەیوەندیدار کردووە کە لە ڕووی کەسایەتی خۆیەوە مشوورخۆری بووە. ئیدی ئەمە کتێبی یادەوەرییە کەسییەکانێتی. ئەو دەرەنجام و ڕایەکەی خۆی ڕاشکاوانە وا دەردەبڕێ؛ کە تۆماری ڕاستییەکانی زۆر بڕوادارانە و ڕاستگۆیانە دەقنووس کردوون. سەرباری تیشکی ڕەخنە کە هەندێکیان لە لایەن هەندێ لە تاقمە دەستڕۆیشتووەکانی دەوڵەتی ئیسرائیلی تازەلەدایکبوو، لێگیراوە، بەڵام لەو کاتەی ئەم کتێبە بەر لە ماوەیەک بە دەقە عیبریە ماکەکەی چاپ و بڵاو بۆتەوە، هیچ ڕەخنەیەک لێی سەرکەوتوو نەبووە و نەبۆتە مایەی کێشمەکێش.
بڵاوکردنەوەی چاپە ئینگلیزییەکەی ئەم کتێبەش، یەکەمین دەرفەت بۆ هاوڵاتییە بیرکاراکانی ئەم وڵاتە دەڕەخسێنێ، بۆ ئەوەی زانیارییان لەسەر ڕاستییەکانی شۆڕشی عیبری دژی دەسەڵاتی ماندایتی بەریتانیا لە فەلەستینەوە هەبێ. ئاشکرایە گەر دیموکراسی کاری خۆی بکا، ئەوا خەڵکی ئەو دەوڵەتە نەتەوەیەی بە پلەی یەکەم لەم پرسەدا بەرپرسیار بووە، بەلانی کەمەوە دەبێ دەرفەتی ئەوەیان پێبدرێ هەر دوو ڕووی دژبەرێکی پرسەکە بزانن، کە دەوڵەتەکەیان تێوەگلاوە. هێشتاش، کتومت ئەم شتە دەربارەی شۆڕشی عیبری ڕوویدنەداوە،

بەتایبەتیش دەربارەی ئەو ساڵە کوشندە و دژوارانەی کە لە هاوینی ١٩٤٦ دەست پێدەکا تا سەرهەڵدان و لەسەر پێ وەستانی دەوڵەتەکە و ڕووبەڕووبوونەوەی دەستدرێژی سەربازییانەی عەرەب لە ١٩٤٨-١٩٤٩.
جۆرە پیلانێکی بێدەنگ، بە دنەدانی چەندان پاڵنەری بێبایەخ، وای لە چاپ و بڵاوکردنەوەی کارای شانشینی یەکگرتوو سەبارەت بە پرسی 'شۆڕشگێڕەکانی' جوولەکە کرد، کە کەمتەرخەم بن، هەرچەندە ڕەوشی ئەو شۆڕشە خۆی دارِسانێکی جدیی بوو لە بەردەم دەسەڵاتی بەریتانی، کە لە ماوەیەکی کەمدا توانیان دۆخێک بهێننە ئارا، بۆ ئەوەی بەریتانییەکان ناچار بکەن ڕژێمەکەیان لە فەلەستین بکشێننەوە. ئەوە کەمتەرخەمی مشوورخواردنی 'شۆڕشگێڕەکان' و پرسەکەیان تەنها بۆ ڕای گشتی بەریتانی نەبووە، بەڵکو بۆ گفتوگۆ و تاوتوێی نێو پەرلەمان بوو، کە لە هەمان کاتدا گەواهیدەری خەمگینانەش لەنێو ئەڵقەی سیاسەتمەدارە باڵاکاندا هێنایە پێشەوە. گلدانەوەی ئەو زانیارییانە لە لایەن دەوڵەتێکی دیموکراسییدا خاڵی دژواربوون سەبارەت بە پێشێلکردنی بەرگری لەخۆکردنێکی ناڕێکی ئازادی دیموکراسییانە.
سەرکردە سیاسییەکان سکاڵایان لەوێ ئەوە بوو، کە ئۆباڵی بەرپرسیارێتی تایبەتمەندیانە دەکەوێتە سەر ملی ئەو جوولەکە بەریتانییانەی دەرفەتی زانینی ئەو زانیارییانەیان هەبوو، دەبوایە ئەوەی دەیانزانی بڵاویان بکردبایەوە. ئەوە ڕەوا نییە، کە ئۆباڵی تەواو بخرێتە سەر شانی جووەکان، کە ئامرازی وایان لەبەردەستدا نەبوو ئەو زانیارییانە بدەنە هاووڵاتی ئینگلیز، یان بەلای کەمییەوە لە بەشێکی زانیارییەکان ئاگاداریان بکەنەوە یاخود بە کەمتەرخەم و نانیشتمانی لە قەڵەم بدرێن. ئەوان فشاریان خرایە سەر تا پشتگیری جووەکانی فەلەستینی بکەن، ئەوان نە ئەو ڕامانە و نە ئەو ئازایەتییەی براکانیان لە فەلەستین هەبوو کە لەوێ بۆ پاشەڕۆژی جووەکان لە هەر کوێیەک بن، دەجەنگان.
لە بنەڕەتدا ئەم کتێبە بە بەعیبری نووسراوە، بەزمانێکی چڕوپڕ و توێکڵدار نووسراوە. وەرگێڕانی ئەم کتێبە بۆ سەر زمانی ئینگلیزی بە شێوەیەکی شایستە ئەرک و مشوورخواردنێکی باشی ویستووە. لەم وەرگێڕانەدا مستەر ساموئێل کاتز کاری لەگەڵ نووسەرکەدا کردووە، بەشێکی باشی سەبارەت بە وردەکارییەکان و شتە خۆجێییەکانی لێ دابڕیوە. ئەوەش ڕەنگبێ وای لێکردبێ کە سیاسەتبازە خۆجێییەکانی ئاڵۆزتر و سەیر نیشاندابن لەوەی هەن. لەو چاپەدا بابەتەکە زیاتر کورت کراوەتەوە، بەڵام بە شێوەیەکی وا کراوە، هاوسەنگی

خۆی لە دەست نەدا و بە هیچ شێوەیەک لە بایەخی پەیام یان شتە جەخت لەسەرکراوەکانی دوتوویی کتێبەکە کەم نەکراوەتەوە.
دیارە مێناحیم بێگن یەکێکە لە ناسراوترین کەسە دیارەکانی ئیسرائیل، ئەمەش نەوەک هەر لەنێو بازنەی ڕکابەرەکانیدا بەڵکو لەنێو شوێنکەوتووەکانی لە بۆتەی پارتی ئازادی کە لەنێو پەرلەمانی ئیسرائیلدا رابەرایەتی دەکرد. دیارە لە ڕووی سیاسییشەوە ئەو بەو شێوە وێنا دەکرێ کە بە کردار باشترین ولاتپارێز و خاوەن ڕامانێکی لەباری جوولەکەیە. پەرۆشانە خۆی بۆ هزری لیبرالی و ئازادیی تاکەکەسی و دادپەروەری تەرخان کردبوو، لە ڕاستیشدا مستەر بێگن وا لەلای ئەو دیاردە 'بتپەرستییە نوێیە'ی سیستمی سیاسی هەر دوو باڵی ڕاست و چەپ بەرپەچ درایەوە بە جۆرێک سەرباری ئەو بەڵێنە شیرینانەشیان، بەڵام ئەمە سەرکێشیش بوو بۆ بەیەکدادانی تاکەکان بەو پەڕی بێبەزەیی و لە ڕاستیشدا بێ بەرپرسیاریتی دامودەزگای دەوڵەتی دارِسێنەر.
لەو یاداشتە لەخۆبردەی نووسەردا، ئەو بەشە لیبراوانەی خۆی، ئەو بوێرە لەشکان نەهاتووە، بەو پەڕی لەخۆبردووانە بەرپرسیاریتی هەڵگرتووە، لەگەڵ ئەو متمانە بەرزەی هەڵسوکەوتی، ئاوەز و بنەما جێگیرەکانی ورەبەرزی، دنەی گیانی هەموو ئەندام و پلەدارەکانی نێو ڕێکخراوی ئیرگونی داوە و هەموو پشتگیری خۆی پێبەخشیون کە بووەتە مایەی سەرکەوتنی خەباتەکە.
مایەی تێرامانێکی مێژووییە، کە یەکێک لە جوامێرترین و لەخۆبردووترین پیاوی هەڵبژێردراوە کە سەرکردایەتی شۆڕشێک دژی بەرچاوترین سەیروسەمەرەکان بکا، بەو هێزەشی، کە تیایدا کانگای هێز و کاریگەری ڕەوشت بووە، بباتەوە. دەکرا ئەو لە لایەن نەیارانی نموونەی ڕۆڵی دێوەزمانەی هەموو تاوانە قێزەونەکان، کە بەدەگمەن نموونەی لە گەوجایەتی مرۆڤایەتی هەبوو، وێنا بکردایە، بەوەی وەک شیلەر Schiller بە ڕاستی نووسیویەتی، "خوداکان خۆشیان تووشی شتی قوڕ دەبن."

**ئیڤان .م. گرینبێرگ**
**لەندەن**
**ئاداری ١٩٥١**

## پێشەکی
## بۆ چاپی نوێ

لە بەرەبەیانی ١٨ی ١٩٧٧دا و ٢٩ ساڵ لە ڕەتبوونی سەربەخۆیمان، ئەوە ڕوون و ئاشکرا بوو، ئەو پارتەی بێ پچڕان لە ئیسرائیل فەرمانڕەوابوو، هەنووکە بەهۆی دەنگی خەڵک کشایەوە دوا و بووە ئۆپۆزسیۆن. لە کۆتاییدا لیکود دەنگی خەڵکی بەدەست هێنا و هاوپەیمانییەکی حکومیی دروست کرد.
ئەم ساتەوەختەش هی گۆڕانکارییە لە ئیسرائیل. ئەوەش ٢٩ ساڵ لە دوای ئازادبوونی گەل و ٤٦ ساڵیش دوای حەڤدەهەمین کۆنگرەی زایۆنستەکاندا (کاتێک پارتی کار پێگەی یەکەمین پارتی وەرگرت) خایاند. ئیدی کاتی هاتووە -دوو نەوە- لەوە تێبگا بە دەنگی سەدان هەزار هاووڵاتیانی ئازاد، گۆڕانکاری بەرچاو ببیندرێ. لە دووتوێی ئەوەشە وەک سەرۆوەزیری ئیسرائیل، ئەم پێشەکییە بۆ ئەو چاپە نوێیەی (یاخیبوونەکە) دەنووسم.
لەو دواییانەدا ڕۆژنامەنووسێکی ناودار ئەمەی خوارەوەی لێپرسیم: "ئەرێ کە لە دەسەڵات بیت، هەست بەچی دەکەی؟" منیش بەگوێرەی ڕاستییەکان وەڵامم دایەوە: 'من هێز ناقۆزمەوە؛ بەڵکو لەو ئەرکەدا تەنها یەک داردەست هەیە، کە بەکاری بهێنم: ئەویش باندۆری ڕەوشتە.' بەڵام خۆ لەوێدا بەرپرسیارێتییەکی مەزن هەیە، تەنانەت دەتوانم ئەوەشی بۆ زیاد بکەم کە بەرپرسیارێتیەکە دژواریشە. منیش دەمەوێ تا توانستم هەبێ بەردەوام بم و شانی بدەمە بەر، هەرچەند سنوورداریش بێ.
لەگەڵ هاوکارەکانمدا لەسەرمانە مشووری ئایندەی گەلی جوولەکە بخۆین، بۆ ئاسایشی دەوڵەتی جوولەکە تێبکۆشین، هەروەها ئاسایش و ژیان و ئازادی ڕۆڵەکانمان دابین بکەین. ئای کە ئەم بەرپرسیارێتییە چەند گرنگ و دژوارە!

له میانەی ئەو ساڵە دووروودرێژانەی خزمەتم وەک ئۆپۆزسیۆنی نێو پەرلەمان و سێ ساڵانیش بەشداریم له حکوومەتی یەکێتی نیشتمانیی (١٩٦٧-١٩٧٠)دا، من دەمەوێ وەک یەک بۆ دۆست و ڕکابەرەکانم ئەوە بڵێم، کەوا له هەر پێگەیەکدا بم، هەرگیز له رووی نیشتمانی و مرۆییەوە بەو گرنگییە بەراورد ناکرێ که برادەرەکان و من له کاتی ژێرزەمینیدا و له جەنگی رزگاریخوازانەی گەلەکەماندا کردوومانە. هەندێک له چاودێران ئەو راگەیاندنەم پێدەبڕن بەوەی گوایە دەربڕینەکە شێوەیەکی خۆ دڵنەواییکردن بێ. "ئەو دەستبەرداری هیوا بووە" ئەوان وا دەڵێن، "رۆژێک دێ به ئەندامی کابینەی حکوومەت یان به سەرۆوەزیر هەڵبژێردرێ؛ هەر بۆیەشە پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ، که ئەوەی له رابردوودا کراوە گرنگترە لەوەی له ئاییندەدا دەکرێ." ئەو چاودێرانە هەڵەن. کۆمێنتەکەی من ڕاست بوو. بۆ باشترین سەلماندنیش، کاتێ وەزیر بوومە هەر ئەو بڕوایەم دەربڕیوە، ئەوەش بەدەر نییە له کاریگەری ناو کابینەی حکوومەت.
هەنووکەش ئەرکم سەرۆوەزیرییە. کاتێکیش ئەو چەند دێڕانەم چاپ دەبن، چەند مانگێکە له نووسینگەکەمم. ئێستا به ڕاستی لەو پێگەیەدام، که بەراوردێک له نێوان ئەو کاتەی سەرکردەی ئیرگون زڤای لیومی بووم، که بۆ ئازادی و سەربەخۆیی (له ڕاستیدا بۆ مانەوە)ی گەلەکەمان دەجەنگاین، لەگەڵ ئەو سەردەمەی که سەرۆکی حکوومەتی ئیسرائیلم، بکەم.
به ناسینەوەی تەواوی ڕاستییەکان، بێ دوودڵی دەڵێم: به هەموو دژواری بەرپرسیارێتی ئەو پێگەیەی له دەوڵەتی ئیسرائیلدا هەمە، بەڵام ئەرکەکەم له سەرکردایەتی جەنگی ولاتپارێزانە له خەباتێکی نایەکساندا، که له بن باری قورسترین ئەگەری سەیردا ، به ژمارەیەکی کەم له بەرامبەر زۆر لەگۆڕێدا بوو، بەرزتربوو.
باشە بۆچی هەستم بەم شێوەیە؟ بەرسڤەکەش روون و ئاشکرایە. کاتێک پیاو بۆ ئازادی دەجەنگێ و بەردەوامیش گیانی لەسەر لەپی دەستە، ئەو بەتەواوی به هەموو گیانی ئازادییەوە، خۆی دەناسێتەوە. ئەو خۆناسینەوەیەش بەدەگمەن له ژیانی مرۆڤدا له جارێک زیاتر دێتە پێشەوە.

لە ژێر تیشکی گیانی ئەو دڵسۆزییە بەردەوامەدا بۆ واتای ئازادی، لێرەدا پێشەکی بۆ خوێنەری چاپە نوێیەکەی کتێبی (یاخیبوونەکە) دەنووسم، ئەوسا خوێنەرەکە جوولەکە بێ یان غەیرە جوو.

**م. بێگن**
**نووسینگەی سەرۆوەزیر**
**ئۆکتۆبەری ١٩٧٧**

## لە ڕوانگەی نەوەیەکەوە

٨/ - ٢٤

لەو کـاتەی ڕووداوەکـانی نێـو ئەم کتێـبە وێنـاکراون، نەوەیەک پەیـدا بـووە. پیاوەکانی ئەم نەوەیە کە لە قەڵا و چەپەرەکاندا لەدایک بوونە، بەشدارییان لە جەنگـی شـەش ڕۆژەدا کـردووە، خوێنـدن و خزمەتـی سـەربازیان تەواو کردووە، خێزانیشیان پێکهێناوە و تەنانەت وەچەشیان ناوەتەوە. بە دڵنیاییەوە کار و ڕووداوی مێژوویی ئەو سەردەمە و ڕۆڵەکانیان هەبووە. بەڵام تۆ بڵێی ئەوانە جـۆش و خرۆشـی گیـانی باوکەکانیـان سـەلماندووە یـان ڕەتیـان کـردۆتەوە؟ لـێگەڕێ بـا تـاقیکردنەوەیەک بکەیـن. لە لێکـۆڵینەوەیەکی بەراوردکارییدا، وەڵامەکەمان دەست دەکەوێ.
کتێبەکە بە ئەزموونی نووسەر لە ڕووسیای ستالیندا دەستپێدەکا. بەندەکە لە کاتێکدا بڵاوبووەوە کە لاڤارێنتی بێریا Lavarenti Beria دەستە ڕاست یان دەستە چەپی جۆزیف ڤیساریێنۆڤیچ Joeseph Vissarinic بـوو. خۆ هەمـوو خـوێنەرێکیش چیـرۆکە پـوختەکراوەکەی ڕاسـتی بەدڵ نیـیە. کۆمۆنیستەکان دەڵێن: ڕێی تێناچی لە یەکێتی سۆڤێتیدا ئەم جۆرە ڕەفتارە لەگەڵ خەڵکدا کرابـێ. ئەوان بـڕوا و متمـانەی ڕەهـای خۆیـان بە دادی سۆشیالیسـتانە و شـێوازە مرۆڤایەتیەکـانی هەیە. بە پێـوەری لێخۆشبوونیشەوە، کەسە سەرسامەکان بە ڕژێمی سۆڤێتی ئەوە داوادەکەن، بەڵکو ژان و ناسۆرە تایبەتەیە کەسییەکانم وایلێکردبم پروپاگەندە دژی یەکێتی سۆڤێتی بکەم.
سـتالین مـرد، بێریـاش لەسـێدارە درا. خرۆشـۆڤیش لە بەردەم کـۆنگرەی بیسـتەمی پـارتی کۆمۆنیسـتی سـۆڤێتیدا دوا. سـۆلژنیتز ڕۆژێ لە ڕۆژە زۆرەکـانی ژیـانی دینیتـۆڤیتچی وێنـا کـردووە. دوای ٢٣ سـاڵ، ئیـدی کەس تەنـانەت خـودی کۆمۆنیسـتەکانیش گومـانی لە ڕاسـتی ئەو چیرۆکـانە

نەماوەتەوە، کە لە ئۆردوگا زۆرەملێکانی دەوڵەتی کۆمۆنیستدا لێکۆڵینەوە[1]ی شـەوان لەگەڵ گیراوەکانـدا کـراوە. هەڵـبەتە راسـتی، بەهـای رەهـایی هەیە. ئەوەش پێویستی بە پەسەندنامەی ئەو کەسانە نییە کە لێی یاخی بوونەتەوە. هەرچەندە ئەوانەی نکوڵی لێدەکەن، بێنە سەر ئەوەی بیسەلمێنن، ئەوا بەڵگەی سەرکەوتنەکەی حاشاهەڵنەگرانەیە.

یەکەمین بەندی کتێبەکە بە سەربردەی گارین Garin[2] کۆتایی دێ. ئەو پیاوە هەر لە تافی لاوێتی خۆیەوە کۆمۆنیست بوو. ئەو بەشداری شەڕی ناوخۆی کرد و هێشتاش لینین و ترۆتسکی لەبیر بوو. لە رێی خزمەتی دڵسۆزی بۆ رژێمـی سـۆڤیەت، گەیشـتبووە پلەوپـایەی بـاڵا. ئەو بـووە یاریـدەدەری سەرنووسـەری "پراڤدا". کـاتێکیش مـن بینـیم، هەر چەنـدە ئەوسـا پیـاوێکی تێکشـکاو، ئەشـکەنجەدرا و دوژمنـی گەلەکە بـوو، پیـاوێکی شـەرمەزار و جوولەکەیەکی ئەشکەنجەدراو بوو. بەڵام ژانوناسۆرە گیانییەکەی لە پێوان نەدەهـات؛ بە دڵنیـایەوە ئەوان تیژتربـوون لە ئـازاری جەسـتەکەی. کـاتێکیش ئێمە لە بن هەیـوانی زیندانەکە یان لە سەرپشـتی بەلەمی کۆیلەکـان بەیەکەوە بووین، داوای لێکـردم گـۆرانی "بەرەو گەڕانەوە"ی بـۆ بڵـێم؛ ئەوەش گـۆرانی هاتیکڤا بوو، کە لە مێردمنداڵییەوە لە دەڤەری ئۆدیسییاوە گوێی لێ ببوو. ئـای چەنـد سـەیر بـوو کە نـاوی گـۆرانیەکەی لەیـاد نەمـابوو. ئەو هـیچ شـتێکی دەربـارەی ئـاوازەکەش نەدەزانـی. لەگەڵ ئەوەشـدا دوای ۳۰ سـاڵ، یەکەمـین وشـەی گـۆرانیەکەی لە مێشـکدا نەقش ببـوو: "گەڕانەوە بـۆ نیشـتمانی بـاب و باپیرانمان."

دوای ئەوە ۳۰ ساڵی دیکە رابرد. ئیدی گارین خۆی بە تەنیا بە هیوای نوێژ و دروودەکەی نەمایەوە. بە دەیان هەزار لە جوولەکەکانی یەکێتی سۆڤیەت پڕ بەدەم هاواریان کرد: "با بگەڕێینەوە بۆ نیشتمانی باب و باپیرانمـان." ئەوەش دیاردەیەکی پەرجووئاسا و مەزنە. پەرجووێکی سەیر هـاتە دێ. کۆمـۆنیزم بە هێز تێکنەشکا، بەڵکو بە بیرۆکە سەرمەشقێک شکا. زایۆنیزم ئەو بیرۆکەیە

---

[1] لێرەدا کە نووسەر وشەی interrogationی بەکار هێناوە، لەکوردیدا هەر لێپرسینەوە، لێکۆڵینەوە(تحقیق) هەیە، بەڵام مەبەستەکە بە تەواوی نادا بەدەستەوە، مەبەست لێکۆڵینەوەیەکی بە سام و پڕ توندوتیژی و تەنانەت بەئەشکەنجەدانیشە، بۆنموەی وا لە گیراوەکە بکا دان بەو تاوانەدا بنێ کە بەسەریدا دراوە.(وەرگێڕ)

[2] بڕوانە لە کتێبی (شەوە سپییەکاندا) کە چیرۆکی زیندانییەکەی لە یەکێتی سۆڤیەت بەتایبەتیش لە سیبیریا دەگێڕێتەوە، لەوێ بەدرێژی لە کۆتایی کتێبەکەدا باسی ئەو گارینە دەکا، لە بەندەکانی داهاتووی ئەم کتێبەشدا ئەم پرسە روونتر دەبێتەوە. وەرگێڕ.

بوو بەسەر خوێندن و پەروەردەی کۆمۆنیستەکاندا زاڵ بوو. لەوکاتەوە من هاتم، یان گەڕامەوە ئێرتز ئیسرائیل، هەرگیز لە دەربڕینی ئەو هیوا و بڕوایە نەکەوتم، کە دەبێ لە ڕووسیاوە بەرەو زایۆن بگەڕێینەوە. ئەوەش ڕوویدا.
لەو بەندەش کە بە ناونیشانی "ئێمە دەجەنگین، کەواتە ئێمە هەین"، ئەو شتەی خوارەوە دەبینینەوە: مرۆ ناتوانێ نەڵێ، ئەوانەی کە سیاسەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی بەریتانیایان داڕشت، لە هەمان کاتدا نەیاندەویست جوولەکە ڕزگار بکەن. خۆ ئەوە ڕاسترە بگوترێ ئەوان پەرۆشبوون بۆ ئەوەی هیچ جوولەکەیەک ڕزگاری نەبێ." من ئەو وشە توندانەم لەسەر بنەمای لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی ڕاستییەکان نووسیوە. لە چلەکان و پەنجاکاندا بەڵگەی وامان لە بن دەستدا نەبوو، ئەو تاوانبارکردنانە بسەلمێنین. هەرچەندە ئەو ڕۆژەش هات، کاتێک ڕاستی، تەنانەت تاڵترین ڕاستی خۆی لەنێو بەڵگەنامە مێژووییەکاندا بەرجەستە کرد. نەوەکەی[3] من بە ڕێکەوت دەستی بەو بەڵگەنامە هێدمەدارانە گەیشت و خوێندیەوە. پێدەچوو زۆریشیان هەرگیز گوێیان لە شتێکی وا نەبووبێ کە بەریتانیەکان دابونەریتی خۆیان بە پێی بەڵگەنامەکان گۆڕیبێ. ئەوە دابی لەندەن بوو، دوای پەنجا ساڵ لە دوورخستنی بەڵگەنامە حکومییەکان لە خەڵک، ئەوسا بە ڕوویاندا بکرێنەوە. چەند ساڵێک لەمەوبەر، حکوومەتی بەریتانیا بڕیاریدا سەردەمی نهێنیی کورت بکاتەوە. لە بەرایی ١٩٧٢دا، چرکە کۆبوونەوەکانی کابینەی حکوومەتی سەرەتای چلەکان بۆ خەڵکی ئاشکرا کران. ئیدی هەنووکە ئێمەش پێی ئاشناین.
بەگوێرەی ئەو بەڵگەنامانە، ڕێکخراوی خاچی سووری نێودەوڵەتی، نەخشەی وابووە چل هەزار جوولەکە لە هەنگاریاوە بهێنێتە تورکیا، ئەمەش بە مەرامێکی ڕوون و ئاشکرا، کە دوا مەنزڵیان بەرەو ئێرتز ئیسرائیل بێ. ئەو مەرامەش ئارامی لەبەر بەریتانیا هەڵگرت. ئەوان پەیوەندییان بە بارەگای سەرەکی خاچی سوورەوە کرد و دژایەتی خۆیان بەرامبەر نەخشەکە نیشاندا. بەڵگەوبەند (ئەرگومێنت)ی نارەزایەتییەکەشیان ئەوە بوو، کە ڕێکخراوە مرۆڤدۆستییەکە مافی ئەوەی نییە بەبێ ڕەزامەندی حکوومەتی بەریتانیا نەخشەیەکی وا جێبەجێ بکا. ئیدی نەخشەی خاچی سوور شکستی

[3] مەبەست لە نەوە، منداڵی کوڕ نییە، بەڵکو جوولەکە هاوتەمەنەکانی نەون(جیل) وەرگێڕ.

هێنا. بەمەش چل هەزار جوولەکەی دیکەی هەنگاری ڕەوانەی تونی مەرگی ژوورە گازییەکان کران، ئەوەش هەر لەبەر ئەوەی بەریتانیا ڕێگر بوو لە هەمبەر گواستنەوەیان بۆ تورکیا و دواییش لەوێوە بچنە وڵاتی ئیسرائیل.
بەڵگەنامەیەکی دیکە، کە ئاماژە بە چەند ساڵێکی ڕابردوو دەکا، دەربارەی جووەکانی فەرەنسا و ڕۆمانیا شتی زۆرمان پێدەڵێ. من ئەمەم لە کتێبێکدا دۆزیەوە، کە پێموایە دەبێ ئەو کتێبە لە هەموو ماڵێکی جوولەکەدا و ماڵی هەموو پیاوێکی باش و نیاز پاکدا هەبێ. من ئاماژە بە لێکۆڵینەوەکەی ئارسەر مۆریس "لەو کاتەی شەش ملیۆن کەس مردن" دەکەم. من خاترجەمم کە دانەرەکە کریستیانێکی نیاز باشە، پێموایە لاری لێنابێ کە کۆپلەیەک لە بەڵگەنامەکە دەق وەک خۆی بهێنمەوە: "ئێمە ڕوانینی نووسینگەی دەرەکیمان پێگەیشت کە خەزێنەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێشنیازی کردووە، ڕێگە بە باقی پارەکەی نشینگەی بەرایی سویسرا کە بڕی ٢٥،٠٠٠ دۆلار بوو، بدرێ بە جۆرێک جووەکانی فەرانسە و ڕۆمانیاشی پێ ڕزگار بکرێ. نووسینگەی دەرەکیش خەمی ئەو ئاستەنگانەی بوو کە چۆن ئەو ژمارە بەرچاوەی جووەکان ڕزگار بکرێن." (دیسێمبەر، ١٩٤٣).
هەڵبەتە لێرەدا هیچ گومانێک سەبارەت بە واتای ئەو بڕیارە نهێنیە، هەروەها دوو ڕێگای ڕاڤەکردنیش ناهێڵێتەوە. نووسینگەی دەرەکی بەریتانی خەمی کێشەکەی نەبوو کە چۆن بتوانێ ئەو ژمارە بەرچاوەی جوولەکەکان ڕزگار بکرێن، بەڵکو خەمی ئەوەی بوو دوای ڕزگاربوونیان چیان لێبکا.
جێی خۆیەتی ئەو بەڵگەنامانەشی بخەینە سەر کە لە نەوەی کوڕەکان دۆزراونەتەوە. بەڵام خۆ پێویست بە ئەوەش ناکا. دوو بەڵگەنامەی فەرمی، کە ئێمە بەرلە بیست سی ساڵ پێمان نەدەزانین، چارەنووسازن بەوەی ئەوە نمایش بکەن کە باوکەکان نە لە تاوانبارکردنەکە و نە لە بەرەنجامەشیاندا شاش نەبوون. سەرتاپای نەتەوە، شەش ملیۆن پیاو، ژن و منداڵ بە پلانی قڕکردنیان کە پێنج ساڵی خایاند، لە دۆزەخدا نغرۆکران، ئەوەش هەر لەبەر ئەوەی ئەڵمانەکان بڕیاریاندابوو لەناویان بەرن، بەریتانیا و ئەوانی دیکەش بڕیاریان دا قوتاریان نەکەن.



**لە هۆلۆکۆستەوە بۆ ڕزگاری.**

کتێبەکە وێنای شەڕەکانی ئۆرشەلیم بە کۆن و نوێیەوە دەکا، کاتێکیش شارەکەی نێوان دیوارەکان لە ساڵی (٥٧٠٨ی عیبری) ١٩٤٨دا روخا، ڕادیۆی دەنگی ئیرگون زاڤای لیومی ئەمەی بڵاوکردەوە:

"لە شارە دێرینەکەدا هیچ خۆبەدەستەوەدانێک نەبوو، بەڵکو شەڕێک پڕ لە بوێری، کە ئێمەی گەڕاندەوە بۆ ساڵە بەراییەکانی گەلەکەمان، کاتێک کوڕەکانی لە سەر پەرستگای شاخەکە[٤] شانبەشان وەستابوون و مەشخەڵەکەشی بەرەو ئاسمان بەرزدەبووەوە. ئەو جەنگە و ئەو ئازایەتییە لەو ڕۆژە ڕەشە و تاڵەدا دڵەکانی ئێمەی بەهێز دەکرد؛ ئەوان ئەو متمانەیان پێدەبەخشین کە ڕزگارکردنی جوودیا و باقی ئیسرائیل هەر دەبێ بۆ پەرستگای تێمپڵ بگەڕێتەوە، هەروەها دەبێ بەیداخی ئێمە بەسەر تاوەری داودا بشەکێتەوە."

نۆزدە ساڵ دواتر، واتە لە ساڵی ١٩٧٦دا، ئەوان ئەو خاکەیان گەڕاندەوە و ئاڵاکەش شەکایەوە. ئەمجارەیان ئێمە لەوە بەئاگا بووین، کە بڕیاری دەرەکی بۆ ئاگربەس دووبارە نەبێتەوە، کە کارێکی وادەکا ڕێگر بێ لە ڕزگارکردنی شارە داگیرکراوەکەدا. کاتێکیش زەردەی بەیانی چوارشەممەی ٧ی حوزەیرانی ١٩٦٧ داهات، من یەکەمجار گوێم لەو هەواڵەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بوو داوای لە هەر دوولا کرد، دەمودەست شەڕ بوەستێنن. بڕیارەکەی بڕگەیەکی وای لەخۆگرتبوو، کە دوای ئاگربەسەکە نابێ هیچ چالاکییەک و کردەیەکی سەربازی ئەنجام بدرێ. لە ئێوارەی ڕۆژەکەشدا، سەربازی جیاوازی بیروڕاش وا دەخوێندرایەوە، کە هێزەکانمان ئەو گردانەی دەوروبەری ئۆرشەلیم بگرنەوە. ئەو گردانە لە هەموو لایەکەوە گەمارۆدرابوون، چاوەڕوانی ئەوە بووین دوژمنە گەمارۆدراوەکە خۆی بەدەستەوە بدات و ئاڵای سپی بەرزبکاتەوە. بەڵام دەنگوباسێک لە نیویۆرکەوە هات، دڵی دەشکاند. تۆ بڵێی ئەمجاریشیان ئاگربەسەکە کاری خۆی بکا و ئێمە هەروەک هاوینی ١٩٤٨ بخرێینە ئەودیو دیوارەکەوە؟[٥]

[٤] ئەو شوێنە بە کەلای هەرسێ دینەکان پیرۆزە و لای ئیسلامیش بە المسجد الاقصی یە. وەرگێڕ

[٥] مەبەست دیواری شارە پیرۆزەکەیە، مزگەوتی ئەقسا.

ئیدی پەیوەندییم بە هاوکارەکەم مۆشێ دایانی وەزیری بەرگری کرد، بڕیارەکەی ئەنجوومەنی ئاسایشم پێڕاگەیاند و پێشنیازی ئەوەشم بۆکرد، کە هەنگاوێک لە بەرامبەر بڕیارەکەی شەوی پێشتری ئەنجوومەنی ئاسایش بنێین، بەوەی فەرمان بە سەربازەکامان بدەین بەبێ وەخران بپەڕنەوە بۆ شارە دێرینەکە. ئێمە لەسەر ئەوە ڕێکەوتین، دەمودەست من بگەڕێمەوە لای لیڤی ئەشکۆلی سەرۆوەزیر (یادی بەخێر) قەناعەتی سەبارەت بەو گۆڕانکارییە پێبهێنم. من سەرۆوەزیرم لە خەو بێدارکردەوە و لە پێشهاتەکانم ئاگادارکردەوە. ئەویش قایل بوو بەوەی چالاکییەکە نابێ هیچی دیکە دوابخرێ، پێویستە ئەو فەرمانانە بە یەکە سەربازییەکانی بەرەی ئۆرشەلیم بدرێن بەرەو شارە دێرینەکە بکشێن. ئیدی فەرمانەکە درا. جەنگە یەکلاکەرەوەکە کورت بوو. لە نێوان سەعات نۆ تا دەی بەیانی هێزە نیمچە سەربازییەکانمان چوونە سەر پەرستگای شاخەکە.

بەمجۆرە دیواری شارە دێرینیەکە چیدیکە بە سنووری ئۆرشەلیم نەمایەوە. ئەوەی ئێمە بۆ ساڵانێکی زۆر هەر داوامان دەکرد و دەکردەوە، دوای شەڕی شەش ڕۆژە هەموو نەتەوەی ئیسرائیل هەمان شتی داوا دەکرد. بە ڕاستیش هەر ئەوە باوەڕمان بوو.



هەڵمەتی ئۆرشەلیمی ١٩٤٨ تووشبوونی شەڕی دێر یاسینی بەدواوە بوو. ئای کە لەو کاتەوە تاکو ئێستا، لە لایەن جوو و غەیرە جووەوە چەند درۆی شاخداری لە بارەوە کراوە؟

بەڵام خۆ ناکرێ ڕاستیەکان دەمکوت بکرێن. لە ١٦ی ئازاری ١٩٦٩دا وەزارەتی دەرەوەی دەوڵەتی ئیسرائیل نامیلکەیەکی بەناوی "لاپەڕە پاشخانییەکان" بڵاوکردەوە کە بە گرتنی دێر یاسین تەرخان بوو . لێرەدا چەند برگەیەکی بنچینەیی ئەوێ دەهێنینەوە:

مەبەستی هێرشەکەی عەرەب، ڕاشکاوانە لە لایەن عەززام پاشای سکرتێری گشتی جامیعەی عەرەبییەوە جاڕدرا. کاتێکیش هێرشی سەرتاسەری لەشکرەکانی عەرەب لە ١٥ی ئایاری ١٩٤٨ بۆ سەر هەرێمی ئیسرائیل دەستی پێکرد، ئەو هیچ دووڵ نەبوو لەوەی ڕابگەیەنێ: 'ئەمەیان دەبێ ببێتە

شەڕی قڕکردن و ساتەوەختی قەتلوعام، هەروەک ئەوەی باسی کوشتارگەی مەغۆل و خاچدارەکان دەکرێ.

ئەوەش تەنها دەربڕینێکی فانتازیا و سەرەڕۆیانە نەبوو، بەڵکو خواستێکی زووتێپەڕ بوو. عەززام پاشا و عەرەب مەبەستیان بوو بێتە دی. ئەوان دەمێک بوو ئەو مەبەستەیان هەبوو. هێرشی ئۆرشەلیم کە تیایدا سەد و پەنجا هەزار هاووڵاتی جوولەکە بۆ ژیانی خۆیان جەنگان، زۆر شێوەیان پێکهێنا. لەبەرەی پێشەوە چوار لەسەر پێنجی بەشی شارەکە کە جووی تێدا دەژیا لە لایەن تۆپخانە و ترۆمبێلی چەکدار کە بەریتانییەکان لێیان دەخوڕین و هی سووپای عەرەبی ئوردن بوون، دابارین، ئیدی شەڕێکی سامناک لەبرەودا بوو. یەکەکانی هەمان هێز هەوڵیان دەدا ئەو ڕێگا خێرایەی ئۆرشەلیمی بە تەل ئەبیب و دنیای دەرەوە دەبەستەوە ببڕن. ئەوان پێشتر لوولەکی ئاویان بڕیبوو کە خەڵکی بەرگریکار پشتی پێبەستبوو. تیپێکی عەرەبی فەلەستینیش، کە سووپای نیزامی عێراقی ڕاهێنەریان بوو، ئەو خاڵە گرنگ و بەرچاوانەیان گرتبوو، کە بەسەر ڕێگای ئۆرشەلیمدا دەیانڕوانی، لەوێشەوە ئەو ترۆمبێل و بارهەڵگرانەیان بۆمباران دەکرد کە هەوڵیان دەدا خۆراک و پێداویستەکان بگەیەننە شارە ئابلۆقە دراوەکە. دێر یاسینیش وەک گردێکی ستراتیژی و دێیەکی قەلاکە، یەکێک بوو لەو خاڵە گرنگانە.

لە ڕاستیشدا دوو گوند کە لە ڕووی سەربازییەوە بە یەکەوە گرێدرابوون، لە ڕێی دێریاسینەوە هێز بۆ قەلاکە دەچوو و گردەکانی پێ قایم دەکرا. هاگانا هێزی بەرگریکاری جوولەکە دوای شەڕێکی قورس، کە تیادا زۆر پیاوی خۆی لەسەر دانا، توانی قەلایەکی بەرزی قایم بگرێ. دێر یاسینیش وەک ئەوێ چەپەرێک بوو، خانووە بەردینەکانی ببوونە سەنگەر. وەک بەشی خۆی لە نزیکبوونەوەی شەڕی ئۆرشەلیم، دووهەمین -کە بچووکترینیش بوو- هێزی نیمچە سەربازی، ئێرگون زاڤای لیومی (بە ئێرتزل و یان ئێرگونیش ناسراوە) بڕیاری پەلاماری دێر یاسین بدا. سەد ئەندامی خۆی بۆ ئەو مەبەستە دەستنیشان کرد.

ئەوێ ڕۆژێ، بەر لەوەی ئیسرائیل ببێتە دەوڵەت، بەرگریکارە جوولەکەکان سووپایەکی نیشتمانی یان سەرکردایەتییەکی یەکگرتوویان نەبوو. ئەوان لە ڕووی چەک و تفاقیشەوە هەژار بوون، چەکی سووکیان هەبوو، هەندێ

کەلوپەلی پزیشکییان هەبوو، بە کردەوەش کەرەستەی بە یەکەوە گەیاندنیان نەبوو. هەڵمەتی پەلاماردانی دێر یاسین ناوازە بوو. هەندێ لە ئەندامانی هێرشەکە تفەنگیان پێ بوو، هەندێکیشیان دەمانچە، کەمێکیان تفەنگی ستێنیان پێ بوو، قورسترین چەکیش لەو پەلامارەدا ڕەشاشی برێنی سووک بوو. بۆ شەڕی دەستەویەخەش نارنجۆکی دەستیان پێ بوو؛ بۆ برینداره‌کانیش دوو حەبی سلفور بۆ هەر یەکێک لەگەڵ باندجێک. هەندێک لە پیاوەکان هەرگیز پێشتر شەڕی نەبینیبوو، ئەوەش یەکەمین ئەزموونی تەقەکردنی بوو.

لەگەڵ ئەوانیشدا بارهەڵگرێکی سەرکراوە یاوەری دەکردن، کە بڵندگۆیەکی لەسەر داندرابوو. لە سەرەتای کازیوەی بەیانی ١٠ی ئەپریلی ١٩٤٨دا، لە دەروازەی ئاواییەکە نزیککەوتنەوە، بڵندگۆکەش بە عەرەبی ئاگاداری سەرنشینە مەدەنییەکانی کردنەوە لە ناوچەی مەترسی، هەر کاتێک شەڕەکە دەستپێکرد، دووربکەونەوە. هەر کەسێک چۆڵی بکا ژیانی دەپارێزرێت، ئەوەی واش نەکا ئەوا ئۆباڵەکەی دەکەوێتە ئەستۆی خۆی. ئاوەها دووسەد گوندنشین هاتنەدەر و لە دامێنی گردەکەدا کە دێر یاسینی بە سەردا دەڕوانی، خۆیان شاردەوە. هیچ کامێک لەوان لە ماوەی شەڕەکە و دوای شەڕەکەش کەمترین زیانیان پێنەکەوت، دوای ئەوەش هەر هەموویان گواسترانەوە گەڕەکێکی عەرەبان لە ڕۆژهەڵاتی ئۆرشەلیم و لەوێ ئازاد کران.

بە کردەوەش شەڕی دێر یاسین بە فرت و فێڵێکی نموونەیی عەرەب دەستی پێکرد، کە بۆ ئەو مەبەستە ڕاهێندرابوون. عەرەبە فەلەستینییەکان و قۆشەنێکی لە سووپای سەربازی عێراقی لە خانووەکانی نزیک دەروازەی گوندەکەوە ئاڵای سپییان هەڵکرد. کاتێکیش پێشەنگی یەکەی ئیرگون لێیان چووە پێش، یەکسەر تەقەیان لێکردن. یەکێکیان لە پێشەوە ئەنگاوت کە فەرماندەیەکی ئیرگون بوو. ئیدی شەڕێکی کوشندەی ماڵ بەماڵ دەستیپێکرد. لە نێوەراستی شەڕەکەدا تەقەمەنی ئیرگونەکان بڕا، بەڵام بەباشترین شێوەش جەنگان، لە ڕێی ئەو خانووەی یەکەمجار دەستیان بەسەردا گرت هەندێ گوللە و نارنجۆکیان دەستکەوت. زۆر لە خانووە بەردینەکان بەرگرییەکی سەرسەختانەیان کرد، هەر ئەو کاتیش دەگیران کە نارنجۆکیان لە پەنجەرەکانەوە بۆ فڕێدەدانە ژوورەوە. هەندێک لە سەربازانی قۆشەنی

عەرەبەکان، کاتێ شەڕەکە خەریکبوو کۆتایی دەهات، هەوڵیاندا بە جلوبەرگی ژنانەوە ڕابکەن. کاتێکیش لێیان نزیک دەبوونەوە، دەستیان بە تەقەکردن دەکردوە. دەرکەوت کە جلی سەربازی عێراقیان لەبن جلی خۆداپۆشینی ژنانە بۆ نەناسینەوە، لەبەردا بوو.
کاتێکیش شەڕەکە کۆتایی هات، یەکەی ئیرگون لەوەدا سەرسام بوو کە چل و یەک برینداری هەن، چوار لەوان برینەکایان کوشندە بوون. لە کاتی گرتنی خانووەکانیشدا شتێکی سامناکیان بینی، ئەوەیان بینی کە لە پاڵ سەربازەکانی عێراقی و عەرەبە فەلەستینییەکان جەستەی ژن و منداڵانی گوندنشینانیش لەو گۆڕە کەوتوون. ئەو گوندنشینە بەدبەختانە دیارە متمانەیان بە سەربازە عەرەبەکان کردبوو کە نابەزن، یاخود ڕێگەیان لێگیرا کاتێ ئەوانی دیکە دەرفەتی چۆڵکردنی گوندەکەیان بەر لە دەستپێکردنی تەقەکردن، بۆ هەڵکەوتووە، یان بەڵکو لە ڕۆیشتن ترسابن. ئیدی بەهەر هۆیەکەوە بێ، ئەوان قوربانی بێ تاوانی شەڕێکی دڵڕەقانە بوون، بەرپرسیارێتی تەواوی ئەو ڕووداوەش دەکەوێتە ئەستۆی سەربازانی عەرەب، کە ئەرکیان لەبن باری ڕێساکانی شەڕدا، ئەوە بوو کاتێک دێر یاسینیان دەکردە مۆڵگەیەکی سەربازی، گوندنشینەکانیان دوورخستبانەوە.
دوای شەڕەکە، سەرجەم زیانەکانی عەرەب بە سەربازەکانیشەوە دووسەد کەس بوون. یەکەی ئیرگون بەو کەرەستە داودەرمانە سنووردارەی خۆی، ئەوەی لە توانایدا بوو بۆ بریندارە گوندنشینەکانی کرد، بەر لەوەی بیانگوازێتەوە نەخۆشخانەی ئۆرشەلیم.
ئەوەش ڕاگەیەندراوی یونس ئەحمەد ئەسەد، گوندنشینێکی دیاری دێر یاسین کە لە شەڕەکەدا قوتاری ببوو:
"جووەکان هەرگیز مەبەستیان نەبووە خەڵکی ئاواییەکە ئازار بدەن، بەڵام ناچارکران، ئەوەش دوای ئەوەی دوژمنەکەیان لەنێو خەڵکەکەوە تەقەیان لێکردن و فەرماندەیەکی ئیرگونیان کوشت."
لە ڕۆژنامەی "الاردن" ی ژمارەی ڕۆژی ٩ی ئەپریلی ١٩٥٥دا شتێک بڵاوکرایەوە. تەنها ئەو نادروستیەی سەبارەت بە فەرماندەکەی ئیرگون تێدابوو: بێگومان ئەسەد بینی ئەو لە پەلامارەکەدا کەوت، بەڵام دوایی قوتاری بوو.

ئەو پەلاماردەرانە، تەنانەت دوای لە دەستدانی تـوخمی لەپڕ بەسەرددان، هەروەها وەک شتێکی ڕوون و بەرچاویش، سەرکێشی بۆ خۆبەدوورگرتن لە زیان، ئەوان بەر لە هێرشکردنەکەیان خەڵکەکیان ئاگادارکردنەوە، ئەوەش لە نامیلکەیەکی سکرتێری گشتی کۆمکاری عەرەبیدا دانی پێدانراوە، نامیلکەکە بەناوی "دەستدرێژییەکانی ئیسرائیلی" بوو لەلاپەڕە ١٠یدا ئەمەی خوارەوە هاتووە:

"شەوی ٩ی ئەپریلی ١٩٤٨، دێر یاسین ئەو گوندە ئاشتیخوازانەی عەرەب، کە دەکەوێتە کەناری ئورشەلیم، لەپڕ بە دەنگی بڵندگۆ بێدار دەبنەوە، کە ئاکنجییەکان ئاگادار دەکەنەوە دەستبەجێ گوندەکەیان چۆڵ بکەن."

❖

گۆبەندی "ئەلتالێنا" بە بەندی "هەرگیز بۆ براکوژی" پەیوەستە. دوای بیست ساڵ بەسەر تێپەڕینی ئەو تراژیدیایەدا، کەسێکی نزیکی بەڕێز بنگۆریۆن لەسەر دەستپێشخەری خۆی هاتە لام و ئەم وشانەی خوارەوەی پێگوتم: "ئێمە گەیشتینە ئەو بەرەنجامە کە لە پرسی ئالتالێنادا بنگۆریۆن بەهەڵەدا براوە".

لە هاوینی ١٩٧١دا گفتوگۆی نێوخۆیی سەبارەت بە لێکجیابوونەوە، پرسی ئالتالێنا دەستی پێکرد یاخود بوژایەوە. هەڵبەتە پرسەکە هێشتاش کۆتایی پێنەهاتووە. لەودیو هەموو گومانێکەوە ئەوە دەرکەوت کە پردی دژبەری نێوان ڕاگەیاندنی ئاشکرای بەڕێز بنگۆریۆن و بەڕێز گالیلی هەڵنەبەستراوەتەوە. بەڕێز گالیلی دەنووسێ: "لە هەموو قۆناغەکاندا بە نووسین و زارەکی ڕاپۆرتم دایە سەرۆوەزیر و وەزیری بەرگری، بەتەواوی سەبارەت بە کۆبوونەوە لەگەڵ سەرانی ئێرگون زڤای لیومی بە کۆبوونەوەی شەوەکەشەوە، بە وتووێژە چڕەکان و کۆبوونەوە لاوەکیەکانیشەوە."

"کۆبوونەوەی شەوەکە" لە بارەگای سەرەکی ئێرگون، لە ١٤ی حوزەیرانی ١٩٤٨دا گفتوگۆ کرا کە لە لایەن حکوومەتی کاتییەوە بەڕێزان گالیلی و ئەشکۆل نوێنەرایەتی کرا، هەموو وردەکاریەکی کەشتیەکە، پیاوەکانی و چەکەکانیشی تاوتوێ کرا. ئەوێ شەوێ، چوار ڕۆژ بەر لەوەی کەشتی ئالتالێنا بگاتە کەنارەکانی ئێرتز ئیسرائیل، وامان جاڕدا کە گەیشتنی کەشتیەکە پابەندە بە بڕیاری حکوومەت. ڕۆژی دواتر، سەعات ١٠ی

سەرلەبەیانی، بەڕێز گالیلی نوێنەری دەسەڵاتپێدراوی وەزارەتی بەرگری ئەم ڕاگەیاندنەی پێدام: "ئێمە بڕیارمانداوە کە ئاتالینا بێت و تا بشکرێ خێرا بێ." کەواتە ئەوە بۆ یەکەمین جار سەلمێندرا کە ئیرگون بەوە لە لایەن تەواوی نەوەکەوە تاوانبار دەکرا ئەتالینا لەپێناوی ئەوەدا بهێنێ جڵەوی حکوومەت بگرێتە دەست، دیاربوو یاخیبوونەکەی بە زانیاری و ڕەزامەندی تەنانەت فەرماندەیی  حکوومەتی کاتی بووە...

بە پێچەوانەی بەڕێز گالیلی، بەڕێز بنگۆریۆن کە سەرۆوەزیر و وەزیری بەرگری بوو، ئەوەی دووپاتکردەوە کەتا ١٩ی حوزەیرانی ١٩٤٨دا بە هاتنی ئاتالینای نەزانیوە. تۆ بڵێی لەو چوار ڕۆژە دژوارەدا چی قەومابێ؟ ئەدی کێ ڕێگەی بەو نوێنەرە دەسەڵاتپێدراوەی وەزارەتی بەرگری داوە، کە قسەی ئەرێیانە لەکۆبوونەوەکەدا بکا؟  خۆ ئەگەر ئەو لە لایەن سەرۆوەزیرەوە دەسەڵاتی پێدرابێ بڕیارەکەی بگەیەنێتە من بەوەی ئاتالینا بەوپەڕی خێراییەوە بگاتە جێ، ئەی چۆن بەڕێز بنگۆریۆن دەڵێ کە تەنها چوار ڕۆژ دواتر بەو کەشتیە پڕچەکەی زانیوە؟

تا ئێستاش وەڵامی پێویستی ئەو پرسە نەدراوەتەوە. دەبێ ئەوەی بەبیربێتەوە کە من لە کاتی نووسینی ئەم کتێبەدا هەمان پرسیارم نەوروژاندووە. ئەو دوو ڕاگەیاندنە دژیەکانە کە پێشتر دراون هێشتا جارنەدرابوون. کەواتە ڕاستی ڕووداوەکە بەو پەڕی سەرکەوتنەوە بەرەو پێشەوە دەچێ.



لە شەوی شەممەی (شابات)ی ١٥ی ئایاری ١٩٤٨دا، من ڕاستەوخۆ و یەکەمجار لە ڕادیۆدا بۆ نەتەوەیەکی بچووکی جەنگاوەری ئازادکراو ئەو چەند وشانەی خوارەم گوتن:

"نیشتمان لە ڕووی مێژوویی و جوگرافییەوە شتێکی لە یەک دانەبڕاوە. هەر کەسێ مافەکانمان لە سەرتاپای نیشتمانەکەمان نەناسێتەوە، ئەوا مافەکانمان لە هیچ هەرێمێک ناسێنێتەوە. ئێمە دەبێ خاوەنی ڕوانینی هەموو ئازادییەکە بین. ئێمە دەبێ هەڵگری ئەوپەڕی ڕزگاربوون بین، هەر دەبێ ئەو شتەش بهێنینە دی. کاتێ ڕۆژەکەی دێ، ئێمە دەبێ بەرجەستەی بکەین. ئەمەش ڕێسایەکی دیرۆکییە: ئەو هێڵەی دەڕوا یاخود لە لایەن کەسێکەوە وەک

هێڵێکی لێکجیاکردنەوە لەنێوان دەوڵەتی نەتەوەیی و وڵاتی گەلدا دەکێشرێ، ئەوا وەک هێڵێکی دەستکرد دەبێ هەڵگیرێ و ون ببێ.
هەر ئەوەش لە نێوان ٥ و ١١ی حوزەیرانی ١٩٦٧دا ڕوویدا. لەوکاتەوە ئەرکمان، بە باوان و ڕۆڵەکان ئەوەیە، ئەو هێڵەی دەستکردەی نەماوە لێنەگەڕێین هەرگیز بکێشرێتەوە. ئێمە نابێ واز لە مافە سروشتی و نەمرەکانی خۆمان بێنین.

١٩٧٢
م. بێگن

## دەستپێک

من ئەم کتێبەم بە پلەی سەرەکی بۆ گەلەکەم نووسیوە، نەبادا جارێکی دیکە -هەروەک کارەساتبارانە لە رابردوودا وایکردبوو- ئەو ڕاستیە سادەیە لەبیر بکا: کە شتگەلی گرنگتر لە ژیان و سامناکتریش لە مردن هەن.
بەڵام کتێبەکەم بۆ خەڵکی غەیرە جوولەکەش نووسیوە، بەڵکو بە نابەدڵیش دەرکیان بەوە کردبێ، یاخود ئامادەن چاوپۆشی لەو ڕاستیە بکەن، کەوا لە خوێن و ئاگر و فرمێسک و خۆڵەمێشدا نموونەیەکی نوێی مرۆڤایەتی لەدایکبووە، نموونەیەک کە بە تەواوی نائاشنایە بە جیهانی هەشت سەد ساڵ لەمەوبەر، ئەویش "جوولەکەی جەنگاوەر"ە. ئەو جوولەکەیەی، کە جیهان پێیوابوو مردووە و جارێکی دیکە هەڵناسێتەوە، هەڵسایەوە. چونکە ئەو لەو "ڕاستییە سادەیە"ی ژیان و مەرگ تێگەیشت، هەرگیزیش جارێکی دیکە نابێ دابەزێتەوە نێو چاڵ و لەسەر گۆی زەوی بسڕدرێتەوە.
لەنێو خوێنەرە غەیرە جووەکانیشدا، دەمەوێ پەیامێکی تایبەت ئاراستەی خوێنەری بەریتانی بکەم. ئەو لە دووتوێی ئەم کتێبەدا چەند برگە و کۆپلەیەک دەخوێنێتەوە، کە وشەی زەق و ڕەق و حەق و توندی بەرامبەر هەندێ لە دەسەڵاتدار، سیاسەتوان و ئاژانە بەریتانییەکان تێدایە؛ لەوەدا ڕەنگبێ هەست بکا هەندێ ڕەخنەش بەرۆکی ئەو وەک هاووڵاتییەکی دەنگدەر لەو دەوڵەتە دیموکراسییەدا بگرێتەوە. ئیدی نابێتە مایەی سەرسامی کە خوێنەرەکە بەرەو دژایەتی نووسەر و کتێبەکەدا بشکێتەوە. خۆ دوای هەموو شتێکیش، نووسەرەکە بۆ چەندان ساڵ دژی دەسەڵاتداریتی بەریتانیی وەستاوەتەوە. ئەو لە لایەن ڕۆژنامە بەریتانییەکان، لە لایەن ئەندامانی

پەرلەمان، وەزیرەکان، ژەنەراڵەکان، قەشەکان، پاریزەرەکانیان و هەموو ئەوانی دیکەدا بە کەسێکی دراماتیکی ناسرا کە فیکەی دەستپێکردن بۆ خەڵکی رەشوڕووتی وەک "تیرۆرستێکی نمرە یەک" لە نێو ئیرتز ئیسرائیلدا لێدەدا.
حەز بەوە ناکەم گوێچکەی خوێنەر بەو هەموو ناو و ناتۆرە ناشیرینانەی دیکە لە ماوەی خەبات و ململانێکەدا کە نراوەتە پاڵم، بیەشێنم. خۆ ئەو بە ئاسانی دەتوانێ لە وشەدانی فەرهەنگێکی دەوڵەمەندی نێودەوڵەتی بگەڕێ و بە ئارەزووی خۆی ناوەکانی لێدەربهێنێ. شتێکی زۆر سروشتییە، زۆر خوێنەری ئینگلیز دڵسافانە ئەو پرسیارە بکەن: تۆ بڵێی ئەو جۆرە پیاوە چیمان پێ بڵێ؛ تۆ بڵێی بەدەر لە پەیامی ڕق و کینە، چیدیکەمان بۆ باس بکا؟

دەبا جارێ بەبێ ترس، بێ مەیل و بێ لایەنکاری هەوڵی لێتێگەیشتنی وشەی ڕقوکینە لەو پەیوەستیەدا بدەین. خوێنەری بەڕێز، دەکرێ تۆ لێم بپرسی: ئایا لە چالاکییەکەماندا، لە شۆڕشەکەمان دژی دەسەڵاتی بەریتانیای سەر وڵاتەکەمان، ڕق و کینە هەبووە؟ هەروەها ئایا ئەو هەست و سۆزەی لە دووتوێی ئەم کتێبەدا کە لە لایەن پیاوێکەوە نووسراوە، کە خۆی ئۆباڵی بەرپرسیارێتی و دەرکەوتەکانی نووسینەوەی ڕاستیەکانی شۆڕشەکەی لە ئەستۆدایە، ئەو شتەی دەبڕیوە؟
وەڵامێکی ڕاستگۆیانەی ئەم پرسیارە: "بەڵێ" یە.
بەڵام ئاخۆ ئەو جۆرە ڕق و کینەشی بەرامبەر گەلی بەریتانیا هەیە؟ وەڵامە ڕاستگۆیانەکە: "نەخێر" ە.
شتێکی حاشاهەڵنەگرە ئەوانەی دەجەنگن دەبێ ڕقیان لە شتێک یان کەسێک بێتەوە. ئێمەش جەنگاوین. ئێمە دەبوایە بەر لە هەموو شتێک و پتر لە هەموو شتێکیش ڕقمان لەو لاوازی (بەستەزمانی)یە دێرین و نارەوا و سامناکەی خۆمان بێتەوە، کە بە هەزاران ساڵ بە نێو جیهانی دڵڕەقدا ڕۆیشتووە و

لەویشــەوە بــۆ نێــو ئەو زۆریــنەی ئــاکنجییە جــوولەکە بــێ دەرەتانــانەدا تێپەڕیــوە، کە خــۆی لە خۆیــدا ڕێخۆشــکەرە بــۆ ئەوەی گەلەکوشــتاریان لــێ بکــرێ. ئــێمە دەبــوایە ڕقمــان لە شەرمەزارکردن و بەسووک سەیرکردنی گەلە بێ نیشتمانەکان بهاتبــایەوە. ئــێمە دەبــوایە هەر وەک هەر نەتەوەیەکــی تەندروســت، ڕقمــان لە دەســەڵاتی بێگــانە لە ڕێســا، نــادادی و نــاڕەوایەتی دەســەڵاتی بێگانە لە نیشــتمانی بــاب و باپیرانمــان، لەنێــو وڵاتەکەی خۆمانــدا بهاتبــایەوە. دەبــوایە ڕقمــان لەوە ببێتەوە، کە دەرگاکانی نیشتمانەکەی خۆمان لەسەر براکانمان داخــرێ، بەو خــوێن لەبەر ڕۆیشــتن و فرمێسکانەشــەوە هەر هاواراهاواریانە بۆ جیهانێک، کە لە ڕووی مۆڕالەوە کەڕە.

هەڵبەتە شتێکی سروشتیشە دەبوایە ڕقمان لەو هەموو کەسانە بێتەوە، کە بەو پەڕی کەرەس و تفاقی هــاوچەرخەوە چەکدار کراون و هەمان سیستمی لەسێدارەدانی پێشوشیان هەرماوە و ڕێگای ڕزگاربوونی جەستەیی لە گەلەکەمان دەگرن، نکولی لە واتــای بەرگــری لەخۆکردنیــان لێدەکەن، هەوڵــی بێهــودەکردنی ســەربەخۆییان دەدەن و بێبەزەییانەش ڕێگرن لە هەمبەر ئەو هەوڵانەی دەدرێن بــۆ ئەوەی نامووســی نەتەوەییــانە بەدەســت بهێننەوە و یەکڕیزی خۆیان نۆژەن بکەنەوە.

ئــاخر کێ ئەو ڕق و کینەی ئەهــریمەنە شــەرمەزار ناکــا، کە لە خۆشــەویســتی و باشــی و دادەوە هەڵدەقووڵێ؟ ئەو جۆرە ڕقە دنەدەری هێــزی بەرەوپێشــوەچوونی مێــژووی جیهــان بــووە. ڕەوڕەوەی پەرەســـەندنەکانی مرۆڤــایەتی "بە ئاشــتی نەبــووە بەڵکو بە شمشێر" بووە.

ســـەبارەت بە دۆزەکەی ئــێمەش، ڕقــوکینە شــتێکی نەکەم نە زیــاتر نەبــووە لە نمایشــی بەرزتــرین هەســتی مرۆڤایەتیــدا، کە خۆشەویستییە. بۆ ئەوەی تۆ ئازادیت خۆش بوێ، دەبێ ڕقت لە کۆیلایەتی ببێتەوە؛ ئەگەر گەلەکەت خۆش بوێ، نابێ ڕقت لەو دوژمنە نەبێتەوە کە هەر لەسەر وێرانکاریەکانی سوورە،

خۆ ئەگەر نیشتمانەکەت خۆش بوێ، نابێ ڕقت لەوانە نەبێتەوە کە نیشتمانەکە بەخۆیانەوە دەلکێنن. سووک و ئاسان: ئەگەر دایکەکەت خۆش بوێ، ئایا ڕقت لەو پیاوە نابێتەوە کە هەوڵی کوشتنی دەدا: ئایا لێی دەهەری نابێ؟ ئایا بەهەر نرخێکیش بێ لە دژی ناجەنگی؟ گەر پێویست بێ ژیانیشی لەسەر دانانێی؟

ئەمەش بنەماترین پرسی مرۆییە لە بارەی توندوتیژی و جیهانە گێژاوەکەی ئەمڕۆ. لێگەڕێ با هەموو پیاوێکی جوامێر بەناو گیانی خۆیدا بگەڕێ و وەڵامێکی جوامێرانە بداتەوە. چونکە لە کۆتاییدا هیوای هەر گەلێک لەوەدایە، ئاخۆ تا چەند ڕۆڵەکانی ئامادەن گیانی خۆیان لەپێناو "دایکەکانیان" لەپێناو ئازادی کە خۆشیان دەوێ، لە دژی کۆیلایەتی، کە مرۆ ڕقی لێیەتی و هەر دەبێ لەپێناو خۆشەویشتیشدا ڕقی لێببێتەوە، بەخت دەکا.

دانەرەکە ئەم چەند دێڕە سەرەتاییانەی بۆ ئەوە نەنووسیوە تا وشە ڕەقەکان لە ڕاستییە تاڵەکان پەستتر بکا. ئەو ئەم چەند دێرانەی بە شێوەیەک نووسیوە، کە شێرازەی سەرجەم کتێبەکەی لەسەرە، ئەمەش هەمووی لەپێناوی ڕاستی دایە. هەر ڕاستیش وایلێکردووە لە بەردەم خوێنەرەکانی خۆی، لە بەردەم خوێنەرە غەیرە جووەکان، خوێنەرە نەیارەکانیدا پرسێک تاقیبکاتەوە: ئەگەر هات و جارێکی دیکە گەلەکەت خۆی لە باروودۆخێکی وادا بینیەوە، ئایا تۆ جارێکی دیکە دەچیتەوە "خەباتی ژێرزەمینی"؟ دەجەنگی؟ وادەکەی وەک یاخییێک ڕاوت بنێن؟ ئایا ئەوەی لە ڕابردوودا دەتکرد، دەیکەیتەوە؟

وەڵامەکەش گردەبڕانە: "بەڵێ" یە.

م.ب

## بەندی ١
## دەروازەی سەربەستی

٣٤ - ٤٩

شەوی یەکەمی ئەپریلی ١٩٤١، لە باڵەخانەیەکی ویلنۆدا کە پێی دەگوترا لوکیشکی، بێدەنگی سەر ئەو دامەزراوە سەیرەی پڕ ژان و ناسۆری مرۆڤایەتی و زیندانییەکان شکا. دەرگای زیندانەکان خرانە سەرپشت، هەر هەراوزەنای کۆت و بەندی پێ و مەچەکمان بوو دەکرانەوە، ڕۆژ ڕۆژی حەشر بوو. هەر دوو دوو لە هاوزیندانەکانم بەسەر تراشاوی و ڕەنگ بزرکاوییەوە دەهاتنە دەر و ڕاستەوخۆش دەبردرانە بەردەم مێزێک، کە لە نێوەڕاستی دالانێکی درێژکۆلەی تاریکدا بوو. لە پشت مێزەکەشەوە دوو پیاوی بێدەنگ دانیشتبوون، لە بەردەمیشیاندا بارستە فایلێک داندرابوون، کاغەزی پەڕپووتیان تێدابوو، کە دەکرا هی ئاودەست یان داواکاری وەزارتی باج بن سەبارەت بە باجی شارەوانییەوە.
ئەوێ شەوێ منیش یەکێک بووم لەو کەسانەی هێنرانە دەرەوە و لە بەردەم مێزەکەدا وەستێندران. یەکێک بووم لە نێو زۆران، یەکێک بووم لەنێو هەزاران کەس، پێوانەی هەزارن نموونەی ئەشکەنجە و ژان و ناسۆر بووم، کە باڵی بەسەر ئەوروپادا کێشابوو، لە ڕۆژئاواوە بۆ ڕۆژهەڵات، لەو کاتەی نازییەکان لە سەرکێشیی و وێرانکارییان دژ بە جوولەکەکان جڵەوی خۆیان لە دەستدابوو. من لەگەڵ هاوزیندانیەکانمدا کەسانێکی نامۆ، کە هەر دەکرا لە ڕێی خەیالپلاوی ئەکرۆباتیکەوە بەیەک بگەین، بەرەو مێزەکە دەڕۆیشتین. کاتێکیش نۆرە گەیشتە سەر من، بۆ سەدەمین جار ئەوەم دووپاتکردەوە، کە ناوم مێناحیم وۆلفۆڤیچ بێگنە. پیاوەکەی پشت مێزەکەش سەیری نەکردم. یەکێک لەوان لە بارستە فایلەکانی سەرمێزەکە گەڕا، ئیدی ئەوەی بە دوایدا دەگەڕا، دۆزیەوە و دایەدەستی هاوڕێکەی، ئەویش بە دەنگێکی بەرز ئەمەی خوێندەوە:

"کۆمسیۆنی باڵای چاودێری کۆمۆمسیاری گەل بۆ کاروباری نێوخۆ، ئەوە دەبینێ، کە مێناحیم وۆلفیڤیچ بێگن، توخمێکی مەترسیدارە لەنێو کۆمەڵگە و بۆنەکانی، بۆیە بڕیاری ئەوەی بەسەردا درا، بۆ ماوەی هەشت ساڵ زیندانی بکرێ و بنێردرێتە ئۆردوگای ئیش بۆ چاکسازیی."
لە خۆوە گەوجئاسا شتێکم بەسەر دەمدا هات "یەکەمی ئەپریل." ئەو پیاوەی کاغەزەکانی بەدەستەوە بوو، کورتە نیگایەکی تێبڕیم، بەڵام بەڕێزەوە پێشی گوتم:
"تکایە واژۆ بکە."
منیش بێ باکانە وەک زۆری دیکە کردیان، واژۆم کرد. هەشت ساڵ؟ ئۆردوگایەکی زۆرەملێ لە شوێنێکی دوورەدەست؟ شوێنەکەش ئەوەندە دوور بوو ئەوەندەش تەمومژاوی بوو. لەو کاتەشدا بیرۆکەیەکت بەمێشکدا دێ، دەشبێ "ڕەچەتەکە" واژۆ بکەی. هەروەک ئەوەی تۆ پیاوی پیسایی پاککەرەوە بیت یاخود خواستە باجی شارەوانی وەزارەت.
ئیدی ئەو کات هەڕەتی سەردەمی ڕۆژە کورت و شەوە درێژەکانی ئەو ماوەیە بوون، کە من بەوپەڕی شکۆوە بەوە تاوانبارکرابووم، کە یاریدەرەێکی گرنگ، ئاژانێکی تایبەتی بەریتانیای مەزن بووم.
ڕۆژەکانی ئەوێم بە خەیاڵی دوانەیی بەسەر دەبرد: ئیدی لەنێو ژوورەکەدا لە دیوار بۆ دیوار یان لەپەنجەرە بۆ دیوار دەهاتم و دەچووم، بیریشم لە ڕابردوو بۆ سەر ئێستا و بۆ ئایندەیەکی نەزانراو ڕۆیشتبوو. ئەو جۆرە داڵغانە وا لە زیندانیی دەکەن باری فیزیکی دەوروبەری خۆی لەبیر بچێتەوە؛ واشی لێ دەکا شێوە واقعێکی تارماوییانەی بە دەوری داخوازییەکانی خۆی ڕۆ بنێ. ئەوانە وای لێدەکەن ڕۆژەکانی زیندانییەکە وا کورت بکەنەوە، بە شێوەیەک ئەو کەسەی لە دەرەوەیە و ئەزمووونی زیندانیی نییە، خەیاڵی بۆ نەچێ. ڕۆژەکانی زیندانی وەک خەونە تێپەڕیوەکان وان. لە ڕاستیدا ئەوان ڕێکخراوترین ڕۆژانێکن کە بە بیری مرۆدا هاتبێتەوە. ئەو ڕۆژانە بە شتی چاوەڕوانکراوەوە ئاوسن. هەر لە کەڵەباب خوێندنی کازیوەوە تا ڕۆژئاوابوون، هەمیشە زیندانییەکە چاوەڕێی شتێک دەکا. هەستی چاوەڕوانییەکە پڕ و بەهێزە، بە جۆش و خرۆشە، ئەوەش لەبەر هۆیەکی زۆر سادەیە، شتێکی هەرە بەرایە، کە ژیانی مرۆی لەسەر بەندە، ئەویش ژەمە

خواردنێک لە سپێدەدا. زیندانیەکە چاوەڕێی ژەمە خواردنێکی ناپەسەند و ئێوارەش لابردنی پاشماوەی پیسایی ژوورە زیندانیەکە و خاوێنکردنەوەی بوو. هەموو سێ ڕۆژ جارێک لەو جۆرە خۆراکە ناپەسەندەمان هەبوو. لەوەش ناپەسندتر غەریبی کردنی ئەو شتەش بوو. بارستەی خاشاکەکە و پیساییشیمان دووجار لە ڕۆژێکدا فڕێ دەدا. خۆ ئەگەر داڵغە دەروونییەکانی هەر ڕۆژێکیشی بخەیتەسەر، کە هەر مایەی پەکخستنی خۆشی و چێژ بوو، ئەوا تۆ وێنای تەواوی ڕۆژە زیندانیەکەت دێتە پێش چاوان. نەخێر، کاتێکیش ئازاد دەبی، ئەوا هەر وێنای ئەو ڕۆژانە نییە، لە یادەوریتدا کێشاون: ئەوانە ڕۆژانێکی بێ دەستپێک و بێ کۆتا بوون. ئەوانە ڕۆژانێکی کورت بوون؛ هەروەک ئەوەی خەونێک بێ و تێپەڕێ.

شەوەکانیش بە تەواوی جیاواز بوون. شەوەکان درێژ بوون، زۆریش درێژ. من مەبەستم لە شەو ئەوە نییە کە وات لێدەکا بخەوی: خەوی زیندان، ئەوسا چ لەسەر پێخەفە باریکێکی ئاسنین بێ یان ناوکەوی بەردین، ئەوە خەوێکی قووڵ و خۆشە. بەڵام خۆ لە زینداندا شەوانی خەولێزڕانیش هەبوون. ئەو شەوە خەولێزڕانانەی لوکیشکی[6] بۆ هەندێکیان درێژەپێدەری زیندانیەکەیان بوو، بۆ هەندێکی دیکەش کورتکردنەوەی ڕۆژەکانیان بوو... ئەو شەوانە شەوی لێکۆڵینەوە بوون. شەوی پرسیار و وەڵامی نێوان لێکۆڵەرەوە و زیندانییەکە بوون. هەمیشە ئەو لێکۆلینەوە سەعاتێک یان دوو سەعات دوای خەوتنی زیندانییەکە دەستی پێدەکرد. بەڵام هەرگیزیش زیندانیەکە نەیدەزانی ئاخۆ لێکۆڵینەوەکە کەی کۆتایی پێ دێ.

لە میانەی ئەو شەوە بێ کۆتاییانەی لێکۆڵینەوە و پرسیار و وەڵامەدا، منیش بەشدارییکی بەرفراوانی ئەو باسوخواس و دەمەتەقییانەی خوارەوە بووم: شۆڕشی ڕووسیا، بەریتانیا و زایۆنیزم، هێرتزل[7]، ژابۆتنسکی[8] و

---

[6] لوکیشکی بەندیخانەیەکی گەورەی پۆلۆنی بوو، لە ۱۹۰۷دامەزراوە، جێگەی هەزار زیندانی دەبۆوەوە لەگەڵ ۲۵۰ پاسەوان، لەوێدا زیندانییەکان چاوەڕێی لێکۆڵینەوەی دادگا و گواستنەوەیان بوون بۆ زیندانێکی دیکەی هەمیشەیی.(وەرگێر)

[7] د. تیۆدۆر هرتزل (۱۸۶۰-۱۹۰٤) دامەزرێنەری بزوتنەوەی نوێی نیشتمانی جوولەکە بوو کە بە زایۆنیزم ناسرا.

[8] ڤلادیمیر ژابۆتنسکی (۱۸۸۰-۱۹٤۰) سەرکردەی ناسیۆنالیستە جوومکان بوو، ئەو کەسەبوو کە ڕێنماییەکانی بوونە مایەی دامەزراندنی ڕێکخراوی ئیرگون زڤای لیومی.

کۆبوونەوەی وایزمەن[9] لەگەڵ مۆسۆلینی، کۆمۆنەی ڕووسی و کیبوتی جوولەکەکان، دەربارەی بزووتنەوەی لاوانی جوولەکە، دەربارەی مارکس و ئەنگلس، بوخارین و ستالین، سەبارەت سەرمایەداری، سۆشیالیزم و کۆمۆنیزم، دەربارەی تەلیسمی ژیان و مردن، دەربارەی بێ خودایی و زانست، دەربارەی شەڕی ناوخۆی ئیسپانیا و بەرەی جەماوەری فەڕەنسی، دەربارەی بیردۆزە ئایدیالیستییەکان و فەلسەفەی ماتریالی. هەندێک جار زیاتر لە دەمەتەقێ و وتوویژی ئازادانە دەچوو لەوەی لێکۆڵینەوەیەکی نێو زیندان بێ.
ئەوەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا دەکردم، پیاوێکی گەنج و درێژ و قۆزیش بوو، بە زۆریش وابوو لە ڕەفتارەکانیدا بەڕێز بوو. ئەو هیچ گومانی لە "تاوانباری"یەکەمدا نەمابۆوە، منیش تاوانبارکردنەکەیم پێ بێ واتا بوو. ئیدی پێویستی بە بەڵگە و گەواهیدەر نەمابۆوە. ئەو ڕاستییانەی کە من خەونم بە حاشالێکردنییان نەبوو، بەس بوون. هەر لە تەمەنێکی زووەوە باوکم کە بە دەستی نازییەکان سەری نایەوە، بە دەنگی ڕێتوێلی جارنامەی بڕوابوون بە خودا و سروودی نیشتمانی عیبری "هاتیکڤا" جۆشکرابووم، کە ئێمەی جوولەکە دەبێ بگەڕێینەوە ئێرتز ئیسرائیل.[10] ئەوەش نەوەک بۆی "بڕۆ"ین یاخود "بێین" بەڵکو بۆی "بگەڕێینەوە". ئەوەش جیاوازییکی مەزنە و مایەی لەباوەشگرتنە.
کاتێکیش گەورەبووم، وەک خوێندکار بوومە ئەندامێکی کارا لە بیتار Betar. بیتار بزووتنەوەیەکی لاوانی جەماوەری پێشەنگانە بوو، ڤلادیمیر ژابۆتنسکی، کە دوای هێرتزل مەزنترین کەسایەتی جوولەکە بوو، بەو پەڕی خۆشەویستی و لێزانین و ڕاستگۆییەوە دایمەزراند. ساڵێک بەر لە هەڵگیرسانی جەنگی دووهەمی جیهان، من بوومە بەرپرسی لقی بزووتنەوەکە لە پۆلەندا، ئەو وڵاتەی بە ملیۆنان جوولەکەی هەژار و نەداری تێدابوو، کە

---

[9] د. حایم وایزمەن سەرۆکی بەردەوامی ڕێکخراوی زایۆنیزمەکان لە ١٩١٩ەوە تا ١٩٤٦ و یەکەمین سەرۆک دەوڵەتی ئیسرائیلیش بوو.

[10] ئێرتز ئیسرائیل دەقاودەق "نیشتمانی ئیسرائیل دەگرێتەوە" ئەوەش هەر لە سەردەمی بایبلەوە وڵاتی دایکی ڕۆڵەکانی ئیسرائیل بووە. هەمیشەش ئەو وڵاتە چەوساوەتەوە تا ئەوەی لێکەوتۆتەوە کە هەر دوو کەناری ڕووبارەکەی ئوردن بە فەلەستین بناسرێ، ئەوەش دەبێ بگوترێ ئەوەک ڕۆژئاوای فەلەستین، بەڵکو ئەو هەرێمەش بە فەرمی لە لایەن سێ تیرە لە دوازدە تیرەی عیبری بەناوی ماناسە، گاد و ڕیوبن داگیرکراوە.

هەمیشە دەچەوسێندرانەوە و خەونیشیان بە زایۆن[11] دەبینی. هاوڕێکان و من هەموو هەوڵێکمان دا تا وەچەی نوێ بە شێوەیەک پەروەردە بکەین، کە نەوەک هەر بۆ ڕەنجدان بۆ ڕۆنانی دەوڵەتی جوولەکە ئامادە بن، بەڵکو لە پێناویدا بجەنگن، ئازار ببین و گەر پێویستیش بکا لە پێناویدا بمرن. لەو کاتەی ئێمە سەرقاڵی پەروەردەکردنی گەنجان و ڕێکخراوەکە بووین بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە ئێرتز ئیسرائیل بە بێ مۆڵەتنامەی بەریتانییەکان؛ لەوێدا، لە ئێرتز ئیسرائیلدا، پەیامی نەتەوایەتی جوولەکایەتی لە دایک بووەوە، کە دەستپێکێکی دەسەلاتی عیبریانە بوو، ئەویش ڕێکخراوی ئیرگون زڤای لیئومی بە خۆی و فەرماندەیی مەزن و ئەفسووناوی دایڤید رازیل و یادەریدەری ئەبراهام ستێرن بە بێدەنگی و جدیی و بڕواپێهەنەرانە هاتەکایە.
لێرەوە یەکەمین دژەهێرشێک لە بەرامبەر ئەوانەی هەوڵی لەناوبردنی ئێمەیان دەدا، دەستپێکرد. هەروەها بۆ هەمان مەبەست بەرهەمی یەکەمین لەشکری جوولەکانەشی لێکەوتەوە. کۆکردنەوەی چەک، مەشقپێدانی ڕێنماییکاران، شکاندنی سیاسەتی "خۆجلەوکردن"، کە سەرکردە جوولەکە میانڕەوەکان لە هەمبەر هێرشی عەرەبەکان پەیڕەویان دەکرد، کارێکی وای کرد دەروازەکانی وڵاتەکە تەلبەند بکرێ- ئەمەش بۆ من و بۆ هەزاران لاوی دیکە هەمووی ڕەوایەتییکی مەزن بوو بەرپەچی بدرێتەوە. بۆ یارمەتیدانی ئەم بارودۆخە و شان دانە بەری، گەورەترین زیدەماف و ئەرکێکی شکۆدارانە بوو، ئەرکێک بەرامبەر وڵاتەکەمان، کە خەڵکانی دیکە مەترسی ئەوەیان خستبووینە سەر لێمان بە تالان ببەن؛ ئەرکێک بەرامبەر گەلەکەمان، هەروەک هەستمان پێکرد و ڕاشمانگەیاند، کە لەسەر لێواری دۆزەخی لەناوچوون بوو. ئێمە هەوڵماندا ئەرکەمان بەجێبێنین.
لێکۆڵەرەوە دلۆڤانەکەم لە زیندانی لوکیشکیدا سەرلەبەری کارەکەی ئێمە لە ژێر تیشکی چرایەکی دیکەدا دەبینی. بنەما نمایشەکەی ئەو بۆ پرسەکەمان، زۆر بێ جێ بوو، بەڵام لایەنە دیالیکتیکیەکەی، کە بونیادی دامەزراندنەکەی لەسەر بنیات نرابوو هی ئەوە بوو بڵێم تەواوعەیار بوو. لە میانەی ئەو شەوە درێژانەی لێپرسینەوە لەگەڵ مندا، ئەفسەرە گەنجەکە پێیگوتم:

[11] زایۆن گردێکە لە ئۆرشەلیم (شاری قودس) هەروەها وەک هاوتای ناوی شارەکەش بەکاردەهێندرێ. وەرگێر.

"زایۆنیزم لە هەموو دارشتەی خۆیدا گاڵتەجاڕی و خاپاندنە، ئەو نمایشێکی لێبووکانەیە. ئەوەش ڕاست نییە، کە مەبەستی سەرەکی تۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی جوولەکە بێ لە فەلەستیندا، یاخود نیازی تۆ ئەوە نییە بە ملیۆنان جوولەکە ببەیتە ئەوێ. هەر دوو ئامانجەکە بە تەواوی هی جێبەجێکردن نیین و سەرکردە جوولەکەکانیش ئەم شتە باش دەزانن. باسکردن سەبارەت بە دەوڵەت، پەردە لەسەر مەبەستی سەرەکی زایۆنیزم هەڵدەداتەوە، ئەویش بەلاڕێدابردنی لاوانی جوولەکەیە لە پێگەی خۆیان لەنێوان شۆڕش لە ئەورووپادا خستنیانە بەر پێشنیازی ئیمپریالیزمی بەریتانیایە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. ئەوەش ماکی زایۆنیزمە. هەموو باقیەکی دیکە قەپێلکێکی دەستکردوە، بە مەبەست بۆ خاپاندن سازێندراوە. هەرچی دەربارەی خودی خۆشتە، هەی مێناحیم وۆلفۆڤیچ بێگن، تۆش ئەو ڕاستیە دەزانی و بە مەبەست ئەو خاپاندنە لەپێناو بەریاتانیای گەورە و بۆرژوازی نێودەوڵەتیدا دەکەی، یاخود تۆش یەکێکی لەو یارمەتیدەرە گەمژانە، کە خەڵک لە ئەرکی سەرشانی خۆی لە جەنگان دژی چەوساندنەوە، لاڕێ دەکەی. لە هەموو بارێکدا بە ڕاستی تاوانەکەی تۆ گەورەیە."

منیش هەوڵمدا شاشی لە نیەتەکانیدا بەدیار بخەم، هەوڵمدا بۆی ڕوون بکەمەوە، کە سووربوونی جووەکان لەسەر گەڕانەوە بۆ ئێرتز ئیسرائیل شتێکی قووڵ و ڕاستییە. ئاخر ئەو خۆگۆڕین و خۆنمایشکردنە چۆنە، کە نزیکەی دوو هەزار ساڵە جووەکان هەر بەدواوەین، لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دیکە، بە چەندان سەدە بگەڕێوە بۆ دواوە بۆ بەر لە سەرمایەداری و سۆشیالیزم، ئەوان هەر ئەو خەونەیان هەبووە؟ ئاخر چۆن زایۆنیزم هیچ نییە بێجگە لە گاڵتەجاڕی، کاتێک بنەماکەی بەندە بە گیانی نێوان جوو و ئێرتز ئیسرائیل، ئەوەش دەربڕینەکەی لە نوێژ و دروودەکانیان دەردەکەوێ و بە ملیۆنانیش قوربانیان لە پێناودا داوە؟ لە سەردەمی ئێمەشدا ئایا بە هەزاران لە سەرمایە و خۆشی خۆیان و لە خوێندنی زانکۆ و ژیاننامەی نایابیان لەپێناو کارێکی هەرەوەزی لە ئێرتز ئیسرائیلدا خۆش نەبوون؟

هەوڵەکانی من بە با دا ڕۆیشتن. بەڵگەوبەندەکانم نەوەک هەر بڕوای بە لێکۆڵەرەوەکە نەهێنا بەڵکو هێندەی دیکەشی توندتر کرد. ئەویش وای وەڵام دامەوە:

"ئەوەی تـۆ دەیڵێـی هەر رامـانەکەی ئـێمە پشتراسـت دەکـاتەوە. هەڵـبەتە هەسـتێکی سـۆزاوی لە نێـوان جووەکانـدا بـۆ فەلەسـتین هەیە، ئەو بەرهەمە پەروەردەیـیە خۆیشـی بەرەنجـامی پەرەسـەندنێکی مێـژووی دیـاریکراوە. بە دەقـاودەقی ئەو هەسـتە کە هێرتـزل وروژانـدی، لەپێنـاو ئەوەدا بـوو، ئەرکـی خـۆی بـۆ برژوازێتـی نێودەوڵەتی رایـی بکـا بـۆ ئەوەی جووەکـان لە ئەرکـی خۆیـان بەرامـبەر شۆڕشـی سۆشـیالیزم بە لاڕێـدا ببـا بـۆ مەیلـی پەرگیـری دەوڵەتێـک. باشـــە ئەو نکـــولیکردنە کەڵکـــی چیـــیە؟ هەرچـــی دەربـــارەی خوێنـدکارەکانە کە زانکۆکانیـان جێـدەهێڵن، ئەوەش هەر بەڵگەیەکـی دیـکەی کاردانەوەی بزووتنەوەکەتە. ئەندازیارێک دەبێ بمێنێتەوە و کاری ئەندازیاریی خۆی بکا، پزیشـک دەبێ بە دوای داودەرمـانی خۆیدا بگەڕێ. ئەرێ تـۆ چـی دەکەی؟ تـــۆ ڕۆشـــنبیرەکان دەبەیـــت و مێشـــکەکانینان بەخاکـــدا دەدەی. ڕێکەوتـانە، یەکـێ لە بەنـدکراوان کە سـەر بە پـارتی هۆشـۆمەر هـاتزایرە[12] فشـــەی ئەوەی دەکـــرد، کە کۆمۆنەیـــان لە فەلەســـتین دامەزرانـــدووە. ئەو گەلحۆیە! ئاخر ئەوەیان  چۆن بە پارەی ملیۆنێرە ئەمریکییەکـان کـرد! نەخێر بێگن، ڕابردووخـوازی ڕاسـتییەکان نـاگۆڕێ. ئەو هەمـوو چیرۆکانە ناوبۆشـن. زایۆنیزم گاڵتەجارِیە و نمایشێکی لێبووکانەیە."

شـــەوێکیان چەقـی بـازنەی گفتوگۆکانمـان لەسـەر ئەوە بـوو، کە شـۆڕش[13] چارەســـەری کێشـــەی جوولەکەکـــانی بیرۆبیـــدجان[14] Birobidjan و دژە سـامیزمە. لێکـۆڵەرەوەکەم سـووربوو لەسـەر ئەوەی، تەنهـا بە سـەرکەوتنی شـۆڕش کێشـەی ناسـیونالیزم چارەسـەر دەبـێ، کە کێشـەی جـوولەکەش بەشێکە تیایدا. "بەڵام شۆڕشەکە" وەک ئەو بە پەرۆشەوە ڕایگەیاند، "پێویستی

---

[12] هۆشۆمەر هاتزایر هۆبەیەکی تونرەوانەی بالی چەپی زایۆنیزمە بوو، کە ئەندامەکانی خۆیـان بە توندوبەنـدەکانی ناشـیونالیزمی زایـۆنیزمی دادەنـا کە لەسـەر ئایـدۆلۆژی تەواوی مارکسـیزم گـۆش کرابن. ئەمرۆش ئەوان بنەمای پارتی ماپان لە ئیسرائیل، هێشتاش هەر بانگەواز بۆ هزری کۆمـۆنیزم دەکەن لەکاتێکـدا کۆمارەکـانی یەکێتـی سـۆڤیەت بەئـازارەوە دەروخـێ. ئەوان کـۆمەڵەیەکی دەوڵەمەندن، ناگونجاوانە کاریگەرن بەسەر ئەندامەکانیان. ئەوان لیبراوانە دژی دینن. دیسپلینێکی رەقیان هەیە. زۆرزانانە ڕێکخراون. لە رووی سیاسییسیەوە نەرم و گونجاون بۆ خالی هەلپەرستی.

[13] مەبەست لە شۆرس لێرەدا شۆرشی بەلشەفی رووسیيایە.وەرگێر

[14] بیرۆبیدجان چەند سـاڵێک بەر لە ئێسـتا کۆمـارێکی جوولەکەنشـینی ئۆتۆنۆمیداربوو لە یەکێتـی سۆڤیەت.

بە جەنگاوەران هەیە، نەوەک بە لادەر و هەلاتوان بۆ دەولەتێکی نەبوو. باشە بۆچی نایەیتە ڕێزی بەرەی جەماوەری، کە لێشاوی کاردانەوەی خۆی هەیە؟"
منیش هەولمدا هەلویستەکەمان بەم سەربردە هێمادارە شیبکەمەوە:

- "ئەی دادوەری مەدەنی، بە خەیال بێنە بەرچاوی خۆت، کە تۆ لە شەقامێکدا دەڕۆی و خانووەکانی هەموویان ئاگریان تێبەربووە. ئایا تۆ چی دەکەی؟ دیارە تۆ بانگی تیمی ئاگرکوژێنەوە دەکەی. بەلام ئەگەر لە پڕێکەوە گوێت لە هاتوهاواری ژنێک یان منداڵێک بوو لە خانوویکی گڕگرتوو بەرزبووەوە، ئایا چاوەڕێی یارۆی ئاگرکوژێنەوە دەکەی؟ بە دڵنیاییەوە چاوەڕێ ناکەی. تۆ باز دەدەی و هەوڵ دەدەی هاوارکەرەکە ڕزگار بکەی. ئیدی ئەوەش بارودۆخەکەمانە. بۆ ساتێک وا دابنێ، کە شۆڕش دوا چارەسەری گەلی بێ نیشتمانی جوولەکەیە، -خۆ هەر لە میانەی ئەزموونی بیرۆبیدجانیشەوە ئەوە دەردەکەوێ، کە یەکێتی سۆڤیەت دەرکی بەوە کردووە جووەکان پێویستیان بە هەرێمی تایبەخۆیان هەیە- ئایا تۆ ئەوە نابینی، ئێمە وەک ئەو ژن و پیاوانەین، کە لەنێو خانووە ئاگرتێبەربووەکان گیرمان خواردبێ؟ ئاخر خۆت دەزانی میلیشیا دژە سامییەکان چییان پێکردوین. ئەوەش دەزانی ئالمان چیمان بەسەردێنێ. نەوەک بە تەنیا خانووەکانمان گڕیان گرتووە، بەلکو خێزانەکانیشمان لەنێو مەشخەلی ئاگردان. ئایا لەو بارەدا تۆ دەستەوەستان دەوەستی تا تیمی ئاگرکوژێنەوە بگاتە جێ؟ ئاخر چی دەبێ گەر ئەو کات درەنگ بکەوێ؟ نەخێر، دەبێ هەر ئێستا خەلکەکەمان ڕزگار بکرێن. ئێمە دەبێ هەولی ئەوە بدەین ئەوان لەنێو مەشخەلەکە دەرباز بکەین و بیانگەیەنینە نیشتمانەکەمان. ئایا ئەو کارە، شتێکی خراپ و بەدە؟"

لە چرکەساتی وادا، پێموایە وا باشترە بمە ڕەوانبێژ. بارودۆخەکەم لە ژوورێکی بچکۆلە و ڕووتەن لە شەودا، سەرێکی تاشراو، ڕیشێکی زۆر هاتوو وام لێدەکا وابم. من لەوێ نامرادانە لە بەرامبەر نوێنەرایەتی دەولەتێکی زلهێز دانیشتووم- ئەوەی لەوەش گرنگتر بێ- بەخۆی و بیردۆزەکەی هیچ تارماییکیش بۆ گومان ناهێلێتەوە. ئاخر ئەرگومێنت و بەلگە دادی چی دەدا؟ هێشتاش لەو ڕەوشە دژوارەشدا کە دەوروبەرەکەم لێ وەتەنگ دەهات، منیش لەناخەوە هەستێکی وام هەبوو، کە من ئەرکێکم

لەپێشە و دەبێ بەدی بێنم، ئەرکەکەش نەوەک هەر بۆ خۆم بێ، بەڵکو لەپێناو گەلەکەم و لەدایکبوونەوەیەکی نیشتمانییانە بوو.
هەرچی لێکۆڵەرەوەکەشمە لە شوێنی خۆی ئارامگرتووانە دانیشتووە و هەموو بەڵگەوبەندێکی من بە یەک گوتە "ئەوە هەللەق مەللەقە" بەلاوەدەنێ.
دەمەتەقێکانمان شەو لە دوای شەودا درێژەی هەبوو. بەزۆریش وابوو لێکۆڵەرەوەکەم بەحەوسەڵە و رێز بوو. هەندێ جاران بە میزاجێکی خۆشەوە شتی پێدەگوتم، بۆ نموونە:
"تۆش هەروەک باقی گیراوەکانی دیکەی. لەجیاتی ئەوەی لەسەر قوونی خۆت دابنیشی و بە سەر بیر بکەیتەوە، بەڵکو تەواو پێچەوانەکەی دەکەی."
لە هەندێ بۆنەشدا ئاگاداری دەکردمەوە نەبادا حەوسەڵەی خۆی لە دەست بدا. ئیدی بە مست لە مێزەکەی بەردەمی دەدا و شێوەی زمانەکەشی دەگۆڕا، منیش بەبیرم دەهێنایەوە ئەو ڕەفتارە دەقاودەق بەگوێرەی قانونی سۆڤیەت قەدەخە بوو. یەکێک لەو بۆنانە شایانی ئەوەیە بیگێڕمەوە.
شەوێکیان من بڕگەیەکی دەستووری یەکێتی سۆڤیەتم لەبەر بۆ خوێندەوە. بە بیرم هێنایەوە بڕگەی ١٢٩ لە دەستووری ستالین ئەوەی بە ڕوون و ئاشکرا تێدایە، کە یەکێتی سۆڤیەت دەبێ مافی پەنابەرێتی بداتە هاوولاتیانی بێگانە کاتێک لە دەست جەور و ستەم هەڵدێن و بۆ ئازادی نیشتمانی خۆیان دەجەنگن. دواتر کە توانیم دەقەکە پشتڕاست بکەمەوە، بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:
"یەکێتی سۆڤیەت مافی پەنابەرێتی دەداتە ئەو هاوولاتییە بێگانانەی بە هۆی بەرگریکردن لە بەرژەوەندی کرێکاران، یان یاخود بە پەیوەستی لەگەڵ کارێکی زانستیانەدا، یان بەهۆی خەبات بۆ ئازادی نیشتمانەکەیان دەچەوسێندرێنەوە."
"تۆ ئەو مافەت نییە،" من ئەمەم بەسووربوونەوە بە لێکۆڵەرەوەکە گوت، جا ئەوش چ ساویلکانە بێ یان بە ڕاستی بێ وامگوت و ئەوەندەشم بۆ زیادکرد کە، "نابێ من لە زینداندا بکەی. بەڵکو بە پێچەوانەوە تۆ دەبێ خۆراک و نیشتاک بۆ خۆم و گیراوەکانی وەک من دابین بکەی و کۆمەکمان بکەی. لەودیو سنوور ئێمە لەبەر جووایەتی خۆمان ڕاودەندرێین، ئەوەش هەر لەبەر ئەوەیە، کە ڕاستەوخۆ بۆ مافە نیشتمانییەکانمان لە ئێرتز ئیسرائیل

تێدەکۆشین. خۆدیتنەوەمان لە یەکێتی سۆڤیەتدا وامان لێدەکا داوای مافی پەنابەریتی بکەین و پێشمان ڕەوا ببینن."

لەگەڵ بیستنی ئەو وشانەمدا ڕووخساری کابرای ڕووسی سوور و سپی هەڵگەڕا. زۆری نەبرد ئەو ئەفسەرە بە ڕێزە پەنجەکانی کردنە مشتەکۆڵە و دەنگیشی بەرزکردەوە: "هەی پاریزەری گەلحۆ واز لەو قسە قۆڕانە بێنە! چۆن زات دەکەی ئەو بڕگە دەستووری ستالین بلێیتەوە؟ تۆ هەر وەک ئەو سەگە هارە ڕەفتار دەنوێنی، ئەو دوژمنەی مرۆڤایەتی، ئەو سیخوڕە نێودەوڵەتییە (تۆ بلێی مەبەستی کێ بێ؟ من مەڕاق مام)- وەک بوخارین."

ئیدی ئەم قسەیەی بەسەردا قیژاندم. "تۆش هەروەک بوخارینی ناپاک قسە دەکەی، ئەو کەسەی وتەکانی مارکس و ئەنگلزی بە بەڵگە دەهێنانەوە تا ڕاستی خۆی پێ بسەلمێنێ. بەلام ئەوە دادت نادا. ستالین ئێمەی فێرە وانەکانی مارکس و ئینگلز کردووە، وانەکانیش یەکەیەکە گرێدراون، ناکرێ کۆپلەی لەنێودا لێ گولبژێر بکرێ." بە گاڵتەپێکردنەوە پێم پێدەکەنی. "کەواتە، بلیمەتێک لە (ویلنو)[10]وە سەری هەڵداوە، پێدەچی بیەوێ بە هۆی بڕگەیەک لە دەستووری ستالین قەناعەت بەمن بێنێ..."

من بەهۆی ئەو تەقینەوەیەی کاس بووم. لە ڕاستیشدا خۆ ئەو لە یەک ڕوانیندا ڕاست بوو. دەرهێنانی بڕگە لە نێو ڕامانەکەی خۆیدا وەک لەخشتەبردن لێی دەڕواندرا. بەلام خۆ من پێم گوت: هەرچەندە هەموو دەستوورەکە یەکانگیرە، بەلام کۆپلەی وای تێدایە واتا و بیرۆکەی سەربەخۆی هەیە و کار لە کۆپلە و واتای ئەوانی دیکە ناکا. ئەوەی من بە بەڵگەم هێنابووەوە، بەشێکی بڕگە کۆپلەیەک نەبوو، بەڵکو تەواوی کۆپلەکە بوو. من ئاماژەم بە مافی پەنابەران لە یەکێتی سۆڤیەت دا ، ئەوەش هیچ پەیوەندی بەشتی دیکەوە نەبوو، بۆ نموونە هیچ پەیوەندی بە هەڵبژاردنی دەسەلاتی بالای سۆڤیەتەوە نەبوو.

بەلام بەڵگەوبەندەکەم کەمترین کاریگەری نەنواند. ئەو هەر مکوڕبوو لەسەر بەراوردکارییەکەی بە" بوخارینی سیخوڕی نێودەوڵەتی".

کاتێک گوێم لەو شاگردە توندەی شۆڕشی کۆمیونیزم بوو، کە بەو جۆرە قسە بە دنەدەری ناوداری "ئەلفبای کۆمۆنیزم" دەڵێ، ئیدی لە زۆر شت

---

[10] ویلنو هەنووکە پایتەختی لیتوانیایە، کاتی خۆی ڕووسەکان داگیریان کردبوو. وەرگێر.

گەیشتم، کە پێشتر لام تەلیسم بوو. لەوە تێگەیشتم چۆن بوخارین و زۆرانی دیکەش وەک ئەو وایان لێکراوە، دان بەوەدابنێن گوایە سیخوڕن و دوژمنی کۆمەڵگەی سۆڤێتین.
هەموومان ئەوەمان خوێندۆتەوە، کە چۆن ڕووسەکان بەندکراوەکانیان بەنج کردووە تا بە کەیفی خۆیان ئەوەی مەبەستیان لێیانەوە دەربهێنن. بەڵام من گەیشتمە سەر ئەو بەرەنجامە ئەوە هەمووی هەڵبەستراو بووە. ئەی کەواتە چی بووە؟ ئەوان چۆن ئەمەیان کرد؟ ئەری ئەو کارەیان بە فشاری جەستەیی بووە؟ بەلێدان بووە؟ من هەر تەنها ئەوەندە دەڵێم، لە ماوەی ئەو کاتەی لە ژێر لێکۆڵینەوەدا بووم، پەنجەیەکیشیان نەگەیاندومی، هەرچەندە منیان بە "تاوانبارێکی سیاسی" بەهەند هەڵگرتبوو، خولی گیرانەکەشمان هەندێک جار زۆر باهۆزانە بوو. لەو سەدان گیراوانەی کە پێشتر تووشیان هاتم، لە هیچ کامێکیان گوێم لێنەبووە هیچ بەدرەفتارییەکی جەستەیی لەگەڵدا کرابێ. لە کەمێکیانم بیست گوایە ئەوانیش لە هەندێکیان بیستبێ کە لێیان دراوە. تەنانەت گەر واش دابنێین، کە پۆلیسی سۆڤیەت زەبروزۆری بەکارهێناوە، تەنها ئەوانەی مافی ئەوەیان هەبووە بەرد بهاوێژنە هێزی پۆلیس، ئاژانەکانی ئاسایش یان ئەفسەرەکان بوون، کە هەرگیز پەنایان نەبردۆتە بەر ئەو شێوازە هۆڤییانە لە "بەلگەوبەندی قەناعەت پێهێناندا". ئێمە هەندێ شت لە خوی سادییانە لە ئێرتز ئیسرائیل و لە پۆلیس تەنانەت لە ماندانی بەریتانیای "دیموکراتییەوە" فێربووین. خۆ ئەگەر ڕاستگۆش بین ناتوانین پۆلیسە جوولەکانی خۆشمان لە هەندێ خوی وا قێزەونانە بێ تاوان بزانین. ئەوەش پێلێنانێکی قورسە، بەڵام گومانی تێدا نییە، کە پۆلیس لە هەر کوێیەک بێ هەندێ دابونەریتی هاوبەشانەیان هەر هەیە.
باشە، ئەدی چۆنە پۆلیسی سۆڤیەتی لە ڕێکاری لێکۆڵینەوەی خۆیدا گەیشتۆتە بەرەنجامێک، کە هیچ پۆلیسی وڵاتێکی دیکە شان لە شانی نادا؟ ئاخر چۆن هاووڵاتییەکی گەنجی سۆڤێتی، کە دیارە خوێنەرێکی پەرۆشی "ئەلفبای کۆمۆنیزمە" دەگاتە ئەو بەرەنجامە، کە بوخارین ناپاکێکی تەواوعەیارە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە، وا پێویستە سەیری مێشکی خودی بوخارین و هاوچارەنووسەکانی بکەین. ئەوسا ئەو پیاوە دەبینین، چۆن لە پڕێکەوە تەواوی جیهان پشتی تێکرد و خۆیشی لە پەرگیرییەکەی

تەواودا بوو، ئەوەش نەوەک هەر بە تەنها لە گۆشەگیرییکی جەستەییدا بەڵکو لەوەش پۆلکتر، گۆشەگیرییکی دەروونی و سیاسییانە. ئەو دابرانە دووانەییە رەها بوو. هەروەک ئەو گۆشەگیرییە ماسییە بچکۆلانەیەی خۆمان ئاسا لە لوکیشکی و گۆشەگیری ماسیە گەورەکانی زیندانی لوبیشکی لە مۆسکۆ. دابڕان، بە شیوەیەک تەنانەت تاکە وشەیەکیشیت نەگاتە هیچ بنیادەمێکی سەر ئەو زەمینە. تەنها ئەوانەی بیردۆزەکەیان رێگەی هیچ گومانێکیان بۆ نەهێشتونەتەوە، خوازیارن جیهانی دەرەوە بزانن چۆن دیواری زیندانەکە کون بکەن. لە هەندێ وڵات و لە سەردەمی دیاریکراودا هەندێ رۆژنامەی قاچاخ هەن کە هەواڵگەل و رامانێک بڵاو دەکەنەوە هەرگیز لە رۆژنامەی رێپێدراودا تیشکی بڵاوکردنەوە بەخۆیانەوە نابینن. لێرە و لەوێ هیچ دیواری بێدەنگی زیندان ناشکێ. کەسیش نایەوێ بخوێنێتەوە یان گوێبیست بێ. جاڕنامەکان کە لەنێو زیندانەکاندا دروست دەکرێن، هیچ هەواڵێکی نوێ بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی بەدەستەوە نادا. هیچ بزووتنەوەیەک لەوێوە سەرچاوە ناگرێ. بۆیە سەرچاوەی دنەدانی رەفتاری شۆڕشگێڕانە دەبێتە هەڵم، بنگەکانیشی لەباربران. شۆڕشگێڕەکانیش لە بەردەم تۆمەتبارەکان، لە بەردەم دادوەرەکان یاخود جەلادەکانیان سەریان وا بەرز رادەگرن وەک ئەوەی سووپایەک لە دوای ئەوانەوە بێت تا پەیامەکەیان پێ رابگەیەنن. ئیدی کەسە زیندانکراوەکە بە هزرەکەی دەناسرێتەوە کە بەکاری دەبا. ئەو لە ئەشکەنجە و یاخود مردن ناترسێ، ئەو لە باوەڕێک دایە کە خواستەکەی قسەکەرێکی دیکە هەر دەدۆزێتەوە لەوێشەوە بڵاو دەبێتەوە هەموو دەوروبەری دابگرێ.

بەڵام چی دەقەومێ گەرهات و ئەو بڕوایەی زیندانییەکە تێکوپێک بشکێندرێ؛ ئەگەر هات و ناچار بەو راستیە کرا، کە پەراوێزخستنەکەی بارێکی رەها بە خۆیەوە دەگرێ، بەوەی هیچ کەسێک، هیچ بوونەوەرێک نە بیبینێ و نە بیسیبێ. ئیدی ئەو کات بیرۆکەی قوتاربوونی لە رەوشە کوشندەکەی لەگەڵ خۆیدا دەمرێ و ئەو توخمە شۆڕشگێڕییانەی پێشتر کە باڵی لێ دەڕواند و لە ناخی دڵیدا چەکەرەی کردبوو، تێکوپێک دەشکێندرێن. ئیدی باڵاترین و رەواترین بیرۆکەی شۆڕشگێڕی لە لا دەبێتە پاڕانەوەیەکی بە بەزەییانە، ئەوسا لەبری شەڕکردن لە پێناو هزرەکانی بۆ ژیانی خۆی دەپاڕێتەوە. ئیدی

ئەو کات، بەڵێ هەر ئەو کات دەرفەتی ئەوەی پێدەدرێ کە بۆ جیهانی دەرەوە بدوێ. ئەوسا بە زێدەباری ئەو بەڵێنەی کە ڕاشکاوانە یاخود ناڕاستەوخۆ بۆ دەرفەتێکی دیکەی ژیان کە پێی دەدرێ، یاخود ئەو ئاماژەیەی کە لەوانەیە لێی خۆش ببن و چیدیکە سزا نەدرێ، ئەو کات "نهێنی" شێوازی ڕووسیت لەبارەی دڵنیابوونەوەی ئەوان لە خۆتاوانبارکردن و دانپێدانان بۆ بەردەم جەماوەر، بۆ دەردەکەوێ. ڕێگای کیمیایی هیچ پەیوەندییەکی بەو باردودۆخەوە نییە، هەروەها توندوتیژی فیزیکیانەش باندۆرێکی کەمی بەسەرەوە هەیە. ئەوەی لەخشتەبەرە هۆکاری دەروونییە، کە باندۆرەکەی ڕوون و ئاشکرایە، بە خاترجەمیشەوە بۆ ئەو کەسانەی لەو بارە نێوخۆییەی نێو کۆمەڵەی دەسەڵاتدارانی سۆڤیەتییەوە ڕادێن و هەروەها ئەوانەش، کە بە هەر هۆیەکەوە بێ لەگەڵ سەرکردەکانیاندا تووشی دەمەقاڵێ هاتوون.

دەربارەی ئەو شتە، من لە گرتووخانەی لوکیشکیوەوە زۆرم بیرلێکردەوە؛ نەخاسمە هەر زوو دوای ئەوەی بەڵگوبەندەکانم لەمەڕ بڕگە و بەندەکانی دەستووری یەکێتی سۆڤیەت هێنانەوە، ئەو کات باشترین دەرفەتی بیرکردنەوەم بوو. حەفت ڕۆژی ڕەبەق منیان خستە بن گۆشەگیرێکی تەواوە. سزاکەش هیچ پەیوەندی بە لێکۆڵەرەوەکەمەوە نەبوو. لە ڕاستیدا هۆکارەکەی ناشیاو زۆر گەمژانە بوو. پاسەوانەکەمان گوێی لە نوکتەیەکی من بوو، کە بە زمانی یدیشییەوە سەبارەت بە گەمژەیەکەوە بۆ هاوزیندانییەکانم کردبوو. کابراش وا تێگەیشت کە لەگەڵ ئەومە، بەمجۆرە زمانی لێدام و حەفت ڕۆژی گۆشەگیری (چاوە زیندانی تەنیای)یان بۆ بڕیمەوە. چاوە زیندانییە سێ گۆشەیەکی تەنهاییەکە هەر سێ هەنگاو و نیوی دەبوو، دەبوایە تیایدا هەڵبکەم و جێی خۆمی تێدا بکەمەوە، ئەوێ بێ پەنجەرە بوو، بۆنێکی ناخۆشی لێ دەهات، ئیدی دەبوایە لە مێشکی خۆمدا مەشق بکەم.

ئەو ١٧٠ سەعاتە خۆش نەبوون. هیچیان بەدەر لە نانی وشک و ئاو زیاتر نەدەدامێ. بەڵام خۆ ڕەوشەکە لەوەش خراپتر بوو. لەوێدا پیسایی لە هەموو کون و قوژبنێکییەوە هەبوو. پیاسییەکەی نێو ئەوێ هەرگیز فڕێ نەدرابوو. ناوکەوەکەی بەردی ڕەق و تەق بوون. بۆ سەرینیش دەبوایە باسکەکانم بەهانام هاتبان. ئای ئەوەش چ سەرینێکی بچووک و ڕەق بوون. بە ڕۆژ

چاوه زیندانییەکە گەرم بوو، بەشەویش لە سەرما دەقەسریم. سەرباری ئەوەش ئەوەی هاوزیندانیم بوو، کونە مشکی بە جموجۆڵ بوو.
بەڵام منی تیایدا مام و نەمردم. هاوزیندانییەکانم بۆم زۆر نیگەران بوون. ئاخر حەفت ڕۆژ لەو "گۆشەگیرییەدا" گاڵتە نەبوو. یەکێک لە گیراوەکان، کە لاوێکی دز بوو، بە هەر هۆیەکەوە بێ لەگەڵ سیاسییەک داوای کەلوپەلەکانی منی کردبوو. ئاخر ئەو دڵنیا بوو کە کەسێکی لەڕولاوازی وەک من بەرگەی حەفت ڕۆژی "ئەوێ" ناگرێ. بەڵام ئەو بەستەزمانە لە کۆتاییدا نامراد بوو. (دواتر هەر چۆنێک بێ، هاوپیشەکانی کەلوپەلەکانی منیان بەسەر خۆیاندا بەش کرد، بەڵام ئەمجارە هۆکارەی جیاواز بوو.)
مانەوەم لە گۆشەگیریەکەدا وانەی وای فێرکردم کە بە هەموو ژیانم پێی قەرزبارم. ئای کە مرۆڤ هەرچەندە ڕۆشنبیریش بێ، چەند پێداویستی کەمی هەن. لە ماوەی ئەو چاوە زیندانە گۆشەگیریە تەنیاییەمدا ڕاهێنانەکانی مێشکم بێ پچڕان بوون. هەرچەندە واقیعی پیسی دەوروبەریشم ناچاری کردم خەون ببینم، بەڵام خەونێک نەوەک بە جیهانێکی ئازاد، نەوەک بە ماڵێکی گونجاو، نەوەک بە گەرماوێکی خۆش، یاخود نەوەک بە پیاسەکردن لەنێو داران، یاخود بە هیچ شتێکی ئازادی و مرۆڤایەتیەوە، نەخێر، من خەونم بە چاوە زیندانی گرتووخانە بینی، بە زیندانێکی تەلبەند، بەوەی یاوەرم هەبن و دۆشەکێکی تا ڕادەیەک نەرمم لەسەر زەویە بەردینەکە بۆ ڕاخرا بێ. دەکرێ شادی پلەی نەبێ، بەڵام بەدڵنیاییەوە ئازار پلەدارە. خۆ ئەگەر پیاوێک ناچار بکەی پەیژەی یەکەم لە ئازار ببڕێ، ئەوا هەوڵ دەدا بگەڕێتەوە خاڵی دەستپێک. کاتێکیش زیاتر بۆ خوارەوە بەسەر پەیژەکانەوە شۆڕ بکرێتەوە، ئیدی خەون بەوە نابینێتەوە بگاتەوە خاڵی بێ ئازاردانەکە، بەڵکو خەون بەوە دەبینێتەوە بگاتە قۆناخێکی پێشتر، کە ئازارەکەی سووکترە. ئەو خەریک دەبێ ئەوەی لەبیربچێتەوە، کە لە دنیای دەرەوە و لەو دیو قۆناخە ئازارەکان چی دەگوزەرێ. وانەکەش هەر یەک وانەیە، تیشک دەخاتە سەر زۆر لەو دیاردانەی قۆناغی تاریکی و ئەهریمەنانە کە ئێمەی تیادا دەژین.
کاتێکیش گەڕامەوە چاوە زیندانییەکەم، هاوزیندانییەکانم زۆر لەگەڵم میهرەبان بوون. تەنانەت دزەکەش خەندەی بۆ کردم، لەوانەیە بەو خەندەیە بێ ئومێدی خۆی لە ڕەوشەکەی من شاردبێتەوە. ئەو پیسی و پۆخڵیەی لە ماوەی

گۆشـەگیرییەکەدا لەسـەرم کەڵەکە ببوو، برادەرەکانم یارمەتیدەرم بوون لە خۆشوشتنمدا.
چەنـد هەفتەیەکـی کەم دوای بەسـەرچوونی حەفـت ڕۆژە گۆشـیرییەکەم، لە یەکەمین ڕۆژی ئەپریلدا ئەوە ڕاگەیەندرا، کە دەستپێکی ئەم بەندەی کتێبەکەم بووە، بەوەی هەشـت سـاڵی زینـدانی لە ژیانمـدا بە تەنگەمـدا درا. دوو مـانگی دیکە خێرا تێپەڕین، دیسـانەوە لە زینـدانی لوکشـیکیەوە جموجۆڵێکی نائاسـایی بەرپـابوو. ئـێمە لە چـاوە زینـدانەکانی خۆمـان بـانگکراین، لـێ ئەمجارەیـان بە ڕۆژی ڕوونـاک بـوو نەوەک بە شـەو، پێیـان گـوتین خۆمـان کۆ بکەینەوە و ئامادە بین.
ئێمە کەلوپەلەکانمـان کـۆ کـردەوە، بە چەنـدان جێـی پرسـیار و تۆمارکردنـدا تێپەڕین، تا دواجـار ئێمەیـان ئاخنیە ترومبێلێکـی ڕەنـگ ڕەش. لەو تـرومبێلەدا هەر جێی سێ بەڵکو چوار کەس دەبۆوە. بەڵام ئێمە زیـاتر لە دەرزەنێک پیـاو بووین. یەکێک لە ئێمە هاواری کرد ناتوانێت چیدیکە هەناسـە بداتەوە. ئـای چ پێلێهەڵبڕینێـک بـوو! مرۆڤـی ئـاژەڵ یەکـێکە لە بەهێزتـرین بـوونەوەر: ئەو بە ئاسانی ناخکێندرێ. ڕاستبوو ناو ترومبێلەکە مـایەی ئاسـوودەیی نەبـوو، بەڵام خۆ زۆریشی پێنەچوو. لە زیندانەکەوە بۆ وێستگەی هێڵی ئاسـنین هەر پـازدە خولەکێک بوو.
کاتێکیش دەرگای زیندانەکە کرایەوە و تـرومبێلەکە گەیشـتە شـەقامە چۆڵەکە، یەکێـک بەبـن گوێمـدا چرپانـدی: "ئەوە دەسـتپێکی گەشـتەکەیە بەرەو ئێرتـز ئیسرائیل!"
بڕوایەکی نەکردە؟ لەوانەیە وابێ. هێشـتاش بـڕوا لە واقیـع بەهێزتـرە؛ خـودی بڕوا واقیع دروست دەکا.

## بەندی ٢
## خاکی باب و باپیرانمان

٤٩ - ٦٦ ً

ئەو شەمەندەفەرە دووورودرێژەی ئێمەی بەرەو باکووری ڕۆژهەڵات بەرەو قووڵایی ڕووسیا دەبرد، واگۆنی دانیشتنی پیادەڕۆیانی تێدا نەبوو. شەمەندەفەرەکە هی بار بوو، لەوێدا هەر پەنجا کەسێک خرانە فارگۆنێکەوە. ئێمە لە سەرەتای مانگی حوزەیراندا خراینە شەمەندەفەرەکە. ڕێگایەکی درێژ و شەمەندەفەرێکی هێواش. کاتێکیش هەواڵی پەلاماردانی هیتلەرمان بۆ سەر یەکێتی سۆڤیەت پێگەیشت - ئەو جۆرە هەواڵانە تەنانەت تەلبەندی زیندانەکانیش دەبڕن- ئێمە تازە لە نیوەی ڕێگادا بووین. هەر چەند ئێمە بەرەو پێشەوە دەڕۆیشتین لە ڕێگادا تووشی گەلێک شەمەندەفەر دەبووین، خەڵکی سەربازگیریان بۆ بەرەکانی جەنگ تێدابوو. لە دوای ئێمەشەوە شەمەندەفەرێکی بارهەڵگری هاوشێوەی ئێمە پەیدابوو. ئەمەش کۆچپێکردنێکی ڕاستەقینەی خەڵک بوو.

کاتێکیش ئێمە گەیشتینە شوێنی مەبەست، وەک پێمگوترا، سەعات دووی سەر لەبەیانی بوو، تازە زەردەی ڕووناکایی ڕۆژ پەیدا دەبوو. یەکێک دەیتوانی کتێبێک بخوێنێتەوە گەر دەستی کەوتبا. ئێمە ئەوەندە بە جوانی ئەو "شەوە سپییانە" دڵشاد بووین، کە ڕۆژە تاریکەکانی بۆ ڕۆشن کردبوووینەوە. شەوێکی پایز هی بەخێرهێنان و باوەشپێداکردن بوو، منیش سەیری زەردەی بەیانییم دەکرد کە چۆن زەوی وەک چۆن بە هەزاران چرا هەڵکرابێ، ڕووناک کرابووەوە، یەکێک لە هاونشینەکانم، بە قاچێکی شەلە، لە ناخەوە ئاهێکی هەڵکێشا و ئاماژەی بە ئاسۆ کرد و گوتی، "لەوێدا خەڵکانێک هەن، ئەوانیش دەگرییێن..."

من نیازم نییە دەربارەی خەڵکی گریاو بنووسم. ئەم کتێبە تەرخان نییە بۆ فرمێسک، بەڵکو تەرخانە بۆ یاخیبوون: تەرخان نییە بۆ بێبەختەکان بەڵکو بۆ یاخیبووان؛ تەرخان نییە بۆ ڕووسیا و ئۆردوگای کاری زۆرەملێ، بەڵکو بۆ ئێرتز ئیسرائیل و بۆ خەباتی ئازادی لە دژی دەسەڵاتی بێگانەدا. بەڵام کاتێک

ناوی ئەو وشانەی کابرای شەلە لێرەدا دەهێنم، من کارێکی وا دەکەم بەو تروسکە هیوایەی بەڵکو ئەوانیش بگەنە کەسێکی خاوەن هێز تا ئازارەکەیان سووک بکا و فرمێسکەکانیان بسڕێتەوە. من ئەوەش دەزانم ئەوێ بە تەنیا شوێنێک نییە کە پیاو تیایدا بگریێ. من ئەوەش دەزانم ئەو پڕۆژە و باڵەخانانە بە خەڵکانێکی وەک من دروستکراون کە هەشت ساڵی زیندانییان بەتەنگەدا درا، گوایە "لە نوێژەنەوە پەروەردە دەکرێنەوە". لەو شوێنەی کە منی بە زیندانی بۆ نێردرا، بەر لە بیست و پێنج ساڵدا پێی بنیادەمی بەسەردا نەچووبوو. هەنووکەش هێڵی ئاسنین و پرد و سەرچاوە و کانی لەبن نەهاتووی سامانی سروشتی لێیە. بەڵام هەی بۆ خاتری ئاسمان، ئەدی باج و نرخەکەی!

من ئەم چەند دێڕانە بە بێ هیچ هەست و سۆزێکی کەسییانە و بە بێ لەبەرچاوگرتنی ئایدیۆلۆژیەکەم دەنووسم، چەقی بازنەی هەمووی هەر ئازادییە، ئازادی و شادمانی تاکەکەس مەبەستە. هەستو سۆزی تایبەتیم لێرە و لەو پرسەدا هیچ ڕۆڵێک ناگێڕێ. ئەو ژان و ناسۆرە تایبەتەیەی ببینم، لەچاو فرمێسک و خوێنی شەش ملیۆن جوو، کە لەبەر چاوان ونکران، تەنها دڵۆپێکە لە زەریایەک. ئاخر ئەو ئازار و ئەشکەنجەیەی من لەچاو کارەساتە گشتییەکەدا چییە؟ ئاخر هەر دوای ئەوە، ژانوناسۆرەکە ڕابرد و بۆ منیش بووە ئەزموونێک، بە دڵنیاییەوە ئەزموونەکەمی بە هێز و توندوبەند کرد، لەوە هیچی دیکە نەبوو. لە سەرێکی دیکەوە نە من دەتوانم لەبیری بکەم، نە هیچ گیانێکی جوولەکەش دەتوانێ دوو ڕاستی بنەڕەتی لەبیر بکا. لە سای سەری یەکێتی سۆڤیەت، بە سەدان هەزار جوولەکە لە دەست نازییەکان قوتاریان بوو، هەرچەندە هەندێکیان ئازاری زۆریان پێگەیشت و هەندێکیشیان لە زیندانەکان، لە تاراوگە و پەنابەرییدا سەریان نایەوە.

دووهەمیشیان کاتێک یەکێتی سۆڤیەت گەیشتە ئەو بەرەنجامە، هەرچەندە ئەوەش بە شێوەیەکی کاتی بوو، کە سەربەخۆیی جوولەکە لە فەلەستیندا نمایشێکی کۆمیدی نەبوو ئیمپرالیستی بەریتانی سەپاندبێتی، بەڵکو ئامانجێک بوو بەقەد مەرگ-مەرگی یاخی بووان و چەوسێنەرەکان- بەهەند هەڵگیراو بوو، یارمەتیدەری ئێمەش بوو بۆ ئەوەی بگەینە یەکەمین قۆناخی سەربەخۆیی. جیهان لەبەر دوو شت سەرسام بوو، هەم لەبەر ئەوەی

یادەوەری ڕابردوو، بەوەی کە ئەو باسوخواسەی لە زیندانی لوکیشکی دەکرا شتێکی فانتازییانە بوو، هەروەها لەبەر ئەوەش کۆمەکی یەکێتی سۆڤیەت لەخۆوە و هاوکات بوو لەگەڵ کۆمەکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ مان.
من لە دواییدا هەوڵێ دەدەم شتەکە شیبکەمەوە، کە بۆچی سەرسامانە بوو. بەڵام خۆ ئەوانە ڕاستیەکان بوون. ئێمە لە بیریان ناکەین، تەنانەت لەو کاتەش کە ڕەوشەکە گۆڕاو دیمانەی ناقۆلا لە لێکۆڵەرەوانی لوکیشکی دیسان سەریان هەڵداوەتەوە.
هەروەها ئەوەشمان لە یاد ناچێتەوە، کە لەوێدا دووڕیانێک تووشی مرۆڤایەتی بۆتەوە: ئاخر چۆن دەتوانی ئازادی تاکەکەس لەگەڵ هەوڵوتەقەڵلا بۆ دادپەروەری کۆمەڵگە بگونجێنی یان لێکی بدەی. ئازادی تاکەکەس وا لە دەوڵەت دەخوازێ، خۆی لە ژیانی ئەودا هەڵنەقورتێنی؛ کەچی هێشتاش لەناوبردنی هەندێ بێدادی ئەستەم دەبێ گەر هەندێ ئۆرگانی کۆمەڵگە، بەواتایەکی دیکە گەر دەوڵەت خۆی تێهەڵنەکێشێ و لەسەری نەکاتەوە. من گومانم نییە کە چارەسەرییەکە لە ئامانجی زێڕیندا خۆی دەبینێتەوە، بەڵام پرسیاری حەیران و سەرگەردان کە ڕووبەڕوووی پیاوی هۆشمەند دەبێتەوە ئەوەیە، ئاخۆ ئەو مەبەستە شادمانییە لە کوێیە و چۆن دەدۆزرێتەوە؟
ئەرکی شۆڕشگێڕە فەرەنسییەکان زۆر سادەتر بوو. بە ڕاست، خۆ ئەوان لە یەک هەناسەدا ئازادی و یەکسانییان دەپرسی. بەڵام ئەو نایەکسانییەی ئەوان دژی وەستانەوە زۆر کوشندە و بەرچاو بوو، دەکرا بە سەرەقەڵەمێکی جوامێرانە ڕاستبکرێتەوە. زێدەمافە بۆماوەییەکان دەکرا لەگەڵ نەهێشتنی نازناوی خانەدان و ئاماژەکانیان کوێر بکرێنەوە. بەڵام خودی ژیان جیاوازی ڕاستەقینەی بوو چونکە پەیوەست نەبوو بە پاشناوی بۆماوەیی، یاخود پابەند نەبوو بە هیچ زێدەمافێکی سیاسیی، کۆمەڵایەتی و ئابوورییانە. باشە ئەدی چی دەربارەی ئەو جیاوازیانە؟
مرۆڤایەتی بەردەوام بەدوای چارەسەردا دەگەڕێ. خەڵکی سۆڤیەتیش بە دوایدا گەڕا، بەڵام هێشتاش چارەسەرەکەیان نەدۆزیوەتەوە. وەک بەرەنجامێکی کردەیی ئەزموونی وڵاتەکەشیان، ئەوان بیرۆکەی بنچینەیی کۆمۆنیزم، کە بیرۆکەی یەکسانی ڕەهابوو ڕەتکردەوە. بنەمای "بۆ هەر کەسێک هەمان شت" چیدیکە کاری پێنەکرا. بنەمایەکی دیکە جێگەی ئەوەی

پێشتری گرتەوە، "هەر کەسێک بە گوێرەی ڕەنجی خۆی". بەڵام خۆ هەموو ڕەنجێکیش وەک یەک نەبوو. بە تەنیاش سەعاتەکانی کار بەهاکەیان دیاری نەکرد. هەر شێوە ڕەنجێک (کارێک) لە یەکێتی سۆڤیەتدا چۆنایەتی خۆی هەبوو. بەهای چۆنایەتیەکەش لە لایەن خودی کرێکارەکەوە دیاری نەدەکرا، بەڵکو لە لایەن فەرمانڕەوایانی"دەوڵەتەکە". بۆ نموونەش کرێکارێکی هێڵی ئاسنین کرێ و مزی زۆر کەمتری لە ئەستێرەیەکی نێو فیلمەکان پێدەدرا. ئەوەش ڕاستبوو جارێکیان بە گوێرەی بنەمای "بۆ هەر یەکێک بە گوێرەی ڕەنجەکەی" بەڵێنی پێدرابوو کە گۆڕدرا "بۆ هەر یەکێک بە گوێرەی پێویستی خۆی". بەڵام خۆ ئەمەش بۆ کەسانی پێداویست جیاوازەکان، واتای یەکسانی ڕەهای نەدا. ئیدی هەر چۆنێک بێ، پرسەکە هەر مایەوە: ئاخر کێیە ئەو کەسەی پێداویستیەکان لە سەنگی مەحەک دەدا؟ ئایا خودی تاکە؟ یاخود دەبێ بگەڕێینەوە بۆ "دەسەلاتی بالآ"ی دەسەلاتداران و دەوڵەت؟

چارەسەری گشتیی بۆ ئەو نەخۆشیانەی کۆمەڵگە هێشتا نەدۆزراوەتەوە، هەرچەندە هەندیک جاری ئەوە دەدەن گوایە چارەسەریەکەیان دۆزیوەتەوە. کۆمەلانی خەڵکی سۆڤیەتیش لە هەوڵی دۆزینەوەیدا قوربانی زۆر گەورە و قورسیان داوە. ئەوان ئازادی تاکەکەسیی خۆیان کردە قوربانی. ئەوەش ئەو ڕاستیەیە کە ناکرێ حاشایی لێبکرێ. ئەوان بەدەر لەوە قوربانی دیکەشیان داوە. لە دوای هەموو شتێکیشدا، ئەگەر دەوڵەت دابینکردنی پێداویستیەکانی ئەوەی خەڵکەکەی لێی داوا دەکا بگرێتە ئەستۆ، ئەوەش هەر لە ئامراز و ماشێنی قورس قورس تا دەگاتە دەرزی و داو، فلچەی ددان، سابوون و قەیتانی پێڵاو، ئەوا چار نییە (شتێکی حەتمییە) دەبێ دەست بە دامەرزاندنی کەرەستە و ماشێنی قورس بدرێ، لە کاتێکدا سابوون و قەیتانی پێڵاو دەبێ چاوەڕێ بن. ئەوەش شتێکی سروشتی و ژیربێژییە. لێ گەلۆ لێرەدا لۆژیک و "قانون" لەگەڵ بارودۆخی ژیانێکی شایستەدا ناکۆکە. بۆ ملیۆنان لە گەلێکی بچووک بارودۆخی کارایان بەند نییە بە بە دامەزراوی کەرەستە و ماشێنی قورس بەڵکو دەقاودەق پابەندە بە شتی بچووک بچووک ؛ پابەندە بە جووتە پێڵاوێک یاخود تەنانەت بە قەیتانی پێڵاوەکان. مرۆڤ دەبێ ئەزموونی لەگەڵ نەبوونی ئەو شتە کەم بایەخانە هەبێ تا پێزانینی بۆ ئەوە هەبێ کە ئەو شتانە چ واتایاکیان بۆ ژیانی تاک هەیە، ئەوەش هەر لێگەڕێ کە ناوی

ئاماژەی کەموکورتی توخمەکانی دیکەی پێویستی مرۆڤ وەک نان، هەندێ شەکر و دلۆپێ شیر نابردرێ.
لە ڕووسیادا دەکرێ مرۆڤ لە واتای تراژیدیانەی نەبوونی گشتیی بگا. هێشتاش مرۆ دەبێ ڕێز و پێزانینی بۆ ئەو خەڵکانە هەبێ کە ئەو نەبوونیەیان لە پێناو گەڕان بەدوای دەرمانی گشت دەردان قبوڵە - تەنانەت گەر ئەو قایلبوونەش بە داری زۆر بێ- سنووری ژان و ناسۆری مرۆڤ، لە هەندێ لە بەشەکانی سەر ئەم گۆی زەمینە لە کۆتاییدا وا دادەنرێ کە شتێکە لەودیو توانای بەرگریکردنی ژیانی مرۆڤەوە بێ، هەرچی لە یەکێتی سۆڤیەتیش ئەمە بۆ ڕووبەرێکی بێ پێوانە لێککێشراوەتەوە. لێککێشانەوەی سنوورەکانی ژانوناسۆر ئەزموونێکی خۆشحاڵانە نییە؛ بەڵام ئێمە دەبێ بیرمان بێ کە هەر ئەمە وای لە ڕووسیا کرد توانستی خۆگرتنی لە هەمبەر مشتی ئاسنینی نازییەکاندا هەبێ، بۆ ئەوەی لەبن زەبرەکەدا نەچەمێتەوە و لە دوایشدا کوڵە مشتەکە وردوخاش بکا.
وانەکانی ژیان لە ئۆردوگا زۆرەملێکاندا زۆر ڕۆشنکەرەوەن. ژیانی ئەوێ وا لە مرۆڤ دەکا ئەوەی پێی دەگوترێ "ژیانی شارستانییانە" هەر بە تەواوی پێویست نەکا، بەڵکو ئەو ژیانە هیچ نییە لەوەی دابونەریتێک بێ. یەکێ دەتوانی هەر بە یەک هەنگاو دەستبەرداری خوێکی "شارستانییانە" بێ بەوەی لە جگەرەکێشان بوەستێ؛ سەرەتا ئەم شتە هەندێ زەحمەت دەبێ، بەڵام دواتر لێی خۆش دێ و زۆریش ئاسان دەبێ، لە کۆتایشدا وای لێدێ تۆ بڵێی کێ جگەرە بکێشێ؟ لەوێدا لە ئۆردوگا زۆرەملێکەدا دەستەواژەیەک هەبوو، هەموو فەلسەفەی تێدا بەرجەستە دەبوو. "تۆش لێی ڕادێی." یان لەوانە یەکێ بڵێ: "تۆ لەوە ڕادێی بەبێ ئەوەش هەڵبکەی." یاخود شتی لەو جۆرە. هەر زووش لێڕادێ کە بەبێ کراسێکی پاقژ، سەدان قێچ و ئەسپێ لەنێو فانیلە و دەرپێتدا هەبێ، هەڵبکەی. یەکەمین ئەسپێ کە تووشت دێ پێت زیندەرەوەرێکی ترسناکە، بەڵام کە سەدانیان دەبنە میوانت ئەوا وەک دراوسێیەک قبوڵتە. ئیدی ئەوان چیدیکە مایەی قێزلێبوونەوە نین، بەڵکو بەشێکی هەبوونی تۆن. تۆ پێتوایە بە بێ بێجامە خەوت لێناکەوێ" قسەیەکی قۆڕە. هەر کێشەی چەند هەفتەیەکە نەوەک فێردەبی کە بە کراسە یەخە بە قرێژەکەتەوە بخەوی، بەڵکو لێرادێی جلەکانت هەر دانەکەنی و – بەو جلە

پیس و پۆخڵەوە برازێی- خەوێکی باشیشت لێبکەوێ. ئەرێ تۆ نانت پێناخوری تا سەرەتا دەست و پەنجەکانت پاک نەشۆیت؟ تۆ لەوێ هەر خواخواتە شتێکت دەست بکەوێ تا بەو دەستە پیسانە بیخەیتە نێو دەمت. ئەرێ تۆ هەموو بەیانی و شەوان ددانەکانت دەشۆی؟ قسەی پڕوپوچ. خۆ لەوێ هەرگیز فلچە و دەرمان نزیک ددانەکانت ناکەون، کەچی دەتەوێ بژی و لەسەر هەڵکردنەکە بەردەوام بیت. ئایا تۆ پێویستیت بە پێخەفێکە تا لەسەری پاڵ بکەوی؟ قسەی قوڕ. تۆ لەسەر تەختە دار، لەسەر ناوکەوی بەردین، لەسەر بەفر، لەسەر زەوی رادەکشێی و دەشتەوێ بخەوی.
نەخێر. شارستانێتی شتێکی هەرە بایەخدار نییە. خۆ ئەگەر ناچار بکرێی ئەوا خێرا خۆتی لێ دادەتەکێنی. هێشتاش ئەو شتە سەیرە، کە چەند کەمتر شارستانێتی لە ژیانتدا هەبێ، ئەوەندە ئارەزووی ژیانت لە لا بەهێزتر دەبێ. ئەوەش هەر تەنها بژی، بژی، بژی. پیاو ئاژەڵێکی بە تین و تاوە. تەنانەت کە دەخرێتە بارودۆخێکی نیمچە کێویانە، هێشتاش خواستی ژیان لای ئەو بنگەییە. ئەو بەدەر لە مردن لە هەموو شتێک رادێ.
بەلام ئاخۆ پێویستیت بەوە هەیە رەوشێک بئافرێنی کە خەڵک هەمیشە بیر لە خواردن بکەنەوە هەرچەندە بە رەهایش ئەوەیان لەبیر چوبێتەوە کە تامی ژەمە خواردنێکی نایاب چۆنە؟ ئایا شتێکی سەرەکییە پیاو ببێتە نیمچە چوارپێ؟ ئایا پێویستە پەروشی بۆ ژیان وا بەهێز بێ لە حیسابی ناواخنی ژیان بێ؟ یەکێک دەکرێ ئەو پرسانە بکا کە کۆمەڵگە، ئەوسا لە چ دارشتەیەکی رێکخراوەییدا بێ، وا لە کەسەکە بکا بەشێوەیەک بژی کە نیمچە چوارپێیانە بێ، یاخود وا لەخۆبوردانەبێ کە بە شێوەیەکی وا ژیان بباتە سەر. ئەوەش شتێکی ئەستەمە لە کەسێک کە بە چاوی خۆی ئەو ژینگەیەی دیتبێ و چاوەڕێی ئەو جۆرە پرسیارانەی لێ نەکەی. ئای بۆچی ئەو هەموو فرمێسکە زۆرانە لەسەر رووباری مەزنی پێچۆرا[16] برژێندرێ؟ ئایا ئەوانەی بڕیاری چارەنووسی ملیۆنانیان بە دەستەوەیە ناتوانن چارەنووسی ئەو بەدبەختانەی سەر لێواری رووبارەکە ئاسانتر بکەن؟
چارەنووسی یەکێ لەو بەدبەختانەی ئەوێ بە قووڵی لە یادەوەریمدا نەقش بووە. گومانیشم هەیە لەوەی تا ئێستا لە ژیاندا مابێ. ناوە فەرمییەکەی

[16] پێچۆرا رووبارێکی گەورەیە لە باکووری رۆژئاوای رووسیا.(و)

گارین Garin بوو: ناوه جوولەکەییە ڕاستەقینەکەشی نازانم. لە سەرەتادا نەیدەویست بە زمانی زگماکی خۆی کە یدیشی بوو، بپەیڤێ؛ تەنانەت ئامادەش نەبوو پێ لەوەبنێ کە جوولەکە بووە. ئێمە بە ڕووسی قسەمان دەکرد، زۆریشمان بەیەکەوە قسەکرد. ئەو جاریکیان بیچمێک بوو لە سیاسەتی سۆڤیەت، سکرتێری گشتی پارتی کۆمۆنیستی بوو لە ئۆکرانیا، یاریدەدەری سەرنووسەری ڕۆژنامەی پراڤداش بووە. هەر لە سەرەتای هەرەتی لاوێتییەوە ئەندامێکی کارای پارتی کۆمۆنیست بووە. بەڵام کارنامەی ژیانی کەمێک دوای ساڵە چارەنووسسازیەکەی ١٩٣٧ پچڕێندرا. ئیدی گارین گیرا و بە هۆڤیترین تاوانی ئەو کات لە یەکێتی سۆڤیەت، واتە ترۆتیسکیزم تاوانبار کرا. بۆ ماوەی چوار ساڵان لەژێر لێکۆڵینەوەدا بوو، بەڵام هەرگیز دادگایی نەکرا. لە ١٩٤١دا سزایەکی کارگێڕی ئەوپەڕی قورس درا: هەشت ساڵ لە ئۆردوگای زۆرەملێی کارکردن بۆ خۆڕاستکردنەوە و نێردرایە سەر لێوارەکانی ڕووباری پێچۆرا. ئیدی ئەو چارەنووسەبوو کە ئێمەی بە یەکدی گەیاند.

گارین دڵنیای کردمەوە، کە ئەو ترۆتکسیی نەبووە. لە بیستەکاندا کاتی خوێندکار بووە، ئەوەی نەشاردەوە کە شتێکی ڕاستی بوو، لە دەمەتەقێ جەماوەرییەکانی ئەوسای نێو پارتیدا مەیلی ترۆتسکییانەی هەبووە. بەڵام ئەو کات دەمەتەقێی سەربەست و ناسراو بوون و زۆر لە خوێندکارەکانی دیکە، کە هەنووکە پلەوپایەی بەرزیان لەنێو دەوڵەتدا هەیە، هەمان ڕوانینی ئەویان هەبوو. پاشان گارین پێیگوتم، ئەو هیچ پەیوەندییەکی بەو شتە نەبوو کە پێیان دەگوت "ترۆتسکیزم". لە ڕاستیشدا ئەو دژی ترۆتسکی دەجەنگا. چەند ڕۆژێک بەر لە گیرانەکەی وتارێکی دوورودرێژی لە پراڤدا لەسەر ئایدیۆلۆژیا یان لادانی ترۆتسکی نووسیبوو. ناونیشانی ڕاستەقینەی وتارەکەش "تێکشکانێکی تەواوی مەنشیفیزم" بوو. بە کورتیش لە وتارەکەیدا ترۆتسکی بەوە تاوانبار کردبوو، کە بۆ خۆشەویستی یەکەمی کە مەنشەفیزم بوو دەستبەرداری بەلشەفیزم بووە. بەڵام لێکۆڵەرەوەکانی دەمودەست وەڵامی مرازەکەی ئەویان دابووەوە بەوەی گوایە: "بارەگای ترۆتسکیزم فەرمانیان بەسەر تۆدا کردووە شتێکی وا بنووسی تاکو لەژێر نمایشەکەدا لەنێو دەوڵەت و حزبدا کار بۆ تێکدانیان بکەی."

سەرباری کوێرەوەریەکانیشی، هێشتا گارین هەر بە سۆڤیەتێکی ولاتپارێز مابۆوە. لە ڕۆژەکانی تەمموزی ١٩٤١دا خەمی زۆری سەبارەت بە هەواڵە دڵتەزێنەکانی بەرەکانی پێشەوەی جەنگەوە دەخوارد. کاتێکیش زیندانییە سیاسییەکانی دیکە، داخلەدڵێکی کۆمۆنیست دەتەقیەوە و هیوای دەخواست بەڵکو ئەڵمانەکان لە بەرەوپێشوەچوونەکانی بەرەی شەڕ بەردەوام بن، بەڵکو بەهۆیەوە ئەو لە زیندان قوتاری بێ، گارین سەرکۆنەی دەکرد و پێیدەگوت ناپاک و بە وێناکرنە دڵگیرەکەی کە لەنێو ئۆردوگاکەدا باو بوو بانگ دەکرد: "هەی مشەخۆر."

وەک کۆمۆنیستێکی بڕواداریش گارین بەردەوام بوو لەسەر شەڕکردن لە گەڵم لەسەر بڕوای زایۆنیزمیم. ئەو دژی زایۆنیزم بوو بە تایبەتیش دژی زایۆنیزمە سۆشیالیسەتەکان بوو پێی دەگوتن ناپاکەکانی چینی کرێکار. ئەو هەر لە گەنجییەوە لە سەردەمی ژیانی ئۆدێسەوە دژی ئەوان بوو هەرواش مایەوە و بیروڕای نەگۆڕا. لە ماوەی ئەو گفتوگۆ درێژانەی نێوانمان، کاتێک لەسەر پێخەفە دارینەکانمان ڕاکشابووین، هەوڵی دەدا بڕوام پێبهێنی کە زایۆنیزم هیچ نییە تەنها هاوکاری ئەنتی سامیزم نەبێ. هەر دووکیان ناسیۆنالیزمی سەررەقن و لەگەڵ گەشەسەندنی مرۆڤایەتیدا نایەنەوە. پشتگیری نەتەوایەتی داهێنانێکی بۆرژووازییانەیە. پاڵپشتی ڕاستەقینە تەنها و تەنها هی کرێکارانی گەلە جیاجیاکانە. هەڵبەتە ئەوەشی نەدەشاردەوە لەسەر "خزمەتکردنی ئیمپریالیزمی بەریتانی"دا سەرکۆنەم بکا. وەک بە جۆشەوە دەیگوت فەلەستین هی عەرەبەکانە. زایۆنستەکانیش داردەستی ئیمپریالیزمی بەریتانیان تا پرۆلیتاریای عەرەبی پێ سەرکوت بکرێ، تا فشاریان بۆ بهێنن و بیانچەوسێننەوە. هەڵبەتە زۆر جاران مشتومڕەکانمان گەرموگوڕ بوون. ئاخر زیندانییەکان وەک منداڵ وان. ئەوان بە تیرۆر دەورەدراون ئەوان بە شێوەیەکی نائاسایی بە مشوورخۆرییەوە وازی دەکەن، یاخود بەتەواوی و ڕاشکاوانە بەهۆی بەڵگەوبەندی ڕووتەن (ئەبستراکت) خۆیان ون دەکەن.

بەڵام ڕۆژێکیان شتێک دنەدەرە ڕۆحیانەکەی گارینی تێکوپێک شکاند. ئێمە خەریکی دابەزاندنی قورسی باری قورسی بەلەمێک بووین، هەر ئەوەندەمان زانی ئەو کەوتە دەمەقاڵێیکی توند لەگەڵ زیندانییەکی تاوانبار کە بە **ئوکری** یان **زولیکی** دەناسرا. تاوانبارەکە بە دەهریبوونەوە گارینی بە "جوولەکەی

پیس" بانگ کرد. گارینیش لە شوێنی خۆی وەک بەرد ڕەق بوو، وەک ئەوەی ئامـان بەربـووبێتەوە. پێدەچوو ئەم قسـەیان بەزەبرتـرین شـەق بـووبێ پێـی کەوتبێ. ئەو دەمێک بوو لە پێگە بەرزەکەی دابەزێندرا بوو، بەڵام بەو شێوە بانگی بکەن "جوولەکەی پیس" ئەوە شتێکی زۆر پۆلکتر بوو.

گارینیش هەروەک ئێمە دەیزانی، یەکێتی سۆڤیەت بە سەرڕەقییەکی جیاوازەوە دژایەتـی دژە سامیێتی دەکـا. خـۆ هەر جۆشـدەرانی دژە سـامیزم یـان گەوجە لەخۆباییەکـانن کە پـێ لەسـەر ئەوە دادەگـرن حکـوومەتی یەکێتـی سـۆڤیەت "جـوولەکە" بـێ یـاخود "هەواداری جـوولەکە" بـێ. لە ڕاستیشـدا حکـوومەتی یەکێتـی سـۆڤیەت دژی دژە سـامیزمە، واش دادەنێ دژە سـامیزم نەوەک هەر نمایشـێکی ڕەگەزی و هەسـتی نەتەوایەتییـانەیە، بەڵکـو -لەوانەیە بەتـایبەتیش وابـێ- چەکێکـی دژواری دەسـتی دوژمنەکـانی ڕژێمـی سـۆڤیەتییە. بەڵام خـۆ ئەوەش ڕێ لە دژە سـامیزم نـاگرێ، کە لە کانیـاوی سروشـتیانەی ڕقـوکینە و یـان لە بەکـاربردنی ئێـرەییەوە هەڵقـوڵابێ. بەهەر شـێوەیەک بـێ، شـتێکی زەحمەتە ئەگەر ئەستەمیش نەبێ، لە ئۆردوگا زۆرەملێکاندا دژی نمایشـی دژە سـامیزم بوەسـتیتەوە. ئـاخر ئۆردوگـاکە جیهـانێکی داخـراو بـوو بـۆ خـۆی. پاسەوانەکان لە بەیانیاندا تۆ دەبەنە سەر شوێنی کاری بێگاری و ئێوارانیش دەتگەڕێنەوە شوێنی حەوانەوە و نوستن. ئەوان بە ڕەوانی نێوان دەمەقاڵێ و شەڕە نێوخۆییەکانی نێوان زیندانییەکان ناکەن. خـۆ تـۆ لەو پاسـەوانانە نزیک نـابیتەوە مەگەر ئەوان بانگـت نەکەن. خـۆ ئەگەر پەنایـان بـۆ بـبەی و داوای کۆمەکیان لێ بکەی، ئەوا دادت نادەن، بەڵکو لەوانەیە قوڕەکەت زیاتر خەست بێتەوە. ئەوسـا هـیچ جیـاوازییەک نییە تـۆ لەسـەر هەق بیـت یـان نـا، چـونکە چیرۆک و سـەربردە گێـڕانەوە بـۆ پاسـەوانەکان قەدەغەیە. ئەمەش بنەمـایەکی مـۆراڵییە بـۆ هەمـوو زینـدانییەک، بەتـایبەتیش زینـدانیەکانی ئۆردوگـا زۆرەملێکان.

گارینیش هەموو ئەو شتانەی دەزانین. ئەو بەسـتەزمانە ئەوەشـی دەزانی، کە ئەو یەکێکە لە بێزراوتـرین پیاوەکـانی نێـو ئەو ئۆردوگـا زۆرەملێـیە. ئەوەش نەوەک لەبەرئەوەی کە جـوولەکە بـوو، قسـەی (ئـورکی) کە پێـی گوتبـوو جوولەکە هیچ خراپەی وای تێدا نەبوو، بەڵکو لەبەرئەوە بوو، ئەو ڕۆشـنبیر و

کۆمۆنیست بوو. ئەوەش قانونێکی گەردوونی بوو کە زیندانییە تاوانبارەکان بەرامبەر "ڕۆشنبیرەکان" لێبوردە نەبوون و لەگەڵیان هەڵنەدەکردن؛ وای قوربەسەر ئەو زیندانە ڕۆشنبیرەی کە سەری نزم بکا یاخود وا دیار بێ لە بەردەم هاوڕێکانیدا سەری داخستبێ. گارین خۆی لێنەگۆڕا بوو، بەڵام هەرگیز ئەو لەمپەرانەشی لەبیرنەدەچوون کە لەنێوان خۆی و (ئوکری) و (زولیکی) لە لەشکری بێگاردا هەبوون، کە ئێمەش هەر دووکمان ئەندام بووین تیایدا.
تەوس ئاسا ئەوەندە بەس بوو، ئەوان لەوەش زیاتر ڕقیان لێدەبۆوە، چونکە ئەو کۆمۆنیست بوو، بۆیە بە هێمایەکی حکوومەتیان دادەنا. ئەوەش گرنگ نەبوو ئاخۆ گارین چ جۆرە کۆمۆنیستێک بوو، ئەو کۆمسیارەی کە فەرمانی دەردەکردن، یان ئەو زیندانە ڕاوەدونراوە، ئەو ستالینییە یان ترۆتسکیەکە. هەموو ئەوەی بۆی حیساب دەکرا ئەوە بوو، کە ئەو کۆمۆنیست بوو، هەنووکەش ئەو زیندانییانە دەرفەتیان بۆ هاتووە کە ڕژێم بە بەرپرسیار بزانن لە کارەکانی خۆیدا.
تەقینەوە و کاری تێکدەرانە لەنێو ئۆردوگاکەدا دەکرا لە ڕووی لۆژیکییەوە ڕوون بکرێتەوە. بەڵام ئەو لێکدانەوە لۆژیکیە لەبەرچاو هەر کوێرەوەرێیکی دەروونی نەگبەت چ سوودێکی دەبێ؟ ئاخر گارین بە تەواوی تێکشکا بوو. ئەو چیدیکە هەر بەدبەختێکیش نەمابووەوە؛ ئەو کەساسترین و کڵۆڵترین بەدبەخت بوو. بڕبڕەی پشتی باوەڕەکەی تێکشکابوو. تەناتەت ئەو هەوڵی شاردنەوەی شتەکەشی نەدەدا. ئەو هەر دەنوزایەوە و دڵی خۆی بۆ من دەکردەوە، منێک برادەرێکی نەیار. خۆ ئەگەر ئەوە ڕووبدا - ئەو وای لێپرسیم- ئەرێ نیاز لەو هەموو کارەی چییە؟
دەگوترێ هێرتزل ئەو ڕۆژنامەوانە تەواو سەرکەوتووە، لەو کاتەدا بەنێو قەیرانە ڕوحیانەتەکەی تێپەڕبووە و ئەوی گەیاندۆتە سەر بیرۆکەی دەوڵەتی جوولەکە، کاتێک لە پرسی دادگایی دریوفیسدا گوێی لە خەڵکانێکی تێکدەر بوو هاواریان دەکرد "مردن بۆ جوولەکە". گارینیش هێرتزل نەبوو. کاتێک من بینیم ئەو تەواو پلیشابووەوە بە خۆی و دڵێکی لاواز و چاوە ئەفسوونەکانی. بەڵام ئەو تەنگژە ڕۆحییە، دوای بیست ساڵ لە نکوڵی لێکردن، جارێکی دیکە

ئەوی گەڕانـــدەوە، خـــۆ ئەگەر بـــۆ ســـاتێکیش بـــێ ئەوی گەڕانـــدەوە لای خەڵکەکەی، بە دڵنیایشـەوە دەستپێکەکەی لە هـاوار بەسـەرداکردنەکەی "هەی جوولەکەی بڵح" بوو.
قەیـرانەکەش لە میـانەی "ئیتێـپ" etape دا گەیشـتە هەڕەتـی خـۆی. ئەم وشەیەش بە واتـای تایبەتی خۆی لە دەرەوەی یەکێتی سـۆڤیەتدا نەناسـراوە. خـۆ لەنێـو یەکێتـی سۆڤێتیشـدا بەدەر لەنێـو ئۆردوگـا زۆرەملێکـانی بێگاریـدا نەناسراوە. هەر لەوێ واتای تەواوی خۆی هەبوو.
"**ئیتێپ**" واتای گواستنەوەی زیندانیی دەدا لە ئۆردوگایەکەوە بۆ یەکێکی دیکە. ئەو گواستنەوەیەش ترسی مەرگی لای هەموو زیندانیەک هەیە، هەر لە پیاوی دیکسـی ژمـارە یەک، واتە ئەو زینـدانییەی کە کەمتر لە نیـوەی ئەو بێگـاریەی بـۆی دانـدراوە تەواوی کـردووە، بـۆیە خـواردنێکی کەمتـری لەوانـی دیـکە دەدرێتـێ، تـا "فەرمانـدەی هێزەکـان" کـۆمەڵە فەرمانـدە و سەرپەرشـتیارەکان هیچیـان نایـانەوێ "بچـنە **ئیتێـپ**"، ئەوەش هەر لەبەر هـۆیەکی سـادە، چـونکە گواســتنەوە هەمووکــات هەمیشـــە هەر خراپترینیـــان بـــووە. لە هەمووشـــی ترسناکتر بیرکرنەوە لە خودی گەشتەکە بوو.
گواستنەوەکەش لە ڕێی وشکانی و ئاوەوەیە، ئەمەش بێ گوێدانە بارودۆخی کەشناسـییە. زۆر جـارانیش گەشـتەکە چەنـدان هەفتەی دەخایانـد. بـۆ ئەوەی لەوەش تێبگەین، بۆچی زیندانییەکە مانەوەی لە لانە پیس و پۆخڵەکەی خۆی، مانەوەی لە نێوان ڕشـک و ئەسـپێدا پێخۆشـترە لەوەی گەشـت بکـا و هەوای تازە هەڵبمژێ و بەڵکو بەختی لە شوێنێکی تازە باشتر دەبێ، هەر ئەوە بەسـە بـۆ ئەوەی ئەو نـاوچەیە بەبیـر بهێنینەوە کە زسـتانەکەی زیـاتر لە نـۆ مانـگ دەخـایەنێ. شـەوانی زسـتانەکە هەژدە بـۆ بیسـت سـەعات درێـژن و پـلەی گەرمییەکەشـی دادەبەزێـتە ژێـر 60 بـۆ 70 پـلە لەژێـر سـفرەوە. تەنـانەت ئاکنجییە خۆجێیەکانیش لەبارەی کەشـوهەواوە نوکتە دەکەن. "زسـتانەکەمان" ئەوان وا دەڵێن، ""تەنها هەر نـۆ مانـگ درێژە دەکێشـێ. لە دوای ئەوە ئەوەنـدە هاوینـت هەیە تـا حەز بـکەی." بـۆیە سەیروسـەمەرە نییە کە وشـەی "**ئیتێـپ**" ئاماژەیەکی تۆقێنەرانەی هەیە.

گواستنەوەکانیش زووزوو ڕوویان دەدا. یەکێک لە هۆیەکانی ئەو زووزوو گواستنەوانەش لەوانەیە ئاسایشییانە بێ؛ نەهێشتنەوەی ئەو خەڵکە داخ لەدڵانە بۆ ماوەیەکی زۆر لەگەڵ یەک و لە شوێنێکی دیاریکراودا. بەڵام هۆی سەرەکی ئەوەیە کە دەبێ بەرنامەی ئاوەدانی حکوومەت پەیڕەو بکرێ. کاری بێگاری لە ئۆردوگادا بە گوێرەی بارودۆخەکان بە شێوەیەکی ڕێژەیی لەسەرخۆ بەڕێوە دەچێ. بەڵام هەر ئەرکێک لە دوای هەموو شتێکەوە هەر تەواو بکرێ، ئیدی بەرنامەی ئاوەدانی لە پارزەمینی قەبەی ئۆراسیادا بە بەرفراوانی بڵاوبۆتەوە و تا دەهاتیش هەر زیاد دەبوو. هەر زوو پڕۆژەکارێک تەواو دەبوو، پڕۆژە کارێکی دیکە دەستی پێدەکرد. چەند ئۆردوگایەک بەتاڵ دەبوون، چەندێکی دیکەش پڕ دەکرانەوە. جووڵەی نێوان ئۆردوگاکان وەک خودی کارەکە لەگەڕ نەدەکەوت.

لە یەکێک لەو گواستنەوانەدا منیان لەگەڵ گارین فڕێدا بوو. کرۆل Kroll ی برادەرم کە پلەکەی بۆ سەرپەل بەرزکرابووەوە (ئەو لە ئۆردوگا زۆرەملێیەکدا ئازاد نەکرا، واش باوەڕ دەکرێ چەند ساڵێک دواتر لە یەکێ لە ئۆردوگاکان مردبێ)، هەوڵێکی بێوچانیدا ناوی من لە لیستی گواستنەوەکاندا بسڕێتەوە. بەڵام تەقەللاکەی بێ سوود بوو. تەنانەت کراسی یەخەداریش، کە لەنێو ئۆردوگاکەدا بەرز دەنێرخێندرا، نەیدەخوارد. فەرمانمان بۆ دەرکرا کە دەبێ بەرەو ژوورتر هەڵکشێین. گارین هەر خۆیشی بەوە ماندوو نەکرد، بەڵکو هەوڵێک بدا ناوی لە لیستەکەدا دەربهێندرێ. ناوەکەی وەک لە ناسنامەکەیدا هاتبوو بە سێ پیتی C.R.T ئاماژەی بۆ دەکرا، واتای ترۆتسکییێکی دژە شۆڕش بوو، هەموو دەرگە و دڵەکانی لەسەر داخرا بوون. خۆ ئەو هیچ کراسێکی یەخەداریشی نەبوون!

مایەی خۆشبەختیش بوو کە گواستنەوەکەمان کەمێک بەر لە دەستپێکی زستانەوە بوو. بەڵام هێشتاش بارودۆخەکە هەر توند و ڕەق بوو. ئێمە بە بەلەمێکی بچووکی سەر ڕووبار کە بۆ بار دروستکرابوو، گوێزراینەوە. لەسەر پشتی بەلەمە باریکەڵانەکەدا حەفت سەد بۆ هەشت سەد کەسیان تێپەستی بوو. لەوێدا سێ چوار تەختەدار هەبوون. لەسەر ئێمەش قەدەغە بوو بچینە سەر پشتی بەلەمەکە، مەگەر بە مۆڵەت و بە یاوەری چەکداران

نەبووبا، ئەوەش هەر بۆ پێداویستی جەستە بوو. بەڵام بۆ مایەی ڕەزامەندی ئەو پێویستییەش هەمیشە دەبوایە نۆرەمان بگرتبایە. ئێمە بەسەدان بووین، لەسەر پشتی بەلەمەکەش تەنها هەر دوو شوێن هەبوون کە خۆمانی لێ خاڵی بکەینەوە. گەدەشمان بەردەوام لە خواردنەکە یاخی دەبوو، یاخود لەبەر بێ خواردنی دەیناڵاند، دەبوایە هەر لەو ئاوە توندوتیژەی ڕووبارەکەش بخۆینەوە. کێچ و ئەسپێش گۆشتی جەستەیان دەخواردین. بۆنی ناخۆشیش سیەکانی دادەڕزاندی. ئەوەش ڕەوشی ئیتێپ (گواستنەوە) بوو.
بەڵام خۆ خەڵکەکە تەنانەت لە بارودۆخەکەش سەختتر بوون. (ئورکی) ئەو کەسەی "خۆت" نەمابووە ئەو کەسەی بەزەییت پێدا دەهاتەوە و ئەو (ئورکی)ەی دوای ئەو هەموو شتە خەریک بوو تۆی خۆش بوێ و ڕێزیشت بگرێ. لێرەدا (ئورکی) غەریبەیە و تۆش هیچ شتێک نی بەدەر لەوەی "ڕۆشنبیرێک" بیت و ئامانجی هەموو خولە لێتێکەیشتنەکانی ئەو بیت و نێچیرێکی دەستە دزیەکانی ئەو بیت. لەوەش زیاتر (ئورکی) بەهۆی ژمارە زۆرییان، لە ئۆردوگاکەدا زاڵە و لێرەش لە قووڵایی بەلەمەکەشدا هەر زاڵبەدەستێکی ڕەهایە. لەنێو ئەو حەفت سەد تا هەش سەد زیندانییە نەفیکراوەکەدا تەنها چەند دەرزەنێکیان زیندانی "سیاسیین". پاسەوانی سەرپشتی بەلەمیش هەمیشە هەر لەسەر پشتی بەلەمەکەدایە. ئەو خۆی لە سەرئێشەی ناو بەلەمەکە هەڵناقورتێنێ: ئاخر ئەویش (ئورکی) دەناسێ.
لەو کەشوهەوایەدا قەیرانی گارین دەگاتە لوتکە. شەوێکیان، بەڵکو ڕۆژیش بێ، ئاخ کێ دەزانێ؟ گارین لە گێژاوە سەرسوڕانەکەی خۆی بێداربوویەوە، ئارەقەیەکی ساردی بەسەر برۆکانیدا بریسکەی دەدایەوە. سێ سەد رۆبلەکەی دیار نەمابوو. ئەو پارەیە کە بڕەکەی سێ سەد رۆبل بوو، گوژمەیەکی زۆر نەبوو؛ لە هەر بارێکدا خۆ لە ئۆردوگاکەدا بڕێکی زۆر لە پارە پەیدا نەدەکرا. هێشتاش زیندانییەکان دڵیان بەو بڕە پارەیەی نێو دەخیلەکەیان خۆش دەبوو. ڕەنگبێ گارین ویستبای بەو بڕە پارەیە هەندێ توتن یان بسکوێتێکی ڕەقی بێ شەکر بکڕێ. گارین لەم جیهانەدا کەسی بۆنەمابۆوە کە بتوانێ پشتی پێ ببەستێ و کۆمەکی بکا. هاوسەرەکەی، کە وانەبێژێکی زانکۆ بوو، ئەویش لەسەر ترۆتسکیزمی گیرابوو. بەڵام بۆ

ماوەیەک ژنەکەی لەوەدا سەرکەوتبوو کە ئەستۆ پاکی خۆی دەربخا. دوای هەوڵێکی خۆکوشتن نامەیەکی بۆ ستالین نووسیبوو، پەرچووانەش نامەکەی گەیشتبووە دەستی ستالین. ستالینیش پاڕانەوەکەی پەژراندبوو، فەرمانی دابوو بیگوازنەوە نەخۆشخانە و ناسنامەی پارتایەتیش بدەنەوە. گارینیش ئەو کات هێشتا نەگیرا بوو. گارین گوتی: ئەو ڕۆژانەیان خۆشترین ڕۆژگاری جووتە هاوسەرەکە بوو. بەڵام هەر زوو شیرازەی هەموو شتێک لە باریەک ترازا. هاوسەرەکەی جارێکی دیکە گیرایەوە. لەوانەیە زۆر نامەی دیکەی بۆ ستالین نووسیبێتەوە، کەچی ئەمجارەیان بێ سوود بوو. دەمودەستیش دوای گیرانی گارین، ئیدی ئەوان لە یەک دابران. ئەوسا جەنگ بەرپا بوو. ئەو سێ سەد ڕۆبلە سەرمایەکەی بوو، هەنووکەش بەدەر لە جەستەیەکی پیس و پۆخڵ و ئازاری دڵ، هیچی بۆ نەماوەتەوە.

بەڵام خۆ ئەو کوێرەوەرییەی بەهۆی دزینی ئەو برە پارە کەمەی دوایی هۆکاری دوایین قەیرانی نەبوو. گارین هەر هیچ لە دزەکان تورە نەبوو. بە پێچەوانەوە، ئەو لێیان دەپاڕایەوە کە لێی تورە نەبن. ئاخر (ئورکی)یەکە لەوە خۆش نەدەبوو کە سکاڵای لە دەست بکرێ و پاسەوانەکانی لێ تێبگەیەندرێ، ئێمە بەر لەوەی سواری بەلەمەکەش بکرێین، بەندوباوەکانمان بیستبوو، (ئورکی) وا چارەی ئەو کەسانە دەکا کە زمانی لێدەدەن، کە هەرگیز جارێکی دیکە نەتوانن سکاڵا بەرز بکەنەوە. ناوبەناو گوێمان لێدەبوو، کە (ئورکی) بە شێوەیەک گەمەی کارتی لەسەر سەری قوربانییەکانی دەکرد، بۆیە ئەو کەسەی لە گەمەکە دەدۆڕا، دەبوایە چارەنووسی هەمان چارەنووسی قوربانییە دەستنیشانکراوەکە بووبایە.

گارین تا دەهات ڕاشکاوانەتر دەکەوتە بن باندۆری ئەو سەربردانە. لە ترس و تۆقینەکەی خۆیدا، باوەڕی بە خۆی هێنابوو، ئەو (ئورکی)یەی دزیەکەی لێکردووە، گومانی ئەوەی لێدەکا بەڵکو لای پاسەوانەکەی سکاڵای لێکردبێ. ئیدی ئەو خەیاڵبازانە چەندان دیمەنی دەهێنانە پێشچاوی خۆی. کاتێک بە بەردەم دەستەیەک لە تاوانباراندا دەڕۆیشت کە گەمەی کۆنکانیان دەکرد - قەدەغەکردنی گەمەی کارت سەرکەوتووانە لە ڕووسیا تەنانەت لە زیندان و ئۆردوگا زۆرەملێکانیشدا فەرامۆش کرابوو- ئیدی ئەو وای دادەنا یاریەکە

لەسەر سەری ئەو دەکەن. بۆ چەندان ڕۆژ و شەو گارین وەک منداڵ بە من نوسابوو. نەخێر، ئەو مێشکی خۆی لە دەست نەدا بوو. ئەو هێشتا ڕۆشنبیرە بە ئاگاکە بوو. کاتێکیش لەوەدا سەرکەوتم ترس و تۆقینی لە بیر بەرمەوە، ئێمە دەربارەی وێژە و فەلسەفە، دەربارەی دیستۆفیسکی و سۆکرات دواین. ئەو پڕ بوو لە گەنجینەی هۆشمەندی. بەلام لە کۆتاییدا شتێک لە هەناوی ئەودا ڕووخا بوو.

کاتێک ئێمە لەسەر تەختەدارەکان پاڵکەوتبووین، یەکێک لە (ئورکی)ەکان بە هێواشی لە سەرتەختەکەی سەرەوە دابەزی. گارینیش کە لە تەنیشت منەوە بوو، خۆی لە بن باڵمدا گرمۆڵە کردبوو، ئەمجارەیان نەوەک بە ڕووسی بەڵکو بە زمانی ئیدیشی پێی گوتم: "ئەو پیاوە بۆ کوشتنی من هاتووە!" منیش تەماشای جێنیشانی ئەوم کرد، دیمەنەکە بە ڕاستی بەدکارانە بوو. پیاوەکە لەسەرەخۆ دەڕۆیشت، لەو تاریکاییەدا سێبەرێکی گەورەی پەیدا کردبوو. ئینجا لە ئێمە نزیکتر کەوتەوە، شتێکیشی لە نێودەستدا بوو، شتێک بوو بۆمان لێکنەدەدرایەوە ئاخۆ چی بوو. لەو بەلەمە و لەو کەشوهەوایەدا، بۆ کەسێک کە تا سەر ئێسقان تێکشکابوو، ئەو دیمەنە ئاماژەیەکی دیاربوو کە بڕوا بکا کۆتاییەکەی نزیک بۆتەوە و ئەو ئورکیەش هیچ نییە زیاتر لەوەی بکوژەکەی بێ. لە ڕاستیشدا (ئورکی)یەکە تەنانەت بیریشی لە گارین نەدەکردەوە. ئەو شتەی لەنێو دەستیشیدا بوو تەنها کەوچکێک بوو. بەلام گارین هەر کەوتە بارێکی ژان و ناسۆری بێ کۆتایی. منیش بە زەحمەت توانیم هێوری بکەمەوە، بەڵام خۆ هەر بۆ ساتێک بوو.

ئەو لەسەر ئەو بڕوایە بەردەوام بوو، کە ئورکی هەرگیز لێی خۆش نابێ، ئیدی چارەنووسی مۆرکراوە، زوو یان درەنگ لەسەر دەستی ئەو کۆتایی پێدێ. شەوێکیان دیسان - لەوانەیە ڕۆژیش بێ- ئەو گەڕایەوە لای من و پرسیارێکی نامۆی لێکردم:

"مێناحیم، ئەرێ گۆرانی لۆشوقت لەبیر ماوە؟"

ئەو، وشەکەی وا گۆکرد، یەکەمین وشەی عیبری کە لەوم بیستبێ بە شێوەیەکی ئەشکەنازیانەی دەردا و منیش نەمدەزانی ئاخۆ ئاماژە بە چ گۆرانیەک دەکا.

ئەو هەندێک تورە بوو.

"باشە چۆنە لەبیرت نەماوە؟ خۆ ئەوە سروودی زایۆنیستەکانە کە لە ئۆدیشیادا دەیانگوت، کاتێ من لاو بووم گوێم لێبووە. 'لۆشیڤ' دەی ئەو گۆرانییەم بۆ بڵێ. خۆ لەوانەیە ئەمە دوا ڕۆژم بێ، لەوانەشە دوا سەعاتم بێ. ئیدی ئێمە هەرگیز یەکدی نابینینەوە. دەی توخوا، گۆرانییەکە بڵێ."

لەوێدا لەنێو گەمیەکەدا چەندان جوولەکە هەبوون. ئەوان نە زیندانی سیاسیی و نە تاوانباریش بوون. ئەوان لە کاتی پەڕینەوەی بەرەی پێشەوەدا گیرابوون. لەنێو ئەواندا دوو گەنجی ئەندامی بێتار[17] هەبوون کە جێی نووستنەکەیان نزیکی من بوو. ئێمە هێشتا توانای گۆرانیمان تێدا مابوو. ئیدی ئەوەمان کرد کە گارین لێی خواستبووم. ئێمە گۆرانی لۆشوڤمان گوت. ئەویش هاتیکڤا Hatikvahیە، ئەو سرووودە نەتەوەییەی ئیسرائیل 'Lashuv 'lêeretz avotenu "*هیوامان بە گەڕانەوە بۆ خاکی باپیرانمان*."

لەوێدا گەمیەکە بەرەو باکوور بەرەو هەرێمی جەمسەری باکوور هەڵدەکشا. تاریکستان بوو. پیسی و پۆخڵی بوو. بۆن بۆگەنی دەهات. کێچ و ئەسپێ ڕیزیان بەستبوو. حەفت سەد (ئورکی) نیوە هۆڤی بوون. چەند جوولەکەیەکیش. ژمارەیەک بەقەد پەنجەی دەستێک خەونبینەر بەزایۆنەوە لەوێ هەبوون. ئەرێ بۆچی ئەوان لەوێ بوون؟ ئاخر ئەوان بۆ کوێ دەڕۆیشتن؟ ئاخر ئەوان دادی چیان دەدا؟ لەنێو ئەوانیشدا، جوولەکەیەک، یاخود ڕووسیەکی بە ڕەچەڵەک جوولەکە هەبوو، کە هەرگیز خەونی بە زایۆنەوە نەدەبینی، هەروەها هەرگیز بڕواشی بە زایۆن نەبوو، لە هەموو ژیانیشیدا هەر ئەوەی گوتار بوو کە زایۆنیزم بزووتنەوەیەکی "پاشکەوتنخوازانەیە". هەموو ژیانی بۆ هزرێکی دیکە تەرخان کردبوو، هزرێکی گەردوونیی، شەڕی لەسەر بەربەستەکانی دەکرد، وایلێهات لەسەر بیرۆکەکەی بگیرێ و بە دەستی "ڕووسە سپییەکان" ئەشکەنجە بدرێ. ئەو بە بڕواوە خزمەتی دەکرد، پلەو پایەی لە بڕواکەیدا بەرزکرایەوە، گەیشتە سکرتێری گشتی پارتەکەی، بووە یاریدەدەری سەرنووسەری ڕۆژنامەی

---

[17] بێتارBetar کورتکراوەی ناوی Bert Trumpeldorە، ئەو ڕێکخراوە لاوەی کە ڤلادیمیر ژابۆتینسکی دایمەزراندبوو. بێتار لە مێژوودا ئەو قەڵایە بوو کە بار کۆخبا Bar Kochba دوا ویستگەی پاڵەوانانەی خۆی لە شۆڕشەکەی دژی دەسەڵاتدارانی ڕۆمانیەکان لە فەلەستینیدا لە سەدەی دووهەمی زاینیدا ئەنجام دا.

ڕۆژانەی پـارتەکەی. ئـای کە ئەوە چەنـد لە زایـۆنەوە دوور بـوو! ئـای ئەو شوێنەش کە چارەنووس بەیەکەوە ئێمەی بۆی برد لە زایۆنەوە دوور بوو! بەلام هەر ئەو پیـاوە، ئەوسـا بـڕواکەی هەرچییەک بـێ، لە دوا سـەعاتەکانی ژیانی سەر زەویدا داوای لێکردم، سرووودی زایۆنی بۆ بڵێم!

ئێمە سرووودەکەمان گوت. تۆبڵێی هەرگیز سـەوزایی ڕووباری پێچۆرا پێشتر گوێی لە سرووودی "هاتیکڤا" بووبێ؟ تـۆبڵێی هەرگیـز (ئورکی)یە حەپەسـاوەکە گـوێی لە گـۆرانییە عیبـریەکە بـووبێ؟ لەنێـو جەرگەی گەمـیەکەدا سـرووودەکە دەتەقییەوە:

***" گەڕانەوە بۆ خاکی باب و باپیرانمان."***

## بەندی ٣
## "لە ئازادییــدا یەکــدی دەبینینەوە"

٦٦ - ز ٧

هەر لەسەر پشتی ئەو گەمیانە بوو، ئازادیم بەدەست هـاتەوە. هێشتا هەر لە ڕێگاماندا بـووین بـۆ شـوێنە مەبەسـتەکەمان لە زەریـای جەمسـەری بـاکوور کاتێـک فەرمـــانی ئـــازادکردنی هاونیشـــتمانییە پۆلۆنییەکـــان دەرچـــوو. سیکۆرسکی[١٨] پەیماننامەی لەگەڵ ستیالیندا واژۆکرد.

بە گوێرەی ئەلفبێتکەی پیتی ناوەکان، ناوی من لە سەرلیستی ئازادکراوەکان بوو. (ئورکی)ەکیش هاواری کرد:

"ئاخر خۆ ئەو پۆلۆنی نییە، ئەو جوولەکەیە!"

ئای (ئورکی) بەستەزمان، نارەزاییەتیەکەی شتێکی خۆڕسکانە بوو. ئاخر لەو ئێرەییە قـوولتر نییـە کـاتێ زینـدانیەک دەبینـێ هاوزینـدانیکەی ئـازاد دەکرێ. تـۆبڵێی یەکێـک ئەوەی ڕەچـاوکردبێ، کە (ئـورکی)یەک جیـاوازی نێـوان ڕەگەزنامە و ناسنامەیی نەتەوەیی زانیبێ؟

ئێمە لە کەنارەکە نزیـک بـووینەوە. بەلەمێکی بچـووک بەرەو ڕوومـان دەهـات، ئەو بەلەمەی ئـێمەی لە گەمـیەکەی زینـدانییەوە ئـازاد کـرد. ئـێمە لەســەر بەلەمەکە دابەزینە سەرکەنارەکە، ئێمە ئازاد کراین.

ئێمە چەندان ڕۆژ لە ئۆردوگای ڕاگواستن مـاینەوە. بەهەمـان ڕێگـا، کە پێشـتر ئێمە بەرەو باکوور ڕۆیشتین، گەڕاینەوە. ئێمە ئەو ئۆردوگایەمـان تێپەڕاند، کە لە بینـــاکردنی هێڵـــێ ئاســـنینی بـــاکووردا یـــارمەتیم دابـــوون. مـــارکۆڤی سەردەستەی کۆمەڵەکە لەسەر لێوارەکە بوو.

"هاوڕێ مارکۆڤ سڵاو، کاروبار چۆنە؟ ئەرێ کرۆل لە کوێیە؟"

"هەمـوو شـتێک باشـە. کرۆلیش گواستراوەتەوە ئۆردوگایەکی دیکە. لەوانەیە ئەویش بەو زووانە ئازاد بکرێ. ئەدی تۆ، ئەرێ تۆش ئازاد کرای؟"

---

[١٨] ولادیسلاو سیکۆرسکی (١٨٨١-١٩٤٣) سەرۆوەزیری نەوساى پۆلۆنیا. وەرگێر.

"بەڵێ، هاوڕێ مارکۆڤ. من ئازاد کرام. ئەرێ لەبیرت ماوە، بڕوات نەدەکرد ئێمە لە دەست ئێتیپەکە قوتارمان بێ؟"
"بەڵێ هاوڕێ بێگن، لە یادمە. ئێوەی پۆلۆنی بەختتان هەبوو. بەڵام کێ دەزانێ؟ کێ نالێ ئێمەش هەر زوو لێرە دەردەچین. شەڕ بەردەوامە، ئەوان باس لە لێخۆشبوونێک دەکەن."
" هاوڕێ مارکۆڤ، بەختێکی باش بۆ تۆش. هیوادارم بەخشینی تۆش زوو بگا. بەختێکی باش. تا بەیەک گەیشتنەوە لە سەربەستیدا."
ئێمە لەسەر ڕێی خۆمان بووین بەرەو ئازادی. بەپێ، بە شەمەندەفەری بار، بە شەمەندەفەری نەفەرهەڵگر، خۆمان پێیەوە گرتبوو. ئاراستەشمان بەرەو باشوور و هەر باشوور. ئیدی پەڕجوەکان لە وەستان نەکەوتن. من بە دوای خوشکەکەمدا گەڕام. ئەویش هەرچەندە نەگیرابوو بەڵام دوورخرابووەوە. تۆبڵێی چۆن بدۆزرێتەوە؟ ئاخر ڕووسیا وڵاتێکی قەبەیە، ئاوارەکانیش بە ملیۆنانن. هێشتاش هەر بە ڕێکەوت دۆزیمەوە. ئەوسا چەند برادەرێکم دۆزینەوە. لەوێوە یەکەمین بروسکەم بۆ ئێرتز ئیسرائیل نارد. لە ئێرتز ئیسرائیلیشەوە یەکەمین بروسکەم وەرگرتەوە. لە نێو واژۆکاندا واژۆی هاوسەرەکەم لەسەر بروسکەکە بوو...
من دوا هەواڵی هاوسەرەکەم لە بیرە. بەر لەوەی لە گرتووخانەی لوکیشکییەوە من بەرەو ئۆردوگای زۆرەملێی باکوور بنێرن، ڕێگەم درا بەهۆی خزمێکەوە خواحافیزیکردن بکەم. ئیدی لەجیاتی ژنەکەم، کچێکی گەنج، پاولا داشیز هات. دواتر پاولا لە شەڕی دژی نازیەکانەوە ناوی چووە نێو ناوی نەمرانەوە. ئەو بووە یاردەدەری سەرەکی برادەر و هاوڕێم جۆزێف گلازمان، ئەو پاڵەوانەی گێتۆی ویلنۆ، هەر لەوێش شان بەشانی پاڵەوانەکە تا دوا هەناسە جەنگا و گیانی لە دەست دا. ئیدی پاولا هاتبوو هەواڵم بداتێ. کاتێکیش ئێمە دەبوایە بە زمانێک بدوێین کە پاسەوانەکان لێمان تێبگەن، بە زمانی پۆلۆنی کەوتینە قسەکردن. بەڵام پاولا بەو شێوەیە هاتە دوان:
"پورەکەت سڵاو و خۆشەویستیت بۆ دەنێرێ." ئینجا بە زمانی عیبری منگەمنگێکی لێوەهات "نامەیەک لە نێو سەرکە سابوونەکەدایە."
پاسەوانەکانیش ئەو سەرکە سابوونەیان لە نێوەڕاستدا کردە دوو لەت، بەڵام

پەیامەکە واپێچرابووەوە، خرابووە لایەکی سابونەکە. کەواتە، تەنانەت لە نێو گرتووخانەی رووسیشدا، پەیام دەگەیشتە شوێنی خۆی. ئەو کورتە پەیامە پێیراگەیاندم، ژنەکەم، هەروەک چۆن چەند برادەرێکی باشیشم، بەرەو ئێرتز ئیسرائیل کەوتونەتە رێگا. ئەوێ دەمێ هەواڵەکە مایەی دڵدانەوەیەکی زۆر بوو. بەڵام ئاخۆ ئەوە چ سەرچڵییەکی منداڵانە بوو! خۆ ئەگەر منیان بەو کورتەنامەیەی نێو سابوونەکەوە گرتبا، لەوانەبوو حەفت رۆژی دیکەی زیندانی تەنیاییان بە سەردا سەپاندبام. بەڵام ئەو...

دوای چەند مانگێک لە رۆیشتن و سەرگەردانی، پەیوەندییم بە لەشکری پۆلۆنییەوە کرد، لەوێشەوە کەشوهەوایەکی دژەسامیانە، نەیارانە و سووکایەتی پێکردنم بینی. بەڵام ئەو رۆژانە زۆر درێژ نەبوون. ئێمە بەرەو باشوور بەرەو بەندەری قەزوێن یان کرانسۆڤۆدسک، ئەو بەندەرە بچووکە فارسییەی پەهلەوی، رێگاوبانە خێراییەکەی داگیرکەرە فارسەکان رۆیشتین. لەوێدا چیای بەرز و مەزنمان بڕین. بە بابل، بەغدا، دەریاچەی حەببانیەدا گوزەرمان کرد. ئەو کات نەمدەزانی، هەر چەند هەنگاوێک لە گۆرەکەی داڤید رازیل فەرماندەی ئیرگون زڤای لێئومی دوورم، کە لە کاتی راییکردنی ئەرکەکانی لەنێو سووپای بەریتانیا لەوێدا کوژا. من هێشتا هەر بەو هیوایە دەژیام لە پاڵ ئەو و لەژێر فەرماندەیی ئەودا بجەنگم.

ئەوسا گەیشتینە رۆژهەڵاتی ئوردن. میراتەکەمان. گێلگەی پانوپۆر، بەربەرین هەروەک دەریا. ئیدی تێگەیشتم بۆچی رۆمانەکان ئەو بەشەی ئێرتز ئیسرائیلیان ناونابوو فەلەستینی سازگار. ئەو سەردەمە عەمباری گەنمی رۆژهەڵاتی ناوەراست بووە. هەنووکەش سەرباری گوێپێنەدان، لە ژێرەوە لەنێو بەردەکاندا سەوزایی تەقیوەتەوە، گیای کەسک و درێژ، مایەی شادمانییە. سەرتاپای دەڤەرەکە چۆڵەوار بوو. لێرە و لەوێ، لەو رووبەرە بەرفراوانەدا، هۆبەی رەوەند و مێگەلە وشترت دەبینی. کاتێکیش لە ئوردن نزیک دەبوویتەوە، چەند کەسێک و کێلگەی گەنمە شامیت بە پیرەوە دەهاتن. ئەوسا کەناری رۆژهەڵاتی ئوردن- ئێرتز ئیسرائیل بوو. کاروانە سەربازییەکە وەستا. ئێمە پشوومان دا. من لە ترۆمبێل دابەزیم، هەندێک لەنێو سەوزە گیاکەدا بە پێیان رۆیشتم، لەنێو بۆنی خۆشی چیمەنەکەی نیشتمانەکەمدا خواردمەوە.

"ئای چەند خۆشە لە نیشتمانی خۆت بی، ئەریٚ وانییە؟" ئەوەش تێبینی یەکێک لە سەربازەکان بوو، کابرایەکی غەیرە جوو بوو، لە تەنیشتمەوە وای پێگوتم.
کاتێک ئەو قسەی کرد، بەبیرم هاتەوە، کاتێ لە ئۆردوگای زۆرەملێی سەر لێواری ڕووباری پێچۆرادا تۆمارنامەی ئەویٚ بە فەرمی بانگی کردم: "تۆ لە ٢٠ی سێپتیمبەری ١٩٤٨دا ئازاد دەکرێی."
ئەو ڕامانە، بەرسەربردنی ئەو هەموو ساڵانە تا ١٩٤٨ بە یاوەری مارکۆڤ یان بێرمەنکە مایەی سەرنجڕاکێشان نەبوو. بەڵام ئاخۆ هێشتاش پیاو دەتوانیٚ پێشبینی بەختی خۆی بکا؟ هەنووکەش هاوینی ١٩٤٢ە، من لە سەر لێواری ڕۆژهەڵاتی ڕووباری ئۆردنم.
ئیدی گارینم بیرکەوتەوە. من هەنووکە بیرم لێکردەوە. مەراق مام تۆ بڵێی مابیٚ؟ تۆ بڵێی بیستبێتی کە ئێمە ئازادکراوین و گەڕاوینەتەوە خاکی باب و باپیرانمان؟ تۆ بڵێی ئەوەی بیستبیٚ کە یاخیبوونێک لە ئیسرائیلدا بەرپا بووە؟ خۆ پراڤدا سەبارەت کار و کردەوەی بەرخودان و سەرهەڵدانی دەوڵەتی ئیسرائیلی شتی نووسیبوو. تۆبڵێی ئەو ئەوەی بیستبیٚ، ئەو دەوڵەتە مەزنەی کە ئەو خزمەتی دەکرد، لە سەرەتا دژایەتی سەرهەڵدانی دەوڵەتی ئیسرائیلی کرد، کەچی لە کۆتاییدا لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا یارمەتی دا تا دابمەزریٚ.
لەوانەیە ئەو پەرجووانە لە کۆتاییدا هەندیٚ لە ژان و ئاسۆری کەم کردبێتەوە.
بەندێک کۆتایی پێدیٚ و بەندێکی دیکە دەست پێدەکا. چارەنووس ڕۆڵێکی سەیر و سەمەرانەی بەسەر مندا گێڕا. لە سەرەتای حوزەیرانی ١٩٤١دا گەشتەکەم لە گرتووخانەی لوکشیکەوە بەرەو باکوور دەستپێکرد. لە سەرەتای ئایاری ١٩٤٢شدا گەیشتمە ئێرتز ئیسرائیل. من گیرام، تاوانبارکرام و حوکمم بەسەردا دراو وەک "ئاژانێکی ئیمپریالیزمی بەریتانیش" دوور خرامەوە. ئەدی چی لەو ئاژانەی بەریتانی هات؟ لەگەڵ لەشکرێکی پۆلۆنییەوە گەیشتمە ئێرتز ئیسرائیل، هەر زووش پاداشتێک بۆ گرتنی من دەرچوو، چونکە هەوڵی داوە دەسەڵاتی بەریتانیا لە ئێرتز ئیسرائیلدا بشکێنێ. (ئەوەش تاکە ریکۆردە کە پێی گەیشتبم و هەمیشەش شانازی پێوە دەکەم.)
لەم بەندە نوێیەدا شتێکی دیکەش ڕۆڵی بەسەرمدا بینی. کاری پیلانگێڕانە، تا ناچار نەکرام تیایدا قووڵ نەبوومەوە، بۆ من شتێکی تەواو نەناسراو بوو. بەدەر لە خوێندنەوەی کتێبێکی سەرپێی، هیچم دەربارەی چالاکی

ژێرزەمینیەوە نەدەزانی. هەرگیز خەونم بەوە نەدەبینی، کە بە نهێنی بجەنگم. مـن پەردەهەڵـدانەوە لەسـەر شـتە نهێنییەکـانی بە باشـی دەزانـی، بەڵام هێشتاش...

مرۆ دەکـا تەگبیـران، خـوا دەدا تەدبیـران. تـا سـێپتێمبەری ١٩٤٨ مـن لەگەڵ لەشـکرێک خـزمەتم کـرد، بەڵام نەوەک لەشـکرێکی وەک هـی مـارکۆڤ یـان پێرمێنکە. ئەوەش ئەوکارە نەبوو لە لێوارەکانی ڕووباری پێجۆرا کرا. ئەوەش نەبوو ڕێگەی ئاسنین بۆ بارکردنی خەڵک و کاڵا بنیات بنرێ. ئەو لەشکرەی من خزمەتم تێیدا کرد لەشکرێکی یاخیبووانی جوولەکە بوو. ئەو لەشکرەش لەسـەر لێوارەکـانی ڕووبـاری ئوردنـدا دەسـتبەکار بـوو، ڕێگـای ئـازادی ئیسرائیلی لێدا.

# بەندی ٤
# ئێمە دەجەنگین، کەواتە ئێمە هەین

٧١ - ١٠

## 1

دوو ڕاستی زۆر زاڵ بارودۆخی گەلی جوولەکەی لە هەرەتی گەرمی جەنگی دووهەمی جیهانیدا یەکلاکردەوە. هیتلەر بە ملیۆنان جووی لە ئەورووپا لەناوبرد، سەرەڕای ئەمەش بەریتانییەکان بەردەوامبوون لەسەر داخستن و کلۆمدانی دەرگاکانی "نیشتمانی نەتەوەیی"[١٩] جوولەکە لە بەردەمیاندا.
ڕاپۆرتە هەواڵەکانی هەڵمەتی قڕکردنی جوولەکەکان لە ئەوروپا، لە سەرەتادا زۆر ڕۆشن نەبوون و بڵاوکردنەوەشیان هێواش بوو. دەزگای خاچی سوور، نوێنەرایەتی دیپلۆماسیانەی وڵاتە بێلایەنەکان و لە سەرووی هەمووشیانەوە دەزگای هەواڵگری بەریتانیی کە یەکێک لە ئاژانەکانی کە لە ڕاستیدا لە ئاڵمان کاریدەکرد، بێگومان دەقاودەق دەیزانی کە بۆ چ کۆتاییەک جووەکانی هۆڵەند، بەلژیک، وارشۆ و لۆدز دەگوێزرێنەوە، بەڵام لەسەریشی بێدەنگ بوون. ئەریێ بۆچی لەبەرچاوی خەملاندنی هەمووان ئەوان وا قەلاقوپیان لێکردبوو. چەند مانگێک دوای قڕکردنەکە، ڕاستیی ئەوەمان پێدەڵێ، کە سەرەتای ڕاپۆرتەکان لەبارەی "دەستەی تایبەتی" نازییەکان ئەوە دەردەخەن، کە فەرمانیان دەرکردووە هیچ جوولەکەیەک لە ژێر قەڵەمڕەویتی ئاڵماندا بە زیندویی نەهێڵن.
هەروەها هەندێ لە جووەکانیش بە گومانەوە لەو ڕاپۆرتانەیان ڕوانیبوو، ئەوەش شتێکی سەرسامانە نەبوو! ئاخر بۆ مرۆڤ سەختە بڕوا بەوە بێنێ کە دایبابی، یان منداڵەکانی یاخود برا و خوشکەکانی هەر وا سووک و ئاسان بەو شێوەیە لەناو براین و هەروەک مەڕ ببردرابنە کوشتارگە. بە گشتی مرۆ ئەوە بڕوا دەکا کە حەزی پێیە بڕوای پێ بکا. خودی ئەو خێزانە کلۆڵانە، کە

[١٩] لێرەدا نیشتمانی نەتەوەیی ئاماژەیەکە بۆ بەڵێنی بلفور لە ١٩١٧دا و ئەو دەستەواژەیە دەق لەوێ هاتووە. وەرگێڕ.

نازییەکان فەرمانیان بەسەردا کردبوون گۆڕ هەڵبکەنن، بڕوایان نەدەکرد، ئەو گۆڕانە بۆ خودی خۆیان بێ. ئەوان لەو بڕوایەدا بوو، هەر چۆنێک بێ لە دوایدا ڕزگاریان دەبێ. ئیدی ئەو کەمە پەڕجووەش ئاسان نەبوو لە لایەن باقی جووەکانی دیکەی جیهان مایەی بڕواپێکردن بێ کاتێ بە گۆڕە بەکۆمەڵەکانی پۆناری، یان گۆڕستانی تریبلینکی[20] یان زانی، ئەوان لە خۆیان دەپرسیەوە، ئاخر چۆن لە سەدەی بیستەمدا تەواوی خەڵکەکەیان بەم شێوەیە بسڕێتەوە؟ تۆبڵێی جیهان لەو بارەیەوە چی بڵێ؟

ئای ئەوان چەند ساویلکە بوون! ئەوان دەرکیان بەوە نەکرد، دەقاودەق ئەو گیانە پێشکەوتووەی سەدەی بیستەمە، کە قڕکردنی سەرجەم گەلی جوولەکە بهێنێتە ئارا؛ لەوەش زیاتر کاتێک باس لە گەلی جوولەکە بکرێ، ئیدی "جیهانەکە" بە بەرفراوانی بێهەست و خوست دەمێنێتەوە.

فریشتەی لەبیرچوونەوە بوونەوەرێکی پیرۆزە. دەستلێدان لە باڵەکانی هەموو برینەکانمان سارێژ دەکا. توانستی لەبیرکردن بەقەد توانستی یادکردنەوەمان گرنگە. هەر لەبەر ئەوەشە ئێمە نابێ تووڕە بین، هەروەها نابێ سەرسامیش بین، کە هەر تەنها چەند ساڵێکی کەمە ئەم کارەساتە بێ وێنەیەی مێژووی مرۆڤایەتی بەسەر چووە، کەچی لەنێوماندا هەن خەریکە پرسەکەی لەبیر بچێتەوە. بەڵام ئێمە زات ناکەین ئەو لەبیرچوونەوەیە لە خۆمان دابڕنین. لەبەر خاتری ئایندەکەمان و لە پێناوی ئایندەی مرۆڤایەتی، زات ناکەین ئەوەی لەم سەدەیەدا و لە میکانیزمی شارستانیەتدا و لەنێو جەرگەی ئەوروپای شارستاندا قەوما، فەرامۆش بکەین.

ئەو هەڵمەتەی قڕکردنە هەروا لە پڕەوە نەهات. لە ڕاستیدا چەندان ساڵ بوو بە وشیاریی، سیستماتیکی و زانستییەوە ئامادەکاری بۆ دەکرا. هەر زوو هیتلەر لە ١٩٣٦دا لە ڕایشتاخدا جاڕیدا: "جەنگێکی دیکە ئەوەیە، جوولەکەی ئەوروپا کۆتاییان پێبهێندرێ." لە ١٩٣٩شدا ئاڵمان ناوچەیەکی یەدەگی بۆ جووەکانی نزیک لوبلین ئامادە کرد؛ ڕۆژنامەکانی ئاڵمانیش باسیان لەوە

---

[20] تریبلینکی لە ڕۆژهەلاتی ئەوروپادا یەکێکە لەو کوشتارگە گەورانەی کە ئەڵمانەکان لە ماوەی جەنگی دووهەمی جیهاندا بەسەر جووەکانیاندا هێنا. وا دەخەمڵێندرێ لەوێدا نزیکەی ملیۆنێک جوولەکە بە ژن و پیاو منداڵ سەربڕابێ و لاشەکانیشیان سوتێندرابێ. جلو کەلوپەلی لەناوبراوەکانیش بۆ ئابووری ئاڵمانەکان بەکار هێندرا، کاتێکیش هاوپەیمانەکان گەیشتنە ئەوێ لەنێو بەڵگەکانی دیکەی ئەڵمانەکاندا کە بەباشی ڕێکیان خستبوو، شەست هەزار جووت پێلاوی منداڵانیان دۆزیبووە کە بەر لەناوبردنیان لێیان سەندبوون.

دەکرد، نەخشـەی گواسـتنەوەی هەمـوو جووەکانیـان بـۆ "دەوڵەتێـک" لە نـاو جەرگەی ئەفریقیـا یـان مەدەغەشـقەرەوە هەیە. ئەوسـا هەواڵـی دامەزرانـدنی چەنـدان گێتـۆ بڵاوبـوونەوە، کە هاوکـات بـوون لەگەڵ کـردەی کوشـتارگە و خوێنڕشــتن. لە ڕاستیشــدا ئەو کەمە کوشــتارگانەی ئەو کــات و زۆریــنەی ســـووکایەتی پێکـــردن و بەنـــزم ســـەیرکردن، دەســـتپێکی ئەزمـــوون و ســەرژمێرییێکی وریایــانە و چــاودێریکردن بــوون. ئەو شــارەزایانە کاریــان لەســەر کــاردانەوەی هەم جووەکــان و هەم جیهــانیش کــرد. ئیــدی هەر ئەو کاتەی ئەوان لەبیر کران، لەژیانیاندا بە ملیۆنـان جوولەکە لەناوبران و بوونە قەرەبروت.

هەنگـاو بە هەنگـاو، قۆنـاغ بە قۆنـاغ جەلـلادە ئاڵمـانەکە خەڵکی ئێمەی خستە بارێکی تۆقین و شێوانەوە، شیرازەی کۆمەڵبوونەکەی لێکترازاند، وای لێکردن تەنهـا بـۆ مـانەوەی ژیانیــان هەوڵبــدەن و هەنــدێ جـار ئەو تـاکە تروســکە هیوایەشیان پێ لە دەستبدا، کە ئامادەی خۆبەختکردن بن بۆ ئەوەی ژیانی یەکێـک قوتــار بــکەن. لە هەمــان کاتیشــدا جەلــلادەکە کــاردانەوەی جیهــانی تاقیدەکردەوە، ئەو وایدانابوو، بەگوێرەی ئامـانجی شـارەزاکانی بە شـێوەیەکی گشتی بێ دەنگییێک لەسەر ڕژانی خوێنی جوولەکە هەیە. لەوەشـدا ئەو شـاش نەبوو. چەنـدان سـاڵ دوای لێکەوتەی ئەو تـاوانە گەورەیەی کە بۆ هەمـووان ئاشـکرابوو، مسـتەر پـاگێتی سۆشیالیسـتخواز، ئەنـدام پەڕلەمـانی بەریتانیـا لە دادگـای تاوانەکـانی جەنـگ لە هامبۆرگدا جەختـی لەسـەر ئەوە کـردەوە، کەوا لەشکری ژەنەڕالی نازی ماینستاین لە پۆلۆنیادا هەم جەنگاوە و هەم ڕەفتـاری لایەقانەشـــی نوانـــدووە. ئەوەش لە پۆلۆنیـــایەک کە ڕووبارەکـــانی بەخـــوێنی سـەدان هەزار جـوولەکە سـوور ببـوون! ئـاخر خـۆ مسـتەر پاگێـت مـاوەیەکی بەردرێژ بەر لە پلەو پایەی فەرمیی، پارێزەرێکی ناسراو بـووە و لە دادگاکانـدا ڕۆڵـی پیشـەییانەی وازیکـردووە. خـۆ هیـتلەر یەکسـەر بە جـوومله دەسـتی بە کوشـتنی خەڵکی نەکرد. سـەرەتا جووەکـانی گـرت؛ کـاتێکیش بینـی جیهـان لە ئاسـتیاندا کـڕو بێـدەنگە، ئەوسـا برسـی کـردن و قـاتوقڕی خسـتە نێویـان؛ هێشتاش لەسەر ئەوان مێشیش مێوانی جیهان نەبوو. ئەوسا چڕنووکەکـانی گیرکـردن، کەڵبەکـانی تیـژ کـردن، بەڵام تـاڵە مـوێیکی بـرۆی جیهـانی دەرەوە نەبزوت. ئیدی ئەو ئاوا هەنگاو بە هەنگاو ڕۆیشت تا گەیشتە ئەو پەڕی تـونی

مەرگ و ژووری گـاز. هیـتلەر پێشـتر گـازی ژاراوی بـۆ ئەو مەبەسـتە ئامادەکردبوو، ئاخر پێشـتر لەبەرەکانی جەنگ تـاقی کردبـووەوە؛ بەڵام تـا دەهـات پـێگەی سـەربازییانەی بە هـۆی بەکارهێنـانی گـازە ژاراویەکە بەرەو سەختی و بێهـودەیی دەچـوو، تاکە خەڵکانێک کە وێرای گـازە ژاراوەکەیـان لەسەر بەکار بهێنێ، کەسیش لەسەریان بەدەنگ نەیەت، جوولەکەکان بوون.
ئەو کرێـی و بێـدەنگییە دژوار بـوو. مرۆڤـایەتی دەبـوایە بەلای کەمـی لە دۆزەکـانی نـادادیی دریفـیس لە پـاریس تـا سـاککۆ و ڤـانزێتی لە ئەمریکـا و دیمیترۆڤ لە بەرلین بێدەنگ نەبووبایە. ئاخر مرۆڤایەتی کاتێ لە دەربارەی چارەنووسی ملیۆنان لە دۆزی دریفوس بێ خەم مایەوە، پاشەکشـەی کرد و گەڕایەوە نێـو تاریکـایی یـان لەوەدا -لە مـاوەی ئەو سـاڵە دووروودرێـژانەدا نوشسـتی هێنـا- کە ئەمیـل زۆلایەکـی دیـکە بەرهەم بهێنـێ. کـاتێکیش بە شـێوەیەکی بەربەریـن مرۆڤـایەتی لە لایەن دوژمنێـک کە پێـی دەگـوترێ ساردەخەمی، هەڕەشـەی لێدەکرێ، ئـاخر تـۆ بڵێـی ئەو گەف و هەڕەشـەیە لەسـەر جـوولەکە چەنـد مەزن بێ؟ هەر بۆیەشـە زۆرتـرین هۆشـداریینامەی شـکۆدارانە لەسـەر زمـانی نەمریـی کیپلینـگەوە[21] هـات، هۆشـداریینامەکە بە جـوولەکە هەر وەک بە غەیـرە جـوولەکەش دەدرێ، کە دەڵـێ: "مەگەر لەبیری کەین!"
داوای ئەوەی لەبیر نەکرێ، شتێکی نوێ نییە. لە ڕاسـتیدا مـن زۆر جـاران ئەو بـانگەوازەم دەگـوتەوە، ئەمەش دوای پێگەیشـتنی ئەو ڕاپۆرتـانەی کە ڕژانـی ڕووبـاری خـوێنی جوولەکەیـان پشتڕاسـت دەکردەوە. بەڵام ئەم بـانگەوازەی ئەوێ ڕۆژێ بەبـادا ڕۆیشـت. زۆریـنەی ئەوانەی لێبـڕاوانە گـوێی خۆیـان لە ئاست هاوار و ناڵەی خوێنی جوولەکە، کە ڕووبارەکانی ئەوروپای بەخـوێن سوورکردبوو، کردە کەڕەی شـەربەت، مستەر پاگێت، فەرماندارانی "نیشتمانە نەتەوەیـیەکەی گەلـی جـوولەکە" و دەسـەلاتدارە بەریتانییەکـانی نیشـتمانی جوولەکە بوون.
مرۆ ناتوانێ ئەوە بڵێ، ئەوانەی سیاسەتی بەریتانیای ڕۆژهەلاتی ناوەڕاسـتیان داڕشت، لە هەمان کاتیشدا نەیاندەویست جووەکان ڕزگار بکەن. ڕاستتر وایە

---

[21] جۆزیف رودیارد کیپلینگ (١٨٦٥-١٩٣٦) شاعیر و رۆماننوسی ئینگلیز، خاوەن شیعری بەناوبانگی مەگەر لەبیری بکەین. وەرگێر.

بگوترێ، ئەوان پەرۆش بوون کە جووەکان ڕزگار نەبن. تێکڕای پیاوی ئینگلیز کە دیار بوو لە بەرامبەر ژیانی جوولەکە ساردەخەم بوون هەروەک کەسە غەیرە جووەکانی جیهان وابوون. بەڵام ئەوانەی حوکمڕانی فەلەستین و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان دەکرد، بەلای کەمی لەوانە نەبوون کە ساردەخەم بووبن. ئەوان زۆر تاسەمەند بوون بگەنە بەرزترین باری داشکان لە ژمارەی جوولەکەکان، کە بگەنە وڵاتی ئیسرائیل. من ئەو تێبینییە بۆ ئەوە دەنووسم دۆزەکە دیار بکەم، نەوەک هەڵوێستی خۆم لەمەڕ دەسەڵاتدارانی بەریتانیا پێناسە بکەم، یاخود هەڵوێستی ئەوان لەهەمبەر ئێمە. من ڕاستیم بەیان کردوە، هەروەها هیچ گومانیشم لەوەدا نییە، کە هەر دەوڵەتمەدارێکی ڕاستگۆیانەی بەریتانی، کە بەتەواوی لە سیاسەتی حکوومەتی بەریتانی ئاگادارکرابێتەوە، بیەوێ دان بەوەدا بنێ مەبەست لە ماوەی ساڵەکانی جەنگ لەسەر خاکی ئێرتز ئیسرائیلدا، کەمکردنەوەی ژمارە جووەکان بووبێ کە ویستویانە بێنە ژوور. جارێکیان ڕۆندۆلف چەرچڵ ئەوەی گێڕاوەتەوە، کە باوکی ئەو لە ماوەی جەنگدا خۆی لە بینینی دکتۆر وایزمەن بەدوور گرتووە. "هەر کاتێک ئەوم دەبینی" ئەوە قسەی چەرچڵ بوو، "شەوەکانی دواتر خەوم لێنەدەکەوت." ئێ خۆ هێشتاش ئەو بە ئاسانی دەیتوانی وایزمەن ببینێ شەوەکانیش بەئارامی لێی بڕازێ؛ ئەگەر دەرگاکانی ئێرتز ئیسرائیلی لەسەر ئەو کەسانەی لە ئۆردوگای مەرگی ئاوشویتز گیریان خواردبوو، کە بۆ ئەوان یان بۆ هەندێک لەوان وایزمەن لێی دەپاڕایەوە، بکردبایەوە.

بەڵام ئەو ئەم کارەی نەکرد. ئەو خۆی لە دیداری وایزمەن دزیەوە. ئەو جوولەکانەی لەناوبران بە گوێرەی نەخشەی ئاڵمان بە ملیۆنان پیاو، ژن و منداڵ بوون. بۆ مایەی تەوس و کەساسیش، پلانەکەی ئاڵمان بەهۆی ڕێکاری ترسناک و ناچاوەڕوانکراوی نەخشەی بنەڕەتی بەریتانیا لە ئێرتز ئیسرائیل مەیسەر بوو.

سیاسەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی بەریتانیا لەمێژبوو فەلەستینیان داخواز بوو. مستەر ئیڤان گرینبێرگ، سەرنووسەری پێشووی ڕۆژنامەی کرۆنۆلۆژیای جوولەکە (ئەو پیاوەی کارنامەکەی لەپێناو بیروباوەڕەکەی دانا) پێیگوتم، لە وتووێژێکی بەردرێژییدا کاتێک من "لە باری ژێر زەمینیی"دا بووم بۆی گێڕامەوە، کە باوکی ئەو گرینبێرگ یەکێ یاریدەدەرە سەرەکییەکانی هێرتزل

و نێردەی تایبەت بۆ میسر، بۆ ئەوەی ئەرکی خوازراوی ئەلعەریش جێبەجێبکا، لە لایەن لۆرد کرۆمەری گەورە کەسایەتی بەریتانیا لە میسر پێیگوترابوو: "کاتێک ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەڕوخێ، زوو یان درەنگ دڵنیایین لەوەی دەبێ فەلەستین بخەینە بندەستمان."

ئەوەش لە سەرەتای سەدەی بیستەم بوو. لە ڕاستیدا چاوتێبڕینی بەریتانیا بۆ خاکی ئێرتز ئیسرائیل هەر لەسەدەی نۆزدەهەمەوە سەری هەڵداوە. ئەمەش یارمەتی ئەوە دەدا ئەو شتەش ڕوون بکاتەوە، کە بۆچی لەنێو زایۆنیستە بەراییەکاندا ئەوانەی پێش هێرتزلیش کەوتبوون، لەنێویاندا پیاوگەلی زۆری ئینگلیز هەبوون. هەروەها ئەم شتە ئەوەش ڕوون دەکاتەوە، کە بۆچی حکوومەتی بەریتانیا ئەوێ دەمێ خەمی لەپاراستنی جووە چەوسێندراوەکانی دەستی سوڵتانی عوسمانی دەخوارد.

زیرەکایەتی سەیری دەوڵەتمەدارێتی بەریتانیا ئێستا و ئەوسا ئەوەیە، کە ڕووخساری بەرژەوەندییەکانی بەریتانی بیرۆکەیەکی نموونەیی گشتی پێبدەن. جارێکیان دیزرایلی بە مستەر گلادستۆنی گوت: "من تۆزقاڵێک لە بیروباوەڕی برادەرە شەرەفمەندەکەم ناڕازی نیم کە لەنێو هەگبەکەیدا هەیە، بەڵام پێشنیازەکەی ڕەت دەکەمەوە، کە دەڵێ یەزدان خستویەتیە ئەوێ." شتێکی سەیرە کە زیرەکایەتی دەوڵەتمەدارانی بەریتانی وا دەکەن ئەو تۆزقاڵە نەوەک هەر ڕەوا و ڕاستەقینە بەڵکو بە شێوەیەکی ئەرێیانە پیرۆزانە دەربکەوێ. لە سەدەی نۆزدەهەمدا بەخت یاوەری بەریتانیا بوو. هاوپەیمانییە سێ قۆڵییەکەی مێتریسخ[22] بە دڵنیاییەوە ناپیرۆز بوو. ڕژێمی قڕاڵ بێگومان کۆنەپەرستانە بوو؛ دەسەڵاتی سوڵتانی عوسمانی بێگومان ناپەسەند بوو. بەریتانیا لای پێشکەوتنخوازان بوو. ئیدی دەستوانەکەی پڕ بە پەنجەکان بوون. ئەو دەستەی دەستی بەسەردا دەهێنا و داگیری دەکرد. بەریتانیا لە بەهێزەوە بۆ بەهێزتر دەڕۆیشت و لە گەڵ تەوژمی شەپۆلەکانی پێشکەوتنی مرۆڤایەتیدا هەنگاوی دەنا.

شۆڕشی گریکەکان دژی چەوسێنەرە تورکەکانیان یەکێک بوو لە مانیفێستە لەشکان نەهاتووی گیانی سەربەستی. شتێکی باش بوو کۆمەکی گەلێکی

---

[22] هاوپەیمانی نێوان شانشینەکانی ڕووسیا، مەجەر و پرووسیا بوو لە دژی ناپلیۆن. (وەرگێڕ)

بچکۆله بکرێ. هەروەها شتەکە شایانیش بوو. لاوازکردنی بابولعالی - نەوەک ڕووخاندنی لە کاتێکدا ڕووسەکان بەهێز بوون، بەڵکو تەنها لاوازکردنی مەبەست بوو- هیچی نەدەگەیاند تەنها پێشوەچوونی بەریتانیا نەبێ. ئایا ئەمە هەڵەی بەریتانیا بوو، کە پاڵپشتکردنی پێشکەوتن واتای پاڵپشتکردنی بەریتانیا بگەیەنێ؟ لەخۆگرتنی پەنابەرە هەڵاتووەکانی دەستی چەوسانەوە ئەرکێکی پیرۆزی مرۆڤانەیە. شۆڕشگێڕە ڕووسەکان مافی پەنابەرێتیان لە بەریتانیا وەرگرت. ئەمەش کارێکی جوامێرانە بوو. هەروەها ئەوە سیاسەتیش بوو. ئەوەش لەنێو بەریتانیای گەورەدا یارمەتی زەبوونکردنی دەدا کە چاوی هەم لەسەر کوستەنتینەپۆل (ئیستەنبول) و هەم هیندستانیش بوو. لە ڕاستیشدا ڕاشکاوانە سوودی پێشکەوتنی مرۆڤ و بەریتانیای تێدا بوو. لەسەر ئەوەش کە هەر دوو ڕەوشەکە شان بەشان دەڕۆیشتن لۆمەی بەریتانیا نەدەکرا. ئاخر چی لەوە مرۆڤایەتیترە کە دەستی پارێزگاری و یارمەتی بۆ جووەکان، گەلەکەی نێو بایبل -دژی کاربەدەستە تورکەکان- درێژ بکرێ؟ ئەگەر ئەوەش بچێتە سەر ئەوا سوودەکانی ئیمپراتۆریەتەکە بەدی دێ. هەموو هێزەکان مەراق بوون دەست وەربدەنە کاروباری تورکیا، هەڵوەشانەوەی "پیاوە نەخۆشەکەی ئەوروپا". فەرەنسا لەجیاتی کاسۆلیکەکان خۆی تێهەڵقورتاند، ڕووسیاش لەبەر بەرژەوەندی کڵێسای گریکی. ئاڵمانەکانیش داوای بەرژەوەندی پرۆتستانتەکانیان دەکرد، ئەوان لەگەڵ سوڵتانیش دۆستانە بوون، سەرقاڵی پلانی ڕێگای ئاسنینی بەرلین/بەغداش بوون. باشە چی بۆ بەریتانییەکان مایەوە؟ جووەکان! بەڕێکەوتیش ئایا فەلەستین هی کێ بوو؟ هەڵبەتە هی جوولەکە بوو. ئاخر وا لە بایبلدا هاتووە. (بەڵام مستەر گرینبێرگ دەیگوت دەبێ بەریتانیا فەلەستین بۆ خۆی ببا..."")

من ئەو شیکارە بە گیانی ڕەخنەئامێزانە لە سیاسەتی بەریتانییەکانەوە ناکەم. من حاشایی لەوەش ناکەم، کە زۆر جار سیاسەتی بەریتانیا سوودی بە مرۆڤایەتی گەیاندووە. بەڵام لە هەمان کاتیشدا پێچەوانەکەشی قەوماوە. لەوە زیاتر، هەر ئەوە دادپەروارەنترە کە بپرسرێ: "ئایا تەنها سیاسەتی بەریتانیا بوو کە وای لێکەوتۆتەوە؟ ئایا حکوومەتی بەریتانیا تاکە زلهێز بووە کە

بەدنەدانی ناوی پێشکەوتن و ئازادی و دادپەروەریی بەدوای سیاسەتەکانی خۆیدا ڕۆیشتووە؟ هەڵبەتە نەخێر!
لە ئێرتز ئیسرائیلیشدا هەمان یاری وازیکرا. تەنها لێرەش یاریەکە بە تراژیدیا کۆتایی هات. بەریتانیا ئێرتز ئیسرائیلی بۆیە دەویست، چونکە دەکەوتە کۆتایی ڕۆژهەڵاتی دەریای سپی ناوەڕاست، لەبەر ئەوەش لەسەر سێڕیانی سێ پارزەمینەکە بوو، هەروەها زاڵیشە بەسەر کەنارێکی نۆکەندی سوێس، لەبەرئەوەش لەسەر ڕێگای هیندستانە و لەبەرئەوەی... ئاخر زۆر هۆکاری بایەخدار هەن. هەر لە نەبوخوزنەسرەوە زۆر لە دەسەڵاتداران مرخی خۆیان لە فەلەستین خۆشکردبوو. بەلام خۆ ئەگەر ولاتێکی زلهێز ولاتێکی دیکەی بوێ، ئایا هەروا دەیگرێ و بەخۆیەوە دەیلکێنێ؟ خۆ ئەگەر هێزێکی زیرەک بێ، نەخێر وا ناکا!
لەبەر ئەوە سیاسەتی بەریتانیا ئامادەی پاشەکشەبوو لە هزری مەزن بەوەی کارابێ تا دەست بەسەر فەلەستیندا بگرێ، بێ ئەوەی هیچی لێ دیار بکەوێ. نموونەکەی لەنێو لەپی دەستدا بوو: جووەکان کە بایبل بەڵێنی فەلەستینی پێدابوون، دەچەوسێندرانەوە و پێویستیان بە نیشتمانێک بوو. هزرە نموونەییەکە زۆر خوازراو بوو. بەریتانیا دەیخواست بەڵێنی نیشتمانێک لە فەلەستین بە جوولەکە بدا. نەوەک فەلەستین وەک نیشتمانی، بەڵکو نیشتمانێک لە فەلەستین. بەریتانیا داخوازی فەلەستین بوو، جوولەکەش دەبوایە نیشتمانێکیان لەوێدا هەبوایە. ئەم سیاسەتە یارمەتی بەرژەوەندیەکانی بەریتانیای لە ئەمریکا دەدا، ئاخر جوولەکە لەوێ دەستیان دەڕۆیشت.
لێ گەلۆ، چی دەبێ ئەگەر زۆر لە جوولەکە ویستیان بچنە ئەو نیشتمانە نەتەوەییە؟ لە سەرەتادا پێنەدەچوو ئەمە توانستی یارییێکی خۆش بێ. لە دوایشدا لە جیهاندا بووە ڕایەکی گشتی، کە جووەکان بزنسیان پێ لەکاری دەستی باشترە. ئاخر ئەوان نایانەوێ واز لە ژیانی ئەوێی کاسبی و بازاڕ و نووسینگە بۆ کارێکی قورس و سەخت لە کوێرە ولاتێکی وەک فەلەستین بە گردە ڕوتەنە بەیار و خاکە لمینەکەی بێنن. بەدەر لە هەندێ ئایدیالیست و مشتێ لە نەدارەکان، بەشی زۆری حەشاماتی جوو هەر لەو ولاتانە دەمێننەوە کە لێی دەژین. لەو دۆخەش ژمارەی جووەکان زۆر زیاد بکەن

ئەوا هەمیشە عەرەبەکان لەوێ هەن کە کێشە و ئاریشەیان بۆ دروست بکەن.
دەکرێ جوولەکە بازرگانێکی باش بێ، بەڵام سەباز و جەنگاوەر؟ تەنها بیرکردنەوە لەو شتە کاربەدەستە بەریتانیەکانی دەهێنایە پێکەنین. بۆ هەزاران ساڵ دەچێ جووەکان دەستیان نەداوەتە چەک. ئەوانەش لە فەلەستینن پێویست ناکات بترسن، دەکرێ پەنا بۆ بەریتانیەکان ببەن بیان پارێزن.
کەواتە نەخشەکە وا دارێژرا؛ کاتێک عەرەبەکان داخوازییان هەبێ ئەوا بە یاخیبوون دژی "دەستدرێژی بێگانە" لە قەڵەم دەدرێن؛ جووەکانیش بۆ هەمیشە کەمینەیەکی هەڕەشەلێکراون. هەریەکەیان بە سەرەنێزەی بەریتانییەکان لەوی دیکە دەپارێزرێ.

## 2

ڕەقوتەق ئەوەش تامی ئەو بیرکردنەوەی بنمیچی جاڕنامەی بلفۆر بوو. هەر بەم شێوەیەش منداتی بەریتانیا لە هێلکە دەرچوو، بەو شێوەیەش سیاسەتی بەریتانیا لە ئێرتز ئیسرائیل پەرەی پێدرا و لە میانەی جەنگی دووهەمی جیهانیشدا گەیشتە ئەوپەڕی هەڕمێن و هەڕەتی خۆی. نەخشەکە لە ڕووی مەبەست و ناوەڕۆکەکەی ڕوون و ئاشکراو شێلگیرانە بوو. بۆ گەیشتن بە مەرامی خۆیان، بەریتانیا پەرۆش بوو ژمارەیەکی سنوورداری جوولەکە بێنە ئێرتز ئیسرائیل، بەڵام لەو ژمارە کەمە زیاتر نەیەن. ئاخۆ مرۆ لە دۆزێکی وادا چی بکا؟ یەکێ "هەر لە ناوەڕاستەوە کۆتایی بە یارییەکە بهێنێ." هەرچی دەربارەی کاردانەوەی جووەکانیش بوو، وەک بەریتانییەکان بە دروستی پێشبینییان کردبوو، ئەوان لە بیزنسدا باش بوون، بەڵام لە سیاسەتدا وانەبوون. هەر چۆنێک بێ ئەوان بایی ئەوەندە زیرەک نین کە بایەخی هەڵبژاردنی سەرکردەکانیان بزانن.
تەنانەت ئەو نەخشەیەش -کە ماستەر پلانی بەریتانی بوو- لە نێوان هەر دوو جەنگە جیهانیەکەی ئەوروپا دروست دەرنەچوو، ئاخر پارزەمینەکە نوقمی ڕق و خوێن ببوو. لە پۆلۆنیادا بە ملیۆنان جوو لەنێو ژینگەیەکی دەورەدراو بە شەڕانگێزی دژەسامیزم دەژیان. لە وڵاتەکانی بالتیک و بەلکانیشدا بە سەدان هەزار جوولەکە هەبوون و لە پاڵ ئەوانیشدا دژە سامیزمیش لەبرەودابوو. ئیدی بە هەزاران لاوی جوولەکە، سەرەڕای توانا و لێهاتوویان، سەرەڕای بڕوانامەکانی زانکۆکانیان، نەیاندەتوانی لەو وڵاتانەی

لێی نیشتەجێن جێگەیان ببێتەوە، بۆیە شتێکی سروشتی بوو ڕوو بکەنە ئێرتز ئیسرائیل. ئاپۆرای جوولەکە هەموو ئەرک و ماندووبونێکیان دەکێشا تا بگەنە ئەوێ.

ئایا چی بکرابا؟ ئەو لێشاوە گیراوەی جووەکان بۆ دەستڕۆیشتنی بەریتانییەکان مایەی هەڕەشە بوو. لە کۆنفرانسی قاهیرەی ١٩٢١[٢٣]دا کە بەئامادەیی چەرچڵ و تی ئی لۆرانس سازکرابوو، سیاسەتی بەریتانیای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە ڕوونی پێناسەکرا، چەرچڵ گوتبووی ئەوەی میر و شا عەرەبەکان بە خۆیان دەیڵێن هیچ گرنگ نییە "تا ئەو کاتەی ئەوە دەکەن کە ئێمە دەمانەوێ و کەی دەمانەوێ." بەڵام تۆبڵێی هەمان شتیش دەربارەی جووەکان گوترابێ؟ لەوێدا پێدەچی دژوارییێکی ڕاستەقینە هەبووبێ.

هێرش و پەلاماری عەرەبەکان دەکرێ بە ئاسانی ڕووبدا، بەڵام چنینەوەی بەری کارەکەیان پێویستی بە وشیاری زیاتر هەیە. لێردا دوو هۆکاری بەهاداری ڕێزلێگیراو تێوەگلاون. یەکەمیان کۆمسیۆنی لێپێچینەوە بوو، کە زینجیرەکەیان هەر لەهاتن و چووندا بوو. ئەو کۆمسیۆنانەش ئەو لێکەوتە سایکۆلۆژیەیان سەربار کرد بەوەی ناوبژیوانێکی بێلایەنن و جەختیشیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە دوو لایەنی کێشەکەی فەلەستین لەسەر هەقن، بۆیە پێداگیریان لەسەر ئەو لایەنی سێهەم دەکردەوە، کە هێزی ماندات بوو لە فەلەستین بۆ ئەوی وەک هێزێکی سێهەمی بڕیاردەر دەربکەوێ. داردەستەکەی دیکەش کتێبی سپی بوو، کە ژمارەیەکی زۆری لێ بڵاوکرایەوە، کتێبەکانیش بە زمانێکی قانونییانە و پێوەرانە نووسرابوون کە لە زۆر ڕامانی خۆیدا ئەوەیان بە ڕەوا دەزانی دەبێ سیاسەتی بەدوورگرتنی جوولەکە لە فەلەستین پەیڕەو بکرێ و تا دەهاتیش بارودۆخەکەی ئەوێیان جڵەوگیرتر دەکرد.

ئەو خولە ڕووداوانە هەر دووبارە بوونەوە. بەمەش عەرەبەکان هاندەدران، هەندێ جاریش بە ئاشکرا خۆیان ڕێکدەخست تا پەلاماری جووەکان بدەن. ئەوسا کۆمسیۆنی لێپێچینەوە بە خۆی و ڕاپۆرتەکاتی دەهاتە نێو ناوانەوە.

---

[٢٣] هەر لەو کۆنفرانسەشدا بوو کە چارەنووسی میزۆپۆتامیا دیاریکراو کرایە شانشین و فەیسەڵی کوڕی حوسێنی حیجازیان بۆ نارد. وەرگێڕ.

کتێبی سپی چاپ و بڵاودەکرایەوە و کۆچ دەوەستێندرا یاخود وای لێدەکرا ژمارەیەکی کەم بهاتبایە هەروەک ئەوەی ڕێگەنەدرێ وابوو.
لە یانیوەری ۱۹۳۳شدا هیتلەر هاتە سەر تەختی دەسەڵات. کۆمەڵگە جووەکانی ئەوروپا شیرازەیان هەژا. شەپۆلێکی دیکەی کۆچبەرە جووەکان بەرەو فەلەستین کشان. هەر لێشاو نەبوو بەڵکو ئەمجارەیان کۆڕەو بوو. لەگەڵ ئەوەشدا تا ئەو کات میکانیزمی کاری سیاسەتی بەریتانیا لەکاردا بوو.
لە ۱۹۳٦دا و بە فشاری کۆچبەرە جووەکان لە دەروازەکانی ئێرتز ئیسرائیل گەیشتە لوتکەی ئەوسای خۆی، شڵەژانێکی خوێناوی بەرپابوو، واش بەردەوام بوو ڕانەدەگیرا. وا شڵەژا تا دوودڵەکان چارس بکرێن و لە پێناوی ئەوەش کردارەکە بەردەوام بوو بەڵکو بەهانەیەک بدرێتە دەست و دەرگاکان لەسەر کۆچبەران دابخرێن. کۆمسیۆنێکی شاهانە، پاشان کۆمسیۆنی دووهەم، لە کۆتاییشدا و لە ئایاری ۱۹۳۹دا کتێبی سپی هاوڕای ناوی کەسێکی ناسراوی وەک ڕامزی ماکدۆنالد بوو. ئەمەشیان دوا دانەی کتێبی سپی بوو، واش داڕێژرابوو کە دوا هیوای جووەکان لە بەرامبەر فەلەستیندا لەناو بەرێ. چوار مانگ دواتر جەنگی دووهەمی جیهان هەڵگیرسا. بە ملیۆنان جوولەکە کەوتنە داو یان خەریکبوو بکەونە داوی ڕاوەدونەرە بێ ویژدانەکانیان، ئەوساش کە هیتلەر و هیملەر بوون. باشە دوای ئەوە چی دیکە بێت؟
کاربەدەستانی حکوومەتی کۆشکی شاهانەی شانشینی بەریتانیا بە ڕاستی پێیان وانەبوو ئەمە کێشەیەکی نوێیە. چارەسەری کێشەی فەلەستین لای ئەوان ئەو کات سووک و ئاسان بوو. ئاخر کتێبی سپی ڕێنمایی بۆ هەموو شتێک پێ بوو: لە کۆتاییدا داخوازی جوولەکان بۆ فەلەستین وا چارەسەرکرا، کە بەڵێنیان دا کۆتاییەکەی تا 75.000 جوولەکە تا ساڵی 1944 ڕێگا بدرێ بێنە وڵاتەکە، ئەمەش بە ژمارەیی ئەو 2500 جوولەکە بەدبەختەی ئەڵمانییاوە. پێنج ساڵ دواتر باسوخواسی "سەربەخۆیی" هاتە گۆڕێ، ئەمەش لەسەر بنەمای پەیوەندی دۆستانەی کۆنینە بوو لەگەڵ عەرەبەکان، کە حکوومەتی شاژنی خاوەن شکۆ بە پێی ڕێکەوتنێک بەڵێنی بە حکوومەتی خۆجێی دابوو. لەوەشیاندا جوولەکەیان فەرامۆش نەکردبوو. لە کۆتاییدا بەریتانییەکان گوتیان، هەموو ئەرک و پابەندبوونەکانیان بەجێهێناوە، ئیدی جووەکانیش ئۆتۆنۆمی کلتوری، مافی یەکسان بەشێکی گونجاو –

نزیکەی سێیەکیان- لە حکوومەتە بەڵێنپێدراوەکەی فەلەستین بۆ عەرەبەکان بەردەکەوێ. بەمجۆرە گوایە جووەکان دەپارێزرێن و عەرەبەکانیش فەرمانڕەوایی دەکەن و بەریتانیەکانیش وەک ڕاوێژکار دەمێننەوە بۆ ئەوەی حکوومەتە نوێکە ڕاستەڕێ بکەن. ئەوەش ڕوون و ئاشکرابوو. هەر ئەوەندە مابۆوە نەخشەکە جێبەجێ بکرێ، کە لەمەوپاش بە "قانونەکە" ناودەبردرێ.
زەحمەتیەکەش بەند بوو بە خواستی بەدبەختانەی ئەو جوولەکانەی لە تاوی گیانی خۆیان لەبەر هیتلەر هەڵاتبوون. هەرزوش هەر ناکارایەک بڕوای وابووبێ کە بەهۆی تۆکمەیی بەرەکانی جەنگ لە ئەوروپا جووەکان نەتوانن رابکەن، لەبارچوو. ڕێکخراوی ئیرگون زڤای لیومی بە هاوکاری پارتی ریڤیژیۆنیستی زایۆنیستییەکان و ڕێکخراوی لاوانی بێتار بە هەزاران کۆچبەری "قاچاخیان" گەیاندە وڵات، هەرگیز ئەوان لە جموجۆڵی خۆیان نەکەوتن. دەسەڵاتدارانی بەریتانیاش هەموو هەوڵێکی خۆیان بەکارهێنا بۆ ترساندنی جیهان لەو کۆچبەرییە بە وێناکردنی بارودۆخی سامناکی پەنابەران لە دەرەوە لەسەر بەلەم و کەشتییەکان، کە بە "بەلەمی کفندار" و شەقوشڕ و کۆنینەیان وێنا دەکردن کە دەبوونە خۆراکی ماسی و نەهەنگەکان. کونسولەکەی بەریتانیا لە کۆنستانزادا سەردانی یەکێ لە گەمیەکانی کردبوو، ئەوسا لە ڕاپۆرتەکەیدا نووسیبووی هیچ ئینگلیزێک بەم جۆرە گەمییە پیس و پۆخڵ و شەقوشڕانە ناکەوێتە ڕێگا... بەڵام گواستنەوەکەش هەر بەردەوام بوو.
هیچ هەوڵێکی دیپلۆماسی نەما لەو وڵاتە خۆرئاوایی ئەوروپیانە نەدرێ بۆ ڕاگرتنی ئەو کۆچڕەوییە، ئەوان بە فەرمی و نافەرمییە لە لایەن دامودەزگاکانیانەوە بە ڕێکخەرانی کۆچڕەویەکەیان ڕاگەیاندبوو. دوو هەزار جوو کە گەیشتبوونە سنووری ڕۆمانیاوە، لەوێشەوە ڤیزەی ترانزیتی ڕۆمانیانیان بۆ لێدرابوو، بەڵام کێلینسکو وەزیری دەرەوەی ڕۆمانیا و لەژێر فشاری حکوومەتی بەریتانیاوە، ڤیزاکەی کشاندەوە. ئەوەش هێشتا وای لە هەندێکیان نەکرد سنوورەکە ببەزێنن و لەگەڵ هاوچارەنووسەکانیان لە

جووەکانی چیکۆسلاۆڤاک، نەمسا و رۆمایان هەوڵی گەیشتن بە ئێرتز ئیسرائیل بدەن.[٢٤]

دیسان هەواڵ بە دەسەڵاتدارە بەریتانیەکان سەبارەت بە ژمارەیەکی زۆری بەلەمە ئیتالیەکان لە بەندەری تریست گەیشت کە ژمارەیەکی زۆری کۆچکردووە جووەکانی تێدا کۆبۆتەوە. ئەوەش نەخشەکە بوو کە جووەکان نەوەک هەر کۆڵ نادەن، بەڵکو ئامادەی بە لێشاو کۆچی ناقانونین. لەو کاتیشدا هاگاناش[٢٥]ی زۆر دەوڵەمەندتر لە ئێرگون، کە سەرچاوەکەیان ئاژانسی جوولەکە[٢٦] بوو، لە بواری کۆچبەراندا کارابوو.

لەگەڵ ئەوەشدا لێهاتوویی حکوومەتی بەریتانی نوشستی نەهێنا. هەندێ هاوسۆزی لەگەڵ جووە هەلاتووەکان لە ژوورە گازە ژاراوەیەکاندا دنەی پەرلەمانی بەریتانی دا هەندێ پرسیار بکەن و بەم شێوەیە بێنە گۆ: "ئایا جەنابی وەزیر لەوە ئاگادار بووە، کە ئاڵمان بە تیشکۆ خستنەسەر گەمییەکانی بەندەری تریست بۆ ئەوەی ژمارەیەکی زۆری جوولەکە بە قاچاغ رەوانەی فەلەستیین بکا تا ئاستەنگ بۆ بەریتانیای گەورە لە رۆژهەلاتی ناوەراستدا بنێتەوە؟ ئایا وەزیر چ رێکارێکی بەربەستانەی بۆ ئەم شتە گرتۆتەبەر؟"

حکوومەتی بەریتانیا ئامادەبوو بە لێشاو پاساو هەڵڕێژێ. لە دواییشدا دەسەلاتدارە بەریتانییەکان بە جیهانییان گوت، ئێمە رەقوزبر نەبووین، لە راستیدا زۆر دڵتەنگی ئەو خەڵکە بەستەزمانە بووین. هەروەها ئاماژەیان بەوەش دا بە شێوەیەکی سەرەکی هەر لە پێناوی ئەو خەڵکە بەستەزمانەدا

---

[٢٤] ئەوان لەو هەوڵەیاندا سەرکەوتن. ئەوان بەگەشتی ناوداری سێکاریا کە لە لایەن مستەر ئێری ژابۆنسکی، کوڕی دامەزرێنەری ئێرگون، رێکخرابوو.

[٢٥] هاگانا رێکخراوێک بوو لەژێر بەڕێوبەرایەتی جێبەجێکاری زایۆنیستدا، بۆ ئەوە داندرابوو کە وەک رۆڵی پۆلیسی پارێزگار ببینی لە نیشینگە جووەکانی فەلەستیندا. ئەوان لە جووە نشینگەکان و دەستەیەکی کارا پێکهاتبوون. سەرکردە زایۆنیستە فەرمییەکان، بەتایبەتیش چەپەکان دژی ئەوەبوون رێکخراوەکە ببێتە میلیتاری، شتێکیان لە مێشکدابوو کە ئەمە پەیوەستە بە کاردانەوە ی راستڕەوەکان. کاتێکیش ژابۆنسکی جاڕی لەشکرێکی جوولەکەی دا ئەو لە لایەن چەپەکانەوە بە میلیتاری و فاشی و چەند ناوناتۆرەی دیکەی نەخوازراو ناونرا. زۆر لەو زایۆنستە چەپانە ئەزموونێکی تاڵیان لەگەڵ دیموکراسی ئەورووپای رۆژهەلات هەبوو، چونکە کاتێ کەسێک جڵەوی سووپای لە دەست بووبایە هەمیشە راپرسی زۆرینەی دیموکراسی دەکرد.

[٢٦] بۆ مەبەستی روونکردنەوە لای خوێنەر، مەبەست لە دەستەواژەی ئاژانسی جوولەکە وەک ناوە فەرمییەکەی حکوومەتی بەریتانیایە بۆ رێکخراوی زایۆنستی. تێکچڕژانی رێکخراوەکان کە لە ژێر ناو هاوکاری رێکخراوی زایۆنیستی کردبوونەوە، کەم و زۆر لە لایەن بەرێووبەرایەتی جێبەجێکاری زایۆنستی ناوهێندراوە و نووسەر لێرەدا بە "دامودەزگای جووەکان"ی ناودەبا.

بووە کە شەڕەکەیان کردووە. کاتێکیش جەنگەکە کۆتایی پێ بێ، هیوایان وایە خەڵکەکە بگەڕێنەوە نێو ماڵ و حاڵی خۆیان. بەڵام "سوسەکارە ئەڵمانەکان" نابێ ڕێگەیان پێبدرێ دزە بکەنە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا -کە بەرژەوەندییەکان لە بەرژەوەندی مرۆیش ڕێک دێتەوە- ی جەنگ بخەنە بەر مەترسی. کۆمسیاری بالای بەریتانیا لە ئۆرشەلیم گوتبووی، ئەو بەڵگەوبەندەیە بەکار دێنێ -دانەی نوێی داشکان لە بزنسی ئایدیالزمدا- بۆ ئەوەی ڕەوایەتی بە سیاسەتی نوێی ناردنەوەی کۆچبەرە "قاچاخەکانی" جوولەکە بۆ ئەوڕوپای هیتلەر .

**3**

خەرمانەی تراژیدیا حەتمیەکە زۆری نەخایاند. کەشتی ستارونا بەخۆی و زیاتر لە حەفت سەد کۆچبەر لەگەڵ ئەو هەموو کۆسپ و تەگەرانەی سەر ڕێگای و هەوڵی نەهێشتنی دابەزینی، گەیشتە لێوارەکانی ئێرتز ئیسرائیل. بەڵام بەگوێرەی ڕێنماییەکانی دەسەلاتدارن گەڕێندرایەوە ئەو شوێنەی کە لێی هاتبوو، ئەویش ڕۆمانیا بوو. لەنیوەی ڕێگاشدا گەمیەکە بە خۆی و سەرجەم ئەوەی هەڵیگرتبوو نقومبوو. هۆکاری ڕاستەوخۆی نقومبوونەکەشی هەرگیز ئاشکرا نەبوو.

ئەوە دەربارەی گەمی ستروما بوو، بەڵام خۆ هی دیکەش وەک میلۆس و پاسیفیک و پاتریاش هەبوون.

ئیدی بەریتانیا ڕەفتارێکی دیکەی مرۆڤانەی لەگەڵ پرسی کۆچبەران کرد. جەنابی هارۆلد ماک میشێل کۆمۆسیاری بالا ڕایگەیاند، کۆچبەران ناگەڕێندرێنەوە ئەوڕوپا -ئاخر پڕوپاگەندەکان لەبەرچاوی ژن و پیاوی شارستان ڕەوایەتیان بەدەست نەهێنا- بەڵکو دەنێردرێنە ماوتریتوس Mauritius[27]. کابرا ئەوەشی بۆ زیادکرد، دوای کۆتایی هاتنی جەنگ جارێکی دیکە دەگەڕێندرێنەوە سەر ماڵ و حاڵیان لە ئەوڕوپا. بۆ ئەوەی دەرسێکیش بە کۆچبەران دابدەن، هێزی چەکداری بۆ ئەوەی دوورخستنەوەکە جێبەجێبکا "بڕێکی دیاریکراوی هێزیان" بەکارهێنا، ئەوەش بەر لەوەی گەمییەکان بنێردرێنە ماوریتیوس.گەمی پاتریا هەرگیز چارۆگەی

---

[27] ماوریتیوس دوورگەیەکە لە زەریای هیندی و نزیکەی ٨٥٠ کیلۆمەتری چوارگۆشە دەبێ و دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی مەدەغەشقەر. وەرگێڕ

خۆی هەڵنەدا تا بەرێ بکەوێ. ئاخر جووە "تیرۆرستەکان" بۆمبێکیان بۆ دانایەوە تا لە شوێنی خۆی دەرنەچێ. بۆمبەکە تەقیەوە و زیاتر لە دووسەد جوولەکەی کوشت یان نوقمی ئاوەکەی کردن. دەسەڵاتدارە بەریتانییەکانیش تێبینی ئەوەیان دا، ئەم کارە جێدەستی رێکخراوی ئیرگون زڤای لیومی پێوە نەبووە، بەڵکو رێکخراوی هاگانا ئەم کارەی راپەڕاندووە.

ئەم پرسە تایبەتمەندە، سەدای ئەم تەقینەوە وای لە ماک میشێل کرد هەندێ "میهرەبانی" بنوێنێ و باقی رزگاربووەکانی گەمیەکە رێگای هاتنە ناوەوەی ئێرتز ئیسرائیلیان پێبدا. بەڵام راگەیەندراوی یاوەری رێگەپێدانەکە جەختی لەسەر ئەوە کردبووەوە، کە ئەم کارە نابێ ببێتە پێشینەیەک بۆ هاتنی گەمی دیکە، بەڵکو "کۆچی بە قاچاخ" بەتەواوی رێگەپێنەدراوە. "قانونەکە" دەبێ بچەسپێندرێ، هەر کەسێکیش بە قاچاخ لە کاتی ئاودیوکردنی بۆ وڵاتەکە بگیردرێ، ئەوا رەوانەی ئەو شوێنە دەکرێ کە لێوەی هاتووە.

ئیدی ئێمە گەیشتینە ساڵەکانی ١٩٤٢-١٩٤٣، لەو ماوەیەشدا بەرنامەی هیملەر لە قڕکردنی بە کۆمەڵ لە تەکانی دوورهاوێژی خۆیدا ببوو. هەموو هیوای جووەکان کە بە هەستی ناسکی بەریتانییەکان بوو، بێهودە بوو. هەموو تکا و نزای رووداوەکە بە با رۆیشت، هەموو تکا و پاڕانەوەی زارەکی سەرکردە جووەکان بەبا درا. سیاسەتی بەریتانیا سەیرئاسا لە فەلەستیندا شێلگیرانە بەردەوام بوو. هاتنە ژوورەوەی جوولەکە لە سنووری خاکی ئێرتز ئیسرائیل قەدەغە بوو. لە کۆتاییشدا کێشەی ئێرتز ئیسرائیل بە کتێبی سپی "چارەسەرکرا".

شەوە رەشەکان، شەوە هەرە تاریک و نوتەکەکان باڵیان بەسەر گەلی جوولەکە لە ئەورووپادا کێشا. ملیۆنێک و پێنج سەد هەزار منداڵی جوولەکە بە شەمەندەفەری مەرگ گوێزرانەوە ژوورە گازە ژاراویەکان. بە ملیۆنان ژن و پیاویش درانە بەر گوللە، یان خنکێندران، یاخود سوتێندران یان گازباران کران یاخود بە زیندوویی ژێر چاڵ خران. کاتێک مرۆڤ دەبێتە جانەوەر، ئیدی جووەکان چیدیکە بە بنیادەم هەژمار ناکرێن. لێرەدا هیچ بوارێک بۆ خۆ هەڵخەڵەتاندن نامێنێتەوە. ئەوە هەر نازیەکان و برادەرەکانیان نەبوون کە جووەکانیان بە بەکتریا دەزانین و دەبوایە لەنێو بردرابان. هەموو جیهان کە خۆیان بە "رۆشنگەر" دەزانی، خەریکبوو لەو بیرۆکەیە رادەهات کە جوولەکە

چیدیکه وەک غەیری جوولەکە بە ئادەمیزاد نەژمێردرێن. هەروەک چۆن جیهان هیچ سۆزێکی بەرامبەر ئەو مێگەلە هەزاران ئاژەڵەی بۆ سەربڕخانە و دەبباخخانەکانی شیکاگۆ نەنواند، هەر ئاواش هیچ سۆزێکیان - یان وا باشترە بگوترێ لێڕاهاتن- بەرامبەر ئەو دەیان هەزار ئادەمیزادە کە هەر وەک ڕانەمەڕ بردانە کوشتارگەی ترێبلینکی نەبوو. جیهان بەزەیی بە کوژراوەکاندا نەهاتەوە. تەنها ڕێزی ئەوانەی گرت کە جەنگان. جەنگ لەپێناو باشتر یان خراپتر، ئەوەش ڕاستیەکەیە.
هەموو خەڵکی جیهان بەدەر لە جووەکان ئەو ڕاستییە تاڵەیان دەزانی. هەر ئەوەش بوو کە دوژمنەکەمان توانی داومان بۆ دابنێتەوە و خوێنمان بڕێژێ.
بەریتانییەکان ئابلۆقەیەکی ئابوریان خستبووە سەر ئەو ناوچانەی ئاڵمانەکان داگیریان کردبوو: ئەوەش جەنگەکەی بوو دژی نازیزم. بەلام لە هەمان کاتیشدا ئابلۆقەیەکی سیاسیانەشی خستبووە سەر جووەکانی ناوچە داگیرکراوەکانی بن دەستی ئاڵمانەکان، کە ئەمەش کۆمەکێک بوو بۆ نازیزمەکان. ئەوەش مەرامی ڕاشکاوی نەبوو، بەلام یارمەتی بەدیهێنانی یەکێک لە ئامانجگەلی نازییەکانی دا: قڕکردنی ئاپۆرای گەلی جوولەکە، یاخود بە دەستەواژەی نووسینگەی کاروباری دەرەوەی (بەریتانیا) کەمکردنەوەی ڕێژەی ژمارەی جووە هەلاتوەکان بۆ فەلەستین بۆ کەمترین ژمارە. ئەوپەڕی کەمی ژمارەی جووەکان ئەوانەی دەیانەویست بگەنە فەلەستین شتێکی هەرە بایەخدار بوو بۆ پەیڕەوکردنی ماستەر پلانی کاربەدەستانی بەریتانییەکان. ماکی نەخشەکە هەرچەندە ناوی زۆر و داڕشتەی زۆری بۆ ڕامانەکە هەبوو، بەلام هەروەک خۆی بە نەگۆڕی مایەوە. کتێبی سپی یەکێ بوو لە ناوەکان. دروشمی دابەشکردنیی کۆمسیۆنی پیل لە ١٩٣٧دا ناوێکی دیکەی پلانەکە بوو. نەخشەی مۆریسۆنیش ناوی سێهەم و پلانی بێڤنیش ناوی چوارەم بوو. لە سەردەمی جیاجیادا شتی وەک "فیدراسیۆن" و "کانتۆنبوون" وەک "ئۆتۆنۆمی" و "سەربەخۆیی" سەریان هەڵدەدا. مەبەستەکەش مانەوەی حکوومەتی بەریتانیا بوو تا جڵەوی ئێرتز ئیسرائیل بەو ژمارە "جووە پارێزرانە" ی نێو دەریایەک لە عەرەب بکا، کە شەپۆلی ئەو عەرەبانەش لە لایەن دەسەلاتدارە نەریتییەکانیانەوە بێ.

دەسەلاتدارە شەپۆلییەکانیش ئاسۆیەکی بەربەرینیان هەیە، هەمیشەش پێیانخۆشە حیسابی بابەتیانە بن و هەنگاوی نەیارانەشیان بهاوێژن. بەلگەنامەیەک کە دنەدەری ئەو گیانەیە و لە نووسینگەی عەرەبی قاهیرەی بەریتانی تێبینی "نهێنی" لەسەر نووسراوە، لە ١٩٤٥دا کەوتۆتە بەردەستی ئیرگون زڤای لیومی. ئەم "نووسینگەیە" کە سەر بە نووسینگەی دەرەوەیە و بە دوای سەرکەوتنی هیتلەردا گەڕاوە. بەلگەنامەکە لە خۆشحالی بەدەر نییە کە دوای هەلگیرسانی جەنگ ژمارەی کۆچکردوە جووەکان بۆ ئێرتز ئیسرائیل دەبێ بە رێژەیەکی بەرچاو کەم بکرێتەوە. بەلام ئەو خەملاندنەشی تێدا هاتووە کە لەوانەیە جووەکان بەرگری بکەن -تەنانەت بە هێزیشەوە- لە جێبەجێکردنی پلانی بەریتانیا. دەکرێ رێگەدانی ژمارەیەکی کەم لە کۆچبەرە جووەکان دەنگی هەراوهوریاکە کەم بکاتەوە، لەوە زیاتر نا. ئەمەش وا دەکا ژمارەی جووەکان بگاتە سێ یەکی دانیشتوان. بە زمانی دیموکراسی، هەروەک داونینگ ستریت (مەبەست حکوومەتی بەریتانیایە- و) راڤەی دەکا، ئەوە "مافە هاوبەشەکانە". بە زمانی واقیعیانەی جووەکانیش، ئەوە گێتۆیە. بە زمانی حەتمیەتی مێژووی گێتۆکانیش، ئەوە لەناوبردنە.
دەستڕۆیشتووەکانی خودی قاهیرەش پێیانوابوو جێبەجێکردنی پلانەکە، کارێکی ئاسان نییە. لە بەلگەنامەکەدا نووسرابوو، دەکرێ رێکخراوی ئیرگون زڤای لیومی و گرووپی ستێرن کردەی تیرۆررزمی بکەن. لەوانەشە دواتر رێکخراوی هاگاناشیان بچێتە پال و لەگەل ئیرگون یەکبگرن و کارێکی وا بکەن بە رێگەپێدراوی گرووپی ستێرن سەربەخۆیانە بجوولێن. لەوانەیە هەلمەتی بە قاچاخ کۆچبەر هێنان بە ژمارەیەکی زۆر بخرێتە گەڕ و هەولی کێشە بۆ دەسەلاتدارە مەیدانییەکان (لە ئۆرشەلیم و قاهیرە) و حکوومەتی لەندەن بدرێ و فشار و دەستڕۆیشتووی جووەکانی ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا تا ئەوپەڕی کارا بکرێ. لەگەل ئەوەشدا نووسینگەی قاهیرە لەگەل ئەوەدا بوو، کە دەکرێ بەسەر ئەو بەرگرییەی جووەکاندا زال ببن. بۆ ئەو مەبەستەش گەر پێویست بکا، بە پلەی یەکەم وا باشە حکوومەتی ئەمریکا لە نەخشەکەی بەریتانیا دلنیا بکرێتەوە.
ئەوەش باندۆری گرنگی حکوومەتی بەریتانیا بوو. ئەوان پێیان وابوو پالپشتی سەرەکی جووەکان لە ئەمریکاوە دێ. لە سەرێکی دیکەشەوە،

دەیانزانی ئەو پێنج ملیۆن جوولەکەیەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هۆکارێکی جەوهەریین لە هەڵبژاردندا، ئەو ڕاستیەش مایەی بێزارییە بەلام ناشگۆڕدرێ. لەو سۆنگەیەوە ئەوان پێیانوابوو گرنگە جووەکانی ئەمریکا بوەستێندرێن لەوەی بکەونە خۆ و هەروەها لە قەناعەتی ئەمریکاش لە ناوەڕۆکی نەخشەکە دڵنیا بکرێنەوە، بۆ قەناعەت پێهێنان و بەدواداچوونیش زنجیرەیەک ڕێکاریان دارشتبوو.

ئەوان هەموو هەوڵی خۆیان بەکارهێنا بوو فشارێک بخەنە سەر ئەمریکا بەوەی هەرچەندە شەڕەکە لەگەڵ ئاڵمان، ئیتاڵیا و ژاپۆن هێشتا لە گەرمەدایە، دەکرێ بە دڵنیاییەوە هەڵوێست لە ڕووسیای سۆڤیەتی بوەخرێندرێ. لەو خەباتەشدا بەریتانیا لەبەرەی بەرگریکردنە لە دیموکراسی و ئازادیدا. لە لێکەوتەکەشدا نابێ ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ببێتە لەمپەر لە بەردەم جێبەجێکردنی نەخشەی بەریتانیا لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا. ئەو سەرهێڵە سادەیە لۆژیکەش دەرەقەتی بەرەنجامی باش دەهات. بە پاڵپشتی ئەمریکا بۆ بەریتانیا، جووەکانیش بە ئاسانی نەدەوێران بەرەنگاریان ببنەوە. هاگانا لە لایەن کاربەدەستە فەرمییە جووەکان سەرپەرشتی دەکرا، بە دڵنیاییەوە لە کارێکی تیرۆرزمییانەوە نەدەگلا. هەرچی دەربارەی "تیرۆریستەکانیشە" دیاربوو کە ئەو پەیڕەوەی دەسەلاتدارانیان قبوڵ نەبوو، ئەوا بەرپرسیارێتی دەکەوتە سەر شانی سەرکردە جووەکان بۆ ڕەفتاری شیاو و ناچارکردنیان بۆ بنبڕکردنی "تیرۆر". ئیدی ئەو ڕامانەش پێدەچوو باش بێ.

**4**

دژی ئەم پاشخانە یاخیبوونی جوولەکە لە ئێرتز ئیسرائیلدا بەرپا بوو. دوو هۆکاری بنچینەیی -هەڵمەتی قڕکردنی جووەکان لە ئەوروپا و دەرگە داخستن بە ڕوویان لە ماوەی هەڵمەتەکەدا- هۆکاری دەمودەستی بەرپابوونی شۆڕشەکە بوون. من لێرەدا جەخت لە وشەی "دەمودەست" بۆ هەر جەنگ و هەر شۆڕشێک وەک هۆکارێکی بنگەیی دەکەمەوە کە بە شێوەیەکی حەتمیانە جەنگ یان شۆڕش هەڵدەگیرسێنێ، ئەم هۆکارەش دەبێ لەو هۆکارە دەستبەجێیانە جیا بکرێتەوە، کە تەنها کاتی ئەو هەڵگیرسانانە دیاری دەکەن.

قـاتوقڕیەکەی فەڕەنسـا لە کۆتـایی سـەدەی هەژدەم و بـاجی خـۆیٚ نەبـوونە مایەی بەرپابوونی شۆڕشی مەزن: ئەو هۆکارانە تەنها ڕێرەوەکەیان خێراتر کرد، هەروەک چـۆن بـاجی چـا ئـاگری جەنگـی ئەمریکـای بـۆ سـەربەخۆیی خۆشکرد. هاوشێوەش هەرای لە پەنجەرە فڕێدانی پراگ[28] کە شـەڕێکی سی سـاڵی لێکەوتەوە، کوشتن و لەناوبردنەکەی سەرایفۆش کە جەنگی یەکەمی جیهانی بە دوادا هات، پرسی دانزینگیش لە ١٩٣٩دا کە دواتر بووە ململانێی حەتمی نێوان ئاڵمان و باقی دیکەی جیهانی کردە ڕاستیەکی تەواوکراو.

ئەم قـانونە مێـژووییە بە سـەنگ و قەبـارەی جیـاوازەوە لە پرسـی ئێرتـز ئیسرائیل سەریهەڵدا. ئاخر ڕاپەڕینەکە شتێک بوو هەر دەبوو ببا. ساڵانێکی دوورودرێـژ بـوو سـەرکردە جووەکـان بیـرۆکەی سـەربەخۆیی و دەوڵەتـی جوولەکەیان بەلاوە نابوو، بەڵام ڤلادیمیر ژابۆتینیسکی ئاگاداری کردنەوە کە هـیچ کەس، نە بەریتانیەکـان و نە عەرەب و جیهـان بەگشـتیش بـڕوا بە نارەزایەتیەکەیـان نـاکەن. ئەو گوتبـووی، هەموویـان بایبلیـان خوێنـدۆتەوە و دەشزانن ڕۆژێک دیٚ ئێمەی جوولەکە دەست بەگەڕانەوە بۆ ئێرتز ئیسرائیل دەکەین، ئیدی دەبیٚ مەبەستەکەمان ڕوون و ئاشکرا بیٚ: ئەوەش ئەوەیە دەبیٚ ئێرتز ئیسرائیل بۆ ئێمە بگەڕێتەوە. لە دواییشدا هەر ئەوە بووە ئامانجمان. ئاخر ئەم ئامانجە لە خوێنماندا بوو. سروودە نەتەوەییەکەمان وای دەگوت. بەریتانییەکان ئەو گۆڕانەیان لەو دانە سروودە نەتەوەییەی لە ئێرتز ئیسرائیل پێشـکەش کـرا، تێبینـی نەکـرد. لە تـاراوگەدا جووەکـان سـروودی هیـوا دێرینەکەیـان، ***گەڕانەوە بـۆ خـاکی بـاب و بـاپیران*** دەگـوتەوە. لە ئێرتـز ئیسرائیلیشـدا جووەکـان سـروودی هیـوای دێرینیـان بەوەی ***گەلمـان لەو وڵاتەکەمانـدا ئـازاد بیٚ***، دەگوتەوە. گەلی سەربەست... لە وڵاتەکەی خۆماندا. ئاخر ئەو جۆرە خەڵکە ناکریٚ لە لایەن بێگانەوە فەرمانی بەسەردا بکریٚ. هەر دەبیٚ خۆی لەژێر نیری بندەستی ڕزگار بکا و هەوڵی ئازادبوونەکەش هەر بە تەنیا پرسی کات بوو.

گومـان لەوەدا نەبـوو، گەر قڕکردنەکەی ئەورووپـاش نەبووبـایە، تەنـانەت گەر سیاسەتی بەریتانییەکانیش نەبووبایە، ئەوا شۆڕشی جووەکان بە شێوەیەک

---

[28] Defenestration of Prague دوو ڕووداوی بۆ مێژووی بۆهیمیان، کە خەڵکیان لە پەنجەرە فڕێدراوەتە خوار و لە ئەنجامدا لە ١٦١٨دا شەڕێکی سی ساڵای بەدوایخۆیدا هێنا. وەرگێڕ.

له شێوەکان دژی دەسەڵاتی بێگانە هەر بەرپا دەبوو، هەر هەوڵیان دەدا بۆ ئەوەی ئازادی خۆیان بەدەست بێنن، ئەوسا هەرچەندیشی خایاندبا. بەڵام ئەم دوو هۆکارانەی (سەروو-وەرگێڕ) لەپڕ بەرپابوون و بەڕێکەوتیش هەڕەشەیان لە هیوای گەڕانەوە و لەناوبردنی گەلی جوو کرد، بۆیە کاتی یاخیبوونەکەی پێ دەستنیشان کرا.
لە سەرێکی دیکەشەوە، لەوە روونتر نابێ، سەرباری بەیەکەوە هاتنی ئەم دوو هۆکارە، لە هیچ بەند و بەشێکی جوولەکایەتیدا جۆشدانی شۆڕشکردن نەهاتبوو، رۆژ لەسەر گەلی جوولەکە هەر هەڵدەهات. "پلانەکە" هەر جێبەجێ دەکرا. دەکرا ئێمە ئەمڕۆ نەبووباینە خاوەن دەوڵەت. دەکرا ئێمە گێتۆیەکمان لەگەڵ دوژمنەکەمان هەبووایە کە بووبایە گۆڕستانمان. یاخیبوونەکە لەبەر چەند هۆیەکەوە پەیوەست نەبوو بە یاخیبووان، رزگاربوونێکی تەواوعەیاریشی بەدوایخۆیدا نەهێنا: دەوڵەتەکە لەسەر بەشێک لە وڵاتەکەمان دامەزرا، بەڵام رێگەی لە قڕکردن و لەباربردنی سەرتاسەریمان گرت.
یاخیبوونەکە لە خاکەوە سەریهەڵدا. چیرۆکە دێرینەکەی گریک لەبارەی یەتینۆس و وەرگرتنی وزەی بەهێزی لە خاکی دایک ئەفسانەیەکە. نۆژەن بوونەوەی هێزیش کە بۆ ئێمە پەیدا بوو، نەخاسمە بۆ لاوەکانمان، لە بەریەک کەوتن لەگەڵ خاکی دێرینەمانەوە پەیدابوو، ئەفسانە نییە بەڵکو راستیەکی بەرچاوە. کاربەدەستە بەریتانییەکانی وەزارەتی دەرەوە کاتێک پلانەکەیان دارشت لەم شتە نەگەیشتن. ئاخر ئەوان چۆن پێشبینی ئەو هێزە شاراوەیان دەکرد کە هێرتزل لە دوانەکەی وەک شتێکی "نەخەمڵێندراو" باس دەکرد؟ هەڵەی ئەوان بیرکارییانە نەبوو، ئەوان لە بارەی ژمارەی ئەو جوولەکانەی دەیانەویست بێنە ئێرتز ئیسرائیل شاش نەبوون. ئەوە مۆراڵ بوو، ئەوان نەیاندەتوانی پێوەر بە کەسایەتی جووەکان دابنێن کە دەگەڕانەوە ئێرتز ئیسرائیل. ئەوان وایاندانابوو کە لە ئێرتز ئیسرائیلشدا، جووەکان هەر دەپارێنەوە تا بپارێزرێن. رەفتاری جووەکان یان باشتر وایە بڵێین هەڵوێستی سەرکردە فەرمییەکانیان کەسیاسەتی خۆ جڵەوکردنیان[29] دەردەبڕی، وایکرد

[29] لە ماوەی ناشووبەکانی ١٩٣٦ -١٩٣٩دا ڕێکخراوی هاگانا ئەو سیاسەتە ناسراوەی هاڤۆلاگای پەیڕەودەکرد. هاڤۆلاگا وشەیەکی عیبریە واتای دان بەخۆداگرتن دەگەیەنێ. ئەوان کاری تۆڵەستێنەیان نەدەکرد مەگەر پەلاماریان درابا. لە بەرئەنجامدا عەرەب هەمیشە لە دەستپێشخەری دڵنیا بوو هەرگیز ڕووبەڕووی دژە

که ئەوان هەروای بۆ بچن. بەڵام ئەو هێزە لەبن و نەبینراوە کە گەلی جوولەکەی لە تواندنەوە پاراستووە، لە زەین و خەمڵاندنی بەریتانییەکاندا نەبوو. ڤلادیمیر ژابۆتنسکی هات، هەموو نەوەکەی بۆ بەرگیکردن جۆشدا، ئامادەی کردن قوربانی بدەن، فێری شۆڕش و جەنگی کردن. داڤید رازیلی ئەو عەقڵە مەزنە سەربازیەی نەوەکەشمان پەیدابوو، بۆ ئەوەی کرداری لێبڕوانە بکا و یەکەمین هێرشیش لە لایەن لەشکری جووەکانەوە بقەومێنێ. سووپای ژێرزەمینی جوولەکە، ڕێکخراوی ئیرگون زڤای لێومی سەریهەڵدا. ڕێکخراوێکی دیکەی خەباتی ژێرزەمینی بە ناوی جەنگاوەران بۆ ئازادی ئیسرائیل[30] هاتە کایە. نەوەیەکی نوێ هاتەکایە کە پشتیان لە ترس کرد. لە بری ئەوەی داوا بکەن و بپاڕێنەوە، جەنگان. بۆ ماوەی نزیکەی دوو هەزار ساڵ، جوو وەک جوولەکە دەستی نەدابووە چەک، ئیدی هەر لەسەر ئەو بێ چەکیەش بوو چ لەبارەی سایکۆلۆجی یان فیزیکیەوە بێت چەوسێنەرەکانمان حیساباتی خۆیان لەسەر ڕۆنابوو. ئەوان دەرکیان بەوە نەکرد، کە ئەم دوو دیاردەیە بە یەکەوە پەیوەستن: ئێمە دەستمان لە چەک بەردا کاتێ لە وڵاتی خۆمان دوورخراینەوە. بە گەڕانەوەمان بۆ سەر خاکی باب و باپیرانمان تین و جۆشمان هاتەوەبەر.

خوێنیش گیانی بەر شۆڕشەکەدا کرد. خوێنی خەڵکەکەمان کە لەسەر خاکی بێگانە ڕژا هاواری کرد، یاخیبوونی لە دڵمان ئاگردا و هێز و توانای بەخشیە یاخیبووان. کاتێکیش ڕاپۆرتە ترسناکەکان پشتڕاست کرانەوە، ئێمە تێگەیشتین کە نابێ هەر تەنها بۆ ئازادی خەڵکەکەمان تێبکۆشین، بەڵکو بۆ شتێک هەر بمێنێتەوە. تۆبڵێی ئێمە شتێکمان هەبێ لە دەستی بدەین؟ ئەوەش پرسیارێکی ڕەوانبێژیانە بوو. بە دڵنیاییەوە دروشمگەلی ناودار هەبوون گوایە کاریگەریی هەبوون جدیترە لەخودی ناوەڕۆکەکەی. "ئێمە هەر دەبێ تا دوا دڵۆپی خوێنمان بجەنگین" ئەم گوتەیان پێ لێهەڵبڕینێکی بەرچاوی تێدایە تەنانەت بۆ جەنگە هەرە ناودارەکانی مێژووش. "ئێمە هیچمان نییە لە دەستی بدەین" ئەوەش نموونەی دروشمێکی دیکەیە. ئاسایانە خەڵک تا ڕژانی دوا دڵۆپی

پەلامار نەدەبوومەوە. ئەمەش بەشێوەیەکی بەرفراوان لەگەڵ سیاسەتی ئیرگون کەلە ١٩٣٧ەوە دەستی پێکرا، ناکۆک بوو.

[30] جەنگاوەران بۆ ئازادی ئیسرائیل بۆ ماوەیەکی کورت بە گروپی ستێرن دەگوترا، ناوەکەش بەهۆی سەرکردەکەیان ئابراهام ستێرنەوە بوو.

خوێنی ناجەنگی. لەباری ئاساییدا هەمیشە ئەوان شتێکیان هەیە لە دەستی بدەن.
لەگەڵ ئەوەشدا دۆزەکەی ئێمە بێوێنە بوو. کاتێک ئێمە دژی نیری زۆرداری و خوێنی بێ پەروا ڕژانی جوولەکە بووینەوە، لەو بڕوایەدا بووین، کە بە ڕاستی گەلەکەمان بەدەر لە ڕامانی قڕکردنی، هیچی دیکەی نییە لە دەستی بدا. ئەوەش بە تەنها دەستەواژەیەک یان زێدەڕۆییەک نەبوو. ئەوە ڕاستییەکە بوو، هەروەها هاندەرێکی لەبن نەهاتووی توانای قوربانیدانی یاخیبووەکان بوو. توانستی قوربانیدان پێوەرێکی یاخیبوون و باوکی سەرکەوتنەکانیشە. تەنها لەو کاتەی لە پێناوی ئاگردانی مرۆڤایەتیدا ئامادەی قوربانی، ئەو کات دەگەیتە ئامانجی ئاگری شۆڕش. ئەو کاتەی کە تۆ سووری لەسەر مەبەستەکەت، تەنانەت گەر لەسەر ئەوەی دەڵێی زەوی بە دەوری ڕۆژدا دەسوڕێتەوە گەفت لێبکرێ، ئەوا تۆ نەوەک هەر مایەی گیران نی بەڵکو تۆ ئەو پەری سەرکەوتنی هزرەکەت، هزری ڕاستی مسۆگەر دەکەی. بەکورتی، لە هەموو مێژوودا هیچ شتێک لە ئامادەبوونی خۆقوربانیکردن مەزنتر نەبووە، هەر وەک ئەوەی هیچ خۆشەویستییەکیش لە خۆشەویستی بۆ سەربەستی مەزنتر نەبووە. خاکی وڵاتەکە و خوێنی خەڵکە کوژراوەکە بە هێز و خۆشەویستیەوە گڕی لە یاخیبووە جووەکان بەردا.
گۆڕانکاری سەبارەت بە گیانی جوولەکە لە سۆنگەی ئەم دوو هۆکارەی سەروو بە گفتار و ڕەفتاریش لە جەنگ و ژوورەکانی دادگادا دەربڕا. ئەو یاخیبووانەی هێندرانە بەردەم دادگای سەربازی هەرگیز بۆ بەزەیی و لێبوردن نەپاڕانەوە. بۆ جارێکیش ڕووینەدا. ئەوسا چ بە بێدەنگی مانەوە بۆ ئەوەی هیچ زانیارییەک نەدەن، یاخود لەنێو ژووری دادگاشدا جەنگان و پەلاماری دادوەرەکانیان دەدا کە گەفی لە سێدارەدانیان لێدەکردن، لە جیاتی ئەوەی بەرگری لە خۆیان بکەن هێرشیان دەبرد، لە جیاتی پاڕانەوە تۆمەتباریان دەکردن. ئەمەش جارێکیان مایەر فاینستاینی چەکدار کە یەکێ بوو لە نێو پاڵەوانە گەورەکانی نەوەی ئێمە، وتەیەکی زۆر بەرز و لەبلەبانانەی بە دادوەری بەریتانی گوت:
"ڕژێمی پەت و قنارە، ئەو ڕژێمەیە کە تۆ دەتەوێ لەم وڵاتەدا دایبمەزرێنی، کە چارەنووسی وایە ببێتەماڵە چرایەک بۆ مرۆڤایەتی. لەو شەڕانگێزییە

گەلحۆیانەکەتـدا، وا دادەنێـی بەهـۆی ئەم ڕێکـارەوە سـەربکەوێ و وورەی بەرزی گەلەکەمـان تێکبشکێنی، ئەو گەلەی کە سـەرتاپای وڵاتەکەی لـێ بـۆتە داری سێدارە. تۆ لەمەدا هەڵەی. تۆ ئەوەت بۆ دەردەکەوێ ئەوەی بەرامبەرت وەسـتاوەتەوە پـۆڵایە، پـۆڵاش بە ئـاگری خۆشەویسـتی و ڕق نەرم دەکـرێ، خۆشەویسـتیش هـی نیشـتمان و ئـازادی، ڕقیش لە چەوسـێنەر و داگیـرکەر. ئەوەش پۆڵایەکی سوتاوە، تۆ ناتوانی بیشکێنی. بەم حاڵە دەستەکانی خۆت تێکدەشکێنی.

"ئای ستەمکاری بەرێتانی چەند کوێری: ئەرێ هێشتا بەوەت نەزانیوە، لەگەڵ کـێ کەوتـویتە داو، لەگەڵ مێژوویەکی بـێ وێنەی مرۆڤـایەتی؟ ئایـا وا دەزانـی ئێمە لە مردن دەترسین، ئێمەمانـان چەندان سـاڵە گوێمان لە تەقە و هـۆڕی ماشێنە بارهەڵگرەکانە کە براکانمان و دایبابمان، باشـترین خەڵکی ئێمە بەرەو کوشتارگەیەک دەگوازنەوە، لە مێژوودا پێشینەی نەبووە؟ ئێمە ئەو کەسانەین کە هەمـوو ڕۆژ لەخۆمـان دەپرسـین؛ ئـاخر خـۆ ئـێمە لەوان، لەو ملیۆنـان لە برایەکانمـان باشـتر نـین؟ ئەرێ جوامێری ئێمە لە چیدایە؟ ئـاخۆ ئـێمە لەگەڵ ئەواندا بووباین لە ڕۆژانی ترس و بیم و ئەو ساتانەی بەر لە هاتنی مەرگ.

"بۆ ئەو پرسـیارە بەدواییەکدا هـاتووانەدا، ویژدانمـان یەک وەڵامـی هەیە: ئێمە بۆ ئەوە دەربازمان نەبووە کە بە کۆیلایەتی یـان لەژێر چەوسـاندەوە و بژین و چـاوەڕێی ژیـانێکی وەک ترێبلینکـی[31] بکەیـن. ئـێمە بـۆ ئەوە مـاوینەتەوە لە ژیـان و ئـازادی و شـەڕەفمەندی خۆمـان، هـی گەلەکەمـان، هـی ڕۆڵەکانمـان و ڕۆڵەی ڕۆڵەکانمـان خـاترجەم بـین. ئـێمە بـۆ ئەوە دەربازمـان بـووە نەهێڵـین جـارێکی دیـکە ئەوەی ڕوویـدا دووبـارە ببێـتەوە یـان هەر شـتێکی دیـکەی هاوشێوە لەبن ڕێسا، لەبن ڕێسای غەدر، لەبن ڕێسای خوێندا ڕوویدا.

"ئێـدی هەر لەبەر ئەوەیە کە ناترسـێین. ئـێمە فێربـووین و دەزانـین نرخـی قوربانی بێ واتا چییە! ئاخر ژیان هەیە لە مەرگ خراپترە و مـردنیش هەیە لە ژیان مەزنترە."

ئەم وشـانە لە دەمێکەوە دەرچـوون، لەسـەر لێواری مەرگەوە بـوو، وشـەکان دەربڕی هەسـتی ئـاگرتێبەربووی یاخیبووان بـوو. هەر هەمـان هەسـت ڕێگای

[31] تورنوگایەکی زۆر مەلیی قڕکردنی جوولەکان بوو کە نازییەکان لە کاتی جەنگی دووهەمی جیهاندا لە گوندێک بەو ناوەوە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی وارشۆ، لە پۆلەندا دایانمەزراندبوو. وەرگێڕ.

به بانگەوازی جەماوەری بۆ یاخیبون دا کە لە لایەن ڕێکخراوی ئیرگون زاڤای لێومی بە درێژی و پانی ئێرتز ئیسرائیل لە سەرەتای ١٩٤٤دا بڵاوکرایەوە. ئەو بانگەوازەی ئەوێ ڕۆژێ بە لەخۆگرتنی ڕابردووشەوە، داخوازی سیاسییانەی گەلی جوولەکەی لە سەروبەندی کۆتایی هاتنی جەنگی دووهەمی جیهان وەک ڕێخۆشکردنێک بۆ ڕاپەڕین و خەبات لەخۆگرتبوو. لە بەرەنجامەکەشیدا گوترابوو:

"چوار ساڵە لەوەتەی جەنگەکە بەرپابووە، هەموو هیوایەک کە لە دڵێ ئێوەوە چەکەرەی کردبوو بەبێ ئەنجام بەهەوادا ڕۆیشت. ئێمە بارێکی نێودەوڵەتیمان پێڕەوا نەبینراوە، نە لەشکری جووش دامەزرێندرا، دەرگاکانی وڵاتەکەش نەخرانە سەر گازەرای پشت. ڕژێمی بەریتانی مۆری ناپاکییە شەرمهێنەکەی لە نێوچاوانی گەلی جوو دا، بۆیە هیچ بنەمایەکی مۆراڵی ئەو دەسەڵاتە لە ئێرتز ئیسرائیل نەماوەتەوە.

"ئێمەش دەبێ نەبەزانە بەرەنجامەکەی بزانین. ئیدی هیچ ئاگربەستێک لەنێوان گەلی جوولەکە و بەڕێوبەرایەتی بەریتانی لە ئێرتز ئیسرائیلدا، کە براکانی ئێمەیان داوەتە دەست هیتلەر، نەماوە. گەلەکەمان لەباری شەڕدایە لەگەڵ ئەم ڕژێمە، شەڕێک تا کۆتایی.

" ئەم جەنگەش دەکرێ قوربانی زۆر و قورسی لێبکەوێتەوە، بەڵام ئێمە دەچینە ژێر باری ئەو جەنگە بە هۆی ئەو بەرەنجامەی کە ئێمە بڕوامان بە منداڵەکانی گەلەکەمان هەیە کە سەریان بڕدراوە. لە پێناوی ئەواندا دەجەنگین، لەپێناو وەسیەتنامەی ئەو مردووانەدا دڵسۆز دەمێنینەوە.

"ئیدی ئەمە داخوازییەکەمانە: دەمودەست دەسەڵات لە ئێرتز ئیسرائیلدا ڕادەستی حکوومەتێکی خۆجێی عیبری بکرێ.

"ئێمە دەجەنگین. هەموو جوویێکی نیشتمان دەبێ بجەنگێ. خودانی ئیسرائیل، یەزدانی مەزن یارمەتیمان دەدا. خواستی ئەوان هی پاشگەزبوونەوە نییە. ئازادی یان مردن.

"دیوارێکی پارێزەر بە دەوری گەنجە جەنگاوەرەکانمان دابێنە. خوایە بێ ئومێدیان نەکەی...

"لاوە جەنگاوەرەکانمان لە بەردەم کوێرەوەری و قوربانیداندا، لە بەردەم خوێن و ژان و ناسۆردا نابەزن. ئەوان دەستهەڵناگرن تا ڕۆژگاری دێرینمان

نۆژەن نەکەنەوە، تا ئەو کاتەی گەلەکەمان لە نیشتمان، ئازادی، شـەرەف و دادپەرەوەری دڵنیـا دەکەنەوە. ئەگەر تـۆش یـارمەتی ئەوان بـدەی، ئەوا لەو ڕۆژی زایۆن و چاکبوونەوەی ئیسرائیل بەچاو دەبینییەوە."

5

ئەم بانگەوازە دەبوایە لە نیوەی یەکەمی ۱۹٤۳دا بووایە نەوەک لە یانیوەری ۱۹٤٤دا. بانگەوازەکە وا داڕێژرابوو، ئەو کات منیش هێشتا هەر سەربازێکی ئاسـایی -هەرگیـز لەو پلەیەشـم تێنەپەڕانـد- بـووم لە سـووپایەکی بێگـانە. بەهۆی بارودۆخێکی ناڕاستەوخۆ لە ناوەخۆ و دەرەوەی ئیرگوندا، سەعاتی سـفرمان دواکەوت. بەڵام سـاتەکەش هەر هـات. ئیدی ئـێمەش بـۆ جەنـگ ڕۆیشـتین. ئـێمە سـەرلەبەری زرێـی ئازادیمـان پۆشـی. ئـێمە ڕاشـکاوانە داخوازییەکی دیاریکراومان دەگوتەوە: ئێمە بەندێکمان دەسـتپێکردووە نـاتوانین پێشـبینی کۆتـاییەکەی بکەیـن. هەنووکەمـان تـاڵوتفتە و دوارۆژیشـمان نادیـار. هەردەبـوو ئێمە بڕوامـان هەبـووایە -بە ڕاسـتیش بڕوامـان هەبـوو- ڕەنـج و قوربـانی. ئیـدی ڕەنـج و قوربانیمـان، خـوێن و ژان و ناسـۆرمان دەبـوایە سەرکەوتنی بەدیبهێنابایە.

بەر لەوەی جاڕنـامەی شۆڕشـەکەش بڵاوبکـرێتەوە، فەرمانـدەی ئیرگـون مـاوەیەکی بەردرێژ و جـدییانە بیـری لێکـردەوە و لە نیگـای وەزەپێدانیشـەوە شتەکە وای دەخواست بڵاوبکرێتەوە. تۆبڵێی ئەوە باشـتر نەبـووبێ کـردەوەکە دەستپێبکرێ ئەوسا ڕوونکردنەوە بڵاوبکرێتەوە؟

هەندێ لە هاوڕێیانم هەستیان وابوو لەبەر هۆی نـاوەخۆ و دەرەکییەوە ئێمە دەسـت بە هێرشـێکی سـەربازییانە بکەیـن، نەوەک دوانێکی سیاسییانە پەخش بکەین. ئەم بەڵگەوبەندەش قورس هەڵدەسەنگێندرا. ئاخر گەلەکەمـان خەڵکێکی کـرداریيە. ئەوان ڕێـز لە وشـەگەلێک نـاگرن مەگەر پاشـخانێکی کردەوەییـان نەبـێ. لە ئاکامیشـدا مشـتومڕی ئەم هاوڕێیـانە بـۆ ئەوەی سەرکێشـا کە جاڕنـامەی ئـێمە بەهەنـد هەڵنەگـرن. ئەوان هەر دەیخـوێننەوە، بەڵام نەوەک سـەرەداوەکانی، وەک خۆیـان بەخۆیـان دەگـوت باشـترە سـەرەداوی تەقینەوەکـان و بۆمبەکـان باشـتر بخـوێننەوە و لەسـەری بـڕۆن. هەرچـی دەربـارەی هاوپلەکـانی وەک ئـێمەش بـوو، ئەوا ویسـتی جەنگـان هـیچ سێودوێنیکی لەسـەر نەبوو. بەڵام تـۆبڵێی چەند جاریـان پێگـوترابێ، شـەڕێکە

تەنها هەڵگیرساوە؟ بەڵێنە بەجێنەهێنراوەکان زۆر بوون، هەرچەندە هەموو نیەتێک بۆ بەرزڕاگرتنیان هەبوو. نامرادییش تاڵ و زۆر بوو. بەڵێنێکی نوێ، یەک بانگەوازی دیکە، دڵی ئەوان ئاوی پێناخواتەوە. ئەوانیش دەیخوێننەوە، سەری لەبەر دەهەژێنن و دەڵێن ئاخر خۆ ئەوەیان پێشتر بیستبوو.
سەرەڕای لەبەرچاوگرتنی قورسی ئەو بەڵگەوبەندانەش، بە پاڵپشتی ئەو ڕاستیەش کەوا "یەکەمین" کردەوە بارێکی پێشڕەوی دەداتە لایەنی سەربازیمان و ڕەوشەکە تەواو سەرسام دەکا، بەڵام ئێمە بڕیارمان دا جاڕنامەکە پەخش بکەین. ئەوەش ڕوون بوو بۆ ئێمە، هەرچەندە شتەکانیش بەرەوپێشەوەچوون، کە ئێمە چوینەتە بەرایی و خەباتیکمان دەستپێکردووە. ئاخر خۆ هیچ تاکە ئۆپەراسیۆنێک هەرچەندە کاردانەوەکەشی بەرفراوان بێ، چارەنووسسازانە نابێ. ئێمە دەبوایە کۆمەڵە ئۆپەراسیۆنێکمان بکردبایە. ئەوەش ژانی زۆر و ڕاوەدونانی دەمودەستی بەدواوە دەبوو. لە بەرەنجامیشدا، ئەوە ئەرکی ئێمە بوو بنەماکانی خەباتەکە و ئامانجەکانی ڕاڤە بکەین. جیهان دەبێ بزانێ، کە ئێمە لە پێناو چیدا دەجەنگین. دەبێ خەڵکەکەش بزانێ ئاخۆ بۆچی تەیار و ئامادە بن، لە میانەی ئۆپەراسیۆنەکانماندا بەرگەی تەنگەوچەڵەمەش بگرن. لاوەکان دەبێ بزانن بۆچی گیانی خۆیان دەخەسەر لەپی دەست. ئێمە دەمانزانی جەنگەکەمان هەر بە تەنیا شەڕێکی سەربازیانە نییە. هێز و تاوی ڕێژەیی چەوسێنەرەکە و یاخیبووان لە هەموو هاوسەنگییەک بەدەر بوو. ئێمە دەبوایە تای تەرازوەکە بە پێوەری هۆکاری دیکە بپێوین. یەکێک لەوان هۆکاری سیاسیی بوو. بۆ ئەوەی دەقاودەقتر بین، شەڕەکە سیاسییە و بە کەرەستەی سەربازی دەکرێ. لێکەوتەی ڕوونکردنەوەی سیاسییانە دەبێ ڕوون و شێلگیرانە بێ، و هاوڕای ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکان بێ. کەواتە ئەوەی لەدایک بووە و ئەوەی لە ماوەی خەباتی ژێرزەمینیدا- هەرچەندە بڵاویش ناکرێتەوە- جاڕ دەدرێ پێی دەگوترێ palabra پالابرا.
کاتێک یەکەمجار گوێم لە وشەی پالا برا بوو، واتاکەیم نەدەزانی، کاتێکیش بەدوایدا چووم ، بۆم دەرکەوت وشەیەکی سپانییەوە واتای "وشە" دەدا و هێشتاش لە تێڕامانەکە نەگەیشتم. بەڵام برادەرەکانم پێیانگوتم، وشەکە واتای "زۆربلێی"ش دەدا. ئیدی هەرئەمەش مەبەستی جاڕنامەکەمان بوو کاتێ

چاپکرا. ئەو پیاوە واتە سیفاردی Sephardi کە ئەدەبیاتی ژێرزەمینی ئێمەی چاپ دەکرد بۆ ساڵانێک یارمەتی گەنجەکانی ئێمەی دەدا، بەڵام لە قۆناغی سەرەتایی زوودا خۆرسکانە شڵەژاو بوو، چاوەڕێی ئەوەی دەکرد خێرا شتێکی بکەوێتە بەردەست، ئەو سکاڵای لە دەست درێژەدادڕی بە پالارابلای کورت دەکردەوە.

لەکاتێکیشدا پێتچنەکە بەهۆکاری تایبەتی خۆی ڕەوایەتی بەو دەستەواژەیەی خۆی دەدا، بەداخەوە زۆر لە برادەر و ئەوانی دیکە لەسەر شتەکەی کابرا کۆک بوون. هیچ کەس جاڕنامەکەی ئێمەی بەهەند هەڵنەگرت. هیچ کەسێک لەو بڕوایەدا نەبوو کە شوێنکەوتەی جاڕنامەکامان دەبن، یان کەس نییە کە شوێنی بکەوێ. من بە خۆم گوێم لە تانەوتەشەری وا بووە: "بێگن دواندەرێکی جەماوەری بوو، هەنووکەش چۆتە باری ژێرزەمینی، ئیدی ناتوانێ دوان بدا، بۆیە وتەکانی لەسەر دیوارەکان دەنووسێتەوە." ئەوە تەنها **پالابرایە.**

پێدەچوو هەر ئەمەش گۆشەنیگای بەریتانییەکان بێ. لەنێو بەگومانەکانیش ویلکینی ئەفسەری C.I.D بوو. ویلکین یەکێک بوو لە فێڵبازەکان وەک ڕێوی بوو، لە ڕاستیشدا ئەندامێکی چالاکی تیمی لێکۆڵینەوەی بەریتانییەکان بوو. ئەو پلەوپایەی بەرزبووەوە، زمانی عیبریشی دەزانی و دەروونناسێکی باشیش بوو. کاتێک گومانلێکراوێکی بگرتبایە، پرسیارگەلێکی سەرسوڕهێنەری لێدەکردن:

"ئەرێ تۆ سەر بەکام ڕێکخراوی، ڕێکخراوی ئێرگون یان گرووپی ستێرن."

کاتێکیش وەڵامەکە وا دەکەوتەوە، "شتاقیان"، ویلکن بە پرسیار شێلکەبارانی دەکرد" ئای لەو ناپاکە؟ هیتلەر لە ئەوروپا جوولەکە دەکوژێ، هێشتاش کتێبی سپی لێرە پەیڕەو دەکرێ، کەچی تۆش نەچوویتە خەباتی نهێنی؟"

ڕاستە ئەو زۆرجاران سەرنەدەکەوت، بەڵام هەندێک دەستبەسەرکراویش دەکەوتنە داو.

لەگەڵ چڕبوونەوەی خەباتی ژێرزەمینیدا، پلەی ویلکین بەرزکرایەوە و گواسترایەوە بارەگای سەرەکی C.I.D لە ئۆرشەلیم، دوایش هەر لەوێ کوژرا.

کاتێکیش جاڕنامە دوورودرێژەکەمان بڵاوکرایەوە، بە ویلکین گوترا، ئاریشەی هەرە مەزن کە خەریکە ڕوووبدا ئەوەیە، ڕێکخراوی ئیرگون زڤای لێومی بانگی شەڕی لە دژ بەریتانیا داوە و داوای یاخیبوونی سەرتاسەری کردووە، کابراش هەر بە ئارامگرتوویی مابووەوە.

ئەوسا بە بێزراوییەوە گوتبووی، "هیچ شتێکی وا نییە مایەی دەرد و خەم بێ."

ئەوەش باری کاردانەوەی گشتی بوو لەنێوان هەر دوو لایەنی جوولەکە و بەریتانییەکان. **پالابرا!** لاقرتێیەکی بەرچاو، بڕوایەکی کەم. وەلێ ئێمەمانان کە چووبووینە قووڵایی باری ژێرزەمینی لەپێناوی خەباتی ڕزگاریخوازیدا، دەمانزانی کارەکە زۆر جدییە.

دەیەکی[32] گەلەکەمان تەنها یەک ڕێگای بۆ مابۆوە: ئەویش ڕێگای ڕاپەڕینی شۆڕشگێرانە بوو. تاکە ڕێگای سروشتی ڕێگای ڕەوا بوو. دوو وشەی پڕ بڕوا مێژوویان گۆڕی و دروستیشیان کرد، ئەو دوو وشانە لە مەیدانی ئێرتز ئیسرائیلدا شۆڕەسوار بوون. ئەوانیش ئازادی یان مردن بوون. دوو وشەی زۆر سادە پڕ واتا.

هەنووکەش ناکرێ پاشگەزببینەوە. کۆستی گەورە لەسەر سینگمان لاکەوتوە. بە ڕاستیش مەڕاقمان بێ کۆتایی بوو. ئەوەش بە تەنها سەرەتایەک بوو. تۆبڵێی خەباتەکە چەند بخایەنێ؟ ئاخۆ چ قوربانیەک دەبوو بدەین؟ خوێن... خێزانی کۆستکەوتوو... منداڵی هەتیوکەوتوو... ڕۆڵەی لە مەیدانکەوتوو... دایکی بێوەژن. بەرپرسیارێتیش شتێکی سامناک بوو.

لێ گەلۆ، لە مێشکی ئێمەدا ئەو زانیارییە جێگیر بوو، کە سیاسەتی بەریتانی چ نەخشەیەکی بۆ داناوین: لە گوێمان تەقە و هۆڕی ئەو لۆریە باربەرانەی مەرگ لە ئەوروپا دەزرینگایەوە. ئێمەش دڵمان لەسەر دوودڵی و دژی جێگرەوەی "چارەسەریەکان" دانابوو.

ئاخر ناسینەوەی یادەوەری دادی چی دەدا؟ ئاخر قسەکردن چ بەهایەکی هەیە؟ خۆ ئەگەر لە دارستانێکدا گورگێک پەلاماری دای، ئایا هەوڵی ئەوە

---

[32] ئەم وشەیە لە بەرامبەر جەوهەری واتاکەی واتا کوشتن و لێدابڕینی دەیەک واتای باشی خۆی ناگەیەنێ. خەڵکی جوو لە جیهاندا لە ۱۹۳۹دا بە شازدە ملیۆن و نیو مەزندە دەکران، بەڵام لە نێوان ۱۹۳۹ -۱۹٤٥دا ئاڵمانەکان، شەش ملیۆنیان لێ قڕکردن. واتە لە ماوەی کەمتر لە شەش ساڵدا زیاتر لە سێیەکی جوولەکانی جیهان بە ئەنفەست فەوتێندران.

دەدەی قەناعەتی پێبکەی کە پارچە پارچەکردنی تۆ نارەوایە، یان بەڵکو هەر لە بنەڕەتدا گورگ نەبێ و بەرخێکی بێ وەی بێ؟ ئایا تۆ "یاداشتنامەیەکی" بۆ دەنێری؟ نەخێر، هیچ ڕێگایەکی دیکە لە ئارادا نەبوو. خۆ ئەگەر نەجەنگابایین، تێکوپێک دەشکێندراین. جەنگان تاکە ڕێگای ڕزگاربوونمان بوو.

کاتێکیش دیکارت گوتی: "من بیر دەکەمەوە، کەواتە من هەم." ئەو هزرێکی قووڵی دەربڕی. بەڵام خۆ ڕۆژگارێک لە مێژوودا هەیە، کۆمەڵانی خەڵک بە تەنها بیرکردنەوە نەبێتە مایەی سەلماندنی هەبوونی خۆی. دەکرێ گەلێک "بیر بکاتەوە" بەڵام هێشتاش کوڕ و کچەکانی هەر ببنە مێگەلێک لە کۆیلە یاخود سابوونیان لێ دروست بکرێ. ئاخر ڕۆژگاری وا هەیە هەموو شتێکی تۆ هاوارت لێدەکا: تۆی ئادەمیزادی ڕێزلەخۆگرتوو لە هەمبەر شەڕانگێزییدا هەموو شتێکت بەندە بە بەرگریت.

***ئێمە دەجەنگین، کەواتە ئێمە هەین!***

## بەندی: 5
## لۆژیکی یاخیبوونەکە

١١٧ - ١٠

**1**

هەڵەیەکی کوشندەیە، گەر لە بەرەنجامی ئەوەی لە بەندەکانی پێشوودا نووسیومە، ئەوە لێکبدرێتەوە، بناوانی سەرەکی یاخیبووان کە هێز و بەردەوامییان لێهەڵێنجاوە هەست و سۆزیان بووبێ. گریمانەی ئەوەی کە یاخیبوونەکە هەر تەنها "سەرچڵێیکی پاڵەوانانە"ی "نامرادیی" خەڵکەکە بووە بەوەی پرسەکە بە بەخت و شانش بووە، کەوا نەشکان و نوشستیان نەهێناوە، ڕوانینێکە لە هەڵە گەورەترە، بەڵکو گەوجایەتیشە. هەر چۆنێک بێ ئەوە گریمانەی لۆرد سامۆئیل، یەکێک لە کۆمسیارە باڵا توندەکانی فەلەستین بوو. سامۆئیل لە دەمەتەقێیەکی ئەنجوومەنی لۆردەکانی بەریتانیادا لە هاوینی ١٩٤٦دا بانگەوازی ئەوەی بۆ ئەندامەکانی کرد، کە ئەو ڕەوشەی لە ئێرتز ئیسرائیلدا لە سەدەی بیستەم و لەژێر جڵەوی فەرمانڕەوایی بەریتانیادا ڕوویداوە، بە سەدەی یەکەمی دەسەڵاتدارانی ڕۆمانی لە فەلەستیندا بەراورد بکەن. ئیدی ئەو لە وتوێژەکاندا گوتی، شتێک بە ناوی ئیرگون زڤای لیومی هەیە. چەند سەدەیەک پێشتر گروپێک هەبوو بەناوی پەڕگیرەکان، ئەوان کاری پاڵەوانانە و خۆقوربانی مەزنیان لەوێ دا و ئازایانە لە بەرامبەر ئیمپراتۆریەتی زاڵی ڕۆمانەکان وەستابوونەوە. لە میانەی قسەکاندا سامۆئیل پرسی؛ بەڵام ئاخۆ ئەوان چییان دروویەوە؟ پەڕگیرەکان بە هۆی پیاوێکەوە مردن. لە ئابلۆقە مێژووییەکەی ماسادادا ئەوانەی مابوونەوە ژن و منداڵەکانیانی خۆیان بە دەستی خۆیان کوشتن، پاشان یەکدیشیان کوشت، ئەمەش بۆ ئەوەی هیچ کامیان بە زیندووی نەکەونە بەردەستی ڕۆمانەکان کاتێ قەڵاکەیان داگیردەکەن. ئەوەش زەبرێکی جەرگبڕ بوو بە گەلی جوولەکە کەوت، کە هەر لە هەمان سەدەوە لە وڵاتەکەیان تەرەکران و بە چوار کەناری دنیادا پەرشوبڵاو بوونەوە. سامۆئیل ئەوەی بیر لۆردەکان هێنایەوە، کە کارەکەیان کارێکی پاڵەوانانە بوو، بەڵام ڕەنج بەخەسار بوون و بە هیچ

نەگەیشتن؛ ئیدی دەبێ گەلی جوولەکە لەوە بە ئاگابن هەمان ڕێچکە نەگرنەوە بەر.

ئێمە هەموومان دەزانین لێکەوتەی پێشهاتەکانی دوای ڕووداوەکە هەڵەی لۆردەکەی کارمێلی سەلماند. پاڵەوانێتی ئیرگون شتێک نییە بە هەند هەڵنەگیرابێ و بە ئامانجێک نەگا. یاخیبوون دژی بەریتانیا کۆتایی نەهاتووە و شۆڕشیش دژی ڕۆمانیەکان کۆتایی هات. ئەوە ماسادا نییە بەڵکو مۆدینی[٣٣]یە کە هێمای یاخیبوونی جووەکان بێ لە ئێستاماندا. هۆکارەکەشی زۆر سادەیە. ئەم یاخیبوونەی ئێستا تەنها بە هۆی هەستوسۆزی خۆڕسکەوە نییە؛ یاخیبوونەکە بە ڕێبەری تێگەیشتنی گشتی و لۆژیکی سیاسییانەوەیە. هەست و سۆز پاڵەوانێتی بەرهەمدێنێ؛ لۆژیکیش ستراتیژی، ستراتیژێکی باشیش سەرکەوتن مسۆگەر دەکا.

هەر لەپێشدا و لە قۆناخە بەراییەکانی یاخیبوونەکە ئێمە بە بابەتێکی ستراتیژی گرنگ گەیشتین: ئێمە لە پوچەڵکردنەوەی هۆکاری عەرەبی خۆجێی سەرکەوتین. بۆ بیست ساڵێک دەبوو ڕکێفی دەستپێشخەری لایەنی سەربازی و سیاسی لە دەست عەرەبەکانەوە بوو. بۆ ئەوەی دەقاودەقتر بین، بەڕێوبەرایەتی بەریتانیا لە میانەی سەرلەبەری ماوەی مانداتەکەیدا، پاڵەپەستۆیەکی وای خستبووە سەر ڕەوشەکە، کە دەستپێشخەری لە دەستی عەرەبەکاندا بێ. ئەمەیان لە لایەک، لە لایەکی دیکەشەوە بەهانەیەکی وای دابووەدەست، کە نەتوانرێ ژمارەیەکی زۆری جوولەکە لە تاراوگەوە بگەڕێنەوە وڵات، لە سەرێکی دیکەشەوە پێشنیازی کردبوو، کە هێزی بەریتانی لە ئێرتز ئیسرائیلدا بۆ پارستنی جووەکان پێویستە. ڕاستییە دیرۆکەکانی پەلاماری عەرەب بۆ سەر جووەکان زانراوە: کوشتوبڕی شارە دێرینەکەی ئۆرشەلیم لە ١٩٢٠، پەلامارە بکوژیەکەی یافا لە ١٩٢١، کوشتارگەی ١٩٢٩، زنجیرە پەلامارە توندوتیژیە بەردەوامەکەی ساڵانی ١٩٣٦ تا ١٩٣٩. لێکەوتە دەروونییەکانی یەکڕەهەندەی ئەم هێرش و پەلامارانە بە قەد ئاکامە سیاسییەکانیان کارەساتبار بوون. لە کاتێکدا نەدەکرا عەرەب بە ترسنۆکیی خەڵکی هەرە ترسنۆک تۆمەتبار بکرێن، بەڵام

---

[٣٣] مۆدینی: گوندێکی لە گردەکانی جودیا کە شۆڕشێکی سەرکەوتووی هاسمۆنین دژی گریکەکان لە ١٦٥ پێش زاین بەرپابوو.

ئازایەتییکی تایبەتمەندانەشیان نەبوو، ئەوان بە جدیی بە دوای ئەوەوە بوون کە جووەکان بە (ولد الموت-ڕۆڵەی مەرگ) بناسن و فیستییڤالی (ذبح الیهود- کوشتنەوەی جوولەکە)یان ساز دەدا. لە جیهان بەو پانوپۆڕیەی خۆیەوە بیروباوەڕێک ڕەگی داکوتابوو، کە جووەکانی ئێرتز ئیسرائیل هەر وەک جووەکانی هەر بستێکی سەر ئەم زەمینە بە ئاستەم بەرگەی هێزی ئاسایشی غەیرە جوو ناگرن. بۆ بەدبەختیش، بە دڵنیاییەوە ئەمە ڕاست بوو؟ لەوانەیە، بەڵام قوڕبەسەر ئەو دادپەروەرییەی کە بە چەقۆی ڕۆڵەی بیابان سەرببڕدرێ.

شۆڕشی عیبری کۆتایی بەو قۆناخە شەرمەزاری و دژوارییە هێنا. بەریتانیەکان لە لایەن یاخیبووە جووەکانەوە پەلاماردران، ئیدی بە ترسەوە مشتومڕیان لەسەر ئەوە بوو، کە بۆ پاراستنی جوولەکە لە فەلەستینن. هەر زوو عەرەبەکان قەوانی "ڕۆڵەی مەرگ"یان لەبیر کرد و تەنانەت ڕێزی جوولەکەکانیشیان گرت. ئەمەی دواییان بەرەنجامێکی ناڕاستەوخۆی یاخیبوونەکە بوو، بەڵام هێمایەکی بەرچاو و بەکردەوە بوو. عەرەبەکان توانستی دەستپێشخەری سەربازییانەیان لە دەست دا. مانداتەکەش نەیتوانی چیدیکە فشاریان بخاتە سەر بۆ ئەوەی جڵەوی دەستپێشخەریان لە دەست بمێنێتەوە. ئەوەش وەنەبێ دەسەڵاتی مانداتی بەریتانی هەوڵی ئەوەی نەدابێ. بە پێچەوانەوە لە میانەی یاخیبوونەکەدا، حکوومەتی مانداتەکە قسووری نەبوو لەوەی گرژیەکە بەلایەکی دیکەدا کشتتر بکا، بۆ ئەوەی ململانێی ئەنگلۆ/جوولەکە بە کێشەی عەرەب/جوولەکە بگۆڕێ. لەو پەیوەندییانەی عەرەب لەگەڵ هاگانا و ئێرگوندا ئەوەیان درکاندبوو، کە ئەفسەرە بەریتانییەکان سەردانی گوندەکانیان کردوون و هانیشیان داون، بەڵام هاندانەکەیان بێ بەر بووە. عەرەبەکان گوێیان گرت و ناکارا (پاسیڤ) مانەوە. لە کۆتاییدا ئەفسەرێکی پلە باڵای بەریتانی، ژەنەڕاڵ دارسی مشووری ڕامانێکی دیکەی سەبارەت بە ئەرکی بەریتانیا لە ئێرتز ئیسرائیل خوارد. ئەو بە کۆمسیۆنی لێپێچینەوەی ئەنگلۆ/ئەمریکایی گوت؛ ئەگەر بەریتانیا لە فەلەستین بکشێتەوە، ئەوا جووەکان دەست بەسەر تەواوی وڵاتەکەدا دەگرن. بە وتەیەکی دیکە، هەنووکە بەریتانییەکان دەبوایە عەرەبەکانیان لە جووەکان پاراستبا... ئیدی بە دڵنیاییەوە تۆنی دەنگەکە گۆڕا!

من لە سەرەتای ڕۆژە بەراییەکانی هێرشەکانمان، بۆنەی وام بۆ پەیدا بوو، کاریگەری لایەنی دەروونی ئەو پەلامارە غافڵگیریانەمان لەسەر عەرەبەکان ببینم. ڕۆژێک دوای پەلامارە سێ کوچکەییەکەمان بۆ سەر بارەگا سەرەکییەکانی پۆلیس لە ئۆرشەلیم، حەیفا و یافا، لە تەلئەبیبەوە چوومە ئۆرشەلیم. لەبەر پرسی ئاسایش بە یاوەری هاوڕێ سێفاردی بە پاسێکی عەرەبان ڕۆیشتم. لە ڕێگادا چەند جاران لە لایەن بازگەی گەڕۆکی بەریتانییەکانەوە ڕاگیراین. کاتێکیش گەشتکردن بە ترومبێل و باربەری جوولەکە مەترسیدار بوو، ڕۆیشتن بە ماشێنی باربەری عەرەبە لایەنگەرەکانی بەریتانیا گونجاوتر بوو. بەڵگەنامەکانی ئێمە بێ کێشە بوون توانینمان بەو ڕێگایەدا گوزەر بکەین. شەمشونی یاوەرم عەرەبییەکی باشی دەزانی، گوێی لە سەرنشینە عەرەبەکان بوو، لەنێو خۆیاندا دەدوان. تاکە بابەتی باسوخواسەکانیان پەلاماری بارەگا سەرەکییەکانی دەسەڵاتدارەکان بوو. ئەوان بە حەپەسانەوە باسیان لێوە دەکرد. خەیاڵدانە بەربەرینەکەیان گڕی تێبەربووبوو، دەیانگوت؛ "ئیدی پۆلیسیان لەوێ نەهێشت."
کاتێکیش گەیشتینە ئۆرشەلیم، ئاپۆرایەکی زۆری خەڵکی عەرەبمان دیت، لە شوێنێک لەنێوان بانکی بارکلی و نووسینگەی پۆست خڕببوونەوە، نزیک تا دور لە دیمەنی ئەو وێرانکارییە وەستابوون، کە ئێرگون بارەگای سەرەکی پۆلیسی تێکومەکان دابوو. ئێمە لە نزیکەوە لێمان ڕوانین. ئەوان کەڕ و کاس ببوون. دیسان شەمشون گوێی لە هەندێک لە دەمەتەقێکانیان بوو. باسوخواسی ئەوان شێوا بوو، تێکەڵەی حەپەسان و سەرسامی و ترس ببوو. ئیدی بۆ چالاکیەکانی دواتریش هەروابوو، کە لە نزیکەوە شوێنەوارەکەیان دەدی.
لەو ساوە جۆرە گەشتێک لەنێو عەرەبەکان سەریهەڵدا. ئەوان وەک ئەندام پەرلەمانێکی بەریتانی گوتی: لە گوند و شارەکانەوە سەردانی ئەو شوێنانەیان دەکرد، کە پیاوەکانی ئێمە "سەردانیان" کردبوو لە دوای خۆشیان ئەو باڵەخانە و دامودەزگای بەریتانییانەیان تەخت کردبوو. لە ماوەی یاخیبونەکەدا ئێمە بە زمانی خۆشیان ڕوومان لە عەرەبەکان کرد. بە هەزاران بڵاونامەمان لەنێو گوند و شارەکانیان پەخشکرد، ئەوسا چ لە ڕێی ئەو کوڕانەی ئێمە کە لە ڕووخساردا لە عەرەب دەچوون، یاخود چ لە ڕێی

دۆستە عەرەبەکانمانەوە بێ. ئەوەش ڕاستییەکە کە عەرەب زۆر ناخوێنێتەوە، بەڵام حەز و تاسەیان بۆ ئەوەی بزانن لە باری ژێرزەمینیدا چی دەگوزەرێ، لای ئەوان مایەی تێبینی بوو. زۆر جاران عەرەبێکی خوێندەوار ئەو پەخشنامانەی بە دەنگێکی بەرز بۆ نەخوێندەوارە پەرۆشەکان دەخوێندەوە.
ئێمە بە عەرەبەکانمان گوت، حەزمان لێ نییە شەڕیان لەگەڵدا بکەین و ئازاریان بدەین؛ بەڵکو بە پەرۆشەوە لەوە دەڕوانین کە هاووڵاتییەکی ئاشتیپارێزی نێو دەوڵەتی جوولەکە بن؛ تیایدا ئاماژەمان بۆ ئەو ڕاستیە حاشاهەڵنەگرە کردبوو، کە ئۆپەراسیۆنەکانمان لەنێو خاکی عەرەبدا بۆ تێکدانی ئاشتی و ئارامی ئەوان نییە. هۆشداریمان دابوونێ، کە بەریتانییەکانن دژی ئێمەیان هاندەدەن و وایان لێدەکەن لەگەڵ یەکدا بە شەڕ بێین. لە دڵەوە هیوامان دەخواست نەکەونە نێو داوی پڕوپاگەندەی ئەوان، بەڵام ئەگەر واشیان کرد، دەستیان لە جووەکان بەرز کردەوە، ئەوا هیچ بژاردەیەکی دیکەمان نامێنێ و بەو پەڕی زەبری توند و خێرا وەڵامیان دەدەینەوە.
هەروەک چۆن ئەدەبیاتەکەمان باندۆرێکی گەورەی نواند، ئاواش ڕەفتارەکانمان کاریگەری کارای هەبوو. ئەو ڕاستیەش کە حکوومەتی بەریتانیای زلهێز نەوەک هەر شکستی هێنا لە دامرکاندنەوەی خەباتەکەمان، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە سەرکوتکردنەوە و شەڕانگێزی خۆی بەردەوام بوو و هەموو جۆرە فشارێکیشی لەسەر عەرەبەکان تاقیکردەوە. ئیدی خەیاڵدانی ئەوانیش بە باقی کارەکە هەڵسا.
عەرەبەکان نەوەک هەر خۆگر بوون لە ڕێگرتنمان لەوەی پەلاماری ڕژێم بدەین؛ بەڵکو هەندێکیان کارایانە یارمەتیشیان داین. کۆمەکەشیان ڕاستیەک بوو، بە خۆڕایش نەبوو بەڵام کاریگەریش بوو. لەو کەمە چەکەی هەمانبوو، بەشێکی لە عەرەبەکانەوە بوو. تا ئەو کاتەی ئێمە خۆمان کەرەستەی دروستکردنی مادده تەقینەوەکانمان پەیداکرد -کە چەکی سەرەکی خەباتی ڕزگاریخوازیمان بوو- بەشێکیش لەو چەکانەی لە خودی بەریتانییەکانەوە گرتبوومان، بەشە هەرە زۆرەکەی تی ئێن تیشمان لە عەرەبەکانەوە کڕیبوو.
لە قۆناخەکانی دواتری یاخیبوونەکەماندا، لە لایەن هەندێ لە نوێنەرانی هۆزە عەرەبەکانەوە پێشنیازمان بۆکرا "بەرەیەکی هاوبەش دژی ئینگلیزەکان پێکبێنین". هەموو ئەوەی لە ئێمەیان دەویست پارە بوو بۆ ئەوەی شەڕی

پڕوپاگەنـدە لەنێـو خەڵکی خۆیانـدا پێبکەن. ئـێمە نەمـانتوانی پێشـنیازەکەیان جێبەجێ بکەین، چـونکە ئەو بڕە کەمە پارەی هەمـانبوو بۆ کڕینی ئەو مـاددە تەقینەوانە بوون کە لە عەرەبەکانمان دەکڕین.

تەنهـا دوای ئەوەی ڕێکخـراوی نەتەوە یەکگرتووەکـان گەیشـتە سـەر ئەوەی بڕیـــار لەبـــارەی چارەنووســـی ئێرتـــز ئیســـرائیل بـــدەن (بڕیـــارەکەش بەرەنجامەکەی یاخیبوونی جووەکان بوو)، ئیدی ئەو کات عەرەبەکانمان لێ ڕاستبوونەوە و دەستیان لێ بەرزکردینەوە. ئەوان ئەوەیان لەبەر ئەوەکرد، چونکە بەڵێنیان پێدرابوو قۆشەنە سووپای دەوڵەتە عەرەبییەکان دێنە مەیدان و شەڕ دەکەن و جووەکان تەفروتونا دەکەن. ئەوان چاوەڕوانی ئەوە بوون باڵەخانە و دامودەزگاکانی تەلئەبیب بدرێنە دەست عەرەبە فەلەستینییەکان. لێ گەلـۆ تەنـانەت لە میـانەی دەسـتپێکی شـەڕ لە ٣٠ی نـۆڤێمبەری ١٩٤٧٧ و لە ماوەی هێرش و پەلاماری داگیرکردن لە ١٥ی ئایاری ١٩٤٨دا ئەو هەڵوێستە تـێکەڵەی ڕێـز و تـرس کە سـووپای جـوولەکە لە مـاوەی شۆڕشـەکەی دژی بەریتانیەکـان بەرپـاکردبوو، لەنێـو عەرەبەکانـدا کـاری خـۆی کـرد. لە گەرمەی شەڕدا بڕیارەکەی بەهێزتر بوو، بەڵام چ هێزو تین و تاوێک؟ ئەمجارەیـان بە تەنهـا هۆکـاری دەروونـی نەبـوو. لایەنـی ڕۆحـی و دەروونـی هۆکـاری زۆر گـرنگن، هەنـدێک جـاران ڕەگەزی یەکلاکەرەوەی هێـزی جەنگـاوەرین. یەکێـک لەوانە ئەفسـانەکەیە، بەر لە هێـزی جەنگـاوەران کـاری خـۆی کردبـوو؛ بـۆ نموونە ئەوە "تیرۆری دوژمنە"، ئەوە "هەمیشـە بردنەوەیە"، هەروەهـا "مـایەی گیـران نیـیە"، ئیـدی بەم جـۆرە گـوتە ئەفسـانەییانە کە لە لایەن یـاخیبووانی جووەکانەوە بڵاو ببوونەوە.

ئەو وتە ئەفسـانەییانە کە لە میـانەی سـاڵانێک بەر لە بڕیـاری نێـودەوڵەتی بڵاوببـوونەوە، بەشـە ڕۆڵێکـی گرنگیـان بینـی لەوەی هێرشـبەران ترسـێکیان بکەوێتە دڵ، ئەوە شتێک بوو کە هێشتا بە دروستی لێکنەدرابووەوە.

هاگانـاش بەر لە سـووپای یەکگرتـووی ئیسـرائیلی کە هەمـوو جەنگـاوەرانی جوولەکەی تێدا یەکانگیر ببـوو، ڕێکخراوی هاگانا بەشـە ڕۆڵێکی دیرۆکیانەی لە خەباتی دژی داگیرکەری عەرەبدا گێڕا. بەڵام ڕاگەیاندنێکی منداڵانەیە گەر بگـوترێ هەبـوونی بەهێـزی هاگانـا بـوو لە ١٩٤٤-١٩٤٨ ڕێگـر بـوو لەوەی تـۆڵەی ئـاژاوە و پشـێویەکانی ١٩٣٦-١٩٣٩ لە عەرەب بکـرێتەوە. هەڵـبەتە

عەرەب گوتیان لە چیرۆکی "نیشانەنمای هەزاران تفەنگ" بووە، بەوەی گوایا هاگانا هەیبوو. بەڵام خۆ هاگاناشیان لە ڕۆژی هاڤلاگاهەوە لەبیرە. ئەو یادەوەریەش بە ئاستەم ڕکێف دەکرێ. خۆ ئەگەر هەر شتێک بیدەنگیان بکا، ئەوا یادەوەری ئۆپەراسیۆنەکانی دوای جەنگی دووەمی جیهانە، کە ئیرگون زڤای لیومی بە فەرماندەیی داڤید رازیل کردوونی.

ئەوەش ڕاستە، سەرباری ناچالاکیی چەندان ساڵە، نمایشی هاگانا لەنێو عەرەبەکاندا بەرز بوو. بەڵام ئەو شکۆیە لە خەملاندنی عەرەبەکانەوە هات کە چۆن ڕووانیانە ئەو پەلامارە سەرکەوتووە کتوپڕ و سەرسامهێنەرانەی ئیرگون بۆ سەر بەریتانییەکان. ئەمەش هێز و تینوتاوی ئێمەی دوو قات و سێ قات کرد، بەهۆی ئەو خەیاڵبینیەوە هێشتا چەندان قاتی کردەوە. خۆ ئەگەر وەک ئەوان مشتومڕیان لەسەر دەکرد کە "لادەرانی" ئیرگون ئەوەندە بەهێز بووبن، خۆ ئەگەر ئەو هێزە بچکۆلەیە بە شێوەیەکی ڕێژەیی بەریتانیای زلهێز هێنابێتە سەرچۆک، ئەدی چی لەبارەی "حەفتا هەزار" چەکداری هاگاناوە دەگوترێ؟ کەواتە هەر پەلامارێکی نوێ بۆ سەر هێزەکانی چەوسێنەر، ئەفسانەیی هێزی چەکداریی و گەلەکەی لەنێو عەرەبەکاندا دەفڕاند.

لەم سۆنگەوەیە بوو، هۆکاری عەرەبی بەرکەنار کرا. بەر لەوەی دەسەلاتدارە بەریتانییەکان عەرەبەکان لە دژی ئێمە هەروەک پێشان بەکاربهێنن، ئەوان لەپەلوپۆ خرابوون. دواتریش کاتێ عەرەبەکان بە هەوڵ و تەقەلالای هاندەرانەی بەریتانیا ویستیان  هێز و توانایان لە دژی ئێمە بەکاربێنن، ئیدی کارلەکار ترازابوو. ئاخر ئەوان" دەستیان بەسترابوو" و ئێمەش ئاگادارمان کردبوونەوە. هەرچەندە قوربانییەکی زۆری گیانیشی لێکەوتەوە، بەڵام یەکەمین بەیەکدادان بە سەرکەوتنی سووپای جووەکان یەکلا بووەوە.

"ئارام ڕاگرتنی لاباڵەکان" لە میانەی یاخیبوونەکە دژی ڕژێمی ماندات دەستکەوتێکی ستراتیژی چارەنووسساز بوو، بەڵام ئەم دەستکەوتە ناڕاستەوخۆ بەدیهات. مەبەستی سەرەکی ستراتیژیەکە خرابووە سەر خودی حکوومەتی ماندااتەکە، ستراتیژیەکەش وا داڕێژرابوو -کە بە ڕاستیش پێگەیشت- ڕاستەوخۆ ڕوو لە ئامانجەکە بکا. ئەوەش بە ڕۆژێک و دووان مەیسەر نەبوو، بەڵکو بە ڕەنج و ماندوبوونێکی زۆر و بە بەگەرمی ئاسن

کوتـانەوە لە میـانەی جەنـگەکەدا و لە ژێـر تیشـکی ئەزمـوونەوە فۆرمەکەی وەرگرت.

سـتراتیژیەکەمان لەسـەر سـێ بنەمـای دروسـت دارشـتبوو: لەسـەر لێکۆڵینەوەیەکی گشتگیری ڕێگا بەکاربردووەکانی بەڕێوبەرایەتی داگیرکەر لە ولاتە بیانیەکانـدا؛ لەسـەر بنەمـای لێکـۆڵینەوەیەکی بابەتیـانەی ڕەوشـی نێـودەوڵەیی، سێهەمیشـیان لەسـەر بنـاغەی لـێگەڕان لەو تـاقیکردنەوانەی ڕەوش و بـارودۆخی بەریتانیـای مەزن لە سـەروبەندی کۆتـایی جەنگـی دووهەمی جیهان.

وەزارەتەکانی حکوومەتی بەریتانیا ئەزموونێکی بەرفراوانیان -بەتایبەتیش لە ڕابـردوودا-لەگەڵ حـوکمڕانی بەسـەر گەلە بیانییەکانـدا هەبـوو. ئـێمە لەو ئەزموونەمـان کۆڵییەوە تاقیشـمان کردەوە. وای لێفێربـووین کە کاربەدەسـتە باڵاکانی بەریتانیی خۆیان بە دووردەگرت لە دەسەڵاتێک کە بە هێزەوە پانەبد بێ، بەڵکو لەجیاتی ئەوە پشـتیان بە بەهێزی شکۆوە دەبەست. ئەوان دەزانن کە "تـۆ دەتـوانی هەمـوو شـتێک بە سـەرەنێزەکان بـکەی بەدەر لەوەی ڕووی لەوان بێ." بۆیە زۆر باشترە لە سێبەری ئەواندا بمێنیتەوە. لە بەرەنجامیشدا، کاتێـک بەڕێـوبەرایەتی بەریتـانی ڕووبەڕووی تونـدوتیژی بەرهەڵسـتاکاران دەبێتەوە، هەوڵ دەدەن ڕێگایەک بدۆزنەوە خۆیـان لە حوکمـڕانی ڕاستەوخۆ بـدزنەوە و بە حوکمـرانییێکی ناڕاسـتەخۆی بگـۆڕن. کەواتە "سـەرۆکی کۆمسیاری باڵا" بە "ڕاوێژکار" و کۆمسیاری باڵاش بە "باڵوێز" دەگۆڕێ. ئیدی لە دەرگـا دەردەچـن و لە پەنجەرەشـدا دێـنەوە ژوور. مێـژووی ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـت و ڕۆژهەڵاتـی دوور لە مـاوەی ئەو دوو نەوەیەی ڕابـردوودا سەلمێنەری ئەو سیستمەیە بوون بە قۆناخی جیاجیایانەوە.

دیرۆک و چاوی چاوەدێریمـان ئێمەی هێنایە سەر ئەو قەناعەتە، ئەگەر ئێمە لەوەدا سـەربکەوین شـکۆی حکـوومەتەکە لە ئێرتـز ئیسـرائیلدا تێکوپێـک بشکێنین، ئیدی لابردنی دەسەڵاتیان ئۆتۆماتیکیانە خۆی بەدوایدا دێ. ئەوسا ئێمە ئەو خـاڵە لاوازەمـان کـوتی و هـیچ بوارێکیشـمان پێنەدا. لە میانەی ئەو هەموو ساڵانەی ڕاپەڕینەکەماندا، بە مەبەست، بێ ماندوبوون و بێ نوچدان زەبرمان لە شکۆی حکوومەتی بەریتانیا دا.

بــوونی ئەو بــارەی ژێــرزەمینە کە فشــار، لە قنــارەدان، ئەشــکەنجە و سنووربەدەر شکستی پێ ناهێنێ و چوکی پێداناداد، هەر دەبێ لە کۆتاییدا شکۆی ڕژێمی کۆلۆنیالی بنکۆڵ بکا، کە لەسەر ئەفسانە لە خەیاڵ بەدەرەکەی خۆیدا دەژی. هەر پەلاماردانێک نەتواندرێ بەری پێبگرن شکستێکە بۆیان، تەنانەت گەر پەلامارەکە سەریش نەکەوێ، چونکە ئەو کات هەر هیچ نەبێ درزێ دەخاتە باڵەخانەی شکۆیان، ئەو درزەش بە پەلامارە دواییەکان دەبێتە کەلێن و تا لە دواییدا بەسەریاندا دەڕوخێ.

زۆرینەی هێرشەکانمان سەرکەوتوو بوون، بەڵام هەندێکیشیان نوشستیان هێنا. ئێمە لە شکستەکانمان فێربووین چۆن خۆیان لێ بە دوور بگرینەوە. بەڵام دەمانزانی کەوا ئەو نوشستیانە تەنها لە ڕووی هەستی میلیتارییەوە بوون. دەنا لە ڕووی سیاسییەوە هەر هەڵمەتێکمان سەرکەوتنێک بوو بۆ خۆی. لەوێدا هەر هەڵمەتێکی سەربازی باندۆرێکی شیرازە ترازانی شکۆی حکوومەتەکەیان بەدواوە بوو. لە پێشەنگی ئەو هەڵمەتانەشدا هەڵکردنی باهۆزی زەبری بەندیخانەی عەککا Acre Prison بوو، کە بەهۆیەوە سەرۆکی حکوومەتی داگیرکەر لێبوردننامەیەکی سەیروسەمەرەی بڵاوکردەوە. ئەو شتەشیان پێڵێنانێک بوو بەوەی لە تێکوپێکشکاندنی خەباتی ژێرزەمینیماندا شکستیان هێنا یان نەیانتوانی بەر بە هەڵمەتەکانمان بگرن.

لە شوێنی خۆی وەک باسی دەکەین، پێشهات و کردارگەلێک هەبوون گەورە یان بچووک، دەقاودەق شتێکی سەبازییانە نەبوون، بەڵام بە شێوەیەک ڕەگوڕیشەی عەرشی شکۆی حکوومەتیان زیاتر لە ئۆپەراسیۆنە سەربازییە سەرکەوتووەکان لەرزاند. دەستبەسەرکردنی ئەفسەرە بەریتانییەکان لەپێناو ئەوەی بڕیاری مەرگ کە ئەوان پێشتر لەسەر چەند کەسێکی ئێمەیان دابوو، هەڵوەشێننەوە؛ گرتنی ئەفسەری زۆرتر لە بەریتانییەکان نەبووە مایەی نەکوشتنی هاوڕێ گیراوەکانمان، بەڵام بووە مایەی ئەوەی کاربەدەستە بەریاتنیەکانی فەلەستین لە سیاسەتی بەدناوی گێتۆوە پاشەکشێ بکەن؛ شکستپێهێنانی ئەحکامی عورفی؛ دوا هەوڵ بۆ فشار خستنە سەر جەماوەر؛ حەسیرمەیدانی ئەفسەرە بەریتانیەکان لە تۆڵەی ئەوەی ئەوان گیراوەکانی ئێمەیان قامچیکوت کردبوو؛ تۆڵەکردنەوەی سێدارە بەسێدارە؛ هەموو ئەو

کردەوانە نەوەک هەر شکۆی حکوومەتی لەرزاند بەڵکو لە ئێرتز ئیسرائیلدا دایرماند و نەیهێشت.

زۆر جاران تووشی ئەو بەڵگە بەندە دەبووینەوە کە بە ئۆپەراسیۆنەکانمان کارێکی وا دەکا تەواوی دانیشتوە جووەکانی ئەوێ بکەونە ژێر مەترسی لەناوچوون. لە ڕاستیشدا ئەمە پرسیارێکی جدیی بوو، لەوانە لە هەموو پرسێک جدیتر بوو کە ڕووبەڕووی بووینەوە. ژەنەراڵ کەنینگهام دواکومسیاری باڵای وڵات، لە لێکەوتەی بەسەرداداني قەڵای عەککادا ئاماژەی بەشتێکی واکرد. ژەنەراڵەکە مشتومڕی لەسەر ئەوە کردبوو، کە تێکوپێکشکاندنی بەرگری ژێرزەمینیانەی جووەکان بێ سوودە مەگەر بە هەموو هێزی سەربازییەوە ڕووبەڕووی سەرتاپای دانیشتوان نەبنەوە.

بەڵام ژەنەراڵ ئەوەشی بۆ زیادکردبوو، کە بەریتانییەکان وەک ئاڵمان نین و ناتوانن ئەو شتە بکەن.

پشتبەستن یان پشت بەستنی زۆر بە مۆرالی خۆگرتنی دوژمنێک لە کردنی شتێک، بەشێک نییە لە ستراتیژی. بۆیە ئێمە پشتمان بە لایەنی"مرۆڤایەتی" حکوومەتەوە نەبەستبوو. ئێمە گەواهیدەری ڕەفتاری نابەجێ و نەشیاوی ئەو قۆشەنە سەربازییەی بە فڕۆکە گوێزەرەوەی ئەوان بووین، کە لە شار و گوند و کیبۆتەکانمان چ هەرایەکیان نایەوە. ئێمە ئەو ئەدەبیاتەی لەنێوخۆی سەربازە بەریتانییەکان بڵاوببووەوە، خوێندەوە. ڕەفتاری هەندێ لە سەربازەکانیان مایەی گەف بوو، کە لەسەر ڕۆژنامەی نهێنی ئێمەی (هێروت)یان نووسیبووەوە: "هۆو هۆو، ئاخر هیتلەر شەش ملیۆنی جوولەکەی کوشت. قۆشەنی شەشەمی سووپای بە هەوا گواستراوەش شەش ملیۆنتان لێدەکوژێ گەر بەخۆدا نەچنەوە و ڕەفتاری جووان نەنوێنن."

لە بەردەستی ئێمەدا بەڵگەنامەیەکی فەرمی هەبوو، بەڵگەنامەکە لە ئێرتز ئیسرائیل و لە لایەن G.H.Q هێزە چەکدارەکانی بەریتانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە دەرچووبوو. ئەوەش بەشی سێزدەهەمی بڵاونامەی ژمارە ٩ی ڕاهێنانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو، تێیدا ڕێنمایی ئەوە هاتبوو، کە چۆن ڕەفتار لەگەڵ خۆپیشاندەرە مەدەنییەکان دەکەن. ئەمەی خوارەوە نووسرابوو:

لەو کاتەی ڕووداوە ناوادارەکەی ئامریستار لە جەنگی یەکەمی جیهاندا ڕوویداوە، بڵاوەپێکردنی ئاپۆرای هەمیشە بە ئەرکێکی دژوار داندراوە، واش دادەندرێ هەر کردەوەیەک بکرێ دەکرێ لە دەست دەربچێ و ئەنجامەکەی مسۆگەر نەبێ. ئەوەش گریمانەیەکی دادپەروەرانە نییە.

لێرەدا بەیانکراوە چۆن ڕەفتار بکەی:

١- هۆشداری بدە ئاپۆرا گردبووەکە، بەوەی تەقەیان لێدەکەی گەر هات و بڵاوەیان لێنەکرد.

٢- سێ کەس لە دەستەکەت هەڵبژێرە. بەدوای سەرکردەکەیاندا بگەڕێ، زۆرجار ئەو کەسە لە پێشەوەی حەشاماتەکەوە نییە بەڵکو لە پشتەوە هانیان دەدا. ئیدی ئەو کەسە بە سێ کەسە دیارکراوەکەت بناسێنە تا بیکەنە ئامانجیان. کاتێک زانیت ئەم کردەوەیەت ڕەوایە، فەرمان بدە تەقەی لێبکەن، تەقەی کوشتنی لێبکەن.

ئەوەش ئەو گیانە بوو کە سووپای داگیرکار لە ئێرتز ئیسرائیل لەسەری مەشق دەدرا. ئاماژادانەکەش بۆ ڕووداوی ئامریستار ڕێکەوت نەبوو.

سەرەڕای ئەوەش ئێمە نەترساین، کە هێزی چەکدار ڕووی لوولەی چەکەکانی خۆی بکاتە یوشیف-جووەکانی فەلەستین- وەک هەندێک لە کاربەدەستە جووەکان دەترسان یان دەیانگوت لەوە دەترسین. ئێمە بڕوامان هەبوو، کە ئەو جۆرە ڕێکارە جێی پرسیار نییە؛ قەناعەتەکەشمان بەرهەمی کاردانەوەیەکی خەمبارانە بوو.

دانیشتوانە مەدەنییەکان، تەنانەت گەر ژمارەشیان هەر سەد هەزار بن، ناکرێ بەیەکجار لەناوببرێن. ڕێخۆشکردنێکی هەڵمەتی لەناوبردنی پێویستە بۆ جێبەجێکردنی سەرلەبەری کارەکە. دەسەڵاتدارانیش دەیانزانی، یاخود بە تێپەڕینی ڕۆژ فێردەبوون، کە ئەم کارە پێواژۆیەکی تاکڕەهەندی نییە. ئەوەش نەوەک هەر تەنها خوێنی خەڵکی زیاتر دەڕژێ، بەڵکو بەرچاوانەش خوێنی بەریتانییەکانیش دەڕژێ، زیاتر لەوەی کە هەموو هێزی نهێنی و ژێرزەمینی بەیەکەوە دەیکەن. کۆلۆنێل پاتێرسۆن، فەرماندەی بەتالیۆنی جووەکان (بەتالیۆنەکە لە جەنگی جیهانی یەکەمەوە لە لایەن ڤلادیمیر ژابۆتنیسکی دامەزرا) کە ئەفسەرێکی بەریتانی بەڕەچەڵەک ئێرلەندی بوو، کاتێ نەفیکرا لەوێوە بانگی ئەوەی هەڵدا کە حکوومەتی بەریتانی ناپاکی لە

گەلی جوولەکە دەکا، جاریکیان لە وتوویژیکی لەگەڵ ئەفسەرانی ئیرگون زڤای لیومیدا گوتبووی: "لەبیرتان بێ ئینگلیز حەزی لێ نییە بکوژرێ."[1]
هەڵبەتە کەس حەز ناکا بکوژرێ. ڕێز و خەم لە ژیان هەڵگرتن پێوەرن بۆ شارستانێتی ئادەمیزاد. لێ گەلۆ سوکراتیش ڕاست بوو کاتێ گوتی ئەو ژیانە هەمیشە شتە سەرەکییەکە نییە. لەوێدا شتگەلێک لە ژیاندا هەن، کە لە خودی ژیان خۆی گرنگترن. لەوانەشە حکوومەتی بەریتانیا یان کاربەدەستەکانی بڕوایان وابێ بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا دەقاودەق ئەو شتانەن کە بایەخدارترن لە خودی ژیان، یان هەر بەلای کەمی گرنگترن لە ژیانی گەلانی دیکە.
هەر چۆنێک بێ ئێمە قسەکەی پاتێرسۆنمان لەبیر بوو کە چی پێگوتین، هەروەها ئێمە کە چەند کات ڕادەبورد بە هۆی ئەزموونەکەمان زیاتر قسەکەیمان بۆ دەسەلما. خۆ دوای هەموو شتێک دەسەڵاتدارە بەریتانییەکان کەسانی ڕۆشنبیر و خوێندەوارن. ئاخر ئەوان دەیانزانی فەوتاندنی جەماوەری مەدەنی واتای ڕاگەیاندنی شەڕێکی نەگریسی بێ ئومێدانەیە، کە تۆڵە بە دوایخۆیدا دەهێنێ و دەبێ بەر لە مەیسەربوونی نیازەکەیان خۆشەویسترین کەسانی خۆیان لەسەر دابنێن.
لەوەش زیاتر تەلئەبیب ئامریستان نییە، لە ئێرتز ئیسرائیلیشدا پەنجاب نییە. ئێرتز ئیسرائیل جەرگەی بەرژەوەندییەکانی جیهان بوو. یاخیبوونەکە بەمجۆرە بەرپابوو. ئەوەش ڕاستییەک بوو کە هیچ خەباتێکی پارتیزانانە لە جیهاندا بە قەد ئێمە شتێ چاپ و پەخش نەکردبوو. لە کاتێکدا بەرخودانەکەمان لە هەڵچوونی خۆیدا بوو، چەند شەڕێکی زێدە بەرچاو گرنگ لە شاخەکانی گریکدا لە گەرمیدا بوون. ئەوان لەوێدا ببوونە سەردێڕی ڕۆژنامە جیهانییەکان. ڕاپۆرتەکانی ئۆپەراسیۆنەکانمان لە بن سەرهێڵە پڕ هاواراکەیاندا، ناونیشانی لاپەرە بەراییەکانی ڕۆژنامە نوێکانی هەموو جیهان بوون، بە تایبەتیش لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا. کەسانێک هەبوون مشتومڕیان لەسەر ئەوە بوو، هەر بۆ تێرکردنی دنەدانی ورووژاندن، ڕۆژنامە ئەمریکییەکان ئەو ڕووبەرە زۆرەیان بۆ ئۆپەراسیۆن و تەنانەت بۆ ڕادیۆی نهێنی و بڵاونامەی جەماوەری تەرخانکردبوو. تەنانەت خۆ ئەگەر تۆزقاڵێکیش ڕاستی لە خەملاندنی بازرگانیانەی ڕۆژنامەکاندا هەبێ، ئایا چی

له پرسه‌که ده‌گۆڕێ؟ خواست و په‌رۆشی بۆ ڕۆژنامه‌کان پێوه‌رێک بوو بۆ مه‌یلی جه‌ماوه‌ر. جه‌ماوه‌ریش -نه‌وه‌ک هه‌ر جووله‌که به‌ڵکو غه‌یره جووش- په‌رۆشی ئه‌و زه‌برانه‌ی ئێمه‌بوون که له ئێرتز ئیسرائیله‌وه ده‌هاتن.
مایه‌ی سه‌رنجدانه که به‌ره‌نجامی ئۆپه‌راسیۆنه‌کانی سووپای ئیسرائیل له سه‌رتاسه‌ری جیهاندا که‌متر له‌وه‌ی سه‌رده‌می به‌رێ، واته سه‌رده‌می یاخیبوونه‌که باس ده‌کرا و ناوی ده‌هات. هۆکاره‌که‌ش به‌رچاوه. ئۆپه‌راسیۆنه‌کانی سووپایه‌کی نیزامی، هه‌رچه‌نده به ده‌ستکه‌وتی مه‌زنیش بگا، که‌متر سه‌نجراکێشه له‌وه‌ی چه‌ند یاخیبوێکی ئازا په‌لاماری سووپا و حکوومه‌تێکی مه‌زن و زلهێز بده‌ن.
له‌و چاپکراو و وه‌شاندنانه‌دا، که هه‌ندێکیان زێده‌ڕۆیشی تێدابوو، به‌ڵام له‌خۆوه بوو، ئێمه دووه‌م هۆکاری کۆسپی به‌مه‌ستی به‌رده‌م "وێرانکردنی کۆمه‌ڵگه‌ی یشوڤ (مه‌به‌ست کۆمه‌ڵگه‌ی جووه‌کانه. وه‌رگێڕ)" بۆ ده‌رکه‌وت. ئێمه ده‌مانه‌ویست خه‌ڵکانێکی زۆر و زۆرتر له ڕه‌وشی ئه‌وه‌ی له ئێرتز ئیسرائیلدا ڕوویده‌دا، تێوه‌بگلێ. ئه‌و مه‌یل و هه‌واداریه‌، که خه‌باته‌که‌ی ئێمه هێنایه کایه، جۆره پشتێنه‌یه‌کی فریادره‌سی نادیاری له ده‌وری دانیشتوانه جووه‌کان پێکهێنا. هه‌ڵمه‌تی چڕوپڕی ڕۆشنگه‌ره‌کان که له لایه‌ن کۆمیته‌ی عیبری بۆ ڕزگاری نیشتمانیی له وڵاته یه‌کگرتووه‌کانی ئه‌مریکا له‌م بواره‌دا ڕۆڵێکی گرنگی گێڕا. حکوومه‌تی به‌ریتانیا له به‌رامبه‌ر بیروڕای ئه‌مریکییه‌کان زۆر هه‌ستیار بوو، نه‌شیده‌توانی خۆی له هه‌ستی ئه‌و مام سامه ده‌وڵه‌مه‌نده‌ی ئه‌تله‌نتی نه‌بان بکا. ئه‌وه‌ش ڕاستبوو که هه‌میشه مه‌ترسی کار و کاردانه‌وه‌ی تاک له تۆڵه‌کردنه‌وه‌ی هێزی چه‌کدار هه‌بوو، به‌ڵام ئێمه هه‌موو شتێکمان کرد، ڕێ له‌و شته بگرین. هه‌ر کاتێک ڕێکاری سه‌ربازییانه‌مان په‌سه‌ند بووایه، هۆشدارییه‌کی به‌رایمان ده‌دایه ئه‌و خه‌ڵکه مه‌ده‌نیه‌ی که پێوه‌ی په‌یوه‌ست بوون، کاتێکیش چالاکییه‌کمان په‌یوه‌ندی به خه‌ڵکی به‌ریتانییه‌وه هه‌بووایه بڵاونامه‌کانمان ده‌کردنه ئینگلیزی. بۆ نموونه ئه‌و جۆره ئاگادارینامانه‌مان له به‌هاری ١٩٤٥دا بڵاوکرده‌وه، ئه‌وه‌ش ئه‌و کاته بوو که نه‌خشه‌مان دانابوو ڕێگای باره‌گای سه‌ره‌کی سووپای به‌ریتانی بخه‌ینه به‌ر ڕه‌حمه‌تی ڕێژنه‌بارانی هاوه‌نه‌کانمان. ئاگادارینامه‌یه‌کی دیکه‌شمان

له بەهـــاری ١٩٤٥، بەر لەوەی سیســـتمی هێڵـــی ئاســـنین مینڕێـــژ بکەیـــن، بڵاوکردەوە.
ئەمەش نموونەیەکی ئەو ئاگادارینامانەیە:
"١- حکوومەتی چەوسێنەر داواکراوە بەوەی دەستبەجێ و بەبێ وەخران هەموو منداڵ، ژن، کەسانی مەدەنی و کاربەدەستانیان لە نووسینگەکانیان، باڵەخانەکانیان، خانووەکانیان ...تاد لە سەرتاسەری وڵات چۆڵ بکا.
٢- داوا لە دانیشتوانی مەدەنی، بە جوولەکە، عەرەب و ئەوانی دیکە دەکرێ لەبەر خاتری خۆیاندا لەمەوپاش تا ئاگادارنامەکە لە کاردابێ لە سەردانکردن و یان نزیککەوتنەوە لە نووسینگە فەرمییەکانی حکوومەت و هتد... دوور کەونەوە.
"ئۆباڵی خۆتان لە ئەستۆی خۆتان!"
نەخێر، ئێمە هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووین کە خەباتەکەمان دەبێتە مایەی وێرانکارییەکی تەواوی گەلەکەمان. ئێمە دەمانزانی ئێرتز ئیسرائیل لە بەرەنجامی یاخیبوونەکەدا، وەک ماڵی لە شوشەی لێ دێ. جیهانیش لەگەڵ بە زیادبوونی بەرژەوەندی و مەیل سەیری نێوی دەکا بۆ ئەوەی زۆرترین ئەو شتانەی لەنێویدا ڕوودەدا، ببینێ. هەر لەبەر ئەم ڕامانە بەرفراوانەش بوو، ئێمە لەسەر خەباتەکەمان بەردەوام بوین تا لە ١٩٤٦-١٩٤٧ گەیاندمانە لوتکەی هەڕمێنی خۆی. بازووەکان چەکی پەلاماردانمان بوو؛ ڕۆشنی "شوشە"کەش قەڵغانی بەرگری لەخۆکردنمان بوو. بەهۆی ئەو دوو داردەستە توانیمان زەبر لە ژێرخانی شکۆی دەسەڵاتی ماندات بدەین.

## 2

خۆ سەلماندنی دووەمین کۆڵەگە، کە ستراتیژی یاخیبوونەکەمان لەسەر ڕۆنرابوو کەمتر نەبوو لە هی یەکەم. لێکۆڵینەوەیەک لە ڕەوشی جیهان لە میانی جەنگەکە و هەر ڕاستەوخۆش دوای دوا قۆناخی جەنگەکە ئێمەی هێنایە سەر ئەو بڕوایە، کە بارودۆخەکە لە بەرژەوەندی ئێمە دایە. جەنگ (مەبەست جەنگی دووەمی جیهانە- وەرگێڕ) گۆڕانکاری بنەڕەتی لە پەیوەندی هێزەکانی جیهان هێنایە ئارا. کەشتی مەزن لە زەریاندا نغرۆ بوون. سوپای مەزن لە شەڕەکەدا تێکشکێندرا یاخود دیار نەما. هێزە مەزنەکان

بوونه هێزی پله دوو. هێزه بچووک و مام ناوەنجییەکان له لایەن بلۆکه بەهێزەکانەوه قوتدران. دوو دەوڵەتی زلهێز به ڕووبەڕووی بەرفراوان، دانیشتووان و ئابووری و سەرچاوه سەربازی مەزن و بەرچاو پەیدابوون و بەسەر جیهاندا باڵکێش بوون.
بەڵام ئاخۆ ئەو گۆڕانکاریه کە له سەردەمی هاوچەرخماندا جێیخۆیان گرتووه، چەند بەردەوام دەبێ هەروەها ئاخۆ بەسوودی مرۆڤایەتی تەواو دەبێ؟ ئەوه تەنها زەمەنه وەڵاممان بداتەوه. بەڵام ئەوەی گومانی تێدا نییه ئەمانه له بەرژەوەندی یاخیبوونی جووەکانن دژی دەسەڵاتی ماندات. وەک ئاکامێکی جەنگی دووهەمی جیهان، ئەو هێزەی کە ئێمەی دەچەوساندەوه له ڕۆژهەڵاتەوه ڕووبەڕووی هێزێکی ناحەز و له ڕۆژئاواشەوه ڕووبەڕووی هێزێکی زۆر دۆست نەبووەوه. ئیدی کاتیش تا دەهات ئاستەنگەکانی بەردەمی زیاتر دەبوون.
له ماوەی ساڵەکانی یاخیبوونەکەدا، ئێمه لەگەڵ نوێنەره فەرمی و نافەرمیەکانی یەکێتی سۆڤیەت و دۆستەکانیاندا دواین. ئێمه لەوه تێگەیشتین که وەک بەرەنجامی خەباتی ڕزگاریخوازیمان، هەڵوێستی ڕووسیا له بارەی تەقەللای سەربەخۆیی نیشتمانیی جوولەکه گۆڕابوو. تەنها کەسێک که من به ئەزموونی خۆم دەکرێ پشتڕاستی بکەمەوه، ئەوەی دەزانی که دەبێ بەسەر دابی بیرکردنەوەدا زاڵ بی بەر لەوەی گۆڕانەکانی لێکەوتەی سیاسەتی یەکێتی سۆڤیەت بتوانێ قەبارەی کاریگەری بەرهەمهاتووی یاخیبوونی جوولەکه بپێوێ. بەڵام به دڵنیاییەوه گۆڕانی هەڵوێستی ڕووسیا هات. له کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەوانی نێودەوڵەتیدا له پراگ له ١٩٤٧دا، دایڤید زاسلاڤسکی، یەکێک له سەرنووسەره سیاسسیەکانی ڕۆژنامەی پراڤدا پرسیاری له ڕۆژنامەوانه عیبرییەکان کردبوو ئاخۆ بۆچی هیچ نوێنەرێکی ڕۆژنامەوانی ڕێکخراوی ئیرگونی ژێرزەمینی لەگەڵیاندا نەهاتۆته کۆنفرانسەکه. کاتێکیش ئەو وەڵامێکی تەمومژاوی درایەوه، هەر سووربوو که ئیرگون ڕۆژنامەی خۆی هەیه و دەبوایه نێردەی ئێرتز ئیسرائیل نوێنەرایەتی ئەوانیشیان لەگەڵدا بایه. "ئاخر ئەوان خەڵکانێکی ئازان،" ئەو وای گوتبوو، "هەروەها کارێکی باشیش دەکەن."

نوێنەرێکی دیکەی سۆڤێتی، کە بەرچاوانە دەستی لە هەموو کێشەوەرەکەدا دەڕۆیشت، بۆ کەسێکی ئیرگونی ڕوون کردبووەوە، کە ئەو خەباتەی ئیرگون زڤای لیومی دەیکا بە سروشتی خۆی کارێکی پێشکەوتنخوازانەیە بەوەی بەرامبەر ڕژێمێکی کۆلۆنیالی وەستاوەتەوە، هەروەها ئیرگون خۆیشی ڕێکخراوێکی پێشکەوتنخوازانەیە کە لەنێو خەڵکدا هەڵقووڵاوە. وەک ئەو گوتی بۆ سەلماندنی ئەمەش، ناتوانایی بەریتانییەکانە بۆ لەناوبردنی ئیرگون. گۆڕانی هەڵوێستی سۆڤیەت بە تەواوی لە وتە بەناوبانگەکەی ئەندرێ گرۆمیکۆ دەرکەوت، کە لە بەهاری ١٩٤٧دا لە ئەنجوومەنی گشتی نەتەوە یەکگرتوەکاندا پێشکەشی کردبوو.

"ئەو پێشهاتە خوێناویانەی فەلەستین بۆ هەموو لایەک زانراوە،" ئیدی نوێنەری یەکێتی سۆڤیەت وا لەسەر قسەکانی ڕۆیشت، "ئەو ڕووداوانە تا دێن بەردەوام دەبن و دەبنە دیاردەگەلێک کە لێکەوتەکانیان بەچڕی فشار دەخەنە سەر جیهان بەتایبەتیش ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان. نابوتبوونی سیستمی ماندات لە حوکمڕانی فەلەستیندا، کە ڕەوشەکەی خراپتر لێکردووە و بارودۆخەکەی بەرەو ڕەوشێکی خوێناوی بردووە، ئەوەش هۆکارێکە ئاخۆ بۆچی ڕەوشەکە خراوەتە بەردەم کۆمەڵەی گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان."

لەوانەیە لەو دەربڕینە کورتەدا، ڕستەی ئاماژەداری وای تێدابێ کە دەربڕی حەزی بیرکردنەوەی سۆڤیەتیەکان بێ. هەڵبەتە یەکێتی سۆڤیەت حەزی لێبوو ڕژێمی کۆلۆنیالی بەریتانیا لە ئێرتز ئیرسرائیلدا مایەپوچ دەرچێ. "پشێویە خوێناوییەکان" نەوەک هەر بەرەنجامی نابوتی دەسەڵاتی بەریتانیا بوو، بەڵکو بۆ هەموو جیهان بەرچاو بوو. بەرەنجامەکانیشی بۆ دەوڵەتمەدارە واقیعییەکان لە لایەن ڕەوشی شۆڕشگێڕانەوە کێشرابوو، کە لە ئێرتز ئیسرائیلدا پەرەیان پێدرا- زۆر جارانیش ئاکنجییەکانی کرەملین دەوڵەتمەداری زۆر واقعی بوون- شتێکی حەتمی بوو. ڕۆژنامەی کۆمۆنیستی لە ئێرتز ئیسرائیل کۆل حائام و مسهماری[٣٤] هەواداری یەکێتی سۆڤیەت سەریان لێشێوابوو کاتێک یەکێتی سۆڤیەت سەرەڕای ڕابردووی،

---

[٣٤] نورگانی هاشمۆر هارتیز پارتی سۆسیالیستە کۆمۆنیستەکان کە هەنووکە چۆتە بنباڵی پارتی ماپام لە ئیسرائیل.

هەڵویستی خۆی لەنێو پاڵپشتەکانی دەوڵەتی سەربەخۆیی جوولەکەدا بینیەوە.
سەروتارەکانی ڕۆژنامەکانی کۆمۆنیستە جووەکان هێشتا هەر یاخیبوون لە بەرامبەر بیرۆکەی دەوڵەتی جوولەکە. خۆڕاستکردنەوەیان لەگەڵ ڕاگەیاندنەکەی یەکێتی سۆڤیەتدا ئەرکێکی ئاسان نەبوو. بەڵام تەنها بۆ چاودێرە کورتبینەکان سیاسەتی سۆڤیەت وا دەبینرا کە لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا گۆڕابێ. ڕاستییە مێژوویەکەش ئەوە بوو، گۆڕانە لەسەرخۆکەی لە مەودای شەوە درێژەکانی یاخیبوونەکەوە هات.
لەگەڵ تەکانی یاخیبوونەکەدا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش داوای چارەسەرێکی دەستبەجێی کێشەی ئێرتز ئیسرائیلی کرد. شایستەی سەرنجدانە کە وۆرن ئوستین Warren Austin پشتگیری لەوە دەکرد دەسەڵاتداریتی بەریتانیا لە ئێرتز ئیسرائیلدا بڕوا و ڕژێمێکی نوێ جێگەی بگرێتەوە، زمانێکیشی بەکارهێنا تا ڕادەیەک لە هی گرۆمیکۆ وەزیری دەرەوەی ڕووسیا دەچوو.

## بەندی 6
## لەشکری ژێرزەمینیی

١٧٠ -١١٧

### 1

دوژمنەکەمان بە ئێمەی دەگوت تیرۆریست. کەسانێکی نە دۆست و نە دوژمن هەروەک پەیامنێری ڕۆژنامەی نیویۆرک هارۆلد تریبیونیش ئەو ناوە لاتینییەی بەکارهێنا، ئەوەش لەژێر کاریگەری دەستڕۆیشتووی پڕوپاگەندەی بەریتانیی بوو یاخود دەرچوونێک بوو لە نەریت. ئۆرایلی ئێرلەندی دۆستیشمان وەک لە نامەکەیدا نووسیبووی "بەرەو پێشەوە بۆ مێژوو"، ئەویش هەر ناوێکی لاتینی پەسەند کردبوو کە وڵاتپارێز (پاتریۆت) بوو. ژەنەڕاڵ ماک میلان کە جێگەی ژەنەڕاڵ بارکەری وەک G.O.C لە هێزە چەکدارەکانی حکوومەت لە ئێرتز ئیسرائیل گرتبووەوە، پێیوابوو ئاوەڵناوی "تیرۆریست" لە ئێمە ناوەشێتەوە. ئەو دەیگوت وشەی تیرۆریزم جۆرێک لە شکۆی پاڵەوانێتی تێدایە، لەوەش زیاتر پێیوابوو بەکارهێنانی وشەکە دەبێتە مایەی ترس و بیم لەنێو هێزەکانیاندا، بۆیە ژەنەڕاڵ فەرمانی دابوو چیدیکە بە تیرۆریستمان ناودێر نەکەن بەڵکو بە "بکوژ و تاوانبار" و... بانگمان بکەن. ئیدی هەر لەخۆوە ماک میلان یەک دەستە ناوناتۆرەی هاوجۆری سەرەوەی بۆ ئێمە دۆزیبووەوە. لەگەڵ ئەوەشدا فەرمانەکەی ئەو هیچی لە پرسەکە نەگۆڕی. ڕۆژنامە و هێزە بەریتانییەکان بەردەوام بوون بەوەی هەر بەو ناوە بانگمان بکەن، کە بەگوێرەی ڕامانی ژەنەراڵەکانیان ئازایەتی لای ئێمە و ترسیش لای ئەوان دەگەیەنی. بۆیە ئەوان تا کۆتایی هەر بە "تیرۆریست" ناویان دەهێناین. گومانیشی تێدا نەبوو، لێکدانەوەیەکی سایکۆلۆژیانەشی لەبن سەردا هەبوو.

تا ئێستاش ئێمە تیرۆریست نەبووین. بنەچەکەی وشەی لاتینی "تیرۆر" واتای ترس دەبەخشی. خۆ ئەگەر هەڵە نەبم زاراوەی تیرۆر بەو دەستەواژە سیاسییەی ئێستای لە شۆڕشی فەرەنساوە هاتووە. شۆڕشگێڕەکان دەستیان بە سەرپەڕاندن کرد بۆ ئەوەی ترس و تۆقان بڵاوبکەنەوە. ئیدی لەو کاتەوە

وشـــەی تیــرۆر وا پێناســـە کــرا، کە کردەیەکــی شۆڕشــگێڕانە یــان دژە شۆڕشگێڕانەی جەنگـاوەرانی ئـازادی و داپڵۆسـینە. هەمووشـی پابەنـدە بەو کەســەی زاراوەکە بەکـاردەهێنێ. زۆر جـارانیش وا بـووە لە لایەن هەر دوو لاوە لە سەودا و ئاڵوگۆڕی یەکدی وێناکردن بەکارهاتووە.
ماکە زمـانەوانی و دیرۆکییەکەی زاراوەی سیاسـی "تیرۆر" ئەوە دەسـەلمێنێ، کە نـابێ وشـەکە لە لایەن جەنگـی شۆڕشـگێڕانە و ڕزگـاریخوازییەوە جـاڕ بـدرێ. دەکـرێ شۆڕشـێک ببێـتە مـایەی لەدایکبـوونی ئەوەی ئـێمە پێیـدەڵێن تیرۆر، هەروەک لە فەڕەنسادا ڕوویدا. دەکرێ تیرۆر لە کاتی خۆی دووبارە ببێـتەوە وەک لە ڕووسـیادا قەومـا. بەڵام خـودی شـۆڕش تیـرۆر نیـیە و تیرۆریش شـۆڕش نییە. شـۆڕش یـان جەنگی شۆڕشگێڕانە مەبەستی نییە تـرس و لەرز بـڵاو بکـاتەوە. بەڵکـو مەرامەکەی سـەرەونخونکردنی ڕژێـم و هێنانەکـایەی ڕژێمێکـی دیـکەیە لە شـوێنیدا. لە جەنگـی شۆڕشگێڕانەشـدا هەر دوو لایەکە هێـز بەکـاردەهێنن. سـتەمکار چەکـدارە، دەنـا لە مـاوەی شـەو و ڕۆژێکدا لەناودەبرێ. جەنگاوەرانی ئازادیش دەبێ چەکدار بن، دەنـا ئەوانیش لە مـــاوەی شـــەو و ڕۆژێکـــدا لەبـــن پێیانـــدا دەپلیشـــێنەوە. بەدڵنیایشـــەوە بەکارهێنـــانی هێـــز، تـــرس و بیمـــیش لەگەڵ خۆیـــدا دێنـــێ. دەســـەڵاتدارە ستەمکارەکان لە پێگەی خۆیان یان لەژیانی خۆیان یاخود لە هەر دووکیان دەترســـن. لە بەرەنجامیشـــدا هەوڵـــدەدەن تـــرس پیشـــانی ئەوانە بـــدەن کە قەڵەمڕەوێتیان بەسـەردا دەکەن. بەڵام دابەزانـدن و پەخشـکردنی ترس، خـۆی لە خۆیـــدا ئامـــانج نیـــیە. ئامـــانجی ســـەرەکی لە لایەکەوە ســـەرەوبنکردنی سـتەمکارە چەکـدارەکەیە؛ لەسـەرەکەی دیکەشـەوە مەبەسـت بەردەوامبـوونی ستەمکاریەکەیە.
جەنگاوەرە ژێرزەمینییەکانی ئیرگونیش بۆیە ڕاپەڕین تـا ڕژێمەکە بڕوخێنن و ڕژێمێکی دیکەی بێتە شوێن. ئێمە هێزی فیزیکیمان بەکارهێنا چونکە هەر ئەو هێزەش ڕووبەڕوومان ببووەوە. وەلێ هێزی فیزیکی نە مەبەستمان بووە نە باوەڕیش. ئێمە بڕوامان بە زاڵبوونی هێزی مۆڕاڵ هەبوو. ئەوە دوژمنەکەمـان بـــوو کە گـــاڵتەی بە هێـــزی مـــۆڕاڵ دەهـــات. هەر لەبەر ئەوەش بـــوو، کە دوژمنەکان هەرچەندە گرەویان لەسەر هێزێکی فیزیکی زەبەللاح دەکرد، بەڵام هەر ئەوان شکسـتیان هێنـا نەوەک ئـێمە. ئەمەش قـانونی مێـژووە. ئـێمە

دڵخۆشـبووین بەوەی دەرفەتـێکە بـۆ سـەلماندنی قـانونەکە نەوەک هەر لە سـەدەی نـۆزدەهەم، سـەدەی ئایـدیالزم، بەڵکـو لەو سـەدەیەی تیایـداین، لەسـەدەی ماتریـالیزم و درنـدایەتی، قـانونەکە نەوەک هەر لە بەهـاری نەتەوەکان بەڵکو لە پایزەکەشیاندا بەرکارە. ئێمە سوپاسگوزارین کە توانیمان ئەو شـتە بسـەلمێنین، سـەلماندنەکەش نەوەک هەر لەپێنـاوی میللەتەکەمانـدا بوو، بەڵکو بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی بوو. بەڵام ئاخۆ خەبات لەپێناو جوامێری پیـاو، دژی چەوسـاندنەوە و سـەرکوتکردن چ پەیوەنـدییەکی بە تیرۆریـزمەوە هەیە؟ لە ڕاسـتیدا ئامانجمـان کتومـت هەڵگێڕانەوەی تیرۆریـزم بـوو. هەمـوو چەقی بازنەی تێکۆشانمان بڕیاری یەکلاکەرەوەی ئازادکردنی گەلەکەمان بـوو لەو ترسـە سـەرەکییەی گیرۆدەی ببوون. ئـاخر چۆن لە جیهـانێکی مـێملانەدا بژین، کە هەر لەبەر ئەوەی پەلاماری جووەکان بدرێ کە جوون؟ ئاخر چۆن بەبێ چەک، بەبێ نیشتمان، بەبێ تـوخمە سـەرەتاییەکانی بەرگری لەخۆکردن بـژین؟ ئـێمە لە ڕێکخـراوی ئیرگـون زڤـای لیومیـدا ڕاپەڕیـن، یـاخیبووین و جەنگـاین، ئەوەش نەوەک بـۆ چانـدنی تـرس و بـیم بەڵکـو بـۆ لە ڕەگوریشـە دەرهێنانی بوو. پێناسەی پیاوە مێرخاسەکەی ئایرشی پاول ئۆ دویەر Paul O'Dwyer، بەڵکـو بەقەد ترسـی کاربەدەسـتەکانی حکـوومەت دروسـت بـێ. بەڵام لە ڕووی مێـژووییەوە ئـێمە تیرۆریسـت نەبـووین. ئـێمە لیبـراوانە دژی تیرۆرستان بووین.

لە دروسـتکردنی ڕێکخراوەکەشـماندا، هـیچ دەسـتە و تـاقمێکی بکوژانەمـان بـۆ دانەنا تا قوربـانییە گرنگەکان بـخەنە داو و لەناویـان بەرن. هەر لە بنکەوە بـۆ سـەرکردایەتی ڕێکخراوەکەمـان وا ڕۆنرابـوو کە لەشـکرێکی ژێرزەمینـی بـێ، نەخشـەی پەلامـاردانی ئامـانجە کوشـندەکانی دوژمـن بـێ، دامەزراوە چەکـدارییەکانی دوژمـن و دەسـەڵاتی مەدەنیـان هێـدمەگرتی بکـا، زیـانی سەربازیانە لە بڕستی پەلاماردانی دوژمن بگەیەنێ. ئەوەش ڕاستییکە، کە بە ژمارەیەکی کەم و سووپایەکی بچووکی ژێر زەمینی دەستمان پێکرد؛ سـەرەتا ژمارەمـان لە چەنـد سـەد کەسێک زیاتر نەبوو. بەڵام هێزوگوڕمـان بە هێڵی تەریب لەگەڵ چڕبوونەوەی ململانێکەدا پتر بوو. سـەرەڕای-بەڵکو بەهۆی- ڕاوەدونـان سـووپایەکی ژێرزەمینیمـان پێکەوەنـا، کە دابەشـببوە سـەر چەنـد هۆبە و یەکەیەک، ژمارەکەشی چەند هەزارێک بوو. ئێمە گروپێکی تیرۆریست

نەبووین، نە لە بونیادی پێکهاتەی ڕێکخراوەییمان نە لە شێوازی شەڕ و نە لە گیانیشماندا.

2

ڕۆنانە ڕێکخراوەیەکەی سووپا بچکۆلەکەمان بایی خۆی سادە بوو. لە سەرکردایەتییەوە فەرماندەیەکی باڵا هەبوو، کە ڕاوێژی لە دەستەیەکی گشتییەوە وەردەگرت. ڕێکخراوەکەش لە چەند بەشێک پێکهاتبوو، لەگەڵ پێداویستییەکانی باری ژێرزەمینیدا بگونجێ. ساختارە گشتیەکەی ڕێکخراوەکە وا دابەش ببوو، پڕ بەباڵای پێداویستییەکانی خەباتەکە بێ. دەزگای بەڕێوبەرایەتییەکەی هەمیشە هەر زۆر بچووک بوو. سووپای بەریتانیا و دەزگای نهێنییان بڕوایان وابوو، ئێمە بە هەزاران سەربازی لێهاتووی پیشەییمان هەیە و مەبەستیشیان هیچ نییە تەنها تیرۆرزمی دژە بەریتانی نەبێ. دەزگای هەواڵگری دوژمن ڕاشکاوانە هەروەک لە زۆر باری ڕامانی دیکەشیاندا خاپێندرابوون، هەرگیز ئەوەش بەمێشکماندا نەهات لە خەیاڵپلاویەکەیاندا بێداریان بکەینەوە. لە ڕاستیشدا، تا ئەو کاتەی هێزەکانی بەریتانی فەلەستیانیان بەجێهێشت، ئێمە لەچەند دەرزەنێک زیاتر نەبووین (لە هەندێ کاتدا کەمتر لە بیست کەس و بەڵام هەرگیز لە ٣٠-٤٠ کەس زیاتر نەبووین) کە تەواوی ڕۆژی خۆمان لە خەباتی ژێر زەمینیدا بەسەربردبێ. ئەو باقی سەدان و لە بەرەنجامیشدا بە هەزاران لە ئەندامەکانمان، ئەو کەسانە بوون کاری ڕۆژانەی خۆیان بە شێوەیەکی ئاسایی ڕایی دەکرد، وەلێ هەموو دەم گوێڕایەڵی ڕێکخراوەکە بوون، هەرکات بانگی کردبان و ئەرکی پێسپاردبان، تەیار و ئامادە بوون. ئەوەش بە ڕاستی لەشکری گەل بوو.

فەرماندەیی باڵا جڵەوی هەموو چالاکیەکانی ئیرگونی لە دەستدا بوو، ئەوسا چ سەربازیی یاخود سیاسیی بێ. فەرماندەییەکە مشوری بنەما گشتییەکان، ستراتیژ و تاکتیک، زانیاری و ڕاهێنان، پەیوەندی لەگەڵ ئۆرگانەکانی دیکە و دانوستان لەگەڵ نوێنەرەکانیان دەخوارد. فەرماندەیی باڵا بڕیارەکانی دەردەکردن. فەرمان دەرچوون لە ئیرگون وەک هەر ڕێکخراوێکی سەربازی بوو؛ بەڵام لەوێدا هیچ بڕیارێک لە لایەن تاکێکەوە دەرنەدەچوو. هەموو دەم گفتوگۆ و مشتومڕ هەبوو. هەر ئەندامێکی فەرماندەیی باڵا هەوڵی دەدا

قەناعەت بە هاورێکانی بهێنێ. بڕیارەکانیش ئاساییانە بە کۆدەنگی بوو. ئێمە پرسیارەکانمان نەدەخستنە دەنگدانی فەرمییەوە؛ لەوێ هەمیشە پێکهاتەی فرە بیروڕایی هەبوو. کاتێکیش بیروڕای جیاواز دەبوو، ڕوانگەی زۆرینە دەیبردەوە. ویژدانی هەست بە بەرسیارێتی، لەیەک تێگەیشتنی دوولایەنە و هەستی برایانە هۆکاری سەرکەوتنی کارەکانی نێو دەزگاکە بوون، لەوانەشە باشترین پەیڕەو بووبێ، کە بڕیاری کردارییانەی دەرکردبێ. کۆبوونەوەکانمان کە ژمارەیان زور بوو، هەمیشە کۆبوونەوەی چڕوپڕی کردەیی بوون. من تاکە کۆبوونەوەیەکیشم لەبیر نییە، کە لە باری تیۆرییەوە قوڵ ببووینەوە، یاخود هەموو ئەوەی لە کۆبوونەوەکە کرابێ هەر ئەوەبێ، جارێ کۆبوونەوەی دووهەمی بۆ بدرێ. هێزەکانی حکوومەت هەرگیز بە گفتوگۆکانی ئێمەی نەدەزانی تا ئەو کاتەی ناوەڕۆکەکەیان جێبەجێ دەکرا.

کاتێکیش بۆ جاری یەکەم، من وەک سەرۆکی فەرماندەیی باڵا دەستنیشان کرام، ئەندامەکانی دیکەی دەستەکە؛ یاکوڤ مێریدۆر، ئاری بن ئێلیازەر، ئێلیاهۆ لانکین و شلۆمۆ لیڤی بوون.

یاکوڤ میریدۆر یەکێ لە بە تواناترین فەرماندەکانی سەربازیی جووەکان بوو، ئەو لە ماوەی ساڵەکانی قەیران و لەنێوان ماوەی مردنی داڤید رازیل و دەستپێکی یاخیبوونەکە، سەرۆکی فەرماندەیی باڵا بوو. یاکۆپ مەشخەڵەکەی بە گڕگرتوویی ڕاگرتبوو. پێگەکەی ئەو سەخت بوو، هەندێک جاریش هی بەرگەگرتن نەبوو. ئەو نیازی وابوو یاخیبوونەکە لە سەرەتای ١٩٤٣دا گڕ بدا، بەڵام دەستەکانی بەسترابوون. من لە زەحمەتییەکانی ئەو، بەر لەوەی ببمە سەرۆکی فەرماندەیی باڵا تێگەیشتبووم. من هەر لەو ساتەی بۆ یەکەم جار خۆم پێناساند، هەواداری بووم' کاتێ لە ڕووسیا گەیشتمە وڵات، پێمگوت نیازم وایە بە داڤید رازیل بڵێم بەتەواوی لەگەڵ پێشنیازەکەی دام. ئێمە لە ژوورێکی بچووکی نیوە ڕووناک بە چرایەکی نەفت، کە هی مستەر هۆنگ ڕێبەرێکی کۆمپانیای گواستنەوە بوو، پەیوەندی لەگەڵ ئیرگوندا هەبوو، قسەمان کردن. ئێمە وەک دوو هاوڕێی کۆن دوایین و باروودۆخەکەمان تاوتوێ کرد. ئێمە یەک هزرمان هەبوو: کە تەنها یەک ڕێگامان لەپێشە: ئەویش یاخیبوونە.

یاکۆڤ هەموو هەوڵێکی خۆی بەکارهێنا، تا مەشق بە پیاوەکان بکا و چەکیش پەیدا بکا. خۆ ئەگەر ئێمە کەمترین پێداویستییەکانی یەکەمین پەلاماردانمان هەبووایە، ئەوا بە پلەی یەکەم شتەکە لەنێو چاوانی یاکۆڤەوە بوو، سەرڕەقیی و خەندە بوێرییەکەی کاتێک زەبری پێدەگەیشت و ناچار دەبوو. کاتێکیش وادەکەی هات ئەو دوودڵ نەبوو، ئەو پیاوێکی خاکی و مەزن بوو، دەسەڵاتی فەرماندەیی باڵای ڕادەستی کەسێک کرد، کە پێشتر لەژێر فەرمانەکانی ئەودا کاری کردبوو. بۆ ئەو، پێگەی کەسایەتیمان هیچ بایەخێکی نەبوو؛ هۆکارەکە هەموو شتێک بوو. دەستپێکردنی یاخیبوونەکە یاکۆڤی زۆر ڕەزامەند کردبوو، ئەوەندە شادمان بوو وەک ئەوەی مامۆستایەک بە کاری باشی قوتابیەکەی دڵشاد بێ. بەڵام ئەو لەگەڵ هاوڕێکانیدا زۆر لە نێو فەرماندەیی باڵادا نەمایەوە. لە زستانی 1944دا ئاژانەکانی ئاژانسی جووەکان بۆ بەریتانییەکان ناپاکیان لێکرد، وەک ئاماژە کردەیەکی چاکە خستیانە فڕۆکەیەکی تایبەت و ناردیانە زیندانێکی تاراوگە لە ئەفریقیا. لەو کیشوەرە ئەسمەرەدا لەپشت تەلبەندی بەریتانییدا وای خۆنواند، کە دەکرێ پیاوێک زیندانی بکەن، بەڵام ناکرێ گیانەکەی دەستبەسەر بکەن. هەڵبەتە هەر یاکۆڤ نەبوو بە تەنیا لە نێو جەنگاوەرەکانماندا هەوڵیدابێ لە زیندان رابکا و خۆی بگەیەنێتەوە نێو کۆڕی خەبات. هاوڕێکانمان بە قەد خۆشەویستیان بۆ ئازادی، کە خەباتیان بۆ دەکرد، ڕقیان لە زیندان بوو. لەو گرتنەیاندا ئەوان لە ڕووی جەستەییەوە کەم تا زۆر سەلامەتر بوون؛ چونکە لە دەرەوە مەترسی لە هەموو کون و کەلەبەرێک خۆی مەڵاس دابوو. بەڵام ئەوان دژواریی جەنگان بۆ ئازادییان پێباشتر بوو لە سەلامەتی دەستبەتاڵی.[٣٥] ئاخر ئەو زیندانانە کامانەن، کە جەنگاوەرانی ژێرزەمینی لێیان ڕانەکردبێ؟ ئەوە واتای چی دەگەیەنێ کە ئەوان بەڵگەکانیان نەسووتاندبێ و هەوڵیان نەدابێ کۆتو بەندی خەڵکەکەیان نەپچڕاندبێ؟ یاکۆڤ مێریدۆر نموونەیەکی پرشنگداری هەمووان بوو. لە ئۆردوگا زۆرەملێکانیشدا مەلێکی ئازادی بوو. تەلبەند و شوورەش ئەویان پێ نەدەسەنگرایەوە. جارێک هەڵات، سەرنەکەوت و گیرایەوە، بەڵام دووبارە ڕایکردەوە. کاتێکیش دەگیرایەوە دیسان هەر ڕایدەکردەوە. دووبارە و چەندبارە تا لە دواییدا گەڕایەوە بەرەی پێشەوە، کاتێک گەڕایەوە، هێشتا

[٣٥] مایەی ئاماژە پێکردنە، پەندێکی خۆمانەش هەیە"شەڕ لە دەست بەتاڵی باشترە". وەرگێڕ.

کاتی ئەوەی مابوو جێگەی خۆی لەسەرکردایەتی لەشکری ئیرگون زڤای لیومیدا بگرێ و فەرماندەییان لە زنجیرەیەک کاری پارێزگاری لەخۆکردن دژی پەلامار و دەستدرێژی هێزە چەکدارە عەرەبەکان بکا، لەوێشەوە بەرەو سووپای یەکگرتووی ئیسرائیلی پەلباوێژێ. ئەو چیرۆکی هەڵاتنە ئازایەکەی خۆی لە کتێبێکی یادەوەریی لەبیرنەکراودا بەناوی "بە درێژایی ڕێگای سەربەستی"دا بڵاو کردۆتەوە.

ئاری بن ئێلیازەریش لە یەکەمین ساڵی جەنگی دووهەمی جیهاندا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا نوێنەرایەتی ئیرگونی دەکرد. ئەو لە ساڵی ١٩٤٣دا لەبری کۆمیتەی عیبری بۆ ڕزگاری نیشتمانی، کە لە لایەن هیلەل کوک[٣٦] و شموۆئێل مێرلینەوە دامەزرابوو، کارابوو. کاتێک ئەو گەیشتە وڵات، ئیرگون بە قەیرانێکی دژواردا تێدەپەڕی. بە شێوەیەکی سەرەکیش بەزاندنی قەیرانەکە بۆ هەوڵی ئاری دەگەڕایەوە. ئەو هەر لە سەرەتاوە بووە دۆستێکی نزیکم و لە کاروباری گشتیماندا هاوکاربووین. لەنێوان ئێمەدا و لە پێش و پاش جارنامەی یاخیبوونەکەدا لە ماوەی پیاسەی شەوانەماندا یان لە ماڵی خوشکەکەی، یاخود لە هوتێلی ساڤۆی لە تەل ئەبیب کە دامەزراوەی خەباتی شۆڕشگێریمان لەوێ بوو، باسوخواسەکانمان هەرگیز کۆتاییان نەدەهات. بەیەکەوە بەرگەی گیانی قەیران، کە لەگەڵ سەرهەڵدانی یاخیبوونەکەدا بوو، دەگرت. ئەوی دەمێ تەنگژەی خەم و ئازار بوون؛ هەرچەندە هەندێک جار وادەی چێژوەرگرتن لە دەستکەوتەکانیش هەبوو. دوای پەلامارە سەرکەوتووانەکەی سەر سێ بارەگای سەرەکی C.I.D (هۆبەی لێکۆڵینەوەی پۆلیس) ئێمە بەیەکدیمان گوت: "ئیدی گەر هەنووکە بشمرین گرنگ نییە." ئێمە دڵنیا بووین دوای ئەو ئۆپەراسیۆنانە، کە سەرسامییەکی بەرچاوی پەیداکرد، خۆ ئەگەر هاتبا و بشگیرابایین یان کوژرابایین ڕەوڕەوەی بەردەوامیتی یاخیبوونەکە مسۆگەر دەبوو. ئەوەش دەستپێکەکە بوو؛ هەروەها هەرچەندە ئێمە بەرەوپێشەوە دەچووین بۆ کردەی زۆر گرنگ، بەڵام نەشمان دەتوانی پێشبینی ئەو ڕۆژە بکەین، کە بەسەر قەڵایەکی مەحکەم و لە نەگیران نەهاتووی وەک قەڵای عەککا Acre دابدەین. لە سەرێکی دیکەشەوە لەبەرپێی

---

[٣٦] هیلەل کوک، برازای سەرۆکی رابیەکان رابی کوک بوو لە ئیسرائیل، بەزۆریش لە ئەمریکا بەناوی پیتەر بێرگسۆن ناسرابوو. لەوێ داهێنەرانە تیشکی خستبووە سەر چاپ و بڵاونامە سەبارەت بە خەباتی ئیرگون کە هۆکارێکی گرنگی سەرکەوتنی یاخیبوونەکە بوو.

خۆماندا تراژیدیای لە دەستدان و ئازارچەشتنی بێنیامێنی لاومان بینی، کە یەکێک بوو لە کوڕە هەرە باشەکانمان و لە پەلامارەکەی ئۆرشەلیمدا کوژرا، هەروەها شیمۆن ئامرانییش کە لە جەنگاوەرە باشە لاوەکان و کەوتە دەست دوژمن و گیرا. (ئامرانی بەتوندترین شێوە لە لایەن پۆلیسەوە ئەشکەنجە درا، بەڵام هیچ نهێنێکی نەدرکاند. ئێمە کاتێ بەسەر قەڵا زیندانی عەککاماندا دادا و ڕزگارمان کرد، بەڵام مخابن، ئەو لە سەر ڕێگای سەربەستیدا گیانی دانا، ئەمجارە لە شەڕی پاشەکشەی دیوارەکەدا بووە قوربانی.)
هێدمەی یەکەمین پۆلکترینیانە. هەر یەکەمان هێز و ورەی لە قسەکانی هاوڕێکەی دەبینییەوە و وەردەگرت. ئێمە دەمانزانی لەو ڕێگەیە زیاتر هیچی دیکەمان لە بەردەمدا نییە. ئێمە بە باوەڕی تەواوعەیارەوە بڕوامان وابوو، قوربانییەکان بە فیڕۆ ناچن. ئێمە بڕوای تەواوعەیارمان بە سەرکەوتن هەبوو. ئیدی هەریەکێکمان هێز و تین و تاوی دەدایە ئەویدیکەمان.
لەگەڵ (ئاری)شدا هەر ماوەیەکی کەم بەیەکەوە کارمان کردبوو. ئەو لە بەهاری ١٩٤٤دا گیرا. لەوانەیە گیرانەکەشی بگەڕێتەوە بۆ ناڕەزایی دەربڕین؛ ڕەنگە هۆکارەکەشی بۆ ساویلکەیی ئێمە بووبێ، یاخود بەهۆی هەڵەیەکمانەوە بووبێ لە ئەنجامی مشورخۆریمان لە هاوڕێ و دۆستەکانی هەندەرانمانەوە سەرچاوەی گرتبێ. ئێمە دەترساین گەر ئاری دەستبەجێ دیارنەمێنی، ڕەنگە ڕەفتارەکەی ببێتە مایەی جۆرە گەواهییەکی دژوار لەسەر هەموو هاوڕێ ناسراوەکانی لە کۆمیتەی عیبری لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا، ئەوسا بەریتانییەکان بە ئاسانی بتوانن بەدوای ئەمریکییەکاندا بڕۆن و لە کۆمیتەکە دەریان بکەن، کە کارێکی مەزنیان ئەنجام دەدا و بیانگەڕێننەوە ئەمریکا. لە هەمان کاتیشدا وامان دانابوو، گەر ئاری لە باری نیمچە ژێرزەمینیدا بمێنێتەوە، ڕەنگبێ بۆ هەر دوو بارەکە باشتر بێ: ئیدی بەم کارە لەوانەیە خۆی لە گرتن بە دووربگرێ، تەنانەت گەر بشگیرێ زۆری پێناچێ ئازاد دەکرێ، لە سۆنگەی ئەوەی کەوا هیچی وای نییە لە دەسەڵاتدارانی بشارێتەوە. بۆیە کاتێ ئاری کارەکەی خۆی بە نهێنی دەکرد، بەئاشکراش لە هۆتێلێکدا دەژیا. بەڵام ئێمە شاش بووین. ئاری گیرا و ئازادیش نەکرا تا خۆی خۆی ئازاد نەکرد. ئەویش لە ئۆردوگا زۆرەملێکەی ئەریتێریادا هەڵات. سەرچڵیەکەشی سەرمەشقی سەرچڵیەکان بوو بۆ خۆی.

ئێلیاهۆ لانکین خەڵکی هاربین بوو، بووە یەکێ لە دینگەکانی خەباتەکە. ئێلیاهۆ ئایدیالیستێکی بێ گەرد بوو، ئامادەبوو ژیانی خۆی لە ڕێی برادەرەکانیدا دابنێ، بە ڕاستی گیانێکی خۆنەویستانەی هەبوو. من لەکانگای دڵمەوە ئێلیاهۆم خۆشدەویست. هەمیشە گوێگرێکی باشی وتە پڕبڕوایەکانی بووم، ئەوسا ئەو قسانەی چ بۆ پەسنی ئەو کردەوانەی کە کرابوون یان چ بۆ ئەو ڕەخنانەی لە شتەکان بوون، کە نەکرابوون. لەو هەستەشمدا هەر بە تەنیا نەبووم. هەموو خەباتگێڕە ژێرزەمینیەکان خۆشیان دەویست. ئێلیاهۆ ئەندامی فەرماندەیی باڵابوو، لە هەمان کاتیشدا فەرماندەی تیپی هەرێمی ئۆرشەلیم بوو. لە ئۆپەراسیۆنی دژی بارەگای سەرەکی هۆبەی پۆلیسی لێکۆڵینەوەدا – هێشتاش کاولگەکەی لەسەر ڕێگای (ماميلا)دا وەک نیشانەیەکی بەرخودانەکەدا دیارە– ئەو بە خۆی بەشداری چالاکییەکەی لەژێر فەرماندەی مەیدانیدا کرد، کەچی لەباری ئاسایشدا ئەو فەرماندەی فەرماندە مەیدانیەکە بوو. دوای پەلاماردانەکە ئێلیاهۆ شوێنێ هەڵگری زۆر لە هاوڕێکانم بوو. ئەویش لەناو جەرگەی ئۆرشەلیمدا ناپاکی لێکراو بەریتانییەکان گرتیان و بۆ ئەریتێریایان ولاتبەدەر کرد. ئەویش لە ئۆردوگا زۆرەملێکەی تاراوگەدا هەڵات. ئۆدیساکەی ئەو، لە ڕاستیدا چیرۆکێک بوو لە سامناکیدا هیچی کەمتر نەبوو لە هی ئۆدیسا کە هۆمیرۆس گۆرانی بۆ چڕی. ئێلیاهۆ یەکەمین هەڵاتوو بوو، کە گەیشتە ئەوروپا، لەوێشەوە فەرماندەیی ڕێکخراوی ئێرگونی لە دەرەوە وەرگرت و دواتر فەرماندەی پیاوەکانمان بوو لەسەر پشتی کەشتی ئالتالێنا.

گەنجترین ئەندامی فەرماندەیی باڵا دانی بوو. شلۆمۆ لیڤی (دانی) کوڕی خێزانێکی پێشەنگ[٣٧] کە خەڵکی پێتاک تیکڤا بوو. ئەو پڕ بەواتای وشە سەرباز و ئەفسەر بوو، بەتەواویش خۆی بۆ ئێرگون تەرخان کردبوو، هەر لە سەرەتاشەوە وەک سووپاسالارێکی یاخیبوونەکە تا گیرانی دەستبەکار بوو. من زۆر گیرۆدەی ببووم، وەک برایەکی گەنج یان وەک کوڕی خۆم سەیرم دەکرد. حەیف ئەویش کەوتە دەستی دوژمن. لە گیرانی ئێلیاهۆ لانکیندا، دانی نێردرا جێگەی ئەو لە ئۆرشەلیمدا بگرێتەوە. لەڕێگای دا بە

[٣٧] مەبەست لە پێشەنگ ئەو کەسانەن کە لە دەستپێکی ئەو جووە کۆچبەرانی جووە کانی هەندەران بوون بۆ فەلەستین.(وەرگێڕ).

ترومبێلی خۆی بازگەیەکی گەڕۆکی بەریتانی وەستاندبووی، لە ترومبێلی دوهەم، کە بەدوایدا هاتبوو ئاژانێک بە بازگەکەی گوتبوو "ئەوە خۆیەتی، پیاوەکەیە."
(دانی)ش یەکێک بوو لە گروپێکی گەورە، کە لە ئۆردوگای زیندانییەکەی ئەریتێریاوە هەڵاتبوو، بەڵام بەخت یاوەری نەبوو. ئەو گیرایەوە، ئەو کاتەش گەڕێندرایەوە وڵات، دەسەڵاتی بەریتانیای تێدا نەمابوو.
چەند مانگێک دوای دامەزراندنی فەرماندەییەکەمان، یەروهام لیڤنی، کە بە ئیتران ناسراو بوو، یەکەمین سەرۆکی ئۆپەراسیۆنەکانمان بۆ زیادکرد. ئیتان پیاوێکی ئاسایی نەبوو، توانستێکی ناوازەی لە نەخشەدانانی پەلامارە سەربازیەکانی ئیرگوندا بینی. بەڵام لە میانی کشانەوە لە زنجیرەیەک لە ئۆپەراسیۆنە بەربڵاوەکانی باشوور گیرا. دوای ئەوەش، ئەو سەرکردایەتی پەلامارێکی دیکەی کرد، ئەمجارەیان لە زیندان و لە دادگای سەربازی ئۆرشەلیمدا ڕابەرایەتی سی و یەک سەربازی ئیرگونی کرد.
(ئیتان) لە میانی ئەرکەکەیدا ڕاهاتبوو زۆر جاران لەماڵەوە سەردانم بکا، ئەوسا چ بە ڕۆژ یان بە شەو. کاتێکیش دەرگای بەکڵۆمدراوی بدیتبا لە پەنجەرە دەهاتە ژوور. ئەوەش پێویستیەک بوو نەدەکرا نەیکا، بەڵام خۆ دەرودراوسێش تێبینیان کردبا بانگی پۆلیسیان دەکرد بەوەی دز هەڵی کوتاوەتە سەر ماڵەکەم! لێ گەلۆ دراوسێکانم بۆ خۆشبەختی ئەوسات ڕازابوون. کوڕە بچکۆلەکەم (بێننی) زۆر عەودالی ئەو مامە رووخۆشەی بوو، کە هەندێ فێڵی پێکەنیناوی بۆ نمایش دەکرد. کوڕەکەم پێیدەگوت مام موشێ. هەر "مام"ێک سەردانی بکردبایە ناوێکی تایبەتی لێدەنا. منداڵان بە سروشت گەورەترین دوژمنی پیلانگێڕین. بەڵام تۆبڵێی دایبابەکان تەنانەت ئەوانەی لەباری ژێرزەمینیشدا بوون هەمیشە ئەوەیان زانیبا، کە منداڵەکان گوێیان لەچی دەبوو؟ ئێمە هەمیشە بەئاگابووین، بەڵام منداڵێکی تەمەن سێ ساڵە جارێکیان گوێی لەشتێک ببوو، ئیدی بە خەندەیەکی شەیتانیانە بەسەری لێوان لێیپرسیم:
"باوکە، مام موشێ کە پێی دەگوترێ یەروهام لە کوێیە؟"
منیش بەو پرسیارە لەناکاوە و دژوارەی سڵەمیمەوە. لە سەرێکی دیکەشەوە نەمدەتوانی هەستی خۆشحاڵیم بە بیرتیژی منداڵەکە دەرنەبڕم.

"مام موشێ چووەتە حەیفا." من وام پێگوت، "دەشگەڕێتەوە."
ئاخر شتێکی خراپە، منداڵ ڕاستی بە باوکی نەڵێ، لەوەش خراپتر ئەوەیە، باوکەکەش نەتوانێ ڕاستی بە ڕۆڵەکەی بڵێ. سەرباری ئەو قوربانیە گەورە و بەرچاوەی بە خەباتی ژێرزەمینیدا لکاوە، هەندێک جار قوربانی نەبینراو دەخوازێ، قوربانییێک پێدەچێ بێ بایەخ بێ، بەڵام قەومانەکەی ئازارێکی زیدەی لێدەکەوێتەوە.
ئاخر بۆچی "بۆ حەیفا؟" دەکرێ دایبابەکان لەپێناوی جەوهەری خەباتەکە لە منداڵەکانیان ببوورن کە ڕاستیان بۆ ناگێڕنەوە. دەکرێ کوڕەکانیش لەدایبابیان لەبەر هەمان مەبەست لە سنووربەزینەکەیان خۆش ببن. کوڕەکەم، مام موشێ بە ڕاستی ناوی پەروهامە. ئەو نەچۆتە حەیفا بەڵکو چۆتە ئۆرشەلیم، لەوێ گیراوە، لەوێشەوە بۆ زیندانی عەککا گواستراوەتەوە. وەک بەریتانیەکان دەڵێن بۆ پازدەساڵ لە وێ دەمێنێتەوە، بەڵام مام موشێ لە عەککاوە دەگەڕێتەوە لامان، ئەویش چواردەساڵ زوتر لەوەی دەسەڵاتدارانی بەریتانی نیازیان بوو.

## 3

لە هەموو ئەو شتانەی لە فەرماندەیی باڵای ئیرگون و پەرەسەندنەکانیدا سەریهەڵدا، دەکرێ بەرەنجامێکی گرنگ لە بەڵگەوبەندی فەلسەفەی مێژوو لەنێوان ئایدیالیستەکان و ماتریالیستەکاندا بکێشرێ: بەوەی ئاخۆ کامەیان هۆ و کامەیان بەرکەوتە بووە؟ ئایا پیاوەکان پێشهات دروست دەکەن یان پێشهات پیاوەکان دروست دەکەن؟ لەنێو خانەی ژێرزەمینیماندا نەمانتوانی وەڵامی ئەو پرسە قورسە بدەینەوە. بەڵام ئەوە فێربووین، هزر دوای ئەوەی شێوەی خۆی وەردەگرێ، تەلیسمانە زەمینەی لەدایکبوونی پیاوگەلێک سازدەکا، کە بەدیهاتنی ئامانج مسۆگەر دەکەن. با ئەو ڕاستیەتان بۆ دەربکەوێ، کە من جەختی لەسەر دەکەمەوە، گەر هاتبا و لە هەر قۆناخێکی یاخیبوونەکەدا هەر هەمومان لە ئیرگوندا بگیرابایین یاخود بکوژرابایین، ئەوا خەڵکانێک هەر هەبوون جێگەمان بگرنەوە و لە بەرامبەر چەوسێنەردا بجەنگن تا دەیبەزێنن. ئێمە فێربووین کە ئامانج لاواز و زەبوون دەکاتە پاڵەوان، سەربازی پلە ئاسایی دەکاتە ئەفسەر، کەسانی زۆر ئاسایی دەکاتە بەخشندەی مێشک و دڵ، بیردۆزەوان دەکاتە پیاوێکی خاوەن کردار و

خوێندکارەکانیش دەکاتە ستراتیژەوان. من لە شوێنێک شتێکم دەربارەی بیردۆزێکی کۆنی حاشالێکردن خوێندوتەوە، کە سروشت قێزی لە بۆشایی (بەتاڵی) دەبێتەوە. ئەوەی لە بیردۆزەکەدا بە خاترجەمیەوە هاتووە، هزرێک رێگە بە بۆشای ئەو پلەدارانە نادا کە هی ئەون دەستکەوتیان لێ بکەوێتەوە. کەسیش نازانێ چۆن یان کەی، بەڵام خۆ هەر دەبێ بۆشاییەکە پڕبکرێتەوە. کاتێکیش ئاری بن ئێلێیازەر گیرا، هەموو شتێک بەرەشی دەهاتە بەرچاوان. لەو کاتەش یاکۆڤ مێریدۆر کەوتە بەردەستی دوژمن پێموابوو زەبرەکە کوشندەیە. کاتێکیش ناپاکیی لە ئێلیاهو لانکین کرا، من حەجمینم لێبڕا. کە خوشکە بچکۆلانەکەی شلۆمۆش لێڤیش گرتنەکەی پێڕاگەیاندم، من تێکچووم. کە ئێتانیش لەگەڵ سی کەسی دیکەدا و لەنێویاندا هەندێ ئەفسەری ئێمەشیان تێدابوون، لە مەیداندا کەوتن، پێدەچوو هەموو شتێکمان لە دەستدابێ. ئەو کەسانە بە ڕاستی دینگە راگرەکانی ئیرگون بوون. باشە کێ جێگەیان بگرێتەوە؟ کێ کارەکە بکا؟

بەڵام خۆ جێگەی هەر هەمووشیان پڕکرایەوە. کارەکەش کرا، چونکە دەبوایە هەر کرابا. هزرەکە لە هەر هەموومان بەهێزتر بوو.

ئەڤراهام هات. ئەو یەکێک لە ئەفسەرەکانی حەیفا بوو. هەر زووش بووە چەقی بازنەی ڕێکخراوەکەمان. ئەو فوارە وزەیەکی بەردەوام بوو. ئەو نە ماندووبوون و نە بەربەستی نەدەزانی. لە ماوەی ساڵەکانی یاخیبوونەکەدا، ئەڤراهام سەرقاڵترین پیاوی ئێرتز ئیسرائیل بوو. ئەو لە ڕۆژێکدا هەژدە سەعات کاری دەکرد. هەمیشەش خەندەی لەسەر لێو بوو، هەرچەندە هەمیشە لە دڵەوەشی نەبووبایە. هەموو هەواڵێکی ناخۆش سەرەتا دەچووە لای ئەو، ئەویش وەک گاشەبەرد چەقیبوو.

"ئای لەو پرسە. شتەکە باش دەبێ. نیگەران مەبن."

ئامزیتوریش هات. ئەویش نەوەک هەر لە باشترین ئەندازیارەکان بوو، بەڵکو یەکێک بوو لە مێشک ڕوونترین کەسەکان، کە تا ئێستا ناسیبێتم. هەرگیز لەبیرم نایەت بیروڕایەکی دەربڕیبێ گەر لە قوڵایی ناخیەوە دەرنەهاتبێ. من هەر نەوەک حەزم بە بیستینی دەکرد؛ چێژیشم لە ئامۆژگاریەکەی وەردەگرت. ئەو بەکردەوە سامانێکی کردەیی بوو. ئەو هەرگیز لە لایەن بەریتانیەکانەوە نەگیرا. ئەو کاتەش کە گیرا بەهۆی کابرایەکی جووە بوو!

گیدۆنیش هات، گیدییەکەمان. ئەو لە تەمەندا گەنج بوو، لە سەرەتای بەهاری بیستەمی دابوو، کە جێگەی ئیتانی سەرپەرشتیاری ئۆپەراسیۆنەکانی گرتەوە. کارەکانی ئەو گەنجە کە تواناکانی لە سنووری بلیمەتیدا بوون، هەر لە بیری ناحەزەکانیدا دەمێننەوە تا لە ژیاندا مابن. گەورەترین و بوێرترین دەستبەسەرداگرتنی چەک، کە نەخشەی بۆ کێشرابێ یان جێبەجێکرابێ هی گیدی بوو. لە دەرفەتێکدا ئەو وا ڕۆیشت کە ئیرگون بە گەورەترین جبەخانەی ڕەشاش، تفەنگ و تەقەمەنی دەوڵەمەندی بکا. لە سەرەتادا وام دانابوو خۆی ڕێبەرایەتی ئۆپەراسیۆنەکە دەکا. ئەفسەرەکانمان هەمیشە دەیانەویست ئەو سەرپەرشتی کردەوەکانیان بکا. منیش بەو خواستەیانم دەزانی. ئەوەش وەنەبێ هەر باش بێ بۆ کوڕەکان کە لەگەڵیاندا بڕوا؛ بەڵکو ئاسانترە لە گەڵیاندا بێ نەوەک چاوەڕێی گەڕانەوەیان بکا. ئەفسەرەکانی ژێر زەمینیی "ئەفسەری لەشکر" نین کە حیسابی لە دەستدانی پیاوەکانی زۆر ستاتیکیانە بکا. ئەفسەرە ژێر زەمینییەکان باوک و برای پیاوەکانن؛ ڕۆژەکانیان ڕۆژی خەمن و شەوەکانیشیان ترس و بیم. بۆیە ئەوان بێدەنگن، بەڵام لە ناخیشدا دەکوڵێن، بە حەسرەتەوە داوا دەکەن: "لێم گەڕێ با لەگەڵ کوڕەکاندا دەرچم."

ئێمە دەبوایە لەگەڵ هەمووانـدا و لەپێناوی بەدیهێنانی مەبەستەکەیاندا خەباتمان بکردبایە. نەخێر لەوێدا دیمەنی دراماتیکی نەبوون، بەڵام قەناعەت پێهێنانی زۆر، بە ڕاستیش کێرڤی بڕوا پێهێنان لە هەڵکشاندا بوو. گیدۆنیش هەر دوو شتی دەزانی، چ خواست و چ نیگەرانییەکە. ئەو بەردەوام داوای ڕێپێدانی دەکرد تا لەگەڵ کوڕە چالاکوانەکاندا دەربچی، بەردەوامیش ڕەفزی وەردەگرتەوە. بەڵام هەندێک جارانیش"یاخی دەبوو" و بایی ئەوەندەش مشتومڕی لەسەر هەڵوێستەکەی دەکرد و لە دوایشدا دەیبردەوە. یەکێک لەو بۆنانەی مۆڵەتی بەشداربوونی مەیدانی وەرگرت، هێرشەکەی R.A.F فرۆکەخانەی ئاکیر بوو، کە ئەکرۆنی پێدەگوترا.

"لەوێدا چەند کۆگایەکی جبەخانە لەسەر یەک هەن." ئیدی ئەوە قسەی گیدۆن بوو، کە بە ئارامیە ئاساییەکەی و لەبنەوەش گیانە گڕگرتووەکەی دەیگوت: "ئاخر ئەمە دەرفەتێکی نائاسایی و کارامەییەکی ئەستەمیشە من دەست لەو ئۆپەراسیۆنە بۆ کەسی دیکە هەڵبگرم."

"جۆشوا و ئاری و حایم و ...؟" من ناوی ئەو ئەفسەرە مەیدانییانەم لە پارچە کاخەزێکدا نووسی و لولم دان، من ئەو ناوانەشم بەتایبەت نەدەناسی، تەنها گوێم لە ناووبانگ و دەستکەوت و توانستەکانیان ببوو.
"بەڵێ لەوانەیە ئەوانیش لەگەڵ خۆمدا ببەم. ئۆپەراسیۆنەکە لە چالاکییە هەرە سەنگین و جدییەکانە. لە هەموو قۆناخەکانیدا کۆسپ و تەگەرە هەیە. بەڵام وا هەست دەکەم خۆم لەگەڵیاندا برۆم. بە ڕاستی بەڕەوای نازانم ئەو دەرفەتە بدەمە کەس."
ئیدی دەمەتەقێکان بەم شێوە بوون، باسوخواسی یەکێ لە پیاوە ژێرزەمینییەکان، کە زۆر کەم خۆشی دیبوو، ناخۆشیش تا بڵێی زۆر. ئەمجارەیان گیدۆن بردیەوە.
ئەو خێرا دەستبەکار بوو. چالاکیەکەی ڕێکخست. دەقاودەق هەر دەتگوت یەکەیەکی بەریتانییە دەجوڵێ. چ جلوبەرگی یەکپۆشی سەربازی، چ پۆلیس چ چەکەکان، هەموو شتێکیان ڕاست و دروست بوو. تەنانەت ئەکسێنتی زمانەکەشیان ئەکسێنتی سکۆتلەندییانە بوو، کە جاکسۆن فیت قسەی پێدەکرد. هەموو قۆناخە پێویستیەکانیان سازاند. ئەو چالاکیە چارەنووسساز بوو. سەربازەکانمان پێشتر زۆر پەلاماری سەرکەوتوانەیان کردبووە سەر مۆڵگە سەربازییەکانی بەریتانی و دەستیان بەسەر زۆر پارچە چەکی گرنگ و تایبەت داگرتبوو، بەڵام بۆ ئێمەی لەشکری ژێرزەمینی جۆری چەکە دەستبەسەرداگیراوەکە ئەوەندە پێویست نەبوو. لەوساوە هۆشدارینامە لەنێو هەموو مۆڵگەکاندا بڵاوببووەوە، کە چەکدارانی ئیرگون مرخی خۆیان لە چەک و جبەخانەکان خۆشکردووە. یەکێک لەو فەرمانانە کەوتە بەردەستی ئێمە. هەروەک فەرمانەکە گوتبووی "پێدەچی ئیرگون چەکی دەستی ئۆتۆماتیکیانەیان کەم بێ" (بە ڕاستیش لەمەیاندا شاش نەبوون!) "بۆیە دەیانەوێ هەوڵێکی وا بدەن لە سەربازەکانمانی بسەنن." نووسەری فەرمانەکە دانی بەوەدا نابوو، کە هەڵمەتی ئیرگۆنەکان "بە وریایانە خۆیان ئامادەکردووە و ئازایانەش پلانەکەیان جێبەجێ دەکەن." بۆیە کۆمەڵێ ڕێنماییان بۆ سەربازەکان لەبارەی چەک و جبەخانە و ئێشکگرتنەوە دابوو، بەشێوەیەک ئاگاداریان کردبوونەوە کەس لێیان نزیک نەکەوێتەوە. لەگەڵ ڕەوتی ڕووداوەکانیشدا ئەو جۆرە فەرمانانە وردەکاریان زۆر تێدابوو. چەند

کەم کاریگەرییان هەبووایە ئەوەندە زیاتر دەریان دەکردن. بەڵام تا کۆتایی شەڕەکە، ئێمە هەرگیز کۆڵمان نەدا، بەوەی چەک لە هێزە چەکدارەکانیان نەسەنین، سەرباری هەموو هۆشدارینامەکانیشیان و ئەو تێبینییانەی کە سەربازەکانیان هەراسان کردبوو، ئێمە کاری خۆمان هەر کرد. "خۆ بەرگە یەکپۆشییەکەی تۆ ناسنامەی خۆت ناسەلمێنێ." بۆیە دەبوایە هەر سەربازێک سەرباری جلەکانی بەڵگەنامەی پێویستی پێبووایە تا بۆ پاسەوانە بەدگومانەکەی بەردەمی بسەلمێنێ، کەبە ڕاستی ئەو سەربازێکی هێزی بەریتانییە. ئەوەش زۆری ماندوو کردن. ئیدی بەمشێوە هەندێک جار خودی پاسەوانەکە خۆی لەژێر بەرگی سەربازێکی بەریتانییدا دەشاردەوە.
بەڵگەنامە پێویستیەکان بۆ هەڵمەتی مۆڵگەی ئاگیر ئامادەکران. گیدۆن وردەکاریی خۆجێیانەی ئەوێی پێشکەش کرد. ئەو برادەرەکانی پشکنین. هەموو شتێک ڕاست و دروست بوو. پیاوەکانیش گیدیان پشکنی. ئەویش تەواو ڕێک و لەبار بوو: ئاخر ئەو ڕۆڵی کاپتن (سەرپەل)ێکی بەریتانی دەبینی.
"ئەرێ هەموو شتێک دروستە؟ دەی با بڕۆین. 'دەی مادام تەندروستیتان باشە' با بەرەو ئاگیر بەڕێکەوین."
"دەی مادام تەندروستیتان باشە" (ئەوە وەرگێڕانی دێرە ئەدەبیاتێکی زمانی یدیشیە بۆ ئابی گێزونت) ئەم دێڕەی سەروو دوعاخوازی سەربازێکی ئیرگونە کاتێ بەرەو بەرەی جەنگ بەڕێ دەکەوت. ئەوەش دروشمێکی دراماتیکی بوو، بێ ئەوەی هیچ واتایەکی بەرچاویشی هەبێ. بەڵام دەربڕینەکە لەلای هەمووانەوە بەکاردەهات، بە غەیرە یدیشی زمانەکانیش، ئەوانەی هەر لە ڕەچەڵەکەوە لە فەلەستین لەدایک بیبوون، ئەوانەی لە یەمەنیشەوە هاتبوون کە فریان بە سەر واتای وشەکانی رستە ناوبراوەکە نەبوو، کەچی بەدروستیش لە ئاماژەکەی دەگەیشتن. ئابی گێزونت هێمایەک بوو بۆ ئاسوودەیی هەناو و ئارامی جەنگاوەرەکانمان، ئەوانەی ئازادییان لە زێدەمافەکان پێباشتربوو. خۆ ئەگەر تۆ بە لێخوڕێک بڵێی کە خەریکی ڕۆیشتنە خەریکە تایەکەت پەنچەر بێ، لەلای هیچ نییە پەلامارت بدا. فڕۆکەوانیش کە بە هەزاران جار بە ئاسماندا سوڕاوەتەوە، سەیری هەموو نیشانەکانی ئاسمان و زەوی دەکا بەر لەوەی بە سەلامەتی بنیشێتەوە.

تەنانەت خوێندکاریش بەر لەوەی بچێتە ژووری تاقیکردنەوە، کە زۆریش لێی دڵنیا نییە بەڵام چاوی هەر لە نیشانەیەکی بەختە. من خوێندکارەکانی وەچەی خۆم لەبیرە لەگەڵ یەکدا دەیانگوت "دەی بتبینم نەتناسمەوە!" دەربڕینەکە نیشانەنمایەکی بەختخوازییان بوو و پێچەوانەکەشی بەدبەختی بوو.
جەنگاوەرە ژێرزەمینییەکانیش، بەو کورتە دەربڕینەیان، لەو شتە خورافیاتانە بەدوور بوون. ئەوان کاتێ دەچوونە وانەی راهێنان یاخود بەرەو خودی ئۆپەراسیۆنەکانیش دەڕۆیشتن، دەیانزانی مەترسی گیران، برینداربوون و یان مردنیان لەپێشە. بەڵام ئەوان بەچاوی کراوەوە بەرەو پیریەوە دەچوون. ئەوان لەوە نەدەترسان بەر لەوەی بچنە جەنگ لەگەڵ ئایندەیان قسە بکەن. ئەوان بۆ تەلیسم نەدەگەڕان، بەڵام میزاجیشیان باش بوو. دراماتیکانە نەبوون. سووکوئاسان ئابی گێزونت بوون. دەسەڵاتدارە سەربازییەکان پارەی زۆریان دەدا بەڵکو زانیارییان دەربارەی ئەو دوو وشانە و ئەو شوێنانەی ئەو وشانەیان لێ دەردەدان بزانیبایە. بەڵام ئەم وشانە نهێنی ژێرزەمینی بوون.
پەلەکەی کاپتن گیدۆن بە سەلامەتی گەیشتە ئاکیر: ترومبێلێکی بارهەڵگری پڕ لە سەرباز، بەخۆیان و چەکی دەستیان سازوئامادە بوو بۆ ئەوەی تیرۆرستان بڕەتێنن؛ جیبێکیش کە لەپێش بارهەڵگرەکەوە دەڕۆیشت ئەفسەرەکانی تێدابوون. کاتێ گەیشتن هەموو شتێک لە شوێنی خۆی بوو، بە بەردەم بەریتانی و عەرەبەکان ئەو دوو ترومبێلە بەنێو بیاباندا ڕۆیشتن و هەر تۆزیان بە با دەکرد. بەڵام ئەو ڕێڕەوە بۆ گەڕەکی جوولەکەنشینی هاتیکڤا[٣٨] شتێکی سروشتی نەبوو، کە ئەفسەر و سەربازی بەریتانی بەوێدا ڕەتببن، بەڵام خۆ گەڕەکی هاتیکڤا دەیزانی چۆن لە ڕێی ئابی گێزونتدا نهێنیپارێز بێ.
کاتێکیش پەلە سەربازەکە گەیشتە دەروازەی مۆڵگە سەربازییەکە، تەواوی کاخەز و بەڵگەنامەکانیان پشکێندرا. هەموو شتێک تەواو بوو، بەتایبەتیش ئەکسێنتە سکۆتییەکەی جاکسۆن. ئیدی ئەوان بەرەو نێو مۆڵگاکە لێیان خوڕی. لەوێدا جبەخانەیەکی گەورەیان بینی. ترومبێلەکەیان لە شوێنێک ڕاگرت کە لە دەرەوە بەدی نەدەکرا. زۆر باشە. لەنێو کۆگاکەشدا زۆر لە

[٣٨] گەرەکێکی قەراخ تەلئەبیب، جوولەکەی یەمەنی بوو.

سـەرباز و کرێکارەکـان، کە بەشـێکی زۆریـان لە عەرەبەکـان و کەمێکیشـیان جـوولەکە بـوون، لەوێ بـوون. کوڕەکـان لە ترومبێلەکەیـان هـاتنە خـوار و بڵاوەیان لێکرد و شوێنی خۆیان گرت. چاوەکانیان بریسکەیان دەهات. چەک ئەمما چەک! وای لەو بڕە چەکە زۆرە! بێدەنگییێکی جاڕس. باشـە کەی گیـدۆن دەسـت پێدەکا؟ گیدی چـاوەڕێی دەکـرد. سـەربازە ڕاسـتەقینە بەریتانییەکـان سڵاویان لە سەرپەلە بەژن درێژەکە کرد. ئەویش سڵاوەکانی سەندنەوە...

گیدی دەستی لەسەر دەمانچەکەی دانابوو، بە هێواشیەوە گوتی:

"تکایە، دەستتان بەرزکەنەوە."

سەربازە بەریتانییەکان پێیان وابوو سەرپەلەکە سەرمەستە.

"ئەوە چییە؟"

"دەی دەستتان بەرزکەنەوە!"

"گەورەم..."

"دەی خێرا، دەسـتتان بەرزبکەنەوە. مـن ئەفسـەرێکی نەفرەتـی بەریتـانیی نـیم. من تیرۆرستێکی ئیرگون زڤای لیونم."

خێرا، هەموو دەستەکان بەرزکرانەوە. سـەربازەکان لە ئەزموونەوە فێربـوون، دەبـێ فەرمانەکـانی ئیرگـون جێبەجێبکـرێن. سـەربازەکان ناچـارکران چەکەکانیش بار بکەن. بارکردنەکە خێرا ڕوویدا. ئاخر کاتەکە هی ئەوە نەبوو لە دەستی بدەن. کوڕەکانمان وزەیـان تێزابـوو. بەریتانییەکانش بـاش ئیشـیان کرد. بـارهەڵگرەکە پڕچەک کـرا. ڕەشـاش، تفەنـگ، هـاوەن، گولله و تەقەمەنی، هەموویان بار کرد. "بەڵکو ئەوەندە بەس بێ." "نەخێر بەس نییە. دەی هێشتا بار کەن."

لەوانەیە ئەوان زۆرزۆریـان بـارکردبێ. ئەو کـاتیش وەرزی بـاران بـارین بـوو. ڕێگاش قوڕ و چڵپاو بوو. ئێمە هەمیشـە تـا پێمـان دەکـرا ڕێگـا لاوەکییەکانمـان بەکاردەهێنـان. ئەمەش وایـدەکرد هێـرش و پەلامارەکانمـان کتوپڕیـانە بـێ و ڕێخۆشـەکەریش بێ بۆ کشـانەوەمان. بەڵام ئەمجارەیـان ڕێگاکە زۆر قوڕاوی بوو. هەر لە نزیک مۆڵگەکەوە ترومبێلە بارهەڵگرەکە لە قوڕدا چەقی. دیمەنی هەوڵ و تەقەللای کوڕەکان بۆ دەرهێنانی بارهەڵگرەکە هەر لەخەیاڵدا مەزندە دەکـرێ. لەو کاتەشـدا ئاگادارینـامە لە مـۆڵگەکەدا لێـدرا. ئیـدی هەر ترومبێلـی زرێپۆش بوو دەهـات و دەچـوو. فڕۆکەکانیش بە ئاسـماندا هەڵگەڕان، کەوتـنە

ڕاوەدونانی چەکدارەکانمان. هێزی دوژمن بەهێز بوو، هەرچەندە زەبری کوشندەشیان لێدرا بوو بەڵام کەوتنە جەنگی ڕووبەڕوو لەگەڵیاندا بێ ئومێد بوو. هێشتاش بارهەڵگرەکەمان لە شوێنی خۆی چەقی بوو، نەدەجولا. جبەخانەی چەکەکانیش سەلامەت نەبوو. ئیدی هیچ بژاردەی دیکە لەئارادا نەمابوو. لەسەر پشتی جێبەکەدا هەر یەکێک توانی باری سەر بارهەڵگرەکە بگوازێتەوە نێو جێبەکە. جێبەکەش لەبن بارە قورسەکەدا نقەی دەهات. بەڵام جێبەکە هێزێکی لە ڕادەبەدری ڕاکێشانی هەبوو.
کورەکان گەڕانەوە، ئەوان بڕە چەکێکی کەمیان لەگەڵ خۆدا هێنا. لە هەمووش گرنگتر ئەوە بوو: هیچ زەرەرمەند نەببوون. ئاخر چۆن دەکرا ئێمە پەستییەکەمان وێنا بکەین؟ ئەوەش تەوسێکی تاڵ بوو! بەڵام تا دواڕۆژی باری ژێرزەمینیمان لەپەرۆشی ئەوە نەکەوتین کە بارە چەکەکەمان پێدەرباز نەکرا.
ئێمە مەیلێکی تایبەتمان بۆ ئەو ئۆپەراسیۆنانە هەبوو، کە پێی دەگوترا "دەستبەسەرداگرتن". لە سۆنگەی ئەوانەوە زەبر لە دوژمن دەدرا و دەستکەوتێکی باشیشمان دەبوو. ئەو ئۆپەراسیۆنانەش هەموویان بەو ئامانجە خراپە نەگەیشتن، کە هی ئاکیری پێ کۆتایی هات. بەهۆی هەندێک لەو ئۆپەراسیۆنانە بوو، بڕە چەکێکی نوێ و تازەمان دەستکەوت و پێی بوژاینەوە. هەندێ ئۆپەراسیۆنیش پەرەیان سەند و بوو بە شەڕ. هێزەکانی حکوومەت کە پێیوابوو هەمیشە بەهۆی فرە هێزیەوە زاڵە، هەرگیز سەرکەوتنی بە دەست نەهێنا. ئۆپەراسیۆنێک لە سارافاند کرا، تیایدا ئاشابێل و سیمچن بریندار بوون و گیران، بەڵام بەندێکی نوێیان لە یاخیبوونەکەدا داهێنا. ئۆپەراسیۆنێکیش لە رامات گاندا کرا، دۆڤ گرونەری تێدا بریندار بوو. لەوێدا چەندان ئۆپەراسیۆن، کە تێیدا تێکەڵەیەکی عەقڵە جووە تەقلیدییەکان و لەدایکبوونی پاڵەوانێتی جووەکان نمایشی کردارگەلێک بوون سنووری کاری پەرجوئاسایان فروان کرد.
مامۆتکی ئۆپەراسیۆنەکان دوای گیرانی ئیتان، گیدی بوو. گیدیش تێکەڵەیەکی ناوازەی توانستەکانی تێدا بوو. ئەو لەیەک کاتدا عەقڵێکی داهێنەر و وەستایەکی بنیاتنەرانە بوو. هەم نەخشەداڕێژەر و هەم جێبەجێکاریش بوو. ئەو،داهێنەری هاوەنێکی کارەباییانە بوو کە لەشکری بەریتانی بۆ هەندێک هۆ

ناویـان لێنـابوو V3، دواتـریش ئەم چەکە لە لایەن سـووپای ئیسـرائیلییەوە پەرەی پێـدراو بە داڤیـدکا ناسـرا. گیـدی گەیەنەرێکـی تەقانـدنی بـنەتەقە (مین)یشی داهێنا بۆ ئەوەی ڕێگای ئاسنینەکان پێ خاپور بکا، پێشتر هەموو هەوڵێکـی پێـوانەیی بـۆ تەقانـدن لە دوورەوە بـێ سـوود بـوو. پـێش ئەوە نەدەتواندرا مینەکان پووچەڵ بکرێنەوە. ئاخر کێ وەک ئەو لەگەڵ ئەو هەمـوو وریاکردنەوانەش ژیـانی وا لەسـەر لەپـی دەسـت دانـابوو. ماشـینێک بەسـەر بنەتەقەکاندا دەڕوا بێ ئەوەی هیچ شـوێنەوارێک بەدوای خۆیدا جێبێڵێ، بەڵام کاتێ شـەمەندەفەرێکی بارقورسـی بەسـەردا دەڕوا، دەیتەقێنێتەوە. بـنەتەقەکە لەسەر بنەمـای هێـزی قورسـیەوە دروسـتکرابوو. بارسـتاییەکی سـووک کـاری لێنەدەکرد، بە بەرکەوتنی قورسـاییێکی زۆر پارچەپارچەی دەکرد. قورمیشێکی کاتی یاوەری بنەتەقەکان بوو، ڕۆژێک دوان، سیان بەڵکو بە هەفتە بەدواوەی بوو. لەیەک کاتدا و لە سۆنگەی ئەو بنەتەقانەوە هاتووچۆی هێڵی ئاسنینیمان لە سـەرتاسـەری وڵاتـدا پەککسـت. ئـاوەزی گیـدی لەسـەر داهێنانەکانیـدا بەردەوام بـوو: بـنەتەقەی ڕێگـای تـایبەت: چەکـی ئـاگرپژێن: قووتـووی شـیر: بەرمـیلە بۆمبـا. گیـدی نەخشـەی پەلامـاردانی قەڵای عەککـای دارشـت. گیـدی لەگەڵ شیمشۆن فەرماندەی ئۆپەراسیۆنی عەککا، زەبرێکی کەمەرشکێنیان لە هێزەکـانی حکـوومەت لە مـاوەی قـانونی ڕەوشـی ئـاوارتەدا. دوای سـیمۆنی هاسمۆنین، گیدۆن بە "داگیرکەری یافا" ناونرا.

ئیـدی ئەوە گیـدۆنەکەمان بـوو. کەسـێکی خۆپـارێز، سـەرکێش و لە هەمـوو لایەکیشـەوە خۆشەویست بوو. کەسێکی خاکەڕا و پیاوی کردار بوو، ڕقی لە خۆدەرخستن دەبـووەوە. هەرگیز لە ساکەیەوە بۆت دەرنەدەکەوت، ئەوەنـدە لەخـۆبردووانەیە، پیـاوێکی بەژنـدرێژی رووتەڵە بەدەسـت و تفەنگـی خـۆی چەندان لاپەڕەی مێژووی سەربازی گەلەکەمانی نووسیوەتەوە.

تۆبڵێی ئەو لە کوێ هاتبێ؟ ئەو سەردەمێک لە نێو هاگانادا بـوو. براکەی ئەو سکرتێری ئیسرائیل گالیلی لەنێو ئەو ٢٣کەسـە بێسەروشـوێنەی ئۆپەراسیۆنی سـووریادا بـوو، کە لە میـانەی جەنگـی دووهەمـی جیهانـدا کـرا. ئەو بەهـۆی سەرنجڕاکێشانی نموونە هزرییەکانەوە بۆ لامان هـات، ئیدی ئامیهای بچکۆڵە بـووە گیـدۆن، گیـدۆنێک ئەو هەمـوو کـارە مەزنـانە بـۆ بەدیهێنـانی بیـرۆکەی ژیانێکی نموونەیی بۆ گەلەکەی کرد. ..

سەرباری گیدۆن، ئامیزتور و ئاڤراهام، فەرماندەیی بالا پێ بەپێی ڕۆژ یۆل، ڕێوڤن ئیسحاق و شمۆئیلیشی تێدا بوو. یۆل سەرۆکی هۆبەی هەواڵگریمان بوو. کەسێکی کەمدوو، فیت بۆ ئەرکەکەی، پیاوی کردەوە بوو، ئەو یەکێک بوو لە کەسە هەرە دەمارساردەکان کە لە ژیانمدا دیتبێتم. لە ڕووخسار و جلوبەرگیدا نموونەی پیاوێکی ئینگلیز بوو. ماوە ماوە خودی دەزگای هەواڵگری ئەو سەبارەت بە هاوسەرەکەی -خانمە جەنگاوەرێکی خۆبەختکار- هۆشداریان دەدا چونکە بە یاوەری پیاوێکی ئینگلیز بینیبوویان! کاتێکیش ئێمە لە سەروبەندی ئەوەدا بووین، لە باری ژێرزەمینییەوە بێینە دەر و بێینە سەر گۆڕەپانی ئاشکرای جەنگ، یۆل لەسەر داخوازی خۆی، چووە هەندەران تا چەکی زیاترمان بۆ دابین بکا. ئەو توانایەکی لە ڕادەبەدەری بەکارهێنا و بەرگەی ناخۆشی زۆریشی گرت تا لە ئەرکەکەیدا سەرکەوتوو بێ.

ڕێوڤنیش پیاوی کار بوو، کەسێکی دەستڕەنگین و بەرهەمدار بوو. بۆ سالانێک فەرماندەی بەشێکی گەورەی هەرێمی تەلئەبیب بوو. ئەو هۆبەی پزیشکی ڕێکخست، مشووری ڕادیۆ و سیستمی کۆگاکردنی چەک و جبەخانەی خوارد، کە کارێکی زۆر سەر بە گۆبەند بوو. ئەو بە دووربینییەوە مشوورخۆری بەرهەمهێنانی خۆماڵیانی چەک بوو، کاتێ خۆمان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بەکرێگیراوە عەرەبەکانی پۆلیسی حکوومەتی بەریتانییەوە سازدەدا.

ئیسحاقیش یەکێک لە ئەفسەرە هەرە بەتەمەنەکانی ئیرگون بوو، سەرپەرشتی باری دارایی و کێشە ڕێکخراوەییەکانی ئێمەی دەکرد. ئەزموونە فراوانەکەی بەردەوام ئێمەی لەباری گونجاو و لەباردا ڕادەگرت.

شموئیل کە دوا کەس بوو هاتە نێو فەرماندەیی بالا، لە باشووری ئەفریقاوە هاتە لای ئێمە و لە ماوەی چەند مانگێکی کەمدا بەتەواوی بووە بەشێک لە ئێمە، ئەو بەگشتی لە هەموو لایەکەوە ڕێزی لێگیراو خۆشیش دەویسترا. ئەو یەکێک بوو لە کەسە هەرە هۆشمەندەکان. ئەو وەک وتەبێژی ئیرگون بۆ هەواڵنێرە بیانییەکان بوو. لە قۆناخە بڕیاردەرەکانیشدا ئەفسەری بەرپرس بوو لە ئۆرشەلیم تا ئەو کاتەی پەل و لقە سەربازییەکانی ئیرگون زڤای لیومی هەڵوەشانەوە.

## 4

چیرۆکی ئەندامانی فەرماندەیی باڵا چیرۆکی هەموو ئەفسەرانی ئیرگونە. زۆریان تاوانبارکران، نەفیکران، گیران، کوژران. ئەوانەی جێگەشیان گرتنەوە گەنجە بێ ئەزموونەکان بوون. تۆ بڵێی ئەوان بەرگەی بەرپرسیارێتییەکە بگرن؟ بەڵێ بەرگەیان گرت. هێزی ئیرادە ئەزموونیشی لەگەڵ خۆیدا هێنا. خۆتەرخانکردن شکۆی ڕۆنا. مەیل و دڵسۆزی خۆیان مەیل و دڵسۆزی بەردەستەکانیشی دروستکرد. هەرگیز ئیرگون لەبن ئەو زەبرانەی پێیکەوت نەچەمایەوە و نەکەوت. فەرماندە هەرێمییەکانی یافای یەک لە دوای یەک گیران. چوار فەرماندەی هەرێمیش ناپاکیان لێکرا و یەک لە دوای یەک لە ئۆرشەلیم کەوتنە بن دەستی دەسەڵاتدارە بەریتانییەکان. ئەفسەرە هەرە گەنجەکان، ئاری، مانۆن، رانان، ئالۆن، تامیر و ئەلیتزور جێگەی ئەوانیان گرتنەوە و بە متمانەشەوە سەلماندیان کە شیاوی پرکردنەوەی جێگەی هاوڕێکانیانن.

هەموو ئەو خەڵکانە بوونە برادەرم. لەوەش زیاتر: ئێمە هەموو برا بووین. ئەو هەست و مەیلە دوولایەنییە، مەیلی هەواداری جەنگاوەران، کە لە دڵسۆزییەکەیان گەورەتر نییە، کانگای خۆشحاڵیمان بوو، بەڵکو ئەوەش تاکە شادمانی تاریکایی باری ژێر زەمینی بێ. لەنێو ئەو لەشکرە بچکۆلەی ئازادییدا بەقووڵی گیانی برایەتی بەسەرماندا زاڵ بوو، شتێک کە بە ئاستەم بدۆزرابایەوە. ئەوەش هەر لە گۆترەوە نەبوو، کە نازناوێک بۆ ئیرگونمان بەکاردەهێنا "خێزانی تێکۆشەران" بوو. ئاخر ئێمە ماڵباتێک بووین. لەنێوماندا متمانەی دوو سەرە هەبوو. هەر یەکەکێکمان ئامادەبوو گیانی لە پێناو هاوڕێکەی دابنێ. ڕۆژ دوای ڕۆژ ڕۆژنامەکان شتی جۆشدراویان لەسەر ئیرگون و نەخاسمە ئەفسەرەکانی دەنووسی. ئەندامەکان شتی کەمیان لەبارەی هاوڕێکانیان دەزانی. ئەوان هەرگیز ئەفسەری لەخۆ پلە بەرزتریان نەدەبینی، لە زۆر لەو پرسانەی کاریشیان بۆ دەکرد نەیاندەزانی ئاخۆ ئەوان لە کوێن. باشە تۆبڵێی ئەو بڕوا و متمانەیە ڕەهایە لە کوێ هاتبێ، کە ئەو کەسە نەناسراوانە ئەو ئەهریمەنانە نین، کە ڕۆژنامەکان زۆر بە قووڵی ڕەخنەیان لێدەگرتن و ناوناتۆرەی سەیروسەمەرەیان دەدانە پاڵ؟ ئەرێ

بۆچی ئەوان بێ ترس ڕووبەڕووی مەرگ ببوونەوە؟ ئەریێ ئەو دڵسۆزییە نارونییە" لە کوێ هاتبێ؟ ئێمە دەگەڕێینەوە سەر ئەو پرسە. لێرەوە کە دەربارەی سووپای ژێرزەمینی دەنووسرێ، من یەک هۆکار باس دەکەم، کە ئیرگۆنی کردە "خێزانێکی تێکۆشەرانە"، ئەوەش نەوەک بە زاراوە بەڵکو بە ڕاستی. هۆکارەکەش خۆشەویستی بوو، خۆشویستنی هزر نموونەییەکە، جەنگاوەران بە مەیل و هەواداری برایەتییەوە جۆشدا. هەر لەوێشەوە هێزو گوڕیان لێهەڵهێنجا.

ئەم پەیوەندیانەش یەکتربڕ لەگەڵ دیسیپلین نەبوون؛ بەڵکو خاڵی بەهێزبوون بوون. دیسپلین لە نێو ئیرگوندا زۆر توندوبەند بوو. شتەکەش لە زۆرلێکردنەوە سەری هەڵنەدابوو. ئیرگون یەکێک بوو لەو ڕێکخراوە کەمە ژێرزەمینیانەی، ڕێگەی دەدایە ئەندامەکانی واز لەپلەکانی ڕێکخستنی خۆیان بهێنن. هەرچەندە مەترسی ئاشکرابوونی نهێنییەکانیش لەگۆڕێدابوو، ئێمە هەرگیز هەوڵمان نەدا زۆر لە کەسێک بکەین بە پێچەوانەی خواستی خۆی لەنێو ئیرگوندا بمێنێتەوە. بەڵێ لەوێدا هەندێ ئەندام ڕێکخراوەکەیان بەجێهێشت، هەندێکیان گەڕانەوە، هەندێکیشیان هەرگیز نەگەڕانەوە ناو ئیرگون. من نامەوێ ئەو باری سەرنجە بدەمەدەست، کە هەموو شتێک لەنێو ئیرگوندا تەواو عەیار بووە. لاوازی و زەبوونی ئادەمیزاد لە هەموو کۆمەڵگەیەکدا هەر هەیە. لەوێدا هەندێ لێکحاڵی نەبوون، هەندێ نابەدڵیش هەبوون، بەڵام ڕێسایەک دەیخوارد کە ڕێزپەڕی نەبوو. ڕاستیەکەش ئەوە بوو دیسیپلین لە زۆرلێکردنێکی دەرەکییەوە هەڵنەقولابوو، کە ئەمە هەر نەبوو، بەڵکو لە قووڵایی ناخی ویژدانەوە بناوانی گرتبوو. هەڵەکان؟ شاشیەکان؟ کەتنەکان؟ شکشتیەکان؟ هەڵبەتە ئێمە ئەوانەشمان هەبوو. خۆ پێویست نەبوو ئێمە ئەفسانە بین. ئاخر ڕاستی لە هەموو ئەفسانەیەک وردترە. ڕاستیەکەش خانەوادەی یاخیبووەکان لە دیسپلین ئازاد بوون هەروەک چۆن لە بڕوادا بێگەرد بوون.

ئێمە لەسەر ئەو نمرە و پلانە ڕۆیشتین کە داڤید رازیل دایانابوون. ئێمە نایب عەریف، عەریف، باشچاوەش، نایب زاپت، ملازم و نەقیبێکیشمان هەبوو کە یاکۆڤ مێریدۆر بوو. ئەو پلانە هیچ پەیوەندیکیان بە بەرپرسیارێتی ڕاستەقینە یان ئەرکەکانی ئەفسەرەکەوە نەبوو مەگەر لە هەندێ نموونەی

کەمدا نەبێ. پیاوێک کە لە قۆناخێکدایە فەرماندەیی هەزاران پیاو دەکا، هەر بۆ نموونە لە هەرێمی تەلئەبیبدا فەرماندەکە ملازم بوو. لە سووپای نیزامیدا، ملازم فەرماندەیی دەستەیەکی کەم دەکا. باشچاوەشەکانی ئێمە هەندێکجار فەرماندەیی چەند سەد کەسیان کردوو؛ کەچی لە سووپای نیزامیشدا ئەم لێپرسراوێتییە هی نەقیبە یان ڕائید. لە نێو ئیرگوندا هەرگیز قرە لەسەر پلەکاندا بەرپا نەبوو. پلەکان نیشانەنمای پێوەری بەرپرسیارێتی بوون. ئەوان کەسانی زۆر خاکی بوون. ئەفسەرێک هیچ جیاوازی نەبوو لەگەڵ پیاوەکانی لەگەڵیدابوون، بەدەر لەوەی ئەرک و بەرپرسیارێتی قورستر بوو. پلەکە هیچ زیدەمافێکی بە هەڵگرەکەی نەدەدا. پیاوێکی ئیرگون کە هەموو ڕۆژەکەی بۆ باری ژێرزەمینی تەرخانکردبوو، ناچار بوو کەمترین پێویستی لەنێو ڕێکخراوەکەدا بۆ پڕ بکرێتەوە، مووچەکەشی بەگوێرەی پلەکەی پێنەدەدرا بەڵکو بەگوێرەی بارودۆخی خێزانەکەی بوو. جەنگاوەرێکی سەڵت ئەوسا هەر پلەیەکیشی هەبووایە، گەر ئەندامی فەرماندەیی باڵاش بووایە، هەر 25 پاوەند (100دۆلاری) مانگانە بوو. ئێمە شوفێرمان هەبوون، کە باوک بوون و چەند سەرخێزانیان بەکۆڵەوە بوو، مانگانەکەیان لە هی فەرماندەیەکی باڵا بەرزتر بوو. من بە ئەنقەست وشەی "مووچە" لەنێوان دووجووت کەوانەدا دادەنێم. مووچەکانی ئیرگون بەئاستەم بەشی پێداویستییە سەرەتاییەکانی دەکرد. بودجەی خەرجیی کەسییەکان هەرگیز لە 14٪ تێپەڕی نەدەکرد، بەڵکو هەندێک جار 12٪ بوو. باربووەکانیش لە لایەن جووەکان، ئەو پارانەی لە دەسەڵاتی مانداتەوە دەگیرا دەهات، ئەو پارەیەش ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بۆ پێداویستییەکانی خەباتەکە تەرخان بوو. ئەگەر واش نەبووایە ئێمە ئەوەی کردمان پێمان نەدەکرا. خۆ ئەگەر واژەی سکهەڵگوشین (دەست بە پارەوە گرتن) هیچ مانایەکی هەبێ، بە دڵنیاییەوە قانونێکی ئیرگون بوو. خۆ ئەگەر دەستەواژەی 'لەشکری دیموکراسی'ش هەر واتایەکی هەبێ، ئەوا خێزانە یاخییەکەی ئێرتز ئیسرائیل یەکێکە لە دیموکراسیترین سووپای سەر گۆی زەوی.

ئێمە دوو ڕۆژمان لە ساڵێکدا بۆ پلە بەرزکردنەوە هەڵبژاردبوو. ئەوانیش ڕۆژانی 14ی نۆڤێمبەر، ئەو ڕۆژەی داڤید رازیل یەکەمین هێرشی کردە سەر دوژمنی گەلەکەمان، لەگەڵ ڕۆژی 29ی تەموز، ئەو ڕۆژەی کە "کەمانی

پەڕجو˚ کە یەکەمین بوو لە ئیسرائیل تێکشکا، ئەمەش وتەی یەکێک لەڕکابەرە هەرە توندەکان بوو لە ڕۆژنامەی داڤاردا نووسیبووی، کە لە 3ی ئابی 1940دا لە نیویۆرکەوە لە بارەی مردنی ڤلادیمیر ژابۆتنسکی بڵاوبکردبووەوە. لە ڕۆژی یادکردنەوەی مامۆستاکەدا، خەڵکەکەی ئەو و یەکەمین کردەی یاخیبوونەکەی لەئیسرائیل بە بەرزکردنەوەی پلەی پیاوەکانمان، ئەوانەی جیاوازن یاددەکەینەوە. لەو ڕۆژانەدا کەشوهەوایەکی پشێویانە بەسەر ئیرگوندا هات. بەڵام خۆ ئیرگون شەڕی مان و نەمان دەکا. ڕێوڕەسمی پلە بەرزکردنەوەکە، کە لە هەمان کاتدا و لە زۆر شوێن دەبێ، بە شێوەیەکی شکۆمەندانە بەڕێوە دەچێ. هەرچەندە ئێمە کەمیش بیری لێدەکەینەوە، بەڵام هەمووان دەزانن کە مەودایەکی زۆرمان لە پەتی سێدارەوە دوور نین. ئەوەش کەش و هەوای شکۆمەندی بۆنەکەیە. خۆنمایشکردنەکە کورتخایەنە، فەرمانەکانی ڕۆژەکەش کورتترن. نە قسە و نەدوانی تێدا نییە. لەوێدا سوێند خواردنێکی بێدەنگ هەیە. هەموو ئەفسەرێک بەرپرسیاریتی خۆی دەزانێ و خۆی بۆ مەبەستە ڕزگاریخوازە نوێیەکە تەرخان دەکا. ئاخر خۆ بۆنە و ڕێوڕەسمی کەم لەباری ژێرزەمینیدا هەن، بەڵام ئەو بڕەکەمەشیان زۆر سەرنجڕاکێشن. ئاخر لە نێو ئیرگوندا، کە دۆڤ گرونەر هەر سەربازێکی ئاسایی بوو، ئاسان نەبوو پلەی بەرز بەدەست بهێنێ...

ئەوەش شتێکی ئاسان نەبوو، شتەکەشم لە ئەزموونی خۆمەوە دەزانی. من هیچ پلەیەکم نەبوو. ئەوەش نەوەک لەبەر ئەوەی من لەبەر پێڵێهەڵبڕینێکی خاکەڕاییانە بێ، بەڵکو ناچاری بارودۆخەکە بوو. لە سووپای پۆڵۆنیدا من سەربازێکی سادە بووم، بەڵام خۆ ئەگەر سەرهەنگ (عەقید)یش بام، پێگەی خۆمی لەنێو ڕێکخراوە تێکۆشەرەکەدا نەدەگۆڕی. کەسێک لە نێو سووپای جیاوازدا ئەفسەر بووە، دوای ماندوبوونێکی زۆر شانازی بەخۆیەوە دەکرد، کە لە نێو ئیرگوندا پلەکەی بۆ باشچاوەش بەرزکرابایەوە. مەرجی سەرەکی بۆ پلە تەواوکردنی خولی مەشقکردنەکە بوو. بۆ بەدبەختیش هەرگیز دەرفەتی ئەوەم نەبوو خولی ڕاهێنانەکە تەواو بکەم. پەیڕەویش پەیڕەوە. بەبێ ئەو هەنگاوە زێدەگرنگە یەکەمە، پلەکەم بەرزتر نەدەکرایەوە. ئەوەش تا ڕادەیەک بووە مایەی بەدحاڵیبوونێکی نێودەوڵەتی. کاتێک بە دیداری

نوێنەرایەتی کۆمیتەی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان گەیشتم، ئەو کات سەرۆکەکەیان دادوەر ساندستۆرم بوو. لێیپرسیم ئاخۆ بە فەرمی دەسەڵاتی من چییە، کە بەناوی ڕێکخراوی ئیرگون زڤای لویمیەوە بدوێم.
"ئایا تۆ ژەنەراڵی؟" ئەو بە تاسەوە وای لێپرسیم.
منیش دەبوایە پێبکەنم.
"نەخێر. من هیچ پلەیەکم نییە."
ئەو قسە ئاڵوگۆڕکردنە بەراییە بووە مایەی پێکەنینێکی گشتی. ئیدی خەندە لەسەر لێوی مستەر ساندستۆم ی سویدی روگرژ نەدەڕویەوە.
لەگەڵ ئەوەشدا خۆ من جۆرە پلەیەکم هەبوو، بەلام نەدەکرا بۆ دادوەر ساندسترۆمی باس بکەم. پلەکەش پلەیەکی سەربازیانە نەبوو، بەڵکو لێبڕاوانە دژە سەربازیانە بوو. لە حزووری مندا برادەرەکانم پێیان دەگوت "فەرماندەکە"، وەلێ لەنێو خۆیاندا ناویان لێنابووم "پیرەمێردەکە".. منیش دانی پێدادەنێم، خۆشیم پێدەهات. کاتێک پرچە لاواز و رووتاوە نیشانەی پیربوون دەردەدا، ئیدی ناوەکە مەجازی نامێنێتەوە، بەڵکو دەبێتە رەنگدانەوەی دڵێکی باش و گەرمی دڵسۆزانەی لەخۆوە.
لەوێدا لە ماوەی ساڵەکانی خەباتدا پەیوەندی لەنێوان سەرکردەکان و پلەکاندا دروست ببوو. پەیوەندییەکی دڵسۆزانەی نەهەژاو. ئەوپەڕی خۆئامادەیی بۆ قوربانیدان. خۆتەرخانکردنێکی بێ مەرج. مەترسی و ژانوناسۆرێکی هاوبەش. لەسەرووی هەموشیاندا خواستێکی بەهێز بۆ سەرکەوتن. کەواتە هەموو سەربازەکانی ئیرگون جەنگان. کەواتە هەموو یەکەکان کاری خۆیان کرد.

## 5

لەگەڵ هەڵگیرسانی یاخیبوونەکە، ئێمە ئیرگونمان دابەش کردە سەر چەند لقێک. بێجگە لە بەشی بەڕێوبەرایەتی، کە ئۆرگانێکی سروشتی ڕێکخراوەکەمان بوو، هەروەها بێجگە لەو بەشە، دابەشبووە جوگرافییەکان ئەم لقانەی هەبوون:

1 - لەشکری شۆڕش.
2 - یەکەی هێدمە (شۆک).
3 - هێزی پەلامار.
4 - هێزی پروپاگەندەی شۆڕشگێڕی.

ئێمە نیازی چوار لقمان هەبوو. بەڵام خۆ واقیع بەهێزترە لە هەر بڕیارێکی فەرماندەیی جەنگ. بۆیە لقی لەشکری شۆڕش هەر لە بیردۆزدا هەبوو. وای لێچاوەڕوان دەکرا ئەم لقە وەک هێزێکی یەدەگ تەماشا بکرێ و ئامێزێک بێ بۆ هەمــوو ئەو سـەربازانەی لە هـیچ لە سـێ لقەکـانی دیـکەدا جێگەیـان نەدەبــووەوە. بەڵام ئەم جـۆرە ڕێکخسـتنە سـەری نەگـرت. سـەربازە تـازە هاتووەکان بەنێویدا تێپەڕین، دوای ئەوەی ماوەی مەشقی سەرەتایی خۆیان دەبڕی، بۆ یەکێ لە سێ لقەکان دەگوازرانەوە. بۆیە لقی ناوبراو نە ئەفسـەر و نە سەربازی تایبەت بە خۆیەوە بینی. تەنها ئەو ڕۆژە ئەم لقە بە دیارکەوت کــاتێ بــاری ژێرزەمینیمــــان بە بــاری شـــەڕی ڕووبەڕوو دژی عەرەبە پەلاماردەرەکان گۆڕا، ئەو کاتەی هەموو کەسێکی نێو ئیرگون چووە یەکێ لە یەکەکان سووپای نیزامی: واتە چووە نێو لق، هۆبە، بەش و بەتالیۆنەکانی.
یەکەی هێدمەش هەرگیز بە ڕاستی دانەمەزرا. ئەوە هەر ناوێکی نوێ بوو بۆ یەکەیەکی پێشتر، کە بەر لە یاخیبوونەکە دامەزرابوو. یەکەکەش بەناوی -بۆ ئەوانەی دەیـانزانی هەیە- "لقی سـوور" یـان "هـۆبەی ڕەش" بـوو. بیـرۆکەی پشت ئەم یەکە زۆر سـەرنجڕاکێش بـوو. بیـرۆکەکەش هـی یـاکۆڤ مێریـدۆر بوو. ئەو وای دانـابوو، خەبات بـۆ ڕزگاری پێویسـت بە پیاوگەلێکی مەشـق تایبەتمەند دەکا، کە بتوانن لەناوچە عەرەبیەکـان دەسـتبەکار بن، ئەوسا چ لە ئێرتز ئیسرائیل یان لە وڵاتە عەرەبییەکان بێ. پیاوەکانیش بەهۆی ئازایەتی و پێستڕەشی (ئەسـمەری) هەڵدەبژێردران. ئەوان مەشـقی سـەربازیان پێدەکراو وانەی زمانی عەرەبیش دادەدران. پێکهاتەی ئەم "لقە سوورەش" بۆ ئەوە بوو، کە تەنانەت بۆ ئەندامەکانی ئیرگونیش نهێنی بن. ئەوەش بیرۆکەی 'بارێکی ژێرزەمینی لەنێو ژێرزەمین'دا بوو، سەریشـی نەگرت. هەرچەنـدە شـتەکەش کردەیەکی بوێرانە بوو، بەڵام جێبەجێکردنەکەی کێشەی تێکەڵەی نایەوە، ئاخر بۆ هەندێکیان خۆش نەبوو. لەپڕێکەوە ئەوە قەوما کە باشترین لە پیاوەکانی، تەنانەت ئەفسـەرەکانی خۆشیان لە ئیرگون کێشایەوە. ئەندامە دڵسـۆزەکان، ئەوانەی لە خۆشی و ناخۆشی ئیرگوندا بوون، ئەم شتەیان پێ سەیربوو و لێی تێنەگەیشـتن. ئـاخر ئەو ڕاکـردووە؟ ڕاکـردووش (هەڵـگەڕاوە) خـوێ بە برینـدا دەکـا. ئەوەش نەیـدەخوارد کە سـوێندی خواردبـوو هیچـی لەگەڵ ئیرگوندا نەماوە. ئەم ڕەفتارە سـەیرەی پیاوە خۆبەختکەرەکان و ئەفسـەر

گرنگەکان دەگەڕایەوە بۆ نزمی ئاستی مۆراڵ لەنێو پلەکاندا. ئەوەش ئەستەم بوو شیبکرێتەوە یان ئاماژە بە خودی ڕاستیەکە بکرێ. لەگەڵ ئەوەشدا ڕاکردووەکان بەدوای ڕاکردنی ڕاستەقینەدا نەچوون. پیاوەکانمان بە بنەماگەلێک گۆشکرابوون، کە ئێمە سەرکەوتووانە لە دڵیاندا ڕواندبوومان: بەوەی هزری نموونەیی شتە گرنگەکەیە نەوەک کەس. هەر چۆنێک بێ یەکێ ڕۆیشت؟ بەهەر جۆرێک بێ یەکێ ڕایکرد؟ ئێ چیدیکە؟ خۆ قیامەت بەرپا نابێ. ئاخر سەرباز لە ناخی بڕوای خۆیدا ئەرکێکی دیرۆکی لەسەر شان داناوە. تۆ هەر دەبێ ئەرکەکە جێبەجێ بکەی ئەوسا بە چاوپۆشین لەوەی پێت بڵێ یاخود ئەرکەکە ڕەت بکەیتەوە، جا ئەوە چ نەیارەکەت بێ، یاخود برادەرەکەی ڕۆژی پێشترت بێ یان هاوڕێکەت یان ئەفسەرەکانت. وەک سەربازێکی ڕێی ئازادی، فەرماندەی هەرە باڵای تۆ خودی دۆزەکە بوو.

گۆڵمەزی 'لقی سوور' لە نێو خەمدا سەریهەڵدا، بەڵام بە خۆشی و شادمانی کۆتاییپێهات. کاتێک یاخیبوونەکە هەڵگیرسا، هەموو ڕاکردووەکان دووبارە لە یەکە نیزامییەکان خۆیان بینییەوە. ئەوەش سەرسامیێکی نوێ بوو، بەڵام ئەمجارەیان بە ئۆخژنێکی خۆشحاڵیانە بوو. هەر دوێنێ بوو فلان و فیسار توک و نەفرەتی لە ئیرگون دەکرد و لێی چووبووە سەردار، ئێ خۆ هەنووکەش بۆتە ئەفسەرێک و لە بەرەی پێشەوەیە؟ ئەوان چاویان هەڵدەگلۆفت. دۆستایەتی نوژەن بووەوە. جارێکی دیکە زۆر ئاستنزمی مۆراڵ بەرزبووەیەوە.

لەنێو 'لقی سوور'دا زۆر جەنگاوەری نایاب هەبوون نزیکەی هەمووشیان لە ڕووخساردا لە عەرەب دەچوون. بەڵام خۆ وەنەبێ هەر خەڵکی وڵاتە عەرەبیەکان پێست ئەسمەر و تاریک بن. زۆر جووی ئەشکەنازیش لە ئەوروپا لەوان نائەسمەرتر نەبوون، هەندێک جاران ئەسمەرتریش بوون لە عەرەبەکان. تاکە ئەندامی ئەم لقەش کە بە شێوەیەکی کەسیی دەمناسی، خەڵکی لۆدز بوو. ئەوەش ڕاست بوو، کە زۆر لە جەنگاوەرانی یەکەی هێدمە لە کۆمەڵگە ڕۆژهەڵاتییەکانەوە سەرچاوەیان گرتبوو. لە خوارەوە چیرۆکێک کە بەتایبەتی لە لایەن پەیامنێرانی ڕۆژنامەوانیی ئینگلیزییەوە بڵاوکرابووەوە، چیرۆکەکە دەربارەی 'دەستەی ڕەش'ی ئیرگون بوو گوایە تەنها لە جووە یەمەنییەکانەوە پێکهاتووە. ئەم ئەفسانەیەش لە سنوورێکی بەربەرینی

سیاسییە جووەکانەوە دەنگی دایەوە. ئیدی ویستیان بچووکمان بکەنەوە، ئەو شتەمان لێ بەهەند هەڵبگرن، ئاخر ئەو بەڕێزانە لەنێوخۆیاندا دەیانچرپاند، یان بەدەنگی بەرزەوە دەیانگوت، خۆ هەموو ئیرگون لە یەمەنییەکانەوە پێکهاتووە. دوژمنەکەمان بۆیە ئەو چیرۆکانەی دەربارەی "یەمەنییە ڕەشەکان" لە سەرێک و لە سەرێکی دیکەشەوە "جووە پیسەکانی ئەوروپای ڕۆژهەڵاتی" بڵاودەکردەوە، بەڵکو ڕەشمان بکا و بە قێزەوە خەڵک سەیرمان بکا. ئەوەش مایەی بەزەیی پێهاتنەوە بوو، کە جووە سیاسییە ڕکابەرەکانی خۆمان کەوتنە داوی ئەو جوێنە ڕاسیستیانە، بەوەی لەنێوان هەر دوو جەنگەکەدا پڕوپاگەندەی دژەسامێتیان هەندێ شیرین کرد. نازییەکان ئەوە فێرببوون، بڵێن: "لەوانەیە هەموو جووەکان کۆمۆنیست نەبن، بەڵام هەموو کۆمۆنیستەکان جوون." هاوشێوەش هەندێ لە زایۆنیستەکان بە ئێمەیان دەگوت: "هەموو یەمەنییەکان ئیرگونی نین، بەڵام هەموو خەڵکی ئیرگون یەمەنین."

هیچ شتێکیش بەو شێوە وێناکراوە نەبوو. لە یەکەی هێندمە و باقی لقەکانی دیکەی ئیرگون، ئەندامەکانمان لە هەموو کۆمەڵگە جووەکان و چین و توێژەکانیانەوە هاتبوون. ئێمە خەڵکمان هی لە تونس و هاربین، پۆلەندا و ئێران، فەڕانس و یەمەن، بەلژیک و عێراق، چیکۆسلۆڤاکیا و سووریا بوون؛ ئێمە خەڵکی خۆجێی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بوخارا، ئینگلستان و سکۆتلەندا، ئەرجەنتین و باشووری ئەفریقیا، زۆریشیان هی ئێرتز ئیسرائیل بوون. ئێمە نموونەیەکی بچووککراوەی نەتەوەی جوو بووین. ئێمە هەرگیز لە بنەچەکەمان نەدەکۆڵیەوە، ئێمە تەنها داوای دڵسۆزی و لێهاتوویمان لێدەکردن. هاوڕێکانمان لە کۆمەڵگە ڕۆژهەڵاتیەکاندا لە نێو ئیرگوندا هەستیان بەخۆشی دەکرد و بەماڵی خۆیان دەزانی. هیچ کەسێکمان شتێکی وا گەمژانەی نەنواند گوایە لەوان بەرزتر بێ؛ ئەوانیش بە خۆیان یارمەتیدەربوون بەوەی هەست بە نادادی نەکەن و خۆشیان بەکەمتر لەوانی دیکە نەیەتە پێشچاو. ئەوان هاوڕێیانە دەجەنگان و هەر ئەوەش بەس بوو. ئەوان کەسانی بەتوانا و لێهاتوو بوون و گەیشتنە بەرزترین پلەو پایەی بەرپرسیارێتی. شلۆمۆ لیڤی یەکەمین سووپاسالاری یاخیبوونەکە سێفاردی[٣٩]

[٣٩] سێفاردی مەبەست لە جووی سپانی و پورتوگال و باکووری ئەفریقیایە. وەرگێڕ.

بوو. ئوزی براشی لە گەڕانەوەی لە زیندانی ئەریتێریادا بووە فەرمانددەی هەرێمی تەلئەبیب و فەرماندەیی هەزاران کەسی کرد، هەر واش مایەوە و پاڵەوانانە جەنگا، لە دوواییدا لە شەڕی یافادا سەری لەپێناودا دانا. شیمشون، کە فەرماندەی هەرێمی حەیفا بوو تا ئەو کاتەی ناپاکی لێکرا و ڕادەستی دەسەڵاتی سەربازی بەریتانیا کرا، خەڵکی ئێران بوو. ئێمە گیدۆنمان لە ئۆرشەلیم هەبوو، ئەو ئۆپەراسیۆنی قارەمانانەی دژی بارەگا سەرەکی پۆلیسی سەربازیی و سووپای داگیرکەر ئەنجامدا و چالاکییەکانی بە گیانێکی نەبەزین و پیاوانە ئەنجام دەدا. ئەویش هەر سفاردیانی بوو. دوو پیاو، کە چوونە بەر پەتی سێدارە، ئەکۆشی و کاشانییش هەر سێفاردیی بوون. ئەو تانەدان و ڕەشکردنەی دوژمن و ڕکابەرەکانمان لە ئێمەیان هەڵدەسوی، مایەی شانازی ئێمە بوو. ئەو کەسانەی سووکایەتیان پێکرا، بوونە جەنگاوەری بەخۆناز لە نێو پلەکانی ئێرگوندا، ئیدی ئەوان پیاو و ژنی ئازاد و یەکسان بوون و هەڵگری ئالای نامووس و ڕزگاریخوازی بوون. ئەی چی لەبارەی ژمارەوە؟ ئێمە هەرگیز ژمارەمان نەکردۆتە پێوەر. بەڵام لەو باوەڕەدام زۆر نزیکم لە ڕاستییەوە ئەگەر بڵێم لەنێو ئەو لق و هۆبە جیاوازانەی ئێرگوندا ئەندامانی کۆمەڵگەی سێفاردی و ڕۆژهەڵاتیەکان لە 25٪ کەمتر و لە 35٪ یش زیاتر نەبوون. لە یەکەکانی هێدمەدا و لە سۆنگەی جەختکردنەوە سەر ڕەنگ ئەسمەری پێست، ڕێژەکە لەوە بەرزتر بوو، لەوانەیە لە نێوان 45 تا 50٪ بوو بێ.

ئەندامانی یەکەکانی هێدمە دەستپێکی ئۆپەراسیۆنەکانی یاخیبوونەکە بوون، بەڵام بەکردەوە هەبوونە ئایرەکەیان ڕەوا نەبوو. لە ماوەی ڕۆژەکانی قاڵبوونەوە لە خەباتدا، یەکەکانی هێدمە لەگەڵ یەکەی پەلامار یەکیان گرت و هێزی هێرشبەری بەناوەدەنگی ئێرگونیان پێکهێنا و زەبری قورسیان لە چەوسێنەران دا، کە ڕاستەوخۆ لە گەندەڵی ڕژێمی ئینتداب لە ئێرتز ئیسرائیلدا بەرپرسیار بوون. لەو چوار لقەی نەخشەمان بۆ کێشابوون، سێیان مانەوە، بەکردەوەش هەر دوویان بوون: ئەوانیش هێزی هێرشبەر و هێزی پروپاگەندەی شۆڕشگێڕی بوون. لەنێو ئەوانیشدا بەردەوام کێشمەکێش هەبوو: هەموو ئەندامێکی یەکەی هێزی هێرشبەر دەیەویست بگوازرێتەوە بۆ

نێو هێزی پڕوپاگەندەی شۆڕشگێڕانە، هیچ ئەندامێکی ئەو یەکەیەش ئامادە نەبوو بچێتە نێو هێزی هێرشبەر.

ئەوەش تەنها تاکە کێشمەکێشی نێو ژێر زەمین نەبوو. شەڕی ژێرزەمینی نموونەیەکی ڕاستی بچووککراوەی دەوڵەتە: دەوڵەتێک کە لە باری جەنگدا بێ. ئاخر خۆ لەشکر خۆی هەبوو، پۆلیس و دادگای تایبەتی خۆشی هەبوو. بەشێوەیەک ڕێکخرابوو، هەموو باسکە جێبەجێکارەکانی دەوڵەتی هەبێ. لەسەرووی هەمووشیەوە، بەرپرسێتی نەوەک هەر ژیان و مەرگی تاکەکانی بەڵکو هی هەموو نەوەکانی لە سەرشان بوو. ئەوەش وەنەبێ هەر لەو ڕوانینەوە باری ژێرزەمینی لە دەوڵەت بچێ. وەک وەزارەتەکان و دامودەزگای میریی، ئاواش ژێر زەمین لق و هۆبەی هەبوو، لەنێو خۆشیاندا هاوکاری و دەمەقاڵی هەبوو، ئاخر ئەوەش لە سروشتی مرۆڤەوە سەریهەڵدابوو. فەرماندەییە هەرێمییەکان حەزیان بەچارەی ئەو ئۆتۆنۆمییەی یەکەکانی هێدمە و دواتر هی هێزی هێرشبەر نەدەکرد. فەرماندە هەرێمییەکان دەیانگوت: "ئێمە چارەی ئەو کاروبارانە دەکەین، کە دەکەونە نێو سنووری فەرماندەییەکەمان. ئێمە ئەو چەکانە دەناسین کە هەمانە (و نیمانە). ئێمە خەڵکی خۆمان دەناسین. باشە کەوایە بۆچی ئێمە خۆمان بۆ ئۆپەراسیۆنەکان ئامادە نەکەین و هەر بەخۆشمان ئۆپەراسیۆنەکان نەکەین؟" ئەم بەڵگەوبەندەش زۆر لۆژیکیانە بوو. بەڵام وەڵامی فەرماندەی هێزی هێرشبەریش لەو کەمتر نەبوو. "ئۆپەراسیۆنەکانی شەڕ" وەک ئەوان دەیانگوت، "زۆر جاران بە شێوەیەکی خێرا ئامادەکاری بۆ دەکرێ. فەرماندەی هەرێمەکان وەک باوکێک وان کە زۆر ڕۆڵەی هەبن. ئەو زۆر بە سەرچاوە کێشە ڕێکخراوەییەکانەوە سەرقاڵە. ئێمە تەنها لەو کاتە لە کاریگەرییەکە خاترجەم دەبین، کە ڕاستەوخۆ پەیوەندیمان بە ئەفسەرە خۆجێییەکانی ئۆپەراسیۆنەکەوە هەبێ."

شتێکی ئاسانیش نەبوو لەنێو ئەو دوو ڕایەدا ناوبژی بکەی، بەتایبەتیش هەر دوولایان لەباشترین پیاوەکانیان دەگەڕان کە چالاکییەکەنیان پێ بکەن. لەو کاتەدا من هەستی ئەو دادوەرەم بۆ پەیدا دەبوو کە هاواری بەسەر هەر دوو بەرەکەدا دەکرد بەوەی هەر دوولای کێشەکە لەسەر هەقن.

ئەو دەمەقاڵێیەی دەربارەی ئەو ئۆتۆنۆمییە بەخشرایە هێزی هێرشبەر هاوزەمان لەگەڵ مشتومڕێکی دیکەدا تەریب دەڕۆیشت، ئەویش دەربارەی جۆرە ئۆتۆنۆمییەکی دیکە بوو کە بە لقێکی دیکە نەبەخشرا. دەزگای هەواڵگریمان هەرگیز لەوە کۆڵی نەدا، داوای جۆرە پێوەرێکی ئۆتۆنۆمی بۆ کار و چالاکییەکانی بکا. ئەم لقەمان لە ماوەی خەباتەکەدا کاری مەزنی کردن. لەو کاتەی هێزی هێرشبەر بە ئاگر و ئاسن پەلاماری دوژمنی دەدا، هەواڵگریمان بە مێشک دەجەنگا. بە ڕاستیش بەشێکی زۆری سەرکەوتن بەسەر هێزەکانی میریدا بە ئاشکراکردنەکان، بە زانیاری و پشتێنەی ئاسایشییانە بوو، کە بەستبوویان، بە کۆڵنەدان و هەستی هاوبەشی بێ هەڵەیی دەربارەی شەڕی ژێرزەمینینی هەواڵگریەکەمانەوە بەند بوو. ئەندامەکانی دەزگای هەواڵگریمان لە لایەن جێگری یۆل و جێگرەوەی بەناوی میشێل بوو ڕابەرایەتی دەکرا، کە خەمخۆری دەستکەوتی مەزنتر بوو گەرهاتباو رووبەرێکی بەربەرینتری لە پێوەری ئازادی پێدرابا. تایبەتمەندانەش ئەو بۆ پشتگیری بەڵگەوبەندی خۆی، دابونەریتی دەزگا هەواڵگریەکانی دەوڵەتانی دەهێنایەوە کە ڕاستەوخۆ لە بن ڕکێفی حکوومەتی ناوەندەوەن.

بەهۆی لێتێگەیشتن و لێبوردەیی نمایشی هەموو هاوڕێکانمان، ئێمە بەسەر کێشمەکێشە نێوخۆییەکانماندا سەرکەوتین، کە لە پێویستی دابەشبوونی کار لەنێوان زۆر لە خەڵک و تاسە و پەرۆشیان بۆ سەرخستنی ئەرکەکانیان سەرچاوەی گرتبوو. ئەوەش وەنەبێ زێدەڕۆیی بێ کە بگوترێ، ئێمە هەموومان لە باری ژێرزەمینیدا ئەزموونی میکانیزمی دووڵەتیمان بە ڕووناکی و سێبەر، بە شکۆ و خەوشەکانییەوە وەرگرت. بەگشتی ئێمە بەسەر کێشە ناوخۆییەکانماندا زاڵ بووین، بەڵام هەرگیز لەوەدا سەرنەکەوتین کۆتایی بەو دەمەقاڵێیە ترسناکەی نێوان هێزی هێرشبەر و هێزی پروپاگەندەی شۆڕشگێڕانەدا بێنین.

6

ئەرکی بڵاوکردنەوەی پەیامەکانی یاخیبوون درابووە هێزی پروپاگەندەی شۆڕشگێڕانە. ئێمە کۆگایەکی مەزنی زانیاری گشتیمان دانابوو. ئێرتز ئیسرئیل هەر بە تەنیا سەرچاوەیەکی گەورەی خۆزاییانەی نەبوو، بەڵکو گەلی

جوولەکە خاوەن دەروازە سامانێکی بە بەهای خۆرسکانە بوو، ئەویش عەقڵەکان بوون. ئەو گەلەی بیریش دەکاتەوە نە بە وشەی بۆش و بەتاڵ نە بە کردەیەکی کوێرانەش قایلە. ئەوان دەیانەوێ بزانن بۆچی شتێک کراوە و ئەوەی کە کراویشە بۆ لەو کاتەدا کراوە. خەڵکەکەمان ڕوونکردنەوەی کردەوەکانیان لێمان دەویست، ئێمەش دەبوایە لەپێناو ئاسایشی ئەوەی دەمانویست بیپارێزن، ڕوونکردەوە بدەین، کە نیشانەی لێتێگەیشتن و هاوسۆزییان بوو.

هەروەها هۆکارێکی دیکەی کاری هێزی پڕوپاگەندەی شۆڕشگێڕانە، کە ناچاری کردبووین تەکانێک بە پەلامارە زارەکییەکانمان بەقەد فیزیکییەکان بدەین، ئەوە بوو پڕوپاگەندەی دوژمن ئێمەی وا وێنا کردبوو، کە لە نزمترین نزمەکانین. هەڵبەتە ناونانێوە شتێکی جێگیر و بی جڵەو بوو. بەلام خۆ پڕوپاگەندەی دوژمن مەبەستێکی دیکەی لەوەدا هەبوو. زۆر کەس پەلامارەکەی ئێمەی بۆ سەر شەمەندەفەرەکە لەبیرە کە بەهۆیەوە دەستمان بەسەر بڕە چەکێکی زۆردا گرت. ڕێنمایی وا لە هەموو ئۆپەراسیۆنە هاوشێوەکان دەرکران، کە باری ناچاریش وامان لێدەکا ئەو کردەوە هێرشبەرانە بنوێنین، بەلام تا پێمان بکرێ ئازاری کەس نەدەین. ئەو بڕە تەقەمەنییەی لەو کردەوانەدا بەکارمان هێنا، وا دەخەمڵێندرا بایی وەستاندنی شەمەندەفەرەکە بکا، هەرچەندە مایەی خۆشحاڵیش نەبوو، بەلام هی وا نەبوو شەمەندەفەرەکە تێکوپێک بشکێنێ یان زیانێکی زۆری پێبگەیەنێ. ئیدی کوڕەکان لەنێو داروباردا خۆیان لەبۆسە دانابووە و لە شەمەندەفەرەکە دەرکەوتن، دەورەی پاسەوانەکانیان درا و چەککران. هەموو ئەو کاربەدەستانەی نێو شەمەندەفەرەکە -شەمەندەفەرەکە هیچ ڕێبوارێکی مەدەنی هەڵنەگرتبوو- گوازرانەوە شوێنێکی دەستبەسەری. کەمێکیشیان کە بە هۆی شوشەی جامەکانەوە ڕوشابوون تیمارکران-بۆمایەی سەرسامیێکی گەورەش- تیمارکردنەکە لە لایەن ئەندامانی فریاگوزاریەکانمانەوە بوون. بڕی ٣٨.٠٠٠ دۆلاریش گیرا. کوڕەکان گەڕانەوە بنکە و بارەگاکانی خۆیان. کاربەدەستە بەریتانییەکان دەیانزانی ئێمە چی لە بڕە پارە دەستبەسەرداگیراوەکە دەکەین، بۆیە هەوڵێکی زۆریان دا بیگەڕێننەوە. لە (هەدرای) نزیکی شوێنی ئۆپەراسیۆنەکە جاڕی باری ناکاو و قەدەغەکردنی

هاتووچۆیـان دا. دەسـتەی تـایبەتی گەڕۆکـی لـێگەڕان ڕەوانەی ڕێگەوبانەکـانی ئەوێ کران. هەموو بارهەڵگرێکی ئەو ڕێگاوبانانەیان پشکنی. ئەو بـارهەڵگرەی پارەکەشــی تیــادا هەڵگیرابــوو، بەچڕوپــڕی پشــکنیان بەڵام دەســتیان لەبنــی هەمبانە دەرچوو.

ئۆپەراســیۆنەکە لەو ســەردەمە کــورتەدا کــرا، کە یەکێتــی بــزووتنەوەی بەرگریکردن دروستبوو؛ بەوەی هاگاناش لە پاڵ ئێمەدا دژی دەسەڵاتدارانێتی بەریتانیا جەنگا. لە یەکێک لە کۆبووەنەوە نیزامییەکانمان لەگەڵ سووپاسـالاری هاگانا موشێ سنیە [40] پێیگوتم؛ ئەفسـەرە باڵاکانی بەریتـانی زۆر بە نەخشـە و جێبەجێکردنــی پلانــی ئۆپەراســیۆنەکە سەرســام بــوونە. ئەو ئۆپەراسـیۆنی دارستانی هـادرای بە "کارێکی خـاوێن" وێنـاکرد. ئێمە ئامـادەبووین پەسـندانی ئۆپەراسیۆنەکە فەرامۆش بکەیـن، بەڵام زۆر قـورس بـوو لەوە خۆش بـین کە لەســەر 'کــارە خــاوێنەکە" لە لایەن ئەفســەرێکی پلەبــاڵای دیــکەی دەســتەی سووپاســالاری بەریتانیــا لە ڕۆژنــامەدا نووســرابوو. ئەو خــانمە لە لایەن ڕۆژنـامەیەکی هەرە بەربـڵاوی بەریتانیـاوە نێردرابـوە ئێرتـز ئیسـرائیل، تـا بە ملیۆنان لە خوێنەرەکانی بڵێ، گوایە ئەو پەلامارە لە لایەن "دەزگیرانەکەم کە شـۆخێکی کەژەیە و شــەو ڕۆژ تفەنگی لە گولـمەدایە، سـەرکردایەتی کـراوە." دوای وێناکردنی ئەو خـوێنمژ (ڤامپـایر)ە لە بەرامبەر کردەوەکەی 'تیرۆرسـتیە دڕندانەکەی' هادێریـادا مـوی لەش دەبـووە نەشـتەر. پێدەچوو ئەو دەنگۆیە بە بەردەوامــی یــارمەتی ئەوەی دابــین، لەنێــو ئەو دەیــان هەزار بەریتــانییەی شانشــــینی یەکگرتــــوودا کەوا خزمەکانیــــان لە ئیســــرائیل لە لایەن حکوومەتەکەیـانەوە ناردبێتە دۆزەخ، جـۆرە فشـارێک لەسـەر دەسـەڵاتدارانیان دروست بکەن، تا زووە ڕۆڵەلانیان لەوێ بکشێننەوە. ئیدی تەنانەت ئەو خـانمە ڕۆژنامەنووسـەش، کە لە جیـاتی ژنە ئەسـمەرەکەمدا دەزگیرانێکـی کەژەی بـۆ دانــابووم، بەو وێنــاکردنە سەیروســەمەرەی، بــێ مــرازانە یـارمەتی ئەوەی دا ڕژێمـی مانـداتی بە خێرایـی بکشـێتەوە. ئەو هــاتبوو بمــان بێزرێنــێ و ئەوەی نووسیبووشی مایەی ئەوە بوو خەڵک قێزمان لێبکاتەوە. بەداخەوە بەدڵنیـایەوە

[40] ئەو جوامێرە سیاسەتوانێکی گروپێک بوو کە لەگەڵ دەستەی جێبەجێکاری مستەر بنگوریۆندا کاری دەکرد و چووبووە ڕیزی ماپام، کە پارتی سۆسیالیست-کۆمۆنیستی توندڕەوبوون.

هەندێ ڕەگەزی جوولەکەش و ئۆرگانەکانیان هاوبازاڕی ئەو پڕوپاگەندە نەفسنزمە ڕوومەت وڕوشێنە قیزەونە بوون.
ئێمە ناچارکراین بەرگری لەخۆمان بکەین. بەرچاوڕوونکردنەوەی خەڵک بەشێکی دانەبڕاوی خەباتەکەمان بوو. یەکێک لە کەرەستە هەرە گرنگەکانی ئێمە ئێزگەکەمان بوو. ئێمە بەیەکجار نەماندەتوانی ڕادیۆی ژێرزەمینیمان هەر بە بەردەوامی و هەم تەواو کارای بکەین. ئێمە بە شتێکی دوو هێندەوە دەستمان پێکرد. دوای بڵاوکردنەوەی کەمێک بەسەر ئێزگەکەماندا، ترانزستەرەکەمان (دەزگای پەخشەکە) لە ماڵی ئەشتەر رازیل، خوشکەکەی داڤیددا گیرا. ئەشتەر و هاوسەرەکەشی گیران. لە دوای ئەوان دوو منداڵ و دایبابە پیرەکەیان بەجێمان و بۆ کوڕە تاقانەکەیان هەر شین و واوەیلایان بوو. لەلای ئێمە خەم و ژانی گیرانی ئەشتەر و یەهوودا زۆر لە دەستبەسەرداگرتنی سندووقی دەزگاکە قورستر بوو. ئەشتەر ماوەیەکی زۆر لە بەندیخانەی بێت لەحیمدا مایەوە، یەهوداش چوار ساڵی لە ئۆردوگای زۆرەملێ مەنفا لە ئەفریقادا ڕاکێشا، بەڵام زۆری پێنەچوو ئێمە دەزگای پەخشێکی باشترمان پەیداکرد.
یەکەمجار لەیەک کاتدا هەر بە تەنیا پێنج خولەک لەسەر یەک ئێزگەمان پەخش دەکرد. لە ئەدەبیاتی ژێرزەمینی ئەوروپیمان خوێندبووەوە، کە ئەڵمانەکان ئامێرێکی تایبەتمەندیان بەکاردەهێنا، لە ماوەی شەش خولەکدا شوێنی ئێزگەی پەخشکراوی ژێرزەمینیان دەدۆزیەوە. بۆیە ئێمە یەک خولەکمان دەهێشتەوە بەر لەوەی پەخشەکەمان ئاشکرا ببێ. بەڵام لەو کەینوبەینەشدا ماندوو بووین. بارودۆخی وڵاتەکەش تا دەهات پەرەیدەسەند و جدیتر دەبوو، خەباتەکەشمان چڕوپڕتر دەبوو. ئیدی پێویست بوو پەخشی ڕادیۆکەمان بەرفراوانتر ببێ. ئێمە ئاگادارینامەیەکمان بڵاوکردەوە، تیایدا هۆشداریمان دابوو، ڕەوشەکە لەبن پاسەوانیتی چەکدایە و ئەگەر هێزی چەکدار هەوڵبدا جارێکی دیکە دەست بەسەر دەزگای پەخشماندا بگرێ، ئەوا باجەکەی دەبێ بە خوێن و ژیانیان بدەنەوە. هۆشدارینامەکە کاری خۆی کرد. ئیدی توانیمان پەخشەکەمان بۆ دە، پازدە، بیست خولەک بەرز بکەینەوە. دیاربوو دەسەڵاتدارەکان دەیانتوانی شوێنپێی پەخشەکەمان هەڵبگرن و بیدۆزنەوە، بەڵام هەرگیز شتێکی وایان نەکرد دەستەیەکی چەکداریان لێ

نزیک بکەونەوە. دیارە هۆیەکەش ئەوە بوو، ئەگەر ئەوان بۆ پەخشەکەمان بێن، ئەوا زیانیان لێدەکەوێ، ڕەنگبێ نەشتوانن پەخشەکەمان پێهەڵبگرن، خۆ ئەگەر لەوەشدا سەرکەوتن، ئەوا ئێرگون تەکنیکزانی دیکەی هەن- کە لە تەکنیکارە هەرە باشەکانی وڵات بوون- هەر زوو دەزگای پەخشێکی دیکە لەجێ دادەنێنەوە.

کەچی ئەوان ڕێکارێکی دیکەیان بۆ دەستوەردان لە پەخشەکەمان دۆزیەوە، لەو کاتانەشدا سەرنجی دەیان هەزار گوێگری بۆلای خۆی ڕاکێشابوو. گۆبلز لە میانەی جەنگیی دووهەمی جیهانیدا گردوکۆی زۆر گەلحویانەی دا تا دەنگی بی بی سی کپ بکا. دەسەڵاتی مانداتیش هەروەک ئاڵمانەکان بە دوای درێژی شەپۆلەکانی پەخشەکەماندا گەڕا. تەکنیکارەکانیشمان عەقڵی خۆیان بەکارخست تاکو ئەو دەستوەردانەی دەسەڵاتداران پەکبخەن. ئەوان دەزگایەکی نێرەری وایان دروستکرد کە بۆی لوابا لە شەپۆلێکەوە بازی بدایە سەرشەپۆلە پەخشێکی دیکە. ئەوانیش لە ئەرز و ئاسماندا هەر بەدوایدا دەگەڕان. لە خاڵێکی دیاریکراودا پەخشی "قاچاخ" بەگەڕ دەکەوت. خولەکێک پاشتر دەزگای تەشویش بە شێوەنێکی ناخۆش لەسەر پەخشەکە دەیکردە زیرەزیر. ئیدی دەبوایە پەخشەکە بگوازرێتەوە سەر درێژە شەپۆلێکی دیکە. گوێگرەکانیش بە پەرۆشەوە میلەکەیان بادەدا بەڵکو بیخەنە سەر دەنگی ئەمریکا. هەندێک جار لە ماوەی چەند چرکەیەکدا لەسەر شەپۆلە درێژەکە ئێزگەکەیان وەردەگرت، هەندێک جاریش لە دەستیان دەردەچوو. لە کاتێکدا ئەو هەراو شیوەنە جاڕسکەرە تەشویشەی هەر بەدوادا دەگەڕا. خۆ ئەگەر ئەمجارەش لەسەر شەپۆلە درێژی دووهەم بیگرتبا، ئەوا دەبوایە تەکنیکارانمان بایاندابایەوە سەر شەپۆلە دەنگی سێهەم یاخود بگەڕابایەوە سەر شەپۆلەکەی یەکەم. بیسەرانیش لە میل سوڕاندندا بوون، دەنگە تەشویشەکەش بەدوایداندا دەچوو. ئەمەش گەمەیەکی تاقەتپڕوکێن بوو.

ئێمە هەوڵی بەندوباوێکی دیکەمان دا. هۆشداریننامەیەکمان دایە دەسەڵاتدارانی بەریتانی، ئەگەر لەم هەوڵەیان بۆ دەنگ کپکردنمان نەکەون، ئەوا ئێمە ئەوان بێدەنگ دەکەین. ئەم وریاکردنەوانە دادی نەدا. ئیدی نەخشەیەکمان بۆ تەقاندنەوەی وێستگەی ڕادیۆی بەریتانیا لە ئۆرشەلیم داڕشت. زۆر جاران هاتینە سەر لێواری ئەوەی نەخشەکەمان پیادە بکەین، بەڵام هەموو جارێک

ئاستەنگێکمان دەهاتە پێش. ئێمە دەبوایە خۆمان لە برینداركردن و زیان گەیاندن بە كرێكارە مەدەنییەكان بە دوور بگرین، كە لە نێویاندا زۆر جوو هەبوون هەروەها ئافرەتیشیان لەگەڵدا بوون. لە باروودۆخی شەڕدا، ئێمە هەرگیز ئەو داردەستیانەمان نەدەدۆزیەوە كە خۆ لە ئاستەنگییەكان بپارێزین. بۆیە بەجێگەیاندنی نەخشەكەمان وەخراند، هەرچەندە هەرگیز بە تەواوی لە كۆششەكەشمان نەكەوتین. لە دوایشدا بەریتانییەكان (سارۆنا) كە دەزگای تەشویشیان لێدانابوو، چۆڵ كرد، ئیدی توانیمان ئەمجارەیان بەبێ كێشەی دەستوەردان، ڕادیۆكەمان پەخش بكەین. ئەو هۆشدارینامەی لەمەڕ ئێزگەكە یەكێ بوو لە زۆر لەو ئاگادرینامانەی دابوومان، كە كاریگەری خۆی لەسەریان نەنواند.

لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز بێدەنگ نەبووین. ئێمە ئێزگەمان بۆ سەر زمانە بێگانەكان وەرگێرا و لەنێو ڕۆژنامە بیانییەكاندا هەواڵی پەیامنێرانمان پەخشكرد و دەنگمان گەیاندە بەرگوێی نوێنەرە دیپلۆماتە بیانییەكان. بەگشتی ئێزگەكەمان هەواڵی واقعی و لێكدانەوەی سیاسیانەی بڵاو دەكردەوە. وەك ئێمە لێی فێربووین، هەواڵەكانمان بە بەرفراوانی هەر لە سیدنییەوە تا سان فرانسیسكۆوە وەردەگیران. ئەوەش گرنگ بوو، تیشكۆی بەردەوام بخرێتە سەر كێشەی ئێرتز ئیسرائیل و سەرنجی ڕای نێودەوڵەتی لێ خەبەردار بكرێ. دەنگی یاخیبوونەكە و ئازادی سەرباری هەوڵی ڕێپێگیرییانەی حكوومەتی بەریتانیا، بەردەوام دەگەیشت. خۆ ئەگەر ئەوە پێوانە بكرێ، كە بە هەزاران ڕێیان لێگیرابوو گوێیان لە ئێزگەكە بێ، بەڵام بە ملیۆنانیش گوێیان لێبوو، لە ئێرتز ئیسرائیلیشدا ڕادیۆكە بەردەوام بوو لەوەی سەرنجی جیهان بۆ ئەوە ڕابكێشێ تەنانەت گەر بە تەقینەوەش دەنگیان نەگات، ئەوا ئێزگەكە دەرەقەتی دەنگ هەڵبڕین بێ.

هۆكارێكی مەزنی ڕۆشنگەری لە ئێرتز ئیسرائیلدا "دیوارەكە" بوو. ئێمە جاڕنامە و بڵاوكراوەكانمان بە درێژی و پانی وڵات لە ڕێی هەڵواسین لەسەر دیوارەكەدا بڵاودەكردنەوە. ئێمە بەدەر لە نامیلكەكانمان هەمان شتمان دەربارەی پەخشنامەكان دەكرد. ئێمە ڕۆژنامەی دیواریی هێروت (ئازادی) وا دەركرد كە یەكەمجار شێوەیەكی وا لە ئێرتز ئیسرائیلدا هەبێ لەوانەیە لە زۆر شوێنی دیكەشدا ببینە و پێشەنگ بووبێ. بڵاونامە، داوانامە و پەیوەندیینامە

ئۆپەراسیۆنە چەکدارییەکانمان بەو شێوە دەخستەڕوو. بەلای کەمی هەر دوو ڕۆژ یان سێ ڕۆژ جارێک وامان دەکرد، هەندێ جاریش بەردەوام بەشەو و بە ڕۆژ پەیامەکانمان بلاودەکردنەوە. کورەکانی هێزی پڕوپاگەندەی شۆرشگێڕی هەرگیز ماندوو نەدەبوون. جەماوەریش تا دەهات پەرەی دەسەند و لە دەوری بلاونامەکان گرددەبوونەوە و دەیانخوێندنەوە ئاخۆ خەباتکارانی ژێرزەمینی چییان پێیە و چی دەڵێن. ڕیزی دووروودرێژ دەبەسترا تا پۆستەر، بلاونامە و کاخەزە هەڵواسراوەکان بخوێنینەوە. ئێمە ڕوومان لە جەماوەرەکە کردبوو، بە ڕاستی و بە زمانێکی سادە لەگەڵیان دەدواین. هەرگیز مەبەستمان چینێکی تایبەتی نەبوو، بەڵکو ڕوومان لە هەموو گەل بوو. کەم کەمەش ئەوان لەوە ڕاهاتن بڕوامان پێبکەن. بەرەبەرە متمانەیان پێکردین، ئاخر ئێمە تەنها ڕاستیمان پێدەگوتن.
بە ڕاستیش یەکێ لە بنەما پیرۆزەکانی زانیارییەکانمان ئەوە بوو، هەر تەنها ڕاستی بڵێین، هیچیدیکە لەو بەدەر نا. خۆ هەڵبەت نەشمان دەتوانی هەموو ڕاستیەکە هەڵڕێژین. ئاخر ئێمە لەباری ژێرزەمینیدا بووین. لە بەرامبەرمان دوژمنێک هەبوو، گوێقولاخ بوو، دەگەڕاو دەسوورا هەواڵی لە سەرمان کۆ دەکردەوە؛ کەسانێک و ئاژانێک هەبوون لە سەرمان جاسوس بوون، هەموو ئامانجیان ئەوە بوو زیانمان پێبگەیەنن. نەدەکرا ئێمەش هەموو شتێک هەر بلاوبکەینەوە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی بلاومان دەکردەوە ڕاستی بوو.
لە ڕۆژێکی ئابی ١٩٤٤دا، ئێمە پەلاماری پۆلیسخانەیەکمان لە ئەبوکانیر لەسەر سنووری یافا- تەلئەبیب دا، کە بارەگای سەرەکی پۆلیسی سەربازی لە یافا بوو. لەو بۆنەیەدا وەک لە پەلامارەکانی پێشوترماندا هیچ مەبەستێکی "نەخشەی شەڕمان" نەبوو. سووکوئاسان مەبەستمان ستاندنی چەند پارچە چەکێک بوو لە پۆلیسە بەریتانییەکان. لەو کاتەدا ئێمە ئەو مۆڵگەی سەربازیمان ڕەت دا، بڕیارمان دابوو تا ئەو کاتەی ئەوان لە شەڕدابن دژی نازییەکانی ئاڵمان هێرشیان نەکەینە سەر. ئەم بڕیارەش لە حیکمەتی سیاسییەوە هاتبوو، بە وردەکاریشەوە تا مانگی مای ١٩٤٥ پەیڕەو کرا، ئەو کاتەی کێشەکە باندۆری خۆی هەبوو، بەلام پۆلیسی بەریتانی و چەکەکانیان هەمیشە جێنیشانەی هەڵکوتانە سەربوو بۆ هێزی هێرشبەرمان، کە لەم ئۆپەراسیۆنەشدا ئیرگون ویستی یەکەمین هەوڵی دەستبەرسەرداگرتنی چەند

پارچە چەکێکدا بگری. خۆ ئەگەر کاتمان هەبووایە، باشتر ئامادەکاریمان دەکرد، چونکە بارەگای سەرەکی پۆلیسی سەربازییەکە دوای یەکەمین "سەردانیمان" (مەبەست بەسەردادانە-وەرگێڕ) لە بەهاردا گواستبویانەوە باڵەخانەیەکی دیکە' بەڵام وێستگەکەی دیکەیان هەر بۆ چەک و تەفەنگەکانیان مایەی سەرنجراکێشانمان بوون. مەبەستی سەرەکیمان ئەوە بوو بارەگا کۆنەکەی پۆلیسی سەربازی بوو، کە ئێمە لە بەهاردا تەقاندبوومانەوە. زانیارییەکانمان ئەوەیان دەگەیاند، بڕێکی زۆر لە تفەنگ و چەکی ئۆتۆماتیکی لە جبەخانەکەیدا هەیە.
ئیدی تەنها بەشێکی ئۆپەراسیۆنەکە جێبەجێکرا. کوڕەکانمان دەستیان بەسەر جبەخانەکەدا نەگەیشت. تەقینەوەکانیان بایی دەرەقەتی لە باریەک هەڵتەکاندنی دەرگا ئاسنینەکەی پاسەوانی ئەوێ نەهات. لە هەوڵێکی نۆژەندا، بە یەکدادان لەسەر سنووری تەلئەبیب- حەیفادا ڕوویدا، بەڵام ئەمجارەیان ڕێگەی جبەخانەکە بە تەواوی گیرا و پیاوەکانیش بە ناچاری پاشەکشەیان کرد. لە شوێنەکانی دیکەدا ئەرکەکان بەگوێرەی نەخشە بۆدارێژراوەکەدا ڕۆیشتن. دەستکەوتیش مەزن نەبوو، بەڵام کوڕەکان کە ئەزموونیان لە سەرکەوتن و نوشستی وەرگرتبوو دڵخۆش بوون، بە دەستی بەتاڵ نەگەڕاونەتەوە. هێزی پەلامار کارەکەی خۆی کرد. هێزی پروپاگەندەی شۆڕشگێڕانەش بەیەکجار چوونە پاڵیان. بەدرێژایی وڵات پەیوەندییەکان سەخت ببوون، پێکدادان لەگەڵ دوژمن پەیدا ببوو. هەرچی دەربارەی چەکیشەوەیە وەک نووسیبوومان، چواردە تفەنگمان لەیەک وێستگەی پۆلیسدا دەست بەسەردا گرت.
ئەم چاڕدانە یان بڵێی ئەم دانپێدانانە هەندێک لە برادەرەکانمانی تووڕەکرد، چونکە مشتومڕیان لەسەر ئەوە بوو، ئێمە لەژێر هیچ فەرمانبەرداریێکەوە نین، تا ژمارەی ئەو چەکانەی دەستمان بەسەرداگرتوون، ئاشکرا بکەین. باشە بۆچی ئەو جەماوەرە نەیزانێ، ئەو خەڵکە پێویستی بە دڵنەوایی و ڕۆنانی مۆڕاڵەوە هەیە، ئایا چەندایەتی زۆر لەوە بەهادارترە؟ ئێمە پشتمان لە بەڵگەوبەندە سایکۆلۆژیەکانی برادەرەکانمان نەکرد. هەڵبەتە دەمانتوانی خۆمان لە ئاشکراکردنی وردەکارییەکانی "چەندایەتی چەکەکان" بپارێزین، بەڵام ئێمە لەسەر پێیەکانی خۆمان چەقین. ئێمە لە شوێنێکی دیارکراودا دەستمان بەسەر چواردە تفەنگدا گرتبوو، دەبوایە بە خەڵکەکەمان گوتبا،

چوارده تفەنگمان گرتوون. ڕووداوی ئەو چوارده چەکە نیشانەنمایەک بوو بۆ ئەو سیاسەتەی، کە ئێمە بە دوایدا دەچین. ئێمە دەم و خامەمان بە ساختە تیژ نەکرد. ئێمە ڕاستیمان درکاند. باش یان خراپ، شادمان یان دڵتەنگ، ئاخر ئەوە هەمیشە ڕاستیەکە بوو. سیاسەتەکە لە ماوەیەکی کاتیدا پاداشتی نەداینەوە، بەڵام لەبەر مەودای درێژدا متمانەی گەل و جیهانمان بەدەستهێنا. هەموو لەوە تێگەیشتن، جاڕنامەکانمان ڕاست بوون. هەموویان لەوە تێگەیشتن کە هۆشدارییەکانمان هاتنەدی. ڕۆژگارێک رابرد لە ئێرتز ئیسرائیلدا بەگشتی ئەوە ببووە باو، دەسەڵاتداران بەگوێی بڕواپێکراوەکانیان دادەدا: "ئەرێ گوێتان لێنەبوو؟ ئێرگون زڤای لویمی وایگوت."

ڕۆژنامەنووسێکی جوو، کە یاریدەرێکی خۆجێی هەواڵنێری بیانی بوو، پێیڕاگەیاندین؛ کاتێک بەیانێکی فەرمی یان لە فەرماندەیی هاگاناوە پێدەگەیشت، لەو یاریدەدەرە جووەیان دەپرسی "ئاخۆ لێی وردبۆتەوە؟' لە سەرێکی دیکەشەوە بەیاننامەکانی ئێرگون بێ دوودڵی یان بێ هیچ سێ ودوو وەردەگیران.

سیاسەتی ڕاگەیاندنی ژمارەی ئەو چوارده تفەنگە، کە لە بڵاونامەکانماندا ڕامانگەیاندبوو متمانەیەکی بەخشیبووە خەڵک، ئەمەش گرنگترین بەهای جەنگی ژێرزەمینییە کە بە دوژمن و لۆمەکاران دەورە درابێ.

ئەرێ چۆن ئێمە شتەکانمان چاپ دەکرد؟ ئێمە فرەڕێگەمان بەکاردەهێنا. سەرەتا ئێمە لە دوکانێکی بچکۆلانەی چاپ لە نزیک سنووری یافا-تەلئەبیب پلاکاردمان چاپدەکرد. ئاخر لەوەشدا بژاردەی دیکەمان لە دەستدا نەبوو؛ بڕی پارەی پێویستمان لە بن دەستدا نەبوو تا ماشێنی چاپی سەربەخۆمان هەبێ. بەڵام لە پایزی 1944دا توانیمان دەزگای چاپێکی بچکۆلانە بکڕین. کوڕەکانمان کە هەموو ڕۆژ لەوێ سەرقاڵی کارەکەیان بوون، ئامادەبون هەموو جۆرە کارێکی بازرگانیش ڕایی بکەن، لە ماوەی نێوان چاپکردنی نامیلکە و نامەکانیشدا کاتی تایبەتیان بۆ کردە جۆشدانەکەی خەباتەکەیان ساز دەدا. پێدەچوو ئێمە بارگرانییەکی زۆرمان خستبێتە سەر ئەم ئەرکەیان. ئاخر ئێمە لە سەرەتای قۆناخی شۆڕشەکەماندا بووین؛ شتی زۆرمان بۆ گوتن پێ بوو. کاتێکیش هەڵمەتی تاوانبارکردن دەستپێکرد، دەزگای چاپی ئێمەش بووە قوربانی جێچاوی سووسەکاران و بۆ ماوەیەک لەکاری

چاپکردن وەستاین. تەنها دەمانتوانی لەگەڵ کۆنە دۆستەکەی دەزگای چاپی میزراحیدا هەندێ کار بکەین. بەڵام دواتر لە ئەزموونەکەمانەوە فێربووین، توانیمان ڕەوشەکە و باری گلاومان راست بکەینەوە. بڕیارماندا ئەدەبیاتی ژێرزەمینی دابمەزرێنین. بۆ ئەوەش شوێنێکی لەبارمان دۆزیەوە. کاری رووپۆش بۆ شوێنبزرکردن کاری خۆی کرد. کوڕەکان ماندونەناسانە کاری هەڵکەندن و ژێرزەمینیانەیان بۆ کرد. هەموو شتێک ئامادەکرا، کەچی لەو کاتەدا پێمان زانی کەسێک لە دراوسێیەکانماندا هەیە کارەکەی ئێمەی پێزانیوە. ئێمەش کارێکمان نەکرد تا هەر پشت بە پەرجوو ببەستین. وازمان لەو باڵەخانەیە هێنا. بەختیش واکەوتەوە، ئەو باڵەخانەیەی بەتەمای بووین و بەجێمان هێشت، دواتر بە پەلاماری بۆردومانی فڕۆکەی میسرییەکان بۆ سەر تەلئەبیب تێکوپێک درا.

ئێمە نامراد نەبووین. ناچاری و پێویستی ڕێسای ژێرزەمینییە. شوێنێکی دیکەمان دۆزیەوە، ئیدی کەلوپەلەکانمان بۆ ئەوێ گواستنەوە. گیدیش کێشەی هەوا ئاڵوگۆڕی باڵەخانەکەی بە دەزگای هەواکێش چارەسەر کرد. نیگەرانییەکی دیکە سەریهەڵدا. بارداگرتنی کەشتی بەناوبانگی سالۆنیکا، کە دەزگای چاپەکەی بۆ دەهێنایە ئەوێ، گوێیان بەر شتێک کەوتبوو. دەزگای هەواڵگری نهێنی ئێمە ئەوەی زانی کە مقۆمقۆی ئەوە کەوتۆتە سەر گوایە ئەمە دەزگای چاپی نهێنی ئیرگونە. ئەمەش مایەی بێزاری بوو. دەکرێ دەنگۆی بێوەیی بڵاو ببێتەوە، ئاخر دوژمن زۆر گوێ سووک و قولاغە. بەڵام نیگەرانیەکە بەسەرچوو. ئەو تاقمەی کەشتی سالۆنیکا لەوە تێگەیشت، کە پێویستە بە شێوەیەکی ڕەها لەو دەنگۆیانە گوێی خۆی کەڕ بکا. ئیدی دەزگای چاپەکە دامەزرێندرا. کارەکەش بە راستی ماندوبوونێکی قورس بوو. هەوای شوێنەکەش خنکێنەر بوو، گەرمی لە تاقەتبەدەر بوو، هەندێ جار تەواوی دەزگاکە لەکار دەکەوت. بەڵام خۆ کرێکارەکانی ئیرگون شەونخونییان نەدەزانی، زۆر جاران لەگەڵ میلی سەعاتدا بێ وەستان کاریان دەکرد. لەسەر زەمینیشەوە، کوڕەکانمان بە دڵخۆشییەکی تەواوە دەستبەکاربوون. لەسەرووی ژێرزەمینەکەی چاپخانەکە کارخانەیەکی دارتاشی بۆ دروستکردنی مۆبیلیات لەگەڕدابوو. باربەری گەورە دەهاتە کارخانەکە، وادیاربوو بۆ هێنانی تەختەدار و بردنی کەلوپەلە دروستکراوەکان بێ. بەڵام هیچ چاوێکی بێگانە

ئەوەیان نەبینی، لە نێوان ئەو تەختە دار و کورسی و قەنەفە دروستکراوانەدا، سەفتە و بارستای کاخەز هەبوون، کە بە شێوەیەکی ڕێک لە سندوقەکاندا داندرابوو. ئەم دەزگا چاپە نهێنییە هەرگیز لە لایەن دەسەلاتدارە بەریتانییەکانەوە نەدۆزرایەوە. تەنها لەگەڵ ڕاگەیاندنی دامەزراندنی دەوڵەتدا، ئێمە شوێنە پەنهانەکەی دەزگاکەمان ئاشکرا کرد، کە لەوێوە بانگی گەلمان دەکرد سەری بەرز بۆ سەرشۆڕی و داپڵۆسین دانەنەوێنن.

لەو شوێنەوە شتە چاپکراوەکانمان دەگەیشتنە مەڵبەندەکانی دابەشکردن. لەوێشەوە بۆ مەکۆ خۆجێییەکانی هێزی پروپاگەندەی شۆڕشگێڕانە دەڕۆیشت و ئەوانیش لەسەر دیوارەکاندا هەڵیاندەواسی و پەخشیان دەکردن. خواستی بەرزەفڕی ئێمە بوو بڵاونامە و پۆستەرەکانمان لە سەرتاسەری وڵاتدا و لە یەک ڕۆژدا بڵاو بکەینەوە. ئیدی بۆ ئەم مەبەستە تۆڕە ڕایەڵەی ئاوەدانییەکانمان پێکهێنا. گواستنەوەی چاپەمەنییەکان وەک گواستنەوەی چەک وابوو، دەبوایە لەبن لوتی پۆلیسەوە بیگوازینەوە.

## 7

بەگشتی دەبێ ئەوە بگوترێ، هێزی پروپاگەندەی شۆڕشگێڕانە لە پاڵ هێزی پەلاماردەرەوە هۆکاری پەلاماری سەربازییانە ڕوونبکاتەوە. هەندێک جار ئەوان پێش هێزی پەلاماردەر دەکەوتن بەڵکو مێشکی خەڵکەکە بۆ ئۆپەراسیۆنی ئایندە ئامادە بکەن. بەڵام خۆ دۆزی واش هەبوو، کە هەر چەندانێک بوون، کاتێ هێزی پروپاگەندەی شۆڕشگێڕانە خۆیان لە بری هێزی پەلاماردەرەوە ئۆپەراسیۆنەکەیان دەکرد. ئیدی بڵاونامە لەبری فیشەک. ئەوانیش کاریگەریی گوللەیان هەبوو. یەک لەو بۆنانەش پەیوەست بوو بە دیواری لاوانەوەوە[41].

کێشەی دیواری لاوانەوە و شارە دێرینەکەی ئۆرشەلیم ڕەنگدانەوەی سەرجەم ململانێی ماخۆیەتی وڵاتی ئیرتز ئیسرائیلە. پێویستە ئەوە دەرحەق دەسەلاتدارە بەریتانییەکان بگوترێ، ئەوان زۆر باش لە بەهای هێماداریتی نەریتییانەی سیاسییەکە گەیشتبوون. ئەوە بە ئینگلیزی بوو نەوەک بەعیبری

---

[41] دیواری لاوانەوە بە عەرەبی پێی دەگوترێ (حائط المبکی) دەکەوێتە شارە دێرینەکەی ئۆرشەلیم، لای جوولەکان شوێنێکی پیرۆزە و دەکەوێتە سەر کۆتەڵی دووهەم، لەوێدا سروودەکانیان دەخوێننەوە دوعای لەبەر دەکەن و بۆی دەگرین، لە عیبریدا بە واتای شاخی ماڵەکە (ماڵی خوا) دەگرێتەوە و لای موسڵمانەکانیش هەر پیرۆزە و بە الحرم الشریف ناسراوە. وەرگێڕ.

که دیزرائیلی نووسیبووی، که خەڵک بە هێز یان بە نەریت ڕابەرایەتی دەکرێ. بۆیە سیاسەتی بەریتانی ڕاستەوخۆ ئاراستەی ناوچەرگەی دابونەریتی جووایەتی کرابوو. لە شوێنی دیکەش عەرەب و موسڵمانەکانی بەکاردەهێنا. ئاساییانەش کۆمیتەی لێپێچینەوە کاتێک بڕیارەکەی خۆی لە ١٩٢٩دا لە کاتی "فەرمانەکانی ئەنجوومەنی" بڵاوکردەوە، ئەوەیان بە بێ چاوڕوونیکی لە ڕادەبەدەرەوە نووسیبوو، گوایە هەر موسڵمانەکانن بە تەنیا مافی ماخۆیەتی دیواری لاوانەوەیان هەیە هەروەک چۆن مافی خاوەندارێتی دیهاتی دەورووبەری ناوچەی دیوارەکەشیان هەیە. لەوێدا ئەوەیان جاڕدابوو: "بۆ جووەکان نییە کەڕەنا (کەڵەشاخی بەران[٤٢]) لە بەردەم دیواری لاوانەوەدا لێبدەن."

بەریتانییەکانیش ناسراون بە چاودێریکردنی قانون، ئەو نەریتە دینییەیان بە داری زۆر قەدەخەکرد. خۆ ئەگەر قانونیش ئەوە بڵێ، کە هەموو بەردەکانی دیواری لاوانەوەکەی کۆتەڵی پەرستگای عیبرییەکان هی مزگەوتی موسڵمانانە کە لەسەر کاولگەی کۆتەڵەکە ڕۆیان ناوە، هەڵبەتە قانون دژی شتێکە کە ئیدی نابێ داوای بکرێ. دابێکی پیرۆز؟ ڕاسپاردەکە لەسەر ڕەفەی ڕابردووی نەمریدا بهێڵدرێتەوە؟ بڕوانامەی مافەکان بە بەردە کۆنەکان دابدرێ؟ ئیدی کتومت هەر لەبەر ئەو هۆکارە دەبێ بەردە دێرینەکان لە جووەکان بسەندرێنەوە. ئای ئەو کەسانەی لەنێو جووەکانیشدا بوون چەند لە خزمەتی ئەو مەبەستدا بوون، کە هاوپەیمانییکی نارەچاوکراویان پێکهێنابوو لەوانەی بە لوتبەرزانە خۆیان بە پێشکەوتوخواز هەڵدەدایەوە گوایە چەند سەر مەڕێکی ڕەسەن لە هەموو بەردەکان شایستەترن.

بەڵام خۆ هەر خودی بەردە دێرینەکان ئەو هیچوپووچییە بە بەزەییانەی "پێشکەوتنخوازان"ی ڕەتدایەوە، کە هەوڵی دەدا هاوزوڕنای بییانییەکان قەوانی هەڵوەدایی "ئازادبوون لە زێدەمافە کۆنباوەکان" لێبداتەوە. بەردەکانیش بێدەنگ نەبوون. ئەوان هەرچەندە نەشگریان، بەڵام چرپاندییان. ئەوان بە هێمنی دوان، لەو ماڵە دوان کە ڕۆژگارێک لەوێ بووە، ماڵی پاشایەک کە بۆ نوێژەکانی لەوێ کڕنوشی بردووە، ماڵی ئەو پێغەمبەر و مژدەدەرانە، کە پەیامەکانی خۆیان لەوێ بە مراز دەخواست، ئەو پاڵەوانانەی لەوێدا سەریان نایەوە، ئای

[٤٢] ڕێتویلێکی دێرینەیی ئایینی جووەکانە لە بەردەم دیوارەکەدا بەکاری دەهێنن. وەرگێڕ.

چ مەشخەڵێکی گەورەیە، کە لەیەک کاتدا وێرانکەر و ڕۆشنکەرەوەشە، ئیدی مەشخەڵەکە لەوێدا هەڵکرا. ئەویش باری ماڵەکە بوو، ئەو ولاتەی بەخۆی و مژدەدەران و پاشاکان و جەنگاوەران هی ئێمەبوون بەر لەوەی بەریتانییەکان هەر نەتەوەش بووبن. ڕاسپاردەی ئەو گاشەبەردانە، پەخشکەری تیشکی خۆیەتین بەنێو وەچەکاندا.
هەر لە زووەوە، لە سەرەتای سالانی کۆیلایەتیدا، دیواری لاوانەوە کۆگای تاسە و پەرۆشی گەلەکەمان بووە. دەبا نەیگەیەنینە مایەی تەوسێکی هەرزەگۆیی باس "تەلیسمایەتی" بکەین . ئاخر دەنگی مێژوو تەلیسم نییە. بەڵکو هێزێکی مەزنی ڕاستییە. خۆ هەر ئەو دەنگەش بوو، حکوومەتی بەریتانیا خەریکبوو کپی بکا. ئەوان جاڕیاندا، کەوا جووەکان لەوە قەدەغەن شۆفار (کەڕەنا- ئامێری شاخی بەران) لە بەردەم دیواری لاواندنەوەدا لێبدەن. کاتێکیش جووەکان خۆیان لەم قەدەخەیە نەبان کرد -کە وەک شاگردە گەنجەکانی ژابۆتنسکی بۆ سێزدە سالی لەسەر یەک وایان کرد- ئەوان بە شێوەیەکی ناشرینانە، نامرۆڤانە و شێتانە بە دوایان کەوتن. من خۆم ئەو دیمەنە سەیروسەمەرانەم لە ڕۆژی گوناح پاکبوونەوەدا لە 1943دا بینی کاتێک لەگەڵ دەستەیەک برادەردا لە بەردەم دیوارەکەدا درودمان دەخوێند.
ڕۆژ هەڵهات. کۆڕی ماتەمی جوان دەنگی بەرز بووەوە: ئەوەش نوێژی داخراو بوو لە بەردەم شوێنە پیرۆزەکە، کە لە هەمان کاتیشدا مەرگەساتێکی گەورە لە ئەوروپا لە ئارادا بوو... ئەوسا لە هەر دوو دیوی مەیدانەکەوە پۆلیسی بەریتانی بەخۆیی و تفەنگ و تۆپزی دەستیانەوە دەوروخولی نزاکەرەکانیان گرت. ئەوان لەنێو خواپەرستان وەستان، بە هەموو بوونی خۆیان لەوێ گەف و هەڕەشەیان لێکردن. ئەوان بەناوی پاشاکەیانەوە هاتبوون لێنەگەڕێن ڕەفتارێکی ناقانونیانە" بنوێندرێ" ڕەفتارەکەش لێدانی ئامرازی موزیکی شۆفار بوو لە شاباتەکاندا. لە کۆتاییدا کە نوێژکەران گەیشتن، ئەوان (پۆلیسەکان) پالیان نا تا بکەونە نێو ئاپۆرای خەلک، هەندێک بە ئانیشک تێهەڵدانەوە گەیشتنە بەردەم دیوارەکە. ئیدی سەرەڕای بوونی ئەوان لەوێ، دەنگی شۆفار بیسترا، تورەیی ئەوانیش لە جلەو نەدەهات. ئەوان لەسەر خواپەرستەکان وەستابوون، کاتێک هێشتا نوێژکەران لە پێشڕەوی خۆیاندا بوون. لێرەو لەوێ گوێ لە دەنگی

نـازونوزەی برینـداریک دەبـوو. دەنگـی سـروودی هاتیکڤـاش دەهـات. ئەوسـا پـۆلیس لە هەمـوو لایەکەوە پێوەربـوون و پاشـاگەردانی بـاڵکێش بـوو. لە کۆتاییشدا ئەوان کشانەوە.
ئەوێ شـەوێ، زۆر دڵ ڕووشـان لەوەی برینـدار بـن، ئـێمە لەلای دیـواری لاوانەوە وەسـتابووین، بە یەکـدیمان گـوت: "ئـا ئەمە بە ڕاسـتی کـۆیلایەتییە. ئەوەی سـتەمکارانی ڕۆمـانی نەوێـران بـیکەن، کۆمسـیۆنێرەکانی بەریتـانی کردیـان. ئەوەی باپیرانمـان لە بـاپیرە چەوسـێنەرەکانی ئەوان خۆشـنەبوون، تەنانەت گیـان و سەربەسـتی خۆشـیان لەسـەر دانـابوو، خەریـکە وەچەی لە دوای وەچە بەخۆیـان دەڵـێن لە دوا چەوسـاوە و یەکەمـین فریـادڕەس خـۆش ببن. گەلێـک گەر بەرگـری لە شـوێنە پیرۆزەکـانی نەکـا- یـان هەر هـیچ نەبێ هەوڵی بەرگریکردنیان نەدا- گەلێکی ئازاد نییە، هەرچەنـدە زۆریـش دەربـارەی ئـازادی کـاوێژ بکـا. گەلێـک کە بـوار بـدا بنکە پیرۆزەکـانی وڵاتەکەی یـان ئەوانەی هەسـتی هەرە پیرۆزییـان لایە بـن پـێ بکـرێ، ئەوا لە گیانیـانەوە کـۆیلەن. ئیـدی هەر لەوێـوە بڕیارمانـدا هەر کاتێـک کاتمـان هـات ئەو شـەرمەزاریەی سـەر گەلەکەمـان بسـڕینەوە، خۆ ئەگەر تینوگورمـان هەبـووایە لێـنەدەگەڕاین شـوێنە پیروزەکـان بەو شـێوە تونـدوتیژییە پێشـێل بکـرێ. لێنەدەگەڕاین جێنوێژ و شوێنە پیرۆزەکان و ڤیستیڤالەکانمان گڵاو بکەن.
لەسـاڵی نـوێی ئاینـدەدا[42] (دە ڕۆژ بەر لە ڕۆژی لە گونـاح پـاکبوونەوەدا) ئـێمە شـەرمەزارییەکە و بڕیـارەکەی خۆمـان بیـر خۆمـان هێنـایەوە. بڕیارمانـدا نـابێ جارێکی دیکە ئەم شتە ڕووبداتەوە، یـان ئەگەر رووشـی دایەوە نـابێ بێ تۆڵە بـڕوا. ئیـدی نەخشـیەکی ئـاڵۆزی تێکچڕژاومـان داڕشـت، کە هەر دوو لای دەروونـی و کـرداری لەخۆگرتبـوو. ئەرکەکەش درایە هێـزی پڕوپاگەنـدەی شۆڕشـگێڕی. هۆشداریشـمان دایە دەسـەڵاتی بەریتانییەکـان. شـەو لە دوای شـەو پۆسـتەرمان لە شـوێنە جیاجیاکـان بە دەقـی جیـاوازی ڕوونوئاشـکرا دەربڕی و هۆشـدارینامەکانمان بڵاوکـردنەوە. ئەوانەش دووپـاتکردنەوەی ئەو ئاگادارینامەمـان بـوون، کە جاڕنامەکەمـان بە عیبـری هەروەک چـۆن بە ئینگلیزیش بڵاوکردەوە.

---

[42] ساڵی نوێی جوو لە پایز دەست پێدەکا و بە سێپتیمبەر و ئۆکتۆبەردا گوزەر دەکا.

1 -لە ڕۆژی گوناح پاکبوونەوەدا، لە دیواری ڕۆژئاوادا، ژمارەیەکی زۆری جوو لەگەڵ گیانی شەهیدانی ئیسرائیل، ئەوانەی بوونەتە قوربانی دڕندایەتی ئاڵمان و ناپاکیتی بەریتانیا یەکدەگرن.

2 -بنەمای مرۆڤانەی شارستان ئەوە دەخوازێ، پیرۆزیی نوێژ و نوێژگا نابێ تێکبدرێ، هەروەها نابێ شوێنە پیرۆزەکانیش توندوتیژییان دەرهەق بکرێ.

3 -حکوومەتی بەریتانی بە شێوەیەکی کاتی دژی خواستی گەلی جوو لە نیشتمانەکەی خۆیدا جووڵاوەتەوە، بۆیە داوای لێدەکرێ دەست وەرنەداتە ئەو بنەمایانە.

4 -هەر پۆلیسێکی بەریتانی لە ڕۆژی گوناح پاکبوونەوەدا بوێرێ لە ناوچەی دیواری لاوانەوەدا دەربکەوێ و پشێوی بنێتەوە یان ڕێتوێلی دابونەریتەکە تێک بدا وەک تاوانبار سەیر دەکرێ و بەو هۆیەشەوە سزا دەدرێ."

ئاگادارینامەکانمان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دەدران، و تا دەهاتیش ڕۆژی پاکبوونەوەی گوناح نزیک دەکەوتەوە، مەراق و دڵەڕاوکێش لە ئورشەلیم و سەرتاپای وڵات پەرەی دەسەند. کەسیش نەیدەزانی ئاخۆ ئێمە چۆن بەرگری لە شەڕەفی خەڵکەکە دەکەین. هەندێکیان دەترسان نەوەک خوێنڕشتن و کوشتارگەیەک لە بەردەم دیوارەکە بکەوێتەوە. ئەوانی دیکەش مشتومڕیان بوو، کە ئەمە تەنها شەڕێکی دەمارگرژانەیە لەگەڵ بەریتانییەکان. ئەوانی دیکەش دیسان داوای چڕکردنەوەی چەکدارانەیان لە شارە دێرینەکەدا دەکرد. لە نێویشیاندا کەسێک هەبوو، خۆی ئاسا نوکتەی لەو بارەیەوە هەڵدەبەستا.

هەڵبەتە دەزگاکانی فەرمی جوو بە ناکارایی (پاسیڤ) لە شوێنی خۆیان نەمانەوە. وتارگەل سەبارەت بەو "شێتایەتیە تاوانباریەمان" بڵاوکرانەوە. وتارگەلی واش هەبوون کرداری بەدوای خۆیدا دەهێنا. سەرۆکی ڕابییەکانیش داوای کرد بەنووکە قەڵەمێک کارەکەمان "نەبوو" بکەین. ئیدی ڕابینەکان کاردانەوەیان لێپەیدا بوو. داخوازینامەیەک بڵاوکرایەوە، تیایدا گوترابوو لێدانی ئامێری موزیکی دینی شۆفار لە ڕۆژی نزیکبوونەوەی جەژنی لە گوناە پاکبوونەوە هیچ نییە لە دابێک زیاتر، بۆیە هی خۆ پێوەپابەند کردن نییە، بەم جۆرە بەهەر شێوەیەک بێ "قانونی وڵات قانونە و هەر ئەو دەیخوا..."

ئێمە لە بڕیارەکەماندا پاشگەز نەبووینەوە. ئێمە لەو ئەرکەمان ویژدان پڕبووین لەوانەیە زیاتر لە هەر قۆناخێکی یاخیبوونەکە بە جۆشتر بووبووین. بنگەی گریمانەکەشمان لەسەر ئەوە ڕۆنرابوو، ئێمە حکوومەتمان بەهۆی باری دەروونی، بەڵکو تەنانەت لەوە بەرەوژوورتریش سیاسیانەش خستبووە هەڵوێستێکی ناشیاوەوە: ئیدی دەبێ لێکەوتەی پاشەکشەی ئەوانی بەدواوەدا بێ. ئاخر پیرۆزی دیواری لاوانەوە بۆ هەمووان شتێکی حاشاهەڵنەگر بوو، هەروەها کارێکی ئاسانیش نەبوو بۆ حکوومەتێک خۆی بە شارستان بزانێ، لە بەرامبەر خوێنڕشتنێک بەهۆی چاودێری دابونەریتێکی ئۆلییانە خۆی بە بەرپرسیار بزانێ.

شتێکی سروشتی بوو، ئێمە نەماندەویست ئەو بەیەکدادانە بێتە گۆڕێ. ئێمە پلانی ئەو هەڵمەتە تایبەتمەندەیەمان زۆر وردەکارانە کێشابوو. بۆ دەستپێکی هەڵمەتەکەشمان، هێرشێکی سایکۆلۆژیانەمان هەڵدا، ئیدی بەهای کردەوەکە بۆ هەموو کەس ڕوونوئاشکرابوو، کە ئەگەر هەر شتێکی دەربارەی ڕەوشی شەڕ زانیبا. سەرکەوتنی تەواو هەندێجار دەکرێ بە چەکی دەروونی مسۆگەر بکرێ.

هەرچەندە هەندێک جاریش، ئەم چەکە ناکارایی خۆی دەسەلمێنێ. ئیدی ئێمە حیسابمان بۆ ئەو بارەش کردبوو. ئاخر دەمانزانی ئەگەر سەرباری هۆشیارییەکانمان و ترسەکەشیان، دوژمن لەگەڵ ئەوەشدا هەر هێزی پیاوەکانی خۆی بۆ بەردەم دیوارەکە بنێرێ، وەک ئەوەی لە ماوەی ئەو سێزدە ساڵەی ڕابردوو کردوویەتی، ئەوا ئێمە نابێ دەستبەجێ و لە هەمان شوێن تۆڵە بکەینەوە. ئاخر لەوێدا پیرە پیاو، پیرە ژن و منداڵ ئازاریان پێدەگا. لەم بارەشەوە ئێمە هەموو دەستکردنەوەیەکمان لەگەڵ دوژمندا بوو.

ئەوەش زۆر ڕوون و ئاشکرا بوو، هەرچەندە نیەتمان بەیەکدادانیش نەبێ لە بەردەم دیوارەکەدا، بەڵام ئەو شتە دەبێ نهێنییەکی لە درکان نەهاتوو بمێنێتەوە. بەهای هەموو هۆشدارییەکانمان کەوتبووە سەر ئەوەی دوژمن بڕوا بەوە بکا گەر ئەوان بوێرن لە دیوارەکە نزیک بکەونەوە، ئێمەش لە هەموو لایەکەوە دەستڕێژییان لێدەکەین و بەم جۆرەش قوربانی قورسی لێدەکەوێتەوە. بۆیە ئێمە ناچار بووین خۆپارێزبین لە دڵنیاکردنەوەی خەڵکە

مەراقەکە، بە هەر دوو ئاراستەکەیەوە، ئەوانەی نەفرەتیان لێدەکردین و بەدرەفتاربوون لەگەڵ ئەوانەی ڕاستگۆیانە لە مەراقدا مابوونەوە.
ئیدی ئێمە ڕاستیەکەمان لای خۆمان هێشتەوە، ئەوەش شتێکی زۆر ئاسان بوو. ئێمە بڕیارمان دا چەکی دەروونی تا ئەوپەڕی بتەقێنینەوە. خۆ ئەگەر نوشستی هێنا و دوژمن ئۆپەراسیۆن و گەمارۆدان و پەلاماردانی شوێنە پیرۆزەکانی دووپات کردەوە، بەڵام لەوێ چاوەڕوانی ئەوەشی نەدەکرد کە پەلامار نەدرێ. ئەوا لە شوێنی دیکەوە زەبری خۆمانی پێدا دەدەین، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەو و جیهان دەزانن، کە هەست و سۆزی گەلەکەمان بەبێ پەرچەکردار گڵاو ناکرێ. ئیدی بیرۆکەیەک هاتە پێشەوە بە شەو پەلاماری سەر بنکە و چەپەرەکانی پۆلیسی تیگرات[44] لە حەیفا، بێت داجان، خەلیلیا و کاتارا بدرێ. هەرچەندە وەک زۆر لە خەڵکی پێیان وابوو زنجیرە هۆشداریینامەکانمان بۆ ئەوە دانەڕێژرابوون، کە دوژمن هەڵبخەڵەتێنێ و لە مۆڵگە و چەپەرێکی نەگیراو پەلامار بدرێ. بە پێچەوانەوە، ئەو هێرشانەی کردمانە سەر قەڵا و چەپەرەکانیان دەستبەجێ وەک نەخشەیەکی تۆڵەکردنەوە بوون لە بەرامبەر گڵاوکردنی پیرۆزییەکانی دیواری لاوانەوە لە لایەن دەسەڵاتی منداتەوە.
هاوئامێزی چەکی دەروونی و نەخشەی کردەوەکە نوشستی نەهێنا. لە شەودا قەڵا و چەپەرەکانی تێرگات پەلامار دران، بەڵام هێرشەکان لە تۆڵەی کردەوەی بەریتانییەکان نەبوو دەرهەق دیواری لاوانەوە. ئاگاداریینامەکانمان کاریگەریی خۆیان سەلماند. جووە بەر سێبەرەکانیش کشانەوە. لە ڕۆژی لە گوناح پاکبوونەوە لە ١٩٤٤دا، بۆ یەکەمین جار لە ماوەی چواردە ساڵدا، پۆلیسی بەریتانی لە دیواری لاوانەوە نزیک نەکەوتەوە. ئەوان لە دوورەوە وەستان، بۆ پرسی ئاسایشیش ژمارەکەیان کەم کردبووەوە. ئیدی نوێژەکان بێ پشێوی بەڕێکران. دەنگی گەورەی کەڕنای شۆفار نەڕەی دەهات. دەنگدەرهێنەکە چیدیکە "قاچاغ" نەمایەوە. نەخۆی شاردەوە و نە دەمامکیشی پێچا. کەڕەناژەنەکە لەسەر قاچی وەستا بەخۆی و قامەتی تا هێزی تێدابوو فووی بە ئامێرەکەدا کرد و شۆفارەکە بووە کەڕەنای یاخیبوون.

---

[44] ئەو وێستگە پۆلیسیانە بوون کە لەسەر ڕێنمایی سێر جێمس تەگرات لەسەر تاسەری وڵات لە ئاشووبی عەرەبەکان لە 1936-1939دا بڵاوکرابوونەوە.

## 8

لەگەڵ تاوسەندنی خەباتدا، تا دەهات کار و چالاکی هێزی پروپاگەندەی شۆڕشگێڕانە دژوارتر دەبوو. پۆستەر هەڵواسەکان چەکدار نەبوون. ئێمە چەکەکانمان بۆ پەلاماری سەربازانە دانابوو. بەڵام هەیتە و پۆلیس و بەدواداگەڕی بەریتانی چەکدار بوون. بۆیە زۆر جاران کاری پۆستەهەڵواسین تەقەکردنی بەدوادا دەهات. لەوێدا پۆستەهەڵواسی وا هەبوو، بەیاننامەی بەخوێنی خۆی بە دیوارەکاندا هەڵواسی. یەکێک لەوان، ئاسیر ترانتەر گەنجێکی قۆزی خۆشەویست نەوەک هەر لە کاتی چالاکیەکەیدا بریندار بوو بەڵکو لەخوێنی خۆیاندا گەوزاند.

ئاخر ئاشیر ترانتەر قوتابیەکی پۆلی نۆهەم بوو لە قوتابخانەی باڵای حەیفا. ئەو هەر لە سەرەتای یاخیبوونەکە هاتە ریزی ئیرگون و رەگەڵ تیمی بەرەی پروپاگەندەی شۆڕشگێرانە کەوت. شەوێکیان، لە کاتی پۆستەر هەڵواسیندا پۆلیسێک تەقەی لێکرد و لە نێکی درا و بریندار بوو. تۆبڵێی ڕژێمێکی شارستان چی لە پیاوێکی بریندار بکا، تەنانەت گەر دوژمنیش بێ؟ من بەداخم کە هەندێ ئەفسەری بەریتانی تیماری برینداڕەکانی ئێمەیان نەکرد، وەک ئێمە لەباری ژێرزەمینیماندا بە دەستی خۆمان تیماری برینەکانی گیراوەکانی ئەوانمان دەکرد. نە دکتۆر پشکنینی بۆ ترانتەر کرد و نە ڕەوانەی تیمارخانەش کرا. بەم حاڵە لە زیندانی عەککادا فڕێدرا تا هەر بۆ بەختی خۆی بناڵێ. ئیدی برینەکە هەوی کرد و لێی بووە تیراوە. هاوزیندانییەکانی برینەکەیان پێچایەوە. کورەکە دەبوایە برینەکەی بە کراسی بەری بسڕیبایەوە. پاسەوانەکانیش لەسەر بەدڕەفتارییان بەردەوام بوون. رابی (بلەم) کە دەسەڵاتداران ڕێگەیان پێدابوو زیندانییەکان ببینێ، پێیڕاگەیاندم، سەرنجی بەریتانییەکانی لەبەد حاڵی زیندانییەکە ئاگادارکردبووەوە. ئەوانیش تەوسئاسا وەڵامیان دابوویەوە: 'رابی هەقە خۆی بە گیانی گیراوەکان تەرخان بکا، نەوەک بە جەستەیان. بیرت لای کارەکەی خۆت بێ.'

هێشتاش ورە و گیانی ئاشەر تێکنەشکابوو، بەڵام جەستەکەی داهێزرابوو. کاتێکیش لە دواییدا پزیشکی زیندانەکە گەیاندرابووە سەر، ڕایگەیاندبوو کە خوێن ژاراویبوونێکی زۆری لێ پەیدابووە و ئیدی کوڕەکەیان ڕەوانەی نەخۆشخانە کرد. بەڵام کارلەکار ترازابوو. تەنانەت قاچ بڕینەوەش دادی نەدا.

دوای چەند هەفتەیەکی بە سفتوسۆ لە زیندانی عەککا و نەخۆشخانەی هەیفادا، بۆ دواجار چاوەکانی لەیەک نان.
ئاشیر یەکێک بوو لە جەنگاوەرە مێرخاسەکان، هەر جارێک بیر لەیاخیبوون و ئەو وەچە نازدارانە دەکەمەوە، کە لەپڕ گیانیان بەبەر نیشتماندا کردەوە، بیر لە ئاشەر دەکەمەوە. تۆبڵێی بۆچی ئەوان وا بەدڕەفتارانە لەگەڵیدا جووڵانەوە؟ بۆ کارێکی وایان کرد تا بە هێواشی و بە ئازارەوە بمرێ؟ من وەک کوڕی خۆم بۆ ئاشەر ماتەمبار بووم.

## 9

سەرتەتەری پەیامەکانی ئیرگون هێزی هێرشبەر بوو. تا ئەو کات و دوای ئاویتەبوونیش لەگەڵ یەکەی هێدمە ئەو ئەرکەیان لەئەستۆدا بوو کە "بە چەکێکی نوێ لە دوژمن بدەن بۆ ئەوەی ڕێسا بیانیەکانیان لەگرێژنە دەربهێندرێ." هێزی هێرشبەریش ئەو ئەرکەی لە ئەستۆ دابوو. ئەمەش بواری هەدادانی بە دوژمن نەدەدا: ئەوان دزەیان دەکردە نێو جەرگە قایمەکەی دامودەزگاکانی حکوومەتەوە. هێزی زاڵی بەریتانیش لەو بارەدا دادیان نەدەدا. ئیدی هەر زوو بنکە و باڵەخانەکانیان دەبوونە وێرانە. هێزی هێرشبەر دزەی دەکردە نێو قەڵا و چەپەرە قایمەکانی دوژمن. تەنانەت دیوارە قایمەکانی پۆلیسخانەکانی تیگراتیش بەرگەی زەبری هێزەکەمانیان نەگرت، شەمەندەفەرەکانیش تەقێندرانەوە، ڕێگاوبانی سەرەکی مینرێژکران، هەر زرێپۆش بوون لەو ڕێگایانەدا بەهەوادا هەڵدەچوون. دوای کۆتایی هاتنی جەنگ دژی نازییەکانی ئاڵمان لە ئایاری ١٩٤٥دا هێزی هێرشبەر ئاراستەی خۆی دایە لوولەکێشی نەوتی ئەنگلۆ-عێراقی و ئیدی هیچ حەجمانی لەبەر شادەماری ئابووری بەریتانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا نەهێشت. هێزی هێرشبەر دزەی کردە نێو مۆڵگەی سەربازی. جاری وا هەبوو لە ڕاگەیاندنی باری ناکاویشدا زەبری کوشندەیان لێداون. جاری واش هەبووە هەترەشی دوژمنیان بردووە و چەکەکانیشیان بەدەستکەوت هێناوە. هێزی هێرشبەر دابەزیە مەیدانی فڕگەکان و بەشێکی زۆری بۆمبی قورسیان تەقاندۆتەوە و هەر چرە دووکەڵیان لە دوای خۆیاندا بەجێهێشت. هێزی هێرشبەر دڵی ڕژێمی بەریتانی گوشی، عەرشی بارەگای سەرەکی هێزی چەکدارییان لەرزاند. هێزی هێرشبەر "بێڤینگراد" ئەو گێتۆ فەرمییانەی دەسەڵاتدارانی

بەریتانی دایانمەزراندبوو، کە بەشوورە و تەلبەند و ئاگر و ئاسن و چەکی قورس و هێزێکی سەربازی زۆرەوە پاراستبوو، تەقاندەوە. یانەی ئەفسەران لە خانووی گۆلدسمیس هاوس، بنکەی سەربازانی گەڕەکی سخێنلەر لە ئۆرشەلیم و بارەگا سەرەکیەکانی پۆلیس لە حەیفا، کە هەموویان لە نێو جەرگەی ناوچەیەکی سەلامەت پارێزراودا بوون، لەبن زەبری هێزی هێرشبەرمان هەر تەپوتۆز و دووکەڵ بوو.

هێزی هەڵمەتبەر بووە مایەی قانونی عورفی لە ئازاری ۱۹٤۷دا هەرەس بێنێ. دوای هێرشەکەمان بۆ سەر گۆلدسمیس هاوس، کە هاوکات بوو لەگەڵ چەند پەلامارێکی تێکدەرانە لە سەرتاسەری وڵات، دەسەڵاتداران جاڕی قانونی عورفیان لە ناوچە جوولەکەنشینەکان دا. شارە گەورەکان لە لایەن هێزی سەربازییەوە گیرا. هەر هەرێمێک داخراو لەوەی دیکە دابڕێندرا. هاتووچۆی هەموو باربەرێک وەستێندرا. پۆست و ڕاگەیاندن و پەیوەندییەکان لە شوێنی خۆی چەقی. رووت لە هەرکوێیەک کردبا، هەر بازگەی سەربازی بوو. ئیدی قانونی عورفی بوو!

بەڵام خۆ هێزی هێرشبەر هەمیشە هەر چوارچێوەکەی کون دەکرد. پیاوەکانی هێزەکە کە گیدۆن و شیمشۆن رابەرایەتیان دەکردن، وەک مەشخەڵ بەنێو وڵاتدا هەڵبوون. نزیکەی بیست ئۆپەراسیۆن لە ماوەی قانونی عورفیدا کرا. لەنێو ئەوانیشدا پەلاماردانی وێستگەی ڕاگواستنی سەربازی لە نزیک ریشۆن لێ زایۆن؛ هێرشێک بە چەکی ڕەشاش و نارنجۆکی دەستی بۆ سەر سەربازگەیەکی نزیک هادێرا؛ پەلامارێک بۆ سەر دەورییەکی گەڕۆکی سەربازی لەسەر ڕێگای سەرەکی بێت لید؛ زۆر پەلاماری دیکە بۆ سەر ئەو بازگە و گەڕیدگەریە سەربازییانەی سەرێگای بێت لید و کاروانی ترومبێلی سەربازی لە باشوور؛ هێرشێک بە چەکی شێلکەهاوێژ و نارنجۆکی دەستی و هاوەنی دوو ئنجی بۆ سەر سەربازگەیەکی نزیک کفر یۆناه؛ هێرشێک بۆ سەر هێزێکی گەڕۆکی سەربازی لەسەر لێوارەکانی رووباری یارکون. سەربازگەی هادەریاش پەلاماردرا و تەقێندرایەوە؛ دەوریەیەکی سەربازی لە دوڕیانی رۆش هایان-لێدا کەوتە بەر پەلامار؛ لوولە نەوتییەکان لەسێ شوێن لە حەیفا سێ شوێنێش لە کفر هاسیدیم تەقێندرانەوە.

لیستەکەش هەر تەواو نەدەبوو. هێرشەکەش بە پەلاماری سەر قەڵا و چەپەری دوژمن لە شخێنەر هاوس تاجی لەسەر نرا. لەوێدا کورەکان دەبوایە لەژێر ئاگری قورسی رەشاشدا دیواری قەڵاکە بتەقێننەوە، ئینجا ڕێگای خۆیان بەنێو تەلبەندی بەرگریدا ببڕن، ئەمەش هەمووی هەر لەبن ئاگری دوژمندا، ئەوسا بۆمبە تەقێنەرەوەکانیان لە شوێنی مەبەست دابنێین و لە ناوچەکە بکشێنەوە، کە دیارە لەوکاتەشدا بە تانک و زرێپۆش دەورە دەدران. سەرباری ئەو هەموو دەردەسەریەش کورەکان هێرشەکەیان وەک چۆن نەخشەی بۆ دارێژرابوو بەجێگەیاند، لەوانەیە بەدەر لە ئۆپەراسیۆنی زیندانی قەڵای عەککا، ئەمەیان لە هەموو ئۆپەراسیۆنە ژێرزەمینیەکانی عیبری بوێرانەتر بێ لەوانەشە لەنێو هەموو کاری ژێرزەمینیشدا هەروا بووبێ. بارگە و بنەکەکانی هێزی داگیرکەر فڕیە ئاسمان و کورەکانیش بە سەلامەتی گەرانەوە شوێنی خۆیان. تانک و زرێپۆشەکانیش ڕێیان پێگیرا. ئەوان لە لایەن هێزەکەی ئێمەوە وەستێندران، بەشێکیان لە ڕێی تفەنگی بێرنەوە، بەشێکیش لەترسی بنەتەقە شەوقدەرەکانمانەوە. ئەرێ ئەو بنەتەقانە چی بوون؟ ئەوان قووتووی تەنەکە بوون، بە پیتی درەوشاوەی ئینگلیزی لەسەریان نووسرابوو بنەتەقە Mines. لە ڕاستیشدا ئێمە نەکات و نە ماددەی پێویستمان لەبەردەستدا نەبوو، هەموو جارێکیش هەر لە تەقەمەنی پڕنەدەکران. بەڵام ئاسنەکە ڕاستی بوو!

تەنانەت دوژمنیش، نەیدەزانی لەباری تەقەمەنیەکان کورتمان هێناوە، ناچاربوو بە ئازایەتی کورەکانمان بزانێ. فەرماندەی هێزی بەریتانی لە ناوچەی ئۆرشەلیم بە ئەفسەرێکی پلە خوارتری خۆی گوتبوو: "ئەوان هەروەک کۆماندۆکان دەست دەکەنەوە."

مستەر گێرشۆن ئاگرۆنسکی سەرنووسەری فەلەستین پۆست شتێکی وای بەمن گوت: "خۆ ئەگەر لە نێو ئیرگوندا کورگەلێک هەبن لە سەعات دووی بەیانی ئامادەی پەلامار بن، ئەوا ئیرگون لە هێزی کەم نییە."

هێزی هێرشبەر پێش و پاش نیوەشەو لەسەر پەلامارەکانی خۆیان بەردەوام بوون. ئەو هێزە پێوەری ئۆپەراسیۆنەکانی بە گەورە و بچووکیانەوە شکاند. هەندێکیان ناویان هات، ئەوانی دیکەش باسیان دەکەم. ئەو ئۆپەراسیۆنانە بەشێک بوون لە مێژووی میلیتاری گەلی جوو. هێزی هێرشبەر هەر بە

دۆزی کتومت دیاریکراو رازی نەبوو، لەسەر ئاستی تاکەکانیش هێرشیان دەبرد. ئەوان شەڕی رووبەڕوو و دەستەویەخەیان لەگەڵ هێزەکانی دوژمندا کرد، یەکەمین شەڕی پارتیزانی هێزی عیبری دژی چەوسێنەران و هێزی داگیرکەر لە دوای شۆڕشی هاشمۆنین ئەوە بوو کە هێزەکانی ئێمە کردیان.
هێزی هێرشبەر ئەوەی بەجێ گەیاند کە لە 1944دا لەسەر زار و وشەکانی خۆی بەڵێنمان بە چەرچڵ دابوو: "ئێمە لەسەر زیخەڵان و ڕێگاوبانەکاندا دەجەنگین؛ ئێمە لە گرد و دەشتەکاندا شەڕدەکەین؛ ئێمە لە شار و دێهاتدا دەجەنگین؛ ئێمە لەسەر شەقام و لە نێو خانووەکانیشدا دەجەنگین؛ ئەگەر تەنهاش بووین هەر دەجەنگین، تەنانەت ئەگەر بەرخودانەکە بۆ چەندان ساڵیش درێژە بکێشێ."
تاکتیکی شەڕەکانی هێزی هێرشبەر لەسەر بنەمای ئەوپەڕی لەخۆگرتنی هۆکاری سەرسامی و ناکاو، بەکارهێنانی هێزێکی کەم بۆ تەقینەوەیەکی گەورە دانرابوو. لەچاو بەیەکەوە گرێدانی ئەو دوو هۆکارانەی سەرەوە، هێزی میلیتاری ڕاستی لە ئێرتز ئیسرائیل لەسەرپێی خۆی وەستا. هێزەکانی چەوسێنەر ئیدی بەشە و بە ڕۆژ حەجمانیان لێبڕابوو. بۆ ئەوان شتێکی ناخۆش بوو کە ئۆپەراسیۆنەکان لە بەرەوپێشچووندا بوون؛ هەروەها کاتێ ئۆپەراسیۆنیش نەبوو هەر بۆیان باش نەبوو، چونکە ئەوان هەر چاوەڕوان بوون، ها لە ناکاو شتێک دەقەومێ. کۆئەندامی دەمارییان دەکرێ بە پیانۆیەکی شکاو بچوێندرێ: تۆ دوگمەیەک دادەگری، کەچی لە هەموو دوگمەکانەوە هەراوزەنای ناساز دەردەچێ. ئێمە پەلاماری بیست مۆڵگەی بەریتانیامان هەر لە خۆڕا نەداوە بۆ ئەوەی لە یەک تێگەیشتنێکی تیژ و خێرا لەنێو هەمووانیدا بوروژێنین. ئەوە بۆ ئێمە بەس بوو پەلاماری ئامانجێک بدەین کە بەشەو ترسوبیمی بەدواوە بێ و بە ڕۆژیش ئاسان نەبێ ئاخۆ چییان لە چاوەڕوانیدایە.
هێزی هەڵمەتبەر گەیشتبووە بەرزترین پلەی لێهاتوویی لە قۆستنەوە و بەکارهێنانی پەلاماری لەپڕ و لە ناکاو، تەقاندنەوەی ڕێگا، تەقاندنەوەی شتەکانیان لەو کاتەی کە هەر لە چوونیان تا کشانەوەشیان لە ژێر ئاگری دوژمندا بوون. ژەنەراڵ کەنینگهام گلەیی ئەوەی هەبوو گوایە ئێمە شێوازەکانمان لە ئاڵمانەکان فێربووین، ئەوەش لەروی کردەیەوە ئەستەمە

بەر بە دەستەیەکی وا بگیرێت، کە لە لایەن کەسانێکی سەرکێشەوە ئەنجام دەدرێ. ئێمە ئەو شێوازە لە ئەوانی دیکە فێرنەبووین. ئێمە خۆمان خۆمانمان فێرکرد، ئەزموونیش باشتری فێرکردین. ئامادەبوون بۆ قوربانیدان پەرجو دەئافرێنێ. بەڵام خۆ ئەوەش راستە، هێزێکی چەکدار بەئاستەم بەری کردەیەکی هاوکاری گرووپێکی دزەکەر و گرووپێکی پاڵپشتیان پێدەگیرێ. کاتێکیش نوشستیمان لە کردەوەیەک دەهێنا، ئەوا خەتای بەد خەملاندنمان یان بەختی کوێرانەمان بوو.

هێزی هێرشبەر هەموو رۆژێکی هەفتە بەدەر لە شابات پەلاماری خۆی هەرهەبوو. ئیرگون دابونەریتی دینییانەی جووانەی لەبەرچاوگرتبوو، ئەو لەبەرچاوگرتنە هەر لە رۆژگاری داڤید رازیلی دینداری لەخۆبردوە هاتبوو. ئێمەش بڕوادار بووین. ئێمە بڕوامان بە یەزدانی مەزن هەبوو، بڕوامان بە ئەرکەکەمان و دادپەروەری دۆزەکەمان هەبوو. هەرچەندە دەشمانزانی خەباتەکەمان پابەندبوونە و لە شەباتیشدا ڕێپێدراوە، بەڵام بە گشتی لەگەڵ ئەوەدا بوو لەم رۆژەدا پشوو بە چەکەکانمان بدەین. بەریتانیەکانیش ئەمەیان دەزانی، بە بەرەنجامیش زیاتر لە شابات بەرەو جوو دەهاتن لەوەی لە رۆژی یەکشەماندا بەپیریانەوە بێن.

بەڵام خۆ چەند ژمارەیەکی ڕیزپەڕی ئۆپەراسیۆنیش هەر هەبوون. یەکێک لەوان پەلاماری یەکەمین "زۆنی ئارام" ی ئۆرشەلیم بوو. ئەم ئۆپەراسیۆنەیان بە نوێژی نیوەرۆ لە شاباتدا کرد، چونکە هەر لەو کاتەدا دەوروبەرەکە بە بەراورد لەگەڵ کاتەکانی دیکەدا لە شارستانەکان بێ جموجۆڵتر بوو. لە کاتی ئەو پەلامارە تەواو غافڵگیرییەدا، دوو کەسی دیار و گرنگی بەریتانی لە مەیدانی تێنسدا لە "زۆنی ئارامدا" تێنیسیان دەکرد. ئەوانیش گورنی بەرپرسی ئاسایشی حکوومەتی فەلەستینی و فیتزگێرالد بەرپرسی دادوەری بەریتانی بوون. هۆمەر بیگارت پەیامنێری لێهاتووی نیو یۆرک هیرالد تریبیون، بەتەوسەوە نووسیبووی کاتێ ئەو دوو جوامێرە گوێیان لە تەقینەوەکان بوون، ئیدی لە یاریەکەی خۆیان وەستان.

## بەندی 7
## ئاشکرایی ژێرزەمین
## ١٩٤ - ١٧٠

دەزگای هەواڵگری بەریتانی دامەزراوەیەکە بە ئەفسانە وەرپێچراوە. تۆ بڵێی کێ هەبێ گوێی لە دەستکەوتەکانی نەبووبێ؟ ئەفسانەکەش لە وەچەیەکەوە بۆ یەکێکی دیکە، لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە، لە پارزەمینێکەوە بۆ یەکێکی دیکە گواستراوەتەوە، تا وایلێهاتووە هەندێک وا بڕوا بکەن، دەزگای هەواڵگری بەریتانیی هەمەزان و بێ هەڵەبێ. ئەوانەی حەزیان لە بڵاوکردنەوەی ئەو چیرۆکانەیە، دەزانن کە سوسەکاری (سیخوڕی) هەروەک لە جەنگدا، ئەفسانەی سەرکەوتنە و هەر خۆی لەخۆشیدا سەرکەوتنێکە بۆ خۆی. لەگەڵ ئەوەشدا هێزوتینی هەواڵگری بەریتانیی هەر لە ئەفسانەییدا نەماوەتەوە. ئەم دەزگایە، دەکرێ بسەلمێندرێ، هۆکارێکی زل و کەتەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان بووە. ڕێکخەری ئەزموونی کەڵەکەبووی سەدەکانە.

کەچی لە ماوەی یاخیبوونەکەی ئێرتز ئیسرائیل نە مەزنایەتی ئەزموونەکەی و نە سەرچاوە بەرفراوانەکانی دەزگای هەواڵگری بەریتانی ئەوەندە زۆری بە کەڵک نەهاتن. ژێرزەمینیی عیبری گورزێکی باش و کەمەرشکێنی لە هەواڵگری بەریتانیدا دا. ئێمە سەلماندمان، دەزگاکەیان نە هەمەزان و نە هەڵەنەکەریشە. ئێمە باڵەکانی ئەو ئەفسانە نەخشێندراوەی دەوروخولی ئاژانە نهێنییەکانی ئەوانمان تێکوپێک شکاند. ئێمە سەلماندمان کە هەر زۆریشیان گەلحۆن، تەنانەت لە بیرکردنەوەشدا زۆر تەمبەڵن و ئەوەندەش سەخت نییە وایان لێبکرێ بخزێندرێنە نێو بارودۆخی دەستەیەکی کوێر، کە لە تاریکایدا پەل بکوتن.

ئەرێ بۆچی دەزگای هەواڵگری لە وڵاتە بچکۆلەکەماندا نوشستی هێنا؟ یەکێک لە هۆکارەکان دابی بیرکردنەوەی دەزگاکە بوو بۆ دزەکرنە نێو دوژمنی ژمارە یەک لەو خەیاڵپلاویەی هەیانبوو. نووسینگەی کۆلۆنیالی بەریتانیی لەوە ڕاهاتبوو بەسەر گەلە دواکەوتوەکاندا زاڵ بێ. لەنێو ئەو

گەلانەدا ئاژانی وا ئاسان لە سۆنگەی پارە یان خواردنەوە پەیدا دەکرێن. هەندێک کەس پێویستیان بە -یان حەزیان- لە پول و پارەیە. هەمیشە چاوی لەوەیە لە ڕێی پێشنیازی دۆستایەتیەوە داوای "کۆمەک" یان "موچە" بکا. ئیدی دەستی کراوە مستی خۆی دروست دەکا. یەکەمین بەشی زانیاریی دێتە ناو. ئەوسا بۆ پارەی زیاتر زانیاری پتری بە دوادادێ. خۆ ئەگەر زانیاریەکانیش هەڵنەڕژان، ئەوا شمشێری دیموکلیس لەسەر سەری قوربانیەکە دەوەستێ... ئینجا سەری قوربانییەکە ئاوڕی خۆی دەداتەوە. دەمی بەکرێ دەگیرێ. تازەش کارلەکارترازاوە چونکە کەوتۆتە نێو تەونەکە. بە هەموو هێزێکیشیەوە هەوڵ دەدا خۆی لە داوەکە ڕاپسکێنێ، تا دەربچێ و قوتاری بێ، بەڵام بێ سودە. لێرەوەش کەڵەگایی دەستپێدەکا. "خۆ ئەگەر زانیاری زیاترمان پێنەبەخشی، ئەوا لای برادەرانت پەردەت لەسەر هەڵدەدەینەوە." قوربانیەکەش دەکەوێتە دووڕیانێکی ناقوڵا. دارمانەکەی تا دێ لێژتر دەبێ. ئەو هیچ بژاردەیەکی لەبەردەستدا نامێنێ.

ئەو شێوازە، کە دەزگای هەواڵگری لە جیهاندا پێ مەعلان ببوو ، بە تەواوی لە ئێرتز ئیسرائیلدا هەرەسی هێنا. ئەوان زەحمەتییەکی زۆریان لەوەدا بینی، جووێکی سوسەکار (زانیاریدەر) بکڕن. ڕاستە لەوێدا دۆزگەلێکی ناپاکی بۆ پارە هەبوون، بەڵام ئەوان کەم بوون، بە گشتیش کەم بایەخ بوون.

خواردنەوەش لە ئێرتز ئیسرائیلدا دادی دەزگای هەواڵگری بەریتانی نەدا. ئاخر لەنێو یەهوددا سەرخۆشێکی کەم یان هەر نین. بە پێچەوانەوی ئارسەر کوستلەر، پێموایە بێداری (ناسەرخۆشی-نامەستی) بەو ڕێژەی خۆی بەشێکە لە کەسایەتی شادمانی گەلەکەمان. کۆستلەر سکاڵای ئەوەی دەکرد بەڵکو ئەو بێدارییەی جوان نەبوو بکرێ[45]. ئەو مشتومڕی ئەوەی لەگەڵدا دەکردم، وەک کاری دیپلۆماسییانە ئاسابیە سەروسەودات لەگەڵ خواردنەوەدا هەبێ، نەخواردنەوە (نەتوانین بۆ خواردنەوە) بە هەندێک پێوەر سەلمێنەری ناتوانایی سیاسیانەیە. ئەوە ڕەنگبێ وابێ، بەڵام خۆ دەبێ ئەوەش بزاندرێ کە دیپلۆماسیەتی ویسکی دوو سەرەیە. یەکێکیان ئەوەیە بە ناچاری دان بەوەدا بندرێ سەرکردە جووەکان تا ئێستا لە سیاسەتدا لەبلەبان نین. هەروەها هۆکاری دیکەش هەن. هەر چۆنێک بێ، من بڕوام وایە زۆر شت هەن دەبێ

---

[45] مەبەست لێرەدا وەک نەبووی لێبکرێ، نەهێڵدرێ. (وەرگێڕ)

لەخەڵکانی دیکەوە فێریان بین، بەڵام خواردنەوە یەکێک لەو شتانە نییە. باشتر وایە ئەوانی دیکە لەو خۆدوورگرتنە (لە خواردنەوە) لە ئێمە فێربن.
هزری حوکمڕانی ئەزموونداری بەریتانییەکان ئەو ڕاستییەی بزووتنەوەی ژێر زەمینیی عیبرییەکانی سەنگین و بەهەند هەڵنەگرتبوو. لە بزووتنەوە ژێرزەمینییەکانی دیکەدا کەم نەبوون ئەوانەی لەسەر بنەمای سەرچڵی خۆشویستن نەوەک هزری پێشەنگ، پەیوەندییان بە ڕیزەکانیانەوە کردبوو. هەرچی لای ئێمەش بوو کەسانی "سەرچڵ"مان دەگمەن هەبوون، دەکرێ بڵێین هەر نەبوون. ڕیزەکانمان پڕی ئایدیالیست بوون، گیانی خۆیان لەسەر لەپی دەست دانابوو تا ژیانی کەسانی دیکەی پێ ڕزگار بکەن. ڕیچارد ماورەر، ڕۆژنامەنووسی ناوداری ئەمریکی و دۆستی گەلەکەمان، جارێکیان پێیگوتم؛ "من دەزانم کوڕەکانی ئێوە به چاوکراوەییەوە دەجەنگن."
ئەوەش قوڵایی ڕاستییەکە بوو. چاوەکانمان بۆ ژانوناسۆری گەلەکەمان، بۆ پێگەی بەهێزی نەیاران، بۆ تایبەتمەندی دژواری شەڕەکەمان، بۆ ئەو مەترسییە کوشندەیەی لە هەموو شوێنێک خۆی بۆمان مەڵاسداوە، کراوە بوو.
بە ڕۆژ و شەو ئێمە فشارمان دەخستە سەر ئەفسەرەکانمان و فەرمانمان پێدەکردن ئەوانیش بەسەر پلە و ڕیزەکانیان فشار بنوێنن، کە دوو دوژمنی سەرەکی نهێنی خۆیان مەڵاسداوە: کە پرسنیی[٤٦] و فشەکەرییە. پرسنی وا لێکدەدرێتەوە، لێدەرهێنانی نهێنییەکە لەو کەسەی دەیزانێ؛ فشەی لەخۆباییش ئاشکراکردنی شتێکە بۆ ئەو کەسەی کە نایزانێ. هەر دووکیشیان نەفرەتلێکراون. ڕێساکەش ئەوەیە: نە بپرسە و نە بیشیلێ. ئەوەی دەکرێ بزانرێ هەر بۆ ئەوانەی پێویستە زانرابێ زانراوە؛ ئەوانیش هەر ئەوەندە زۆرەی لێدەزانن کە پێویست بکا. لەوە زیاتر نایزانن؛ لەوانیش بەدەر کەس نایزانێ. ئەگەر تۆ بەمە قایل نەبی، بەڵام نەوەک هەر بەسەر خۆتدا، بەڵکو بەسەر هاوڕێکانیشتدا دەهێنی، ئەوەش نەوەک هەر لەسەر ئاستی تاکەکەسی بەڵکو لەسەر ئاستی تەواوی خێزانی جەنگاوەرانیش هەمان شتە.

---

[٤٦] مامۆستا مسعود محەممد لە کتێبە شاکارەکەی خۆی (ڕستمسازی پێوانە)دا ، وشەی پرسن، پرسنیی بەرامبەر curiosity ئینگلیزی و حب الاستطلاعی عەرەبی بەکارهێناوە. منیش لەو وشە جوانترو پاراوترەم نەدۆزیەوە. وەرگێر.

پەروەردەکەمان بە بەر بوو. هەواڵگرە بەریتانییەکان وایان لێهات زۆر گوێ هەڵبخەن. بەڵام هیچیان گوێ لێنەبوو. ئێمە دیوارێکی بێدەنگی مەحکەممان رۆنا. هەڵبەتە ناوناوەش کونی هەرتێدەبوو، بەڵام درزەکان کەم بوون. هەواڵگری بەریتانیی هەرگیز لەوەدا سەرنەکەوت دیواری ژێرزەمینیمان بشکێنێ و دزەبکاتە نێومان.

دیواری بێدەنگیی، گرنگترین هێڵی بەرگری ژێرزەمینیە، ئێمەی لە لێکەوتە شەرپێفرۆشتنەکانیش پاراست. وەک رێساش پیلانگێری و شەرپێفرۆشتن بە یەکەوە رێ دەکەن. ئاخر باری ژێرزەمینی لەسەر رووی زەمیندا نییە، لە بەلای ئاژانە شەرپێفرۆشەکان قوتاری بێ. زۆر کەم بزووتنەوەی ژێرزەمینی لە مێژوودا هەن بە هۆی شەرپێفرۆشەکانی دەرەوەی بازنەکەیان زەفەریان پێنەبرابێ. (B.O) رێکخراوی تیرۆرستی ژێرزەمینی سۆشیال-شۆڕشگێڕەکان لە رووسیای قراڵدا لە لایەن ئۆکهارنای پۆلیسی نهێنی قراڵییەوە زەبرێکی جەرگبڕی پێکەوت، ئەمەش لە رێی کۆمەکی ئاژانە زانیارییەخشەکان بوو، گرنگترین و ناودارترینیان هەر بە خۆی یەکێک لە سەرکردەکانی رێکخراوە ژێرزەمینییەکە بوو کە ئازێفی ناقۆلا بوو. باری ژێرزەمینی ئیرلەندیش زۆری بەدەست دزەکردنەوە ناڵاند. پارتی کۆمۆنیستی پۆلەندی بەر لە جەنگی دووهەمی جیهاندا کاری ژێرزەمینی دەکرد، لە راستیشدا لەژێر فەرماندەیی دەزگای پۆلیسی نهێنی حکوومەتی پۆلۆنیدا بوو! کۆمێنترن[47] ناچارکرا لقە پۆلۆنییەکەی خۆی هەڵبوەشێنێتەوە، چونکە لەبەر ناپاکی دارزابوو، نەوەک هەر لەنێو ریزەکانیدا بەڵکو لەسەرکردایەتیشدا گەندەڵ بوو.

سایەی قێزەونی شەرپێفرۆشەر، ئەو ئاژانەی بە مراز پەیوەندی بە ریزی شۆڕشگێرانەوە دەکا تاکو نهێنییان لێدەربهێنێ، یان ئەو ناپاکەی بەهەر هۆیەکەوە بێ لە هاورێکانی هەڵدەگەرێتەوە و دەچێتە باوەشی دوژمن، ئەو جۆرە کەسە لە باری ژێرزەمینی ئێمەدا فرێدراوەتە دەر. دەزگای هەواڵگری بەریتانی ئەوپەڕی توانای خۆی بەرکارهێناوە تا چاو و سوسەکار لەنێو ریزەکانماندا بچێنێ و ئەندامەکانی ئێمە بۆ خۆی کێش بکا. لەو هەموو ساڵانەی یاخیبوونەکەدا تەنها سێ حاڵەتی ناپاکی روویداوە، هەواڵگری

[47] کۆمێنترن (١٩١٩-١٩٤٣) کۆمۆنیستی نێودەوڵەتی، بە سێهەمین رێکخراوی نەتەوەناسیۆنالیش ناسراوە. وەرگێر.

دوژمن هەرگیز نەیتوانیوە کەسی خۆی لەنێو ئێمەدا بەبێ ئەوەی هەر زوو ئاشکرا بێ، بچێنێ. ئەوان هەرگیز لەو کارەدا سەرکەوتوو نەبوون- ئەوەش لە هەمووی گرنگتر بوو- کە کەسێکی پلە بالای ڕاستەوخۆ لەنێو پێگەکانی خەباتی ئێمەدا بچێنن.
دەزگای هەواڵگریی ئێمەش بە جۆش و خرۆش، لێبوردەییانە و کارامانە تێکۆشان. کۆمەکبەخشی ناونەدراو لەنێویاندا پۆلیسی جوو لەنێو دەزگای بەریتانییدا هەبوون، سەرکەوتووانە دزەیان کردبووە نێو مۆڵگەی دوژمن، بێئەوەی لێبگەڕێن دوژمن پەیان پێ ببا. لە بەرەنجامیشدا، بەگشتی ئێمە دەمانزانی ئاخۆ هێزەکانی حکوومەت بەنیازن چی بکەن. خەباتەکەش هاوواتای دەستەواژەی ژێرزەمینی نهێنی بوو. جیهانی دەرەوە بەیەکدادانی فیزیکی دەبینی. زەبرەکانمان بە ڕاستی بوون، ئێمە لەژێرزەمیندا نەخشەمان بۆ دادەنا، بەڵام جێبەجێکردنەکەی لەسەر ڕووی زەوی بوو، ڕووبەڕووش بوو لەگەڵ دوژمنی چەکدار. ئەوەی جیهان نەیدەبینی، بەیەکدادانی مێشکەکان بوو. ئەمەش لە قووڵایی ژێرزەمیندا بوو، بەڵکو شەڕە بڕیاردەرەکەی خەبات بووبێ بۆ ڕزگاری. بەریتانییەکان توشی کێشەی لەبارییەک هەڵنەوەشاندنەوەی ئێمە بوون بەڵکو بمان هاڕن. ئێمەش تووشی کێشەی هاڕینی ڕێساکانیان ببووینەوە تا لەباریەکیان هەڵوەشێنین. زۆرزانی دەزگای هەواڵگری ڕووبەڕووی هۆشمەندی بوەوە و زۆرزانیەکەش دۆڕاندی.
دژوارترین دۆخێک لەو جۆرەی زانیاریدان تێیکەوتبین، لە سەرەتای قۆناغەکانی یاخیبوونەکە بوو، ئەویش ناپاکیی تسۆرۆس بوو. ئێمە لەوە بەئاگابووین کەسێک لەنێوماندا یان پەیوەستە پێمانەوە، زانیاری بۆ دوژمنەکەمان دەبا. من پێشتر باسی دەستگیرکردنی ئەشتەر ڕازیل و هاوسەرەکەیم کرد، کەچۆن ترانسمیتەری ڕادیۆکەیان لە ماڵیاندا دۆزیبووەوە. ئەو گرتنانەی لە سەرتاسەری وڵات دوای ئۆپەراسیۆنەکانمان، شتگەلێک نەبوون مایەی سەرسامی و لەهیکەوە بووبن. ئەوانەی لێرەولەوێ گیران، کەسانێک بوون دیاربوو هەوڵی خۆشاردنەوەشیان نەدا. بەڵام ئەوەی بۆ ئێمە مایەی هێدمە بوو، چۆن بەریتانییەکان زانیان ترانسمیتەری ڕادیۆکە لە ماڵی ڕازیلە، بێ ئەوەی هەوڵی بۆ بدەن، پێش ئەوەی کاتمی واسمان لە بەرداست بێ کارێکی بۆ بکەین. "ئەوشتە" وەک لێکمان دایەوە "هەر دەبێ بەرهەمی

زانیارییکی نێوخۆ بێ؛ ئیدی بە دوای چاوەکانمان لەنێو کەسانی دوژمندا گەڕاین. زۆریشی پێنەچوو شوێن پێی سیمۆن تسۆرۆسمان هەڵگرتەوە.
بەڵام بەر لەوەی باسی تسۆرۆس بکەم، پێویستە ئاماژە بە باندۆری ڕەشبگیرییەکە بکەم کە نەوەک هەر لەسەر ئاپۆرای خەڵکی هەیبوو، بەڵکو کاریگەری لەسەر خودی ژێرزەمینییدا دانابوو. یاخیبوونەکە تازە سەریهەڵدابوو، ئیدی هێندەی زەبری یەکەم هەژێنەر بوو. حاشایی لەوەش ناکەم، لەو شەوانەدا خەوم لێنەدەکەوت. بەئاستەم کارم پێدەکرا. بەردەوام بیرم لە ماڵباتە دەستبەسەرکان دەکردەوە، نەخاسمە منداڵەکانیان. سەردانی هەندێکیانم کرد و خەم و ترسم لەچاویان بەدیکرد. خانم (رازیل)م بینی، ئەو داپیرە مەزنەی ئەو نەوە مەزنە، پرچی وەک بەفر سپی سپی ببوو، بەڵام ورەی هێشتا وەک کێو قایم مابۆوە. هەوڵم نەدا دڵی بدەمەوە. لێم پرسی ئاخۆ چۆنە. ئەویش سوپاسمی کرد، بە هێمنی و حەوسەڵە و شکۆی کەسێک، بڕوای بە خواوەند هەبێ کە گیان دەبەخشێ و دەیباتەوە، دەکرێ جارێکی دیکە بیگێڕێتەوە: "بڕوانە، لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا دیسان ماڵەکەمان وێران بوو."
ئێمە بووینە دەسکەنەی فشار. بایەکەش لە زۆر گۆشە و کەنارەوە هەڵیکرد. هەمووان داوایان لێکردین هەوڵی ڕزگارکردنی گیراوەکان بدەین بە تایبەتیش ئەشتەر. لەگەڵ فشارەکانیش کێشەیەکی هزریش پەیدابوو. تۆبڵێی ئێمە مافی ئەوەمان هەبووبێ ببینە مایەی ئازار و چەرمەسەری بۆ خەڵک و خێزانەکانیان؟ ئەرێ ئێمە مافی ئەوەمان هەیە ئازادی و ژیانی ئەوانە بخەینە بەر مەترسی و هەڕەشە؟ ئەرێ چۆن لەوە دڵنیا بین، داری ئازادی خەباتەکەمان بەر بدا؟ تۆبڵێی کێ بێ نەکەوتبێتە بەر زەبری ئەو دادگاییە ویژدانییەی کە هەرگیز بەتەواوی کاریگەرییەکەی تەواو نابێ.
برادەرەکانم یارمەتیان دام بەسەر ئازاری دوودڵیدا زاڵ بم. ئەوان بەدەنگەوە پێیان گوتم، کەوا دەنگی ناخ دەچرپێنێ: "ئەی هەر یەکێک لە ئێمە ئامادە نییە ئازادی یان ژیانی خۆی لەسەر دابنێ" هەروەها ئەوەشیان بۆ زیادکرد: "ئەرێ ئەوانەی لە دەرەوە لە ژێرزەمینیدان، ئەوانیش لە زینداندا نین؟ لەوانەیە زیندانەکەیان لەوانەی لەپشت تەلبەندەکانیش قورستر بێ. باشە ئەلتەرناتیف چییە؟ ئایا ئێمە خۆمان لەگەڵ کۆیلایەتی ڕابێنین؟"

ئەو کێشمەکێشە ویژدانییە، کە لە سەرەتای سەرهەڵدانی یاخیبوونەکەماندا بەرپابوو، تەنها لە باری ژیانی ژێرزەمینیماندا کۆتایی پێهات. هەڵبەتە سروشتیانەش هەروا ڕۆیشت. خۆ پێویست نەبوو ئەفسانەی پیاوی ئاسنین دروست بکرێ. ئاخر گیانی وا کوا هەیە، هەر بە دوای رەق و زبریدا بگەڕێ. پووکانەوەیەکی سروشتی لە قووڵایی هەستەکانی ئادەمیزاددا سەلمێنەری کەسایەتییەکی بەهێز نییە. خۆ ئەگەر شتێکی واش "دڵێکی لە پۆڵا" هەبێ، یان وایلێهاتبێ، ئەوا ژانوناسۆرێکی گەلێک قورسی لێ دەخوازێ.
لەگەڵ ئەو کێشە هەناوییەدا، کە لەگەڵ هەر قوربانییەک و هەر فەرمانێکی نوێی دوژمن سەری هەڵدەدا، ئیدی پرسەکە دوای ڕۆژانی یەکەمین گرتنەکان بڕیاردەر بوو. ئێمە لەبەر فشارەکان نەچەمواینەوە. ئەوەمان ڕەتکردەوە هەوڵی ڕزگارکردنی گیراوەکان بدەین. بە برادەرەکانمان گوت:
"ئێمە پارێزەر بۆ ئەو کەسانە دەگرین. تا ئەوپەڕی توانا هەوڵی یارمەتیدانی خێزانی گیراوەکان دەدەین. بەڵام هیچ هەوڵێکی نزیکبوونەوە بە فەرمی و نیمچە فەرمییشەوە لە دەسەڵاتداران نادەین. تەنانەت هەوڵی ئازادکردنی ئەشتەریش نادەین. لێرەدا هیچ دانوستانێک سەبارەت بە ئازادکردنی گیراوەکان نادرێ. نە شەڕ بەبێ کۆستکەوتن دەکرێ، نە هیچ یاخیبوونێکیش بێ گرتن و ڕاوەدونان دەبێ. هیچ ئازادیش بێ قوربانیدان نییە. ئێمە هەموو دەبێ لە تاقیکردنەوەکە دەربچین. دەنا دوژمن خاڵی لاوازمان دەدۆزێتەوە، فشارمان دەخاتەسەر، بەڵێنمان پێدەدا، کەڵەگاییمان بە سەرەوە دەکا، شەرمان ودەکا و ناموسمان دەبا."
ئێمە لەو هەڵوێستەمان دانەبەزین. لە میانەی یاخیبوونەکەدا سەدان و هەزاران لەنێو ڕیزەکانماندا گیران، بەڵام ئێمە هەرگیز دەرهاویشتەی "بیست و نۆی حوزەیران[48]"مان بەسەردا نەهات...
وەک هەر بارێکی ژێرزەمینی ئێمەش ناپاکمان لەنێودا هەبوو. تسۆرۆس هەرگیز ئەندامی ئیرگون نەبووە. بۆ ماوەیەک ئەو لە دەزگایەکی فەندا کاری دەکرد، ئیرگونیش لەو دەزگایەوە کۆمەکی دارایی دەکرا. هەر ئەمەش وای لێکرد بکەوێتە پەیوەندی لەگەڵ کەسە چالاکەکانی ئیرگون و هەندێکی

[48] لە 29ی حوزەیرانی 1946دا دەسەڵاتدارە بەریتانییەکان ژمارەیەک سەرکردە و کاربەدەستی زایۆنیستی و ئاژانسی جوولەکانیان گرتن، لە بەرئەنجامیشدا بەوە ئازادکران کە دەست لە شەڕکردن هەڵبگرن بەتایبەتیش هاگانیان لە مەیدانی خەباتەکەدا کێشایەوە.

دیکە کە پێوابوو چالاکن. زۆریش سەختە بزانرێ ئاخۆ کتومت کەی کلکی لەگەڵ پۆلیسی نهێنییەوە گرێداوە و بۆتە ئاژانیان. (تسۆرۆس) قومارچی بوو، حەزی لە ڕێکپۆشی بوو. ئەو پارەی پێدەویست، دیاربوو ترسنۆکیشە. جارێکیش کە قاچی هەڵخلیسکا تا خوارەوەی گردەکە غلۆربووەوە. کاتێکیش زمانی لەوەدا کە ترانسمێتەری ڕادیۆکە لە ماڵی ڕازیلە، ئەو کەوتبووە نێو تەونی دەزگای هەواڵگری. چەند هەفتەیەک دواتر لیستێکی ناو و وەسف و ناوونیشانی دایە دەست کارلینگ، بەرپرسی هۆبەی جوولەکە لە هێزی پۆلیسی سەربازی بەریتانی. لەنێو ئەو ناوانەشدا یاکۆڤ مێریدۆر هاتبوو. زانیارەکە بۆ کاتی خۆی دروست بوو، یاکۆڤ ئەو کات لەبەر تاوی ئازاری دومەڵ دەیناڵاند. لێ تەنانەت ئەو زانیارییە وردەش نەبووە مایەی دەستگیرکردنی جێگری فەرماندەی ڕێکخراوی ئیرگون زڤای لیومی. پۆلیس هاتە شوێنی کاری "مستەر هۆنیگس" بەڵام "مستەر هۆنیگس" لە کاتی خۆی لەوێ نەمابوو. بۆ ماوەیەکی درێژ دوای ئەوەی بەریتانییەکان هۆی پەشیمانی خۆیان هەبوو، "مستەر هۆنگیس" بە ئازادی دەسوڕایەوە.

شتێکی باوەڕنەکراوبوو، سوسەکاران ئەوەیان بەهەند هەڵنەگرتبوو، کە دومەڵ (زیپکە) دێت و دەڕوا، بەڵام ئەوان هەر بەدوای کەسێک دەگەڕان کە لەسەر کەپووی زیپکەیەک هەیە. ئەوەش هیچ مایەی دوودڵی نییە، ئاخر کاتلینگ هەر بە تەنها لەڕێی تسۆرۆس گەر هاتبا و نووسینگەیەکی هاوبەشی زانیاریی بە دوادا نەبایە، دەستی بە مێریدۆر ڕانەدەگەیشت.

بە بەدەست گەیشتنی لیستی تسۆرۆس، کاتلینگی دەسەڵاتدار لەوپەڕی میزاج خۆشیدا بوو. ئەو دڵنیابوو ئیدی ئیرگون ریشەکێش دەکا. هەر بەو هەوایەوە بۆ کاربەدەستانی سەرووی خۆی لە ئۆرشەلیم، قاهیرە و لەندەن ڕاپۆرتێکی نووسیبوو. دەزگای پۆلیسی نهێنیی کارامەکە خەنی و خۆشیان بوو، ئەوان بە تەمای مەدالیا، خەڵات و پلەبەرزکردنەوە بوون. ئاخر لەوە بێ ئاگابوون، دانەیەکی لەبەرگیراوی ئەو لیستەی بەوان درابوو، لەبەردەستی ئێمەشدا بوو. ئەوان نەیاندەزانی، ئێمە ئەوە دەزانین کە ئەوان لەبارەی ئێمەوە دەیزانن. ئێمە بە وریاییەوە لیستەکەمان سکان کردبوو. لەنێو لیستەکەدا ناوگەلێک هەبوون، لە نێو ڕێکخراوەکەدا نەبوون، ناوی واشی تێدا بوو، دەمێک بوون پەیوەندییان بە ڕێکخراوەکەوە نەمابوو. هەر چۆنێک بێ هەندێک ناو بە

بەریتانییەکان گەیشتبوون، ئەوەندە زوو گەیشتبوون مایەی بەزەیی بوون. لە ڕاستیشدا تەنها کەمێکیان لێگیران. بەگشتیش شتەکە خراپ نەبوو. ئێمە پێوەرێکی ئاسایشپارێزانەی دیکەمان گرتبەر. زەبرێکی کوشندەمان لێدرا، بەڵام هەر زوو خۆمان گرتەوە. کاتلینگیش تێگەیشت، کە شادمانیەکەی پێشوەختەیە و سەرووی خۆشی لە لەندەن لێی بێمراد بوون.
لەو نێوەشدا ئێمە لە تاوتوێکردنی ئەو بارەدا بووین چی لەگەڵ تسۆرۆسدا بکەین. هاوڕێکانم داوای لەسێدارانیان کرد. بەگوێرەی قانونی ژێرزەمینی داواکەیان دادپەروەرانە بوو. باری ژێرزەمینی زیندانی نەبوو، تا دوژمنەکانی تێدا بەند بکا و بەمە ڕێگری بکا لە کاری تێکدەرانەیان: لەو نێوەشدا زانیاریدەر ترسناکترین دوژمنە. سەرباری ئەو ڕەوشەش من دژی لەسێدارەدانی تسۆرۆس بووم. من لە ئەگەری هەڵە دەترسام. من داوای بەڵگەی تەواوم دەکرد. من لەو باوەڕەدا نەبووم جوێک بەم جۆرە تا بندین بخزێتە نێو زەلکاوی ناپاکیی. کەچی من شاش بووم. بەپێی ڕۆژگار لە ڕاستی تێگەیشتم و دانیشم بەهەڵەی خۆمدا نا.
تسۆرۆس، بەتایبەت بە دوامدا گەڕا. ئەوبوو هاتەماڵەکەم.
ڕۆژ هات و تێپەڕی. من لەبەرچاوی خۆمدا هەموو ئەو کوڕە پاڵاوانانە، ئەو کەسە پیرۆز و پاک و بێگەردانەم بینین. ئیدی زانیم ئەگەر پیاوێک بەسەرخۆیدا سەرکەوێ ئەوا هیچ سنوورێکی بەرزەفڕی نامێنێتەوە. لە سەرێکی دیکەشەوە، تسۆرسۆشم بینی. ئەو لە بەردەم ژووری کوڕەکەم وەستابوو. منداڵەکە بە هەر دووکمان پێدەکەنی. تسۆرسۆش بزەی بۆ باوک و کوڕ دەکرد. هەموو کاتەکە بیری لە هزرەکانی دەکردەوە. دیسانەوە من زانیم، ئەگەر پیاوێک ڕووخا ئەوا هیچ سنوورێکی دارمان نامێنێتەوە. بەڵام سوپاس بۆ خودا، من بە هەر دووو چاوی خۆم بینیم، ئەوانەی بەرز دەبنەوە زۆرن، کەچی ئەوانەی دادەڕمێن کەمن.

## 2

شێوە چەندبارەیی بیرکردنەوە، نەوەک هەر بووە مایەی ساتمەبردنی بەریتانییەکان لە کۆششی شەڕپێفرۆشتنەکانیان، بەڵکو وایان کرد وێنەی خۆیان بەشێوەی خەڵکانی ژێرزەمینیش بگرن. تا ڕاددەیەکیش بەریتانییەکان هەستیان کرد بوونەتە قوربانی پڕوپاگەندەی خۆیان دژی ئێمە. ئەوان

ئیمەیـان بە 'تیرۆرسـتێکی' ترسـناک وێنـا دەکـرد و پاداشـتیان دانـابوو بـۆ ئەوانەی دەمانناسنەوە. بەڵام وەک پێشتر لە سەری وەستاوم ئێمە هەرگیز تیرۆرسـت نەبـووین و هـیچ نیشـانەنمایەکی ناسینەوەوەشـمان نەبـوو. لە ژوورەکەی من لە ئۆرشەلیمدا بەریتانییەکان دوو وێنەی منیان دۆزیبووەوە. یەکێکیـان بـاش لە مـن دەچـوو. دووهەمەکەشـیان وێنەیەکـی لەبەرگیـراوەی لەسەر لای ناسنامەکەم بوو، کە تەنها کەمە لێکچواندنێکی لەگەڵ من تێدابوو. بەڵام کاتێـک بەریتانییەکـان لەشـکری بەدواداگەڕ و سـیخوڕی دەنـارد و بە هەزاران پاوەندیشیان بۆ ڕاوەدونانی من خەرج دەکرد، ئەوان تەنها وێنەی دووهەمیان بڵاودەکردەوە. باشە بۆ؟ چونکە وێنەی یەکەمیان کەم تا زۆر لە 'بنیادەم'ان دەچوو. کاتێ وێنەیەکت هەبێ، شتێکی جوان نەبوو، بەڵام هیچ هەستێکی نەرێیانەشی بۆ ئەوانەی دەیانبینی نەدەخوڵقاند. ئەوەش هەروەک کەسێکی ئاسایی بوو. بەڵام بۆ وێنەی دووهەم؟ چونکە زیاتر هی سەلمێنەری بیردۆزی داروین بوو. جۆرە ڕوییکی نیشـان دەدا، دەکرێ بڵێین ئەو کەسـە هەر بـۆ زینـدان دەسـتدەدا. فسـیۆگنۆمی (physiognomy)[49] –سیماناسـی– زانستی نەزانەکانە. لە تاقیکردنەوەیەکی ئەمریکیدا، پیاوێک نمایشـی 'دەموچـاو خوێندنەوەی' دەکرد، چەندان وێنەی دەموچاوی لەپێش داندران. ئیدی دیقەتی لێدان و بە دڵنیـاییەوە ئەو جـۆرە وێنـانەی لێگـرتن گـوایە بەڕووخسـار هـی تاوانبـارانن، کەچی لەبری تاوانبـارە ڕاستەقینەکان وێنەی ئەکتەر، نووسـەر، مامۆستا و داهێنەرانی لێگرتبوو، کەچی بکوژ و تاوانبارە ڕاستەقینەکانیشی لە لایەکی دیکە دانـابوون گـوایە ئەوانە خەڵکـانی ئاسـایی و میهرەبـانن. کەچـی شارەزا بەریتانییەکان تەنانەت گەر گوێیشیان لەهی شـارەزا ئەمریکییەکە بێ یان لەبارەوە خوێندبێتیانەوە، ئەوان هەر بەگوێرەی قـانونی نەزانانەی خۆیـان ڕۆیشتن. ئەو وێنە 'تیرۆریستە'ی چاپ و بڵاویان کردەوە بە ڕاسـتی ترسـناک بوو. کاتێکیش ڕۆژنامەی ئینگلیزی زمـانی ڕۆژانەی میدل ئیست مێیل وێنەی لەیەک جیاوازی بڵاوکردنەوە، لە وێنەیەکدا منی لەتەک کوڕەکەم نیشاندابووم، کە بـووکەڵەی فیلێکـی لەبـاوەش گرتـووە، لەسـەر ئەوەش سەرنووسـەرەکە سەرزەنشـت کـرا. بە ڕاسـت وێنەکە هەنـدێ سـەیر بـوو، وێنەیەکـی دلۆڤانـانە

[49] فسیۆگنۆمی: علم الفراسة. ڕووخسارناسی. زانینی ڕەوشت و سروشتی مرۆڤ لە ڕێی لێوردبوونەوەی ڕووخسارەوە؛ ی.ڕوانە قاموسی ئازادی .وەرگێڕ.

بوو، به سەرنووسەرەکە گوترا چۆن وێنەی وا بڵاو دەکەیتەوە، کە لەگەڵ منداڵێکدا یاری بکا، ئاخر ئەم جۆرە وێنانە سۆزی بەلادا رادەکێشرێ.

حکوومەتیش دەیەویست بەدەوری خۆی ئازارمان پێبگەیەنێ. ئەو وێنەی 'تیرۆرست'ەکەی بڵاوکردبووەوە کە لایەنێکی باشی هەبوو: وێنەکە لە ماخۆکەی نەدەچوو. بە هەزاران دانە لەو وێنەیە لەنێو پۆلیسی بەریتانییدا بڵاوکرانەوە، بەڵام خۆ ئەگەر بە رۆژی رووناک بەبێ دەمامکیش لە شەقامەکانی تەلئەبیبدا سوڕابامەوە، کەس لە رێی ئەو وێنەیەوە پاداشتی ناسینەوە و گرتنی منیان وەرنەدەگرت. هەر چۆنێک بێ خۆ ناشکرێ بڵێین، ئەوان ئەوەشیان نەدەویست.

هەرچەندە زۆر کەس بەهۆی منەوە یاخود بەهۆی وێنەکەمەوە تووشی گرفت بوون، بەڵام یەک بەرەنجامیشی لێکەوتەوە. یەهۆشافانت، ئەفسەرێکی لەخۆبردەمان بەهۆی هەندێک تەقەمەنیەوە لە ئۆرشەلیمدا گیرا. مخابن هیچ لەیەک نەدەچووین. گومانم لەوەش هەیە، پۆلیسی بەدبەخت سیماکانی بە تەواوی لەیەک کردبێتەوە. هی ئەو و وێنە بڵاوبووەکەی من. ئیدی هەندێ لە پشکنەران هەندێ خاڵی هاوبەشیان لەنێوان ئەو و وێنەکەی مندا دۆزیبووەوە. بەم جۆرە گومانەکەیان تا دەهات زیاتر دەبوو، بەتایبەتیش لە کاتی دادگاییکردنی پیاوەکە. ئیدی ژووری دادگا جمەی دەهات و دیمەنی سەیرسەیری پڕ لە جۆشی تێدا بەدی دەکرا. پاسەوانانی دادگاکە دوو هێندە کران، سێ هەندە و بەڵکو چوارهێندەش کران. سەرپشکنەر و لێکۆڵەرەوەکانی سەیرئاسا سەرقاڵ بووون. ئەوان هەر دەهاتن و دەچوون و سەیری کابرایان دەکرد و وێنەیان دەگرت. ئیدی هەواڵی خۆش خەریک بوو چەکەرە بکاتە نێو دڵی هەموو پشکنەر و لێگیرەکان. ئاخر گوایە 'تیرۆرستی ژمارە یەک'یان گرتووە. ئەوان هەروا ناوی منیان دەبرد. بەڵام لە دواییدا کەسێک لە دواساتەکانی بڕیاردانیدا فریایان کەوت و پێیگوتن، 'نەخێر، ئەمە ئەو بێژمۆتە نییە' کە بەدوایدا دەگەڕێن.

برادەرێکی دیکەم، بە ناوی ئارۆن، یەکێک بوو لە باشترین ئەفسەرەکانی زانیاریی، ئەزموونێکی زۆروزەوەندیشی هەبوو. شێوەی ئارۆن نە لە من نە لە وێنەکەم دەچوو. بەڵام ئارۆن تووشی داوی دوو جۆرە ناتوانایی ببوو، ئەمەشی لێبووە بەڵا: ئەو هەم لاواز و هەم چاویلکەیەکی لاچک ئەستوریشی

لە چـاو دەکـرد. ئەم دوو شـتەش بەگـوێرەی پۆلیسـی فەلەسـتینی دوو نیشـانەنمای بـوون، لە ئەنجامـدا بە منـی بچـوێن و بڵـێن خـۆیەتی. ئیـدی (ئارون)یـان گـرت و بردیـانە بەردەم بەرپرسـی پۆلیسـی C.I.D، لەوێشـەوە پرسیارباران کرا.
ئارۆن ناوی خۆی پێگوتن وەک چۆن لەسەر ناسنامەکەی نووسرابوو. منیش ناتوانم دڵنیابم، ناوەکە ناوی ڕاستەقینەی بووبێ مەگەر ناسنامەکەی ڕاستی بووبێ. هەر چۆنێک بێ ناوەکەی بێگن نەبوو. لێکۆڵەرەوەکان زۆر بەتەوس بوون لەگەڵی. گوایا ئەوان منیان گرتووە، منیش گاڵتەیان پێدەکەم و تەنانەت ناوی خۆمیشیان بۆ ئاشکرا ناکەم. ئەوەش ڕەوا نەبوو.
"ئایا نـاوی ڕاستەقینەت چییە؟" ئەوان گوشـاریان خستە سـەر ئـارۆن. "ئایـا پێتوایە، کە نەزانین تۆ کێی؟"
ئـارۆن زۆری پێخـۆش بـوو، هەر بە ڕاسـتی بەریتانییەکـان نـازانن کێـیە و بەشاشی پێیانوایە منم. وەک گومانلێکەرێک لەسـەر ئەوەی گیراوە، ڕەوشـێکی خراپە، بەڵام بەوەی تاوانبارکراوە کە منم، زۆر دژوار نییە.
لێکۆڵینەوەکە بە درێژایی ڕۆژەکە بەردەوام بـوو، هەر لێکـۆڵەر بـوو دەهـات و دەچـوو. ئـارۆنیش لە وەڵامـدانەوەدا ماندوو بـوو. ئەوان لە ڕووەوە سـەیریان کـرد. تۆمارنامەیـان پشـکنی. لێگەڕان بەنـاو ژوورەکەدا بێـت و بـڕوا. ئەمەش تاقیکردنەوەیەکی دژوار بوو. ئارونیش گەر هەڵە نەبم، پێیەکانی تەخـت بـوون.
لێکۆڵەرەوەکان لە ڕەوشەکەیدا لە نێوان هیـوا (کە گیـروەکە مـن بـم) و گومـان (کە گیـراوەکە مـن نەبـم) تێـدامابوون. لە دواییـدا یەکێکیـان حەوسـەڵەی لە دەست دا بەسەر ئارۆندا قیژاندی:
"ئەگەر وابێ، کەواتە بیسەلمێنە، کە خۆت خۆتی."
ئەم ئارۆنە ناکارابوو وا بکا. ئەو نەوەک هەر من نەبووم، بەڵکو نەیـوێرا ببێتە خۆیشی. ناسنامەکەی کە پێیـدا بـوون نمایشـی ناسـنامەی خـۆی نەبـوو. ئیدی ئەو ئەوە بوو کە لەسـەر کارتەکە نووسرابوو. ئارۆن ڕاسـتگۆبوو لەگەڵ دابی ژێرزەمینیـی، ئەو شـوێنکەوتوویکی سـەرئاسـن بـوو. ئەو تۆزقـاڵێکیش بـۆ بەریتانییەکـانی دانەنەوانـد، تـا ئەو کـاتەی بەریتانییەکـان دەسـتبەرداری ئەوە بوون، کە ئەو من بووبێ، ئیدی بڕوایان کرد ئەو ئەو کەسـەیە نـاوی لەسـەر کـارتی ناسـنامەکەدا نووسـراوە. هەرگیـزیش پێشـهاتی ئەوەی بۆ بە خەیاڵدا

نەدەهات، کە ئەو خۆی بێ. ئارۆن ئازاد کرا و بێ کۆڵدان تا کۆتاییش لەگەڵ باری ژێرزەمینیدا مایەوە.
دوای ئەو، چەندان کەسی دیکە بەو تۆمەتە گیران، گوایە لە وێنەکەی من دەچن، کەچی ئەوان لە من نەدەچوون. هەموو ئەوەش لەبەرئەوە بوو بەریتانییەکان بڕیاریان دابوو ئێمە بە جۆرێک نیشانی جیهان بدەن گوایە قۆچ و کلک و سممان هەیە، بەڵام ویژدانمان نییە.
هەرگیز ئەوە بە خەیاڵی بەریتانییەکاندا نەدەهات، کە ئێمە لە وڵاتێکدا دەژین وەک ئەوەی کردمان: تا ڕادەیەک کراوە. ئەوان لەوە تێنەدەگەیشتن، ئێمە جوامێریی پێویستیمان ئافراند. ئاخر چۆن ئێمە لە وڵاتێکی بچکۆلانەدا خۆمان بشارینەوە؟ پارتیزانەکانی گەلانی دیکە لە شاخە سەخت و عاسێکان یان لە لێڕە بەربەرینەکاندا ئۆپەراسیۆنەکانی خۆیان ساز دەدا. لە ئێرتز ئیسرائیلدا نە شاخی لێیە و نە و دارستان تا یاخیبووانی خۆیان تیایدا حەشار بدەن. ئێمە بەتەواوی لەبەر چاوی دوژمندا ئاشکرا دیار بووین. لەگەڵ ئەوەشدا یان وەک بەرەنجامێکیش ئێمە دیاربووین و نەشدەدیتراین. شتێکی خۆڕسکانەبوو، ئێمە چەندین ناومان هەبێ، ئێمە چەندان بەڵگە و ناسنامەمان بەکار دەهێنا، ئاساییانە هەمووشیان دەستکرد بوون، بەڵام هەرگیز شوێنی حەشارگەی ژێرزەمینمان نەبوو. ئێمە بە پاسەوان دەورە نەدرابووین، بۆ پارێزگاری لەخۆشمان چەکمان پێ نەبوو. ئێمە مامۆستا و قوتابی بووین، ئەوسا چ بە ڕاستی بێ یان نمایش. ئێمە چ بە ڕاستی یان هەڵبەسترا و بازرگان یان ژمێریار بووین ئێمە ئەندازیار و میکانیکزان بووین. بە کورتی ئێمە هەموو ڕۆژێ هاوڵاتی بووین لە هاوڵاتیانی دیکە لەیەک جیا نەدەکراینەوە. پۆلیس بێژمار جار دەهاتە نێو خەڵکەکەمان. ئەندامەکانی ئێمە بەردەوام لەبەر دەستیاندا بوون. بەڵام ئاخۆ ئەوان چیان لەوان دەدۆزیەوە؟ ئەوان چەکیان پێ نەبوو. ئەوان ئامێر و داردەستی کاریان و بەڵگەنامەی کارخانەکانی خۆیان پێ بوو. ئاخر کێ گومان لە هاوڵاتییکی بێوەی دەکا، کە دەچێتە سەر کار یان دەگەڕێتەوە ماڵەوە؟ ئێمە وامان لە دوژمن کردبوو ببێتە کەسێک بە هەر دوو چاوەکانی نەتوانێ هیچ ببینێ، بە دوو گوێ نەبیسێ و بە کەپووشی بۆن نەکا.

پرسی پاسـەوانی کەسـیی هەندێ جار لەیەکحاڵینەبوونێکی نوکتەئامێزانەش دێنێتە کایە. نەوەک تەنها دوژمنەکانمان بەڵکو دۆستەکانیشمان لەسـەر ئەو بڕوایەدا بوون، کە لەشکرێکی پاسەوانیم هەیە، بۆ هەموو شوێنێکیش لەگەڵمدا دێن و دەڕۆن. یەکێک لەو کەسـانە سەرسـام بـوو بە چـۆنیەتی ڕێکخسـتنە نایابـانەی پرسـی پاسـەوانیکردنم. ئەو کەسـە دوو جـاران لە مـاڵی لە (مایرخـان) کە پێیـدەگوترا ئەلـێکس کە لای ئـێمە شـوێنی دێرینەمـان بـوو، سەردانی کردم. لەم ماڵەدا زۆر کۆبوونەوەی نهێنیی تێدا کرا، شـوێنەکەش بە داری سنەوبەر دەوروخـولی گیرابـوو. پێویستیشـی بە خەیـاڵپلاویێکی زۆر نەدەکرد، کە بگوترێ لەودیو دارەکانەوە کوڕانی پاسـەوان چەک بە دەستی پەنجە لەسەر پەلاپیتکەی تفەنگ لەوپەڕی ئامادەباشیدان. لێ گەلۆ چۆن لەو سەردانکردنانە کەسێکیان لێبەدی نەکرا؟ ئیدی ئەنجامی برادەرەکەمان ئاسان بـوو. لە کـاتی سـەردانی دووهەمیدا، کـاتێ دەرگـای گفتوگۆکانمـان کـرایەوە، لێیپرسیم:

"من دەبێ پیرۆزبایی ڕێکخستنە تۆکمە و ئاسایشی پاسەوانەکانت لێبکەم. خۆ ئەوە دووهەمـین سەردانیشـمە، هێشـتاش شـوێنپێی یەک پاسـەوانتم بەدی نەکردووە."

منیش بێدەنگ بـووم. خـۆ نەدەکرا ڕاسـتیەکە بە بـرادەرەکەم بڵـێم. ڕێسـای ژێرزەمینی ڕیزپەڕی بۆ نییە؛ بەڵام نەشمدەویست درۆی لەگەڵدا بکەم. بۆیە هیچم پێنەگوتەوە. ئەو کاتەش لەباری ژێرزەمینییدا دەرچووین، برادەرەکەم بۆی دەرکەوتبوو، هۆکاری بەدینەکردنی هیچ پاسەوانێک، سووکوئاسـان ئەوە بوو، کە ئەوان هەر نەبوون تا بدیترێن.

پرسـی هەڵنەگرتنی چەک بـۆ بـاری خۆپاریزیشـمان شتێکی زۆر جدیی بـوو. هەر لە سـەرەتاوە بڕیارمانـدا هەمـوو چەکەکانمـان لە جبەخانەکـان بـۆ جێبەجێکردنـی نەخشـەی پەلامـاردان هەڵبگیـرێ. هەمـان کـات ئەم ڕامـانەش تەواو جیـاواز بـوو لەگەڵ سـەرکردەکانی F.F.I (گروپـی سـتێرن). ڕێسـای ئەوان وابوو، هەموو ئەندامێکی نهێنییـان بە ڕۆژ و شـەو چەکی پێ بێ. گەر ئاژانەکانی دوژمـن هـاتن بیگرن، ئەرکی خۆیەتی تـا کۆتایی بەرگری لەخـۆی بکـا، لە کـاتی پێویسـتدا باشـترە بمرێ لەوەی بگیـرێ. ئیسـحاق یسەرنیتسکی فەرماندەی (گروپی ستێرن) ئەو ڕێسایەی بۆ من وا شیکردەوە. دوای ئەوەی

لێکۆڵەرەوە و بەدواگەڕەکان نامەردانە ئەبراهام ستێرنی بێچەکیان کوشت، ئیدی شوێنکەوتووەکانی بڕیاریاندا نەکەونە بەردەست و نەگیرێن.
هۆکاری ڕێساکە مەرگەسات بوو، چونکە دەرهاوێشتەکەی وابوو. لە بەهاری ١٩٤٤دا ژمارەیەک بەیەکدادان لەنێوان دوژمن و ئەندامانی ڕێکخراوی F.F.I قەوما. لەو ڕووبەڕووبوونانەدا ئەندامانی گرووپەکە بۆ ژیان و ئازادی تاکەکەسییان تا دوا هەناسە شەڕیان کرد. لێ گەلۆ هەڵبەتە هێزی چەکداری بەریتانیی بالادەست بوو. جڵەوی دەرستپێشخەریش هەر لە دەستی هێزی دوژمندا بوو، بۆیە ژمارەیەک ئەندامی ئازای گرووپەکە بە تفەنگی دەستی هێزەکانی دوژمن کوژران.
لە جەژنی لێخۆشبووندا لە 1944دا، لە ژوورێکی بچکۆلانەی سەرماڵی بێنی براک، چاوم بە یسەرنیتسکی فەرماندەی گرووپی ستێرن کەوت. ئەو کات هێشتا نەببووە "رابی شامێر" بەخۆی ردێنێکی درێژی رەش، بەڵام بەنمایشی بازرگانێک بە پرچێکی لول و سمێڵێکی کەشخە. لەوێدا باسی پرسی هەڵگرتنی چەکمان کرد. یرنتسکی هەر هەمان بەڵگەوبەندی پێشووی دووپاتکردەوە. منیش هەڵوێستی خۆمانمان بەم شێوەیە بۆ ڕوونکردەوە:
"بەردەوام هەڵگرتنی چەک زیاتر زیان بە هەڵگرەکەی دەگەیەنێ لەوەی سوودی پێببەخشێ. ئاخر پیاوێکی چەکدار هەمیشە مایەی تووشبوونە بەوەی کۆمەڵێ پۆلیس دەورەی بدەن و بەسەریشیدا زاڵ بن. ئەمەش واتای ئەوەیە، ئەستەمە بەتاقە دەمانچەیەک ڕووبەڕوی دەستەیەک تفەنگچی ببێتەوە. لەو بارەشدا چەکەکە نەوەک هەر هەڵگرەکەی سەلامەت ناکا، بەڵکو ژیانیشی دەخاتە مەترسییەوە. لە سەرێکی دیکەشەوە، تۆ وەرە بیر لە نەخشەکەمان بکەرەوە. ئێمە بەو شێوەیە ناتوانین جڵەوی دەستپێشخەری نەخشەکێشان -کە دەستپێشخەری سەرەکیترین سەرچاوەی هێزمانە- بەدەستبێنین، گەر لە هەر ئانوساتێکدا ڕووداوێکی پلان بۆدانەڕێژراو لەنێوان یەکێ یان زیاتر لە پیاوە ژێرزەمینییەکانمان و هێزێکی دوژمندا ڕوویدا."
بۆ پاڵپشتکردنی بەڵگەوبەندەکەم سەربردەی یاکۆڤ مێریدۆرم بۆ یسەرنیتسکی گێڕایەوە، کە هەر چەند ڕۆژێک پێش ئێستا ڕوویدا بوو. یاکۆڤ و چەند هاوڕێییەکی دێنە سەردانی من. لە ڕێگا لە نزیک ماڵەوە، دەستەیەکی پۆلیسی تفەنگ لەشانیان لێپەیدا دەبێ. پۆلیس داوای ناسنامەیان لێدەکا.

ئەوانیش ناسنامەکانیان ڕادەست دەکەن، ناسنامەکانیان دروست و بێ پەڵە بوون. بەڵام پۆلیس هەر بەئەوەندە وازیان لێناهێنێ، بەڵکو دەشیان پشکنێ. هەر ئەو کاتەش پێیان دەڵێ بڕۆن، کە دەبینن هیچ چەکیان پێ نییە. ئیدی بەم شێوەیە هاوڵاتییێکی پابەند بە ڕێسا و قانون ڕێگا دەدەن سەردانی هاوڵاتیێکی هاوشێوەیان بکەن. لێ ئەگەر هاتبا و چەکیان پێبووبا، ئەوا بەیەک دوو دەمانچەی گیرفانیان هیچیان لەگەڵ دەستەیەکی تفەنگ بەدەست پێنەدەکرا. دەرهاوێشتەی ڕوداوەکەش یان کوشتن و بریندارکردن دەبوو، یان گرتنی هەموویان دەبوو، لەوانەش بوو ڕووداوەکە لەوەش خراپتری لێهاتبا. .. بۆیە پیاوەکانمان بێ چەک بوون، ئیدی پۆلیسیش دەرفەتی پێدان بە ئاسایی تێدا بسوڕێنەوە... بەمە پۆلیسەکان کڵاویان لەسەر نرا.

من نازانم ئاخۆ بەڵگەوبەندەکەی من بڕوای بە سەرکردەی F.F.I هێنا یان هەر بەگوێرەی ئەزموونی بەرێی خۆیان ڕۆیشتن، بەڵام هەر زوو دوای کۆبوونەوەکەمان لە بێنی براک، ئەوانیش ڕێنمایی "بێ چەکی ناوخۆیان" کارا کرد. سەرەتا وەک پێمراگەیەندرا، هەندێ لادەر و جیابووەوە لەنێو ڕیزەکانیان لەسەر ئەو پرسە پەیدا بوون. ئەوان بەموو لە ڕامانی بەرێی خۆییان لانەدا و بنەمای چەکداریی و خۆبەدەستەوەنەدانیان بە نەگۆڕی هێشتەوە، ئەمەش وایکرد ئەوان لە تەواوی بزووتنەوە ژێرزەمینییەکان جیا بکرێنەوە. بەڵام ڕێنمایی نوێی ڕێکخراوەکە کتومت وەک ڕوونکردنەوەکانم لێهات، ئەوانیش ملکەچی ئەوە بوون، چەکەکان تەنها بۆ پلانە نەخشە بۆدارێژراوەکان بەکاربێن.

کەواتە ئێمە بنەمای "ئاشکرایی ژێرزەمینیمان" پەیرەوکرد. مایر کاهان حەزی لێبوو پرسە جدییەکانیش بەرگی قۆشمەیان لەبەر بکا، دەیگوت: "هەڵبەتە ژێرزەمینەکەمان کراوەیە. تاریکترین خاڵ کتومت لەژێر چراکەدایە."

بۆ پارێزگاریکردنیش لە کرانەوەیی باری ژێرزەمینیی، پێویستیت بە زیاتر هەر لە تەکنیکی نازناوەکان هەیە. ئەوەی زۆر پێویست بێ قووڵایی ویژدانی کەسەکەیە، کە وای لێبێ "قانونیی" لا ناقانونی بێ و "ناقانون(قاچاخ)یشی" لا قانونی و ڕەوا بێ. ئێمە ئەو ویژدانەمان لا پێوەری باڵا بوو. ئێمە بڕوامان بە ڕەهایی ڕەوایی کارە "ناقانونییەکان(قاچاخەکان)نمان بوو. ئیدی هەر ئەمەش وای کرد، سەرمان لێتێکنەچێ، هەروەها کاتێ دەستەی هەیتە گەڕۆکە

بەریتانییەکـان لە ڕێوبانـان تووشـمان دەهـاتن و پرسـیاریان لێـدەکردین، دەمـانزانی چـۆن وەڵامیـان بـدەینەوە. هەر لەبەر ئەوەش بـوو ئێمە هەرگیـز وامان نەکرد دوژمن پەی بە شتە شاراوەکانی کۆگاکانمان ببا.

ئێمە بە مردن دەورە درابووین، بەڵام هەرگیزیش وامان نەدەدی. ئێمە "لەژێر تیشکی چراکە" دەڕۆشتین. هەر بە تەنیا ئەوەش نەبوو کە لە گرتن بترسین؛ بەڵکو هەر بیریشمان لێنەدەکردەوە. ئێمە هەموو هزری خۆمـان خستبووە سەر خودی یاخیبوونەکە. ئەو ئارامییە دەروونییەش هیچ پەیوەندییەکی بەوەی پێی دەگوترێ "ئازایەتی"یەوە نەبوو. بەڵکو ئەوە خۆی ئازادبوونێک بوو لە کۆیلایەتی. ئەوەش دەرهاویشتەی ویژدانی خاوەندارێتی نیشتمانێک بوو، کە لەبـن زنجیـری تـانکی دوژمنـدا زیـڕەی دەهـات. ئـاخر "سـەروەری گیـانی(دەروونی) بەر لە سـەروەری سیاسـییەوە دێ. بە ڕاسـتیش ئـازادی گیانیی مەرجێکی چارەنووسسازانەیە بۆ بەدەستهێنانی ئازادی سیاسیی.

مەرجێکی دیکەی سەرباریش هەبوو، وای کردبوو باری "کراوەیی ژێرزەمین" وا بمێنێـتەوە، ئەویـش هەسـت و مەیلـی خەڵـکەکە بـوو، کە خـودی بـاری ژێـرزەمینیەکە لەوانەوە هەڵقوڵابـوو. ئـێمە دەمودەسـت و بەیەکجـاری داوای مەیل و هەست و سۆزی خەڵکمان نەکرد. بەڵام ورەمان ڕۆژانە لەنێو خەڵکدا لە زیادبووندابوو. لەو گۆشەنیگایەشەوە، وای دەبینم ماوەی نێوان ١٩٤٥-٤٦ ڕۆژگـارێکی چارەنووسسـازانە بـوو. لەو ماوەیەشـدا هاگانـا، کە لەژێر ڕکێفی دامودەزگـای فەرمـی جـوودا بـوو، لە دژی ڕژێمـی بەریتـانی هـاتە پـاڵ خەباتەکەمان. ئیدی خەڵکەکە لە پڕێکەوە شتێکی دیکەی بینی، بینی ئەوانەی بە ئێمەیان دەگوت "شێت" وا خۆشیان دامودەزگاکانیـان هەمـان کاردەکەن کە پێویسـتە بکـرێ. ئەنجامەکەشـی بەوە کەوتەوە، گـۆڕانی بەرەی سـەرکردە فەرمییەکـانی زایۆنیسـت دوای ڕەشـبگیرییەی ٢٩ی حـوزەیران، چیـدکە دەربەستی گۆڕانی هەستوسۆزی خەڵک نەهات. کەواتە ئێمە لە هەموو چین و توێژێکەوە بووینە مایەی مەیل و هەواداریی، ئیدی هەر ئەمەش بووە سەنگی مەحەک. ئەو "دیوارە ئاسنینەی دەوروپشتی گەنجە جەنگاوەرەکانمـان" کە لە سـەرەتای یـاخیبوونەکەوە بانگمـان بـۆ هەڵـدەدا، لە ڕاسـتیدا ڕۆنـرا. بەریتانییەکـانیش هـۆی خۆیـان هەبـوو، سکاڵای ئەوە بـکەن کە سەرنشـینە جووەکان بە بەرفراوانی لە هەمبەر "دژایەتی تیرۆرزمدا" کارا نین.

له کتێبی سپی ١٥ی نیسانی ١٩٤٨دا (فەلەستین: سنووردارکردنی ماندانەکە) کە تۆماری مایەپووچی کتێبی سپی ١٩٣٩ بوو، دانی بەسەرکەوتنی یاخیبوونەکەدا نا و ڕۆژبەندی کۆتایی دەسەڵاتی بەریتانی دانا. حکوومەت نووسیبووی: "٨٤٠٠٠ سەرباز لە لایەن کۆمەڵگە جووەکانەوە هاوکاریان نەدەکرا، ئیدی ئەم سەربازانە ناکارایی خۆیان لە چەسپاندنی ڕێساو قانون لە بەرەنگاربوونەوەی هەڵمەتی تیرۆرزم لەبەر هێزی ڕێکخراوی تۆکمەی جووەکان، کە بە نوێترین چەکی تاکەکەسی سەردەمدا چەکداربوو بوون، سەلماند."

کاتێکیش ئەوان باسی نەبوونی هاوکاری 'کۆمەڵگەی جوو' دەکەن، ئەوا بەریتانییەکان ئاماژە بەر سەرانی ئەو جڤات و کۆمەڵگەیانە ناکەن، کە هەندێ جار، ناوبەناو نەوەک هەمیشە هاوکاری تەواو دەکران بۆ ڕاوەدونانی شەپۆلی تیرۆریزم؛ بەڵکو ئەوان ئاماژەیان بە حەشامات و ئاپۆرای خەڵکەکە دەدا. ئاخر گەل بوو هاوکارییان نەدەکرد. گەل هاوکاری یاخیبووان بوو. ئەوان جەنگاوەرەکانیان دەبینی کە دەچوونە شەڕ، بەڵام لێوەکانی خۆیان لەبارەیانەوە درووی بوو. ئەیان بینی ئەوان چۆن لە شەڕدا دەگەڕانەوە، بەڵام بێدەنگییان لێدەکردن. ئاشکراشە بێدەنگی زۆر گرنگ بوو، هەرچەندە ئەوە تاکە کۆمەکیش نەبوو، بە یاخیبووانیان کردبێ. گەل ئەوەی بە یاخیبووان بەخشی کە لەباری وڵاتاندا مەرجی ڕووخانە، ئەویش: داپۆشین بوو. ئێمە لەنێو داروباردا خۆمان نەشاردبووە، بە داری زیندوو پاسەوانی لێدەکراین. ئەگەر وا نەبوایە ئێمە شەڕمان پێنەدەکرا، بە دڵنیاییشەوە نەماندەبردەوە. قووڵایی ژێرزەمینێکی کراوە بە مەیل و سۆزی گەل بۆ خەباتەکەی دەپێورێ.

## 3

پێویستە دان بەوەدا بنێم، لە سەرەتادا باری ژێرزەمینییەکەمان زۆر 'کراوە' بوو. پێدەچێ شتەکە جێی بڕواکردن نەبێ، بەڵام ڕاستیەکەی ئێمە هەر نەچووبووینە باری ژێرزەمینیی. بە دڵنیاییەوە لە ڕووی فیزیکی نەچووبووین. بە پێچەوانەوە کە دژی دەسەڵاتی بەریتانیا وەستاینەوە، لە قەپەنگی ژوورێکی بچکۆلانەی هۆتێلێکی پڕ لەخەڵکدا ئەو کارەمان کرد. ئەوەش ئەو هۆتێلە بوو، تا ئێستاش سەرسامەکان بە کەناری تەلئەبیب بۆ خۆی ڕادەکێشێ. من لەوێ لەبەر هۆکارێکی زۆر سادە لێمداکوتابوو: چونکە

جێگەی دیکەم دەستنەکەوت، ئیدی بۆ ماوەی زیاتر لە چوار مانگی ڕەبەق لەوێ مامەوە، تیایدا سەرەتای ئۆپەراسیۆنەکەمان جاڕدابوو. هەموو شتێک هەر لەبەراییدا بوو. من هێشتا بەڵگەنامە و ناسنامەم لەسەر ساغ نەببووەوە. هێشتا ناوە ئەڵمانییەکەم نەخواستبووەوە تا هاولاتییەکی فەرمانبەرداری قانونیانیانە بم. ئەوێ دەمێ نازناوەکەم "بن زیڤ" بوو، ناوێک بوو دنەی هیچ گومـــانێکی نەدەدا. کەچـــی بەریتانییەکـــان لە تەواوی ولاتەکەدا بەدوامـــدا دەگەڕان. یەکەمـین پەلامـاری سـەر شـەمەندەفەرەکانی ئەوان، بـووە مـایەی جاڕدانی قەدەغەکردنی هاتووچۆ لە ئۆرشەلیم، حەیفا و تەلئەبیب بۆ ماوەی دە ڕۆژ. دواتر ئەو قەدەغەی سـەر هـاتووچۆ بـووە بەشـێک لەژیـانی ڕۆژانە، بەلام ئەوێ ڕۆژێ شتەکە بۆ ئێمە لەپڕ و سەرسامانە بوو. لە هوتێلەکەدا بەخـت یـاوەرم بـوو. بەریتانییەکـان لەوێـدا بە دوامـدا نەگەڕان. بە مێشـکی سـەرانی لێکـۆڵەر و بەدواداگەڕەکـان نەهـات، مـن لە هـوتێلێکی گشـتیدا خۆم"حەشار"دابێ. کەچی هێشتاش هوتێلەکە هەر لەبن پشکنینی ڕۆتینیانەی ئەوان دابوو بۆ گەڕان بە دوای گومانلێکراواندا، گرژیش شتێکی گشتیی بوو، ئەویـش جـێگەی مەترسـی بـوو، بەڵکـو "مسـتەر بـن زیـڤ" لە پشـکنینێکی ڕۆتینیانەی پۆلیس وەک "گومانلێکراوێک" بگیرێ.

ئەم دژوارییەش لە لایەن راگری هـۆتێلەکە رەوێنـدرایەوە. ئـاخر ڕێـزدار بـن زڤی (خاوەنی هوتێلەکە-وەرگێڕ) نەیدەزانی ئاخۆ کتومت "مستەر بن زیڤ" کێیە، بەلام فامیدەکرد کە ئەو پەیوەندی "بەو شتانەوە" هەیە. بەهـۆی مەیلی یارۆی هـوتێلەکە بـۆ "بۆ ئەو شتانە" مستەر بن زڤی خۆبەخشانە ئازادی و ژیـانی خـۆی خسـتە مەترسـییەوە. لە شـەوێکی قەدەغەکردنـی هـاتووچۆدا، دەستەیەک پۆلیسی سەربازی و مەدەنی هاتن و هوتێلی ساڤۆ بپشکنن. ئەوان ژوور بە ژوور دەگەڕان، هەمـوو میوانەکانیشـیان لە داڵانەکە کردبـوون، بە ریـز وەسـتاندبویانن. ئیـدی ناسـنامە و بەڵگەنامەکـانی نیشـتەجێبوونیان دەپشکنی، هەرچی گومانیان لێکردبا دەیاندایە لایەک و بۆ لێکۆڵینەوەی زیاتر لەگەڵ خۆیاندا بۆ پۆلیسخانەیان دەبردن.

هەرا و هەنگـامەی لـێگەڕانەکە گەیشـتە ژووری ژمـارە ١٧. دەنگـی پـێ و هەراوزەنـای پـۆلیس منـی بێـدارکردەوە. هاوسـەرەکە و کـوڕە بچکۆڵەکەشـم لەگەڵدابوون، بەلام بەختم بەوە باش بوو ئەوان خەوتبوون. ئەوان هەر تەنها

چەند ڕۆژێک پێشتر لە ئۆرشەلیمەوە گەیشتبوون. یەکەمجار من ئەوانم دوای ناپاکییەکەی تسۆرۆس جێهێشت. پێموابوو وا باشترە خێزانەکەم لەگەڵ خۆم ڕانەکێشمە ژێرزەمین. دیاربوو باشترە ئەو لە ژیانێکی ئاشکرادا بژی و وەک من ڕاوەدونەنرێ، چونکە گەر شوێنەکەم پێنەزانی، دەتوانێ بەمتمانە بەخۆبوونەوە وەڵامی پۆلیس بداتەوە و بڵێ "نازانم لە کوێیە". بەڵام هەر زوو زانیم ئەو نەخشەیەم خەیاڵپڵاویەکە و هیچی دیکە. ژورەکەمان لە ئۆرشەلیمدا بە شەو و بە ڕۆژ بە سوسەکاران دەورە درابوو. ئاخر دەسەڵاتداران چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد، ئاخۆ کەی باوکەکە سەر لە ماڵ و منداڵی بداتەوە. کەچی ئەوان بە پەرشوبڵاوی تەونەکە ڕەزامەند نەبوون، کە بەلای عەقڵی خۆیانەوە وایان دەزانی ئێمە پێی زانا نین. ئەوان لە ڕاوکردنی ماسیەکەیان نەوەستان. شەو لە دوای شەو دەستەی پۆلیس سەردانی ژورەکەیان دەکردین. کاتە خۆشەویستەکان لەنێوان نیوەی شەو سەعات دوو دابوو. ترومبێلی پڕ لە چەکدار، تفەنگی شەست تیر، لایتی دەست و پرسیارە نەبڕاوەکان: "ئەرێ مێردەکەت لە کوێیە؟" ئەوسا دڵنیاکردنەوەیەکی لەسەرخۆ: "قەیناکا. بەیانی دەگەڕێینەوە. خۆ ئەو وەختێک هەر دێتەوە."
ئەزموون فێری کردبووین، پۆلیس لەوەدا دوودڵ نابێ کە ژن و منداڵەکەم وەک بارمتە بگرێ. بۆیە هاوڕێکانمان مشتومڕی ئەوەیان لەگەڵدا کردم، بە تەنیا خۆی لە ماڵدا جێنەهێڵم. ئیدی (ئیتان) بە بن کەپووی پۆلیس خۆی گەیاندە ئۆرشەلیم، ژن و کوڕەکەمی بە قاچاخ گەیاندە تەلئەبیب، لەوێشە بۆلای من لە هوتێلی ساڤۆی. لەوێشەوە هەموو ڕێگاکەی خەباتی ژێرزەمینی، هاوسەرەکەم بە مەراق بەڵام هێمنانە لەگەڵمدا بوو. ئەویش وەک یەکێ لەو دایک، خوشک، هاوسەرانە ئازایەتیکی بەرچاوانەی نواند. ئازایەتی ڕاستەقینەش بەدەر لە خەمخواردن دەرنابڕدرێ بەڵام بەسەریدا زاڵ دەبێ. یەکێ لە برادەرەکانم ئاگاداری هاوسەرەکەمی کردبووەوە، کاتێ کە من گیرام ئەوا من ژیانی لەپێناودا دادەنێم. ئەویش بە خەندەوە سوپاسی کردبوو. هاوسەرەکەم مەراقەکەی نە بۆ من و نە بۆ کەسی دیکەی دەرنەبڕی.
ئەوێ شەوێ لە هوتێلی ساڤۆیدا، کە گوێم لە تەپەی پێی پۆلیس بوو لە ژوورەکەمان نزیک دەکەوتنەوە، داخم خوارد، نەدەبوایە ژن و کوڕەکەم بهێنابانە تەلئەبیب. ئەگەر پۆلیس من وەک گومانلێکراوێک لەگەڵ خۆیدا ببا،

من بەخۆمم دەگوتەوە، لەوانەیە گومانەکەیان بۆ ئەویش بڕوا. خۆ ئەگەر ئەویش گیرا، ئاخۆ چی بەسەر منداڵەکەدا دێ؟ لەپشت ئەو شتەوەش بیرکردنەوەم وەرسوڕایەوە سەر خەباتەکە و بەردەوامبوونی. کاتێکیش هێوربووومەوە، من هیچ گومانێکم لەوەدا نەبوو، کاتێ شمشێری یاخیبوون دەردەکێشرێ، تا سەرکەوتن نابێ بچێتەوە کالانەکەی خۆی. بەڵام خەمم لەو هاتنەناوانە دەخوارد. ئێمە هەر لە سەرەتاکەیدا بووین. هێشتا زۆرینەی کاری پەروەردەیی، سەربازی و سیاسییانەمان لەپێشدا ماوە. تۆبڵێی بەختی من وا بێ هەر لە چەخماخەی بەرایی نەوەک لە مەشخەڵی تەواوی گڕەکەدا بەشدار بم؟

تا دەهات دەنگی پێ قورسەکانی ئەوان پتر دەبوو. ئاخر هیچ ڕێگاییەکی دیکە نەبوو. من بەرکە و باخەڵی خۆم گەڕام. هیچ بەڵگەنامەیەکم پێنەبوو. هەموو شتێک بۆ گرتن ئامادەیە. دەی بابێن. مەڕاقەکەم ڕەوایەوە. هەستم بە ڕاستییکی سەیر تێکەڵ بە خۆشیەکی لێتێنەگەیشتوو کرد. بەخۆمم دەگوتەوە دەبێ شوکرانەبژێر بم، کە توانیم بگەڕێمەوە و بەشداری هەڵدانی ئاڵای شۆڕش بکەم. لەوەش زیاتر، خۆ هەر شتێک ڕوویدا، ئەوا ئاڵایەکە نەوی ناکرێ. ئیدی بەتەواوی ئامادەی ئەوە بووم لە دەرگای ژوورەکەمان بدەن.

کەچی لەجیاتی ئەوەی تەپەی پێیەکان و دەنگەنگ نزیکتر ببێتەوە و بگاتە بەردەم قاپی ژوورەکەم، لەپڕێکەوە بەرەو لایەکی دیکە ڕۆیشتن. ئەرێ خۆ پۆلیس خەریکبوو بگاتە سەر کۆسپەی دەرگای ژوورەکەم، بەڵام بەهەر هۆیەک بێ کۆسپەکەی تێنەپەڕاند. تۆبڵێی چی رویدا بێ؟ وام بەچاک زانی نەچمەدەر و نەپرسم. بۆ ماوەی نیو سەعاتێکی دیکە گوێم لە جووڵەجووڵێک بوو. ئینجا ئەویش نەما، دنیایەکی کڕومات. ئۆخەی پۆلیس ڕۆیشت، هوتێلی ساڤۆیش گەڕایەوە سەر خەوەکەی خۆی.

بۆ بەیانیەکەی، مستەر بن زڤی لێیپرسیم ئاخۆ بە شەو گوێم لە هیچ دەنگەدەنگێک بووە. منیش بە پرسیارێک وەڵامم دایەوە.

"چی ڕوویدا؟"

ئێمە هەر دووکمان دەمانزانی و هەریەکەمان دەیزانی کە ئەویدیکەش دەزانی. من دەبوایە بێدەنگ بم. مستەر بن زڤی وریا بوو:

"ئێمه نەمانویست بێدارت کەینەوە،" ئەو وای پێگوتم. "هوتێلەکەیان پشکنی. پۆلیس بەدوای گومانلێکراواندا دەگەڕان. چەند میوانێک کە بەڵگەنامەکانیان لەگەڵ ئەوانەی پۆلیس تێکی نەدەکردنەوە، بۆ زیاتر لێکۆڵینەوە لەگەڵ خۆیانیان بردن. هەنووکە ئەوانیش بەربوونە. منیش پێموابوو شتەکە هی ئەوە نەبوو تۆش دڵگیر بکەن. هەڵبەتە من ژوور بە ژوور لەگەڵ پۆلیسدا گەڕام، کاتێکیش گەیشتینە قەپەنگە (بەلەکۆنە)کەی لای تۆ، پێمگوتن' ئەوە هەموویەتی'. ئەوانیش وایان بینی کە گەیشتوینەتە کۆتایی داڵانەکە و بڕوایان پێکردم، ئیدی ڕاستەوڕاست بەرەو نهۆمی سێهەم ڕۆیشتین."

پیاوێکی بوێر. پۆلیس بڕوایان پێکرد، بەڵام خۆ دەشکرا لێی دوودڵ بن. مستەر بن زڤی سەلامەتی خۆی خستە مەترسییەوە بۆ ئەوەی مستەر بن زییڤ بتوانێ لەسەر "ئەو ئیشانە" بەردەوام بێ، ئەوەش بەو هیوایەی کە ڕۆڵەکانی هەر دووکمان نەکرێنە کۆیلە.

## 4

ئێمە دوای ئەوە هەر زوو وازمان لەو ژێرزەمینە "زۆر کراوەیە" هێنا. لە هوتێلی ساڤۆیەوە گواستمەوە خانوویێکی بچکۆلانەی دابڕاو لەسەر لێواری گەڕەکی یەمەنیەکان لە پێتا تیکڤا. ڕەوشی ئەوێ قورس بوو. خانووەکە چۆڵکرابوو. با بە ڕۆژ و شەو لە پەنجەرە و دەلاقە شکاوەکانی دەدا. بەشەو سارد و تاریک بوو. نە کارەبای هەبوو نە گەرمیی. بەڵام من یەک خۆشیم لەو ڕۆژانە دەبینی: من لەسەر پەتۆکانی هارۆلد ماک میشێل، کۆمیسیاری باڵای بەریتانی دەڕازام.

لە حوزەیرانی ١٩٤٢دا ئیرگون نەخشەی گرتنی ماک میشێلی داڕشت، تا دەسگیر بکرێ و لە باڵەخانەیەکی نزیک پیتاهـ تیکڤا، نزیک ئەو خانووە لاپەرگەیەی منی تێدا ژیام، دەستبەسەر بکرێ. ئەم نەخشەیە زۆر بوێرانە و لە ڕووی سیاسیشەوە ساویلکانە بوو، دواتر دووبارە لە لایەن گروپی "ئام لۆهێم" کە پێکهاتبوو لە هەندێ ئەفسەری لاوی هاگانا بە هاوکاری ئەفسەرەکانی ئیرگون. لەبەر چەند هۆیەک پلانەکە لە کاتی خۆی جێبەجێ نەکرا.

لە هاوینی ١٩٤٤دا، دوای یەکەمین ماوەی قەدەغەکردنی هاتووچۆ، ئێمە دوو نەخشەی جێگرەوەی ماک میشێلمان دانابوون. یەکەمین دزەکردن بوو بۆ نێو

بارەگای کۆمسیارانی باڵا و تەقاندنەوە لاباڵی ئەو پیاوەی لێدەژیا چونکە بەرپرسیار بوو لە گرتن و کوشتن. پلانی دووهەمیش گرتن و دەستبەسەرداگرتنی شوێنەکە و گرتنی ماک مێشیل و داروودەستەکەی وەک دیل و جاڕدانی کۆتاییهاتنی دەسەلاتی بەریتانی لە وڵاتەکەمان. هەر دوو پلانەکە بە درێژی لێی کۆڵرایەوە. لەو نێوەشدا هەندێ ئامادەیی بۆکرا، شوێنەکە پشکێنرا، بنگە و هێڵەکانی ئۆپەراسیۆنەکە دیاریکران و شوێنپێی نێچیرەکەش هەڵگیرا. بەڵام دوای بەدواداچوونمان بۆمان دەرکەوت، دوای یەکەمین ئۆپەراسیۆنمان بارەگای کۆمسیارانی باڵا هێزێکی بەرچاوی بەرگریان بۆ هاتووە. ئێمە ئەو شتەمان هەڵسەنگاند کە لەو بارودۆخەدا دەبێ هەموو هێزی کاریگەری بەردەستمانی بۆ بەکاربهێنین. بۆیە ئێمە بە پلانەکەماندا چووینەوە. گەیشتینە ئەو دەرهاوێشتە نابێ هەموو شتێک لەسەر یەک ئامانج دابنێین، هەرچەندە ئۆپەراسیۆنەکە بەو گرنگییە سیاسیانەش بێ. ئێمە هەر بەتەواوی وازیشمان لە پلانەکەمان نەهێنا، بەڵام جێبەجێکردنەکەمان هەڵگرت بۆ کاتێک کە بەهێزتر ببین.

لەو نێوەشدا جێسەرنجی ئێمە کەوتە سەر رامەڵلا، بۆ سەر وێستگەی سەرەکی رادیۆی رژێمی بەریتانی. پیاوەکانمان دەستیان بەسەر وێستگەکەدا گرتبوو، بە فەرمیش بەرنامەی فەلەستینییان وەستاندبوو، لەجیاتی ئەو بەرنامیەیە بانگی گەلی جوو و نەتەوەکانی جیهانیان تێداکردبوو کە بەهانای جووەکانی ئەورووپا بێن و جووەکان لەژێر نیری بەریتانی رزگار بکەن.

ئەم پلانەش لە رۆژەکانی خۆیدا کارێکی ئاسان نەبوو. ئاخر هەر لە نزیکی وێستگەکەوە مۆڵگەیەکی پۆلیسی لێبوو. دراوسێکەشی عەرەب بوون و زۆریش لە مەڵبەندی جووەکانەوە دوور بوو. وەک هەر جارێک ئێمە لە گواستنەوەدا کورتمان هێنا. بۆ سێ شەو ئێمە بێهودە لە بارەگاکان چاوەڕێی دەنگی جاڕدانەکەمان کرد. دووجاران پیاوەکانمان لەبەدەستهێنانی ئامێر و هۆیەکانی گواستنەوەی پێویست شکستیان هێنا. بۆ شەوی سێهەم، توانیان چەند ترومبێلێکی باربەر بگرن و یەکەکەمان گەیشتە وێستگەی رادیۆکە، لەبن لووتی پۆلیس کە بنکەیان لە نزیکەوە بوو، توانیان بیگرن. پۆلیس شێلکەی ئاگری چەکەکانیان رووی لە پیاوەکانمان کرد و گوللەی ئاگرداریشی بۆ بەهاناوەچوونی زیاتر هەڵدایە ئاسمان.

بۆ یەکەمین جار بە هاوەنی دەستکردی خۆمانە کەوتنە شەڕ، دواتر عەرەبەکانی ڕامەڵلا گوتبوویان کەوا چەکی قورسیان بەکارهێناوە. پۆلیس پێی باشتر بوو لەنێو بنکە قایمەکەی خۆیدا بمێنێتەوە. لەنێو ویستگەی گواستنەوەی پەخشەکەشدا، ئاڤیتاگارم یەکێ لە ئەفسەرە هەرە ئازاکانمان، چەند جارێک دەمانچەکەی بەهەوادا تەقاند، ڕووی لە کاربەدەستە حەپەساوە بەریتانی و عەرەبەکان کرد. پێیان گوترا، هیچ ئازارێکیان پێناگا گەر یارمەتیان بدەن و دەنگیان بەهەوادا پەخش بکەن. بەڵام ئەوە ڕوونبووەوە کە لە ڕامەڵلادا ستۆدیۆی پەخشی لێ نەبوو، بەڵکو لە ئۆرشەلیمدا بوو، ئیدی ئەستەم بوو دەنگیان پەخش بکرێ.

دوای ئۆپەراسیۆنەکەی ڕامەڵلا، چەندین نەخشەی پەلاماردانی بارەگای سەرەکی کۆمسیارانی بالای بەریتانی دووبارە تاوتوێکرانەوە. ماک میشێلیان لەسەر پۆستەکەی خۆی نەهێشتبوو. (هەر بەر لەوەی ماک میشێل وڵات جێبێڵێ، جەنگاوەرانی ئازادی پەلامارێکی سەرنەکەوتوانەیان بۆ دا.) وەک زۆر لە کاربەدەست و ئەفسەران کە لە ئێرتز ئیسرائیلدا شکستی هێنا، ئەویان ناردە مالایا. لە کۆگاکانی ئێمەش لە پێتاتکڤادا چەند شتێک بە وریاییەوە ئامادەکرابوو تا دەستگیری بکەن. لەنێو ئەوانەشدا چەند بەتانییەک، ئیدی بەختی منیش وابوو ئەو شتانە لە ماڵە دابڕاوەکەمدا بەکارهاتن. من دەتوانم گەواهی بدەم، ئەو کەلوپەلانە باش بوون، بە کەڵکی بەکارهێنان دەهاتن. لێ گەلۆ پێخەفەکە -کە هیچ مێژوویێکی تایبەتیانەی نەبوو- بەداخم بڵێم پەڕپوت بوو...

## بەندی 8
## پیاوێک بە چەند ناوێکەوە

١٩٤ - ١٩٥

پاش ماوەیەک وازم لە پەتۆکانی ماک میشێل هێنا و لەوێ بارمکرد، ئەمجارەیان لەگەڵ هاوسەر و کورەکەمەوە بۆ خانوویێکی بچکۆلانە لە گەڕەکی هاسیدۆف گواستمەوە. لەوێدا ناوم کردە ئیسرائیل هالپەرین.
گەڕەکی هاسیدۆف لە ڕیزە خانوویێکی نەوی پێکدەهات، دەکەوتە سەر ڕێگای کفرسیکین، لە نزیک لیدا. ئەوێ گەڕەکێکی قەراخ شاری کرێکاران بوو، سنووری شارەوانیەکەی کەوتبووە سەر پیتا تیکڤا، هەر لە بەرامبەری ئەو گوندەی عەرەبان بوو بە ناوی فەججە. لە ماوەی نێوان ١٩٤٤-١٩٤٥ زۆرجاران خانووەکانی گەڕەکەکە بێ ئاو دەبوون، کارەباشی هەر لە بنەڕەتدا نەبوو. بەڵام لە دەوروبەریدا کەسکایی هەبوو، لەوێدا کێڵگە، باخچەی ڕەنگین، داروبار و ڕەزی دارپرتەقاڵ هەبوون. هەر بیانییەک بیدیتبا گومانی نەدەما، گوایە ئەم شوێنە پڕ داروبارەمان هەڵبژاردووە، چونکە لەبارە. کەچی ڕاستیەکەی وانەبوو. ئەویمان هەر بە ڕێکەوت دۆزیەوە. ئەوێ هێمن و هەرزان بوو، بەگوێرەی تاکتیکەکانی باری "کراوەیی ژێرزەمینییەکەشمان" ئێمە چووینە ئەوێ تا وا دابنێین باشتر خۆمان شاردۆتەوە. وامان دانابوو، بە خەیاڵی دەسەڵاتدارەکاندا نایەت، کە "سەری تیرۆرستان" لە شوێنێکدا بژین، هەمووان بە دەورورواسیکانی بزانن. لەم کارەشماندا شاش نەبووین.
نزیکەی ساڵێک لەو گەڕەکە لاچەپەی قەراخ شاردا و لەنێو بێدەنگی برادەرانی ژێرزەمینیی و هاروهاجی نەیارەکانمان ژیام. یەکێک لە ئاکنجییەکانی ئەوێ دەیزانی. ئەو یەکەمجار کە بە بەردەم ڕیزە خانوویێکدا تێدەپەڕیم، منی بینی و ناسیمیەوە، بەڵام هیچیشی نەگوت. خانەخوێکەشم پیاوێکی میهرەبانی کڕوبێدەنگ بوو. باقی دراوسێکان کەمترین گومانیان نەبوو. ئەوان هەموو شتێکیان بە سروشتی لێحاڵیبوون بینی. بە دراوسێکان گوترابوو خێزانی هالپەرین خێزانێکی پەنابەرە و لە پۆلۆنیاوە هاتووە، هێشتاش جێوڕێی لە شاردا بۆ نەکراوەتەوە. بە ڕاستیش وا بوو، پیاوی خێزانەکە هەموو ڕۆژێک

بۆ ئیش دەرنەدەچوو، بەڵام خۆ بۆ ئەوەش ڕوونکردنەوەیەکی ماقوڵانە هەبوو. ئێمە خۆبەخشانە بە دەر و دراوسێمان گوت، ئێمە لەسەر باربووی ڕێکخراوی کۆمەکی پەنابەرانە دەژین، ئیدی خۆم بۆ تاقیکردنەوەی قانونیانەی فەلەستین ئامادە دەکەم، بۆیە لەمەودوا لە ماڵەوە کار دەکەم. خاوەنی خانووەکەش مستەر مالکیلی بوو، پیاوێکی باش بوو، ئەو دەیزانی "ئەو کاروبارانەی" من سەرەدەری لێدەکەم پەیوەستن بە قانونەوە. مالکیلی ئەندامێکی ئیرگون بوو، مێریدۆریشی دەناسی، ئاخر ئەو ئەفسەری فەرماندەکەی بوو هەروەک چۆن هی ئیتان و دانیال و بنیامینیش بوو. ئەو هەموو ئەفسەرانەی دەبینین بەردەوام سەردانم دەکەن، بەڵام لە هەوڵی لێکدانەوەی بابەتی سەردانکردنەکان گەیشتبووە بەرەنجامێک، کە شتەکە پەیوەندی بە لایەنی قانونییەوە هەیە و ئەوانیش هاتوونە لای من بۆ ڕاوێژ سەبارەت بە دادگای جەنگاوەرە ژێرزەمینیەکان کە گیراون. پێدەچوو ئەو کرێچییە[50] زیاتر بەلای پارێزەریدا بڕوا لەوەی "فەرماندەکە" بێ. دواتر کابرا ڕاستیەکەی زانی. بەڵام سەرباری مەترسی سەر ژیانی خۆی، پارمەتییێکی باشی دام، کەچی پێموانەبوو هێشتاش ئەو ڕای خۆی لەسەر ڕووخساری کرێچییەکەی گۆڕیبێ.

ئێمە هەر زوو نەوەک هەر لەگەڵ خانەخوێکە، کە دەیزانی بەڵکو لەگەڵ هەموو دەرودراوسێشدا، کە نەیان دەزانی من کێم، بووینە ئاشنا. کوڕەکەم ڕاهات لەگەڵ مندالەکانی شەڕ و یارییەکانی خۆی بکا. لەگەڵ دراوسێکان سەردانی یەکدیشمان دەکرد. خانووەکەمان پڕبوو لە بەرگە کتێبی قەوارە ئەستووری قانونی. ئیدی مایەی هێدمەگرتن نەبوو بزانرێ، لە گەڕەکی هاسیدۆفدا، لەنێو جەنگاوەرانی ژێرزەمینییدا خەریکبوو کرێ و مزی ڕاوێژە قانونیەکان وەربگرم. یەکێک لە ئاکنجیانی گەڕەکەکە کێشەی لەگەڵ شارەوانی پیتا تیکڤادا سەبارەت بە دامەزراوێکی بچکۆلانە هەبوو گوایە پەسەندنامەی وەزارەتی تەندروستی لەگەڵدا نییە. داواکارەکە لێیپرسیم بەڵکو داوایەکی بە ئەدەبانە بەڵام دڵنیایانەی لە دژی شارەوانییەکە بۆ بنووسم. بۆ منیش سەخت بوو دواکەی ڕەتکەمەوە. ئیدی من بوومە کۆیلەی نامەکە، ئەمەش نەوەک لەبەر ناوەڕۆکەکەی بەڵکو لەبەر دەستخەتەکە بوو. ئاخر دەستخەتەکەم باش

---

[50] مەبەستی نووسەر لێرەدا خۆیەتی. وەرگێر

ناخوێندرێتەوە. کاربەدەستانی شارەوانی پیتاه تکفاش خۆ (روهاما) نەبوو، کە سکرتێرەکەی هەرئەوە نەبوو نهێنییەکەمان بشارێتەوە، بەڵکو دەشیزانی چۆن لە دەستخەتەکم حاڵی بێ و کۆدەکانیشی بکاتەوە. لەوەش زیاتر لەوە تێگەیشتم سەرباری میزاجی ئەو کاربەدەستەی نامەکەی دەچێتە بەردەم، ئەوا دەستخەتە هیرۆگلیفیەکەمی لێ دەبێتە بەلا. بۆیە هەوڵمدا نامەکە بە پیتی خڕ و خەتێکی درشت بنووسم. من دەبوایە زۆریش بە ڕوونکردنەوەی داواکە ماندووبم، کاتێک کابرای شیرفرۆش دەیبینی ماندوبوونێکی زیاد لە پێویست بە نامەکەیەوە دەبینم، ئەویش وای دەبینی ئەو شتە لە چاوی دراوسێتییەوە دەکەم نەوەک لە بەرامبەر پارەدا.

من زۆر یادەوەری خۆشم لەو گەڕەکە دڵخۆشەی هاسیدۆف هەن. لە ناندینە بچکۆلانەکەدا، لەبەر تیشکی چرایەکی بچووکی نەوت، یان لەبەر مۆمدا، ئێمە کۆبوونەوەی فەرماندەیی بالامان دەبەست، لەوێدا بڕیاری گرنگ و پلانی ئۆپەراسیۆنەکانمان دادەڕشت. "دۆستەکان" ئەوانەی سەردانی ماڵباتی "هالپەرین"یان دەکرد، دنەی هیچ گومانێکیان نەدەدا. ناوەناوەش یارمەتی گەڕەکەکەیان دەدا: ئەوان ژمارەی ئەو دە کەسەیان پڕ دەکردەوە کە لە ڕێتوێلی نوێژی سەر مردوو لە سیناگۆکە بچکۆلەکەدا دەکرا. هەندێ جاریش، لە ئێوارەی شاباتدا یان لە شەودا، بەیەکەوە دەردەچووین و بەناو کێڵگە و ڕەز و باخەکاندا پیاسەمان دەکرد. ئیدی بەدەم ڕۆیشتنەوە کۆبوونەوەی خۆمانمان دەکرد و بڕیارمان لەسەر سیاسەت دەدا. شوانێکی عەرەبیش لەولاوە، لەلای ڕانەمەڕەکەی سڵاوی لێدەکردین، نەوجەوانە لاوەکانیش لە دەوروبەرمان خەریکی یاری خۆیان بوون. کەس خەیاڵی بۆ ئەوە نەدەچوو، ئەم پیاسەچییە بێوەیە لە لایەن دەزگای نهێنی بەریتانیی و پۆلیسەوە بە درێژی و پانی وڵاتەوە ڕاودەنرێن.

هەروەها ئەوەشم لەبیرە، سیناگۆگێکی بچکۆلە لە بەرامبەر ماڵەکاندا هەبوو. لەو سیناگۆکەدا ئامادەی نوێژەکانی شابات و ڕۆژەکانی پشوو دەبووم، لەوێدا ناوی ژێرزەمینیم ئیسرائیل بوو. لە یەکەمین شاباتدا، دوای ئەوەی گەیشتمە گەڕەکەکە، منیان بەوە شەرەفمەند کرد، وەک ئاکنجێیکی نوێ هەڵبستم و هەندێ لە تەوراتەکە بخوێنمەوە. یارۆی ڕێتوێلەکە ناوی منی پرسی. ترسام نەبادا ناوی یەکەمی خۆم لەگەڵ ناوی باوکم بڵێم، ئەمەش

دەکرا بە هۆیەوە یەکێک بمناسێتەوە. بۆیە بە دوودڵی گوتم "ئیسرائیل کوڕی زیف دۆڤ". پێموابێ بۆیە ناوی ئیسرائیلم لێگرت، چونکە لە ڕێی برادەرەکەم ئیسرائیل ئێپستاین زۆر پێیەوە پەیوەست بووم. ئیدی لەو کات بەدواوە، تا ئەو کاتەی باری ژێرزەمینیمان بەجێهێشت، هەمیشە هەر بەهەمان ناوەوە بانگکرام. من دەبێ داوای لێبووردن لە پەروەدگاری مەزن بکەم، کە ناوی ڕاستەقینەی خۆم تەنانەت لە بەردەم سرووتی خوداییشدا شاردەوە، بەڵام خۆ ئەو لە ڕەوشی من دەگەیشت، هیچ چارەی دیکەم لە بەردەمدا نەبوو.

هەر لە گەڕەکی هاسیدۆفدا بوو ئەزموونی یەکەمین شالاوی ڕاوەدونان و لێگەڕانی پۆلیسی فەلەستینی بە هاوکاری قۆشەنێکی لەشکری داگیرکار کرا. لە ٥ی ئەیلولی ١٩٤٤دا بە هێزێکی زۆری سەرباز و پۆلیسەوە دەورەی پێتاه تیکڤا درا. شارەکە بووە مایەی سەرنجی دەسەڵاتدارنی ماندات. ئەوان بێشەرمانە دەیانگوت: "پێتاه تیکڤای نەفرەتی پڕیەتی لە تیرۆست."

خۆ ئەوان لەودا هەڵە نەبوون. پێتاه تیکڤا، بە خەڵکە ئازادەکەیەوە، تا سەر ئێسقان لە خزمەتی باری ژێرزەمینییدا بوون. جەنگاوەرەکانمان ئازادانە بێستان و باغ و باغاتی پرتەقالیان بێ زیان پێکەوتن بەکاردەهێنا. کێڵگەکان و داروبارەکانی دەڤەرەکە دەکرێ زۆر سەربردە و چیرۆک لەمەڕ شاردنەوەی چەک و جبەخانە، بەنهێنی مەشقی سەربازییانە، گەڕان و سوڕانی چەکداران و ڕاهێنانەکانیان بگێڕنەوە. دارەکان نهێنیپارێزی گەنجەکانی پێتاه تیکڤا بوون، کە بەکەیف و سەفا و ئازادانە و بێترس دەهاتن و دەچوون، زۆرجاریش زەبریان بەردەکەوت، بەڵام چاکدەبوونەوە و لەوێ خۆیان بۆ جەنگ و بەرگری تەیار دەکردەوە. دوو جار سووپای دەسەڵاتداران بە هۆی زانیاریدانی جووەکان، تا ڕادەیەک لەوەدا سەرکەوتن هۆبەی خۆجێی ئیرگون زڤای لویمی لەناوبەرن، بەڵام هەموو کاتیش پلە و بۆشایی ڕیزەکانمان بە خوێنی گەنج و جۆش و خرۆشی زیاتر پڕدەکردنەوە، زیاتر و بەهێزتریش لە ڕۆژی پێش لەناوبردنەکە. پێتاه تیکڤا موفەڕکئاسا "پڕ لە تیرۆرست" بوو.

دەسەڵاتداران لەگەڵ ڕۆژئاوابووندا دەستیان بەگەڕان و پشکنینی خۆیان کرد. شارەکە لە هەر چوارلایەوە ئابڵوقە درا. باری قەدەغەکردنی سەر هاتووچۆ ڕاگەیەندرا. سەربازەکان بە شەقامەکان وەربوون. بە بڵندگۆش هاواریان دەکرد:

"هــاتووچۆ قەدەغەیە، هــاتووچۆ قەدەغەیە! لەنێــو ماڵەکانتانــدا بمێنــنەوە! هەرکەسێ لە ماڵ بچێتەدەر، ئۆباڵی ژیانی خۆی لەملی خۆی!"
ئیدی هەمــوو ماڵێکیــان گــرت و لە هەمــوو کەسێکیشــیان دەپرســییەوە. بە ڕاســتیش ئەمە کنە و پشــکنینێکی مەزن بــوو. ســەرباز و پۆلیســەکان هیــوای 'نێچیرێکی باشیان" بۆ یەکدی دەخواست.
لەگەڵ ڕۆژهەڵاتنــدا، دراوســێکەم کە بەم شــتەی زانیبــوو، لە خەو بە ئاگــای هێنام و هەرچی ڕوویدابوو بۆی گێرامەوە. شتێکی خۆڕسکیش بــوو هێندێک نیگەران بێ. ئاخر ئەو چیرۆکەی گێڕایەوە، هی خۆشحاڵی نەبوو.
"هەوڵمدا خۆم بگەینمە پتاه تیکڤا" دراوسێکەم وای بۆ گێرامەوە، "بەڵام دەستە گەڕۆکەکان منیان گێرایەوە. ئەوان لە هەر چوار کەنــار بــوون. کەس نەدەکرا بەنێویاندا تێپەڕ بێ. بێگومــان بۆ ئێرەش دێن. پێمــوایە هەوڵێک بــدەی لە ڕێی ڕەزوباخی دارپرتەقاڵەکانەوە لێرە بڕۆی."
من بە گوێی ئامۆژگاری کابرام نەکرد. دانییێلیش، کە هەمــوو شــەوەکە لە مــاڵ مابووەوە، لەگەڵ مــن کــوک بــوو بەوەی پێویســت ناکا بەرەو بــاخەکە رابــکەم. ئەم هەڵاتــنە نەوەک هەر لەبەرچــاوی دراوســێکان کۆتاییمــان پێدەهێنێ، بەڵکو لەوانەشە بمگەیەنێتە باوەشی دوژمن. وا باشترە چاوەڕێی سەرئێشەکە بکەی لەوەی لەنیــوەی ڕێگــا تووشــی بێی. هەڵــبەتە ڕەوشــەکەش دژوار بــوو. بەڵام ئێمە پشتمان بە مەودای دژبەری نێوان سەرباز و پۆلیس و هەروەهــا بەختی خۆشمان بەستبوو. بۆیە لەو شــوێنەی لێیبووین ماینەوە، دانییێل لە ژوورەکەی خــۆی منیش لە هــی خــۆم. ئێمە دەمانەویســت وا نیشــانی دراوسێکانیشــمان بــدەین، کە باکمــان بە نزیکبــوونەوەی پۆلیســەکان نیــیە. هەر بۆیەشــە لە ژوورەکانمــان دەرچــووین لە بەردەم دەرکەی ماڵەکەمــان وەســتاین. ئێمە لەو وەستانەماندا بووینە گەواهیدەر بەســەر دیمەنــی ســەیروســەمەرە. لەســەر ڕێگــا ســەرەکییەکە کە هەر دووســەد گەز لێمــانەوە دوور بــوو، تانــک و تــرومبێلە چەکدارەکانی بەریتانییەکــان پەیــدا بــوون، ترومبێلەکــان پــڕی چەکــدار بــوون، خەریکی جووڵە بوون. پۆلیسێکی جوو، کە پێشــتر لە هەمــان گەڕەک ژیابوو، بەغــار هاتەلامــان و دڵنەوایــی بەوە داینــەوە، چاوەڕوانیمــان درێــژە ناکێشــێ، ئەوەنــدەی پێنــاچی و هەمــوو شــتێک تەواو دەبــێ. بەڵێــنەکەی هــیچ دڵخۆشــی نەکردین. هیچ کەسێک بە شادمانی نەدەهاتە بەرچاو.

خانم سیگلی دراوسێمان، دایکی راهێل و میکی بوو، ئەوان لەو گەڕەکەدا زۆر ئاشنام بوون. خانمەکە زۆر نیگەران دیاربوو. هاوسەرەکەم بێهودە هەوڵی دەدا ئارامی بکاتەوە. لە دواییدا لەمتمانەکردن بە "خانم هالپەرین" لەبەر برادەرایەتی دانی بەوەدا نا، "هەڵبەتە خانم هالپەرین بۆ تۆ هیچ لەگۆڕێدا نییە. تۆ هیچت نییە تا لێی بترسی. بەلام من، بەتانیێکی سەربازی لە ماڵەکەمدا هەیە. ئاخر هەنووکە من چیبکەم؟ ئاخر من چیبکەم؟"
بەڵێ، لەوێدا هیچ نەمابوو بکرێ. هیچ نەدەکرا. ئێمە نامرادانە چاوەڕوانی پۆلیس و سەربازەکانمان دەکرد. ئەوان سەرلەبەری پێتاه تیکفیایان پشکنی، بەلام لەبەر هەر هۆیەک بێ لە قەراخ گەڕەکی هادیسۆف گەڕانەوە. بەیانیش بەسەرچوو. لە ئێوارەدا باری قەدەغەکردنی هاتووچۆ هەڵگیرا. دانییل بێئەوەی مەرەخەسیش لە مستەر هالپەرین بخوازێ، کە "بە ئاستەم دەیناسی" چووە سەر کاری خۆی. دووبارە هەناسەی ئازادیمان هەڵمژیەوە. ترسەکە لە بەردەرکەی ماڵەکەمان گەڕایەوە.
لێگەڕان و پشکنینەکە دنەی چەندان بەندوباوی دا. سەرجەم هاورێکانمان لە ڕەوشی وریاییدا بوون، هەموویان مێشکی خۆیان دەگوشی، بەڵکو ڕێگایەک بۆ ڕزگارکردنمان بدۆزنەوە. بەلام خۆ پێتاه تیکفاش بەتەواوی داخرابوو، کەلێنێک نەمابوو لێی بێنەژوور. دوای ئەوە چیرۆکەکە وا لەنێو خەڵکدا بڵاوببووەوە، بڕوا بە توانا و هێزی ئیرگون بکەن، گوایە یەکەیەکی بەهێزی سەربازەکانمان توانیویەتی لایەک لە ڕیزەکانی دوژمن دابدڕێ و ئابلوقەکە بشکێنێ و هەڤاڵەکانمان ڕزگار بکا. چیرۆکەکە یەکێ لەو ئەفسانانەی سەبارەت بە ئێمە بوو، ئەمەش چیرۆکی دیدارەکەمی لەگەڵ ژەنەراڵ بارکەر و سەربردەی بنەچەکە ڕووسیەکەمی یاد خستمەوە.
ڕۆژنامەکانی جیهان ڕەوشی چیرۆکی دیداری منیان لەگەڵ ئەفسەری فەرماندەیی هێزە بەریتانییەکان لە ئێرتز ئیسرائیل بڵاوکردەوە. ماکی چیرۆکەکەش لە سەر پێشنیازی ئەفسەرێکی دەستەی بارکەرەوە هاتبوو بەوەی ئێمە وەک "دوژمن بۆ دوژمن" لەگەڵ یەکدیدا بدوێین. ئەندامێکی هەواڵگری هاگانا لە ئۆرشەلیم کە پەیوەندی بە نوێنەرایەتی دەستەی بارکەرەوە هەبوو، بانگهێشتنامەکەی گەیاندبووە موشێ سنێی فەرماندەی هاگانا، ئەویش لە میانی یەکێ لە دیدارە دیاریکراوەکانماندا، لەمیانی ئەو

کورتە ماوەیەی یەکخستنی باسکی خەباتمان لە بزووتنەوەی بەرگرییەکەدا، پەیامەکەی پێگەیاندم. هەڵبەتە منیش بانگهێشتنامەکەم پەسەند کرد. قایلبووم وەک "دوژمن بۆ دوژمن" قسە لەگەڵ ئەفسەری فەرماندەیی هێزەکانی داگیرکەر بکەم، بەڵام من زمانی شەڕی لێکجیابوونەوەمان هەڵبژێرم. لەگەڵ ئەوەشدا لە ڕۆژنامە بیانییەکانم زانی، کەوا من نەوەک هەر لەگەڵ نوێنەری بارکەر کۆ نەبوومەتەوە بەڵکو لەگەڵ خودی خۆیدا.
چیرۆکەکەش دیاربوو مەیل و لایەنداریی بۆ باری ژێرزەمینی تێدا بوو. بەگوێرەی چیرۆکەکە گوایە مەرجم بۆ بارکەر داناوە، وەک من دەبێ بە تەنیا و بە جلکی مەدەنییەوە بێتە قاوەخانەیەکی دیاریکراو. بارکەریش بەگوێرەی ئەوانەی گێڕایانەوە، بە مەرجەکە قایل بووە، بەڵام قسەکەی خۆی خواردۆتەوە و بەیەک تیپ سەربازەوە دەوروبەری قاوەخانەکەی گرتبوو. ئەویش هاتە قاوەخانەکە، بەڵام دڵشکاوانە منی لەوێدا نەبینی. ئەو ماوەیەک لەوێ ماوەیەوە، چاوەڕێی کرد، تا دەهاتیش هەدادانی نەدەما. ئیدی لە دەوروبەری خۆی راما، بینی قەشەیەک لە گۆشەیەک دانیشتووە و سەری بەسەر ڕۆژنامەیەکدا داگرتووە. ئەم دیمەنەی پێخۆش بوو، بەڵکو کاتەکەشی بە دەم هەندێ قسەکردن لەگەڵ قەشەکە بەسەر ببا. دوای ماوەیەک، بینی بیگن هەر نەهات. ئینجا هەڵساو سوپاسی قەشەکەی کرد، کە ئەوماوە لە قاوەخانەکەدا یاوەری بووە. ڕۆژی دواتر گوایە نامەیەکی لە منەوە بۆچوو، ئەم دێڕە توندانەی خوارەوەی تێدا نووسرابوون:
"نەدەبوایە تۆ سۆزی شەرەف بشکێنی. تۆ بەڵێنت دابوو بە تەنیا بێیت. باشە بۆچی بەڵێنەکەت شکاند؟ تۆ دەزانی، ئیرگون هەمیشە خاوەن قسەی خۆیەتی. ئەمجارەشیان هەر لەسەر قسەی خۆمان بووین. سەرباری ناپاکییەکەشت من هەر هاتمە شوێنی کۆبوونەوەکە. ئەو قەشەیەی هەندێ قسەی دۆستانەشت لەگەڵ کرد، ئەوە خۆم بووم."
تەنانەت لەوەش وروژێنەتر ئەو چیرۆکەبوو، کە ڕۆژنامەیەکی سویسری بڵاوی کردبووەوە، لەوێشەوە پەڕیبووە سەر هەموو بەشەکانی جیهان. ڕۆژنامە گەورەکانی ئەمریکاش ئەو ئاوەیان ڕشتبوو، تەنانەت ڕۆژنامەیەکی یدیشیی زمانیش بەناوی (بوند) چیرۆکەکەی بەهەند هەڵگرتبوو. چیرۆکەکەش ئەوە بوو، گوایە ناوی ڕاستەقینەی من بیگن نییە بەڵکو (فرایمان)ە، گوایە من

مەشقی تایبەتیم لە کرەملین بینیوە و بەشداری ململانێی کۆمۆنیستم لە ئیسپانیا و چیندا کردووە پاشان لە لایەن خودی ستالینەوە نێردراومەتە ئێرتز ئیسرائیل تا بەریتانییەکان تەنگەتاو بکەم... ئیدی ڕۆژنامەنووسێکی گرنگی ئەمریکیی ئەوەندە لەژێر باندۆری چیرۆکەکەدا بوو، کاتێک سەردانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکام کرد، لە شیکاگۆوە بۆ نیویۆرک بە تەلەفۆن هەر لەگەڵمدا بوو.

ڕۆژنامەنووسێکی دیکەی گرنگی ئەمریکی لەو بارەیەوە لە دیدارێکی تەلەفزیۆنیدا پرسیاری لێکردم. منیش لە وەلامدا گوتم: "من لە ڕۆژنامەیەکی کۆمۆنیستی عیبریدا خوێندومەتەوە، گوایە دیداری نهێنیم لەگەڵ وەزارەتی دەرەوەدا سازداوە و لەو ڕێگەیەوە هەموو فەلەستینم بە تروما‌ن فرۆشتووە. ئیدی ئەو ڕۆژنامەیە منی بە فاشیست ناوبردبوو."

"ئاخر ئەوە چ پەیوەندی بە پرسیارەکەی منەوە هەیە؟"

"زۆر سادە،" منیش بەرسڤم دایەوە. "ئاخر ئەوە سەختە بڕیار بدەم ئاخۆ من ئاژانێکی ستالینم یاخود هی ترومان، یان هی هەر دووکیان، ئەوسا من چ کۆمۆنستێکی فاشست بم یان فاشستێکی کۆمۆنیست."

هەر لەوێدا زۆر ئەفسانە هەڵبەسترابوون. ڕاستیەکەش من هەگیز نەچووبوومە ئیسپانیا یان چین، یاخود کرەملین یان وەزارەتی دەرەوەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ڕاستیەکەی من ڕقم لە هەموو شێوەیەکی تۆتالیتاریی (گشتگیرییانە) بوو. من سەربەستی و پیاوە ئازادیخوازەکانم خۆشدەویستن و بڕواشم بەسەرکەوتنیان هەبوو ئەوسا لە هەر کوێ ستەمکاری و تۆتالیتاری بەهەر شێوەیەکەوە هەبێ. ڕاستیەکە -کە بگەڕێینەوە سەر چیرۆکی یەکەم- هەرگیز نە بارکەر و نە نوێنەرەکەیشم بینیوە یان ویستومە بیانبینم. ئەوە پابەندە بە ئەفسانەی بەختەوە، پەیوەندی بە پشکنینەکەی پیتاە تیکڤاوە هەیە، ڕاستیەکەش زۆر سادەیە: دەسەلاتدارە بەریتانییەکان گەڕان بەلام نەیاندۆزییەوە.

بەلام خۆ لەوێدا چیرۆکێکی دیکە یاوەری پشکنینەکەی گەڕەکی هاسیدۆف بوو، بەلام چیرۆکێکی ناخۆش. لە میانەی پشکنینەکە، بەڵکو لە سۆنگەی پشکنینەکەشەوە بێ، من خەزوور و برادەری هەرە نزیکم (د. ئارنۆلد)م لە دەستدا. ئاخر کاتی خۆی هەر لە ماڵەکەی ئەودا بوو، بەختم هەبوو کیژێکی

حەڤدەسالان، کە دواتر بڕیارمدا بیکەمە هاوسەرم، بینیم. لەو لێبژاردنەشدا هەڵەم نەکرد. حەزم لێ نییە زۆری لەبارەوە بدوێم. ساڵەکان هاتن و تێپەڕین، ئێمەش بەیەکەوە پیروخەڕۆ بووین. ئێمە بەیەکەوە کوپی تاڵاویمان نۆشی. ماڵباتەکەمان لەبارییەک هەڵوەشا. کوڕە بچکۆلەکەی ئارنولد لەبەر زگی دایکی هەڵگیرا و نازییەکان ڕەوانەی ژووره گازیەکانی تونی مەرگیان کرد. لە حەسرەتان دایکەکە خۆی کوشت. باقی خزمەکانیش یان بە دەستڕێژی گولله کوژران یان وەک کوڕە بچکۆلەکە لە لایەن ئالْمانەکان ڕەوانەی تونی مەرگ کران، ئیدی جەرگی ئارۆلند کونکون کرا. ئەو لە تەلئەبیب بوو کاتێک زانی شاری پیتاه تیکڤا ئابلۆقەدراوە. ئەو دەیزانی من لەژیاندا ماوم، زۆریش بۆمان نیگەران بوو. ئەو هەر ئەوێ ڕۆژێش مرد. من ئەو کات لەباری ژێرزەمینیدابووم، نەدەکرا یاوەری کۆنە هاوڕێکەم بم بۆ دوا مەنزڵ. برادەرەکانم لەباتی من بە خزمەت هەڵسان. بەڵام ئەوان نەیانتوانی ڕێ لە بەریتانییەکان بگرن لە ڕۆژی بەخاکسپاردنەکەدا چەند چاوشۆفارێک بنێرنە گۆڕستان، چونکە دەیانزانی خزمین. خێزانەکەشم هەر لەبەر ئەو ڕەوشە، ملکەچی قانونی ژێرزەمین بوو، نەیتوانی لە ناشتنی براکەیدا بەشدار بێ، کە یەکێک بوو لە دواپاشماوەی ماڵباتەکەی. ئێمە سەرکز و خەمبار لە ماڵدا ماینەوە. من دروودی کادیش (نوێژی مردوو)م لە سیناگۆیکی بچکۆلەدا لەسەر خوێند. مرۆ دەبێ بەرگە بگرێ. ئاخر بژاردەی دیکەمان لە دەستدا نەمابۆوە. بەڵام خەڵکەکەی دەرەوە، تۆ بڵێ بیانزانیبا، ئایا دەکرا بیانزانیبا؟

ئەو ماوەیەی لە گەڕەکی هاسیدۆف ماینەوە، نەزۆک نەبوو. ئیرگون بەمەحکەمی ئالای یاخیبوونی هەڵگرتبوو. زۆر لەوانەی لە ڕۆژانی تەنگژەی ناوخۆیدا بەجێیان هێشتبووین، گەڕانەوە نێو پلە و ڕیزەکانی خۆیان. زۆر خۆبەخشیشمان بۆ هاتن. ژمارەکەمان تا دەهات پتر دەبوو. کێرڤی متمانە بەخۆکردن هەڵکشا. لە هەمووشی گرنگتر: بڕوابوون بە هێز و تین و گوڕمان بێداربوو. ڕقیان لێدەبووینەوە خۆشیش دەویستراین، بەڵام بێزراو نەبووین. ـەر بزووتنەوەیەکی ژێرزەمینی قۆناخی حەتمیبوونی دەستپێشخەری ـوساوی خۆی تێپەڕێنێ، ئەوا نیوەی ڕێگای بڕیوە، لەوانەشە سەختترین نیوەی ڕێگا بێ بەرەو ئامانجەکە. لە ماوەی ئەو ڕۆژگارەدا من ناملیکەی "ئێمە لەو بڕوایەداین"م نووسی، تیایدا هاتبوو "بڕوای جێگیرمان بەوە هەیە،

بە خوێنمان داری ئازادی بۆ وڵاتەکەمان و داری ژیانیش بۆ گەلەکەمان سەوز بکەین." هەروەها نامیلکە، هەڵسەنگاندننامە و جارنامەی دیکەشم نووسین.
هەر لەو ماوەیەدا مەڵبەندی پۆلیسی بەریتانیامان لە ئۆرشەلیم تەقاندەوە، هێزی پۆلیسمان ناچارکرد لە دیواری لاوانەوە دوور کەوێتەوە، هەڵمەتمان بردە سەر قەڵا و چەپەرەکانی (تیگرات)، پەلاماری بنکەکانی پۆلیسمان لە سنووری یافا- تەلئەبیب دا، هەروەها لەبن کەپووی هێزەکانیان دەستمان بەسەر بڕێکی زۆر لە پۆشاک (جلوبەرگ)ی کۆگاکانی میریدا گرت، بەمە حکوومەتمان کردە گاڵتەجار. بەشێکی پۆشاکەکانمان بەسەر هەژاراندا دابەش کرد، بەشەکەی دیکەشمان فرۆشت و بە پارەکەش چەکمان کڕی.
کەچی لە کۆتایی ماوەکەدا هەورێکی رەشی چڵکن لە ئاسماندا کۆبووەوە. باهۆزی چەوساندنەوەی ناوخۆ لێمان نزیک دەبووەوە. "بڕی توندوتیژی" کە ئێمە دژی دەسەڵاتی مانداتدا بەکارمان هێنا، زیاتر بوو لەوەی چاوەڕێی بکەن. ئاژانسی جووەکانیش تا دەهات لە لەندەن و ئۆرشەلیمەوە گوشاری دەکەوتە سەر. داوا لە سەرکردەکانی کرا "بە تەواوی هاوکاری دەسەڵاتی بەریتانیا بۆ بنبڕکردنی تیرۆر بکەن". نموونەی ئەو ڕاپۆرتانە گەیشتنە دەستی ئێمەش. بەندوباوی ئەوە بڵاوبووەوە، سەرکردەکانی ئاژانسی جووەکان هاوکاریکردنی چەوسێنەرانیان رەت نەکردبووە، بەڵام بە ڕاستیش بەڵێندرابوو کە ڕێنمایی بەو زووانە بۆ "نەهێشتنی لادەرەکان" دەردەکرێ.
ڕەوشەکە تا دەهات خەستر دەبوو. ژمارەی چاو و سوسەکاران تا دەهات زیادی دەکرد. لەوەش زیاتر، زانیم یەکێ لە دراوسێکانمان مایەی گومانە. ئیدی نەدەکرا زیاتر لە گەڕەکی هاسیدۆفدا بمێنمەوە. لەنێو دراوسێکاندا ئەندامانی "هاشۆمەر هاتزایر" هەبوون کە باڵە توندڕۆکەی کۆمۆنیست/سۆشیالیستەکان بوو، مەیلیان لێبوو بە دژی ئێمە هاوکاری بەریتانییەکان بکەن. دراوسێکان زۆر لەگەڵ"مستەر هالپەرین" هاتیەوە(دڵ گەرم) بوون، لێ گەلۆ تۆ بڵێی ئەوان هەروا دۆستانە بمابانەوە گەر بۆیان دەرکەوتبا چی لەبن سەری 'پارێزەرەکە"دا هەبوو؟

ئیدی ئێمە خواحافیزیمان لە گەڕەکی هاسیدۆف کرد و بۆ تەلئەبیب گواستمانەوە. لەوێ لە خانوویکی بچووک لە شەقامی یۆشوا بن نوندا، ئەمجارە بوومە ئیسرائیل ساسۆڤەر.

2

یۆشوا، داگیرکەری کانان (کەنعان) یەکێ لە مەزنترین ژەنەڕالەکانی ئێمە بوو لە مێژوودا، شەقامێکی لاوەکیش لە باکووری تەلئەبیب بەناوی ئەوەوە کراوە. شەقامەکە بە هاوین تۆز و غوبار و بە زستانیش قوڕ و چلپاو لەلای زۆربەی دانیشتوانی شارەکەش نەناسراوە. شەقامێکی دووورودرێژیش بەناوی ژەنەڕاڵێکی دیکە کراوەتەوە، بەڵام ئەمەیان ئەلنبی، ژەنەڕاڵی بەریتانیە، لەو ڕێگاوەش نمایشی ریزۆیشتنی هێزی سەربازی جوو بەناو تەلئەبیبدا دەڕوا...

لە شەقامی یۆشۆڤا بن نوندا دوو شتی گشتی هەن /هەبوون/: یەکێکیان قەسابخانەیەکی شارەوانی و دووهەمیشیان ماڵێکی شارەوانی بۆ سەگە تۆڕیەکان. هیچ کامێک لەم دوو جێیە نەمایەی شایەستە و خۆشحاڵی گەڕەکە بوون نە مایەی خۆشئاوازی موزیک. لەوێدا بەردەوام وەڕینی نەبڕاوەی سەگە زنجیرکراوەکان بۆ ئازادی دەهات. ئەو ئاژەڵە بەستەزمانانە لەتاو ژیانیان نوسکەنوسکییان ڕێگا ڕۆژێک دەڕۆیشت. باشە ئەی لەبارەی بۆن...؟ نەخێر گەڕەکی یۆشۆوا بن نون بە هیچ جۆرێک مەرجی تەندروستی تێدا نەبوو.

ئیدی لەوێ، لە شوێنێک کە زۆریش لە ڕووباری یارکۆنی شین دور نەبوو، لە سەرەتای ماوەی ڕاوەدوونانە نێوخۆیەکاندا، خانوویکی بچۆکۆلانەی لاپەڕگەمان دۆزیەوە، کە باخچەیەکی وێرانە و وشکە دارپرتەقالی لێبوو. چاوی تیژی یاکۆڤ مێریدۆر پێیگوتبوو، هەرچەندە خانووەکە لە دەعبا چوارپێیەکان نزیکە، بەڵام شوێنێکی باشە، چونکە هەر هیچ نەبێ لە ڕاوەدوونانی دەعبا دوو پێیە دەستبەخوێن سوورەکان دوورە. هەرچی منیش بووم دوودڵ بووم. خانووەکەشیان بەکرێ نەدەدا بەڵکو بۆ فرۆشتن بوو. ئاخر چۆن چەند هەزار پاوەندێک لە بودجە لاتوپاتەکەمان دەربێنین و بەو خانووەی بدەین؟ هەڤاڵەکانم زۆر لە ناسەلامەتی گەڕەکی هاسیدۆف نیگەران بوون، ڕێگەیەکی دەرچوونیان دۆزیبووەوە. مایرخان کە بۆ ئەم ئامانجە تایبەتە ببووە "مستەر گۆلدهامەر" گوایە هاولاتییکی ڕەقوتەقی ئۆرشەلیمە،

خانووەکەی کڕی، بۆ دوو ساڵ بەکرێی دایە من. پاشان مستەر گۆلدهامەر خانووەکەی فرۆشتە جوێکی میسری، ئەویش دوودڵ بوو بەخۆی بێتە ناو، بۆیە قایلبوو کرێنامەکەی بۆ دوو ساڵ (تەنها دوو ساڵ)ی دیکە درێژ بکاتەوە. کەواتە ئیسرائیل هالپەرین، ئەو شاگردە بەڕێزەی قانون، لە گەڕەکی هاسیدۆف نەماو بزربوو، ئیدی لەنزیک لێوارەکانی ڕووباری پارکۆن هەمان کەس پەیدابووەوە، بەڵام ئەمجارەیان ناوی گۆڕا و بووە ئیسرائیل ساسۆڤەر.
گۆڕانەکە وەنەبێ هەر لە ناو شوێنی حەوانەوەم بووبێ، بەڵکو ڕووخسار و ڕەفتاریشمی گرتەوە. هەڤاڵەکانم بڕیاریان دا، دەبێ شێوە (ستایلی) پرچیشم بگۆڕم، چونکە هەر بە تەنیا هێشتنەوەی سمێڵیش بەس نەبوو، تا من لەبەرچاوی کەسوکار، بەتایبەتیش جووەکان بزر ببم و نەناسرێمەوە. بەردەوام لەسەرم مکوڕ بوون دەبێ ردێنیش بەربدەم. قانونی پیلانگێڕی لە باری ژێرزەمینیدا باڵکێش بوو، ئیدی لێگەڕام ردێنم بێت، بەمەش دە تا پازدە ساڵم بۆ سەر تەمەنم زیادکرد.
ئەوەش کارێکی ئاسان نەبوو. ئاخر خۆ ڕیشەکەت وا بە ئاسانی لە ماوەی شەو و ڕۆژێک لەنێوان شاری پیتا تیکڤا بۆ باکووری تەلئەبیب پەیدا نابێ. لە گەڕەکی هاسادیفدا من بە باری کتێبی قانونیەوە دەبینرام و لە شێوەی پرچداهێناندا ئازاد بووم. خۆ دەکرێ واز لەکتێبان بهێنێ، بەڵام ئەی ڕیشەکەم بەو پەلەپەلییە لە کوێ بێنم؟ وەڵامەکەش لای هەڤاڵەکانم دۆزرایەوە. بە دراوسێکانی گەڕەکی هاسادیف گوترا، من تازیەبارم، ئاخر منیش کەسێکی پابەندبووم بە دابونەریتی جووان، بۆیە دەبوایە بۆ ماوەی ٣٠ ڕۆژ سەر و ڕیشم نەتاشم. ئیدی دوای ئەو سێ ڕۆژە ڕاشکاوانە بوومە ئیسرائیل ساسۆڤەر، کە دەکرا رابیێکی هاوچەرخ بێ، یاخود سیاسەتبازێکی پارتێکی دینی، یاخود گوناهکارێکی تۆبەکار.
ڕیش و ڕەوشە نوێکەم هەندێک پابەندبوونی دەستنیشانکراوی لەنێو ژینگە نوێکەدا بۆ پەیداکردم. هەر لە یەکەمین ڕۆژەوە شەماسەی دلۆڤانی سیناگۆکە بچکوکەکەی نزیکمان، ڕێب سیخما داوای لێکردم هەرکاتێ یەکێ مرد بەڵکو بچمە سیناگۆگەکە بۆ ئەوەی ڕیزی نوێژی مردوو تەواو بێ. هەر دوای ئەوەش داوام لێکرا بۆ نوێژەکان بچمە سیناگۆکەکە. ئیدی ئەو سیناگۆکە بچکۆلانەیە لەو ڕۆژگارە سەختەی خەباتەدا بوو بەشێکی گرنگ لە ژیانم.

ئەنـدامانی ئەو سـیناگۆکە خەڵکـانی هەمەجـۆری تێـدابوون، وەک دەگـوترێ "ئـاپۆرایەکی تێکەڵـی خەڵکی" بـوو: هەر لە پیشـەوەرەکان، دەسـترەنگینەکان، دوکانـداری بچـکـۆلانە، کرێکارەکـان. ئەوان بە باوەشـێکی گەرم و پرسـنییەوە میوانە نوێیکەیان وەرگرت. پرسیارگەلێکیان لێدەکردم، دەبوایە منیش وەڵامم دابـانەوە. ئەوان شـوێنێکی بەردەوامیـان لەنێـو خۆیانـدا پێدام، ئیـدی منـیش بـوومە یەکـێ لەوان. دواتـر بیسـتمەوە، بە متمـانەپێبوونەوە دەیـانگوت، گەر بەریتانییەکان بۆ ماوەی دە ساڵی دیکە لە ئێرتز ئیسرائیلدا بمێننەوە، لەوانەیە من بۆ پلەی بـاڵاتر هەڵبکشێم و ببمە مجێوری سیناگۆگەکە. من لای ئەوان زۆر خۆشەویسـت بـووم، بەڵام هەرگیـز تخـونی دەمەتەقـێ سیاسـیەکان نەدەکەوتم، لەوانەشە هەر ئەوە هۆکارەکە بێ، کە وایان لە من دەڕوانی.

هەڵـبەتە لەوێـدا گۆبەنـد و مەترسـیش هەبـوون. ڕۆژێکیـان ڕێـب سـمیخ، شەماشـەکەمان هـاتە مـاڵ داوای لێکردم چاکەیەکی لەگەڵدا بکەم و لەگەڵیدا بچمە لای سـەرۆکایەتی رابینەکـان و گەواهـی بۆ گۆشتفرۆشـەکەمان بدەم بەوەی پیاوی باشە، کابرایەکە لەخوا دەترسێ و گۆشـتی "کۆشەر"یشـی زۆر دروسـت و حەلاڵە. شەماشـەکە پێیگـوتم، "ئەوان بـاوەڕ بەتـۆ دەکەن." منـیش نەمدەزانی ئاخۆ رابینەکە بڕوام پێدەکا یان نـا. بەڵام چوونە ئەوێ، بە نوێژی نیوڕۆ و ڕۆیشتن بەنێو شەقامێکی قەڵەباڵغ، چوونە بەرێوبەرایەتی رابینەکـان و وەستان و شاهیدی دان و پرسیار و وەڵام لەسەر کابرا، بۆ مـن زۆر بـوو، ئیـدی وەک ساسـۆڤەر لەو بەزمە ترسـام. شەماشـەکەش هەر سـوور بـوو لەسـەر داواکەی خـۆی، دەبـوایە بەهـانەیەکی باشـیش بـدۆزمەوە، بـۆ ئەوەی دەست لە من هەڵگرێ.

تەنـانەت گەورەتـرین مەترسـی ئەو ڕۆژانەش لە کـاتی دەمامکـداری منـدا، لەوەوە دەرچـوو کە لەنێـو ئەو کـۆمەڵگە ئەرسەدۆکسـە تونـدڕەوەدا خـۆم لەبیرکـرد، کە کێم و لە کـوێم. چەنـد جارێـک ناچـار بـووم پاسـاوی قـوڕس قـوڕس بێـنمەوە، کە درەنـگ یـان هەر نەدەچـوومە نێـو ئەڵـقەی گردبوونەوەکەیان. وایلیهاتبوو بەردەوام ئامادەی خوێندنی وانەکانی تەلمود و کۆمێنتەکـانی سـەر بایبل بم، هەمـوو دوای نیوەڕوانی ڕۆژانی شـەممە رابـی وانەکەی دەگـوتەوە. بـۆ ئەم دەرسـانە زۆربەی خەڵـکەکەی ئەوێ، ئەوانەی هەمـوو ڕۆژانـی هەفـتەش کـاری قوڕسـیان دەکـرد، ئامـادە دەبـوون. ئیـدی

پەرۆشـی خوێنـدنەکە بـوو تـا تاریکـایی دادەهـات لەوێ دەمـانەوە، ئەمەش ئەوەی بۆ سەلماندم، گەلەکەمـان چەند بەتاسە تێنوی زانیارییە. جارێکیان لە دەرسێکدا ناوی هێلین، شاژنی هاشمۆنین هـاتە گۆڕێ، ئەو شـاژنەی دیکۆری پەرستگای کۆتەڵەکەی بەرفراوانتـر کـرد. یەکێـک لە ئامـادەبووان پرسـیاری ئەوەی لە مـالمەکە کـرد، ئـاخۆ بۆچی ئەم شـاژنە عیبرییە نـاوی هێلین بـووە. مالمەکەش کە شارەزای کون و کەلەبەری زانیاری و یاسا و ڕێسـای عیبری بـوو، کاتێـک بـاس هاتبـایە سـەر کلتـووری گریکـی هیچـی پـێ نەبـوو، دۆش دادەما. منیش ئەو کات خـۆم لەبیرکردبـوو، بۆیە خـۆم تێهەڵقورتاند و گـوتم نـاوەکە گـریکییە، لە سـەردەمی هاشـۆنیندا زۆر جـوو نـاوی گریکیـان خواستبووەوە. ئیدی دەرودراوسێکانم ئەوق مـان، چـۆن مـن کتوپڕیـانە ئەو زانیـارییەم پێبەخشـین. ئـاخر ساسـۆڤەر (مەبەسـت خـودی بێگـنە-و) پێشـتر ناوورومەتی لەوەدابوو کە هیچی نەدەزانی.

"ساسـۆڤەر" ئەوان وایـان لێپرسـیم، "باشـە تـۆ ئەمەت لە کـوێ دەزانـی؟" پرسـیارەکەیان زیـاتر لە هەمـوو پرسیارەکانی سـەردەمی تاقیکردنەوەکـانی زانکۆکەمدا، شڵەژاندمی. ئـاخر سـەخت بـوو جـارێکی دیکە بێدەنگ ببمەوە و بـاری بێـدەنگی جـاران وەربگـرمەوە، سـەرچاوەی پرسـنیی ئامـادەبووان بڕەوێنمەوە.

ئەوەش سـەختە بـزانم ئـاخۆ دراوسێکان چـۆن لەبـارەی مـن و ئیشـەکەمیان دەڕوانـی. پێمـوابێ ئەوان گەیشـتبوونە بەرەنجامێـک، مـن هەر مـارەییە زۆرەکەی ژنەکەم دەخـۆم، بـۆ هـیچ شـتێک دەستنادەم. ئەوان پێیـان وانەبـوو مـن بـۆ هـیچ کارێـک دەسـتبدەم. ئەوان لەنـاخەوە بەزەییـان بە هاوسـەرەکەم دەهاتەوە، بەتایبەتیش ژنەکانیان.

"ئـای لەو ژنە گەنـجە بەسـتەزمانە." ئەوان وایـان دەگـوت، "ژنەکە هەر دەبـێ بەزۆر درابێـتە ئەو تەوەزەلە، ئەو خوێنـدکارە قەت تەواونەبـووە." منـیش بە دڵنیاییەوە مەیلم لێنەبوو خەیاڵ و ئەندێشەکەیان بەبا بدەم.

یەکەمین کچم لەو خانووە لەدایکبوو. ناوم نا هاسیا، ئەوەش نـاوی دایکمبـوو، کە لە نەخۆشـخانەی بریسک(شـوێنی لەدایکبـوونی مـن) بە دەسـتی نازییەکـان کـوژرا. هـاتنە سـەر دنیـای هاسـیا یەکێـک بـوو لە نهێنییە هەرە توندەکانمان، تەنهـا هەر شـەش کەس لە برادەرەکـانم بەو پرسـەیان دەزانـی. ئـاخر بـاری

ژێرزەمینی مامۆستایەکی ڕەق و توندە. لەوێدا ڕێگە نەبوو بۆ مردووەکان شین و ماتەم دابنێن، بۆ لەدایکبووەکانیش ئاهەنگ بگێڕن. کیژەکەم ڕەوشەکەمانی گۆڕی. دەسەڵاتداران کە پێشتر لە هەوڵەکانی خۆیان، بۆ ئەوەی بمدۆزنەوە، ساڵانێک بوو بەدوای "ژنێک بەخۆی و منداڵێک" دەگەڕان. هەنووکە ژنەکە بۆتە دایکی دوو منداڵ' ئیدی حکوومەت ئەمەی نەدەزانی، سەرەداوی هەموو شوێن پێهەڵگرتنێکی لە دەست دەرچوو.
هایسا چەند جارێک بە "قاچاخ" لەدایک بوو. ئەوەش نەوەک لەبەر ئەوەی نەمدەتوانی ناوی ڕاستەقینەی خۆمی بدەمێ، بەڵکو نەدەوێرام ناوە خوازراوەکەشمی بدەمێ. ئەستەمیش بوو ناوی لە تۆمارنامەی بە "ساسۆڤەر' یان ناونیشانەکەی دەقنووس بکرێ. هەروەها نەشدەکرا بچمە نەخۆشخانە و پێپیرۆزی. ئیسرائیل ئێپستاین ئەرکە قورسەکەی لە شانی خۆی گرت. ئەو ناوی خۆی بەخشیە ژن و کچەکەشم. ئەوەش خەریکبوو بکەوێتە بارێکی دژواری بەد لێکحاڵیبوون. ئاخر لە هەمان نەخۆشخانە و لە هەمان کاتیشدا، ژنێک بەناوی خانم ئێپستاین کوڕێکی ببوو. کاتێکیش ئیسرائیل ئێپستاین (دۆستەکەی من-و) دەگاتە نەخۆشخانەکە، پەرستارێکی دڵخۆش دێت و مژدەی دەداتێ: "بەڕێز ئێپستاین، بەختێکی باش بۆ تۆ، خێزانەکەت کوڕێکی بووە." ئیدی هەر دەبێ ڕەفتاری باوکەکە هەندێ بۆ پەرستارە میهرەبانەکە سەیر بێ. ئاخر لەجیاتی ئەوەی کابرا پەلە بکاو سەری ژنەکەی بدا، بەڵکو بایدایەوە تا هێزی تێدابوو غاریدا، ویستی خێرا بێتەوە هەواڵی لەدایکبوونی کوڕەکەم پێبڵێ. هەر تەنها دواتر بەد لێکحاڵیبوونەکە ڕەویەوە. ئێمە بەزانیی ڕاستیەکە زۆر دڵخۆش بووین.
بەڵام خۆ کچیش هەندێ ڕێورەسمی ئاهەنگێڕانی دەوێ. تۆبڵێی ئیسرائیل ساسۆڤەر بتوانێ خزمە نزیکەکانی لە سیناگۆگدا خۆشحاڵ بکا؟ بڕیارماندا ڕێورەسمەکە بەپێی دابونەریتەکە بەڕێوە بچێ. لە شاباتدا و لە سیانگۆکەکدا من بەگەرمی پیرۆزبایم بە بۆنەی لەدایکبوونی کچەکەم لێکرا، منیش لەناخەوە بەو خەڵکە باشە دڵخۆش بووم، کە یاوەری خۆشییەکانی گۆشەگیرییەکەم بوون.
بۆنە ئاهەنگئامێزە نایابەکە بەسەرچوو. هەموو شتێک ئامادەکرابوو، بڕوادارە دڵسۆزەکانی ژێرزەمین تەنانەت خوێ و ماسی هارینگی تایبەت بە

بۆنەکەشیان لەبیر نەچووبوو. هەمووان گوتیان هەرگیز بۆنە ئاهەنگێکی وا خۆش لە ساناگۆکدا رێکنەخراوە.
کاتێکیش رابییەکە، ئەو دینزانە بەخۆی و چاوە تیژەکان بەرەورووم هات پیرۆزبایی بکا، هەستێکی وام لا دروست بوو، بەڵکو داوای لێبکەم، ئەو ساوا پاکزادەیە پیرۆز بکا، کە جارێ بۆ چەندان ساڵ بە "ناقانونی" دەمێنێتەوە. بەلام وام نەکرد و بێدەنگ بووم، ئیدی هەر بەئاستەم لێوەکانم جوولان و پەیڤە فەرمییەکانی سوپاسگوزاریم لەدەم دەرچوون.
دوو جاران هێزەکانی حکوومەت بە نائاسودەیی لە ماڵەکەمان نزیک بوونەوە. یەکەمین جاریان، ئەو رۆژگارە بوو کە بەگرێدراوی بزووتنەوەی بەرگریکردن و راچەنین لە ئارادابوو. هاگانا ئەو نیمچە رەوشە قانونیەی خۆی کە بەحزوری دەسەلاتی بەریتانیەوە هەیبوو، لە دەستی دابوو، ئیدی پۆلیسە بەریتانییەکان بەدوای چەک و جبەخانەدا دەگەران. یەکێک لە هاورێ پۆلیسەکانمان هەر گەیشتە بەرامبەر ماڵمان. هەموو دراوسێکانیش بەو شتەیان زانی.
شەوێکیان لەدەنگەدەنگی ترومبێلی بارقورس بەگا هاتینەوە، کە دەیگوت: "یەک، دوو، سێ."
ئیدی چوومە دەر و لە کەلاوەی حەوشەکەوە سەیرم کرد، ئەوە ترومبێلی پۆلیسە بلندگۆیەکی لەسەرە و هەر فەرمان دەردەکا. بەدواداگەرانەکە سەرجەم گەرەکەکەی گرتبووەوە بە ماڵەکەی ئێمەشەوە. پۆلیس خرۆشابوو. منیش نەمدەتوانی بڵێم ئەوانە بۆ چەک دەگەرێن یاخود ماڵ بە ماڵ دەگەرێن و دەیپشکنن. لەوێش هەروەک گەرەکی هاسیدۆف هیچم بۆنەمابۆوە بەدەر لەوەی بە حەوسەڵەوە چاوەروانیکردن نەبێ.
لەگەڵ ئەوەشدا تەنها (رۆکسی) بێ حەوسەڵەبوو. ئەو دەیەویست بەیەکجار بەریتانییەکان راو بنێ، دیاربوو هەر ئەو وروژاویەش سەرنجی بەریتانییەکانی رادەکێشا. رۆکسی کسۆکێک بوو. ئەرێ چۆن دەبێ رێب ساسۆڤەر سەگی هەبێ؟ ئاخر ئەو پیاوە بەگوێرەی لێکدانەوەی دەوروبەرەکەی بێ، لە سەگ دەترسێ، چجای یەکێک بەخێو بکا. بە راستیش رۆکسی هەندێ جار سەرنجی نالەباری دەوروژاند. کاتێک ساسۆڤەر پەلی کورە بچکۆلانەکەی دەگرت، ئێوارانی رۆژانی هەینی و بەرەو سیناگۆکە ملی

ڕێگای دەگرتەبەر، ڕۆکسی بەدوایانەوە دەڕۆیشت. بەڵام ئەو چیبکا؟ ڕۆکسی هـی کریتشـینەکەی پیشوو بـوو، بەهەر هـۆیەک بـێ لە دوای خـۆی لەخانووەکەدا بەجێیهێشتبوو. دێڵە سەگەکەش ڕۆیشتبوو، دیاربوو بەدوای خاوەنەکەیدا وێڵ ببوو، کەچی لە دوایدا بەڕێگاکەی خۆیدا بۆ خانووەکە گەڕابۆوە. هەموو منداڵەکانیش چیرۆکەکەیان دەزانی، کە چۆن ئێمە ڕاومان نا تا دوور بکەوێتەوە؟
ڕۆکسی هەموو کەسێکی خۆشدەویست تەنها پۆلیس نەبێ. مـن هەرگیز ئاژەڵێکی وا دژە بەریتانیم نەبینیوە! بەدڵنیایشەوە خۆ ئەو سەگی من نەبوو. خـۆ ئەگەر بەمـن بـووایە، واملێـدەکرد بەتـایبەت لەگەڵ کاربەدەسـتە بەریتانییەکـان دۆسـتانە بێ. بەڵام پێدەچوو هەروا بە دژە بەریتـانی لەدایک بـووبێ. ئـاخر لەوە بەدەر نـاتوانرێ ڕەوشـەکەی ڕوونبکـرێتەوە، کە بـۆچی کسـۆکەکە لەگەڵ هەمـوو کەسـێک لاشـەڕە، لەگەڵ ژن و منـداڵانی گەڕەک دۆسـتە، کـاتێکیش هەر لە دوورەوە بـۆنی پۆلیسـی بەریتـانی دەکـا، خەریکە بنمـیچ لەگەڵ نەڕە و وەڕینـی بلەرزێنـێ. ئـای لەو شـەوە چـی ڕویـدا، کـاتێ ڕۆکسـی بـۆی دەرکەوت کە تەواوی یەکەی سـەربازی بەریتـانی بەو نـاوە وەربـوونە، لەوەش زیـاتر بەدەنگـی بەرز قسـەمان لەگەڵ دەکـرد، ویسـتمان هێـوری بکەیـنەوە، بەڵام چـی، هەر گوێشـی پێـنەداین. ڕۆکسـی حەزی لێبـوو ڕاویان بنێ، کەچی بەم ڕەفتارەی سەرنجی دەخستە سەر ماڵی خانەخوێکەی. ئەو شەوە لەوانەیە من زیاتر بەقەد ئەوەی ئەو ڕقی لە بەریتانییەکان دەبۆوە، مـن ڕقـم لەو بـووبێتەوە. بەڵام خـۆ کارەسـاتەکە تێپەڕی. لەگەڵ بەرەبەیانـدا، ڕۆکسی ڕێگای خۆی دۆزیەوە، ئاخر بەریتانییەکان ڕۆیشتبوون.
بۆنەی دووهەمیـان دژوارتـر بـوو. شـتەکەش لە کۆتـایی مـاوەی بزووتنەوەی بەرگری یەکگرتوودا ڕوویدا، بەشێکی چیرۆکەکەش پەیوەسـتە بە هـوتێلی شـا داود، لە بەندی دواتردا لەسەری دەدوێم.
هەر لە شەقامی یۆشوا بن نوندا بوو، لەگەڵ تـاکە نەخۆشـیەکەی ژێرزەمینیدا ناڵانـدم. لە هـیکەوە جەسـتەم کەوتە مـانگرتن لە خـواردن. بـۆ مـاوەی چەنـد هەفتەیەک نەمـدەتوانی خـواردن بخـۆم. دیـاربوو ئەمەش بەهـۆی کورتهێنـانی هەوا بوو. هەر چۆنێک بێ، بۆ چەندین ساڵ تاکە دەرفەتی هەوا هەڵمژینم ئەو کـورتە پیاسـانەی شـەقامەکەی گەڕەکەکەمـان بـوو. لەو نێوەشـدا مـن خـۆم

بەزیندانیتر دادەنا لە خۆبەخشە زیندانییەکان. هاوڕێکانیشم زۆر خەمی منیان خوارد، بەتایبەتیش وام لێهات لە چا خواردنەوەش بکەوم، ئیدی ئەوە نیشانەی کوشندەی نەخۆشییەکەم بوو. ئەڤراهام پێشنیازی کرد پزیشکێکی پسپۆر، دکتۆرێکی ناسراوی وەک (زۆندەک)م بۆ بێنن. من ڕەتم کردەوە. من دڵنیا بووم دەردەسەرییەکەم لە خۆیەوە دەڕوا. لەوەش زیاتر خۆ پێشنیازەکەی دژی ڕێساکانی ژێرزەمینیی بوو. بەڵام ئەڤراهام لەسەر قسەکەی هەر سووربوو، لەم پرسەدا مایریش پشتی گرت، ئیدی وایان کرد دکتۆری خۆیان (د. زۆندک)م بۆ بانگ بکەن. ئەویش ڕەچەتەیەکی بۆ نووسیم، لەگەڵ ڕاوێژێکی تایبەت بە چارەسەری: 'بەڕێز ساسۆڤەر، بۆچی هەر لە ماڵ دانیشتویی هەموو ڕۆژەکە هەر خەریکی دەرس و دەوری؟ پێویستیە بچیە دەر و هەوایەکی تەڕوتازە هەڵبمژی.'
ئەو نەیدەزانی، ناتوانم پەیڕەوی ڕاوێژەکەی بم. هەر چۆنێکیش بێ، چاک بوومەوە.
ئەو ڕۆژانەی شەقامی یۆشوا بن نون بە هەواڵ و پێشهات ئاوس بوو. ڕەفتاری ئیرگون لە ڕێی هاوڵاتییە جووەکان گەیشتبووە لوتکە. یاکۆڤ مێریدۆر ڕادەستی بەریتانیەکان کرابووەوە. ئێلیزاریش ڕفێندرابوو. ئەفسەرێکی دیکەی گرنگمان ناپاکیی لێکرابوو، ئەویش ڕفێندرابوو. ئێمە دەبوایە هەندێک بوەستین و بچینە قووڵایی ژێر زەمین.
لە ماوەی ئەو ڕۆژگارەدا ڕەفتارەکە بەکۆتا هات. ڕۆژی یەکێتی جەنگان لە ئاسۆوە هەڵات. یەکێتی بزووتنەوەی بەرەنگاری لەدایک بوو. هەر لەو ماوەیەشدا، دوای کۆمەڵێک ئۆپەراسیۆن، ڕەشەبا بەسەر حکوومەتی بەریتانی بارەگای سەرەکی هێزی چەکداری لە هوتێلی شا داودا هەڵیکرد و باهۆزی لەگەڵ خۆدا هێنا. هەر لەو ماوەیشدا بوو دوو لە جەنگاوەرە حوکمدارەوەکانمان لەژێر پەتی لەسێدارەدەران دەرهێنان. لەو ڕۆژانە هێرش لەسەر هێرشمان دەکردە سەر هێزی داپلۆسەر، ئیدی مەشخەڵی یاخیبوونەکە گڕی گرتبوو.

## 3

لە سەرەتای 1947دا ناچار بووم شەقامی یۆشۆڤا بن نون جێبێڵم. جارێ لە پێشەوە کرێنامەم لەگەڵ مستەر گۆلدهامەردا تەواو ببوو، بەڵام ئەوەی

لەوەش گرنگتـر بـوو، بـارودۆخەکە گـۆڕا بـوو. خـاوەنەکەی بڕیاریـدابوو هوتێلێک لەبەری باخچەکەوە دروست بکا. ئیدی سەخت بوو ژێر زەمین لە تەنیشت دەرگای هوتێلێک بێ. ئەو کات ژێرزەمینەکەمان زۆر کراوە دەبوو. دەزگای هەواڵگریشمان دەیزانی لەو بارەیەوە بەریتانییەکان سەرنجیان بۆ دەوروبەری شوێنەکە دەچێ. ئێمەش نەدەکرا لەوە وریاتر بین. یەکێک دەکرێ وا بکا نەکەوێتە بەردەستی حکوومەت، بەڵام خۆ دەکرا یەکێک بە ڕێکەوتە ڕووداوێک توش بێ و بگیرێ. ئیدی ئێمە نەدەکرا هەر پشت بە بەختی زۆر ببەستین. لەدواجاریشدا سەرکردەکانی هاگانا لەبارەی ڕیشەکەی منیان دەزانی. بەدرێژایی بەیەکەوە جەنگانیش، ئەوە هیچ کێشە نەبوو، بەڵام خۆ هاگانا جیابووەوە، ڕێگای خۆی لە پاسیڤیدا گرت و ئێمەش لە جەنگی خۆماندا خەستر بووینەوە، بۆیە وا باشتر بوو چیدیکە ئەوانیش نەزانن کە من ئەو پیاوەی بەڕدێنم. هەر چۆنێک بێ، بەڕای ئەفسەرەکەی ئاسایشم کرد و لەوێ بارم کرد.

کەواتە بەندێک کۆتایی هات و یەکێکی دیکە کرایەوە. بیچمی ڕێب ئیسرائیل ساسۆڤەر لە شەقامی یوشۆڤا بن نون نەما و لە شەقامی یوسف ئێلیاهۆدا، لەناو جەرگەی تەلئەبیبدا دکتۆر یۆناه کوینگسئۆفەر پەیدا بوو.

هەر بە ڕێکەوتیش لە کتێبخانەی گشتیدا پاسپۆرتێک بەناوی د. یۆناه کونیگسئۆفەر دۆزرابووەوە. هەرچەندە ناوەکە دوورودرێژ بوو، بەڵام ئەو چاکەی هەبوو ناوێکی تەواو ئەڵمانی بوو، کەس گومانی لە دڵسۆزی و ملکەچی ڕێسا و قانونێتی ناوەکە نەدەکرد. ئیدی بڕیارمدا باڵا بەقەد کاڵای ناوی پاسپۆرتەکە لێبکرێ، یان لەسەر پاسپۆرتەکە وێنەی منی لێبدرێ. ناو و ناسنامە نوێکەم لە کاتێکدا تەواو بوو، دەمتوانی بجوڵێم. کێشەی بوونی ئەپەرتمانەکەش هەر زوو چارەسەر کرا. مایر خان کە هەمیشە متمانەی بەخۆی بوو. ناوێکی نوێی بۆ خۆی دۆزییەوە و خۆی کردە بازرگان و باڵەخانەکەی بۆ "زاواکەی"[51] بەکرێ گرت، ئەوەشی پێگوتبوون کە "زاواکەی" لەبەر نەخۆشی ناتوانی کرێنامەکە مۆر بکا، خۆی هەموو شتێکی تەواوکردبوو. ئەپارتمانەکە زۆر لە تیاترۆخانەی هابیماهەوە نزیک بوو. مایر گوتەنی تاریکترین خاڵ ڕێک لەژێر چراکەدایە.

---

[51] لێرەدا مەبەست خودی نووسەرە. و

شەوێک پێش بارکردنەکە، ریشم تاشی. ئیدی ساسوڤەر بوونی نەما. سەیری خۆمم کرد دە ساڵ گەنجتر بوومەوە. سەرەتا سەیرم بەخۆم دەهات. کوڕەکەشم تەنها لەدەنگ ناسیمیەوە، هاواری بۆ دایکی کرد: "دایکە، پێموابوو مامێک هاتۆتە سەردانمان."

کوڕەکەم زۆری نەدەپرسی. شتێکی سەیریش بوو، ئاخر ئەو لە پرسیاری منداڵانەی نەدەکەوت، بە دەگمەن "لەو شتانەی" دەپێچایەوە. ئەو هیچی سەبارەت بە بارودۆخی باوکی نەدەزانی، بەڵام خۆ ئەوەی دەبینی باوکی لەبەیانیدا ریشی هەبوو، کەچی ئێوارە ئەویش نەما. کەچی بێدەنگ بوو. لەوانەیە خۆماکانە هەستی بەشتێک کردبێ. هەرچەندە واش بووبێ، چونکە دەیزانی من هەمیشە هەر لە ماڵم، ئەو بە کەسیشی نەدەگوت ئاخۆ کێ دێتە ئەپارتمانەکەمان. هەندێ جاریش کە شەیتانیی لەنێو چاواندا دیاربوو، بە سرتەوە پێیدەگوتم: 'ئەرێ باوکە، تۆ وەختێک ردێنت هەبوو، وانەبوو؟'

ئەوەش رازی نێوانمان بوو، هەرگیز بۆ کەسی باس نەکرد. هەرچی (هاسیا)ش بوو هێشتا بەسەر قسە نەکەوتبوو، ئیدی من لەولاوە دڵنیا بووم.

کەچی شتێکی نەخوازراوم لە گۆشەیەکی چاوەڕواننەکراودا لێڕوویدا. کاتێک خانمە خانەخوێکەی ئەپارتمانەکەمان لێبەکرێگرتبوو، بۆ یەکەمجار بەبێ ردێن منی بینی، دەموچاوم بە شێوەیەکی بەرچاو رەنگیان تێدا نەمابوو، سپیپاتە ببوو. ئیدی لای خۆی وای بۆچووبوو گوایە دەردە سیلە. ئەمەش پرسێکی گرنگ بوو بۆ ئەو، ئیدی بە جدیی بەدوایدا گەڕا ئاخۆ گومانەکەی راستە یان نا. بە خانمەکەشیان گوتبوو، من لە شاری پێتاە تیکڤاوە هاتووم. ئیدی لێیدابوو، چووبووە ئەوێ لە هەواڵی کرێچییە نوێکەی بپرسێ. هەر بە ڕێکەوتیش لەوێ شوێنێپێ یەکێک کە پاشناوەکەی کونیگسۆفەری هەڵگرتبووەوە کە بە ڕاستی سیلدار بوو. ئیدی ئەم نەخۆشییەی کرێچییەکەی زۆر بێزاری کرد. ئاخر کێ ناڵێ دەردەکەم ناتەنێتەوە، بەمەش سەرتاپای سەرنشینانی باڵەخانەکە کە من ئەپارتمانێکم لێ بەکرێ گرتوون، تووشی سیل ناکەم. ئیدی خانمی خانەخوێ بانگی مایەری "خەزوورم" دەکات و پێشنیازی بۆ دەکا لەوێ بۆ شوێنێکی دیکە بگوازمەوە. مایریش هەوڵدەدا بڕوای پێ بهێنێ، کە من سیلدار نیم، بەڵام بێهودە دەبێ. لە کۆتاییدا ژنەکە دەڵێ، دەبێ سەردانی پزیشکێک بکا، مایریش پێیگوتم، وا بکەم، بەڵام من

گوتم نەخێر، من بیرۆکەیەکی باشترم بۆ هات. بە پێچەوانەوە وا باشترە، لێگەڕێ با قسەکە بڕوا، با هەروا بزانن من نەخۆشی سیلم هەیە. خۆ بۆ پیاوێکی 'نەساغ' لە ژێرزەمینیدا بۆی بەتەندروستی وەردەگەڕێ. بیرۆکەکەش سەری گرت. لە شەقامی یوسف ئێلیاهۆدا، ئێمە دیواربەندێکی خەیاڵبازییمان بە دەوری خۆماندا کێشابوو. منیش داوای لێبوردن لەو خانمە دەکەم، کە مەراقم بۆ پەیدا کردبوو.

من دەبێ داوای لێبوردنیش لە کوڕە بچکۆلانەکەی خۆم بکەم، بەهۆی پاشناوە نوێکەمەوە سەرئێشەم بۆ پەیداکرد. منداڵانی باخچەی ساوایان و گەڕەک پێیان دەگوت کونیگسئۆفەر، نەشیان دەزانی نوکتەکەشیان هەر چییە. کاربەدەستانیش گوێکردنی ناوەکەیان بە ئاستەم دەبینی. یەکێکیان لەو کاربەدەستانە، ڕۆژێکیان لە دەرگای ماڵەکەمیان دا، کاتێک دەرگام لێکردەوە بەتوڕەییەوە گوتی: 'ئەرێ تۆ ئەو ناوە دووروودرێژەت لە کوێ هێناوە، کونینگس- شتێک؟'

'باشە من چیبکەم؟' منیش وا وەڵامم دایەوە، 'ئاخر باپیرەگەورەم وا بانگ دەکرا.'

کاربەستێکی دیکە هەبوو، سکاڵای لەسەر ناوەکەی من نەبوو. پیاوەکە باربووی بۆ ڕێکخراوێک بەناوی Le'asirenu 'بۆ زیندانییان' کۆ دەکردەوە. ئەو منی لە هۆدەی پێشەوە بینی کە دەرگاکەی ڕاستەوخۆ دەچووە سەر باخچەکە. ئەو هیچ گرنگی بەناوی من نەدا. داوایەکی پەرۆشانەی بۆ باربوو کۆکردنەوە بۆ زیندانییانی سیاسی نەتەوە کرد. منیش قایلبووم و ئیدی ناوی کونیگسهۆفەر بووە ئەندامێکی ناوتۆمارکراو. بەڵام دەبێ داوای لێبوردن لە د. یۆناە کونیگسهۆفەر بکەم، بێ مۆڵەتنامەی ئەو واژۆم لەسەر فۆرمی Le'asirenu و چەند کاخەزێکی دیکەش کرد. لەخۆم رادەبینم بڵێم، ناوە باشەکەی ئەوم شەرمەزار نەکرد. هەر کاتێکیش وادەکەی خۆی هات، ئەوا شتەکەی بۆ دەگەڕێنمەوە. هیوادارم هەڤاڵەکانم پاسپۆرتەکەی ئەویان گەڕاندبێتەوە. ڕەنگبێ ئەویش هەنووکە ناوێکی عیبریانەی بۆ خۆی هەڵبژاردبێ.

کاتێک من یۆنا کونیگسهۆفەر بووم، بوومە بابی دووهەمین کچم بەناوی لیێا. ئەویش وەک خوشکەکەی بە 'قاچاخ' لەدایکبوو. ناوی خانەوادەکەی هەر

وەک هاسیا دەبوایە ئیسپتاین بێ. کاتێک ئەو هاتە سەر دنیا لە حەیفاوە بۆمبابارانی عەرەبەکان بەسەر سەرماندا دەڕۆیشت. من دەبوایە لە دوورەوە سڵاوی بۆ بنێرم: ئەویش هەر "نهێنی" بوو. خۆ نەدەکرا بۆ لەدایکبوونی ئاهەنگیش بگێرم. ئیسرائیل ئیسپتاینیش لەمێژ بوو نەمابوو...

ئەپارتمانەکەی کونینگسهۆفەر دوا ویستگەم بوو لە نێو تونێلی ژێرزەمینییدا. کاتێکیش دوای ئەوە لە ژێرزەمین دەرچووین، بۆ یەکەمجار لە بەردەم جەماوەردا لە ئۆرشەلیم دوانم دا، دراوسێکانم هێدمەگرتی ببوون، ئیدی لە ڕۆژنامەکانەوە زانیان، خۆ باوکی "بێنی"ی فەرماندەی ئیرگون لای خۆمان بووە و نەمان زانیوە. ئاخر ئەوان نەیاندەویست بەیەکجار باوەڕ بکەن. "ئاخر چۆن دەبێ هیچی لەبارەوە نەزانین!"

بێنیش خۆی یەکەم جار لە منداڵەکانی گەڕەکەوە زانی.

"خۆ ئەوە باوکی تۆیە! خۆ ئەوە باوکی تۆیە!"

بێنیش سەرسام بوو. ئاخر باوکی ئەو هەرگیز لەنێو ئیرگوندا نەبووە. لەوەش زیاتر، بێنی "هەوادار"ی ئیرگون نەبوو. جارێکیان گوێم لە دەمەتەقێیەکی ئەو بوو لەگەڵ یێفێت، کە کوڕە بچکۆلانەیەکی یەمەنی بوو، ماڵباتەکەی ئەو بۆ ماوەیەک پەنای هێنابووە بەر ئەو باڵەخانەیەی ئێمەی تێدا بووین، ئەوەش لە سەرەتای پەلاماری عەرەبەکان بوو، ئەوان بە ناچاری لە ئافاوە هەڵاتبوون. یێفێت و بێنی دوو برادەری گیانی بەگیانی یەکدی بوون، لە ڕووی سیاسیەوە زۆریش لەیەک جیاواز بوون.

"بێنی،" یێفێت وای لێپرسی، "ئەرێ تۆ سەر بەکێی؟"

ئەو ڕۆژانەش ئەو پرسیارە لای منداڵان ڕوونوئاشکرا بوو. "سەر بەکێی" واتای یەکێ لە ڕێکخراوە چەکدارەکانی وەک هاگانا، ئیرگون یان F.F.I دەگەیاند. کوڕەکەشم ڕێکوپێکانە وەڵامی دایەوە:

"من سەر بە F.F.Iم."

"بێنی، ئەوە تۆ چی دەڵێی؟ ئەوان باش نین."

"زۆر باشە، کەواتە من سەر بە هاگانام."

"بێنی، ئەوە تۆ چی دەڵێی؟ ئەوان هەر باش نین. من باپێت بڵێم. من سەر بە ئیرگونم. ئەوان باشن. ئەوان هەمووان دەشکێنن."

دوای ئەوەی یافامان گرتەوە، دایبابی یافێت بۆ ئەوێ گەڕانەوە. بەڵام بێنی هەر دڵنیا نەبوو ئاخۆ سەر بەکام لایەنە. سەیریش نییە یەکەمجار باوەڕی نەدەکرد، باوکی فەرماندەی ئیرگونە. دواجار بەسەر دوودڵی خۆیدا زاڵ بوو، ڕۆژنامەیەکی پێبوو، وێنەیەکی منی لەسەر بوو، هات و گوتی:
"باوکە، ئەرێ ئەوە خۆتی؟ دەی ڕاستیم پێ بڵێ، ئەوە تۆی؟"
ئیدی نەدەکرا ڕاستیی بە کوڕەکەم نەڵێم. دایکی هەموو شتێکی بۆ ڕوونکردنەوە. من بڕیارێکی لێبڕاونەم بۆ دەرچوون لە باری ژێرزەمینی دا. منداڵەکەش ئەمەی بە سەرسامییکی هێورانە وەرگرت. ئەوە نەبێ ناوبەناو دەهاتە لام و چاویشی نیشانەی پێکەنینی پێوە بوو: "ئەرێ باوکە لەبیرتە، کە ئێمە لە ژێرزەمیندا بووین؟"
بەڵی لەبیرمە. من خەم و پرسیارە نەبڕاوەکانی بێنیم لەبیرن. "ئەرێ مام ئیسرائیل لە کوێیە؟" ئای چۆن منیش ڕاهاتبووم وا وەڵامی بدەمەوە گوایە مام ئیسرائیل چۆتە ئەمریکا و هەر بینا گەڕایەوە. ئەوەش ڕاست نەبوو. مام ئیسرائیل ڕۆیشت، بەڵام هەرگیز ناگەڕێتەوە.
"مام ئیسرائیل" باشترین مامی بێنی، ئیسرائیل ئیسپتاینی دۆستی ئازیزم بوو. ئەو لە پیتاه تیکڤا مامۆستای قوتابخانە بوو، لە لایەن هەموو مامۆستا و دایبابەکانەوە ڕێزلێگیراو بوو، هەموو منداڵەکانیش خۆشیان دەویست. من هەرگیز دڵێکی وا مەزن، لەخۆبردوێک و دۆستێکی وا ڕاستگۆیانەم نەبووە.
ئیسرائیل ئەندامی فەرماندەیی باڵای ئیرگون نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، یەکێک بوو لەو چەند کەسانەی بە شوێنی ژیانی منی دەزانی و بەردەوامیش سەردانی دەکردم. ئەو مشورخۆری چاپکراوەکانی (هیروت) بوو، کە ڕۆژنامەی ژێرزەمینیمان بوو. ئەو هەموو نهێنیەکانی دەزانین، لای خۆی ڕازپارێز بوو. کاتێکیش کوڕەکانی ئێمە لەمەیداندا دەکەوتن، کزەم لە جەرگەوە دەهات، بۆ ئەو مایەی نیگەرانی بوو. ئیدی ئەو لەو ڕۆژانی خەمی ناخۆشیدا دڵدەرەوەم بوو.
لە کۆتایی ١٩٤٦دا ئێمە ئەومان ڕەوانەی ئەوروپا کرد، بۆ ئەوەی لەوێ لە ڕێکخستنی مەشقی هێزی یەدەگمان، کە لەوێ بنیاتمان نابوو، بەشدار بێ. ئەویش زۆر کەیفی بە ئەرکە نوێکە هات. بەڵام کێ دەزانێ ئاخۆ چارەنووس چی لەبن سەردایە؟ چەند ڕۆژێک دوای ئەوەی دەگاتە ڕۆما، ئیرگون

باڵوێزخانەی بەریتانیا لەوێ دەتەقێنێتەوە. ئیدی گرژی دروست دەبێ. ڕۆژنامەی چەندان وڵاتی جۆربەجۆر بێ پەروا هەواڵی وایان بڵاودەکردەوە گوایە هێرشێکی تیرۆرستانە بۆ سەر دوورگە بەریتانییەکان زۆر لە گوێیە. ئەمەش شتێکی زۆر نابەجێ بوو. بەڵام ئیتالییەکان کردییانە مەرگەسات. ژمارەیەک لە ئەفسەرە گرنگەکانی ئیرگونیان گرتن. لەنێو ئەوانیشدا ئیسرائیل ئیسپتاین بوو. ئەوانی دیکەیان ئازادکردن، ئەویان لە زینداندا هێشتەوە. ئەو گومانێکی تایبەتمەندانەی لەسەر بوو، چونکە کەمێک پێش تەقینەوەکە گەیشتبووە ئەوێ. دەزگای هەواڵگری نهێنی بەریتانی، کە ئەو کات لەگەڵ ئیتالیا دەستەمۆبوون، داوایان کرد ئەو هاوڵاتییە فەلەستینییە ڕادەستی ئەوان بکرێتەوە. ئەوەش دەزانرا، بەریتانییەکان لەنێو پۆلیسدا دەستیان دەڕوا. ئیسرائیل ئیسپتاینیش ئەوەی دەزانی. بۆیە بڕیاریدا لە زیندان ڕا بکا. نەخشەی هەڵاتنەکەش کێشرا، بەڵام جێبەجێکردنەکەی شکست بوو. کاتێک لە بینایەی زیندانەکە دەردەچێ، پۆلیسێکی ئیتالی تەقەی لێدەکا. برینەکەی دژوار دەبێ.

سپێدەیەکیان، گوێم لە یەکەمین هەواڵنامەی بەیانیانی لەندەن بوو، ڕاپۆرتێکی لە ڕۆماوە خوێندەوە: "جوویێکی پۆلۆنی، بەناوی زیڤ ئیپستاین لە هەوڵی هەڵاتنی لە گرتوخانەیەکی ئیتالییدا بەسەختی بریندار دەکرێ. ناوبراو گومانلێکراوی پیلانی تیرۆرستانەی سەر باڵوێزخانەی بەریتانیایە لە ڕۆما."
جوویێکی پۆلۆنی؟ زییڤ ئسپتاین؟ برووسکەیەک لە دڵمەوە پێیگوتم کە ئەو کێیە؟ دوعام کرد بەڵکو هەڵە بم، بەڵام من دەمزانی ئیسرائیل ئیسپتاینمان لە دەست دا.

ڕۆژی پاشتر، یان شەوەکەی بوو، بی بی سی ڕاپۆرتی لەسەر زیڤ ئیپستاین دا کە بە برینەکەوە گیانی لە دەست دا. زیڤ ئیپستاین؟ هاوڕێکانمان هەوڵیاندا دڵم بدەونەوە، گوایە ئیپستاینێکی دیکەی پۆلۆنی لە ئیتالیادا هەیە. بەڵام هەر دوو ڕۆژ دواتر، هەواڵی سەلمێنەرمان پێگەیشت کە خودی خۆی بوو. ئیدی من برادەری گەنجایەتی، کە لە ژێرزەمیندا بەیەکەوە بووین، لە دەست دا. ئەم جارەیان هەر نەشمتوانی بچمە سیناگۆگێک و نوێژی مردووی بۆ بکەم. ئای، خۆ هەر دەبوایە یەکێک بڕوا. لەوێشدا هیچ بژاردەیەک نەمابۆوە.

دوا قۆناخی یاخیبوون، بە ڕووداوە دژوار و مەزنەکانی، من پەڕیبوومەوە شەقامی یوسف ئیلیاهۆ لە ناوجەرگەی تەلئەبیبدا و دەزگای هەواڵگری نهێنی بەریتانیش ئاگای لەمەحموودی بێ زەواڵ نەبوو. ئەو ئەپارتمانەی نزیک تیاترۆخانەی هابیماه، ئەو خانووەی نزیک رووباری یارکۆن، گەڕەکی هاسیدۆف تەنها شوێنگەلێک نەبوون کە منی لێ ژیابم. .. من زۆر "نشینگەی" دیکەشم هەبوون، بەڵام لە کاتی جیاواز جیاوازدا و بۆ ماوەیەکی کورتخایەن بوون. من لە گەڕەکی هاتیکڤای یەمەنی بووم لە تەلئەبیب، لە رامات گان بووم لە خودی پیتاه تیکڤادا. لە ماوەی قانونی ڕەوشی ئاوارتەدا من لە ماڵی پۆلیسێکی جووودا دەژیام، کە کاری ئەوە بوو "یارمەتی بەریتانییەکان بدا بۆ دۆزینەوەی تیرۆرستان". ئەو پۆلیسەم زۆر بەکەڵک هات. بەڵام لە هیچ کامێک لەو جێگە و ڕێگانە، بە هەمیشەیی و کاتیشەوە، نە هیچ پاسەوان (بۆدیگارد)م لەگەڵدابوون نە زەنگی ئاگادارکردنەوەش. هەموو ڕۆژێ و هەر هەموو شتێ سادە و ساکارانە بوو. هاووڵاتیکی ئاسایی، خێزانێک، لە خانوویکی کراوەدا بووم. دراوسێکانیش، کە "هەموو شتێکیان دەزانی"، نهێنی لەئارادا نەبوو. نهێنییەکە ئەوە بوو کە نهێنی نەبوو. ژێرزەمینێکی کراوە بوو. کەچی چاوەکانی دەزگای نهێنی بەریتانی کوێر بیوون.

سێر ئەدوارد گریگ، وەزیری بەریتانی بۆ کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە ئەنجوومەنی لۆرداتدا. کە تیایدا پلەکەی بەرزکرایەوە بۆ لۆردی ئالتەرینچام، گوتبووی: "هۆکاری سەرەکی شکستیمان لە فەلەستین نوشستهێنانی دەزگای هەواڵگری نهێنیمان بوو."

ئەم قسەیەی هەر زۆر ڕاست بوو.

## بەندی 9
## براکوژی ... هەرگیز

٢١٩ - ٢٢٤

1

لەگەڵ کۆتاهاتنی دەسەڵاتی بەریتانیی لە وڵاتەکەماندا، هیچ شەڕێکی ناوخۆیی لەنێو جووەکاندا بەرپا نەبوو. ڕاشکاوانە، لەوانەیە ئەم شتە وەک پرسێک لە کاتی خۆی سەریهەڵنەدابێ، بەڵام لە سەر زەمینی ڕاستەقینەدا، ئەمە دەستکەوتێکی مێژوویی بوو. دیرۆک فێری کردووین، پێبەپێی هەر جەنگێکی ڕزگاریخوازی، شەڕێکی ناوخۆی خوێناوی لەگەڵیدا هەڵگیرساوە. لە ڕۆژگاری ئێمەشدا ئەم ڕێسایە سەری گاندیشی خوارد، ئەو گاندییەی ڕابەڕی شۆڕشی ناتوندوتیژی بوو، کەچی هەر بە خۆیشی بووە قوربانی. لە هەندێ گۆشەنیگاوە ڕووخانی ڕژێم وەک بومەلەرزە وایە، تەنانەت دوای قەومانی بوومەلەرزە و لەخۆبوونەوەی، زۆرجار زنجیرەیەک ڕاچەنینی ژێرزەمینی بەدوادا دێ.

ناشکرێ بگوترێ، یاخیبوونەکەمان دۆخی بە یەکدادانی نێوخۆیی دروست نەکردووە. بە پێچەوانەوە، لە یەکخشان و بەیەکدادانی نێوخۆیی وا دەبینرا، کە زۆر حەتمیترە لە زۆر یاخیبوون و شۆڕشی سەرکەوتووی دیکەی دنیا. شۆڕشەکەمان بەرەنجامی فەرمانێکی سەرووی خۆی نەبووە. یاخیبوونەکە بە ڕێنمایی کاربەدەستانی فەرمی سەرکردە جووەکان نەبووە؛ لە ڕاستیدا شتەکە دژی خواستی سەرکردایەتی سەریهەڵدا. بەردەوامبوونیشی نەوەک هەر بەبێ پەسەندنامەی ئەوان بوو، بەڵکو داڕسانێک بوو بۆ سەر شتە قەدەغەکانیشیان.

کاربەدەستە بەریتانییەکان پێشبینی ئەوەیان کردبوو، لەگەڵ ڕۆیشتنی ئەواندا، شەڕ لەنێوان عەرەب و جوو بەرپا بێ. ئەوان لە پێشبینیەکەیاندا ڕاست بوون. هەروەها پێشبینی ئەوەشیان کردبوو، کاتێک ئەوان وڵات جێدەهێڵن، شەڕێکی ناوخۆ لەنێوان خودی جووەکان هەڵدەگیرسێ، بەڵام لەمەیاندا هەڵە بوون.

دوو هۆکار گەلەکەمانیان لە کارەساتی براکوژیدا پاراست. بەپلەی یەکەمیان ئێمە جەنگاوەرانی ئێرگونمان وا فێرنەکردبوون رقیان لە رکابەرە سیاسییەکانی خۆیان بێتەوە. رق و کینەی یەک لایەنە بە راشکاوی، گەفێکە لەسەر یەکێتی نەتەوەیی. رق و کینەی دوولایەنەش بەزۆری شەڕی نێوخۆی بەدوادا دێ. کاتێکیش ئێمە نمایشی رق و کینەی دژ بەخۆمان دەبینی، خەمبار دەبووین و دەتاسایین. تۆبڵێی ئەگەری ئەو جۆرە پاییزەبراییە لە ئارادابێ، ئێمە ئەو پرسیارەمان لەخۆمان دەکرد.
دووهەمین هۆکاری دوورکەوتنەوە لە شەڕی براکوژیدا پەیوەست بوو بە کێشەی دەسەلات. ئێمە لە ژێرزەمینیدا لەپێناو دامەزراندنی دەسەلاتداریتی جوو دەجەنگاین؛ خودی خۆمان خەمی دەسەلاتمان نەبوو. کێبەرکێکارەکانمان هەرگیز نەیانتوانی ئەم شتەمان لێبڕوا بکەن. ئەوان پێیانوابوو -یان هەر هیچ نەبێ وایان دەگوت- کەوا ئەو "هەڵگەڕاوانە" ململانێیان بۆ هیچ نییە بۆ هێز و دەسەلات نەبێ. ئەوەش هەڵەیەکی مێژووی ئەوان بوو.
مێژووی دیین و نەتەوەکان ئەوەیان فێرکردین، هەڵگەڕانەوە دەکرێ بە بێ شۆڕش بێتە کایە، لێ شۆڕش بەبێ هەڵگەڕانەوە ناکرێ. ئاخر خۆ شۆڕش هەر گۆڕینێک نییە بە تەنیا. شۆڕش شتێک نیە تا بیدەیتە دەنگدان؛ هەروەها دەرهاوێشتەی گفتوگۆیەکی گشتییش نییە. رەشەبای باستیل بوو جاڕنامەی مافەکانی پیاوی بەرهەم هێنا؛ گردبوونەوەی چای بۆستۆن[٥٢] بوو Bill of rights بەڵگەنامەی مافەکانی هێنایە کایە. شۆڕش هەمیشە لە خۆیەوە سەرهەڵدەدا یان هەر سەرهەڵنادا. شۆڕش شتێک نییە بابەتی دیسیپلین بێ. بەڵکو خۆی دسیپلین بۆ شۆڕشگێرەکان دێنێتە کایە. کرۆکی هەڵگەڕانەوە و شۆڕش هەر یەکە، هەروەک شۆڕش و پێشکەوتنخوازیش هەر یەکە.
ئێمە رێگەی یاخیبوونمان بۆیە گرت، چونکە کۆیلایەتیمان وای لێدەخواستین. ئێمە لەپێناو جەنگان بۆ گەلەکەمان هەڵگەڕاینەوە، نەوەک بۆ ئەوەی دەسەلاتدارییان بەسەرەوە بکەین. هەوڵدان بۆ هێز خۆی لە خۆیدا رەوا نییە.

---

[٥٢] لە ١٦ی دیسێمبەری ١٧٧٣دا گردبوونەوەیەکی وڵاتپارێزانی ئەمریکی بە رابەرایەتی سامۆئێل ئادامز لە بەندەری بۆستن، بە جلی هیندییە سوورەکان ٣٤٢ گوشە تۆچایان لە کەشتییەکی بەریتانی فڕێدایە نێو زێ، ئەمەش لە تووڕەیی و نارەزایەتی خەڵکەکە بوو دژی باجی دەرمان چا، ئیدی لەوێوە بڵێسەی شۆڕشی دژی بەریتانییەکان گڕی سەند. وەرگێڕ.

به پێچەوانەوە، دەبێتە بەرجەستەکردنی دروستی بەدیهێنانی ئارەزوو. جەنگانی ژێرزەمینیش هەوڵێکی تەواوعەیارە بۆ هێز؛ ئەو کۆششەش لە ڕاستیدا دەکرێ ببێتە چەسپێنەری شەڕ دژی شەڕانگێزی، بە ڕاستیش هەندێک لە ئێمەش لە ژێرزەمیندا بڕوایان وابوو، نەبوونی مراز بۆ هێز شکستێکی ئەرێییانەیە. من لێرەدا حەزناکەم ڕاستیەکان شی بکەمەوە، بەڵکو تەنها دەیسەلمێنم. باش یان خراپ، ڕەوا یان هەڵە، ڕاستی لە میانەی خەباتی ژێرزەمینیماندا ئێمە نە بیرمان لە دەسەلات دەکردەوە و نە هەوڵیشمان بۆ دەدا، لەناو دڵی خۆماندا لەسەر ئەوە کۆک بووین، لەگەڵ سەرکەوتنی یاخیبوون یان لەناوبردنی دەسەلاتی بێگانە، حکوومەتی وڵاتەکەمان دەبێ لە لایەن سەرکردە فەرمییەکانەوە ڕایی بکرێ. بەو گیانەش سەربازانی ئێرگون زڤای لیومی پەروەردە کرابوون. خەباتەکەمان لە هەر مرازێکی لاوەکی بەدەربوو.

بیرۆکەی سەربەستی بەتەواوی هەموو دڵمانی داگرتبوو. تاکەکەمان بە تەواوی خۆیان لەنێو ئەو هزرەدا دەبینییەوە و خۆشیان پێدەناساند. خۆ ئەگەر ئەوەش واتای دەستبەرداربوونی ئازادی کەسیی بگەیاندبا، دەستبەرداری دەبوو؛ ئەگەر داخوازی بەجێهێشتنی ماڵباتەکەی کردبا، بەجێی دەهێشت؛ ئەگەر پەیوەست بە بەرگەگرتنی ئازار و ئەشکەنجە بووایە، پێی قایلبوو؛ ئەگەر داوای لێکرابا بێژمار جار خۆی تووشی گێرەوکێشەی دژوار بکا، وای لەخۆ دەکرد؛ ئەگەر داوای ژیانیشی لێکرابا، دەیدا. بۆ ئەوەی دەوڵەت دابمەزرێنێ، جەنگاوەرەکە ئامادەی هەموو قوربانییێک بوو، قوربانیەکە لای ئەو ئەوەندە گرنگ نەبوو. شتە هەرە جەوهەرییەکە، ئەوە بوو، دەبێ دەوڵەت هەبێ، پێویستە ئێمە نەتەوە بین، نەتەوەیەکی ئازاد لە نیشتمانەکەی خۆماندا، بۆ ئەوەی دەروازەکانی سنوور بەسەر تاراوگەنشینە کوێرەوەرەکاندا بکەینەوە، بۆ ئەوەی جارێکی دیکە بەسەرمان نەکەونەوە و دەسەلاتی بێگانە ڕیسوامان نەکا، بۆ ئەوەی هەوای سەربەستی هەڵمژین، کە سییەکانمان بەتاسەوەن چونکە ماوەی دوو هەزار ساڵە ئێمە لە پەڕاگەندەیی و گیتۆکاندا دەژین. ئیدی ئەستەمە بگوترێ ئێمە دەبێ بگەینە ئەو دەسەلاتەی کە دەمانەوێ. یەک شت ڕوون و ئاشکرابوو: ئێمە نیشانەمان لە هێز

گرتبـوو، بـۆی دەجەنگـاین. لەگەڵ ئەوەشـدا ئـێمە بە تەنیـا سـێرەمان لە لەناوبردنی دەسەڵاتی بێگانە گرتبوو، ئێمە بۆی جەنگاین و پێشی گەیشتین.
ئەگەر بە جۆرێکی دیـکە بـوایە، دوو بەرەی ناتەبـا لە ئێرتـز ئیسـڕائیل دژی یەکدی دەوەستانەوە. نەدەکرا مشتومڕی ئەوە بکرێ، پێشـهاتی شـەڕ لەگەڵ عەرەبەکـان بـووبێتە مـایەی بەرگرتن لەو پەرەسـەندنە. هەر یەکێ مرخـی لە دەسەڵات خۆشکردبێ، هەر دژوارییێکی دەرەکی دەقۆزێتەوە تا خواستی خۆی لە نـاوەوە بسـەپێنێ. ڕاستی ئەوە بـوو، شانبەشـان دژی شـەڕانگێزی عەرەب وەستاینەوە، چونکە بەرەی یـاخیبووان چـاوی لەسـەر هێـز نەبـوو، هەروەهـا هەر لەبەر ئەوەی لە بەرەکەی دیکە بوون قینی لە براکانمان نەدەبووەوە.
کەچی مەترسی شەڕی ناوەخۆ بە مێژووی کەسایەتی شۆڕشـەوە نوسـابوو، هەر وەک چۆن لەناوبردنەکەشی بە کەسایەتی مۆرالی یـاخیبووانەوە ئاوێتە ببوو.
لـێگەڕین بـا ئەوە بیـر بخەیـنەوە، کە یـاخیبوونی هەڵگەڕاوەکـان لە میـانەی نـزیکەی هەمـوو مـاوەی یـاخیبوونەکەدا، بە دڵـی سـەرکردە فەرمییەکـانی ئاژانسـی جـوو نەبـوون و یاخیبوونیـان نەدەخـوازی. لە میـانەی هەمـوو ماوەکەشدا بە دڵنیاییەوە هەڵگەڕاوەکانیشیان نەدەویست.
سـەرۆک ترومـان گوتبـووی گەر هاتبـاو لە میـانەی دەسـەڵاتدارێتی بەریتانییەکـان لە ئێرتـز ئیسـڕائیل بـوایە، دەچـووە ریـزی "تیرۆرستەکان". خۆ ئەگەر واشـی کردبـا سـەرکردە فەرمییەکـان پێیـان کرابـا ڕادەسـتی بەریتانییەکانیان دەکردەوە، چونکە ئەوان هەڵگەڕاوەکانیان نەدەویست، ئەوسـا بە ترومـان بـا یـان بەبـێ ئەو بووبـایە. ڕەنگبـێ ئەوان بڕوایـان بە ڕامـانی یاخیبوونەوە نەبووبێ. ڕەنگبێ لە یـاخیبووانیش ترسـابن. ڕەنگە لەو بڕوایەدا بن، ئێمە خەڵکانێکی شەڕانگێزین.
هەرچییەک بووبێ، دوای بەرپاکردنی یاخیبوونەکە، سەرانی فەرمی زایۆنستی خوازیـاربوون دەسـتبەجێ ئـێمە لە چـالاکییە شۆڕشـگێڕیەکانمان بوەسـتێنن. سەرەتا مەراییان بۆ دەکردین. کاتێکیش مەراییکردنەکە دادی نەدا، هەڕەشـەی بەدوادا هـات. ئەو 'کـردەوانەی' دواتـر باسـیان دێـت، دەکـرا براکـوژی لەگەڵ خۆیدا هێنابا، گەر هاتباو ئێمە لێبڕاوانە بڕیارمـان نەدابا، گەورەترین مەترسـی لەسەر ئایندەی گەلەکەمان هەرا و کێشەی نێوخۆ بوو.

## 2

هەوڵ و کۆششی قەناعەتپێهێنان لە ناوەڕاستی هاوینی ١٩٤٤ دەستیان پێکرد. ئەو کاتەی لە سەروبەندی ئەوەدابووم لەگەڵ ڕێزدار بنگۆریۆن[٥٣] یەکدی ببینین.

شتێکی تایبەتمەندیشە، هەر دوولا پەرۆشی ئەو دیدارە بووین، بێ ئەوەی بشزانرێ ئاخۆ هەر لایەک چی لە لایەکەی دیکە دەخوازێ. هەر دوو لا، مەبەستم ڕێزدار بنگۆریۆن و خۆم بەتایبەت نییە؛ بەڵکو مەبەستم بڕواپێکراو و دۆستەکانمانن.

برادەرەکانم بیرۆکەی کۆبوونەوەیان لەگەڵ بەڕێز بنگۆریۆن هێنا پێشەوە و منیش پێشنیازەکەیانم پەسن دکرد. ئێمە ئەو کات لە نێو جەرگەی ئۆپەراسیۆنە بەراییەکانماندا بووین، لەسەر ئەو خاڵەش بووین چالاکیەکانمان بەرفراوانتر بکەین. بەڕێز بنگۆریۆنیش لەلای خۆیەوە، لەتۆپکەی ڕۆژگارە 'توندڕۆ'کەیدا بوو. 'بلتیمۆر' لەنێو هەگبەکەی خۆیدا بوو. ئەم وشەیە خەریکبوو بە تەواوی لە بیر بکرێ. ئەوەش ناوی ئەو هوتێلە ئەمریکاییە بوو، کە بەڕێز بنگۆریۆن بەرگری لە ئامانجی جەنگی گەلەکەمان دەکرد وەک دەوڵەتی جوو لە هەموو ئێرتز ئیسڕائیلدا (هەڵبەتە لەوێدا ڕێزدار بنگۆریۆن مەبەستی خۆرئاوای ئێرتز ئیسڕائیل بوو). ئەو ناوە بیانییە، کە کاتی خۆی بووە شێرپەنجەی بەرەی زایۆنیستەکان، لیبڕاوانە کردبوونیە دوو لەت. هێشتاش هوتێلی بلتیمۆر زەق و ڕەق لە شوێنی خۆی وەستابوو. ئەو ڕێنماییەی لێیەوە دەرچوو، - هەڵبەتە نە ڕێنماییە نوێکان- هەر زوو لەبەین نەمان.

لە ١٩٤٤دا باوەڕێکی نوێ سەریهەڵدا. هەڵبەتە تا ئەوپەڕی مەودای، ناواخنەکەی مایەی خەم لێخواردن نەبوو. بنگۆریۆن جێگەی ژابۆتنسکی گرتبووەوە، ئەویش بانگی بۆ چەمکی دەوڵەتی جوو هەڵدا، کە ڕۆژهەڵاتی

---

[٥٣] داڤید بنگۆریۆن لە پۆلەندای رووسیا لەدایک بووە، هەر لە گەنجێتی هاتە فەلەستین (ئەوکات بەشێکی ئیمپراتۆریەتی تورکان بوو). ئەو گەنجێکی سۆشیالیست بوو، کارنامەی خۆی لە نێو پارتی کاری ئیسرائیل (ماپام)دا بوو تا بووە رابەری پارتەکە. بۆ چەندین ساڵیش سەرۆکی ئاژانسی بەڕێوەبردنی زایۆنزمی بووە، کاتێکیش رژێمی بەریتانی لە فەستین کشایەوە، ئەو بووە یەکەمین سەرۆوەزیری ئیسرائیل. (ئەم تێبینییەی پێشوو هی خودی نووسەر بوو. بەڵام بۆ زیاتر ناشنابوون بە ژیان و کارنامەی رابەرانەی کەسێکی مەزنی وەک بنگۆریۆن سەیری کتێبی "داود بنگۆریۆن، دامەزرێنەری دەوڵەتی ئیسرائیل" بکەن کە بەندە لە هۆڵەندییەوە وەرگێڕاوە و لە٢٠١١شدا بە چاپی گەیاندووە.

ئێرتز ئیسرائیل یش بگرێتەوە. پێشینەی ژابۆتنسکیش تیۆدۆر هرتزل بوو، کە بیـرۆکەی دەوڵەتـیەکەی ئەو چـارەگە سـەدەیەک بەر لە ئێسـتا لە لایەن سـەرکردە زایۆنیسـتەکان، وازی لێهێنـدرابوو.[٥٤] جـوامێری بەنـد بـوو بە دوانـدەرەکە: ڕێـزدار بنگوریـۆن داوای دەوڵەتـی جـووی دەکـرد: ئەو پیـاوەی تەنهـا چەنـد سـاڵێکی کەم بەر لە داواکەی، هەوڵیدا بڕوا بە لیژنەی پیل بێنێ، ئەوەی ئـێمە دەمـانەوێ و بەدوایەوەیـن دەوڵەتـی جـوو نیـیە، بەڵکـو شـتێکە پێیـدەگوترێ "نیشـتمانێکی نەتەوەیـی". راسـتە ئەو بە ڕوانینـی خـۆی دەستەواژەکەی شیکردەوە، وەلێ کێشەکە لەوەدا بوو، ئەو غەیرە جووانەی ئەو بیـرۆکەکەی بـۆ ورد دەکـردنەوە، لەمێـژ بـوو لە هـونەری شـیکردنەوەکە ببوونەوە.

لە چلەکاندا، بنگوریۆن وازی لە شیکردنەوە "مێژوویە فەلسەفیانەکەی" خۆی هێنا و بەزمانێک قسەی کرد، هەمـوو لێی تێدەگەیشـتن: ئەویش دەوڵەتێکی جولەکە بوو. دەگوترێ لەم ڕووەوە کاریگەری بێرل کاتزلنسکی لەسەر بووە. لەوانەشە وا بێ. بۆ من وا پێدەچوو بنگوریۆن لە سیەکاندا بە قووڵی و بێ ئاگایی لەبن باندۆری کۆبوونەوەکانی ژابۆتنسکیدا بێ. ئەو لەژێر کاریگەریی شـاڵاوی نازییەکـان بـۆ ڕیشەکێشـکردن لە ئەوروپـادا بـووە. ئیـدی بنگوریـۆن سەرلەنوێ لەدایکببووەوە، تا بەم جۆرە بدوێ. ئەو هەر نەوەک دروشـمەکەی بێلتیمـۆری مەیـدانەکە فڕێـدایە دەرەوە، بەڵکـو کۆمەڵێـک دوانـی تونـدی سەربازییانەی بەزمانێکی توند "دژی دەسەڵاتداران" دا.

ئێمە بەو قسانە گەشاینەوە، تۆزقاڵێکیش دژی ڕێزدار بنگوریۆن نەبووین. خۆ ئەوە ژابۆتنسـکی بـوو، هەمیشـە ئـێمەی فێـرە بەرپێگرتنـی "یـادەوەرییە ڕەشـەکان" کردبـوو. ئەو هەر دەیگـوت: "لـێمەگەڕێ یادەوەرییەکانـت لە هەڵەکانی ئەو یان لە قسەکانی ئەو گیر ببێ. خۆ ئەگەر خەڵکە باشەکان داوای دەستی یارمەتیان لێکردی، لێمەگەڕێ یادەروەرییەکەت "ڕەشی" بکات. ئەوەی دەکرێ لە بیر بکرێ، لە بیری بکە، دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکە."

---

[٥٤] تەنانەت لای د. حایم وایزمەنی کۆچکردووش لە ١٩٤٣دا کە سەرۆکی ڕێکخراوی زایۆنیستی جیهانی بوو، لەسەر کتێبەکەی هێرتزل (دەوڵەتەکی جوو) نووسیبووی و ئاماژەی بە " پلانێکی وردەکاری ساویلکەی سەیر، تەواو ناپێویستی ڕێکخراوی کۆچبەران، لە تاراوگەو دامەزراوەکان، قانون و تەنانەت شێوەی دەوڵەتە نایندەکە"ش کردبوو. (پێشەکی کتێبی دەوڵەتی جوو، وەشانی سکۆپس، نیویۆرک.)

برادەرەکانم مشتومڕی ئەوەیان بوو، کاتی هاتووە دەست لەگەڵ بنگۆریۆن تێکەڵ بکەین. ئێمە نیازمان بوو بە بنگۆریۆن بڵێین، بەگوێرەی ڕێنماییەکانی ژابۆنتسکی، بۆ ئێمە شتێک گرنگ نییە ئاخۆ کێ "سەرۆکایەتی" دەوڵەتی ئایندە وەردەگرێ. ئەوەی گرنگە ئامانجەکەیە، لەگەڵ خەبات بۆ بەدیهێنانی. خۆ ئەگەر ڕێزدار بنگۆریۆن سەرکردایەتی خەباتەکەمان بکا دژی دەسەڵاتی بەریتانیی و هەوڵ بۆ بەدیهێنانی سەروەری عیبری بدا، بە جۆش و خرۆشەوە دوای دەکەوین. بە کورتی، مەبەستمان بوو پێی بڵێن، ئێمە خۆمان بەردەستی پرۆژەکەی دەکەین، گەر ئەو ئامادە بێ بە کردار راسگۆیەتی گفتارەکانی بسەلمێنێ.

ئێمە دواتر زانیمان لە هەمان کاتدا برادەرەکانی بنگۆریۆنیش لەسەر هەمان بیرۆکەی دیدارە دوولایەنییەکانمان بوون. هیوایان وا بوو ئێمە بخاتە بەردەست پرۆژەکەی، خۆ ئەگەر ئامادەش نەبێ کردەوەی لەگەڵ قسەکانی ڕێک بهێنێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا کۆبوونەوەکە سەرینەگرت. بنگۆریۆن دوودڵ بوو. ئەو گومانەکەی لەوەدا دەربڕی گوایە "زمانی سیاسیانەی هاوبەش لەگەڵ من"دا نادۆزێتەوە. مەبەستەکەی ئەوە بوو پەلامارە سەربازییەکانمان بۆ سەر ڕژێمی بەریتانی بوەستێنین. ئەوە لە دواییدا پێمان گوترا سەرباری ئەمەش، ئەو هێشتا هەر پەرۆشی کۆبوونەوەکەیە کە تیایدا جێناگرێ بەڵکو پێشنیاز و پرۆژەکەی لە ڕێی نوێنەرێکی کەسایەتی خۆی جێبگرێ. ئێمەش دڵنیاکراینەوە کەسی نوێنەرەکە هەموو دەسەڵاتێکی دەبێ.

ئێمە لەگەڵ نوێنەری تایبەتی بنگۆریۆن دانیشتین، کە کۆبوونەوەکەی بەم شێوە دراماتیکییە کردەوە. نوێنەرەکە پێیگوتم: "تۆ داردەستێکت لە دەستدایە، چارەنووسی گەلێکی پێ دیاری دەکەی، بەڵام ئێمە خۆمان بە بەرپرسی چارەنووسی ئەو گەلە دەزانین. ئاخر ئەوە خوازراو نییە سەرباری هێزێک کە لە بەردەستی دامەزراوە نیشتمانییەکان دابێ، هێزێکی دیکەی چەکدار لە ئیسرائیلدا هەبێ. هیوادارم ئەو ڕۆژە دوور نەبێ، یەکێتی هەر دوو هێزەکە لەیەک هێزدا لە ئیسرائیلدا بەدی بێ. تا ئەو ڕۆژەش دادێ، ئەوەی خوازراوە، شتێک ڕێکبخەین لە کردەی زیانبەخشانە دوورمان بخاتەوە..."

منیش وەڵامم دایەوە:

"مـن ئەوە نـازانم ئـاخۆ ئەو ڕێکخـراوەی مـن تیایـدا کـارام، هـی ئەوە بـێ چارەنووسـی گەلێک دیـار بکـا. خـۆ ئـێمە گەر دەسـتمان بە شـەڕ کـردووە، ناشزانین ئاخۆ لەو جەنگەدا دەیبەینەوە یان دەیدۆڕێنین. ئەگەر -هیواشمان وایە وا بێ- ئەوەی کردوومانە و دەیکەین ببێتە کاریگەرێیکی مێژوویی، بەڵام لەوانەشە هەر ئەو کردەوانە ببنە مایەی "قۆناخێکی تراژیدی". هەر چۆنێک بـێ، ئـێمە بڕیارمــان داوە بجەنگـین، چــونکە ئـێمە تەواو دڵنیــاین، ئەگەر نەجەنگین، هیچ بەدەست ناهێنین. لەوانەشە نەوەک ئێمە بەڵکو ئەوانی دیکە بەروبوومی خەباتەکەمان بچننەوە؛ بەڵام ئەمە شتێک نییە جێ خەمی ئێمە بێ. هەرچــی دەربــارەی بەرپرسیارێتیشـــە، ئـێمە خۆشـــمان بە بەرپــرس لە چارەنووسـی گەلەکە دەزانـین. هەر چۆنێک بـێ، ئێـوە خـۆ لەمێـژ نیـیە دژی دەوڵەتی جوولەکە بوون، هەنووکە ڕامانی خۆتان گۆڕیوە، سـەلماندنێک کە ڕاست و دروسـتە. ئێمە بڕوامـان وایە تـا ئەمـڕۆش، ئێمە ڕاسـتین. ئێمە لە ئەرکەکە بەئاگاین. ئەوسا چ باشتر یان پۆلکتر، ئەوەش ئەوەیە کە هەیە."

نوێنەرەکە هەندێک سەخڵەت بوو.

"ئێـوە هەڵەن" ئەو وای پێگـوتم، "بەرپرسـیارێتیەکە هـی ئـێمەیە، بە تەنیـا هـی ئێمەیە، بەڵام خۆ ئەوە ئەو شـتە نییە هـاتووم تـاوتوێی بکەین. هـاتروم بۆت بســــەلمێنم، ئەســـــتەمە هەر بە تەنیـــا و بە دەستپێشــــخەری خۆتــــان، ئۆپەراسیۆنەکانتان ئەنجـام بـدەن. ئەوە بـاش لەبەرچـاوبگرە: ئێـوە زانیاریتـان نییە، بەدڵنییـایەوە زانیـاری دەقاودەقتـان سـەبارەت بە دۆخـی سیاسـییمان و ئەنجامەکانی نییە. ئاخر ئێوە چۆن دەزانن چ کردەوەیەک پێویستە و چۆن و کەی بکرێ؟ دەکرێ تۆ لە هەنگاوێکی بەهەند هەڵنەگرتووتاندا هەموو ئەوەی ئێمە پێیگەیشتین، جارانی سفری بکەن!"

منیش بەرسڤم دایەوە: "یەکەمین شت ئێمە زانیارییمان هەیە. دووهەمیش، مـن بـڕوام بە "نهێنێکی قـووڵ" نییە. لەم سـەردەمەی ڕادیـۆدا، ئـێمە بـایی ئەوەنـدە شت دەزانین."

ئەو لەگەڵ ئەمە ناکۆک بوو. "با من هەندێ زانیارییت پێبدەم" ئەو وای گوت، "لە ســـۆنگەی زانیــــارییەکەوە بـــۆت دەردەکەوێ چەنــــد ناوەســـــتایانەیە ئۆپەراسـیۆنەکانتان دژی ڕژێمـی بەریتـانی ئەنجـام بـدەن. ئـێمە پەیوەنـدی باشمان لەگەڵ چەرچڵ دا هەیە، ئەو دۆستێکی زایۆنزمە، پێمان گوتراوە 'ئەو

پیاوە پیرە" پلانێکی نوێی بۆ ئێرتز ئیسرائیل هەیە. هێشتا وردەکاریەکانی نەزانـدراون، بەڵام ئاشـکرایە جووەکـان شـتێکی جەوهەرییـان پێـدەدرێ. نەخشەکەش پەیوەستە بە ڕۆژهەڵاتـی ئـوردنەوە. چەرچـڵ گوتـویەتی: 'مـن جارێـک فەلەسـتینم داتاشـی، دیسـان کـۆی دەکەمەوە و جـارێکی دیـکە دایدەتاشمەوە'."

"ئایا راستە" منیش لێم پرسی، "چەرچڵ گوتویەتی ئەو خۆ ئامادەیە تا هێزی تێدایە بۆ زایۆنیزم بجەنگی بە مەرجێک لێی تێبگا؟"

"نەخێر، ئەوە شێواندنە. چەرچڵ شتێکی هاوشێوەی گوتبوو، بەڵام کتومت ئەوە نەبـوو. ئەو ڕوونـی کردبـووەوە، بە جـدی لەنێـو حزبەکەیـدا دژی بەرهەڵستی زایـۆنیزمە، بەڵام ئەو متمـانەی بە شکۆی خـۆی هەیە. ئەو لەو بڕوایەدا، ڕامانەکەی سـەردەکەوێ، بەڵام تـا جەنگ لە گۆڕێدا بێ ئەو نـاتوانێ هیچ بکا. ئەو چارەسەرێکی ڕیشەیی دەوێ، ئەوەش بەبێ کۆتاییهاتنی جەنگ، ئەستەمە. هەر بۆیەشە گوتبووی، ئەو یەک شەڕی گەورەی پێ باشترە."

"ئایا وایزمەن پەیوەندی لەگەڵ چەرچڵدا هەیە؟"

"هەڵبەتە. لە ڕاستیدا ئەو سەربەستانە دەستی بە چەرچڵ رادەگا. ئەوان هەر بەو زووانە لەگەڵ یەک دواون. دواتـر چەرچـڵ بە بـرادەرە بەریتانیەکانمـانی گوتـووە، زۆر سـەختە قسـە لەگەڵ وایزمەنـدا بکـا. دوای دوا دیـدارەکەیان هەموو شەوەکە خەوی لێنەکەوتووە..."

"باشە، چەرچڵ لەدوا دیداریدا چی بە وایزمەن گوتووە؟"

"ئەو هـیچ شـتێکی نوێی پێڕانەگەیانـدووە. دیسـان دڵسـۆزی خـۆی بـۆ هـزری زایۆنیزم دووپات کردۆتەوە، بەڵام ئەوەشی بۆ دووبارە کردۆتەوە، تـا جەنگ کۆتـایی نەیەت، هیچـی پێنـاکرێ. لە میـانی وتووێژەکەیانـدا ئەم قسـانەی خـوارەوەی دەق دەربڕیـون: 'تـۆ لەوە دڵنیـا بە، دوای کۆتاییهـاتنی جەنـگ، پارووێکی گەورەی چەورتان بەردەکەوێ'."

"مەبەست لەمە چییە؟"

"واتاکەی ئەوەیە... خشتەی دابەشکردنێکی باش."

"ئایا شتێکی وا هەیە؟"

"هەڵبەتە. هەر بۆ نموونە، دابەشکردنێک بەبێ "سێگۆشەکە"[55]، دابەشکردنێکی باشە ئێمەش قبوڵمانە."

"ئەری چی دەبێ گەر پێشنیازی دابەشکردنێکی "بەد" بکەن"

"ئێمە پێی قایل نابین. لە ڕاستیدا خۆ خشتەیەکی دابەشکردن لە لایەن ڕێبازی بەریتانییەکانی قاهیرەوە ئامادەکراوە. نەخشەکە بە پلانی سوریای گەورەوە گرێ دەدرێتەوە. نەخشەی دابەشکردنەکە تیایدا ئەو بەشەی گالیلی و تەنانەت هەندێ نشینگەی (ئەمەک[56])یش لە خۆدەگرێ، کە دەبێ بخرێنە سەر دەوڵەتی عەرەب. بۆ ئەمەش، هەڵبەتە ئێمە قبوڵی ناکەین. گەر هەر بیانەوێ نەخشەکە بەسەر ئێمەدا بسەپێنن، لێی یاخی دەبین. بنگۆریۆن ئامادەی یاخیبوونە. هەر لەبەر ئەوەشە، نابێ جاری هیچ کردەوەیەک بکرێ. لەسەرێکەوە ئێمە دەرفەتی ئەوەمان هەیە، شتێک لە چارەسەری بەریتانییەکان بەدەستبێنین، هەرچەندە شتەکە نموونەییش نییە، بەڵام سەربەخۆیی و ژمارەیەکی زۆری کۆچبەر و رووبەرێکی بەرفروانکردنی نیشنگەکانمان بۆ مسۆگەر دەکا. لە سەرێکی دیکەشەوە، ئێمە دەبێ ئامادەی پلانێکی خراپیش بین. چالاکیەکەی ئێوە شایستەی ئەو نەخشە نامرادانەیە و لە هەمان کاتیشدا بۆ ئەوەی لەگەڵ ئامادەکارییەکانی ئێمە بۆ هەڵگەڕانەوە تێهەڵکێش بکرێن."

"من لەگەڵ تۆ ناکۆکم،" من وام پێگوت، "ئێمە، وەک خۆتان دەزانن، هەموو دابەشکردنێک رەت دەکەینەوە. بۆ ئێمە شتێک نییە ناوی 'دابەشکردنی باش' یان 'دابەشکردنی خراپ' هەبێ. دەکرێ تۆ قسەکەم بە دۆگمای بزانی، بەڵام ئەوە هەڵوێستمانە. نیشتمان یەک یەکەیە، ناکرێ کەرت کەرت بکرێ. هەر چۆنێک بێ، ئەوە بۆ ئێمە ڕوون و ئاشکرایە، گەر شەڕ نەکەین، بە هیچ ناگەین. من بەدوای ڕۆژنامەگەری بەریتانیدا ڕۆیشتووم، زیاتر لەوەی لێرە دەستمان پێڕا دەگا. بۆ نموونە لە The Economystدا خوێندومەتەوە و لێی تێگەیوم، کە کتێبی سپی سیاسەتێکی نەگۆڕی حکوومەتی بەریتانییە. بەگشتی لێرەدا شتێک نەماوەتەوە، هیوا لەسەر بەڵێنەکانی ئەوان ڕۆ بندرێ. با چەرچل بۆ خۆی هەر ئاماژە بە قۆناخی دوای کۆتاییهاتنی شەڕ بکا. وا

---

[55] مەبەست لە دەستەواژەی سێگۆشەکە دیارکردنی ئەو خاکەیە لە ناوەندی فەلەستین، باکووری ئۆرشەلیم و تا دەگاتە کەنار، ئەوەش هێڵێکی خەیاڵییە کە سێ شاری پڕ لە دانیشتوانی عەرەب وەک نابلس، تولکەرەم و جەنین بەیەکەوە دەبەستێتەوە. سێگۆشەکە بەشێکی باش لە ڕۆژئاوای فەلەستین لە دەوڵەتی ئیسرائیل دادەبڕێنی.

[56] دۆڵی ئیسرائیل، بە پیتترین نشینگەی کشتیاری جوولەکە لە ئێرتز ئیسرائیلدا.

دابنێ ئەو چی دیکە لە دەسەڵاتدا نەما. ئەرێ ئەو کات چی روودەدا؟ تۆش هەروەک من دەزانی چی لە ئەوروپادا دەقەومێ. ئایا شیاوە بۆ ئێمە چاوەڕێ بکەین؟ لەدوا لێکدانەوەشدا، چۆن دەکرێ خەباتەکەمان زیان بە پرسی نیشتمانیی جوو بگەیەنێ؟ ئێمە پرسی ئێرتز ئیسرائیل بۆ کەمەری سەرنجی رای گشتی بەرز دەکەینەوە، وەک دیارە خەریکە تۆ کتومت خۆت لەگەڵ چالاکیەکانمان نەبان بکەی."

"بەڵێ، بەلام خۆ هێشتا پرسی دیسیپلین هەر لەگۆڕێدا دەمێنێ، ئەمەش پرسێکی کوشندەیە. ئێمە ناکرێ رێگە بەوە بدەین، ئێوە پارە لە پیاوێک وەربگرن کە باربووی کێرن هایسۆد[57] دەکا و دیسپلینی خۆتانی بەسەردا بچەسپێنن. گەل دەبێ تەنها یەک لەشکر و یەک سیاسەتی هەبێ."

ئاخر گەلەکەمان لەژێر دەسەلاتی بێگانە دایە، تەنها یەک سیاسەتیش بۆ خەڵکی چەوساوە هەیە: خەبات بۆ رزگاربوون. "

دەمەتەقێکە لە سەعات سێی بەیانیدا بەکۆتا هات. نوێنەری تایبەتی بنگۆریۆن لە کۆتاییدا داوای ئەوەی لێکردین نەخشەکانمان بدەینە ئاژانسی جوو یان فەرماندەیی هاگانا. منیش پێمگوت، نیازم وا بوو وا بە رێزدار بنگۆریۆن بڵێم: "ئەگەر تۆ بجەنگی، ئێمە نەوەک هەر لە پاڵتدا دەجەنگین، بەڵکو دواشت دەکەوین. تا ئەو کاتەش دێ، ئێمە ناتوانیین نەخشەکانمان رادەست بکەین. خەباتەکەمان ئەوپەڕی نهێنی نەخشەدانان و جێبەجێکردنی لێماندەوێ. ئاخر چۆن ئێمە نەخشەکانمان رادەستی دامەزراوەیەک بکەین، کە حاشا لە مافی بوونمان دەکا؟"

لە دواییدا، پیاوەکە بە خەندەیەکی سەیرەوە گوتی: "تۆ قەناعەتت لەیەک شت پێهێنام: دەبێ هەر یەک هێزی چەکدار لە ئێرتز ئیسرائیلدا هەبێ." بەڵێنیشی دا بە راپۆرتێکی تێروتەسەل بنگۆریۆن لە دیدارەکەمان ئاگادار بکاتەوە.

ئەو لە دەستە چەکدارە شەوگەڕە بەریتانییەکان نەدەترسا. ئەو هاولاتییێکی بەڕێزی ملکەچ قانون بوو. منیش لەگەڵ ئێلیاهۆ لانکین مامەوە، کە بۆ کۆبوونەوەکە یاوەرم بوو. من باسوخواسەکەم پێگوت. ئێمە باسی ئایندەمان کرد، تیاشیدا گێژمان خوارد. لە بەرەبەیاندا، کاتێ کرێکاران دەچوونە سەر

---

[57] دامەزراوی فەندی فەلەستینییە کە جووی خۆبەخشی سەرتاسەری دنیا تێدایە و گەورەترین پەرەسەندکانی ولات فەند دەکا.

کاری خۆیـان، ئـیمەش هەر دووکمـان لە شـەقامێکی لابەلاوە بـۆ سـەر کـاری خۆمـان بـۆی دەرچـووین. هاوڕێکانمـان بە تیروتەسـەلی لە کۆبـوونەوە بە ئەنجام نەگەیشتوەکە، ئاگادارکردەوە. قسەی لەسەر نییە ڕێزدار بنگۆریۆنیش ڕاپۆرتی نوێنەرەکەی بۆ چووە. ئەو پیاوەی نوێنەرایەتی دەکرد، کە بڕوای بە وتەکانی چەرچڵ دەربڕی، ئەو کەسەی بە تاسەوە باسی دیسپلینی بۆ کردم، مۆشێ سینە بوو.

3

دوای تکـاکردن هەڕەشەوگوڕەشـە هـات. ئەوان لە پـایزی ١٩٤٤دا دەسـتیان پێکرد. ئێلیاهۆ گۆلۆمب، سەرکردەی هاگانا، تازە لە لەندەن گەڕابۆوە. دیاربوو لەگەڵ کاربەدەستە حکوومییە بەریتانییەکان یەکدییان دیبوو. دەستڕۆیشتنی د. وایزمەن لە دامودەزگاکانی حکوومەتی بەریتانیادا -یان ئەوەی گۆلۆمب پێیوابوو دەستڕۆیشتنە- باندۆرێکی قووڵی لەسەر سەرکردەی هاگانا دانابوو. هەر چۆنێـک بـێ، کاتێـک ئەو لەپـایتەختی بەریتانیـا گەڕایەوە، گۆلۆمـب سەرۆکایەتی هەڵمەتێکی خاچدارانەی دژی ئیرگون زڤای لیومی دەستپێکرد. ئەو لە کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەگەریدا بیروباوەڕی خۆی سـەبارەت بە گۆڕانی هەڵوێستی بەریتانییەکان لەمەڕ گەلی جوولەکە دەربڕی؛ ئەو وای نمایش کرد گـوایە "زۆر دەرگـا"(بێ دیـاریکردن) لە لەنـدەن، کە تەنـانەت لە ڕووی کاربەدەستانی دەرەوەشیان داخرابوون، هەنووکە بـۆ سـەرۆکی ڕێکخراوی جووەکـان لەسـەر گـازی پشـتن؛ ئەو وای گـوت گـوایە هەر "تیرۆرستەکانن" هەمـوو ڕامانێکیـان خسـتۆتە ژێـر مەترسـی و داواشـی کـرد، نـابێ ڕێ بەو "منداڵبازاڕییە" بدرێ لەسەر کاری خۆیان بەردەوام بن.

چەند هەفتەیەک دواتر داوامان لێکرا لەگەڵ بەڕێز گۆلۆمب، ئەوەی پێیدەگوترا "وەزیری ئاسایش" کۆببینەوە. بەلای منیشەوە ئاسان نەبوو، بەو دیدارە قایل ببم. ئێمە هەمووومان لەوە دوودڵ بووین، ئاخۆ ڕەوشەکە ئەوە دەهێنێ یاخود دروستە لەگەڵ کەسانێک دابنیشین، کە ڕاشکاوانە جاڕی شـەڕیان لە دژمـان داوە. هەرچۆنێـــک بـــێ تـــای تەرازووەکە بەلای بەڵگەوبەنـــدەکان (ئەرگومێنتەکـان)ی ئێلیـاهۆ لانکینـدا شـکایەوە. ئەو مشـتومڕی لەسـەر ئەوەدەکرد، پەیوەنـدی ڕاسـتەوخۆ هەمیشـە داخـوازە. باشـە بـۆچی وا بکەیـن خەیاڵبـازیی گۆلۆمـب ئـازادانە بەسـەرمان تێپەڕێ، ئەو وای پرسـی. هەڵـبەتە

گەر نەشکرا قەناعەتی پێ بهێنین بەوەی، تاکە ئامانجی ئێمە لەو شەڕەدا ڕزگارکردنی نیشتمانەکەمانە، خۆ هەر هیچ نەبێ دەکرێ بیروڕاکەی ئەو سەبارەت بەئامانجە سەرەکییەکەمان لاواز بکەین، ئاخر ئەو جارێک ئامانجەکەی وا وێنا کردبوو: "دەسەڵات لە یوشیڤ[٥٨] دا." وەک ئێلیاهۆ بە بەرەنجامێک دانابوو، گەر ئێمە لەوەدا سەرکەوتین، ئەوا ڕەتکردنەوەی کۆبوونەوەکە تای تەرازوی بەرەوپێشچوونەکە لەنگ دەکا.
ئەو بەڵگەوبەندە شیرین و ماقووڵە دوودڵییەکەی ئێمەی سەبارەت بە کۆبوونەوەکە لانەبرد، بەڵام قایلیش بووین لەگەڵیان دابنیشین و وەڵامی "نەخێر" بۆ داوای ڕاگرتنی خەباتیان لە چنگ بنێین. گۆلۆمب بە یاوەری موشێ سنێ هات؛ ئێلیاهۆ لانکین و منیش نوێنەرایەتی ئیرگونمان کرد. کۆبوونەوەکەش لە شەقامی بزنسی تەلئەبیب لە ئەلنبیدا زۆر فەرمییانە، ساز درا. گۆلۆمب و سنێیە وایان بەئێمە گەیاند، ئەوان بەناوی "کنێستی ئیسرائیل[٥٩]"ەوە قسە دەکەن، ئیدی هەر بەناوی ئەوانیشەوە داوا دەکەن دەمودەست ئێمە کاروچالاکیەکانمان دژی بەریتانییەکان ڕاگرین. زۆربەی بەڵگەوبەندەکانیشیان نوێ نەبوون. گۆلۆمب پێی وابوو، ئۆپەراسیۆنەکانمان کە ئامانجیان زیانپێگەیاندنی ئاژانسی جووەکان نییە، لێ دەرهاوێشتەکەی کارێکی نیمچە منداڵانەی شوێنپێهەڵگرتنی پاڵەوانانەیە. ئەو زۆبەی قسەکانی تەرخان بوو بۆ چالاکی قۆستنەوەی دەرفەت لە لایەن ئەندامانی هاگانا لەنێو دەزگای هەواڵگری نهێنی بەریتانیا دژی ئەڵمانەکان کە بە پەرەشووت لە چەند وڵاتێکی ئەوروپادا دابەزێندراون. "ئەمە ئازایەتی ڕاستەقینەیە،" سەرکردەی هاگانا وایگوت، "دەکرێ ئەندامەکانی ئێوەش بەشداری ئەو جۆرە ئۆپەراسیۆنە نەبەزانە بن، نەوەک بابدەنەوە سەر تیرۆریزم."
قسەکانی گۆلۆمب تێکەڵێک بوون لە بۆرە پەسندانێک تا بۆ لای خۆیمان کێش بکا، لەگەڵ گەفێکی ڕەش بۆ ئەوەی لایەنی ورە و دەروونیمان بشێوێنێ. "من حاشایی لەوە ناکەم،" ئەو وای گوت "کە گیانی خۆ قوربانیدان لەنێوان ئێوەدا هەیە، بەڵام هەنووکە دەبێ ئاراستەی کارەکەتان بە ئاقارێکی دیکەدا وەرگێڕن. دەکرێ ددان بەوەدا بنێم، ئەوکارەی کردووتانە،

[٥٨] مەبەست لە زاراوەی یوشیڤ کۆمەڵگە و نشینگە جووەکانی نێو فەلەستینە. وەرگێر
[٥٩] ئەوەش ناوە فەرمیەکەی کۆمەڵگەی جووەکان بوو لە ئێرتز ئیسرائیلدا.

نیشـانەنمایەکی دیـاریکراوی سیاسـیی پێـوەیە، چـونکە ئێـوە سـەلماندتان، هەرکاتێ جووێک لە ئێرتز ئیسرائیلدا کەوتە شەڕ، ئەوا ئامادەیی تێدایە تا دوا ئەنجام لەگەڵیدا بڕوا، تەنانەت گەر سەری خۆشی لەپێناودا دابنێ. خۆ ئەگەر ئەمە ئامانجەکەتان بێ، ئەوەی کردوتان بەسیەتی. ئێوە ئەوەی لێتان داواکرا، سـەلماندتان. هەنووکە ئێوە دەبێ چالاکیەکانتـان ڕاگرن˝- ئەو تۆنە دەنگێکی لێبڕاوانەی بەکارهێنا- ˝نەوەک هەر چالاکیەکان ڕاگرن، بەڵکو دەبێ ڕاشکاوانە ئەوەی بڕیارتان لێداوە بیکەن، ئیدانەی بکەن.˝

لانکین و منـیش ئەوەمـان بـۆ دووبـارەکردنەوە، کە بڕیارمـان لێدابوو پێیـان بڵێین. ئێمەش شتێکی نوێی وامان بۆ وەڵامدانەوەکانمان لێ زیاد نەکرد. ئێمە لەنێو هەڵمەتی قڕکردنەکەی ئەورووپادا ون بووین. ئێمە ئاماژەمان بە سنوورە تەلبەندکراوەکانی ئێرتز ئیسرائیل دا، سەدای دەنگدانەوەیش لە جیهاندا لە ڕێی ئۆپەراسـیۆنەکانمانەوە بـوو. ئـێمە جەختمـان لەسـەر ئەوە کـردەوە، کە خواستمان سەرچڵیی و کاری پاڵەوانانە نییە، بەڵام دەبێ ڕەگوریشـەی هۆش لە ئەرکەکانماندا بچەقێنین، هۆشیاریی ئەوەی گەر ئێمە چەکەکانمان دابنێین، ئەوا شەوێکی تاریک و نوتەکی کۆیلایەتی باڵ بەسـەر گەلەکەماندا دەکێشێ. کاتێکیش ئێمە جەنگاین، دەتوانین بارودۆخی نیشتمان و گەلەکەمان بگۆڕین. لە بەرەنجامیشـدا ئێمە هیچ هۆیەک نابینین بۆ قایلبوون بەداخوازی خەبات ڕاگـرتن، هەروەهـا هـیچ هـۆیەکیش نـابینین، هـاوڵاتییێکی جـوو دژی ئـێمە بوەستێتەوە، هەر لەبەر ئەوەی ئێمە دژی بەڕێوبەرایەتی بەریتانی دەجەنگین.

شەقامی ئەلینبی کە لە ئێواراندا لەخەڵک جمەی دێ، بەڵام شـەو ڕاشکا بـوو، دەمێک بوو خەڵکەکە ڕازابوون، ئێمەش هەر چوارمـان بۆ چەندان سـەعات لە دەمەتەقـێ و مشـتومڕی خۆمانـدا بەردەوامبـووین. لەو باسوخواسـانەماندا، بەڵگەمـان دەخسـتە ڕوو، مێژوومـان بیردەهێنـایەوە، پێشـبینی ئایندەشـمان دەکرد. کاتێک من گوتم، هیچ لایەکمان شـتێکی نوێی نەهێنا پێش، دوو لەو شتانەی ئەوێ شەوێ گۆلۆمب باسی لێوەکردن هی لەبیرچوونەوە نەبوون و لە یادەوریمـدا تۆمـار بـوون. ئەو بیروڕایەکـی قـووڵی نەوەک هەر دەربـارەی سـەرکەوتنی ئاینـدەی پـارتی کرێکـاران لە بەریتانیا دەربڕی، بەڵکو ئەوەشـی گـوت، بەهـۆی هەڵبـژاردنەکەوە گۆڕانکـارییێکی بڕیـاردەرانەی هەڵوێسـتی

بەریتانیەکان سەربارەت بە زایۆنیزم دێنێتە ئارا. ئێمە هەوڵماندا باوەڕە ساویلکانەکەی بهەژێنین، بەڵام بێهودە بوو.
هێشتا ئەوەی مایەی سەرسامی بوو- لەڕاستیش حەپەسان بوو- ڕوانینی سەرکردەی هاگانا سەبارەت کارانگازێتی خەباتەکەمان لەسەر گەلی خۆمان بوو. ئەو شتومڕی لەسەر ئەوە دەکرد، گوایە ئێمە جووەکان فێرە ترسنۆکی دەکەین، لەبری ئەوەی لەسەر ئازایەتی رایانبهێنین!
بەترێک لە نیوە شەویش رابردبوو، هێشتا مشتومڕی گفتۆگۆکانمان لەگەرمەدا بوو. خواحافیزکرنەکەش شتێکی دڵخۆشکەر نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، ئێمە وشەی "شالۆم"مان دەگوت و دەستی یەکدیمان دەگوشی، لێ هەڕەشە و سێبەری شەڕی ناوخۆ لە هەوادا هەر مابووەوە. بەر لەوەی لەیەک جیا ببینەوە، پێمان لەسەر ئەوە داگرتەوە، شتێکی رەوا نییە هاگانا بکەوێتە نێوان ئێمە و حکوومەتی ماندات. هیوای ئەوەشمان دەربڕی، ڕۆژێک دابێ بەیەکەوە بەرەنگاری ڕژێمی بێگانە ببینەوە. گۆلۆمبیش وەلامی دایەوە: "ئێمە هەنگاوێک دەنێین و لەناوتان دەبەین." زۆر دواتر لە واتای تەواوی ئەو وشانەی، کە لە کۆتایی دانیشتنەکەدا پێیگوتم، تێگەیشتین. گۆلۆمب خۆی بەدەست نەخۆشییەکی دڵ دەیناڵاند، کەمێک دواتر و لە تەمەنێکی تا ڕادەیەک گەنجیشدا کۆچی دوایی کرد.

## بەندی 10
## ئێمە لەسەر هەقین؟
٢٣٤ - ٢٤٧

کاتێ هێزەکانی بەریتانیی زەبرێکی گورچکبڕیان لە ئێمە وەشاند، هێشتا گەف و هەڕەشەی برایانمان لەنێو وڵاتدا هەر لەگوێماندا دەزرینگایەوە. سەر لە بەیانی زووی ٢١ی ئۆکتۆبەری ١٩٤٤، هێزێکی زۆری داگیرکار ئۆردوگای گیراوەکانی (لاترن)ی لە هەموو لایەوەکەوە ئابلوقە دا. هەندێک لەو ٢٥١ گیراوەیان لە خەو بە نیوەڕوتی ڕاچڵەکاند، بە دەستبەستن و بەدواخۆدا ڕاکێشان خستیانە فڕۆکەیەکی بارهەڵگری قورس و بەرەو ئێریتێریا لە ڕۆژئاوای ئەفریقیایان ڕاپێچ کردن. لەو هەموو شێوازانەی دژی ئێمەیان بەکارهێنا، ئەم زەبرەی چەوسێنەران کوشندەترینیان بوو. ئەمەش هەوڵێکیان بوو، تا بڕبڕەی پشتی یاخیبوون بشکێنن و ئەو ئاگرەی هەڵمانگیرساندبوو، دایبمرکێننەوە. لە وڵات دەرکردن شتێکی سووکوئاسان نییە. ئەو ڕوونکردنەوەی دەسەڵاتدارانی بەریتانییش خستیانەڕوو، تا ڕادەیەک پەسندانی دڵنەوایی ئێمە بوو. ئەوان گوتیان، بۆیە وامان کردووە، چونکە لە نیازیی ئیرگون دەترساین نەوەک بەهێز گیراوەکان ئازاد بکا. ئێمە دەمانزانی ئەوان لە گوتنەکەیاندا مەبەستیان مەراییکردن نەبوو. ئەوان مەبەستیان بوو گیان و ورەمان تێکبشکێنن. ئەوەش ڕاستبوو، هەمیشە نەخشەی ڕزگارکردنی هاوڕێ گیراوەکانمان هەبوو، هەر کاتێک دەرفەتمان بۆ بڕەخسابا، سێ و دوومان لێ نەدەکرد؛ بەڵام ئەم گوتەیان، کە نمایشێکی فەرمییانە بوو، بۆ ئەوە بوو، نیازە ڕاستەقینەکەیان گۆڕەوشار بکەن. مەبەستەکەشیان فرەسەر بوو. چەوسێنەر دەیەویست جەستە و گیانی گیراوەکان تێکبشکێنێ، لەنێوشیاندا هەندێ لەباشترین ئەفسەر و مێرخاسەکانی ئێمەی تێدابوون. ئەوان دەیانەویست ئازاری ماڵباتەکەیان بدەن، کە ژمارەیان چەند سەدانێک بوون. مەبەستیان بوو ترس و دڵەڕاوکێ لەنێو دڵی گەنجانی جوو بچێنن، تا لە ڕیزەکانی ئێمەیان دوورخەنەوە. مەبەستیشیان بوو کاردانەوەی 'یوشیفی ڕێکخراو' سەبارەت بە وڵاتبەدەرکردنەکە تاقیبکەنەوە، بۆ ئەوەی بزانن ئاخۆ

ئەوان تا چەند نەوەک هەر لەگەڵ "تیرۆستان" بەڵکو لەگەڵ جوو بەگشتی بەگوێرەی پێوەندگەکانیان بڕۆن.
ناکرێ نکولی لەوە بکرێ، ئەوێ دەمێ ورەمان دابەزیبوو. ئاخر دیسان ئێمە کەوتبووینە بن بارێکی قورسی بگرەوبەردەیەکی عەقڵ توندەوە، کە لەگەڵ بەرکەوتنی یەکەمین زیانی زەبری کوشندەمان پێکەوت. لەو بڕوایەدا بووم پرسەکە لە لای هەموو شۆڕشگێڕێک چەکەرەی کردبوو. تۆبڵێی ئێمە لەو دۆزەدا هەقبین، تەنانەت گەر بە ناڕاستەوخۆش بێ، ئەوەندە ژانوناسۆرە و ئەوەندە خەم و خەفەتمان تووشی بەشێکی زۆر لە هاوڕێکانمان کردبێ؟
من خۆم کاتی گرتن و دوورخستنەوەکەم لەبیر بوو. دەمزانی خودی زیندان سزادانێکی بۆ کەسێکی ڕۆشنبیر قورسە. لێ گەلۆ، خۆ گەر ئەو نامۆییەی بەسەر گیانی هەر دوورخراوەیەک دەسوڕێتەوە، سەربار بکەی، ئەگەر تۆ کەساسیی ئەو غەریبییەی نیشتمان لێ زیاد بکەی، بیرۆکەیەکی قوڵی ترسوبیمت لا دروست دەبێ، کە هەر دەبێ بەرگەی بگری.
ئەمەش بەرگەگرتنێکی دووهێندە بوو بۆ ئەو دووسەد و پەنجا کەسەی، کە بەریتانییەکان گرتبوویانن. کەواتە، جێی سەرسوڕمان نەبوو، یەکەمین کاردانەوەمان ئەوە بوو، هەموو شتێک کە پێمان دەکرێ، بیکەین، بەڵکو چەوسێنەران ناچار بکەین ئەو هاوڕێ دوورخراوانەمان بگەڕێننەوە.
هەڵبەتە ئێمە بڕواشمان بە "ناوبژێکردن" نەبوو. گەر هاتبا و بە "ناوبژێکارەکانمان" گوتبا ئێمە بە تەواوی دەست لە خەبات هەڵدەگرین، نەوەک هەر دوورخراوەکانیان دەگەڕاندەوە، بەڵکو سەرلەبەریان ئازاد دەکردن و شتی دیکەشیان بۆ دەکردین؛ بەڵام بڕیاری یەکلاکەرەوەی ئێمە بەردەوامی خەباتە نەپچڕاوەکەمان بوو، تەنها گەر پێویست بکا، ناوبەناو پۆلایەکە لەنێو ئاگرە کوێرەوەرییەکەدا شل بکەین. ئەمە لە سەروبەندی ئەوەدابوو، نەخشەی ئۆپەراسیۆنەکانمان وا داڕێژین، کە هەر لەبەر تۆڵەکردنەوەی دوورخراوەکان نەبێ، بۆ ئەوەی بۆ دەسەلاتدارەکان بسەلمێنین حیساباتەکانیان تا ئەوپەڕی سنوور هەڵە بووە.
ئەندامەکانی ئێمەو ئەندامانی F.F.I (جەنگاوەرانی ڕزگاریخوازی ئیسرائیل) شەو دوای شەو دروشمی نارازییان دژی دوورخستنەوەی هاوڕێکانیان هەڵدەواسین. هەروەها هۆشدارینامەی دوا وادەی یەکانگیری ئێمە و F.F.I و

داخوازییەکانمان بۆ گەڕاندنەوەی هاوڕێ دوورخراوەکانمان دەرکرا بوو. هەر بۆ ئەوەش ئێمە دەستمان لەسەر پەلاپیتکەی "هاوڕێ پارابێلیوم"[٦٠] دانابوو. لێ گەلۆ ئەوێ ڕۆژێ شتێک ڕوویدا، نەخشەکانمانی شکست پێهێنا. لە یەکی نۆڤێمبەری ١٩٤٤دا و لە کاتێکدا لەگەڵ یاکۆڤ مێریدۆردا چاوەڕێی ئێتزا یسەرنێتسکی و ناسان فریدمان فەرماندەکانی F.F.I دەکرد، تا ئۆپەراسیۆنێکی هاوبەش تاوتوێ بکەین، یاکۆڤ هەر لەخۆوە ڕادیۆکەی کردەوە. هەواڵی تازە لە قاهیرەوە بڵاوکرایەوە، لۆرد مۆینە[٦١] کوژرا. ئەمەش دەستبەجێ هێمای هەڵمەتێکی گشتیی هاگانا و ئاژانسی جووەکان بوو دژی کارە تێکدەریەکانمان. سەرکردە فەرمییەکان هەموو شتێکیان قۆزتەوە تا ڕووداوی کوشتنی مۆیەنە بۆ هەڵمەتێکی بەرفراوان دژی ئیرگون بەکاربێنن. ئیدی "وەرزی کراوە" دەستپێکرد.

## 2

شتەکە بووە پێشینەی گفتوگۆیەکی نهێنی و دەمەتەقێیەکی گشتی لەنێو "قوتابخانە هزرییە" جۆربەجۆرەکان، لە نێویشیاندا سەرکردە فەرمییە زایۆنیستەکان. ڕابی فیشمان (لە پارتی میزراحی دینی زایۆنیستی) و بەڕێز یتساق گرێونباوم (لە زایۆنیستییە گشتیەکان) بە شێوەیەکی بنەمای دژی هەر هەڵمەتێک بوون لە دژی ئێمەدا. ئەندامانی "گرووپی ب" کە لە پارتی ماپای (پارتی کاری فەلەستینی) ببوونەوە، لەگەڵ "پۆلای زایۆنی چەپ" زیاتر حەزیان بە "کردەوەیەکی سەربەخۆییانە" -کە ڕفاندن و هاوپەیمانێتی ئۆپەراسیۆنانە- بوون، بەڵام دژی هەر هاوکارییەکی ڕاستەوخۆی پۆلیس و دەزگای هەواڵگری بەریتانی بوون. بنگۆریۆن، گەورەی ماپایش، لە کۆنفرانسێکی هیستادروت[٦٢]دا کە ڕاشکاوانە بۆ جەماوەرەکە دوا، بیروڕای سەرنجڕاکێشی دەربڕی بەوەی جاڕی هەڵمەتی دژی ئێمەی دا. ڕێزدار بنگۆریۆن ڕوونی کردەوە، تەنها لە هەندەراندا ئەوە هەڵە بوو، کە هاوکاری پۆلیسی بێگانە بکرێ؛ کەچی لێرە لە ئێرتز ئیسرائیلدا، هیچ هۆیەک لەئارادا

---

[٦٠] جۆرە دەمانچەیەکی نەوکات بوو. وەرگێڕ.

[٦١] وەزیری بەریتانی بۆ کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو. وەرگێڕ.

[٦٢] هیستادروت کۆنفیدراسیۆنی یەکێتییەکانی کرێکارانی ئێرتز ئیسرائیل بوو، بە شێوەیەکی ڕێژەیش لە یەکێتی کرێکارانی بەریتانیای مەزن بە دەسەڵاتر بوو. هەرچەندە بە گوێرەی دەستەواژەی هەڵبژاردن بێ دەگوترێ ماپای جڵەوی هیستادروتی لە دەستدا بوو، بەڵام گەر لە ڕاستی نزیک ببینەوە، دەبێ بگوترێ هیستادروت بەسەر ماپایدا زاڵبوو.

نییە ئاخۆ بۆچی کۆمەڵگە جووەکان لە "دۆزێکی هاوبەشدا" یارمەتی پۆلیس پەسند نەکەن.
لەوێدا بنگوریۆن پرۆژەیەکی "چوار خاڵی بۆ بنبڕکردنی تیرۆر" دارشت. بە تاسەیەکی شایستانەوە بۆ دۆزێکی باشتر ڕێزدار بنگوریۆن گوتی:
"هەنگاوی یەکەم بەشێوەیەک دارێژراوە، ئارەزوم وایە بە زمانێکی سادە پوخت دەریببڕم.

***دەرکردن لەکار***

"... هەر کەسێک بەو باندەوە پەیوەست بێ، هەر کەسێک کۆمەکیان کا، نەوەک هەر ئەوانەی دەمانچە بەکاردەهێنن یان بۆمب دەهاوێژن، بەڵکو هەر کەسێک ئەدەبیاتیان بڵاو بکاتەوە یاخود جاڕنامەکانیان بەدار و دیوارەکاندا هەڵبواسێ، دەبێ لەسەر کارەکەی دەربکرێ، ئەوسا چ لە دامودەزگا بێ، یان کارخانە یان کێڵگەکان، دەبێ لە ئاڵوگۆڕکردنی ئیشەکانیش بەدەر بنرێ. هەمان داواش بۆ ئەو قوتابییانەی لە سەرەتایی و قوتابخانەکانی دیکەن... خۆ ئەگەر ئەدەبیاتەکانیان لەنێو خوێندکاراندا پەخش بکا، نابێ هەر بەوە لێبگەڕێن ئەدەبیاتەکەی لێ بستێندرێ و بسوتێندرێ، بەڵکو دەبێ لە قوتابخانەکەش دەربکرێ...

***نە هەنوان و نە داڵدەدان***

"... دووهەمین هەنگاو، نابێ نە هەنوانیان بدرێتێ نە داڵدەش بدرێن. من دەزانم لێرەدا ئێمە دژی یەکێ لە جوامێرترین و پەسندترین شتی خۆماکی - خۆماکێکی مرۆییانە نەخاسمە جووان دەوەستینەوە، بەڵام ئێمە نامانەوێ گەلی جوو بخەینە ململانێیکی وێرانتر و ناشکرێ خۆمان لەگەڵ بەزەییێکی ساختەدا رابێنین. هەنوان و داڵدەدانی ئەو تاوانبارانە قەدەغەیە، کە ئایندەی ئێمە دەخەنە مەترسییەوە.

***ملکەچ نەکردن بۆ گەف و هەڕەشە***

"... سێهەم: ملکەچ نەکردن بۆ گەف و هەڕەشەکانیان... هەڕەشەکانیش گەیشتوونەتە ئەو قۆناغە، خەڵک لەو باندە دووركەوتۆتەوە.و بە جۆشوخرۆشەوە دژی ڕەفتارە شەرانگێزیەکانیان وەستاونەتەوە داوای ئەوە دەکەن، نابێ هیچ کردەوەیەکیان لەدژدا بکرێ دەنا دەکەوینە نێو براکوژی...

***هاوکاریکردن (لەگەڵ بەریتانییەکان)***

"...له بەرەنجامدا، تا ئەو ڕادەیەی دەسەڵاتدار و پۆلیسی بەریتانی چاوی لەوەبێ تیرۆریزم پامال بکا، ئێمە هاوکارییان دەکەین. ئەوە شتێکی یاغنیشانە و خۆکوژیانەیە، کە ئێمە هەر لەبەرناهەقی بارەکانی دیکەی دژی هەبوونی ڕژێم لە وڵات، دەستی یارمەتی لە بوارەکانی دیکەدا ڕەتبکەینەوە، کە بەرژەوەندی هاوبەشمانی تێدایە... بەبێ یارمەتی دەسەڵات و یارمەتیدانی ئێمە لە لەناوبردنی تاعونەکەدا سەرناکەوین...

"ئەو چوار داخوازییانە بۆ باری هەنووکەییمان کەمترین داوای کردەییمانە، کە دەکرێ جێبەجێ بکرێ، بۆ ئەوەش دەبێ هەموو ژن و پیاوێک، هەموو قوتابی، کرێکاری کارخانە، هەموو باخچەوانێکی گوندیی بۆ جۆش بدرێ..."

ئەو بیروڕایەی لە لایەن بنگۆریۆن و ڕکابەرەکەی هاشۆمەر هاتزایری سۆشیالیست پێشکەش کرا، سەرکەوتنێک بوو. رابی فیشمان و گرینونباوم بۆ ماوەیەک دەستیان لەکار کێشایەوە و بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بەرکەنار کران. گروپی (پۆلای زایۆنی چەپ)یش خۆپاریزی بنەماییانەی خۆیان لەهەمبەر خاڵی چوارەمی بەرنامەکە دەربڕی، بەڵام پەیرەوکردنەکەشیان پەسەندکرد. 'وەرزەکە' بە هەموو هێزێکی خۆیەوە بەسەرماندا هات. هەزاران ئەندامی هاگانا جۆشدران و لەشارە گەورەکاندا چڕبوونەوە. وڵات دابەش ببوە سەر بەرەو ناوچەی چالاکییەکان. ئەفسەرەکان ڕەگەڵ پۆلیسی بەریتانیی خران. بەشوێنداگەڕانی ڕێکخراوانە هەموو گەڕەک و کۆڵانێکی گرتەوە.

یەکەمین دەرکردن لە قوتابخانە و یەکەمین لەکارخستنی کرێکارێکی"گومانلێکەران" لەسەر کارەکەی جێبەجێکرا. پێ بەپێی دەرکردن و لەکارخستنەکە، مەبەستیان تۆقاندن و برسیکردنی باوک و ڕۆڵەکانینان بوون، ئیدی لەوێشەوە ڕفاندن و ڕادەستکردنی گیراوەکان بۆ بەریتانییەکان برەوی سەند. هەموو ڕۆژێک کارێک لە کورتەی دەدا. ئەندامە لاوەکان دەرفێندران، ڕێگاش بە دێرینەکان دەگیرا. هەڕەشەی هاگانا بۆ ڕفاندنەکان ناقوڵا بوو. تۆ حیسابی خۆت بکە، وەرز زستان بوو، زۆر جاران قوربانییەکان لە ژوورە تاریک و شێدارەکان دەهێڵدرانەوە. خۆراکی کەمیشیان دەدرایێ و بە دەستی هاوڵاتییە جووەکانیشیان ڕەفتاری خراپیان لەگەڵدا دەکرا.

هاوشان لەگەڵ ڕفاندنەکانی هاگانادا، دەست بە پەیڕەوکردنی خاڵی چوارەمی بەرنامەکەیان کرا: ئیدانەکردن و ڕادەستی بەریتانییەکان. لیستی پیاوەکانی ئیرگون کە لەبن ئەوبارە نالەبارە دەیانناڵاند، دووورودرێژ بوو. هەندێ شت لەو دەمەدا بە زێر دەقەبڵێندرا کە ناوەکان، ناوونیشان، وێناکردنەکان، خەبەرلێدان، ئیدی تا دەهات بارستایی فایلەکان قەبەتر دەبوو.
بەگوێرەی قسەی ریچارد کرۆسمان، ئەندام پەڕلەمانی پارتی کرێکاران، ئەو لیستەی لە لایەن ئاژانسی جووەکان و هاگانەوە لەسەر ئەندامانی ئیرگون زڤای لویمی دراوەتەوە بەریتانییەکان ١٥٠٠ ناو دەبوو. من پێموامە ژمارەی ١٥٠٠ زێدەڕۆیی بێ، لەوانەشە زۆریش نەبێ، هەڵبەتە لەچاو پێلێهەڵبڕین ژمارەکە زۆر نییە. هەرچەندە ئەوەش قسەی لەسەر نییە، لە ماوەی ئەو تەنگژەیەدا ناوی سەدان ئەفسەر و پیاوی ئیرگون لە لایەن دەزگا فەرمییە جووەکانەوە ڕادەستی پۆلیسی بەریتانیەکان کراوە.

3

ئەرێ ئێمە چۆن لەو ڕەوشەی ڕووبەڕوومان ببووەوە، هەنگاومان بنابایە؟ خۆ ئەوە ڕاستبوو، هێشتا ئێمە بە "پلەی سێهەم" ئاشنا نەبووین، بەڵام هەر "یەکەمین پلە"ش بەس بوو تا دەهریمان بکا. ئێمە دەمانزانی هەڤاڵەکانمان بەردەوام دەناڵێنن. ترسی ڕفاندنەکانیش لە ناخەوە ئێمەی هەژاند. تۆبڵێی تاکەی بەرگەی ئەو دڕندایەتییە بگرین؟
ژیان لە ژێرزەمیندا گۆشەگیری بەدواوەیە، گۆشەگیریش وات لێدەکا قووڵ بیربکەیتەوە. لەو ڕەوشەدا وات لێدێ شتگەلێک ببینی (رابمێنی) کە نەوەک بە شێوەیەکی ڕاگوزەریانە، بەڵکو بەگوێرەی دەستەواژە کلاسیکیەکە sub specie aeternitati (لەبن ڕامانی نەمرێتیدا)[٦٣] بێ. ئێمە لەو ڕۆژانەدا و بۆ چەند دادگایی کردنێک ئەو جۆرە ڕامانەمان پێویست بوو. ژێرزەمینە قووڵەکان لەو بارودۆخە تایبەتییەدا، ببوونە تاوەرێکی بەرزی چاودێریکردن. لەو کاتدا شتێکی جیاواز یان بابەتیانە نەبوو تا بتوانین لەگەڵ ئەواندا ئاڵوگۆڕی پێبکەین، ئەوانەی دەیانزانی، دەکرێ هۆلۆکۆستێکی دیکە لەنێو

---

[٦٣] لە شاکارەکەی سپینۆزا (١٦٣٢-١٦٧٧) فەیلەسووفی هۆلەندی بەڕەگەز جوو، تێیدا ئەم ڕستە لاتینیەی سەرەوەی بەکار هێناوە، بەگوێرەی ویکیپیدیا دەربڕینێکی شکۆمەندانەیە لە وێناکردنی گەردوون و نەمرێتیدا بەکار هێنراوە بێ ئەوەی پشت بە بیرۆکەیەکی واقعیانە ببەستێ. واتاکەشی ڕامانێکی جێگرەوانە و بابەتیانە دەگەیەنێ. وەرگێڕ.

جووەکانی ئیسرائیلدا ڕوویدا. حکومەتی ماندانت بەم ڕەوشە خەنی ببوو. خۆ ئەگەر پێکەنینیش بووایە، ئەوانەی نێو "بورجە چاودێرییەکانی ژێرزەمینی" نەدەگرتەوە، چونکە ئەوان دەیانبینی، بەدوای شەودا بەیانی دێت، بۆیە دەکرێ ئەوانیش لە کۆتاییدا پێکەنیبان...

هەڵبەتە ئێمە دەکرا یەکێ لەو چەند جێگرەوانەی لەبەردەستدا هەبوون، هەڵبژێرین. هەرە ئاسانەکەشیان قایلبوون بوو بە هۆشدارینامەی سەرکردەکانی ئاژانسی جووان و خۆبەدەستەوەدان بوو. ئاخر لێرەدا دوو جۆرە خۆبەدەستەوەدان هەن، هەروەک چۆن دوو جۆرە جەنگیش هەن. لێرەدا شەڕێکی ناڕەوا، شەڕێکی دەستدرێژیکەرانە هەیە، کە ئەوانەی هەڵیدەگیرسێنن مایەی شەرمەزارییە بۆیان. لە بەرامبەریشیدا شەڕی ڕەوا و ڕزگاری هەیە کە مایەی شەرەف و نامووسە بۆ ئەوانەی پێی هەڵدەستن. هەر دووکیشیان بە خوێنڕشتن و ژانوناسۆر دەورەدراون، بەڵام لە ئامانجدا جیاوازن، یەکیان مایەی شورەیی و ئابرووچوونە، ئەویدیکەشیان پیرۆزە. خۆبەدەستەوەدانیش هەمان ڕەفتارە. خۆبەدەستەوەدانی سیاسیی و گیانییەکەی بەدوای ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٤٦دا[٦٤] هات، بێناموسیی خۆبەدەستوەدەران بوو؛ کەچی خۆبەدەستەوەدانی دوا بەرگریکاری (هاگانا و ئیرگون) لە شارە دێرینەکەی ئۆرشەلیم و لە ١٩٤٨دا، مایەی عەیب و عار نەبوو. لەژێر ئەو دروشمە لاتینەدا "نەفرەت لە دۆڕاو" ڕاستییکی تاڵ هەیە، هەروەها لەژێر بارودۆخێکی دیاریکراویشدا ڕاستییکی تەوسداری هاوشان بۆ پێچەوانەکەی "نەفرەت لە براوە" هەیە. ژیان زنجیرەیەکی دووردرێژی یاخیبوون و خۆبەدەستەوەدانە، هەندێک جار وا ئاوێتەی یەکدی بوون، کەسێک ناتوانێ لێکیان بکاتەوە. پیاو، خۆبەدەستەوەدەری بڕوای خۆیەتی، ڕۆڵیش بۆ خواستی باوکی، تاکیش بۆ ڕێسا و قانونی کۆمەڵگە و دەوڵەت. ئەو "خۆبەدەستەوەدانانە' زۆرجاران دەبنە مایەی "یاخیبوونەکان" و هەر ئەو کار و کاردانەوەشن دەبنە خوێ بۆ تامی ژیان.

---

[٦٤] لەو ماوە کورتە ی بەشداریکردنی هاگانا لە یاخیبوونەکەدا، حکوومەتی بەریتانی پەلاماری ئاژانسی جووانی دا و ژمارەیەک سەرکردەی گرتن و لە گرتووخانەی لاترونی کردن. بنگۆریۆنیش هانای بۆ پاریس برد. ئەو لەهەوڵی خۆی بۆ خۆ نزیککردنەوە لە حکوومەتی بەریتانیا نەکەوت، لە بەرەنجامیشدا هاگانا لە یاخیبوونەکەدا کشایەوە.

ئێمە ڕەتمان کردەوە خۆمان بدەینە دەست مەرج و خواستی "دامەزراوەکان"، نەوەک لەبەر هیچ مەزندەیەکی قەڵبی شکۆداری و نەلەبەر هیچ ڕێزی خودپەسەندیش بوو. خۆ ئەگەر خۆشمان بەدەستەوەدابا هەستمان بە هیچ شەرم و شورەیەک نەدەکرد. لە دواییدا هەر ئەوەمان کرد، کە بۆ گەلەکەمان پێدەکرا. ئێمە ئاڵای یاخیبوونمان هەڵدابوو؛ ئێمە خۆمان لەبەرچاو نەبوو، ئازادی تاکەکەسیمان لەبەرچاو نەبوو، تەنانەت ژیانی تایبەتیانەشمان لەبەرچاو نەبوو. خۆ ئەگەر هێزێکی نیوخۆیی، چەندان جار لەسەر و سامان لە ئێمە گەورەتر و بەهێزتر، هەڕەشەی لەناوبردنمان لێبکا، ئاخر شەرمەزاری لە چیدایە کە خۆمانی بەدەستەوە بدەین؟ بە دڵنیاییەوە شتەکە دەچووە پاڵ "براوەکان."

لێ گەلۆ ئێمە وامان بینی، سەرلەبەری ڕەوشەکە شێوازێکی دیکەی هەیە. ئێمە شتەکەمان لەچاوی هەموو جوولایەتییەوە سەیر کرد. قڕپێهێنانی جووەکان لە ئەوروپادا لەوپەڕی کڵپەی خۆیدا بوو. دەروازەکانی ولاتی پیرۆزیش لەسەر هەر کڵۆڵێکی هەنوانخواز تەلبەند کرابوو. ئاخر لەوێدا کوا دەرفەتێکی سیاسیی، کە ڕەوایەتی بە وەستاندنی خەباتەکەمان بدا؟ خۆ ئەگەر بەئاستەم ملکەچی هەڕەشە و گورەشە و گەڕپێکردنەکانیان بووایەن، ئەو کات یاخیبوون وەک هۆکارێکی سیاسیی کۆتایی دەهات. بۆ ئەوانیش، دەربڕینەکەی (ویلکینیان) دەقۆستەوە کە "هیچ شتێک نەدەما خەمی لێ بخۆن." خۆ ئەگەر ئاژانسی جووەکان ملکەچی بەریتانییەکان بووبا و ئیرگونیش ملکەچی ئاژانەکە بووبا، ئەوا دەسەڵاتی کۆمسیاری باڵای بەریتانی بۆ هەمیشە هەر دەمایەوە.

داوای نێوەخۆش لە هەموو پرسەکە نابڕیاردەرانەتر نەبوو. من بە گوڵۆمبم گوتبوو، لە هەر ساتێکدا دەبێ خۆمان بۆ دیسیپلینەکەی بنگۆریۆن ئامادە بکەین، ئەگەر ئەو سەرکردایەتی ڕزگاری نەتەوەیی لە ئەستۆ بگرێ. ئەو کات چەند وشەیەکم لە ناخی دڵەوە گوتن. خۆ ئەگەر ژابۆنتسکی لە ژیاندا مابا، من وامگوت، ئەوا بێ هیچ سەر بۆدانەواندنێک داوای ئەوەم دەکرد، کە نووسینگەی باڵا بدرێتە ئەو. بەڵام هەنووکە ژابۆنسکی نەماوە. بۆ ئێمە گرنگ نەبوو کێ ڕابەرایەتی گەل بکا، گرنگ سەرکردایەتیەکەی بۆ ڕزگاری نیشتمانیی بسەلمێنێ. فەرمانەکانی بنگۆریۆن لە ئۆرشەلیم و دانانان بە کتێبی

سپی، شتێک بوو بە ئێمە هەڵنەدەستا. ئێمە بەخۆشییەوە بەدوای ڕێنماییەکانی بنگۆریۆن دەکەوتین، ئەو قسەیەی لە دیگانیاوە[٦٥] جاڕی یاخبوونی دژی ڕژێمی چەوسێنەردا. جاڕنامەکە ببوە مایەی پلاری گاڵتەپێکردنی ئاژانسی جووەکان. ئەو لادەرە ناقۆڵایانە -کاربەدستێک بەبن گوێی ئەوی دیکەی دەچرپاند- دەیانەوێ بنگۆریۆن بچێتە دیگانیا و شەڕ بکا. گاڵتەپێکردنەکە خۆی لەبەر بەریتانییەکان نەگرت. هێشتا ساڵێکی بەسەردا نەچوو، بەڕێز بنگۆریۆن لەگەڵ بەریتانییەکان کەوتە شەڕ و ئێمەش ڕێنمایەکانی ئەومان پەسند کردن. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو نەچوو بۆ دیگانیا، بەڵکو بۆ پاریس ڕۆیشت.

پرسەکە دەبێ بڕیاری شایستەی لێبدرێ. ناکرێ ئێمە نە لەگەڵ خودی خۆمان و نە لەگەڵ گەنجانی نەتەوەکەمان ڕاستگۆ نەبین. ئەرێ ئێمە چۆن ڕەوایەتی بدەینە شەڕوەستاندنمان؟ تۆبڵێی دەروازەکانی وڵات لەپڕێکەوە لەسەر ئاوارەکان و کۆچبەران کرابنەوە؟ ئایا ئێمە بەڵێنمان داوە برایەکانمان لە مەترسی قڕکردن لەو وڵاتانەی تووشی بوونە، ڕزگار بکەین؟ هەڵبەتە لەوێدا ئەو ڕەوایەتیە لە ئارادا نەبوو. ئەوپەڕی ڕاستی ئەوە بوو، بارودۆخە سیاسییەکە خوازیاری چڕکردنەوەی خەبات بوو، نەوەک وەستاندنی. خۆبەدەستەوەدان دووقات شەرمەزاری دەهێنێ: چاوپۆشین لەو قڕکردنەی ئەورووپا و کۆیلەبوون لە نیشتماندا. خۆ ئەگەر وامان کردبایە، گیانی یاخیبوون -باوکی سیاسەت و یاخیبوونی چەکداری- بەنێو هەوایەکی تەنکدا بە با دەڕۆیشت. نەخێر، ئێمە نەماندەتوانی هۆشدارینامەی ئاژانسەکە وەک خۆی بپەژرێنین.

هۆی دووهەمی ڕەتکردنەوەی هۆشدارینامەکە پەیوەست بوو بە هاوڕێیانی یاخیبوون، F.F.I (گرووپی ستێرن).

ئاخر ئێمە زۆریان لێ تووڕە بووین، چونکە هیچ ئاماژەیەکیان بۆ ئێمە سەبارەت بە ئەرکەکەی (بێت تسوزی) و (هاکیم) لە قاهیرە نەکردبوو، ئەو دوو لاوە ئازایەتییکی بێوێنەیان لە بەردەم دادگای میسریدا نواند و

---

[٦٥] دیگانیا یەکێ لە نشینگە هەرە کۆن و جوانەکانی ئیسرائیل بوو، دەکەوێتە گالیلیا لە باشووری دەریاچەی کینەرێت. لە گۆڕستانە دیمەن جوانەکەی نەوێ لەسەر لێواری ڕووباری ئوردنەوە، زۆر لە زایۆنستە پێشەنگەکانی لێ بەخاکسپێردرابوون، لەنێویشیاندا نا، دی. گۆردۆن سۆشیالیستە تۆلستۆییەکە، کە هەرخۆشی نشینگەکەی دامەزراندبوو، هەروەها گرینبێرگ هێرزلی زایۆنیست.

چاونەترسانە چوونە بەر پەتی سێدارە. لە کاتێکدا لەناوبردنی لۆرد مۆینە، یەکێ لە سەرکردە جێبەجێکارەکانی سیاسەتی بەریتانیا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، هۆکاری ئەو شەپۆلە ڕاوەدونانەی نێو وڵات نەبوو، بەڵام پریسکەکەی داگیرساند. سەرکردە فەرمییەکان تۆقین، ترس لە کولەکەی خۆی دەرچوو. هەڵمەتێکی بەسرتە —ڕێکخراو و ناڕێکخراو- خەڵکی وا ترساند گوایە کوشتوبڕێکی گشتی لە جووەکانی فەلەستین لە تۆڵەی کوشتنی وەزیرەکەدا دەکرێ. کەش و هەوای ترس و تیرۆر بە جۆرێک لە وڵاتدا پەرەی سەندبوو، دەبێ بیربخرێتەوە، کە بە شێوەیەکی بەرفراوان بەهۆی باری جەنگەوە لە جیهانی دەرەوە دابڕێندرا. ئیدی لەو بارودۆخەدا بە ئاسانی ئەو کەسانە ئیدانە دەکران، گوایە هەوڵیانداوە "کارەساتێک بەسەر نەتەوەدا بێنن."

هەروەها هاوڕێیانی یاخیبوون و هاوبەش لە مەترسییەکان، دەبوایە ئێمە لەلای سەرکردەی گروپی ستێرنەوە، پێشکات لە ڕووداوەکە ئاگادار کرابایەنەوە، بەڵام ئەوان لێگەڕان بۆ ئێمەش کردەوەکە بەتەواوی لەپڕو سەرسامانە بێ. لەگەڵ ئەوەشدا بڕیارماندا ئێمە لە ساتە دژوار و تەنگانەکاندا خۆمانیان لێ نەبان نەکەین. ئەوەش یەکێ بوو لە دوو هۆکارە لێبڕاونەکەی ڕەتکرەنەوەی خۆبەدەستەوەدان. هەر زووش ئاشکرابوو، خەمخۆرییەکەمان بۆ F.F.I نادروست بوو. پیاوەکانمان بەوە سەرسام بوون، چۆن ئەندامە کاراکانی F.F.I بێباکانە بە شەقامەکانی تەلئەبیبدا دەسوڕێنەوە. تەلیسمەکە دواتر، دوای پێکهاتنی یەکێتی بەرەی بەرگری ئاشکرابوو. پێمگوترا، لە نۆڤێمبەری ١٩٤٤دا، F.F.I بەڵێنی بە گۆلۆمب دابوو، کە ئۆپەراسیۆنەکانیان دژی بەریتانییەکان سڕ دەکەن، هەر بۆیەش بوو هاگانا لەو ماوەیەدا بەدوای ئەندامانی گروپەکەدا نەگەڕا. هەموو بارگرانیەکەی "وەرزەکە" ڕاستەوخۆ و بە تەنیا دژی ئیرگون بوو.

لەوێدا کردەی دووهەمیش دژی ئێمە هەبوو. دەکرا ئێمە هۆشدارینامەکە بە خۆپارێزێکی ئاقڵمەندییەوە پەسەند بکەین -یان بەزمانێکی سادە- بەو نیازەی ئێمە قسەی خۆمان بشکێنین. دەکرا چاوەڕێی ئەو زریانە بکەین کە تێبپەڕێ. ئەو جۆرە دۆزانەش لە مێژووی خەباتی ژێرزەمینییدا کەم نین. لێ گەلێ لەبەر تایبەتمەندی بنەمای مۆراڵ کە لە کۆبوونەوە چارەنووسسازەکەی

فەرماندەکاندا رابەری دەکرد، بابەتەکەش لەسەر ئەو هەڵمەتەی دژمان بوو، ئەو بیرۆکەیەی خۆبەدەستەوەدانە بە هیچ شێوەیەک لەلای هیچ ئەندامێکەوە هەر ئاماژەشی بۆ نەکرا.
ئەگەری سێهەم زۆر سادە و ساکار بوو: ڕەتدانەوە. حاشایی لێنەدەکرا، لەنێو ئێمەدا زۆر هەبوون فشاری ئەوەیان دەنواند، ئەم سیاسەتە پەیڕەو بکەین. ئەوان بەڵگەوبەندی ڕەوا، مۆراڵیی کردەییان دەهێنایەوە. شەڕی ژێرزەمینیی ڕێساو قانونی تایبەخۆی هەبوو، یەکێکیان ئەوە بوو، هەر زانیارییەخشێکی ناپاک دەبێ بە ژیانی خۆی باج بدا. ئەوەی هاوڕێیان مشتومڕیان لەسەر دەکرد، ئاخر مۆڕال لەچی دایە کاتێ ئێمە ئامادەبین ژیان لە پێناوی گەلەکەمان دابنێین و لە لایەن ناسیاوەکانیشمانەوە ڕاوەدوبنرێین بێ ئەوەی هیچ کاردانەوەیەکیشان بەرامبەر ئازاردەرەکانەوە هەبێ؟ دەبێ ئێمە لە پڕیکەوە بوبینە "تولستۆیی"؟
لەوەش زیاتر، گەر پەلاماردەرەکان بزانن کردەوەکانیان هیچ کاردانەوەیەکی بەدوادا نایە، ئەوا لەسەر ڕەفتارەکایان ڕشتتر دەبن.
ئەوە هەڵەیە گەر وا مەزەندە بکرێ، کە ڕۆڵەکانی ئێمە بیریان وا ڕۆیشتبێ گوایە گەنجەکانی هاگانا لە ئازایەتیان کەمە. بە پێچەوانەوە (سابرا)کانی[66] ئێمە دەیانزانی سابراکانی هاگانا چ نموونەیەکن. بەڵگەوبەندە کردەیەکانیان ئاماژە نەبوون بۆ پلەدارەکانی ڕیزەکانی هاگان بەڵکو بۆ سەرکردەکانیان.
ئەو بەڵگەوبەندانە، قورس و گران بوون، لەگەڵ هەر قوربانییێکی دەستی بەریتانییەکان دووباره دەبوونەوە. هەرگیزیش ئێمە رەتمان نەکردنەوە. لەو کۆبونەوەیەی پێشتر ئاماژەم پێدا، ئێمە هەرگیز جێگرەوە ئاسانەکانمان هەڵنەبژارد. ئێمە بڕیارماندا لەسەر لێدانەکانی خۆمان بەردەوام بین، کارێکمان کرد هەرگیز هیچ بزووتنەوەیەکی ژێرزەمینی وای نەکردبێ. بڕیارماند! خەباتەکەمان دژی دەسەڵاتی بەریتانی نە سڕ بکەین، نە بەڵێنی سڕکردنیشی بدەین؛ لە هەمان کاتیشدا مەیلمان لە کاردانەوە و تۆڵەکردنەوەی ڕفاندنەکان، ئیدانەکردن و ڕادەستکردنەوەی پیاوەکانمان نەبوو. ئەوسا چ لەسەر ئاستی تاک بێ یان ڕێکخراوەیی. ئەوەی جێی

[66] سابرا دەقاودەق واتای داری کاکتوس دەگەیەنێ. واژەکەش ناوێکە بۆ نەو جووانەی لە فلەستین لەدایک دەبن.

سەرسامیشە -کە ئێمە باس لە جەنگاوەرانی ئیرگون دەکەین- بڕیاری تۆڵە نەکردنەوە، کە تووشی هەموو گیانێکی سروشتی بەرگریکردن بووەوە، لە لایەن هەمووانەوە پیرۆزکرا. شتەکە وا پیرۆز کرا تا کۆتاییەکەشی بەردەوام بوو، تا ئەو کاتەی ڕاوەدونانەکان بەهۆی یەکێتی خەباتی بەرگری لەگەڵ هاگانا و F.F.I هەڵپەسێردرا.

پێویستە دان بەوەدابنرێ، ئەوانەی ئەو سیاسەتە "ئاڵۆزەیان" هێنا پێشەوە، نەدەکرا و نە دەشیان توانی بەڵگەوبەندێکی لۆجیکیانە پێشکەش بکەن. ئەوان بە دنەی باوەڕەوە، بە باوەڕێکی قووڵەوە ئەمەیان خستەڕوو، باوەڕیان بوو ڕۆژێک دادێ ئەو دووریەی نێوان هێزە ناکۆکەکان نامێنێ، بەڵکو شانبەشانی یەکدی دژی چەوسێنەر دەجەنگن. بەو هیوا و بەو بڕوایە، ئێمە گوتمان شتەکە شایستەیەتی مادام بەرگەی ژانوناسۆرەکەی دەگیرێ. ئێمە نەوێراین ئەو بڕوایە بەوە تێکبشکێنین، کە دەرگای دۆزەخێکی خوێناوی لەنێوان ئەوانەی هێشتا هەر بران دەکرێ هاوڕێی چەکی یەکدیش بن، بکەینەوە. دەمانبینی گەلەکەمان لە ئەوروپادا لەدوا قۆناغەکانی مەرگ دایە؛ ئێمە دەمانبینی چۆن گتێۆکان دەبوونە مەشخەڵی گڕ، ئێمە دەمابینی چەوسێنەر چۆن لە دژی هەموومان لە پیلانە. ئیدی لە ڕاڕەوی مێژووشدا، گوێمان لە سەدای جەنگەکانی دیکە بوو، گوێمان لە نەفرەتیی شەڕە کاولکارییەکەی شەهیدکردنی ئۆرشەلیمی نۆزدە سەدەی ڕابردوو بوو. خانەکانی ژێر زەمین تاوەری بەرزی چاودێری بوون. نەوەک لۆجیک بەڵکو دەنگی خۆماکی حەتمییانە بوو: "نەخێر؛ نا بۆ براکوژی. بەهەر نرخێک بێ نابێ بکرێ." ئەوانەی دەشیزانن: بەڵکو خۆماک بەتەواوی دڵی لۆجیک بێ.

ئەم ڕەوشە ترسناکە بۆ چەندان مانگ بەردەوام بوو. ئێمە دەمانگوت لەوێدا شەڕی نێوخۆ ڕوونادا، لە ڕاستیشدا هەموو وڵاتەکە تاک لایەنە بۆ شەڕی نێوخۆ دەکوڵا.

کاتێک ئەو ڕۆژانەم بیردەکەوێتەوە، هەموو خۆشەویستییێکی کانیاوی دڵی مرۆیانە، بۆ ئەو جەنگاوەرە گەنجە کۆڵنەدەر، نەترسانەی دۆخی ژێرزەمینی هەڵدەقوڵێ، کە بەهۆی گیانی بالای جەنگاوەرانەوە دەجووڵانەوە. ئەوان چوونە ئۆردوگا زۆرەملێکان، لەوێدا ڕەوانەی ژوورە تاریکەکان کران، برسی کران، لێیاندرا، بەد ڕەفتارییان لەگەڵدا کرا، کەچی هیچ یەکێکیان ئەو سۆزە

شکۆمەندییەی خۆیان نەشکاند، بەوەی نابێ کاردانەوەیان لە بەرامبەر ئەشکەنجەدەرە براکانیان هەبێ. من ئەوانم بەترسناکی دەبینی و خۆشم هاوهەست بووم. هەروەها گەورەییشم لە ئەواندا بینی، پێیانەوە شاناز بووم.
دیسیپلین؟ ئاخر دیسپلینی سەربازییانە، دیسپلین لە کردندا، لە بەرامبەر دیسپلینی نەکردندا (ناکارایی)دا چیی دەگەیەنی کاتێ هەموو گیانت بۆ تۆڵەکردنەوە و کاردانەوە هاوار دەکا. لێرەدا بار (سیستم)ی ئادەمیزاد بێ کەڵکە. "سیستم" لە شوێنێکەوە، لە قووڵایی مێژووی جوولەکایەتیەوەڕا دێ؛ دەبێ بەرفەرمانی بکرێ. ئێمە کارەساتمان لە کارەسات پاراست. بەر لەوەی چەند مانگێکیشی بەرسەدا بڕوا، هەموو گەل ئامێزی بۆ یاخیبوون کردەوە. ڕاوەدونەران و ڕاونراوانی دوێنێ، بەیەکەوە چوونە بەرەی جەنگ، جەنگێکی هاوبەش بۆ گەل و نیشتمانەکەمان..

## بەندی 11
## گۆبەندی "ئالتالێنا"

٢٤٧ - ٢٦٢

دوورخستنەوەی شەڕی ناوخۆ بە هەر نرخێک بێ، بنەمایەک بوو بۆ ساڕێژکردنەوەی برینەکانی لە "وەرزەکەدا" کە چەند ساڵێکیش دواتر لە ڕووداوی ئالتالێنادا تامی خوێن و ئاگرەکەیمان کرد.

ئیدی شاراوە نەبوو، ئەو کەشتیە پڕچەکە بەناوبانگە بووە دەسکەلای پلانێکی شەڕانگێزی. لە کاتێکدا بەڕێز بنگۆریۆن لەسەر مینبەری پەرلەمانی ئیسرائیلیدا، بەشێوەیەکی خاکییانە شانازی بەوە دەکرد، "من چەند پارچە لەناو ئەو کەشتیەیە دایە کە زۆر لێرەوە دوور نییە." لە لایەن یەکێ لە ئەندامانی ماپایەوە قسەکەی بەم پرسیارە پێبڕی: "بەڵام کێ بوو جەختی دەکردەوە، کە شتەکە بکا؟"

ڕێزدار بنگۆریۆن بێدەنگ بوو. لەوانەیە بێدەنگیەکەشی لە وشەکانی ڕەوانتر بێ. پەلاماردانی "ئالتالێنا" بەنهێنی و بە مەبەست ڕێکخرا بوو. بەلەمەکە بە ئاگر خاپوورکرا. دوکەڵی چڕی لێبەرزبووەوە هەڵیلوشی. ئێمە نەماندەتوانی ئاگرەکە بکوژێنینەوە؛ بەڵام بە دوای ڕەوانەوەی دوکەڵەکە دەگەڕاین.

ڕاستی تراژیدیاکە درەنگ هاتنی ئالتالێنا بوو. گەر هاتبا و باری سەرپشتی کەشتیەکە دەمودەست هەر دوای نەمانی دەسەڵاتی بەریتانی بگەیشتبایە کەنارەکانی ئێرتز ئیسرائیل، واتە لە نێوەڕاستی ئایاری ١٩٤٨دا، ئەوا سەرلەبەری بارودۆخی نەتەوەکە بە شێوەیەکی ڕادیکالیانە دەگۆڕا. ئیدی ئەو کات ئێمە بارەکەمان دەخستە بەردەستی حکوومەت و ئەو هەشت یان دە بەتالیۆنە سەربازە، بە هۆیەوە هەموویان پڕ چەک و تەقەمەنی دەکران، لەبری تەقەمەنییە خۆمانەییەکە و ئەوپەڕی ئامادەیی خۆبەختکردن و کورتهێنانەی تفەنگی ستێن.

لە یەکەمین هێرشماندا دەبوایە ڕامەڵلامان گرتبایە. ئەو شارە عەرەبییە لەسەر داوای هاگاناوە لە لایەن ئێرگونەوە ئابلۆقە درابوو، بۆ ئەوەی هێزەکانی دوژمن پاڵبنرێن و لەبەرەی (لاترن) دوور بخرێنەوە، لەو کاتەی

ئەوی خەریک بوو بکەوێ، ئێمە دەبوایە بکشابینەوە. ورەی ئاکنجیانی شارەکە دابەزیبوو، بەزۆریش لەبەر شێلکەی تۆپە سێ ئینجیەکانمان بوو. ڕۆڵەکانمان لە بەرەوپێشوەچووندا بوون و دەروازەی شارەکە و بەشێکی بەرفروانیشیان گرت، بەڵام کورتهێنانی چەک و تەقەمەنی ڕاستییکی کوشندە بوو. ئەوان پێویستیان هەر بە چەند سەد تفەنگ و تەقەمەنی زێدەوە هەبوو، لێ لە بەرەی ڕامەڵڵاوە ئەو چەندایەتییەی چەک نە بۆ ئێمە و نە بۆ فەرماندەیی هاگاناش بەردەست نەبوو. سێ سەد تفەنگ یان شەش لە سەدی لەسەر پشتی ئالتالێنا بارکرابوو...

گەر ئێمە ئەو کات ڕامەڵلامان گرتبایە، گرتنەکەشی تەنها بەو برە چەکە زێدەوە پەیوەست بوو، ئەوا هێزی یەکگرتوی جوو دەیانتوانی بەرەی عەرەب لە لاترن بشکێنن و ڕەوشی ستراتیژیشمان لە بنەڕەتەوە بگۆڕێ. باندۆرەکەشی لە ئۆرشەلیم و شارە دێرینەکە هەستپێدەکرا. بە کەوتنی ڕامەڵلا، چارەنووسی (لیدیا)ش ختم دەکرا. کەواتە ئێمە دەبوایە دوژمنمان لەبەرەی ناوەڕاستەوە (لەناوجەرگەوە) لە قۆناغی یەکەمی هێرشەکەوە تێکبشکاندبا، لەبری ئەوەی ئەو کارەمان دوای یەکەمین ئاگر بەستەکە کردبا. ئیدی هێزی یەکگرتوی جوو لە قۆناغی دووهەمدا دەستی کراوە دەبوو بۆ ئەوەی هێرشێکی هەمەلایەنی بکاتە سەر سێ گۆشەکە. بە کورتی، ئەمڕۆ ئێمە بەلای کەمییەوە دەستمان بەسەر کەناری ڕۆژئاوای ئوردندا دەگرت.

چارەنووس بە جۆرێکی دیکە دەشکێتەوە. کەشتی ئالتالێنا بە خۆی و نۆسەد سەرباز، پێنج هەزار تفەنگ، سیەروبەندی چوار ملیۆن فیشەک، سێ سەد تفەنگی بێرن، ١٥٠ ڕەشاش، چوار زرێپۆش، هەزاران بۆمبی هەوایی و باقی تفاقی دیکەی شەڕ، هەمووی ئامادەبوون بە دەریادا بێن، بەڵام نەوەک لە ناوەڕاستی ئایار بەڵکو لە دووهەمین هەفتەی حوزەیران. ئێمە لە ڕادیۆی لەندەنەوە یەکەمین بەڕێکەوتنی کەشتیەکەمان بیست کە لە بەندەرەی فەڕەنسییەوە دەرچوو. من هێدمە گرتمی. ئاخر ئەو ڕۆژانە ئاگربەست لە گۆڕێدابوو. بەهاتنی ئەم کەشتیە پڕچەکە، هەڵویستمان دەربارەی ئاگربەستەکە چی لێدەهات، من بۆ هاورێکانم ڕوونکردنەوە، ئێمە هی ئەوە نین ئەگەری بەرپرسیارێتی لێکەوتەی شکاندنی ئاگربەستەکە بگرینە ئەستۆ. ئاخر هەموو هێزی چەکداری جوولەکە ماندوو ببوون؛ دوژمنیش لە ڕووی

چەکەوە باڵادەست بوو. خۆ ئەوەش چیدیکە شەڕی سیاسی/پارتیزانانەی ژێرزەمینیی نییە. ئەمە شەڕی بەرەی کراوەیە. بەزین تیایدا لەوانەیە گەلەکەمان بەرەو لەناوبردن ببا. لە ئاکامدا بڕیارماندا سەرەتا کەشتیەکە لە ڕێکردن بوەستێنین. هەڵبەتە خۆ ئێمە بەتەواوی باوەڕیشمان بە ڕاپۆرتەکەی بی بی سی نەکرد. بەڵکو کەشتیەکە هێشتا ڕێگای دەریای نەگرتبێتە بەر، کێ ناڵێ بەریتانییەکان هەر لەبەرئەوە هەواڵەکەیان بڵاونەکردبێتەوە تا چاودێرانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بوروژێنن و ئاگاداریان بکەنەوە. ئەو ڕۆژە من برووسکەیەکم بۆ بنکەی سەرەکیمان لە پاریس لێدا: **"کەشتیەکە مەنێرن. چاوەڕێی ڕێنمایی بکەن."** ئەو کات بەرپرسیارێتی پاریس لە ئەستۆی شامۆئیل کاتزدا بوو، وەڵامی دامەوە، پەیامەکە بە ڕۆژێک دوای بەڕێکەوتنی کەشتیەکە گەیشتووە؛ ئەو چیدیکە پەیوەندی لەگەڵ کەشتیەکە نەمابوو. ئەو پێیگوتین، ڕاستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ کەشتیەکە بگرین.

یەکەمین پەیامی ڕادیۆیمان بۆ ئالتالێنا **"دوورکەوە، چاوەڕێی ڕێنمایی بکە!"** بوو. ئێمە نەماندەزانی ئاخۆ کەی کەشتیەکە پەیامەکەی پێدەگا. دواتر زانیمان، کاتێ هێشتا کەشتیەکە زۆر لە کەنارەکانمان دووربوو، دەزگا وەرگرەکانی تەنها بەیەک ئاراستەوە شتی وەردەگرت: ئەو پەیامەکەی وەرگرتبوو، بەڵام نەیدەتوانی وەڵام بنێرێتەوە. دەمودەست دوای ڕەوانەکردنی ئەم پەیامە، شەو درەنگانێک پەیوندیمان لەگەڵ وەزارەتی ئاسایشی ئیسرائیلییەوە کرد و وردەکاری کەشتیەکە و بارە چەک و تەقەمەنییەکەمان پێدان. هەنووکەش - ئێمە بە نوێنەرانی وەزارەتی ئاسایشمان گوت- ئەوە بۆ ئێوەیە بڕیار بدەن ئاخۆ کەی کەشتیەکە بێت یان ئاراستەکەی بگۆڕێ. پڕوپاگەندە فەرمییەکە لەپشت دوکەڵەکەوە خۆی شاردبووەوە، وایان نمایشکرد گوایە ئێرگون بۆ ئەوە ئالتالێنای هێناوە، تا یاخیبوونێکی چەکدارانە دژی حکوومەتی ئیسرائیلی هەڵگیرسێنێ.

بڕیارەکەی حکوومەت -یان وەزارەتی ئاسایش- ئەوە بوو بە زووترین کات کەشتییە پڕچەکەکەی ئێرگون بگاتە جێ. بڕیارەکەش لە ڕێی ئیسرائیل گالیلییەوە ڕۆژێک پاش کۆبوونەوە و باسوخواسی درەنگی شەو لە بنکەی سەرەکی ئێرگوندا، بەمنی ڕاگەیاند. ئێمەش پێی گەشاینەوە. ئاخر بەرپرسیارێتییەکە لەسەر شانی ئێمە هەڵسا. هەر چۆنێک بێ، حکوومەت

ڕەوشی خۆی و داخوازییەکان باشتر دەزانێ. دیاربوو بژاردەیەکی دیکەش نەمابۆوە. چەک و تەقەمەنیمان لە کورتەی دابوو. بەکردەوەش لە ڕووی تفەنگ، کورتمان هێنابوو، بەڵێ لە ڕووی تفەنگی ئاساییەوە، کە چەکی بنەڕەتی شەڕەکەمان بوو لە ئێرتز ئیسرائیلدا، هەروەها لە بارەی چەکی بەریتانی ٣٠٣ و گوللە و فیشەکیشەوە حاڵمان شڕبوو، هەر بۆیەشە بەشێکی زۆری هاگانا لە دەرەوەی بازنەی کردەوەکاندا بوون. هەموو ئەو داخوازییە مکوڕانەی سەر چەک بە هاتنی ئالتالینا پڕ دەکرانەوە.

هەرچی دەربارەی قەدەخەکراوەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانیش بوو، شتێکمان ڕێکخستبوو. خۆ لە دوای هەموو شتێکیشەوە حکوومەت بەمەی دەزانی. لەو بارودۆخەشدا پرسی مۆراڵ لەگۆڕێدا نەبوو. ئاخر کەس یارمەتی گەلە هێرش بۆکراوەکەی نەدەدا؛ ڕەوشەکە یەکێک بوو لەوانەی ژیان و مردن؛ ئێمەش شوکرانەبژێری خواوەند بووین، کە حکوومەت لە بارودۆخەکە گەیشتبوو، ئەوەی هەڵسەنگاندبوو کە پێویستە و باکیشی بەو شتە قەدەخەکراوانە نەبوو، کە بەسەرماندا سەپێندرابوون. ئیدی پەیامێکی کۆدەدار ڕەوانەی کەشتی ئالتالینا کرا، دواتر پێمان زانی پەیامەکە مایەی خۆشحاڵییەکی زۆر بوو. ئەوسا لە بری ئەوەی "دوورکەوە یان ئاراستەکەت بگۆڕە" پەیامە نوێیکە "**بەوپەڕی خێراییەوە**" وەرە.

دەبێ پێ لەسەر ئەو ڕاستیەدا دابگیرێ، لە خاڵی تەکانی بەرەوپێشەوەی لە مێژووی خەمبارانەی مێژووەوە ئەو دوکەڵە ڕەشە بەرزکرایەوە. حکوومەتی کاتیی دواتر لە کاتێکدا بڵاونامەیەکی دووڕوویانەی بڵاوکردەوە، گوایە ئیرگون هەوڵدەدا خۆی لە فەرمانەکانی ئاگربەسی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان نەبان بکا، حکوومەتیش بەڕەچاوکردنی قانونی نێو دەوڵەتی، ناچاربوو ئەو چەکانەی گەیشتبوونە ئێرتز ئیسرائیل، کە لەگەڵ ئاگربەستەکە ناکۆک بوون، لەناوببا.

من دەبێ وەڵامی ئەوە بدەمەوە: حکوومەتی کاتی هەر لەگەڵ دەریابڕینی کەشتیەکە و هاتنی بەرەو کەنارەکەمان و گەیشتنی بەدرەنگەوە، بە پرسەکەی دەزانی. خۆ ئەوە هەر حکوومەتیش بوو، بڕیاریدا کەشتی ئالتالینا لە میانەی ئاگربەستەکەدا بگەیەندرێتە جێ. خۆ ئەگەر وا نەبوایە، دەکرا کەشتیەکە نەیەت.

دوای ئەوەی حکوومەت فەرمانی دابەزاندنی بارەکەی بێ دواخستن دەرکرد، باسوخواسی دابەزاندنی چەکەکان و دابەشکردنی لەنێوان وەزارەتی ئاسایش و دەستەکەی ئێمە پەیدابوو. ئەوسا ئیرگون زڤای لیومی هێزێکی چەکدارییانەی ئاشکرا بوو، لە لایەن دامەزراوە فەرمییەکانیشەوە دانی پێدانرابوو. بەر لەجاڕدانی دەوڵەت، ئەنجوومەنی هەرە باڵای ڕێکخراوی زایۆنیزم، ئەو ڕێکەوتنەی هاوکارییە چەکدارانەی نێوان ئێمە و هاگانای پەسەند کردبوو. کاتێکیش سەربەخۆیی لە ١٤ی ئایاری ١٩٤٨دا جاڕدرا، ئەوسا دەمودەست فۆرمۆلەی پێکهاتەی یەکێتی سەربازیانە لە ئارادا نەبوو. هاگانا لەسەر هەبوونی خۆی بەردەوام بوو؛ ئیرگونیش کە سەربازەکانی لەبەرە جیاوازەکانی شەڕ و هەندێ کەرتدا دامەزرابوون، هاوشانی هاگانا دەجەنگان و ئەویش لەسەر هەبوونی خۆی بەردەوام بوو. ڕۆژنامەنووسی ناسراو د. ئازریل کارلیباخ، لەو کاتدا نامەیەکی کراوەی منی بڵاوکردەوە، لەوێدا هاتبوو هەنووکە توانیمان چۆک بە بەریتانییەکان دابدەین، ئیدی بەتاسە و پەرۆشەوە دەبێ کار بۆ لەشکری یەکگرتووی ئیسرائیل بکەین. چەند ڕۆژێکیش پێشتر، لە ڕادیۆکەماندا دامەزراندنی ئەو سووپا یەکگرتووەم دووپاتکردەوە، بەوەی جێگەی ئەو بارەی ڕێکخراوە میلیشیاییەکان بگرێتەوە. ئەوەش پەیوەست بوو بە حکوومەتەوە نەوەک بە ئێمە.

کاتێکیش دامەزراندنی سووپای یەکگرتوو ڕاگەیەندرا، ئێمە وەک ڕێکخراوێکی میلیشیایی دانپێدانراو بەردوام بووین تا چۆنیەتی خزانە نێو هێزی یەکگرتوو تەواو دەبێ. لە فەرمانە ئۆپەراسیۆنەکانی بەرەی هێڵی پێشەوەی فەرماندەیی هێزەکاندا، یەکەکانی ئیرگون وەک بەشێکی دانەبڕاوی هێزی سەربازیی دەبیندرا. لە ڕزگارکردنی یافاش، کە لەسەر خواستی ئێمەدا بوو؛ هێزەکان دابەش ببوونە سەر دوو کەرت، کەرتێکیان لە لایەن ئیرگونەوە بەڕێوە دەبردرا. سەرۆوەزیر، بەڕێز داود بنگۆریۆن، ڕۆژێکیان سەردانی یافا دەکا و یەکەکانی ئیرگونیش بەسەردەکاتەوە، کە چەکیان پێشکەش کردبوو. پێیان گوتم بەڕێز بنگۆریۆن کاتێک لەبۆنەکەدا دەڕۆیشت بەدەستەکەی گوتبوو: "نەمدەزانی کوڕگەلی وایان هەن."

پاشتر سەرۆوەزیر ئەم نامەیەی خوارەوەی بۆ هایم، ئەفسەری فەرماندەی هێزی ئێمە کە یافایان داگیر کرد، ناردبوو:

**دەوڵەتی ئیسرائیل**
**حکوومەتی کاتی**
**٢٢ نیسان، ١٩٤٨**
**بۆ فەرماندەی سەربازەکانی ئیرگون لە یافا. تا ڕێنمایی دادێ تۆ و هێزەکەت بە تەنیا فەرمانداری سووپای حکوومەتن لە یافا.**
**(واژۆ) دایڤید بنگۆریۆن**
**سەرۆکی حکوومەتی کاتیی و وەزیری ئاسایش**

ئێمە تێبینی ئەوەمان دایە یاریدەدەری جەنگی بەڕێز بنگۆریۆن، کە داب و نەریت وا نییە سەرووەزیر ڕاستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ ئەفسەرێکی خۆجێی ببەستێ. ئێمە سوپاسگوزار بووین ئەو دانپێدانانە فەرمییەی "سەربازەکانی ئیرگون زڤای لیومی لە یافا" بوون، بەڵام لە سۆنگەی پەرۆشی و دڵگەرمیمان بۆ دەوڵەتە ساواکەمان، ئارەزوومان بوو پێگەی سەرووەزیر کاری لەم جۆرە دووبارە نەکاتەوە.

بە کۆمەکی ئەو و هاوکارەکانی ئێمە لەسەر گفتوگۆی دروستکردنی سووپایەکی یەکگرتوو بەردەوام بووین. وردەکاری گفتوگۆکانیش لە شوێنێکی دیکە دایە. ئەوەی لێرەدا گرنگ بێ ئەوەیە، ئیرگون قایلبوو بەوەی تەواوی بەتالیۆنە چەکدارەکانی لەگەڵ ئەفسەرەکانیدا بخاتە نێو سووپای یەکگرتووەوە. بۆ ڕێکخستنەوەکەش هەندێ کاتی دەویست، بۆ ئەمەش هەر دوو لا قایلبوون دەستەیەکی کاتی بۆ ئیرگون زڤای لیومی دابندرێ و ڕەزامەندی سەرووەزیر و وەزیری ئاسایشی بۆ وەرگیرا. لەوکاتەش کە ئاتالینا گەیشتە کەنار، ئێمە تێکەڵکردنەوەی چەند بەتالیۆنێکمان لەنێو سووپای یەکگرتوودا ڕێکخستبوو. باقی یەکەکانی دیکەش خەریکی ڕێکخستنەوە بوون، پیاوەکانی ئەو یەکانە هێشتا لە یەکە بچووکەکانی بەرەکانی شەڕدا بوون. دەستەکەی ئێمە ئەو کات دەستەیەکی فەرمی دانپێدانراو بوو، هەر ئەو کاتیش بوو لە لایەن نوێنەرایەتی وەزارەتی ئاسایشەوە داوا کران بۆ باسکردنی دابەزاندنی بارە چەکەکەی کەشتیەکە.

ئێمە بڕیارماندا بەیەکەوە بچینە ئەو شوێنەی، کە باری کەشتیەکەی لێ دادەگیرێ. ئەوەش گۆڕانێک بوو لەو ڕێنماییانەی لە ئەپریلدا دابوومانە کاپتنی کەشتیەکە. ئالتالێنا چاوەڕێی پیاوەکانی خۆی دەکرد، چەک و پێداویستیەکان

چەند مانگێک بوو لەنێوان بەندەرەکانی ئەوڕوپا و کەناری باکووری ئەفریقادا بوو. کەشتیەکە لەسەر داخوازی کۆمیتەیەکی عیبری ڕزگاریخوازی نیشتمانی و کۆمەڵەی ئەمریکی بۆ فەلەستینێکی ئازاد و نیازمان وابوو لە کاتێکدا بیگەیەنین، کە هێشتا هێزەکانی بەریتانی بە پیاو چەکەکانیانەوە هەر دەسەڵاتدار بوون.

بۆیە لەو کاتدا بڕیارمان دابوو لە کەنارەکە لەنگەر بگرێ، چونکە (لە کۆتایی ١٩٤٧دا) هێزەکانی بەریتانی ناوچەی تەلئەبیب-پێتاه تیڤاهی وەک یەکەمین مۆڵگە چۆڵکردبوو. هەمان شوێنمان ئامادەکردبوو بۆ باردابەزاندن. ئەو وردەکاریە بۆ ئەوەیە لەنێو چڕەدووکەڵەکەدا تەمی هەموو شێواندێک بڕەوێتەوە.

شارەزای وەزارەتی ئاسایش پێشنیازی کرد، کەشتییەکە نابێ لە تەلئەبیب لەنگەر بگرێ، بەڵکو دەبێ بێتە گیڤات ئۆلگا یان کفر ڤیتکین لە نزیک ناتانیا، ئیدی بەم جۆرە دوور دەکەوێتەوە لەچاوی چاودێرانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان. شارەزایانی ئێمەش قایلبوون؛ بۆ ئەوانەی ئێمە گرنگ نەبوو لە چ خاڵێک بارەکە دابگیرێ. شتە گرنگەکە دابەزاندنی بارەکە بوو. ئێمەش گومانی هیچمان نەکرد، چونکە ئێمە پیلانگێڕ نەبووین، هەرگیز خەیاڵمان بۆ ئەوە نەدەچوو، نیازی دیکە لەبن بارداگرتنەکەدا هەبێ. بۆیە ئەو ڕۆژە پەیامێک بۆ ئاتالینا نێردرا: ئاراستەکەت بگۆڕە و ڕوو لە کفر ڤیتکین بکە.

دەمەتەقێکە ئەوسا لەسەر دابەشکردنی چەکەکان پەیدابوو. ئێمە پێشنیازمان وابوو پێنج یەکی چەکەکان بنێردرێتە ئۆرشەلیم و بگەیەندرێتە دەستی یەکەکانی ئیرگون زڤای لیومی لەوێ، باقیەکەی دیکەش بەسەر یەکەکانی سووپادا دابەش بکرێ، لەنێو بەتالیۆنەکانیشدا وەک چۆن گی ئیرگون هەیە هی ئەوانی دیکەش هەن. پێشنیازەکەی ئێمە دادپەروەرانە بوو. ئاخر هۆکاری ڕاستەقینەش بۆ ئەو مەبەستە هەبوو.

2

بۆ ئەوەی بایەخی گۆبەندی ئالتالینا بزانین، پێویستە بەکورتی ڕەوشی سەربازی ئەوێ دەمێ، کاتی گەیشتنی کەشتیەکە و بارودۆخی ڕاستەوخۆی پێشتریش باس بکەین. ئەو باسکردنە خۆی لە خۆیدا ڕوونکردنەوەی پێشنیازەکەی ئێمەشی سەبارەت بە دابەشکردنی چەکەکان تێدایە.

قۆناغەکە قۆناغی گواستنەوە بوو. ئۆرشەلیمیش یەکەیەکی دابڕاو بوو. هێشتا سەروەری دەوڵەتی ئیسرائیل نەگەیشتبووە پایەختەکەمان. سەرکردە فەرمییەکان، کە بڕیاری نەتەوە یەکگرتوەکانی دابەشکردنیان بەخۆڕەوە پەژراندبوو، خۆیان لە دانانی ڕەوشی ئۆرشەلیم بەوەی ببێتە ڕژێمێکی نێونەتەوەیی دوور خستبووەوە. ڕێزدار بنگۆریۆن لە کۆبوونەوەی بەڕێوبەرایەتی جێبەجێکاری هیستادروتدا داوای کردبوو، کە بزووتنەوەکەی هەموو هێزی دەسترۆیشتووی خۆی بەکارهێناوە تا ڕێ لە هەر گفتوگۆیەکی "داگیرکردنی ئۆرشەلیم" بگرێ یاخود سنووری دەوڵەتی ئیسرائیل فراوان بکرێ. لە ئاکامیشدا سووپای ئیسرائیل تەنانەت دوای پێکهاتنیشی لە ئۆرشەلیم دانەنرا و لە شوێنی دیکە کەوتە جموجۆڵ و چالاکی. لە ئۆرشەلیمدا هاگانا مایەوە کە بە داڤید شالتیل فەرمانداریەتی دەکرد، ئیرگون زڤای لیویمیش لەگەڵ هاگانا و F.F.Iدا هاوکاری شەڕەکە بوو. F.F.Iیش بەبێ هیچ ڕێکەوتنێکی فەرمی هاوکاری شەڕەکەی هاگانا بوو. ئۆرشەلیمی پەراوێزخراو و ئابلۆقەدراو بۆمباباران کرا، هاواری بۆ چەک لێ هەڵدەستا، بەتایبەتیش دوای کارەساتەکەی مەزاری پێغەمبەر دانیال، کە لەبەر چاوی بەریتانییەکان یەکەیەکی گەورەی هاگانا خۆیان دایە دەست عەرەبەکان و ژمارەیەکی زۆری چەکی جووەکانیش یان تێکشکێندرا یان کەوتە دەستی دوژمن.

هاوڕێکانی ئێمەش لە ئیرگوندا بۆ شەڕێکی کراوە چەکیان نەمابوو. ئەوانیش هاواریان لێهەڵسابوو: **چەک!** ئێمەش هاوارمان بۆ نوێنەرایەتی هەندەرانمان دەکرد: **چەکمان بگەیەننە دەست**. لەوێدا بارێکی ئاڵۆز هەبوو. بڕێک لەو بارە چەکەی کە (یۆل) ئامادەی کردبوو، بۆمانی ڕەوانە بکا، بەر لەوەی لە کەشتیەکەی بار بکا، ئاشکرا بوو. ئێمە بڕە چەکێکی دەستکردی خۆمانەمان ڕەوانەی ئۆرشەلیم کرد. لە ڕاستیدا ئێمە هیچمان نەمابوو هەڵیبگرین. گەر ئێمە ئەو بەشە هەرە گرنگەی ڕەشاشەکانمان یان گوللە و فیشەکمان ناردبا، کە لە هێزەکانی بەریتانیەکانمان گرتبوو، ئەوا دەبووە هێزقایمی بۆیان، بەڵام کتومتیش وا دەرنەچوو؛ ئەو کات نەماندەتوانی دەست بەسەر یافادا بگرین.

سەربازەکانمان لە پایتەختدا بڕێکی کەمیان چەک هەبوو، بەو بڕە کەمەش دەستکەوتی سەرسامهێنیان بەدەستهێنابوو، بەتایبەتیش کە بەدوای

نەخشـەکانی خۆیانـدا دەڕۆیشـتن. هەمـوو چـالاکییکی کـردەنیش دژی ڕژێمـی بەریتانی لە دەست فەرماندەیی باڵادا چڕببووەوە. لە شـەڕی دژی عەرەبیشـدا ئـێمە دەسـتی فەرمانـدەیی خـۆجێی حەیفـا و ئۆرشـەلیمان بە فراوانـی کردبووەوە. ئەم گۆڕانەش بۆ بارودۆخی شڵەژاو، ئاستەنگی پەیوەندییەکان و ڕێگا نەخۆشەکان، لێکەوتەیەکی حەتمییانە بوو.
کوڕەکـانی ئـێمە لە شـارە دێـرینەکەی ئۆرشـەلیمدا قارەمانـانە جەنگـان. ئەو یەکەی لەوێ بوو زۆر بچووک بوو: کەمتر لە سـەد پیاوی ئیرگون بـوو، هـی هاگانـاش لە دووسـەد کەس کەمتـر بـوون. چەکەکانیشـیان شـتێکی وانەبوو: چەند ڕەشاشێکی کەم، تفەنگ، تفەنگی ستێن؛ بڕێکی زۆر کەمیش لە فیشـەک. هێشـتاش ئەو بەرگرییەی لە شـارە دێـرینەکە کـرا، بەرامـبەر هێـزە عەرەبییە "نانیزیامیی" و قۆشـەنە لەشکری نیزامییـان، کە لەژێر سەرپەرشـتی ئەفسـەرە بەریتانییەکـان دەجەنگـان و پاڵپشـتێکی تانـک و تـۆپی قورسیشـیان هەبـوو، سەرسوڕهێنەرانە بوو.
شەڕەکە چەند هەفتەیەکی پێچوو. سەرەتا بەدڵێکحاڵیبوونێک لەنێوان هاگانا و ئێمەدا هەبوو. پەروەردەی قین تەنانەت لێرەشدا بەری خۆی دابوو. کوڕەکانی ئـێمە لەبـارەی بەشـە خۆراکەکەیـان جیاوازییـان لەگەڵـدا دەکـرا. لەگەڵ تێپەڕبـوونی کاتیشدا پەیوەندییەکان باشـتر دەبـوون. مەترسیە هاوبەشـەکەی سـەریان، کـارێکی وایکـرد دڵەکانیـان زیـاتر لەیەک نزیـک ببێـتەوە. ڕۆڵەکـانی هاگانـا تـا دەهـات لە جەنگاوەرەکانمـان نزیـک دەبـوونەوە، ئیـدی بۆیـان دەردەکەوت، کە کـوڕی ڕۆژی تەنگـانەن و ئەو شـتەیان لەدڵدا نییە وەک لە پڕوپاگەنـدەکانی دژیـان باسـدەکرا. لەوێـدا بەیەکەوە ڕاوێـژێ هەبـوو. بەیەکەوەش ئۆپەراسـیۆنەکانیان ئامـادەدەکرد. یەکـێ لە ئەفسـەرەکانمان خـولێکی تەقەمەنـی دانـانەوەی پێـدان، ئەمەش کـاریگەرییەکی باشـی لەسـەر ڕەوشی پارێزگاری لە گەڕەکی جووان و خاڵە بەرگریەکانی دیکەوە هەبوو.
بەر لە ١٤ی ئایـاردا توانیمـان گیـدۆن ئـاودیو کەیـن، گیـدۆن خوێنـدکارێکی کـارامەی بیرکـاری و یەکـێ لە ئەفسـەرە هەرە باشـەکانمان بـوو، توانیمـان بیگەیەنینە نێو شـارە دێرینەکە. (ئەوەش گیـدۆنی سـێهەم بـوو، ئـاخر ئـێمە ژمارەیەک گیدۆنمان هەبوون.) لەگەڵ گیدۆندا کە فەرماندەیی ئەوێی وەرگرت، ژمـارەیەک لە ئەفسـەرو پیـاوی دیکەمـان نـاردن، هەروەهـا بڕێکـی چەک و

تەقەمەنیش. لە ١٤ی ئایاردا هەموو پەیوەندییک لەنێوان شارە دێرین و نوێکەدا پچڕا. هەر دوو لا گەمارۆ دران.
گیدۆن وۆرکشۆپێکی لە شارە دێرینەکە بۆ نارجۆکی خۆمانە سازدا، ئەو بۆمبانەش بایەخێکی زۆریان لەبەرپەرچدانەوەی هێرش و پەلامارەکانی دوژمندا هەبوو. لەیەک بەیەکداداندا پیاوەکانی ئێمە هەڵمەتێکی خێرایان برد و شوێنێکی ستراتیژیان گرت: ئەویش کڵێسەی ئەرمەنی بوو، کە بەسەر گەڕەکی جووەکاندا زاڵ بوو. قەشەی کڵێساکە داوای کشانەوەی هێزە چەکدارەکەی ئێمەی لە ناوچەی کڵێساکە کرد، بەڵێنیشی دا، نابێ عەرەبەکانیش تخونی ئەوێ بکەون. گیدۆنیش فەرمانی دا لەو شوێنە هەستیارە و دژوارەدا بکشێنەوە کە گەڕەکەکە ستراتیژی بوو؛ ئەمەی بەدڵێکی گرانەوە کرد. لێ ئەو بەڵێنەی بە ناوی عەرەبیشەوە درابوو، نەبردرایە سەر. چەند سەعاتێک دوای ئەوەی پیاوەکانمان لەوێ کشانەوە، هێزی عەرەب پێیوەرکرد، لەوێشەوە ئاگری چەکیان رژاندە سەر گەڕەکی جووەکان.
ئیدی ئاکنچییەکانی گەڕەکەکە لە شارە دێرینەکەدا نامرادانە شپرزە بوون، بە تایبەتیش دوای هێرشە دژاورەکان. یەکێ لە رابییە خۆجێیەکان داوای خۆبەدەستەوەدانی کرد. داواکەی لە لایەن هەر دوو هێزەکەی هاگانا و ئیرگونەوە رەت کرایەوە. رەوشەکەش تا دەهات پۆلکتر دەبوو. لایەکی لە دانیشتووە مەدەنییەکان، لەنێوانیاندا زۆر ژن و منداڵ هەبوو، لەسەر راگرتنی شەڕە بێهودەییەکە سووربوون. لە دەرفەتێکدا کاتێک پالماخ[٦٧] هێڵێکی شکاند و کۆمەکی گەیاندە بەرگریکارەکان، هێشتاش بارودۆخەکە باشتر نەبوو. هێزە پشتیوانییەکە لە هەشتا ئەندامی میشمار هائام (پاسەوانی ماڵ) پێکهاتبوو، ئەوانیش هیچ بیرۆکەیەکی وایان سەبارەت بە بەکارهێنانی چەک نەبوو، بەدڵنیاییەوە نەبوونە مایەی ورەبەرزکردنەوە. لە رێگای (یرخیۆ)وە دوژمن لەسەر تەقەکردنی لە گەڕەکەی جوولەکەکان بەردەوام بوو. تا دەهاتیش ژمارەی کوژراو بریندارەکان پتر دەبوو. گیدۆنیش سوێندی خوارد، خۆی هاورێکانی تا دوا فیشەک شەڕ دەکەن. لە شارە دێرینەکەشدا خۆراک نەمابوو. ئاویش لە کورتەی دابوو. گوللەشیان لێبڕابوو. فەرمانەدەی یەکەی

---

[٦٧] جەنگاوەرە راهێنراوە تایبەتیمەکەی هاگانا.

هاگانا بریندار ببوو؛ گیدۆنیش زامدار ببوو. کوڕەکان چوونە شەڕ. کوڕانی دە دوازدە ساڵی نیشانیاندا چۆن ڕۆڵە جووەکان لە کاتی تەنگانەدا بەکارن. بتیاکانە لە ئاگری چەکی دوژمن، گوللە و فیشەکیان لەو خاڵ بۆ ئەو خاڵ دەگواستەوە. پێگەی بەرەنگاری تا دوا سات، کەلە شوێنی خۆیان بەردەوام بوو، مەتەریزی ئیرگون بوو لە نیسان بێگ. بەڵام خۆ ئەوان هیچیان پێنەمابوو شەڕی پێبکەن. زۆربەی بەرگریکارەکان کوژران و بریندار بوون. دەربازبووەکانیش شەکەت و هیلاک ببوون. ئیدی بەمجۆرە شاری داود، شارە دێرینەکە، کەوتە چنگی دوژمن. ماتەمێکی قووڵ باڵی بەسەر هەمووماندا کێشا.

هەوڵی ڕزگارکردنی شارە دێرینەکە لە دوای ئاگربەستەکەوە دەستپێکرایەوە. لێ لەبەر هۆیەک، گوایە بە دڵنیاییەوە لەنێو مەڵبەندی سیاسی جووەکان شارە دێرینەکە بە شوێنە پیرۆزەکانی پڕ گۆبەند داندرابوو، هەرچەندە فشاری زۆریش لە لایەن ئەفسەرەکانی ئیرگونەوە دەخرایە سەر بڕیاربەدەستان، کەچی هێرشکردنەکە تا دوا ڕۆژ پێش ئاگربەستی دووهەم وەخرێندرا. هەر چەند سەعاتێکی کەمی بۆ دووهەمین ئاگربەست مابوو، هەڵمەتێک بە چوار دەستە لە هاگانا، سێ لە ئیرگون و یەکێکش لە F.F.I فەرمانی دەستبەکاربوونیان پێدرا. یەکەکەی ئیرگون بەشداری شەڕێکی سەختی گرتنەوەی رامەللا لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئۆرشەلیم ببوو، زیانێکی زۆری لێکەوتبوو، هەژدە پیاوی لە دەست دابوو. کاتێکیش پێیان ڕاگەیەندرا، ئامانجەکە شارە دێرینەکەیە، هەموو ترس و خەمێکیان وەک بڵێی جادوویان لێکرابێ، ڕەویەوە. بەوپەڕی جۆش و خرۆشەوە بەرەوپێشەوە ڕۆیشتن. کەچی ئۆپەراسیۆنەکەش بە ماتەمباری کۆتایی پێهات. هاگانا و F.F.I لە بڕینی دیواری شارەکە شکستیان هێنا. یەکەی هاگاناش توانی دیوارەکە ببەزێنێ و لە دیوی ژوورەوە بنکە بکاتەوە و ڕێگاکەش بکاتەوە. لێ گەلۆ سەعاتی ئاگربەستەکە، کە سەعات پێنجی بەرەبەیان بوو، گەیشتبوو.

هەڵبەتە ئاگربەستەکەش لە زۆر بەرەدا لە لایەن دوژمنەوە چەند جارێک شکێندرابوو. لە هەمان ساتیشدا ئێمە دەبوایە ئۆرشەلیمان خستبایە بن چاوان. شارەکەی داود چاوەڕێی ڕزگابوونی دەکرد، بەبێ ئەویش نەدەتواندرا

ئاسایشی باقی ئۆرشەلیم بپارێزرێ، بەبێ ئۆرشەلیمیش نەدەکرا باس لە ئاسایشی دەوڵەتی ئیسرائیل بکرێ.
بەر لەوەی ئۆرشەلیم لە ئاپاردا بە تەواوی گەمارۆ بدرێ، پیاوەکانی ئێمە بە چەکێکی کەمیشەوە ژمارەیەک هەڵمەتی هێرشبەرانەی گرنگیان کردە سەر بنکە و بارەگاکانی دوژمن. لە ئۆرشەلیمدا وەک هەر شوێنێکی دیکە، ئێمە دەبوایە لە ڕەوشی بەرگرییەوە پەڕیباینەوە باری هێرشبردن. لە دەروازەی یافا و دەروازەی دیمەشقیشەوە چەند جارێک سەربازەکانمان توانیبوویان هێڵە بەرگرییەکانی دوژمن ببڕن و لەپشتەوە زەبری کوشندەیان لێبدەن و زیانێکی زۆریان پێبگەیەنن.
گوندە عەرەبنشینەکەی شافات، کە وەک بنکەیەکی پەلاماردەری کوشندەی لێهاتبوو بۆ سەر کاروانەکانمان، لە لایەن یەکەی هەڵمەتبەری ئیرگونەوە، کەوتە بەر شاڵاوێکی گرانی پەلاماردانەوە. لە ٩ی ئەپریلیشدا پیاوەکانمان لە گەڵ ئەوانەی F.F.I دا بەیەکەوە دەستیان بەسەر گوندی دێر یاسیندا گرت.
دێر یاسین، گوندێک بوو، نزیکەی دووهەزار پێ لەسەر ئاستی دەریاوە بەرز بوو، بنکەیەکی گرنگی زنجیرە پێگەی عەرەبەکان بوو، بۆ ئەوەی کەڵبەی خۆیان لە لای ڕۆژئاواوە لە ئۆرشەلیم گیر بکەن. لە دێر یاسینەوە هێزە عەرەبییەکان لە عەین کەرەم و بەیت لەحمەوە دەپەڕینەوە بۆ بەرەی قەڵاکە، لەوێشەوە پەلاماری کاروانی جووەکانیان دەدا. هەر ئەو تاکە ڕێگەیەش لە ئۆرشەلیمەوە بەرەو کەنار دەڕۆیشت. دوای گرتنی دێر یاسین -کە یەکەم گوندی عەرەبان بوو لە لایەن هێزێکی جووەوە دەگیرا- فەرماندەی هاگانا لە ئۆرشەلیم ڕایگەیاند گوایە گرتنی گوندەکە هیچ بایەخێکی سەربازی نییە بەڵکو ئەوەش بە پێچەوانەی نەخشەی گشتی بەرگریکردن بوو لە ئۆرشەلیم.
ئێمەش بەداخ بووین بۆ بەرپەرچدانەوەی قسەکەی بەرپرسی هاگان بە نامەکەی بەڕێز شالتیل وەڵامی بدەینەوە. ڕانان، فەرماندەی ئیرگون لە ئۆرشەلیم ئەو نامەیەی خوارەوەی لە فەرماندەی خۆجێی هاگانا پێگەیشتبوو، بۆ ئێمەی ڕەوانەکرد:
"من دەزانم ئێوە نەخشەی پەلاماردانی دێر یاسینتان هەیە. من دەمەوێ ئەو خاڵە ڕوون بکەمەوە، گرتنی دێریاسین و پاراستنی قوناخێکی نەخشە گشتیەکەی ئێمەیە. من هیچ لاریم لەو نەخشەیەتان بۆ گرتنی گوندەکە نییە،

بتوانن جێپێی لێ قایم بکەن. خۆ ئەگەر ئێوە توانیتان وا بکەن، من لە تەقاندنەوەی گوندەکە ئاگادرتان دەکەمەوە، کە لە ئاکامدا سەرنشینەکان چۆڵی دەکەن، ئیدی ئەو خانووە وێرانبووانەش دەبنە مۆڵگەی هێزی بێگانە. ئەمەش باروودۆخی گشتیمان قورستر دەکا. دووهەمینیشیان دەرهاویشتەی گرتنی شوێنەکە پەیوەستە بە قوربانییێکی گرانوگەست. لەوەش زیاتر، گەر هێزێکی بیانی بچێتە ئەوێ، ئەوا دەبێتە مایەی سەرئێشە بۆ نەخشەکەمان..."

کاتێکیش ئێمە نامەکەمان بڵاوکردەوە، سێ پنتەکەمان لە کۆتایی وشەی "نەخشە" بۆ زیادکرد. بەرژەوەندی نیشتمانی وای دەخواست، کە نابێ ناوەڕۆکی نەخشەکە ئاشکرا بکرێ. ئەمڕۆش ئەو سێ خاڵە شتێکی زیادەن. دەکرێ شتەکە ئاشکرا بکرێ، کە لە کۆتایی نامەکەدا سێ وشەی زۆر سەرنجڕاکێش هەبوون: "**بۆ دامەزراندنی فڕۆکەخانەیەک.**"ئەو فڕۆکەخانەیەش لە دێر یاسین دامەزرێندرا، لەو کاتیشدا وەک تاکە پردێکی پەیوەندی لە نێوان ئۆرشەلیم و کەنارەکەدا ڕۆڵی خۆی بینی. دووبارە خوێندنەوەی نامەکە بێ دوودڵی ئاکامێک بە دوای خۆیدا دەهێنێ. زمانی نامەکەش پڕبەپێستی داخوازییەکەی نەبوو. دواتر بەڕێز شاتیل لە ڕوونکردنەوە زارەکییەکەیدا، ڕاستیەکەی نەسەلماند. لێ گرتنی دێر یاسین دژ بە نەخشە گشتیەکەی بەرگریکردن لە ئۆرشەلیم نەبوو. بە پێچەوانەوە؛ "گرتنی دێر یاسین و دەستپێوەگرتنی قۆناخێکی نەخشە گشتییەکەمان." بوو. دێر یاسین بە زانیاری هاگانا و پەسەندنامەی فەرماندەکەیان گیرا.

بەدەر لە لایەنی سەربازییانە، لە چیرۆکی گرتنی دێریاسیندا لایەنێکی ڕەوشتیش هەیە. لەو گوندەدا، کە ناوی بە چوار کەناری دنیاییدا بڵاو بووەوە، هەر دوو لا زیانی زۆر قورسیان پێکەوت. لە ئێمە چوار کوژران و نزیکەی چل کەسیش بریندار بوون. ژمارەی زیانەکان بەگوێرەی ڕێژەی سەدی تێکڕای ژمارەی هێرشبەران چل لەسەد بوو. هێزە عەرەبییەکانیش سێ قاتی ئێمە زیانیان پێکەیشت. ئاخر شەڕەکە زۆر قورس بوو.

هێشتاش پڕوپاگەندی ناحەزانە بە دنیادا بڵاودەبێتەوە، بە ئەنقەستیش خۆیان لە ئاگادارکردنەوەی گوندنشینەکە نەبان دەکەن، کە بەر لە دەستپێکردنی شەڕەکەدا ئاگادارمان کردبوونەوە. یەکێک لە ترومبێلەکانمان بڵنگۆیەکی گەورەی لەسەر داندرابوو، لە دەروازەی گوندەکەدا وەستابوو، بە زمانی

عەرەبی داوای لە ئاکنجییەکان دەکرد ژن، منداڵ، پیر و پەککەوتەکان لە ماڵەکانیان دەربچن و بۆ خۆپارێزی پاڵبدەنە قەدپاڵی گردەکە. لە ڕێی ئاگاداکردنەوەی بڵندگۆیەکەدا، هێزەکانی ئێمە تۆخمی لە ناکاو بەسەردادانیان لە دەست خۆدا، بەمەش ئەو مەترسییەی بردنەوەی شەڕەکەیان بۆ خۆیان زیاتر کرد. ژمارەیەکی بەرچاوی دانیشتوانی گوندەکە گوێڕایەڵ بوون، خانووەکانیان چۆڵکرد و زیانیان پێنەکەوت. کەمێکیشیان لەبەر سەرلێشێوان خانووە بەردینەکانیان جێنەهێشت. ئاگری تەقەی دوژمن کوشندە بوو، ژمارەیەک لە برینداڕەکانمان گەواهیدەرێکی زیندوون. ئیدی پیاوەکانمان ناچارکران ماڵ بەماڵ شەڕ بکەن؛ تا بەسەر دوژمنەکەیاندا زاڵ بن کە لە خانووەکان نارنجۆکیان فڕێدەدا. ئەو مەدەنییانەی گوێیان بە ئاگادارکردنەوەی ئێمە نەدا، بێگومان خۆیان تووشی زیان کرد.

ئەو پەروەردەیەی ئێمە لە میانەی ساڵەکانی یاخیبووندا دابوومانە جەنگاوەرەکانمان، ڕەچاوکردنی قانونەکانی دابونەریتی جەنگ بوو. ئێمە هەرگیز ئەو ڕێسایانەمان نەشکاندووە، مەگەر دوژمن دەستپێشخەر بووبێ و ناچاری کردبین. من بڕوام بەوە هەیە، کە جەنگاوەر و ئەفسەرەکانمان خوازیاربوون خۆیان لە زیانپێگەیاندنی مەدەنییەکانی گوندی دێر یاسین تا پێیان بکرێ بە دووربگرن. بەڵام ئەوانەی بەردی ئیدانەکردن بگرنە داگیرکەرانی دێر یاسین[68]، ناشبێ عەبای دووڕوویی بە خۆیان دابدەن.

پەیوەست بە دەستبەسەرداگرتنی دێر یاسیندا، ئاژانسی جووەکان بەپێویستی زانی نامەیەکی پاکانە بۆ عەبدوڵلا، کە ئەو کات بەڕێز بنگۆریۆن بە جۆشێکی زۆرەوە، پێیدەگوت "ئەو دەسەڵاتدارە بەئاوەزەی کە چاکەی بۆگەل و وڵاتەکەی دەوێ"، بنێرێ. کرێگرتەکانی ئەو "دەسەڵاتدارە بە ئاوەزە" گوش ئیتزیۆنیان ڕووخاند و تەرمی پاڵەوانە بەرگریکارەکانیشیان وەک تەڵە فڕێدایە

---

[68] لە بەرامبەر لە دەستدانی گوندی دێر یاسین ی هەڵکەوتە ستراتیژیدا، بنکەی سەرەکی عەرەب لە ڕامەڵادا ڕووداوەکەی وەک چیرۆکێکی دڕندانە بڵاوکردەوە، گوایە هێزەکانی ئیرگون لە گوندەکەدا قەتڵوعامی ژن و منداڵەکانی ئەویان کردووە. کاربەدەستە فەرمییە جووەکانیش کە وەک ڕکابەرێکی سیاسی لە ئیرگون دەترسان، ئەو پڕوپاگەندە ناحەزانەی عەرەبەکانیان قۆستەوە و ئێمەیان پێ ناشیرین کرد. ڕابییەکی دیاریش بەر لەوەی ڕاستییەکانی بۆ دەرکەوێ هاتی سەرکۆنەکردنی ئێمەی دەدا. بەدەر لە لایەنە ئەهریمەنییەکە، شتی باشیشی بەداودا هات. ئەو پڕوپاگەندە عەرەبییە وەک ئەفسانەیەکی تیرۆر بەنێو عەرەب و هێزەکانیاندا بڵاوبووەوە، بەمەش هەر لەگەڵ ناوهێنانی چەکدارەکانی ئیرگوندا دەتۆقین. ئەفسانەکە بەقەدەر پێنج شەش بەتالیۆنی چەکداری ئیسرائیلی بەکار بوو. "کوشتارگەی دێر یاسین" هێشتاش وەک کاردانەوەیەکی ڕق لێبوونەوە لە جوو، لەسەرتاسەری دنیادا بەرکارە.

بەر باڵندەکان، بەخۆیشــی وەک فیـودالێ (دەرەبەگ)کـی لەخۆبـایی وەڵامـی نــامەکەی دایەوە. ئەو لێبوردننــامەکەی ڕەتکــردەوە و لە وەڵامــدا هەمــوو جووەکـانی بە بەرپرسـیار زانـی و بڕواشـی نەدەکـرد کە "هەڵـگەڕاوە" لەنـاو جووەکاندا هەبن. ئیدی لە نێو عەرەب و سەرتاسەری دنیاشدا پڕوپاگەنـدە سەبارەت بە کاری تێکدەرانەی جووەکان بڵاوکرایەوە.

پڕوپاگەندەی دوژمنان بۆ تەڵخکردنی ناوی ئێمە بوو. لە ئاکامیشدا کۆمەکیان پێکردین. ترس و تۆقین بەرۆکی عەرەبەکانی ئێرتز ئیسرائیلی گرتەوە. گوندی کۆلۆنیا، کە پێشتر بەرپەچی هەموو هێرشێکی هاگانای دابووەوە، لە ماوەی شـەو و ڕۆژێکدا هەر بەخۆیـان چۆڵیـان کـرد و بەبـێ شـەڕ کەوتە دەست. بەیتــول ئەقســاش بەم جــۆرە چــۆڵکرا. ئەو دوو شــوێنەش بەســەر ڕێگــا سەرەکییەکەیاندا دەڕوانی؛ کەوتنی هەر دوو شـوێنەکە هاوکـات لەگەڵ گرتنی قەڵایەکە لە لایەن هاگانــاوە، ڕێگـای ئۆرشــەلیمی کـردەوە. لە بــاقی وڵاتــدا، عەرەب لە تیــرۆر زەنــدەقی چووبــوو، تەنــانەت بەر لەوەی لەگەڵ هێــزە جووەکانیشدا بەیەکدابدەن، هەڵدەهاتن. نەوەک ئەوەی لە دێر یاسیندا قەوما، بەڵکـو ئەوەی لەبــارەیەوە هەڵبەســترا، ڕێخۆشــکەری ڕێگــای ســەرکەوتنە یەکلاکەرەوەکانمان بوو لە مەیدانی شەڕدا. ئەفسانەی دێر یاسین بەتایبەت لە پاراستنی تیبێریا و دەستبەسەرداگرتنی حەیفاشدا یارمەتی داین.

فەرماندەی هێزە بەریتانییەکـان لە کۆتـایی ئەپڕیلدا فەرمـانی کشـانەوەی لە حەیفــا دا. هاگانــا ڕۆژی کشــانەوەکەی دەزانــی، خــۆی بــۆ نەبەردێکــی یەکلاکەرەوە ئامـادەکردبوو. لەسـەر داوای هاگانا، یەکەکانی ئێرگونی باکوور کە (ئامیـل) فەرمانـدەیان بـوو، خـزانە نێـو شـەڕەکە و فەرمانیـان پێکـرا ئەو باڵەخانەی بەسەر شـەقامی هێهالوتز دەڕوانێت، کە بنکەیەکی گرنگی دوژمـن بوو، بگرن. پیاوەکانمان هێرشێکی کتوپڕ و تەڕدەستانەیان کردنە سـەریان و شوێنەکەیان گرت. لە لایەن ئاکنجیانی گەڕەکەکەش بەگەرمییەوە پێشـوازی لە چەکــدارەکانمان کــرا. ئەوســا بەرەو وادی نیســان ڕۆیشــتن، هەمــوو گەڕەکەکەیان گرت و بەردەوامیش بوون لەسـەر چوونەپێش لەگەڵ عەرەبـان. ئەوێ دەمــی هاگانــاش هێرشــی ســەرکەوتوانەی لە بەرەکــانی دیـکەی حەیفـا دەست پێکردبـوو. هەمـوو هێـزە جووەکـان بە شـێوەیەک لە بەرەی حەیفـاوە دەچوونە پێش وەک ئەوەی چەقۆیەک بێ بەناو کەرەدا بڕوا. عەرەبەکانیش

تۆقیبوون، زراویان چووبوو، هەڵدەهاتن و هەر هاواریشیان دەکرد: **"دێر ياسين، دێر ياسين!"**

ئێمە دەبێ بەیەک چاو، بەبێ گوێدانە هەوادارێتی یەکەکان، سەر بۆ سەربازە جووەکان دابنەوێنین، ئەوانەی بە ئازایەتییێکی بێوێنەوە دژی عەرەبە داگیرکەرەکان جەنگان. ئەوان هەموویان سەرکەوتنی مەزنیان بەدیهێنا. هەمووشیان تاڵاوی شکستیان خوارد. هەموویان بەدەست نەبوونی پێداویستیەکانی شەڕەوە دەیان ناڵاند. ئێمە هەرگیز گاڵتەمان بە کشانەوە و شکستی ئەوانی دیکە نەکردووە، بەڵام ئەوەی شتە نایاب و چیرۆکی ناڕاست سەبارەت "لە شێخ جەرەح بکشێنەوە؟ دەربارەی هاوڕێکانمان نەگوترابوو. لە هەموو شوێنێکیش کەموکورتی چەک و فیشەکمان هەبوو. هەموو ئەوەش بەشێکە لە پاشخانی ئەو گفتوگۆیانەی پەیوەندن بە دابەشکردنی چەکی سەر پشتی کەشتیەکەی ئاتالینا.

## بەندی 12
## کاتێ دڵ دەگرێ

٢٦٣ - ٢٧٨

مـن بە ئاسـانی لەوە تێـدەگەم، بـۆچی ئـێمە دەمانەویست بەشـێک لەو چەکە باشانە، کە ئێمە بە کەشتی ئاتالینا هێنابوومـان، بۆ یەکەکانمـان لە ئۆرشـەلیم بنێـردرێ و بـۆچیش یەکەکـانی ئـێمە لە نێـو سـووپادا بەشـەکەی خۆیـان بە دادپەروەرانە وەربگرن. دابێکی سروشتیە لەنێو هەر سـووپایەکدا، فەرمانـدەی هەر یەکەیەکـی گەورە خەمـی کەرەسـتە و تفـاقی پێویسـت بخـوا. سـووپاکەی ئـێمەش لە نـاوجەرگەی شـەڕدا لەدایـک بـوو. ڕێکخسـتن و بـاری ورە و دەروونی یەکەکان پرسێکی دابونەریت نەبوون، بەڵکو پرسی نیازپاکیی بـوون. ئاخر کارێکی ئاسان نەبوو هەڤاڵەکانت بنێریە نێو سـووپایەک، تـا دوێنـێ بـوو ئەفسـەرەکانی قینیـان لە ژێرزەمینییەکـان دەبـووەوە، ڕاوەدویـان دەنـان، جنێویـان پێـدەدان، ئەنـدامەکانیان دەڕفانـدن و ڕادەسـتی ئەفسـەرەکانیان دەکردنەوە. تەنها چەند مـانگێکی کەم بەر لە دامەزراندنی دەوڵەت، شـەپۆلێکی نـوێی سـادیزمی ڕێکخـراو لە نێـو بەشـێکی هاگانـا سـەریهەڵدابوو، لەژێـر ڕێنمـایی سـەرکردە فەرمیـیە جووەکـان دەسـتبەکاربوون، بە سەرتاسـەری وڵاتـیش وەربـبوون. لەوێـدا خـوێن ڕژا. جـوامێرییێکی مەزنـی گیـان و ورە، ڕاددەیەکـی بەرزی قەناعەتپێهێنـان پێویسـتبوو، بـۆ ئەوەی، ئەوەی ڕابـردوو ڕوویـدا، هەمـووی لەپێنـاو ئەو گەلە کڵـۆڵەدا لەبیـر بکـرێ. هەزاران لە کورەکانمـان چـوونە ڕیـزی سـووپا، چـوونە بەرەکـانی پێشـەوەی شـەڕ و جەنگان. ئاخر ئەوان لە کوێ نەدەبیندران؟ ئەوان لە نەقەب بوون، مل بە ملی هاوڕێکانیـان (ڕاوەدونەرانـی دوێنـێ)، لاپەڕەی هەرە گەشـیان لە جەنگـی بەرگریـانەی جـوولەکەدا تۆمـارکرد. ئەوان بە فەرمانـدەیی (گیـل) و سـروودەکەی ئیرگونیـان دەگوتەوە "لە ئاسـتەنگەکاندا". ئەوان ناوچەکەیـان لە دەسـت میسـرییەکان سـتاندەوە و ڕێگـای بیـر سـەبعەیان کـردەوە، ئەمەش خاڵێکی ستراتیژی هەرە گرنگ بـوو. لە باشـوور نـاوچەی یـاڤینی، تارشیها لە جەلیل و ڕووبەرێکی بەرفراوانیشیان لە شـاخەکانی ئیفرایمدا گرت. ئەوان لە

بەرەکـانی پێشـــەوەدا خزمەتیـان کـرد، گیـانی خۆیـان لەپێنـاو سەربەسـتی وڵاتەکەیاندا دانـا، ئەوان بەهەق رزگاکەربوون لە دەسـەڵاتی بێگـانە و بەهەق جەنگاوەرانی ئیرگـون بـوون. لەگەڵ ئەوەشـدا حاشـا لەوەنـاکرێ، کە دڵیـان لە ئـازار و مەراق پـڕ بـوو. ئەوان ئیرگونیـان خۆشدەویسـت. هەمـوو شـتێکیان لەپێنـاو دانـا. ئیرگـونیش هەمـوو شـتێکی دانـێ. ئەوان لە ڕیـزی ئیرگونـدا بـۆ چەنـدان سـاڵ جەنگـان. بەئـاڵای سـەرکەوتنەوە لە شـەڕ و دژواریـدا، لە ئۆردوگـای زۆرەملێـی و چـاوە زینـدانی ئەشـکەنجەدان و مەرگـدا هەر بەرەوپێشـەوە دەڕۆیشـتن. ئیرگـون چیـدیکە وەک ڕێکخراوێکـی میلیشـیایی نەمابۆوە، بەڵکو ببووە ڕێڕەوی ژیانیان.
من دوا ئامادەکاری ئەفسەرەکانم لە بیرە. لە هۆڵەکەدا سەدان جەنگاوەری بە ئەزموون و دێرینی لێبوون. لە زۆر باردا یەکەم جار بوو دەموچاوی یەکدی ببینین. ئەرێ کاتێک بۆ خۆشـی و جەفەنگ؟ بە دڵنیاییەوە وابوو. ئەدی ئێمە لەبـاری ژێـر زەمینیـیەوە نەهـاتینە دەر؟ ئایـا ئـێمە بەچـاوی خۆمـان سـەرکەوتنمان نەبینـی؟ لـێ بـۆنەکە زۆر خەمبـارانە بـوو. بە ئەفسـەرە خۆشەویستەکانم گوت، لەمەودوا من فەرماندەیان نیم. ئەفسـەرەکانی دیکە، ئەوانەی سووپای جوولەکە دەبنە فەرماندەیان. دەبێ بۆ ئەوانیش ئەوپەڕی ڕێـز و هاوکـاری و فەرمـانبەرداری بنـوێنن. ئیرگـون زڤـای لیـومی وازی لەوەهێنا کە هێزێکی سەربازییانە بێ. ئیدی هۆڵەکە کش و مات بوو. من و پاڵەوانـانی جەنـگ، پیـاوە ئاسـنینەکان، ئەوانەی بەچـاوی خۆیـان مەرگیـان بینیبوو، ڕووبەڕووی مردن ببوونەوە، بینیم فرمێسکیان لەچاو دەهاتنە خوار. "فەرمانە کۆنەکە گۆڕا، هی نوێ جێگەی دەگرێتەوە". سەرلەبەری دنیا، دنیای نەمـری و دنیـای نمـوونەیی پـاکوبێگەرد، هاوڕێیـایەتی و دڵسـۆزی، دنیـای جوامێری و بەرزیی، بەسەرچوو، لەوانەیە هەرگیز نەشیبینینەوە. بە ڕاستیش هەر ئەوەی شـایان بـوو. هەمـوو شـتێکی شایسـتە بـوو. ئـێمە بردمـانەوە. نەتەوەکەمان دیسان هەڵسایەوە، بەلام ئیرگون... تۆبڵێی کێ ڕابەڕایەتی بکا؟
لەوێدا مەراقیکی زۆر هەبـوو، هـی ئەوە نەبوو نکولی لێبکرێ. ئەو پیـاوانەی خەریـک بـوون لە نێـو سـووپادا ببـنە فەرمانـدەی پیاوەکـان، دەمێـک بـوو سیستماتیکیانە لەسەر ڕق لێبونەوەیان لێراهێنرابوون. نەخێر، شتەکە ئاسـان نەبوو. لەوێدا چیدیکە فەرمانەکان نەیاندەخوارد. ئەوەی ئێمە پێویسـتمان بـوو

بڕواپێهێنانێکی باش بوو، بۆ ئەوەی برینەکان، کە هەندێکیان هێشتا هەر کراوەبوون، سارێژ بکرێنەوە. ئەوە مافێکی خۆمان بوو، بەڵام ئەرکیشمان بوو بزانین ئاخۆ ڕۆڵەکانمان لە نێو سووپا و لە بەرەکاندا چۆن ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکرێ، ئاخۆ چەک و پێداویستیەکانیان وەک هاوچەکەکانیان بۆ دابیندەکرێ، تاکو هەست بە پشتگیری و متمانە بەخۆکردن بکەن. وەک گوتم لەبارودۆخی ئاساییشدا ئەم خەم و مشورخواردنە شتێکی سروشتی و ڕەوایە. بە گشتی وابوو، بەڵام لەباری تایبەت، هەر زۆریش تایبەت وەک دامەزراندنی سووپا، ئیدی گرنگتر. ئەوەی ئێمە لە سەردەمی تفەنگی ستێن دەماننالاند، ئەگەری ئەوە هەبوو ئەم نالاندنە لە باری سەرهەڵدانی سووپادا نەمێنی و چەکی شیاو بدرێتە جەنگاوەران، بە تایبەتیش کە قسە لەسەر گەیشتنی کەشتییە پڕ چەکەکەی ئالتالێنا دەکرا. ئێمە داوای بارەکەمان نەکرد بۆ خۆمان بێ، هەروەک دەگوترا گوایە "یاخیبووە چەکدارەکان" داوای دەکەن. ئاخر چییدیکە "ئێمە خۆمان" نەمابۆوە تا داوای بۆ بکرێ. ئیرگون -بەدەر لە ئۆرشەلیم- هەموو شتێکی ڕادەستی هێزی سەربازی کردبووەوە. پیاوەکانمان لەنێو سووپادا بوون، ئەوان مل بە ملی هاوچەکەنیان لە بەرەکانی شەڕدا دەجەنگان، لە کاتێکدا چاوەڕوانی ئەوە بوون ڕێکخراوەکەشیان بچێتەوە نێو سووپا. هەموو لە ژێر فەرماندەیی سووپاسالاری سووپادا بوون. هەموو ئەوەی داوام دەکرد، بەشێک لەباری سەرپشتی کەشتییەکە، کە هەر ئێمە هێنابوومانە وڵات، بدرێتە جەنگاوەرانی ئیرگون لە بەرەکانی پێشەوە تا شەڕی پێبکەن.

ئیسرائیل گالیلی، فەرماندەی هاگانا و لە هەمان کاتیشدا جێگری وەزیری ئاسایش بە تەلەفۆن ئاگاداری کردمەوە، وەزارەت بە پڕۆژەکەی ئێمە دەربارەی ئۆرشەلیم، قایلە. بیست لە سەدی باری چەکەکانی سەر پشتی ئالتالێنا بۆ بەرەی ئەوێ تەرخان بکرێ. ئێمە دڵخۆش بووین، هەوڵمان نەدا سەرنجی وشە بە وشەی ڕاگەیەندنامەکەی بدەین. تەنها دوایی، زۆریش پاشتر، لە مەبەستی پشتەوەی "ڕێکەوتنامەکە" گەیشتین. ڕێژەی بیست لەسەدەی بارەکە بە تەنیا بۆ هێزەکانی هاگانا بنێردرێتە ئۆرشەلیم.

ئێمە بۆ ماوەیەک لەگفتوگۆکانی خۆمان سەبارەت بە پرسی دابەشکردنی باری چەکەکان بەردەوام بووین. لەیەکێک لە گفتوگۆ درێژەکانماندا پێمگوت:

"خۆ ئەگەر وەک نەخشەمان بۆ کێشابوو، کەشتیەکە چەند هەفتەیەک پێشتر گەیشتبا، ئێمە لە ئیرگوندا هەموو چەکەکەمان دەبرد. ئایا ئێوە قایل نابن، کورانی ئێمە لەنێو سووپادا پڕ چەک بکرێن؟ ئەدی هەر بەخۆتان داواتان نەکرد ئەو چەک و تفاقەی لای ڕێکخراوی ئیرگون هەیە، بدرێتە ئەو جەنگاوەرانەی دەچنە ریزی سووپا و بەرەکانی جەنگ. ئەرێ هەنووکە چ شتێکی جیاواز هاتوتە گۆڕێ؟ ئەو بارە چەکە دیاریکراوە درەنگوەخت گەیشت. دەمێکیشە کورەکانمان لەنێو سووپادان، یان وا خەریکە دەچنە ریز. پرسەکە هەر پرسی چەند ڕۆژێکی کەمە. ئەوەش هەر واتای ئەوە دەگەیەنێ ئێمە پڕ چەکیان بکەین. ئایا چ شاشیەک لەمەدا هەیە؟ باشە بۆچی ئێوە قایل نابن؟"

بەڵگە و بەندەکانمان بە فیڕۆ ڕۆیشتن. پرۆژەکانمان رەتکرانەوە. شەو و ڕۆژیش خێرا تێدەپەڕین. لە کاتێکدا ئالتالێناش بەگوێرەی ڕێنماییەکانی حکوومەتی کاتی، ڕێگەی دەریای بەرەو کەناری کفر ڤیکتین لە ئێرتز ئیسرائیلدا تەیدەکرد. ئێمە لەسەر دەمەتەقێی نەخشەکان دەربارەی باردابەزاندن لەگەڵ نوێنەری وەزارەتی ئاسایش بەردەوام بووین.

ئەوسا گالیلی پێیراگەیاندم، گەر سەبارەت بەدابەشکردنی چەکەکان نەگەینە ئەنجام، ئێمە هاوکار نابین لە دابەزاندنی بارەکەدا. "ئێمە دەست لە داگرتنی باری سەر پشتی کەشتیەکە دەشۆین." ئەو وای ڕاگەیاند.

ئەم ڕاگەیاندنامەیە لە گۆبەندی ئالتالێندا خاڵی وەرچەرخان بوو.

حکوومەت لەگەڵماندا سەبارەت بە ڕێکخستنی هاوبەش بۆ دابەزاندنی چەکەکان و دابەشکردنیان لە دانوستاندا بوو. ئەوان تەنانەت پرۆژە ماقووڵەکەشمانیان رەتکردەوە. هەر هیچ نەبێ ئەوان بە فەرمی، بەو شێوەیە لەسەر هەق بوون. دەکرا حکوومەت بڵێ: "ئێمە لێناگەڕێین ئیرگون بارەکە داگرێ." دەکرا بە ئێمەش بڵێن: "لەو بارودۆخەدا ئێمە هێنانی کەشتی بۆ کەنارەکانی وڵات قەدەخە دەکەین."ئاخر هەر لەو کاتەی کەشتیەکە کەوتە ڕێگا، ئێمە بارەکە و پرۆژەکەمان خستە بەردەستی حکوومەت.

ئەمەش هەموو ڕاستیەکە بوو. بەڵا خۆ هەر دەبێ هەندێ تاکی گێرەشێوێن، ئەوانەی دەیانەویست گومان بخەنە سەر ڕاستی ئەم ڕاگەیاندنامەیە، لە دژی بەڵگەوبەندەکان قین لە دڵی و پەرگیری خۆیان بسەلمێنن.

کەشتیەکەش لەگەڵ وەزارەتی ئاسایش کۆک بوو، لەبەر ئەمە لە ئیڤات ئۆلگا یاخود کفر ڤیتکین لەنگەری گرت. ئایا دەکرا ئێمەش گەر حکوومەت وایگوتبا لە تەلئەبیبەوە بگەیشتبایینە شوێنی لەنگەرگرتنەکە؟ هەر چۆنێک بێ ئەو رێ لاوەکیە تەسکەی دەگەیشتەوە سەر رێی سەرەکی حەیفا- تەلئەبیب، لەوێشەوە بۆ گوندی ماپای ئەوەندە بەربەستەی خرابووە بەردەم، ترومبێل و باربەرەکانمان بە هیچ شێوەیەک نەیاندەتوانی لە خاڵی لەنگەرگرتنەکە نزیک ببنەوە. لە سەرێکی دیکەشەوە، ئەگەر واشمان دانابا، پەرجووئاسا و هەر بەگریمانە و بەو بارودۆخە گەیشتباینە لای کەشتیەکە، ئایا بە مێشکی کەسدا دەهات، لەو بارەوە بەو رێگا تەنگەبەرەدا بۆ کەنارێکی چۆڵ و لاپەڕگەدا بڕوا، بێ هیچ ئامێر و کەرەستەیەک، بێ هیچ پێداویستیەک تەنانەت بەبێ ئاویش! ئەهریمەن ئاسا لەوانەیە هەبن ئارەزوومەند بن گومان بخەنە سەر ئەوەی دەیڵێین: بەڵام خۆ ناکرێ حاشایی لەوە بکرێ، کە ئیرگون بە هەندێ تاکتیک و ستراتیژەوە بەڵەد بوو. هێشتاش ئەوان هەر ئەوەیان لە خەڵکەکە دەپرسی بۆ ئەوەی بڕوامان پێبکەن: بەوەی گوایە ئیرگون بە تەمایە یاخیبوونێکی چەکدارانە لەوێدا بەرپا بکا، مەبەست هەر لەوێ لە کفر ڤیکتین، لەنگەرگای کەشتیەکەیە، لەو شوێنەی پیاوەکانمان بەتەواوی لەجیهانی دەرەوە دابڕابوون، تەنانەت گەر ئەوان بەبێ ڕەزامەندی سووپاش خۆیان گەیاندبێتە ئەوێ.

ئاشکرا و ڕوون بوو بڵاونامەکەی ئێمە نەیارانە نەبوو. هەڵبەت ئەوە دووبارە دەکەمەوە، گەر هاتبا و حکوومەت کە پێی وابوو ئێمە وادەکەین، تەنها یەک وشەی پێگوتباین، ئەوا ئێمە هەرگیز بەو جۆرە نابەدڵیی و بەرهەڵستییە تخوونی دابەزاندنی باری سەر پشتی کەشتیەکە نەدەکەوتین، بەڵام "کەسێک لەبن گوێی کەسێکی خوێندبوو کە شتێکی زیرەکانە بکا" و حکوومەتیش وشیارانە وشەکەی لە دەم دەرنەچوو. حکوومەت گوتی: "ئێمە لە دابەزینی چەکەکاندا کۆمەکتان ناکەین." "ئێمە یارمەتیتان نادەین." لەوە زیاتر نا.

هاوکاری ڕەتکردنەوەی حکوومەت لە دابەزاندنی بارەکەدا، زەبرێکی کوشندە بوو پێمان کەوت. ئێمە نە توانای ڕووناک کردنەوەی ئەوێ، نە باربەر نە کەلوپەلی پێویستی داگرتنمان هەبوو. تەنانەت ئەو ژمارەیەی کە لە دواییدا بۆ ئەو مەبەستە خۆیان گەیاندبووە ئەوێ، بایی پێویست نەبوون و

مەبەستەکەیان پێبەدی نەدەهات. لەوێ لەسەر کەشتیەکەدا ئێمە لە لایەن ژمارەیەک لە پیاوانی پالماخ یارمەتی دراین. ئەمڕۆ من هیچ لەوە دوودڵ نیم بڵێم ناردنی ئەو کەسانەش بۆ سیخوڕیتی کردن بووە بەسەرمانەوە. ئەوێ دەمێ ئێمە بەخۆشی و پێزانینەوە یارمەتیەکەی ئەوانمان پەژراندبوو. بێئەوەی هیچ گومانێکیشمان هەبێ. ئاخر بۆچی گومانمان هەبێ؟
وێڕای هەموو زەحمەتیەکانیش ئێمە بەدڵەوە قۆڵمان لێهەڵماڵی. ڕاستە، حکوومەت گوتبووی، یارمەتیتان نادەین، بەڵام لەژێر ئەو پێویستیە زۆرە بۆچەک و تفاقەکە شتێکی لۆژیکی بوو، بیروڕاکەیان بگۆڕن. لەوەش زیاتر، خۆ ئەوە بە تەنیا تاکە ئەرکێکی سەخت نەبوو، هەر بەخۆمان ڕاییپەڕێنین. کارەکە بە تاسەوە جێبەجێدەکرا. تا دەهات ورە بەرزتر دەبوو، ئیدی کوڕەکان قۆڵی مەردانەیان لێ هەڵماڵیبوو، هێزی بازوویان دوو هێندە لێکردبوو. بار دابەزێنەرانی سالۆنیکاش ئەوەندەی ئەوێ ڕۆژێی ئێمە، لەبەر تین و تاوی ڕۆژی هاوین، بەو ئەندازەیە نەیاندەتوانی شانلەشانی کوڕەکانی ئیرگون بدەن و ئەوەندە بارە لەسەر پشتی کەشتیەکە دابگرن، هەموو ئەو کارە جەستەییەش بەبێ خۆراک و بە ئاوێکی کەمەوە دەکرا.
تۆبڵێی چ دەبوو، نەوەک بەبێ یارمەتی، بەڵکو بەبێ دەستوەردانی حکوومەت، هەموو بارە چەکەکە و فیشەک و باقی کەرەستەکەمان لە کەشتیەکە دابەزاندبایە؟ ئیدی فیتی حەڕامزادانە دەیچرپاند، گوایە ئێمە بەنیازین هەموو ئەو بڕە چەک و گوللە و تەقەمەنییە بۆ خۆمان بۆ سووپا ژێر زەمینییەکەمان ببەین. لێ ڕاستییەکە ئەوە بوو، ئەو کات ئێمە هیچ جبەخانەیەکی نهێنیمان نەمابوو. هەموو چەکوچۆڵمان ڕادەستی سووپا کردبوو، ئەوانیش بە تەواوی ئەو کون و کەلەبەرانەیان دەزانین، کە ئێمە پێشتر هەمان بوون. ئاخر بۆ خاتری خودا، چۆن دوای ئەو ڕادەستکردنەی چەک، دوای نەمانی باری ژێرزەمینیی، دوای ئاشکرا بوونمان و دوای ئەوەی پیاوەکانمان چوونە ڕیزی سووپاوە، دەمانتوانی ئێمە ئەو بارە چەکە، کە بەشی دە بەتالیۆنی دەکرد بشارینەوە؟ هێشتاش ڕاستیەکی دیکە هەیە جێی باس بێ: تەنانەت دوای ئەوەی گالیلی پێڕاگەیاندین، لە دابەزینی بارەی چەکەکاندا کۆمەکمان ناکەن، هێشتاش داوامان لە دەستەی سووپاسالاری هێزی سەربازی کرد، بەڵکو سەرپەرشتی دابەزاندنی بارەکە بکا. یەکێکیان بەڵێنیدا بێت، بەڵێنیشی دا

بەتایبەت چەند لۆریەکیش بۆ یارمەتیدانمان دەنێرێ... پێویست ناکا زیاتر لەسەر ئەوەش بڕۆین، لە هەموو گفتوگاکانماندا ئێمە دڵنیامان کردبوونەوە، دوای سەرپەرشتی کردنی چەکەکان و دابەزاندنی بارەکە بەتەواوی، ئێمە ڕادەستی سووپای دەکەینەوە. دیاربوو هەموو ئەو بەشەی "ئامادەکارییە نهێنییەکە" بۆ "هەڵگەڕانەوە بوو لە حکوومەت"!

گەر ئێمە هەموو بارەکەی سەر پشتی کەشتی ئالتالێنامان دابەزاندبا، ئەوا دەچووە بەردەستی سووپا یەکگرتووەکە، کە هەر لەوکاتەوەی دەوڵەت دامەزرا ئێمە بانگی دامەزراندنی سووپای یەکگرتوومان دا. بڕی بیست لە سەدی چەکەکان بە ڕەزامەندی حکوومەتەوە بۆ ئۆرشەلیم دەچوو، تەنها و تەنها بۆ ئۆرشەلیم نەوەک بۆ هیچ هێزێکی تایبەت، بەمە شارە دێرینەکە سەرباری وەخرانەکەی شالتیلیس، لە دەستی دوژمن دەستێندرایەوە.

لێ گەلۆ، تەنها بەشێکی چەکەکان دابەزێندران و کاریان پێکرا، ئەمەش تەنها دوای کوشتنی چەند ئەندامێکی پیاوەکانی ئیرگون هات. ئەو چەکانەش خۆیان خۆیان سەلماند. ئالتالێناش خاپوورکرا، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کەشتیەکە بڕی دووهەزار تفەنگی نوێی و نزیکەی یەک ملیۆن فیشەکی ۳۰۳ و ۲۵۰ ڕەشاشی برێن و تفەنگی هەمەجۆری دیکەی دایە گەلی جوو. لە ڕامەلەلا و لیدیدا ئەو برە پێویست بوو، ئاخر چۆن پێویستی نەبێ! ئیدی ئەو برە چەکە خزمەتێکی لێبڕاوانەی کرد. گولله و فیشەکەکانی ئالتالێنا کاری خۆیان کرد، نەوەک هەر تفەنگی برێن[٦٩] لەگەڵ بارەکاندا هاتبوون، بەڵکو برێنی دیکەشی لەگەڵدا بوو کە تا ماوەیەکی زۆر لەوێ بێ کار کەوتبوون. چەکەکانی ئالتالێنا هۆکاری چارەنووسسازییانەی خۆی لە شەڕی دژی عەرەبە پەلاماردەرەکان سەلماند.

کەشتی ئالتالێنا نەوەک هەر چەکوچۆل، بەڵکو زیاتر لە یەک بەتالیۆن جەنگاوەریشی لەگەڵ خۆیدا هێنا. ئەو گەنجانە کاتێ گەیشتنە سەر کەنارەکانی نیشتمان، زۆر بەگەرمییەوە بەخێرهاتنیان کرا. زۆر لەوانم بینین، کاتێ دابەزین دانەوینەوە و لمە خوێنینەکەی کەنارەکەیان ماچ کرد. هێشتاش

---

[٦٩] تفەنگ یان ڕەشاشی برێن دەستکردی بەریتانییە لە ۱۹۳۰ تا ۱۹۹۲ دروستکراوە و لە جەنگی دووهەمی جیهانیدا ڕۆڵی کارای بینیوە و لە شەڕی کۆریاش بەکار هاتووە، ئەم جۆرە تفەنگانەش چەندان جۆریان هەن، لێ هەموویان بە bren gun ناسراون. وەرگێڕ

سەدای ئەو هەراوهەنگامە خۆشەی ئەوانم لە گوێدا دەزرنگێتەوە کاتێ پێیان نایە سەر کەنارەکە.
ئاخر چۆن خۆشیەکەیان خامۆش کرا، چۆن بەخێرهاتنەکەیان زاندرا. هەر چۆنێک بێ ئەوان هاتن و چوونە ریزی سووپاش. لە ڕیزەکانی سووپاشدا بە باوەڕ و مەردانە شەڕیان کرد. کوڕەکانی سەر پشتی کەشتی ئالتالێنا لە زۆر بەرەی شەڕدا خزمەتیان کرد، بەشداری زۆر لە سەرکەوتنەکانیان کرد، هەر لە تراشیلاوە تا ئیلات. زۆریشیان هەر بە نەبەردی و ئازایەتیان دەناسرانەوە. کەمیش نەبوون ئەوانەی لە مەیدانەکانی شەڕدا سەریان نایەوە. سەبارەت بەو پرس و ئەو کوێرەوەریەش هێشتا دەیانزانی چۆن لە تاقیکردنەوەی بالای خۆشویستنی دڵسۆزی نیشتمانەیەکان دەرچن.
پێویستە لە گۆشە نیگایەکی دیکەشەوە لەو کوڕە گەنجانە بڕوانـدرێ. بەگوێرەی گێڕانەوەی ئەو چیرۆکە ڤیزەونەش بێ، دەبوایە ئەوان سەر بە "یاخیبوونە چەکدارییەکە" بووبان، بەڵام باشە بۆچی ئەوانە، ئەو ئیرگونە ڕێکخراوانە، بۆچی پاڵیان نەدایە گەڵ یاخیبووان. خۆ کەشتیەکە تەواوی بەتالیۆنەکەی لەگەڵ خۆی هێنابوو، چەکی قورس و نوێشیان پێ بوو. ئاخر چی لەوە سروشتیتر بوو، چەکەکە نەکەوێتە بەردەستی جەنگاوەرە" یاخیبووەکان؟ خۆ بەگوێرەی ئەم جۆرە گریمانەیە با، لەسەر کەنارەکە، هەر بەچاو تروکانێک بەتالیۆنێک بە چەک و تفاقی تەواوە حازروبازر دەبوو. لە ڕاستیدا ئەو "ڕێکخراوە یاخیبووە" چی کرد؟ ئەوان بە نێردراوەکانی پالماخ، ئەو ڕکابەرە سیاسییە توندانە لەسەر کەنارەکەدا، یەکەمجار جەنگاوەرەکانیان دابەزاندن و بێ چەک ناردنیایە ئۆردوگایەکی دوور لە ناتانیا تا پشو بدەن، لەوێ و لەژێر سەرپەرشتی سووپادا ماندوێتییان بحەسێتەوە؛ لەکاتێدا چەکە لە گریز دەرنەهاتووەکە نەوەک لە لایەن سەربازانەوە بەڵکو لە لایەن کارمەندە شارەزاکانەوە، ئەوانەی لە بەندەرە جۆربەجۆرەکانی ئێرتز ئیسرائیل کۆکرابوونەوە، دابەزێندرا. ئەمەش قۆناخێکی زۆر سەیری داهاتووی "یاخیبوونە چەکدارەکە" بوو...
لەوێدا لە دواساتی گەیشتنی ئالتالێنادا وەخرانێک ڕوویدا. کاتێ کەشتییەکە لەسەر ڕێنمایی حکوومەت ئاراستەی خۆی بەرەو کفر ڤیتکین گۆڕی، یەکەمجار لەنگەری نەگرت، چونکە کاپتنی کەشتیەکە هیچ ئاماژەیەکی لەسەر

کەنارەکە بەدی نەکرد تا لەنگەر بگریّ. ئیدی رووی کردە تەلئەبیب و دوای ئەوە گەڕایەوە کەناری کفر ڤیکتین. کاتێکیش بەرەبەیان داهات، لەترسی ئەوەی نەوەک چاودێرانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان کەشتیەکە ببینن، بڕیارمان دا دابەزینی کەشتیەکە بۆ شەوەکەی دوابخەین.
دوای گەڕاندنەوەی کەشتیەکە بۆ نێو دەریا، ئێمە گەڕاینەوە تەل ئەبیب و پەیوەندیمان بە وەزارەتی ئاسایشەوە کرد. ئێمە بە ئەفسەری پەیوەندی وەزارەتی ئاسایشمان گوت، کەشتیەکە شەو دەگەڕێتەوە. تەنانەت ئێمە لێشمان پرسی ئاخۆ مافمان هەیە بە ڕۆژی ڕووناک کەشتیەکە دابگرین. ئەویش وەڵامی دایەوە: "هەڵبەتە ئێوە مافتان هەیە. لەو بارەیەوە شتەکە بە ئیسرائیل گالیلی رادەگەیەنم." دیسان ئێمە ئەومان بۆ سەرپەرشتیکردنی دابەزاندنی بارەکە بانگهێشتکرد. ئەوەیش لە وەڵامدا گوتی: لەوانەیە بێت، لەوانەشە هەندێ لۆریش بۆ یارمەتیدانی کارەکە بنێرێ...
لە ڕۆژئاوابووندا کەشتیەکە گەڕایەوە کفر ڤیتکین. ئێمەش بەپەلە پیاوەکانمان دابەزاندن و دەستمان بەدابەزاندنی بارەکەش کرد. ئێمە هەموومان لە شەودا کارمان دەکرد، تا سەعاتەکانی بەرەبەیان بەردەوام بووین. ئیدی فڕۆکەیەکی سپیی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان بەسەرماندا فڕی. کەشتیەکەش بەدی کرا. شتێکی زۆر چارەنووسسازانە بوو، دەبووا بەهەر نرخێک بێ پەلە لە دابەزاندنی بارەکەدا بکەین.
ئیدی هەر ئەوەندەمان زانی، لە هەموو لایەکەوە بە سووپا دەورە دراین. چەند خولەکێک دواتر، ئاگادارینامەیەکم لە فەرماندەی خۆجێی سووپا پێگەیشت، **دە خولەکتان ماوە هەیە**. منیش وەڵامم بۆ فەرماندەکە ناردەوە، شتەکە بە دە خولەک چارەسەر نابێ، پێشنیازی دیدارێکم لەگەڵیدا کرد. لەو دەمەدا یاکۆڤ مێریدۆر بانگهێشتکرا بچێتە کفر ڤیتکین و ناتانیا تا لەگەڵ بەرپرسی ئەنجوومەنی خۆجێی بدوێ، کە بەلێحاڵیبوونەوە مەراقی ئەوە بوو هیچ ڕووداوێکی نەخوازراو ڕوونەدا. یاکۆڤ ڕەوشەکەی بۆ بەرپرسەکە ڕوونکردنەوە. ئەوانیش بەڵێنیاندا لەگەڵ دەسەڵاتدارانی حکوومەت بکەونە خۆ. لە ئێوارە درەنگدا چاودێرانی نەتەوە یەکگرتووەکان گەیشتن، چاودێرەکانیش ئەفسەرێکی ئەمریکی و یەکێکی فەڕەنسی بوون. نوێنەرانی حکوومەتیش، کە لە نزیکەوە وەستابوون، بەئێمەیان گوت لێنەگەڕێن

چاودێرەکان بێنە سەر کەنارەکە. چاودێرەکان داوایانکرد کەشتیەکە بپشکنن. ئێمەش بە دڵنەرمییەوە پێمانگوتن، لەم بارودۆخەدا ڕێگا نادەین بچنە سەر پشتی کەشتییەکە. ئەوانیش ڕۆیشتن.
ئێمە هێشتا لە هەموو لایەکەوە بە سەرباز دەورەدرابووین. یەکێک پێشنیازی کرد کەشتیەکە بچێتە تەل ئەبیب، بچێتە ئەو خاڵە لەنگەرگایەی بەرامبەر شەقامی فریشمان، ئەو شوێنەی لە بنەڕەتەوە بۆ کاپتنەکە لەسەر نەخشەکە دیارکرابوو. لەو ڕێگەیەوە دەکرا خۆمان لە هەلومەرجی ئابڵوقەکە قوتار بکەین و منیش دەمتوانی ڕاستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ حکوومەت بگرم و کۆتایی بەو پرسە بهێنم، ئاخر هێشتاش هیوام وابوو کە بەد لێکحاڵیبوونێکی ترسناک لەگۆڕێدا هەیە. من بە گومان بووم لە بەجێهێشتنی کوڕەکان، لە گەمارۆدانی ئەوانیش لەو شوێنەی لێی هەن، بەڵام مێریدۆر سووربوو لەسەر ئەوەی من بڕۆم.
"لێرەدا تۆ هیچت بۆ ئێمە پێناکرێ،" ئەو وای بەمن گوت، "من دەمەوێ تۆ بچی بەڵکو ئەو پاشاگەردانیە بەلایەکدا بخەی."
ئێمەش کوڕەکانمان خڕکردنەوە، تا لەگەڵیاندا بڕۆم.
ئیدی بەبێ هیچ ئاگادارکردنەوەیەک، لە هەموو لایەکەوە پەلاماردراین. بە ڕەشاش و هاوەن تەقەمان لێکرا. من ویستم بڕیارێکی پێچەوانە بدەم و بمێنمەوە. یاکۆڤ پێی لە زەویدا چەقاندن: "تۆ بڕۆ. بەڵکو ئەمە هەر زوو بەسەربچێ. من لێرە بەرپرسیارم. تۆ دەبێ بڕۆی ئێمە لەو قوڕە خەستە دەربێنی. خۆ ئەگەر وا بڕوات و کەشتیەکەش بەم چەشنە بەربکەوێ، دەتەقێتەوە..."
ئەمەش ساتێکی گرنگە بۆ ڕەواندنەوەی پڕوپاگەندەی چڕە دوکەڵەکە. ئەوان وایان نمایشکرد گوایە ئێمە بە ئەنقەست ئاراستەی کەشتیەکەمان بۆ تەلئەبیب و بەرامبەر هوتێلی کێیت دان گۆڕیوە، چونکە ئەو کات هوتێلەکە جێمانەوەی چاودێرانی نەتەوە یەکگرتوەکان بوو. ئەوان لەوەش زیاتریان گوت، گوایە یاکۆڤ کە بەرپرسیاربوو لە خۆ بەدورگرتن لە خوێنڕژان، ڕێککەوتننامەی خۆبەدەستەوەدانی لەگەڵ فەرماندەی سووپادا مۆرکرد و کەشتیەکەی خستونەتە بەردەست. ئەو چیرۆکانە ڕاست و ڕەوان هەڵبەستراو بوون. ئێمە کەشتیەکەمان هێنابووە بەرامبەر شەقامی فیرشمان، هەر لەبەر

ئەوەی ئەم خاڵە بە گوێرەی نەخشە ماکەکەی ئەپریل، شوێنی لەنگەرگرتن بوو. هەرچی دەربارەی یاکوڤیشە، لەو کاتەی رێکەوتنامەکەی کفر ڤیتکینی واژۆکرد، کەشتییەکە گەیشتبووە تەلئەبیب.

کاتێک لەسەر پشتی ئالتالینا، ئێمە لە دوای نیوەشەودا گەیشتینە تەلئەبیب، لەسەر کەنارەوە بەکورتە تەقەیەک بەخێرهاتمان لێکرا. بنیامین، کە فەرماندەی پیاوەکانی سەر پشتی کەشتیەکە بوو، مکوڕبوو من لەسەر کەشتیەکە بمێنمەوە. ئێمە وەڵامی تەقەکەمان نەدایەوە. بە زەردە دەرکەوتن و دنیا روناکبوونەوە، بۆمان دەرکەوت، سەرباز دەوروخولمانی گرتووە. ئێمە قسەکەمان بۆ دووبارەکردنەوە و بەڵێنمان پێدان، کە لە هیچ بارودۆخێکدا تەقەیان لێناکەینەوە. داوامان لێکردن ئەوانیش تەقەکە راگرن. گەمییەکەمان نەوەک هەر لە وشکانی بەڵکو لە ئاویشەوە گەمارۆدرابوو. سێ بەلەمی جەنگی لە ئێمە نزیک بوونەوە. یەکێکیان بەچەکی بچووک تەقەیەکی سەختی لەو بەلەمە بچووکە سەوڵدارە کرد کە ئێمە لە کفر ڤیتکین پێ چووبووینە سەر کەشتیەکەی ئالتالێنتا. کارامەیی کاپتنی کەشتیەکەبوو، کە نەتوانرا بەلەمەکە بپێکرێ و تێکوپێک بشکێندرێ. شتێکی ناوازە بوو، کابرا یەکی بوو لەو کەسە هەرە ئازایانەی کە تا ئێستا دیتبێتم، لێزانانە ئالیتالێنای سوڕاندەوە تا بەر بە شێلکەی تەقەکە بگرێ و پێمان نەکەوێ. ئەوەش ئەو بارودۆخە بوو، کە ئێمە لە کفر ڤیکتین سواری کەشتیەکە بووین. هەمان بەلەمە جەنگییەکەش لە تەلئەبیب هەڕەشەی لێکردین.

ئیدی ئالتالێنا گەیشتە ئەوخاڵەی بنی لە زەوی بخشێ و لەنێو ئەو گاشەبەردانەی ئەوێ نەیتوانی بشجوڵێ، هەر ٧٠٠ گەزی مابوو بگاتە وشکانییەکە. ئێمەش بڕیارمان دا هەر لەوێوە چەکەکان دابەزێنین. کاتێک بەلەمێکی بچکۆلانەمان ڕەوانەی کەنارەکە کرد، هەمووومان تووشی شێلکە تەقەیەک هاتین. یەکێ لە خۆبەخشەکانمان، کە (کەندی) بوو، دەمودەست گولەیەکی پێکەوت و کوژرا. گوللەیەکیش بەر لاقی شموئیل مێرلین کەوت. ئاڤراهام ستاڤسکی، ڕێکخەری تیمی مەزنی "بەقاچاخ" هێنانی کۆچبەرانی سییەکان و بەرپرسی هێزی لێخوڕی ئالتالێنا بەسەختی بریندار بوو. لەسەر پشتی کەشتیەکە تا دەهات ژمارەی بریندارەکان زیاد دەبوو. هەندێک لە گوللەکان ڕاستەوخۆ ئامانجەکەیان دەپێکا. هەر کاتێکیش من دەچوومە

شوێنی کاپتنەکە تەقەکە گەرمتر و چڕتر دەبووەوە. کاتێک من پردەکەی لای کاپتم بڕی، ئاراستەی گوللەکان تایبەت بوو بە شوێنێک.
لەو نێوەندەشـــدا، هاوڕێکانمـــان لە شـــارەکەدا، کە پەیوەنـــدیمان بەیەکەوە نەمابوو، هەوڵیاندا بوو هێلەکانی سووپا ببڕن، بۆ ئەوەی بگەنە کەشتیەکە.
ئەوسا فەرماندەی پالماخ بڕیاری تەقەڕاگرتنی دا، بەمەرجێک چیدیکە بارەکە دانەبەزێنین. ئێمەش بەو مەرجە قایل بووین. تەقەکە ڕاگیراو بارداگرتنەکەش وەستێنرا. ئێمە بە فەرماندەکەمان ڕاگەیاند، چەند برینداریکمان لەسەر پشتی کەشتیەکە هەن. بەلەمە بچکۆلانەکەی ئێمە زیانی زۆری بەرکەوتبوو، بەکەڵکی بەکارهێنـــان نەدەهـــات. داوای بەلەمێکمـــان لێکـــردن بەڵکـــو برینـــدارەکان بگوێزنەوە، تا ئەو دەمیش هیچ پزیشکێک لەسەر پشتی کەشتیەکە نەبوو، زۆر کەسیش بەسەختی بریندار ببون.
ئەفسەرەکەی پالماخ بەڵێنیدا، دەستبەجێ لە بەندەری تەلئەبیبەوە بەلەمێکمان بۆ بنێرێ. ئێمە چاوەڕێ بووین. سەعاتێک، دووان، کەچی هیچ پەیدا نەبوو. هەلومەرجی زامدارەکانیش تا دەهات شەپرێوتر دەبوو.
ئیدی لە هیکەوە... شتێک بەسەر سەرماندا گرماندی. مۆنرۆ فاین هاواریکرد: "ئەوە تۆپە! ئەوان دەیانەوێ کەشتیەکە بسووتێنن!" ئێمە بانگی فەرماندەی پالماخمان کرد، بەبیرمان هێنایەوە، کە بەڵێنی تەقە ڕاوەستانێکی سەرتاسەری پێداوبووین. ئەویش وەڵامی نەدایەوە. تۆپی دووەم، سێەم و چوارەمیشی بەدوادا هات. مۆنرو بێئومێد بوو. من پێشنیازی ئەوەم بۆکرد، خۆی و هاوکارە ئەمریکاییەکان کە وەک ڕێنیشاندەر (نافیگاتور) نەوەک سەرباز هاتبوون، کەشتیەکە جێبێڵن ئێمە و سەربازەکانیش دەمێنینەوە. ئەو هەر گوێشی لێ ڕانەگرتم. ئاماژەی بەوەکرد گەر تۆپەکان بەو شێوەیە بەردەوام بن، ئەوا تێکشکان و نغرۆبوونی کەشتییەکە حەتمیە، لە هەمبەر ئەو بارە تەقەمەنییەدا هیچ ڕێگەیەک نەمابۆوە بێجگە لە هەڵدانی ئالای سپی نەبێ. هەر ئەوەشی کرد. لێ ئەم هێمایە لەنێو ئەو شەرکەرە شارستانانە دادی نەدا.
تۆپەکان بەردەوام بوون. دووبارە داوام لە فەرماندەی پالماخ کردەوە. "تۆ دەبێ تەقەکە ڕاگری، ئەرێ بۆچی ئێمەتان داوەتە بەر ئاگری چەکەکانتان؟"
دوای تاوێک وەڵامی دایەوە. دوا قسەکانی هی ئەوە بوون تۆمار بکرێن: "ئەوە

تەقە ڕاگرتنێکی گشتییە، بەڵام هێشتا فەرمانەکە بە هەموو یەکەکانی سووپا نەگەیشتووە."

پاش چەن خولەکێکی کەم ئاگری تۆپەکان بەر بەدەنەی کەشتیەکە کەوتن، ئاگری تێبەربوو، چرە دوکەڵیشی لێهەڵسا. ئەوسا یەکەمین ئەرکمان قوتارکردنی بریندارەکان بوو. ئەوانیش ڕەفتارێکی ئازایانەیان نواند. هیچ تۆقینێک لەئارادا نەبوو. هیچ کەسێک بازی نەدایە نێو ئاوەکە. هەمووان بەو پەڕی دیسیپلین و ئارامییەوە جووڵانەوە. یەکەمجار بریندارەکانمان دەرباز کردن. (فاین) جوامێر بوو. لەگەڵ ئەوەی کەشتیەکە گڕی ئاگری لێهەڵدەستا، ئەو لەسەر پردی کاپتانییەکەی وەستا بوو، بەهێمنەتەوە فەرمانی دەردەکردن و دەیگوت، "بە هێواشی، ئاگاتان لە خۆتان بێ". بەو فەرمان و ڕێنماییەنای ئەو نەوەک هەر گیانی ئێمە، بەڵکو هی ئەو ماڵانەی دەورووبەری کەنارەکەش پارێزرا. گەر گەمیەکە تەقیبایەوە، زیانەکە زۆر گەورەتر دەبوو. ئەو بەخۆی لێبەسەر کەوت و برینداراەکانی دەگواستنەوە، یەک لە دوای یەکی شۆڕی سەر بەلەمە بچکۆلەکەی دەکردنەوە. هەموو ئەو کاتەی گوللەی تۆپ لە دەورووبەری دەدان و کەشتیەکەی ئاگر تێبەردەدا، کاتێ برینداراەکانیان لەسەر تەختەدارەکان دادەنا و گوللەکانیش بەبن گوێیاندا هەر ویزەیان دەهات.

هەندێک لە گەنجەکانمان، لەناو شارەوە خۆیان گەیاندبووە لێواری ئاوەکە. ئەوان بەلەمی بچووک بچووکی وەرزش و کەیف و سەفایان بەکارهێنابوو، بەبێ گوێدانە مەترسییەکان، بەناو دوکەڵ و ئاگردا هاتن، ئەگەری تەقینەوەش لەئانوساتدا بوو، کەچی ئەوان هەر سەوڵیان لێدەدا، بەو بەلەمە جوان و ناسکانە خۆیان گەیاندێ. ئەوان هاتبوون هاوڕێکانیان دەرباز بکەن، بڕیاریشیان دابوو هەرچی دەبێ با ببێ، گرنگ هاوڕێکانیان ڕزگار بکەن.

ئالتالینا ئاگری گرت. ئەو چەکەش کە هەندێکی هەر لەسەر مابوو، وێران بوو، کەشتیەکەش بووە گۆڕێکی بە کۆمەڵی ئەو پیاوە بوێرانەی کە خۆبەخشانە بۆ جەنگ لەپێناوی گەلەکەیان لە هەندەرانەوە هاتبوون.

لە نەخۆشخانەشدا، ئاڤراهام ستاڤسکی هاوشارییە باشەکەم، کە بە هێز و وزەی خۆی هەزاران جوولەکەی لە مەرگە بە کۆمەڵەکەی نازییەکان

ڕزگـارکردبوو، هەموویـانی هێنـابوونە سـەر خـاکی ئێرتـز ئیسـڕائیل، بە برینەکانیەوە سەری نایەوە. کۆستی ئەویشم کەوت.
زۆر کەس، کە ئەو ڕۆژانە کـارە ترسناکەکەیان بـۆ جێبەجێکردنـی نەخشـەی حکوومەت بینی، پێیان وابوو ئەمە بۆ قوتاربوونە لە ڕکابەرە سیاسییەکەیان. ئەوەش لە هێمایەک زیاتر بوو بۆ براکوژی.
لـێ گەلـۆ، دوژمنـی بێگـانە لەسـەر دەروازەی نیشـتمانی دایـک بـوو، ئێمەش سـوێندمان خواردبـوو: **"لە هـیچ بارودۆخێکـدا لـوولەی چەکەکانمـان لە هاونیشتمانییە جووەکان نەگرین."**
چەند ڕۆژێک پاشتر، کوڕەکانی ئێرگون، بەوانەش، کە لە سـەر پشـتی ئالتالێنا بـوون، لە هەمـوو بەرەکـانی شـەڕ دەبینـران کە ڕووبەڕووی پەلامـاردەران ببـوونەوە، پیـاوگەلێکی وەک جـۆ و کـۆهن لە فلادلڤیـا و ناتـان کاشـمان لە لەندەنەوە. چۆن پاڵەوانانە لە ئۆرشەلیم شەڕیان کرد تا گیانیـان دانـا، کاشمان لە هێرشـەکەی سـەر مالهـا و جـۆ و کـۆهنیش لە دوا پەلامـاری سـەر شـارە دێرینەکەدا کوژران.
لەو شـەوەی سـاڵی ١٩٤٨دا، کـاتێ کەشـتیەکە خـاپوور کـرا، مـن لەڕادیـۆوە سـەبارەت بە کەشـتیەکە، دەربـارەی چەکەکـان و کوژراوەکـان دوام. چـاوم پڕببوو لە فرمێسک. لەوێدا پاڵەوانی مەزن لە هەموو جۆرێک هەبوون، لەسـەر کورسیەکان گوێیان گرتبوو، هایهۆیـان بـۆ "هەستوسـۆزە نەرمونیانەکەمیـان" دەکێشا." لێگەڕێ با هایهو بکێشن! لەوێدا ریزە فرمێسکێک هەن، کە پێویست ناکا هیچ پیاوێک لێیان شەرمەزاربێ؛ لەوێدا فرمێسک هەن هەر پیاوێک دەبێ شـانازییان پێوە بکا. خـۆ فرمێسـک هەر لە چاوەکانەوە نایەت؛ هەندێک جار وەک خـوێن لە دڵەوە هەڵـدەقوڵێ. لەوێـدا فرمیسـکێک هەن لە خەمبـارییەوە هەڵدەڕژێن، فرمێسکیش هەن فریادرەسی بەدواوەیە.
هەرکەسـێ بەدوای چیرۆکەکەمـدا بچـێ، دەزانـێ، چـارەنووس منـی نەلاواندۆتەوە. هەر لە سەرەتای ساڵانی گەنجیمەوە برسییەتم بینیوە و لەگەڵ خەم و خەفەتیشدا ئاشنا بوومە. زۆر جاران مەرگ بەسـەریدا داوم، ئەوسـا چ لە سەر خاکی نیشتمان بێ یان لەسەر خـاکی بێگانە، بەڵام بۆ ئەو شـتانە مـن هەرگیـز نەگریـاوم. تەنهـا لەو شـەوەی کە جـاڕی دەوڵەت درا؛ لەگەڵ ئەو شەوەی ئالتالێنا... گریاوم. بە ڕاستیش فرمێسکی ڕزگاربوون هەن هەروەک

چۆن فرمێسکی کۆست کەوتنیش هەن. ئاخر لەوێدا کات هەیە تا لەنێوان خوێن و فرمێسکدا یەکێکیان هەڵبژێری. هەندێک جار وەک یاخیبوونەکەمان دژی چەوسێنەر فێری کردبووین، شتێکی زۆر چارەنووسسازانەیە خوێن جێگەی فرمێسک بگرێتەوە. هەندێک جاریش، وەک لە پرسی کەشتی ئالتالێنادا دەرسی دادایـن، شتێکی چارەنووسسازیە دەبێ فرمێسک جێگای خوێن بگرێتەوە. ئەوەش دەبێ لەیاد نەچێ، بەتایبەتیش بۆ ئەوانەی گوللەیان بەر ئالتالێناو. نا کە ئەوانەی سەر پشتی کەشتیەکەیان کوشتن و تەقەیان لە بریندارەکان کرد و لەوانەش لە مەشخەڵی گرەکەدا هەڵاتبوون.
لێگەڕێ با فشەفش بەو ڕەفتارەیان نەکەن کە "یەکێ جەختی لێکردبوون وا بکەن"، هەروەها خۆشیان لە بەرپرسیارێتی نەدزنەوە. لێگەڕێ با هەموو شتێکیان یاد بکەوێتەوە کە هی یادکردنەوە بێ، هەر لە قەپێلک دەرهاتنی پلانەکە تا کۆتاییهات بە دوا شێلکە گولله کە کەشتیەکەی سوتاند و خوێنی لەبەر چۆڕاندەوە. خۆ ئەگەر ئەمەیان لەبیر بێ، بەڵکو لە هەستی ئەو پیاوە تێبگەن کە هەوڵیاندا لەناوی بەرن: ئیدی بەڵکو لەوەش تێبگەن، هەندێ جار وا باشترە پیاوێک لە دڵەوە سەبارەت بەو کارە قێزەونەی لەئیسرایل کرا، فرمێسک بڕێژێ، لەوەی زۆر کەس لەبەر ئاکامی شتەکان دەگریێن...
ئیدی بەم شێوە هات و تێپەڕی، هیچ شەڕێکی براکوژیش نەقەوما، نەوەک دەوڵەتی جوو بەر لەوەی لە دایک ببێ، لەبار بەرێ. سەرەڕای هەموو شتێک کە ڕوویدا، شەڕی ناوخۆ هەر نە قەوما!

## بەندی 13
## یەکێتی بەرگریی

۲۷۸ - ۳۰۲

کۆتایی هاوین، هاوینی ١٩٤٥، سەرەتای سەرکەوتن و ترس و تۆقین؛ سەرەتای بێ ئومێدی و هیوا بوو. جەنگی دووهەمی جیهان کۆتاییهات. دەستبەجێش یەکێتی سەرکەوتووەکان، ئەوانەی بە بەرژەوەندی نەرێیانە لە جەنگەکەدا دژی دوژمنێکی هاوبەش هاوکار بوون، شیرازەیان لە باریەک هەڵدەوەشا. کێبەرکێی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەستپێکرد، ئەمەش بۆ خۆئامادەکردنبوو بۆ جەنگی سێهەمی جیهان، کە لە هی پێشخۆی زۆر سامناکتر دەبێ و لە مێژووی مرۆڤایەتیشدا لە دڕندەیی وێنەی نابێ. بۆ گەلی جوو ئەو هاوینە سەرکەوتن بوو بەسەر تیوتۆنی[٧٠] جانەوەر، بەڵام بە ڕووخانەکەشی تیرۆر و ترس و تۆقین بڵاوبووەوە. لە دواییدا و بە فەرمی دوا قڕکردنە بەکۆمەڵەکەی جووەکانی ئەوروپا سەلمێندرا. لە ڕێی ئەو دوژمنە جانەوەرەدا، ئەوروپا بووە یەک گۆڕی بەکۆمەڵی گەورە بۆ ملیۆنان جوو. ئەوەی ئێمە پێشبینیمان کردبوو هاتە دی. لەو حەڤدە ملیۆن جوولەکەی سەرتاپای جیهان، تەنها یازدە ملیۆنیان مانەوە. سێ یەکی گەلەکەمان بێباکانە بەبێ بەرگری لەنێو بردران.

لە ئێرتز ئیسرائیلیشدا ڕاوەدونانی ئیرگون زڤای لیومی، کە نە خۆی بەدەستەوەدا و نە تۆڵەشی کردەوە[٧١]، بەردەوام بوو. هێشتاش چاوەکانی ئێمە لەسەر ئایندە بوون. بەکۆتاییهاتنی جەنگەکە، جیهان بۆ ئێمە کرایەوە و توانیمان سەرنجی جیهان بۆ ئەو گۆشە بچکۆلانەیەی وڵاتەکەمان رابکێشین. ئاسۆیەکی فراوان لەسەر خەباتەکەی واڵا بوو. چەوسێنەرەکەشمان چاوەڕێی دەکرد ئێمە بکەوینە نێو شەڕێکی مەدەنی خوێناوی خۆبەخۆ، ئەوسا بۆ ئاشتی و باڵادەستێتی پەنای بۆ بەرین. لێ گەلۆ، ئێمەی یاخیبوو بڕیارمان دا

---

[٧٠] تیوتۆنی Teutonic ناماژەیە بە هۆزێکی ئەڵمانی کە لە مێژوودا نووسەرە یۆنانی و ڕۆمانییەکان ناویان هێناوە. وەرگێڕ.

[٧١] مەبەست لە تۆڵە کردنەوە لە ڕێکخراوی هاگان و ئاژانسی جوولەکانە نەوەک عەرەب و بەریتانییەکان. وەرگێڕ.

لەم پنتەشدا بێئومێدی بکەین. لەگەڵ خاڵی وەرچەرخانی جەنگی دووهەمی جیهاندا، بڕیارماندا نەوەک هەر لەسەر خەباتەکەماندا بەردەوام بین، بەڵکو وێڕای ڕاوەدونانی نێوخۆیش، هەوڵ و تەقەلامان توندتر چڕتر بکەینەوە.
ئێمە ئەو کات پێشنیازمان کرد و نووسیشمان، کە ڕابەرایەتی کەسایەتی یوشیڤ، لە هەر دوو بەش لە ئاژانسی جووەکان و لە دەرەوە، لە هەر دوو پارتی کار و خەڵکانێکی ناحزبی، دەبێ کۆ ببنەوە، لە هەنگاوی یەکەمی شۆڕشگێڕانەشدا دوو دامەزراوە پێکبهێنن:

1 - حکوومەتێکی کاتی جوو.

2 - ئەنجوومەنێکی باڵای نەتەوەیی (نیشتمانی).

"دەبێ وا دابندرێ کە ئەندامەکانی حکوومەتی کاتی ئەوانەی جاڕنامەی دامەزرێنەر واژۆ دەکەن، ئەگەر نەچنە باری ژێرزەمینیی، لەوانەیە دەستبەجێ لە لایەن دەسەڵاتدارانی بەریتانییەوە بگیرێن. ئەوان دەبێ بەخۆشییەوە بەو ڕیسکە یان ئەو چارەنووسە قایلبن، ئەوە بێننە بەرچاویان کە چۆن بە ملیۆنان کەسانی ئاسایی و بە هەزاران سەرکردەی دینی و ڕۆحی سەریان لەپێناو خۆیان و گەلی جوو دانا. هەروەها دەبێ ئەوەشیان لە مێشکدا بێ کە بایەخی ئەو ڕەفتارەیان، چ دەرەکی یان تایبەتمەندیانەتر ناوەخۆیی لەنێو ئاپۆرای جەماوەرەوە تا سەرکردایەتیکردنیان بەهەند هەڵبگرن. هەر لەبەر ئەو هۆیەش "کۆنفرانسی نوێنەرەکان" دەبێ پانێلی دووهەم و سێهەمی حکوومەتی کاتی هەڵبژێرێ. ناسنامەی ئەو ئەندامانەش ئاشکرا ناکرێ، ئەوان دەبێ ژێرزەمینییانە لە خەباتدا بن، نەبادا ئەندامە ماکەکانی بەرایی گیران یان لەکار خران.

ئەنجوومەنی باڵای نیشتمانیش، کە حکوومەتی کاتی لە بەرامبەردا بەرپرسیارە، دەبێ لە نوێنەرانی هەموو لایەنە جووەکان پێکبێ، لە کاتێکدا سەربەخۆیی سیاسییانەی خۆیان دەمێنێتەوە، بەڵام دەبێ هەر هیچ نەبێ لەگەڵ لایەنی کەمی ئامانجی بەرنامەی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە کۆک بن. گومانیشی تێدا نییە، ئەو بنەما لە هەر دوو باری مەیدانی سیاسی (حکوومەتی کاتی، ئاپۆرای گەڕاوەکان بۆ نیشتمان، ڕژێمێکی ئازاد و دیموکرات، مافی یەکسانی بۆ هەموو نیشتەجێیانی وڵات) و کایەی کۆمەڵایەتی (بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانی کرێکاران و هەموو چینەکان

ئەوانەی پێداویستیەکانی ژیانیان پڕ لە کەموکوڕی بووە؛ بیمەی کۆمەلایەتی، چاکسازی کشتوکاڵی، دابەشکردنی زەوی کشتوکاڵی لەنێو کرێکارانیدا، کەرتی گشتی بۆ خزمەتگوزارییە گشتیەکان) جێگیر ببێ.
"حکوومەتیش دەبێ: دەستەیەکی سووپاسالار بۆ ڕاپەڕینی سەربازییانە دابمەزرێنێ؛ ئەنجوومەنێکی کۆمەلایەتی و ئابوری بۆ مانگرتنی گشتی بەزۆر شێوە و پێداویستیەکانەوە بخولقێنێ؛ ئەنجوومەنی کاروباری دەرەوەش بۆ دامەزراندنی پەیوەندی لەگەڵ لایەنی دەرەکیدا بێنێتە کایە؛ ئەنجوومەنێکی قانونییانەش دەبێ دابمەزرێنێ بۆ ئەوەی دادگاکان سەربەخۆ بن و پرۆژەی دەستووری کۆماری عیبری بنووسنەوە؛ دامودەزگای دیکەش دابمەزرێنێ کە لە پێداویستی جەنگ یان پێشهاتەکانی دیکە بێ."

## 2

کاردانەوە لە هەمبەر پێشنیازەکانمان تایبەتمەندانە بوون. ئێمە نوێنەرمان ناردنە لای ئەوانەی یاداشتنامەکەیان بۆ چووبوو، بۆ ئەوەی ناوەڕۆکەکەیان بۆ ڕوون بکەینەوە و وەلامەکەش وەربگرینەوە.
رابی مایەر بەرلینی کۆچکردوو، سەرۆکی پارتی میزراحی بە ئامیتزوری گوتبوو: "ئەگەر هات و پەنجا کەسم بۆ بێنی، کە ئامادەی واژۆکردنی پێشنیازەکانیان بێ، ئەوا من یەکەم کەس دەبم یاداشتنامەکە واژۆ دەکەم، بەلام خۆ تۆ هەلومەرجەکە دەزانی..." ڕابی بەرلین پیاوێکی ئازا و بە شکۆ بوو. جارێکیان کە کنەوپشکنینی بەریتانییەکان لەوپەڕی دابوو، ئەو پێشنیازی بۆ هاورێکانم کردبوو، بچم لە ماڵەکەی ئەودا خۆم حەشار بدەم. منیش ڕێز و پێزانینم بۆ میهرەبانی ئەو ڕابیە زانایە نارد. ئەودەم باری ئاسایشەکەم ئەوەندە خراپ نەبوو، واشم بینی پێویست ناکا ژیانی ڕابی بەرلین بەهۆی خۆمەوە تووشی دەردەسەری بکەم.
لێ گەلۆ، ئێمە وا بیردەکەینەوە کە زۆر ڕەوا و هەقە سەرکردە حزبییەکان ژیان و پێگەی خۆیان بخەنە مەترسی و فەلاکەتەوە لەپێناو ئەوەی تەوقی سەختگیری لە ملی هەموو نەتەوەکە شل بکەن و بیکەنەوە. ڕابی بەرلین داوای لێکردین پەسەندنامەی پەنجا کەسی بۆ ببەین. ئێمە لەبەدیهێنانی ئەوەدا سەرنەکەوتین. تەنانەت واژۆی پێنج سەرکردەشمان پێ کۆنەکرانەوە. بەلام بێئومێدیش نەبووین. تەنانەت گەپجاڕیی "زیرەکەکەش" کاری لە ئێمە نەکرد.

ئـێمە دەمـــانزانی کە ڕاســـتین. ئەوەش جەوهەرەکە بـــوو، ئـــێمە لەوەدا هەڵە نەبووین. پێشـنیازە بنەماییەکەمـان لە ئایـاری ١٩٤٥دا ڕەتکـرایەوە، کەچـی لە ئایاری ١٩٤٨دا پەسەندکراو جێبەجێش کرا. سێ سـاڵ تەنانەت لە سـەردەمی ڕادیۆ و فڕۆکەشدا ماوەیەکی دووورودرێژ نیە.
گەپجاڕییەکە تەنانەت سێ ساڵانیشی خۆ نەگرت. لە ڕاسـتیدا لە مـاوەی چەند مـانگێکی کەم دوای ڕەتکـردنەوەی پێشـنیازەکانمان بـوو بە هەڵـم. بێهیـواییە مەزنەکە زۆری نەبرد گەیشت. هەڵبژاردنی گشتی لە بەریتانیا بەڕێوە چوو، هەمـوو خەیـاڵپڵاوییەکی مـاوەی جەنگـی دووهەمـی جیهـانی وەک تـامێکی تـاڵ لەبن ددانان مایەوە.
ئێلیاهۆ گۆلۆمب لەو دیدارەی لەبارەی ژێرزەمینییدا لەگەڵـم سـازدابوو، دڵنیای کردمەوە لەوەی، گەر هـاتوو پـارتی کـار لە بەریتانیـادا دەسـەڵاتی وەرگـرت، ئەوا "بەلای کەمییەوە بەشـێکی داخوازییەکانمـان" بۆ جێبەجێدەکرێ. دیاربوو ئەو بڕوا سـاویلکە و سـاکارییە هەر بە تەنیا لای گۆلۆمب نەبوو. بیروڕایەکە هاوبەشـێک بـوو لەنێـو زۆر لە هاوکارەکـانی لەنێو دامودەزگـا جۆربەجـۆرە جووەکاندا. شـتێکی سـەیروسـەمەرە نەبوو، ئەوانەی ئەو خەیاڵپڵاوییەیـان لای خۆیان بە بناوان گرتبوو، لە خۆشیان هەڵدەپەڕین کاتێک بە شکستی چەرچڵ و (ئێـدن)[72] یـان زانـی و ئـاتلێ[73] و بێڤـین جێگەیـان گـرتنەوە. ئـاهەنگگێڕان متمانەیـان بەو شـتەبوو، بە گـۆتەی خۆیـان "هاوپەیمـانێتی دێرینە"ی زایـۆنیزم لەگەڵ بزووتنەوەی سۆشـیالیزمی کـاری بەریتانی. ئەوان کوێرانە بڕوایـان بە بڕیـارەکەی کۆنفرانسـی بلاکپـوولی پـارتی کـاری بەریتـانی کردبـوو، تیایـدا داخـواز بـوو دەوڵەتێکی جوو لە فەلەسـتین دابمەزرێ. تەنانەت بەڕێز ئـاتلێ بەڵێنی ئەوەشی دابوو، دانیشـتوانە عەرەبەکـان ڕاگوێزرێ. لەو مـاوەیەی بەر لە پەلامـاری عەرەبەکـان لە ١٩٤٨دا ، ئەوە دەسـەڵاتی بەریتـانی بـوو شـێلگیرانە داوای لە عەرەبەکـان دەکـرد لە وڵات هەڵبـێن بەڵکـو دواتـر بەسـەرکەوتویی بگەڕێـنەوە. ئێـدی دەکـرا ئەوان بڵـێن کە نیـوەی بەڵێـنەکەی پـارتی کاریـان

---

[72] ئەنتۆنی ئیدن (1897-1977) سەرکردەیەکی کۆنسەرڤاتیزمەکانی بەریتانیا بوو، جێگری چەرچڵ بوو، لە میـانەی جەنگـی دوو هەمـدا وەزیـری دەرەوە بـوو، لەدوای جەنگـیش لە هەڵبژاردنـدا پارتەکەیـان دەرنەچوون.وەرگێڕ.

[73] کلێمەنت ئاتێلێ (1883-1967) ، ئێرنست بێڤن (1881-1951) دوو سەرکردەی پارتی کاری بەریتانی بوون، لە دوای جەنگ یەکیان بووە سەرۆوەزیر و دووهەمەکەشیان وەزیری دەرەوە. وەرگێڕ.

هێناوەتە دی: هەڵبەتە نیوەی دووهەمی. نیوەی یەکەمیش دەبوایە خۆمان بەدی بێنین.
هەر چۆنێک بوو ئەو ڕۆژانەی ١٩٤٥ بە ڕۆژەکانی دواتریشی یاد بکەینەوە، دەبێ ئێمە بە زەحمەت لەوە بگەین ئاخۆ چۆن سەرکردە فەرمییە جووەکان بەوشێوە بەزەیی خوڵقینە نابینا بوون، بەڵام خۆ ڕاستی ڕاستییە. کەیفسازییەکەی سەرکردە فەرمییەکان بە سەرکەوتنی پارتی کار لە ٢٩ نۆڤێمبەری ١٩٤٧دا لەوەشی تێپەڕاند، ئەو کاتەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری دابەشکردنی فەلەستینیان دا. داڤار، ئۆرگانی فەرمی زمانحاڵی سەرکردە فەرمییەکان لە ١٩٤٥دا نووسیبووی: "سەرکەوتنی پارتی کار، کە لە هەڵمەتی هەڵبژاردنیدا ئاڵای زایۆنیزمی ڕاشکاوانە هەڵدابوو، ئەوا سەرکەوتنێکی بێ گرێوگۆڵی داخوازییەکانی زایۆنیزمە لەنێو بیروڕای بەریتانییدا."
ئەو پیرۆزباییە گرانبەهایەش بۆ سکرتێری پارتی کاری بەریتانی نێردرا:
"لە کانگای دڵەوە سڵاو لە سەرکەوتنە نایابەکەتان دەکەین. کرێکارانی فەلەستین لەبارەی پلەوپایەی بەرپرسیارێتی نەتەوەیی و نێونەتەوەییدا بە دۆستایەتی متمانەوە نموونە بەرزەکەی ئێوە بە پێشەنگ دەگرن. ئێمە بڕوامان بە جێبەجێکردنی نەخشە مەزنەکەتان هەیە، دەمودەست کار بۆ ڕزگارکردنی پاشماوە ناسۆرەکانی گەلەکەمان دەکەن و نیشتمانێکی سەربەخۆشمان بۆ بنیاتدەنێن."
وێڕای ئەو وتارە شاد و برووسکە پەرۆش و بە جۆشانە، لەوێدا وتار و لێدوانی بارگاوی لێوانلێو لە بەڵێنی مژدەدەرانە (مەسیا)ش هەبوون. تەنانەت لەوێدا لەسەر شەقامەکانی تەلئەبیبدا شای و لۆغان بوو. بەکورتی: گوایە سەرکەوتنی پارتی کاری بەریتانیا، سەرکەوتنی ئێمە بوو. دەستەکەی ئاتلی-بێڤین گەیشتنە ئەوپەری پێگەی بەرپرسیارێتی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی، ئیدی دەبێ جووەکانیش دڵخۆش و کەیفساز بن.
مایەی سەرنجە لەو بوارە بەراوردێک سەبارەت بە کاردانەوەی سەرکردە فەرمییە جووەکان لەگەڵ یاخیبووەکان کە لەژێر زەمینداببوون گوایە "ئاسۆی ڕوانینی سیاسیانەیان" کورتهێنە، بکەین. لە کاتێکدا خەیاڵپلاوی ئەوان دەهۆڵی

گەشبینیان دەکوتی، ئیرگون زڤای لیومی ئەو ڕاگەیاندنامەی خوارەوەی بڵاوکردەوە:
"لە بەریتانیا پارتی کار گەیشتە دەسەڵات. بەر لە دەسەڵات پارتەکە لە خۆی گرتبوو کە باری لاری وڵاتی ئیسرائیل راست بکاتەوە بەوەی ئیسرائیل بکاتە دەوڵەتێکی سەربەخۆ، کە هەموو دوورخراوە زایۆنەکان، ئەوانەی بۆ زایۆن بە پەرۆشن، بۆی بگەڕێنەوە.
"ئەمەش خۆی لە خۆیدا واتای زامنی دەستەبەرکردنی ئامانجە نەتەوەییەکانمان ناگەیەنێ. گەلی جوو کە لە ژان و ناسۆر ڕاهاتووە، پەندی لە ئەزموون وەرگرتووە. پیاو و لایەنەکانی لە ئۆپۆزسیۆنن... ئەوە بیست و پێنج ساڵە زۆر بەڵێن دەدەن و پابەندبوونی ڕوونوئاشکرا لەخۆ دەگرن. کاتێکیش دێنەسەر دەسەڵات لە گفتەکانیان پاشگەز دەبنەوە و دەگەڕێنەوە سەر قەوانە کۆنەکەی پێش خۆیان. ئاکامەکەش بەتاڵانبردنی وڵاتەکەمان و لەناوبردنی خەڵکەکەمان بووە. ئەو ئەزموونەش کە بە شەش ملیۆن گیان لەسەر گەلی جوو کەوتووە، فێریکردین **تەنها** بە شەڕی ڕزگاری، سەربەخۆیی و مانابەخش، سیاسەت و هۆکاری نێودەوڵەتی دەجوڵێنێ و ئازادی بۆ گەلە چەوساوە و فەوتاوەکەمان دێنێ.
"ئەم دەرهاوێشتە مێژووییە کە دەیخوا. خەباتەکەش کە گەنجەکان ... تێوەی گلاون، بۆ ئەوە نەکراوە کە "ڕاگەیاندننامەی دۆستانە"ی یان "فەرمانی هەڵوەشانەوە"ی بەدوادا بێ. بەڵکو خەباتەکە بۆ ئەوە بەرپاکراوە، ئامانجە بنەڕەتییەکە دەستەبەر بکرێ: ئەویش دامەزراندنی دەسەڵاتی جووە لەسەر خاکی جوولەکان. ئەمەش بەردەوام دەبێ تا ئامانجەکە بەدی دێ. هەر بۆیەشە ئێمە چەکەکانمان دانەناوە. هەر لەبەر ئەوەشە، وێڕای هەڕەشە و گوڕەشە، بەبێ ئەویش، ئێمە لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژانەی ڕابردوو چووینە نێو قۆناغی چڕکردنەوەی ئۆپەراسیۆنەکان.
"لێ لە ژێر ڕامانی ئەو ڕاستییەی کە هەموو ئەندامانی حکوومەت، وەک ئەندامانی پارتی کار، ئەوەیان لەخۆ گرتووە، کە بەرنامەی بە لێشاو گەڕانەوە بۆ خاکی باب و باپیران، بۆ زایۆن و دامەزراندنی دەوڵەتێکی جوو هەبێ، ئێمە وای دادەنێین ئەرکی ئێمە لەوەدایە دەرفەتێکیان بدەینێ ئاخۆ ئەوان لەسەر

ڕێی پێشینەکەیان -ڕێگای حاشایی و ناپاکیی- دەڕۆن یاخود مەبەستیان بەجێگەیاندنی لەخۆگرتنە گشتیی و بەشکۆکەیانە بەبێ دواکەوتن.
"لەبەرچاوی زانینی تەنگژەی گەلەکەمان، هەر تەنها ماوەیەکی کورتە -چەند هەفتەیەک هێشتا نەبۆتە مانگێکیش- ئەوە داوا دەکرێ ئاخۆ ئەوان بڕیاردەرن لەسەر ئەوەی گفتولفتیان ببێتە کردار؛ یان هەروەکو زۆر ئەندێشە مەرگبارەکانی گەلی جوو ئەوەش بخرێتە سەر ئەوانی دیکە، لەوانەیە دوا خەیالپلاوی کە لەناو بچێ بەوەی هەموو بەیەکەوە هاوارمان دەکرد، بەرەو جەنگ، شەڕ تا کۆتایی، شەڕ تا سەرکەوتن."
هێشتا چەند هەفتەیەک تێنەپەڕیبوون و بەڵگەکە سەلمێندرا. بێڤین دەمی کردەوە و شەکری شکاند و جیهانیش لەناو گوێی ساویلکەیەتیدا تەقڵەی لێدەدایەوە. خەونی چلەی هاوینیش بەسەرچوو. نە بەڵێنی پارتی کار، نە بڕیارەکەی کۆنفرانسەکەیان لە بلاکپوول، نە دۆستایەتی و نە هیچ. هەر مستەکۆڵە کۆنەکەی بەریتانی مایەوە، بێڤینیش وەک کەسێکی ناحەز بە جوو وەک پێشینەکانی دەرچوو.
ئەو بێئومێدیە سەختترین و شەرمەزارترین قۆناخی ڕۆژگاری دژە شۆڕشی بەریتانی بوو. سەرکردەکانی ئاژانسی جووەکان لەوە تێگەیشتن، ناتوانن چیدی هاوکاری ئەو "دەسەلاتدارانە" بکەن. فەرمان درا چی دیکە سەرکۆنەی ئێرگون نەکرێ، دەستیشیان لەو گیراو و ڕفێنراوانە کردنەوە کە لایان بوون. هاگانا فشارەکانی خۆی خاوکردنەوە. یەکەمین ئاماژەی هەستپێکراو بۆ دامەزراندنی بەرەیەکی یەکگرتووشمان درا.
سەرەڕای تالاویی ئەو ئەزموونەی چێشتبوومان، ئێمە دەمانزانی دەبێ تینوتاو بدەینەبەر خۆمان و دەستمان بۆ ئەو ئامانجە درێژ بکەین کە هەمیشە سەوداسەری بووین؛ جەنگێکی یەکگرتوو، بەرەیەکی یەکگرتوی جوو دژی چەوسێنەر. ئاخر، ئێمە چ قوربانی و کوێرەوەریەکمان لە پێناو گەیشتنە ئەو ئاکامە نەبینی؟ بە ڕاستیش، یەکێ لە هۆ یەکلاکەرەوەکان بۆ ئەو دان بەخۆدا گرتنە سەرسوڕهێنەرە بڕوابوونمان بوو بە حەتمیەتی بەرەیەکی یەکگرتوو. هەنووکەش ڕۆژەکەی هات. ئیدی قوربانیەکانمان بەفیڕۆ نەچوون. هەموو پیاوێک چ ئەوانەی ناپاکییان دەرهەق کرابوو، چ ئەوانەی پشت دیوارە

تەلبەنـدەکانەوە، ئەوسـا چ لە وڵات یـان لەسـەر خـاکی بێگـانە، دەمودەسـت پشتگیری بڕیارەکەیان کردین.
ئیدی بێ هیچ خۆپارێزیەک بە بنەمای جەنگانێکی یەکگرتوو قایلبووین. لێ ئێمە نەماندەتوانی دەستبەجێ بە دانوستان رازی بین. ئاخر هێشتا هاگانا یەکێ لە پیاوەکـانی ئێمەی لابـوو، ئێلیـازەر، ئەو جەنگـاوەرە دێـرینەی ژێـر زەمینیمـان لا مـابوو. ئەو هەلـومەرجەی کە تێیـدا ژیـانی بەسـەربردبوو، بەتەواوی باری لەشساغیەکەی دارزاندبوو. کەچی ئەوان هەرگیز نەیانتوانی گیان و ورەی بشکێنن. ئێمە بە ئەفسەرەکانی هاگانامان گوت، ئێمە گفتوگۆ لەسـەر هـیچ ڕاگەیانـدنامەیەک نـاکەین، تـا ئەو کـاتەی 'بـاری ڕاوەدونـان' بەردەوام بـێ، یـان تـا ئەو دەمەی ئێلیـازەر هێشـتا هەر گیـرا بـێ. ئەوان نەیانـدەتوانی ئەو پیاوانەمـان بـۆ بگەڕێننەوە کە ڕادەستی بەریتانییەکانیـان کردبوون، بەڵام ئێلیازەر هێشتا هەر لەبن دەستی ئەواندا بوو. ئێمە هەمـوو سازشێکمان ڕەتکردەوە، لە دواییدا ئەوانیش قایلبوون. لە ڕۆژێکی ڕووناکدا ئێلیـازەر دەرکەوتەوە، بـۆ ئەوەی کـاروانی سـەرچڵیە کـاراکەی لە هەنـدەران دەست پێبکاتەوە.
ئێلیـازەر لەگەڵ ئەفسـەرێکی دیکەمـان بەنـاوی هانانیـا بە کەشـتییەکی نەوت هەڵگر ئاودیوی ئیتالیا کران. ڕێنمایی ئێلیـازەر ئەوە بـوو ئێرگون لە هەندەران ڕێکبخا و نەخشەی گەڕاندنەوەی جووەکان دەست پێبکاتەوە. ئێلیازەر هەمـوو هەولێکی بـۆ جێبەجێکردنـی ئەرکەکەی دا. ئێرگـون لە هەنـدەران هەڵسـایەوە. هەروەهـا وەک هێزێکـی پاڵپشـت بـوو لە هەنـدەران و لە پشـت هـێڵە سنوورییەکانی ئێرتـز ئیسـرائیلدا تـرس و لەرزی خستە دڵی دوژمنەکانمـان. هەروەهـا هێـزەکەی وەک هێزێکـی یەدەگ بـوو بـۆ یەکەکانمـان لە ئێرتـز ئیسرائیل. لێ بە هۆی کەشوهەوای 'بەقاچاخ هێنانی کۆچبەران' ئێمە تووشی نـامرادییێکی زۆر بـووینەوە. لە ئیتاڵیـا ئێلیـازەر داوای دوو کەشـتی کردبـوو. کۆمیتەی عیبری بۆ ڕزگاری نەتەوەیی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کرێـی شـەمەندەفەرەکانی حکـوومەت لە هـادێرا کەرەسـتەی پێویسـتیان خستەبەردەست، بەڵام ئاژانەکانمـان و بەڵێندەرەکە بـوونە قوربـانی پرسێکی تۆڵەسـەندنەوە، کە هـیچ پەیوەنـدییێکی بەئێمەوە نەبـوو. یەکێ لە گەمیەکـان ئـاگری تێبەردرا، ئەوی دیکەشـیان وێرانکـرد. ئیـدی کـاری گەڕانـدنەوەی

جووەکـــان، کە بەر لە جەنگـــی دووهەمـــی جیهـــان دەســـتکەوتی باشـــی بەدەســتهێنابوو، دژوارانە پەکی کەوت. دوای ئەو شکستەی ئیتالیا، نزیکەی دوو ساڵی خایاند تا جارێکی دیکە کۆمیتەی عیبری بۆ ڕزگاری نیشتمانیی لە بەدەستهێنانی کەشتی (بێن هێخت) سەرکەوتوو بێ. (بێن هێخت) نزیکەی هەزار کـــۆچبەری گەڕانـــدەوە خـــاکی نیشـــتمان، ئەوانـــیش وەک زۆر لەگەڕاوەکانی دیکە ، لەو کاتدا ڕەوانەی قوبرس کرابونەوە.

ئەو شکست و سەرکەوتنانەی هەندەران (دیاسپۆرا) هێشتا ئەوێ دەمێ، ڕۆژانی 1945 کاتێ ئێلیازەر لە ڕفاندنەکە ڕزگار کرا، خۆیان لە ئاسۆی ئایندەدا حەشـــاردابوو. ئەوێ ڕۆژێ تەنهـــا وەبەر کەیـــف و خۆشـــی رادەگەیشتین. دوا کۆسپی بەردەم کۆبوونەوەی ئێمە و هاگانا تەخت بوو، ئیدی ئەو کۆبوونەوەش بەئامادەیی قسەکەری هەرسێ ڕێخراوە چەکدارەکە بوو. نوێنەرانی هاگاان مۆشێ سنێهی کۆنەدۆست و ئیسرائیل گالیلی بوو، کە بۆ یەکەم جار بوو بینیم. نوێنەری F.F.I یش ناتان فریدمان بوو، منیش لە جیاتی ئیرگون زڤای لیومی بووم. ئەمجارەیان هیچ ئاگادارینامەیەک لەگۆڕێدا نەبوو، هەروەها قسەش لەبارەی 'لەناوبردن' نەبوو. گفتوگۆمان لەبارەی یەکێتی جەنگانی هیوای گەل بوو.

3

سنێ و گالیلی پێشنیازی تێکەڵاوکردنەوەی سەرلەبەری هەموو ڕێکخراوە چەکدارییەکانی کرد. ئەوان جەختیان لەسەر کۆمەڵێ بەڵگەوبەند کردەوە، بەڵام سەرەکیترین بەڵگەوبەندیان دەربارەی پێکهێنانی "بزووتنەوەی بەرگری جوولەکە بوو".

"هاگانا" وەک ئەوان گوتیان، "لەگەڵ کتێبی سپی حکوومەت دەچێتە شەڕ. باشە بۆچی ئێوەش نایەنە ریز؟ سووربوونی ئێوە لەسەر ئەوە بوو، گەر هاتوو ئێوە بەرەنگاری بەریتانییەکان ببنەوە، ئەوا ئامادەن بە دیسپلینەکانی ئێمە قایل بن. هەنووکەش کاتی ئەوە هاتووە. ئێمە دەستمان بە شەڕەکە کردووە و بەدڵنیایشەوە لەسەری بەردەوام دەبین. ئەوەش نەوەک لە ڕووی رامانی دیسپلینی نەتەوەییەوە ئەرکتانە، بەڵکو خودی بنەکامانی خۆشتان ڕێگاتان دەدەن پاڵ بدەنە پاڵ هاگانا، کە تیایدا یەکەکانتان دڵنیا دەکەنەوە، لە قۆناخی گواستەنەوەدا ئۆتۆنۆمییکی پلە باڵای هەبێ."

ناتان فریدمان پاشتر پێگوتم، دەکرا ئەو بە پێشنیازەکەیان قایل بووبا، بەڵام فەرماندەی ئیرگون دەستی بە مشتومڕێکی بەراییانە کرد. ئێمە ئامادەبووین لەگەڵ هاگانادا بجەنگین؛ لێ سازوتەیار نەبووین لەژێر عەبای 'یەکێتیدا' هەڵبوەشێینەوە. مـن بـۆ سـنیە و گـالیلی بـاری جیاوازییە سیاسـیی و ڕێکخراوەبەکانی نێوان هاگانا و ئیرگونم ڕوونکردنەوە. هاگانا خۆی بەوە هەڵدەدایەوە، کە لەژێر فەرمانی ئاژانسی جووەکاندایە. ئێمەش ئەو پەیوستیەمان بە ئەگەرێکی یەکلاکەرەوەی بەهەند هەڵگیراوی بەربەستی سەر ڕێی خەباتی ڕزگاریخوازانە لە قەڵەم دەدا. ئاخر بۆ بڕیاردان لەسەر خواستی هەر ڕێکخراوێک بۆ مانەوە و پەرەسەندنی، قانونی سروشتی هەن. ڕێکخراوێکی قانونی، دانپێدانرا و "ڕێزلێگیراو" هەوڵ دەدا هەر بە قانونی، دانپێدانرا و ڕێزلێگیراو بمێنێتەوە. هەرچی ڕێکخراوێکی قاچاخی، میلیشیایی ڕاوەدونراو هەیە بە دوای بەدیهێنانی ئامانجەکانی دەڕوا کە لە ڕاستیدا مێلیشیایی و ڕاوەدونانە. لە نێوان هەوڵوتەقەللای سروشتیانەی ئەو ڕێکخراوانەدا کێشەیەکی بابەتیانە هەیە. دەکرێ ئیرادەی تاکەکان نەرم یان توندی بکاتەوە، بەڵام ناتوانی هەڵیوەشێنێتەوە. ئەم بەیەکدادانەی ئامانجەکان شتێکی حەتمیە، کە هەر بە یەک لەم دوو ڕێگایانە خوارەوە کۆتایی پێدێ: ئەوسا ئەو ڕێکخراوە قانونییە ڕێکخراوی قاچاخ ناچار بکا خەباتەکەی بوەستێنێ چونکە ئەمە دەبێتە مایەی لەرزۆک کردنی پێگە قانونیانەکەی ڕێکخراوەکە، یاخود ڕێکخراوە مێلیشیاییەکە پەیوەندییە شل و خاوەکانی کە پابەندە بە ڕێکخراوە قانونێکە دەهەژێنێ. لەوە زیاتر ڕێگای سێهەم لە گۆڕێدا نییە.

تەنانەت ریچارد جرۆسمانیش لەم هەڵسەنگاندنە گەیشتبوو. لە کتێبەکەی 'ئەرکی فەلەستیندا' لەسەر ڕاسپاردەی بەڕێز بنگۆریۆن بەر لە کۆمیتەی بەدواداچوونی ئەنگلۆ-ئەمریکی نووسیبووی:

"لە وەڵامی پرسیارەکەی مانینگهام —بوللەر کە لەگەڵ د. وایزمەن کۆک بوو بۆ ئیدانەکردنی توندوتیژی، ئەو گوتی لەگەڵ ئەو شتەدا هاوکارە؛ بەڵام کاتێک باس لە ڕەوشی هاوکاری ئاژانسی جووەکان سەبارەت بە سەرکوتکردنی تیرۆرستەکان دێ، دەبێ واز بهێنێ چونکە هەوڵێکی بێسوودە... ئەو پێیوایە ئەو هەر دوو ڕێگاکەی بوێ بەوەی ئەو لەگەڵ

قانوننامەکە وەک سەرۆکی ئاژانسەکە بمێنێتەوە، لە هەمان کاتیشدا لێبوردەبێ دەرهەق تیرۆر وەک رێگەچارەیەک بۆ ئەوەی فشار بخرێتە سەر بەڕێوبەرایەتی. ئەمەش سیاسەتێکی گومانـاوییە. سەرکردە ئایرلەندییەکان مێشکی خۆیان یەکلاکردەوە و چوونە ژێر زەمین... من پێم سەیرە باشە بۆچی بنگۆریۆن وەک ئەوان هۆشمەند نییە و هەمان شت ناکا یاخود ڕابەرایەتی وایزمەن و نەرمڕەوەکان بپەژرێنێ کە ڕاشکاوانە و ڕاستگۆیانە پێیانوایە بەکارهێنانی توندوتیژی هەڵەیە."

ئەوسا هەڵوێستی خۆمانمان بۆ نوێنەرانی هاگانا ڕوونکردنەوە. "ئێمە ناتوانین دەستبەرداری سەربەخۆییبوونەکەمان بین" من وام پێگوتن، "بەدڵنایشەوە ئەو شتە لە قۆناخی یەکەمی تێکەڵاوبوونەکەوە نابێ. ئێمە بە گۆڕینی بیروڕاتان دڵشادین، بەڵام لە خەمی ئایندە داین. ئەمڕۆ دامەزراوە نیشتمانییەکە فەرمانی پێکردی بە شێوەیەک لە شێوەکان دژی بەریتانییەکان بوەستێتەوە. هەر دوێنێش بوو، پێیان گوتن لە دژی ئێمە شەڕ بکەن. ئاخر کێ دەڵێ بۆ سبەی چ فەرمان دەدەن؟ بڕیارەکە لەنێو لەپی ئێوەدا نییە. ئەوانی دیکە بۆ ئێوە بڕیار دەدەن. خۆ ئەگەر ئەوان ڕایان گۆڕا، ئایا ئێوە چیتان بەسەردێ، چی بەسەر ئێمە دێ، لە هەمووشی گرنگتر ئاخۆ ئەوسا چی بەسەر خەباتەکە دێ؟ من پێموایە ئێوە فەرمان وەردەگرن، بەڵام هەرچی ئێمەین، ئێمە چەندجارمان دووپاتکردۆتەوە، ئێمە دەمانەوێ تا دوا مانەوەی دەسەڵاتی حکوومەتی بەریتانی لە وڵاتدا شەڕ بکەین. ئایا ئاکام بەچی دەگا؟ دوای یەکانگیری لەیەکترازانێکی دیکە؟ ئێمە چیمان لەو هەموو ئاڵۆزیانە دەوێ؟ لێگەڕێ با ئەوەی واقیع دەیسەپێنێ بپەژرێنین. تازە هاگانا هاتۆتە نێو شەڕەکەوە. ئێمە عەیامێکە شەڕمان جاڕداوە. دە لێگەڕێ، وێڕای هەموو ئەو شتانەی لە ڕابردوو ڕویانداوە، جارێ بەرەیەکی یەکگرتوو پێکبێنین. خۆ ئەگەر ئێوە لەسەر خەباتەکەدا بەردەوام بوون، ئەوسا زەحمەت نییە تێکەڵاوی یەکدیش ببینەوە. لێ ئەگەر بە هەر هۆیەک بێ ئێوە خۆ لە خەباتەکە ببوێرن، ئەوسا ئێمە دوای نموونەکەی ئێوە ناکەوین. بۆیە ڕێککەوتنەکەی ئێمە ئاشکرا و ڕون و کردەییە، شتێکی ئاڵۆز بڵۆزی و شاراوەی خۆپارێزی تێدا نییە."

ئـێمه لەو یەکەم دانیشـتنه نەگەیشـتینە هـیچ ئاکـامێکی کردەیـی. دەبـوایە نوێنەرانی هاگانـا وەڵامـی ئێمەیـان بـۆ سـەرانی خۆیـان بردبـایەوە، لە کاتێکدا قسـەکەری ئیرگـونیش دەبـوایە لەگەڵ هـاوڕێ ژێرزەمینییەکانیـدا ڕاوێـژ بکـا. چەنـد ڕۆژێـک دواتـر کۆبـوونەوە سـێقۆڵیەکە کـرایەوە. لەو میـانەیەدا سـەرکردایەتی F.F.I ڕامـانەکەی ئێمەیـان پەسـەند کـرد، ئـێمەش بەیەوەکەوە لەسـەر یەک هەڵوێسـت ڕێککەوتـین. ئیـدی بڕیارمانـدا بەدوای سـەربەخۆیی هەبوونەکەمانـدا بـڕۆین، لـێ لەپێنـاو یەکێتـی بەرخـودان، رازیبـووین واز لە ئۆپەراسیۆنی سەربەخۆ بێنین، بەدەر لە حاڵەتی "دەستبەسەرداگرتن" نەبێ. بە پەسـەندنامەی سـەرانی ئاژانسـی جووەکـان، نـوێنەرانی هاگانـا بە پێشـنیازە بەرامبەرەکانمان قایلبوون. ئێمە لەسەر ئەوە ڕێککەوتین، لە کاتێکدا ڕێکخراوە ژێرزەمینییەکانمـان سـەربەخۆیی خۆیـان دەپـارێزن، لـێ بڕیـاری چـالاکی و ئۆپەراسیۆنی هەڵمەتبەرانە دژی حکوومەتی بێڤین بدرێتە دەست فەرماندەی "بزووتنەوەی بەرگری"یەکە،[74] بەڵام دەکرێ پێشنیازەکان لە هەر لایەکەوە بێن. بزووتنەوەی بەرگریی دەسەڵاتپێدراو بـوو ڕێنمایی بەجێگەیاندنی چالاکی و ئۆپەراسیۆن دژی بەریتانییەکان ڕووبەڕوومان بکاتەوە، ئێمەش ئـازاد بووین لە پێشـــنیازکردنی پلانـــی ئۆپەراســـیۆن، بەڵام دەبـــوایە ڕەزامەنـــدی بزووتنەوەکەمان بۆ جێبەجێکردنی وەربگرتایە. هەروەها لەسـەر ئەوەش ڕێـک کەوتـین هـیچ بڕیـارێکی ناوبژیکەرانەمـان لەنێوانـدا نەبـێ. لە کـاتی خۆشـیدا نـــوێنەرانی هەرســـێ لایەنەکە ســـەبارەت بە دۆزی سیاســـی و پرســـە سـەربازییەکان دەدوێن. هەر چـی دەربـارەی ئامـانجی ئۆپەراسیۆنەکانیشـە لە گرتنـی چەک (یـان پـارەدا) ، لە دواییـدا ڕێککەوتـین، کە ئێمە ئـازادین بڕیـاری لەبارەوە بدەین.

ئەم ڕێککەوتننامەیە لەو برووسکە نهێنییەی کە (سنێ) بۆ هاوکارەکانی خۆی لە دەرەوەی وڵاتی لێدابوو، دەنگی دایەوە. تەلیسمئاسا ئەو بروسـکەیە ڕێگـای خـۆی بـڕی و گەیشـتە دەسـتی دەزگـای هەواڵگـری بەریتانیـا، ئەوانـیش برووسکەیان قۆستەوە و شیفرەکەشیان شـکاند. ئیدی لە کتێبی سپی تـایبەت بە حکـوومەتی بەریتانیـا بڵاویـان کـردەوە. مـن دەبـێ ئەوە تۆمـار بـکەم، ئەو

[74] تا ئەو ڕادەیەی ئیرگون ئەمەی "بزووتنەوەی بەرگری" و "هاگانا" بوو، ئەو شتە هاوتای یەکدی بوون، بۆیە لەمەودوا لە بەکاهێنانی زاراوەکاندا شوێنەکانیان ئاڵوگۆڕدەبێ.

کتێبە تایبەتمەندە دەربارەی "توندوتیژی لە فەلەستین"، یەکێ بوو لەو بەڵگەنامە کەمانەی بەریتانیا لەسەر فەلەستین، کە من خوێندبێتمەوە و بەدەگمەن شێواندنی تێدابێ. لەوانەیە بەڵگەنامەی دیکەی هاوچەشن هەبن، بەلام من نەمبینیبن. کتێبی سپی ١٩٤٧ راستیەکانی لەخۆگرتبوو. هەر بۆ نموونەش، کۆپلەیەکی رادیۆی دەنگی ئیسرائیل (ئێزگەی فەرمی بزووتنەوەی بەرگری جوو)ی هێنابووەوە و ئەوەشی سەربارکردبوو، کە ئێزگەکە لەچاوی ئەوان زۆر گرنگ بوو، چونکە لە لایەن سەرۆکی هۆبەی سیاسی ئاژانسی جووەکان، بەڕێز مۆشێ شێرتۆک پەسەند کرابوو.

ئەو شتەش راستی بوو. لە یەکێک لە کۆبونەوەکانماندا پیرۆزبایی ئێزگەی دەنگی سیاسیی نایابم لە سنێ کرد. ئەویش پێزانینی بۆ پیرۆزباییەکە هەبوو، ئەوەندەشی لێ زیادکرد:

"ئایا پێت وایە من ئەم ئێزگەیەم هەر لەسەر بەرپرسیاریێتی خۆم تێپەڕاندبێ؟ موشێ شێرتۆک دەقەکەی پەسەند کردووە."

لە برووسکەنامەکانی دیکەی پەیوەست بە بەرێکخراوە ژێرزەمینییەکاندا، سنێ لە برووسکەنامەی ٢٣ی سێپتێمبەری ١٩٤٥دا نووسیبووی:

"وا پێشنیازکراوە چاوەڕوانی ڕاگەیاندنامەی فەرمی نەکرێ، بەلام داوا لە لە هەموو جوو بکەین و ئاگاداری حکوومەت بکەنەوە و ڕاپەڕینێکی ورەبەرزکردنەوە لە کۆمەڵگەکانی یوشیڤ (جوو) بەرپا بکرێ. ئەگەر تۆ قایلبی، داوا لە زیڤ شێرف بکە کەرەستە سەرەکییە پێویستیەکان...

"هەروەها ئەوەش پێشنیاز کراوە، کە ئێمە بووینە مایەی سەرهەڵدانی ڕووداوێکی دژوار. ئیدی دەبێ جاڕنامەیەک سەبارەت بە باندۆرەکەی دەربکەین کە تەنها ئاگادارکردنەوە و لێکەوتەکانی ئەو ڕووداوە زیان بە ئاسایشی بەرژەوەندیەکانی بەریتانی لە وڵات دەگەیەنێ، حکوومەتیش دژمان دەوەستێتەوە. سەربارەت بە ڕامانەکەت برووسکە لێبدەوە، هەر وەک پێشتریش ئاماژە هێما بە ژمارەی کەرەستەکانی کۆچبەرەکان هی ساڵەکانی جەنگ بکە. گرووپی ستێرن خواستی خۆیان دەربڕیوە لەسەر بەرنامەی پڕ چالاکی بەتەواوی بدەنە پاڵمان. ئەمجارەیان پێدەچێ نیەتەکە جددی بێ. خۆ ئەگەر یەکێتییەکی لەو جۆرەش هەبێ، پێموایە ئێمە دەتوانین ڕێ لە کردەی سەربەخۆیانە بگرین تەنانەت ئەگەر ئێرگون زڤای لیومیش پێی هەڵسێ.

رامانی خۆت سەبارەت بە دۆزی یەکگرتنەکە بە برووسکە بنێرە، ئاماژە بە کەرەستەکانی سەربازگرتنی سووپای جوو بکە. سنێ."
لە ١ی نۆڤێمبەری ١٩٤٥یشدا ئەم برووسکەیە:
"ئێمە خەریکی ڕێکخستنی کاریکین لەگەڵ ڕێکخراوە هەڵگەڕاوەکان، بەوەی ئەرکگەلێکی دەستنیشانکراو لەژێر فەرمانڕەیی ئێمەدا بەجێ بگەیەنن. ئەوان دەیانەوێ تەنها بەگوێرەی نەخشەکەمان بجوڵێنەوە. سنێ، شاول مێریۆف و بێرنارد یوسف ئەو جۆرە ڕێکەوتنە خوازیارە، بەڵام ناکرێ کارا بکرێ چونکە حزبەکە دەوروژێنێ. هەندێکیان دژی هەر چالاکییەکی لەو جۆرەن، بەتایبەتیش هەر ڕێکەوتنێک لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان.
لە چوارشەممەدا ئەم چالاکییەی خوارەوە ئەنجامدرا. دوو بەلەم لە بەندەری حەیفا و سێهەمیشیان لە یافا نغرۆ کران. ئەوان پەیوەندییان بە ڕاوەدوانی کۆچبەران هەبوون. ڕێگای ئاسنینی لە خاڵی ١٨٦دا پچڕێندرا. هەمووی بەسەریەکەوە ٥٠٠ تەقینەوە بوون. هاتووچۆی ڕێگای ئاسنین لە سنووری سوریا تا غەززە، لە هەیفاوە بۆ ساماک، لە لیداشەوە بۆ ئۆرشەلیم ڕاگیرا. لەو هەموو ئۆپەراسیۆنانەدا هیچ کەس نە بریندار بووە نە گیراش.
"ئەوێ شەوێ ئیرگون زڤای لیومی پەلاماری وێستگەی لیدیای دا، زیانێکی زۆری پێگەیاند و ژمارەیەک قوربانیشی لێکەوتەوە. گرووپی ستێرنیش بەدژواری پاڵاوگەی نەوتی حەیفای تێکدا و پیاوێکیش کوژرا. لە ڕووداوەکاندا پێشکات ئاگادار دەکراینەوە، ئێمە دژی چالاکییەکەی لیدا نەبووین، بەڵام ناکۆک بووین لە گەڵ هی پاڵاوگەکە. گەر ڕێککەوتننامەکە جێبەجێ کرابا دەمانتوانی ڕێگە لە زیانەکانی لیدی و ئۆپەراسیۆنەکەی پاڵاوگەکان بگرین. من ڕاستیەکە وای دەبینم کە پارتی و دەستەی بەڕێوەبەر ڕێککەوتننامەکەیان وەک تاوانێک وەخراند..."
ئەو ڕێککەوتننامەی لایەنەکان بۆ پێکهێنانی بزووتنەوەی بەرگری لەنێوان ئاژانسی جووەکان و هاگانا و ڕێکخراوە ژێرزەمینیەکان واژۆ کرا، وەنەبێ بە مەرەکەب لەسەر کاغەز نووسرابێتەوە، بەڵکو بە خوێن مۆرکرا. مەرجە بنەڕەتیەکەی کردەوە بوو. ڕێککەوتنەکە دەستبەستنێکی ناخۆشی ئێمە بوو، بەڵام نەوەک هەر لە ڕووی ڕۆحییەوە سەیرمان کرد بەڵکو وەک نامەیەکی نەنووسراو. لە نۆڤێمبەری ١٩٤٥دا تا سێپتێمبەری ١٩٤٦ تا ئەو کاتەی هاگانا

له شەڕکردن وەستا، ئێمە تەنها بە پەسەندنامەی سەرکردایەتی بزووتنەوەی بەرگری پەلاماری بەریتانییەکانمان دا، هیچ کار و چالاکییەکمان بەبێ قایلبوونی پێشکاتی ئەوان نەکرد، بەدەر "ئۆپەراسیۆنی دەستبەسەرداگرتن" نەبێ، کە تیایدا ئێمە بەگوێرەی ڕێککەوتننامەکە لەو جۆرە ئۆپەراسیۆنانەدا دەستکراوە بووین.

یەکێ لە ئۆپەراسیۆنەکانی دەستبەسەرداگرتندا بەر لە ڕێککەوتننامەی چالاکیەکان بەرکار بوو. کاتێک هێشتا هەر خەریکی گفتوگۆی مەرجەکانی ڕێککەوتننامەکە بووین، یەکێ لە یەکەکانمان دزەی کردبووە نێو مۆڵگەیەکی سەربازی لە ڕێهۆڤوت، ئەو یەکە بەریتانییەی لە جووەکان پێکهاتبوو دابەزی بوون، لەوێ نەبوون، ئیدی بەبێ خوێن لە کەپوو هاتنی هیچ سەربازێکیش، چەند سەد تفەنگێک، نزیکەی دەرزەنێک تفەنگی برین، ژمارەیەک ڕەشاش و ژمارەیەکی بەرچاوی فیشەک و کەرەستە سەربازییەکانیان دەستکەوت بوو. دەنگی ئێزگەی kol israel بە توندی ئیدانەی ئۆپەراسیۆنەکەیان کرد. سنێ و گالیلیش سەبارەت بە ئەنجامدانی چالاکییەکە سەرزەنشتیان کردین، کە چۆن شتێکی وا دەکەین، لە کاتێکدا لە گەرمەی دانوستاندان بۆ ڕێککەوتن. ئەندامانی F.F.Iیش لە سەرێکی دیکەوە، گلەیی ئەوەیان لێ کردین، ئاخۆ بۆچی ئەوانیشمان لە چالاکییەکەدا بەشداری پێنەکردبوون.

پێگەکەی ئێمە شادیهێن نەبوو. ئێمە نەماندەویست ناڕاستی بە هاوڕێیانی چەکمان بڵێین؛ بەڵام خۆ هەر نەشدەکرا ڕاستیەکەیان پێبڵێین. ڕاستی شتەکە بۆ ئێمەش لەناکاو بوو. ئۆپەراسیۆنەکەی ڕێهۆڤوت بەگوێرەی فەرمانی فەرماندەییەکەمان جێبەجێکرا، بەڵکو لەسەر دەستپێشخەری ئەوانەی بەشداریان تێداکردبوو، کرا. کۆمەڵە ئەفسەرێکی لاو، لەنێویاندا باشترین خۆبەخشی ئیرگون هەبوون، لەوە دەترسان نەوەک نەخشەی چالاکیەکەیان لێ قەدەغە بکرێ. وایان قۆستەوە ئەو چەکە گرنگانە دەست بەسەردابگرن بیخەنە جبەخانەکەمان و هەرواشیان کرد.

ئەوەش بەزاندنی سنووری دیسپلین بوو کە ئێمەی خستە ڕەوشێکی زەحمەت. لەبەر ئەوە چەند جارێک لۆمەی هاوڕێ گەنجە لەخۆبردووەکانم کرد. بە گوێرەی قانونی پلانگێڕیش من لەپشت پەردەکە بووم و وشەی لۆمەدارانەم هەڵڕشتن. بەڵام لەدڵی خۆمدا... هەستەکانم تێکەڵەیەک بوو. بیرم

کەوتەوە لە مێژووی کۆنی ئیمپراتۆری نەمساویدا پیاهەڵدانێ تایبەت بە کردەوەی پاڵەوانانەی هەیە، کە لە لایەن سەربازەکانەوە ئەنجامدرابوو، کەچی دیسپلینی سەربازیان شکاندبوو.
لەنێو ئەو کەسانەی لەو چالاکیەی ڕێهۆت بەشداربوون، زۆریان ڕۆڵێکی قارەمانانەیان لە خەباتی ڕزگاریخوازیدا وازی کرد. لەنێو ئەواندا کەم نەبوون ئەوانەی جارێکی دیکە هەرگیز نەمبینینەوە... هیوادارم لەو وشە تاڵە لۆمەکردنانەی دەرم برین بمبەخشن، کە بەهۆی ڕاپەڕاندنی ئەرکەکەم ئەوێ شەوێ دەرم برین. ئەوەش تاکە ئۆپەراسیۆن بوو لەو هەموو ساڵانەدا بەبێ پەسەندنامە و ڕێنمایی فەرماندەی باڵای ڕێپێدراو، ئەنجام درابێ. خۆ ئەگەر دیسپلین لە هەموو سوپایەکدا گرنگ بێ، ئاخر چۆن لەنێو سووپای یاخیبووندا گرنگ نییە کە بەدژمن و نەیار دەورە درابن؟ ئەوانەی دەستیان بەسەر چەکەکانی ێهڤۆتدا گرت، دەرکیان بەوەکرد و دەشزانم هاوبەشی خەم و مشورخۆرم بوون. لە ڕاستیدا دەبوایە لە جیاتی سەرزەنشتکردن میدالیای شانازیان بە بەرۆکەوە کرابایە. یان هەر دووکیان بەیەکەوە؟ ئەوان سەرۆکۆنە کران، بەڵام ئەدی میدالیاکە؟ لەنێو سووپای ژێرزەمینیماندا میدالیان نەبوو؛ جەنگاوەرەکانمان لە کردەوەکانیاندا تەنها بەئاگایی و ویژدانی ئەرکەکانی خۆیانەوە پاداشت دەکران. ئەوەش ئەو میدالیایە بوو درایە ئەو دەستە بێدسپلینییەی ڕێهۆڤێت. ئەرێ ئەو تفەنگ و ڕەشاشی بێرنانە چ سوود و کەلکێکیان بۆ کارو چالاکی ڕزگاریخوازی هەبوو!

## 4

شەڕی هاگانا لە دژی بەریتانیا لە نۆڤێمبەری 1945دا تا تەموزی 1946 نۆ مانگی خایاند. هاوکاریشیان لەگەڵ ئێمەدا دە مانگی ڕەبەق بوو، ئەویش هەر لە نۆڤێمبەرەوە تا کۆتایی ئاب. هەر دوو هەفتە جارێکیش کۆنفرانسی یەککرتوومان دەبەست. بەر لەوەی لەسەر هەر لەشکرکێشییەک ڕێک بکەوین، کۆبوونەوەیەک لەنێوان ئەفسەرانی ئۆپەراسیۆنەکان دەکرا. هەڵمەتەکەش بەیەکەوە لە لایەن یەکەی هەڵمەتبەری ئێمە و F.F.Iیەوە دەکرا، کە نەخشەکەی لەلای ئێمەوە داڕێژرابوو. بە بەردەوامیش ئێتان نوێنەرایەتی ئێمەی لە کۆنفرانسی ئۆپەراسیۆنەکاندا دەکرد، دوای ئەوەی ئەویش گیرا ،

گیدۆن جێگای گرتەوە. هەندێک جاریش ئورفی، ئەفسەری ئۆپەراسیۆنی F.F.I، ئامادەی ئەو کۆنفرانسانە دەبوو. ئەو نەخشانەی لەوێدا دەمانخستە ڕوو، لەگەڵ ئیتزاک سادیە نوێنەری هاگانا تاوتوێ دەکران. (سادێ) هەرگیز خۆی بە وردەکاریی ئۆپەراسیۆنەکان خەریک نەدەکرد. ئەو لە سەرهێڵە سەرەکییەکانی دەپرسی و دەشبووایە بە گشتی نەخشەی چالاکیەکە لە ڕاژەی ئامانجەکانی ئەفسەرانی ئۆپەراسیۆنەکان بوونایە. هەمیشەش پەسەندنامەکەی دەدایە ئیتان یان گیدۆن، بەدەر لە ئۆپەراسیۆنی یەکەم، ئەوەی لە دژی وێستگەی هێڵی ئاسنینی لیدیا کرا، کە پەسەندنامەکەی بە نووسین درایە فەرماندەیی ئیرگون. ئەوەیش لە ڕێکەوتی 25ی ئۆکتۆبەردا بوو، تیایدا هاتبوو:

١- قەبارەی یەکەکە و چەک و تفاق و پێگەکەی بۆ ئامانجەکە لەبارە (بەدەر لە هاوەنەکە کە لەو هەلومەرجەدا کاریگەر نابێ). ئەگەر هات و پاسەوانەکان هێزی پاڵپشتیان بۆ بێ، ئەوا پێویست ناکا یەکەکە بە جەنگاوەران زیاد بکرێن، بەڵکو چڕی ئاگری چەکەکان زیاتر بکرێ.

٢- نەخشەکە دوو بەشە: (ئا) ناوچەکەی نێوان ڕەزەکە و کووخەکان. (ب) ناوچەی کۆڵیت و کووخەکان و تونێلەکان. تەنها بەشی یەکەم (ئەوەش بە بێ زیانگەیاندن بە تونێلەکان)دەبێ بە لەبەرچاوگرتنی تاکتیکەوە جێبەجێبکرێ. ئەم بەشەیان دەکرێ بە شێوەیەکی تەواو لەناکاو و سەرسامهێن جێبەجێبکرێ چونکە پاسەوانەکان ئەو ناوەیان خستۆتە بەرچاو، بە ئاسانیش دەتوانن بەرگرییەکی سەخت بکەن. لەو هەلەمەرجەشدا تا ڕاددەیەک ئەستەمە ئۆپەراسیۆنەکە بە هەمان ڕێگا لە تونێلەکان ئەنجام بدرێ.

٣- خودی ئامانجەکە -تونێلەکە- بایەخێکی وا زۆری نییە و ڕەوایەتیش ناداتە هەر لەڕێ لادانێکی تاکتیکی لەو قۆناخەدا.

٤- بە ئەنجامگەیاندنێکی سەرکەوتووانەی ئۆپەراسیۆنەکە لەوانەیە لە ڕێی برانی تەزووی کارەباوە کە لە ڕێی شۆرتی سلکێتەکە یان هەر ڕێگایەکی دیکە بێ، کارئاسانی بۆ بکا.

٥- ئامادەی ئەوەبن بەسەر پاسەوانەکاندا زاڵ بن، بێ ئەوەی چەک بەکاربێنن.

له دواییدا: ئێمه پێی لەسەر ئەوه دادەگرین، كه ئێوه بەلای كەمییەوه ٤٨ سەعات پێشتر ئاماژەی دەستپێكردن وەردەگرن. ئێمه هەموو زانیارییەكتان دەستبەجێ به جێبەجێكردنی ئۆپەراسیۆنەكه دەدەینێ."
له سەرەتای یەكەمین ئۆپەراسیۆنی بەیەكەوه خۆشحاڵییەكی زۆری بەخشییه تەواوی ڕێكخراوه جووەكان. وتارێكی ڕۆژنامەی هێروت بەخێرهاتنی ئەو پێشهاتەی كرد و نووسی: "ئەو گەنجانەی كوتەكی ڕێگای خەباتی ڕزگاریان به جەستەی خۆیان شكاند":
"ئاخر ئێمه بەرگەی چیمان له ماوەی ئەو ساڵانەی به تەنیا لەمەیدانی جەنگان مابووینەوه نەگرت، كه ئاڵای سەربەستی لەنێو دەستماندا بوو ئاگری بڕواش له دڵماندا كڵپەی دەسەند؟ ئەرێ قوربانی زۆرمان نەدا؟ چەندانمان لێ بەربوونەوه، چەندان نەگیران و نەخرانه زیندان و دوور نەخرانەوه؟ لەوەش زیاتر، ئایا مانگەكانی ڕاوەدونانتان لەبیرنەماوه؟ ئەرێ ئەو هەڵوێسته "بولێڵەی"كه له له بەرامبەر دژوارترین هەڕەشەی مێژووماندا لەسەرمان بوو، گرتبوومانەبەر؟ تەنانەت لەو ڕۆژگارە شێتانەیەشدا ئێمه هێشتا ئەو بڕوایەمان له دەست نەدا، كه ڕۆژێك دادێ له پاڵ یەكەوه وەك دوو برا دەجەنگین. ڕۆژەكەش هات... ئێمه به خاكەڕاییەوه شوكرانەبژێری خواوەندی ئیسرائیلین بۆ چاندنی ئەو بڕوایه لەنێو دڵماندا، بۆ ئەو لێكتێگەیشتنه و ئەو خۆشەویستییه زۆرەی، كه وای لێكردین له براكوژی دوور بكەوینەوه و ڕێگەی خەباتی ڕزگاری بۆ ئاسان كردین."
لێ ئەو هێرشەی كرایه سەر وێستگەی هێڵی ئاسنینی لیدیا كه به سەركەوتوویی كۆتایی هات، دەكرا به ئاسانی به شكست یان به ئاكامێكی فەلاكەتبار بۆ هێرشبەرەكان كۆتایی پێبێ. یەكەی هەڵمەتبەرمان لەگەڵ یەكەی F.F.Iدا بەبێ ئەوەی هیچ زانیارییەك سەبارەت به ئۆپەراسیۆنی تەقاندنەوەی سیستەمی ڕێگا ئاسنینەكه، كه له لایەن هاگاناوه، هەر سەعاتێك دوای نیوەی شەو له لایەن هاگاناوه كرابوو، گرتەبەر. ئێمەش لەسەر پێدانی ئەو جۆره زانیارییه سوورنەبووین و و ڕێككەوتنی نێوانیشمان هیچ وردەكاریی و برگەیەكی دەربارەی ئەو شته تێدانەبوو. ئێمه پێمان وابوو تێبینییەكی لەو جۆره زیادەیه. ئاكامەكەشی بەوه كەوتەوه، كاتێ یەكەكەمان گەیشته لیدیا – دوای هەندێ وەخران، ئەمەش بەهۆی ڕێگاكەیانەوه بوو، دەبوایه به پێی له

پێتـاه تیکڤـاوه چووبـان- ئەو تەقینـەوانەی زیـاتر لە دوو سـەد خـاڵی لە سەرتاسـەری وڵات گرتبـووەوە، لەوپەڕی کـارایی خۆیـدا بـوو. هاگانـا ئەو چالاکیانەی ئەنجام دابوون. هەندێکیان لە لیداوە دەبیسـتران، ئیدی هێزەکانی بەریتـانیش ڕێگـای ئاسنینەکان باشـتر خسـتبووە ژێـر چـاودێرییەوە. بـاری ئاگاداری تەواوی بنکەکانی پۆلیسی گرتبووەوە و هێزی سـەربازیش لەسـەر ئەو ڕێـیە دامەزرابـوون کە پیاوەکـانی ئۆپەراسـیۆنەکە بـۆی دەچـوون. دژوارییەکە قەبە بـوو. هەرچەنـدە ئیتـان -دوای ئەوەی هەلـومەرجەکەی بـۆ پیاوەکـان ڕوون کردەوە، ئەوانیش جۆشوخرۆشـی خۆیـان دەربڕی و بەرەو وێستگەی هێڵی ئاسنینی لیدیا بەڕێکەوتن- بڕیاریـان دا لە سـەر پەلامـاردانەکە بەردەوام بـن. دیـاربوو هەلـومەرجی پێشـتر بەتەوای گۆڕابـوو، نەشـدەکرا پەلامارەکە بە گوێرەی نەخشەی بۆ داڕێژراو ئەنجام بدرێ. دەبوایە بەسـەر بەرەنگـارییە بەهێـزەکەی دوژمـن زاڵ بـن. ژمـارەیەک سـەربازی بەریتـانی کوژران و بریندار بوون. ئێمەش زیانی قورسمان لێکەوت، یەکێک لە باشـترین ئەفسـەرەکانمان کوژرا. لەگەڵ ئەوەشدا دامەزراوەیەکی گرنگی هێڵی ئاسنین خاپوورکرا، بەمەش ئامانجی تاکتیکەمان بەدیهات.

لـێ ئەمە تەنهـا نیـوەی ئەرکەکە بـوو؛ خـۆ هێشـتا دەبـوایە کوڕەکانمـان بە سەلامەتی گەڕاندرابانەوە بنەکەیان. ئەمەش کارێکی ئاسان نەبوو، گەزەنگی بەیـانیش دادەهـات. ڕێگـاش بە دەوریە چەکـدارییەکان تەنرابـوو، بەدوای "تیرۆرسـتان"دا دەگەڕان. هەڵـبەتە پیاوەکـانی ئـێمە دوای شـەوەکە و شـەڕەکەیان، لە گەڕانەوەیانـدا تووشـی چەنـدان دەوریەی گەڕۆکی بەریتـانی بووبوون، لـێ هەوڵیـان دابـوو خۆیـان لـێ بپارێزن. لە کۆتاییدا ئیتـان تـوانی یەکەکە بە سـەلامەتی بگەیەنێـتە بـنکەی پێتـاه تیگڤـا. لە ئێـوارە درەنـگ و شەویشـدا ئیتـان و پیاوەکـان دەیـانزانی ئێمە چەنـد لە تـرس و دڵەڕاوکێ و مەراقی گەڕانەویانـدا دابـووین، ئیتـان ڕاپـۆرتی شـەڕ و زیانەکـان و سـەختی کشانەوەی پێراگەیاندم.

چەند ڕۆژێک دواتر، لە کۆبوونەوەیەکماندا لەگەڵ نوێنەرانی هاگانا، پەنجەمـان خسـتە سـەر ئەو خـاڵە، بەوەی پێمـان گـوتن لەوانەبـوو ئۆپەراسـیۆنەکەمان ئاکـامێکی دژوارانەی لێکەوتبـایەوە، چـونکە پێشـتر لە ئۆپەراسـیۆنی تەقینەوەکـانی هاگانـا ئاگـادار نەکرابـوینەوە. ئەوانـیش دانیـان پێـدانا، کە لە

گلەییەکەماندا حەق بوووین، دەبێ لە داهاتوودا پێشکات لە کردنی ئۆپەراسیۆنەکاندا ئاگادارمان بکەنەوە.
ئۆپەراسیۆنی سەربازیانە، کە لە لایەن هاگانا و لە ماوەی پێکهاتەی بزووتنەوەی بەرگریکاران، لە رووی ژمارەوە زۆر نەبوون؛ هەروەها ئێمە نەشمانتوانی زۆریشیان پەسەند بکەین. لە "شەوەکەی هێڵی ئاسنیندا" هاگانا سێ بەلەمی گەرۆکی دەریایی نقومکردن. پاشان دووجاران هێرشیان کردە سەر وێستگەی راداری حەیفا. لە جاری یەکەمدا بەریتانییەکان توانیان بەر لەوەی تەقەمەنییەکان بتەقێننەوە، پوچەڵیان بکاتەوە و هیچ زیانێکی بەدواوە نەبوو، لێ لەجاری دووهەمدا هێرشەکە سەرکەوتو بوو. هێرشێکیان بۆ سەر بنکەی پۆلیسی چاودێری بوو لە گیڤات ئۆلگادا، کە تەقێندرایەوە.
هاگانا "شەوی وینگێت"ی لە تەلئەبیب رێکخست. مەبەستیش نمایشێکی دابەزاندنی کەشتی گەڕاوەکان لە کەناری شارێکی عیبری و رێگرتنێکی زۆرەملێیانەش بوو لە دەسەڵاتداران تا دەستیان پێڕانەگا. لێ لەوێدا سەرلێشێوانی زیاتر لە شەوەکەدا هەبوو تا لە کردەوەکە. هێزی بەریتانیی چوونە هەموو جێیەک.
لە فێبرایەری ١٩٤٦دا هاگانا ئۆپەراسیۆنی تێکدانی دامەزراوێکی پۆلیسی گەرۆکی ئەنجام دا. لە حوزەیرانیشدا هاگانا هێزەکانی خۆی بە پەلامارە سەرکەوتووەکەی پردەکانی پێشەوە سەرقاڵ کرد.
هێرشی سەر هێزی گەرۆکی پۆلیس کە پێشتر راوێژێکی دەستەجەمعی بوو، بووە مایەی دڵسوتانێکی زۆر. ئێمە پێشنیازمان کردبوو پەلاماری یەکێک لەو وێستگە گەرۆکانەی نزیک کفر ڤیتکین بدەین. ئێمە بەتایبەت چاومان لەوێ بڕیبوو، چونکە جبەخانەیەکی پڕچەک و تەقەمەنی تێدابوو. نەخشەکەمان بۆ دەستبەسەرداگرتنی چەکەکان بوو. بۆ چەندان هەفتە کوڕەکانمان کنەوپشکنینیان بۆ مۆڵگەکە کردبوو، دوای زانیاری دەقاودەقیان دەربارەی مۆڵگەکە بەگشتی و ئەو چەکوچۆڵانەی تێدابوو، کردبوو. ئیدی لەنێو خۆماندا رێکەوتین، کە لە هەمان شەودا هێرش بکرێتە سەر چوار مۆڵگە، سێ لە لایەن هاگاناوە یەکێکیش لە لایەن ئێمەوە. ئێمە پێشنیازمان کردبوو، کە پەلاماری مۆڵگەی سارۆناش بدەین، بەڵام سەرۆکی هاگانا بڕیاریدا تەنها پەلاماری کفر ڤیتکین بدەین.

چەند ڕۆژێکی کەم لە نزیکبوونەوەی سەعاتی سفری چالاکیەکان، گالیلی پێیراگەیاندم، لەبەر هەلومەرجێکی تایبەت پێویستە ئەو هێرشەی سەر مۆڵگەی کفر ڤیتکین هەڵبوەشێندرێتەوە. من چووم بیبینم بۆی ڕوون بکەمەوە، هەڵوەشاندنەوەی چالاکیەکە کاریگەری بەسەر گیان و ورەی کوڕەکانمان دەبێ و لەوەش زیاتر، شتێکی بەزەیی پێهاتنەوە کەوا لە ختوخۆرایی لێ بگەڕێین ئەو چەکە نازدارە، کە زۆرمان پێویست پێبوو لەبەردەستمان دەربچێ. داوامان کرد بە چالاکییەکە هەڵبستین. گالیلیش گوتی هاوسۆزە لەگەڵ ڕوانینەکەم، بەڵام سووکوئاسان هەڵوەشاندنەوەکەی شتێکی حەتمییە. گوتیشی هۆکارەکەی خۆجێییە، بەڵام یەکلاکەرەوانەیە.

ئەو کات من گالیلیم بەدڵێکی پڕ بەخەم بەجێهێشت. ئەویش هۆکارەکەی ئاشکرا نەکرد، منیش زۆر لەسەری نەڕۆیشتم. پیاوانی ژێرزەمینی دەبێ ڕێزی ئەو کەسانە بگرن کە نایانەوێ متمانە لە دەست بدەن. لە هێماکردنەکەیدا ئەوەم لێکدایەوە، کە هاگانا شوێنێکی حەشاردانی چەکیان لە گوندێکی نزیک ئەوێ هەیە، ئیدی دەترسن بەهۆی چالاکیەکەی ئێمە، هێزی بەریتانی ئەو ناوە بپشکنێ و جبەخانەکەیان ئاشکرا ببێ. من مەزندەکەی خۆم بە هاوڕێکانم گوت؛ بەڵام دەبوایە هەوڵێکی زۆر بدەم تا تووڕەییان دابمرکێنمەوە بەر لەوەی ئەوان دەستبەرداری هەڵوەشاندنەوەی ئۆپەراسیۆنەکە ببن.

لە کاتی دیاریکراودا، هاگانا هێرشەکانی خۆی بۆ سەر مۆڵگەکانی پۆلیسی گەڕۆک کرد. لە سارۆندا ئەوان تووشی تراژیدیایەک بوون. بەشێک لە هێزەکانیان درەنگ گەیشتبوون. هەوڵی شکاندیان بەنێو هێڵەکاندا سەرنەکەوت. چوار لە ئەندامە ئازاکانیان بەر لەوەی بگەنە شوورەکە کوژران. لە مۆڵگەی دووهەمیشدا هێرشەکە هەر لە سەرەتاوە نەکرا. هەرچی دەربارەی مۆڵگەی شافرامیش بوو، سەربازەکانی هاگانا توانیبوویان تەلبەندەکە ببڕن و لە تێکشکاندنی چەندی ترومبێلی سەربازیدا سەرکەوتن. بۆ فراوانکردنی سەرکەوتنیان، بە هەمان شێوەش لە کفر ڤیتکین دەستکەوتیان هەبوو!

ئیدی کوڕەکانمان ڕەوایانە لێیان دەهەری بوون.

"ئۆپەراسیۆنەکەمان لەبەر هۆیەکی تایبەت هەڵوەشێنرایەوە،' باشە ئەدی بۆچی هاگانا کردی؟ باشە بۆچی تەنانەت پێشیان نەگوتین پەلاماری شوێنێک دەدەین، کە پێدەچوو پێشتر هی ئەوە نەبێ پەلامار بدرێ؟ تۆبڵێی لە دوای هەمـوو شـتێک چ دەسـتکەوتێکیان بەدیهێنـابێ؟ یەک دوو ترومبێلـی سەربازیانەی دوژمن تێکشکێندران. خۆ ئەگەر ئێمە هێرشەکەمان کردبایە، نەوەک هەر ئەو زیانانەمان بە دوژمن دەگەیاند، بەڵکو چەند سەد تفەنگ، ڕەشاش و فیشەکیشمان دەستکەوت دەبوو."

من ئەمەم بە گالیلی و سنێ گوت، بەڵام هەرگیز وەڵامێکی بڕواهێنەرانەم لە ڕەفتارە گوماناویەکەیان دەستنەکەوت. تا ئەمڕۆژی لەگەڵدا بێ، نەمزانی ئاخۆ بۆچی فەرماندەیی هاگانا لێنەگەڕا ئێمە بەسەر مۆڵگەی کفر ڤیتکیندا دابدەین. لەوانەیە نەیانویستبێ ئێمە لە هەمان بازنەی چالاکی ئەواندا، ئۆپەراسیۆن ئەنجام بدەین.

ڕووداوی سارۆنیاش تەواو جیاواز بوو. لەوێدا ڕەخنەیەکی بەرفروان لە هاگانا بەبۆنەی کوژرانی چوار کەسەکەی لیگیرا کە لە ئۆپەراسیۆنەکەیاندا سەریان تێداچوو. ئەوەش ڕەخنەیەکی نارەوایانە بوو. ئاخر شکست و قوربانیدان هاویاریکی دانەبڕاوی جەنگن. ئێمە کە ئەزموونمان لە هەڵمەتی پارتیزانیدا هەبوو، ئەزموونەکەشمان زۆر لە هاگانا دەوڵەمەندتر بوو، سەرباری ڕووداوەکەی کفر ڤیتکین لەسەر پەلامارە گشتیەکەی مۆڵگەکانی پۆلیسی گەڕۆکدا پەسنی هاگانامان دا. بنەمای سیاسی خەباتەکەمان دەیخوارد. ئیدی سەری ڕێز و نەوازشمان بۆ ئەو پیاوانەی لە سارۆندا کوژران ، دانا.

هاگانا کە وەک دامەزراوەیەک هەرگیز بە دژواری لە لایەن دەسەڵاتدارە بەریتانییەکان ڕاوەدو نەنرا، بۆنەیەکی جەماوەریانەی بۆ بەخاکسپاردنی چوار کوژراوەکانی ڕێکخست. ڕۆژنامەنووسانی ئەمریکی، کە جیاوازیان لەنێوان بۆمبی فەرمی و نافەرمی نەدەکرد، ئەو مەراسیمی بە خاکسپاردنەیان وەک نیشانەی پێناسەیەکی هاگانا بۆ "تیرۆریزم" دانا. هەندێک لەو ڕۆژنامەنووسانە، بەشداری سەرکردەی ئاژانسی جووەکانی لە ڕێوڕەسمەکەدا وا دانابوو، کە سەرکردەکان چوونەتە پاڵ ئیرگون! هەڵبەت، ئەوەش شتێکی ڕاست نەبوو؛ بەڵام ئەوەی لێی دڵنیابووین ئەفسەرانی

دەزگــای هەواڵگــری ســـووپای بەریتـــانی زۆر وێنەیـــان لە ڕێورەســـمی بەخاکسپاردنەکەدا گرت، بەتایبەتیش هی ئەو گەنجانەی لە ڕێڕۆیشتنەکەدا بەشدار بوون.

**5**

ئەو هەفتەیەی هاگانا پەلاماری یەکەکانی پۆلیسی گەڕۆیان دا، سەربازەکانی ژێرزەمینیش هێرشیان کردە سەر فڕۆکەخانەکان. نەخشەکەش لە هۆبەی ئۆپەراسیۆنەکان بە وردییەوە کاری بۆ کرابوو، سێ فڕۆکەخانەی سەربازی لەخۆگرتبوو: هی لیدا، کفر سرکین و کاستنا. لەوانە فڕۆکەخانەی کفر سرکین -نزیــک گەڕەکــی هاســیدۆف-بــۆ F.F.Iتەرخــانکرا، کە ســەرکەتووانە هێرشــەکەیان ئەنجامــدا. هێــزی هەڵمەتــبەری ئــیمەش لەگەڵ فڕۆکەخــانەی مەڵبەنـدی لیـدا و فڕۆکەخـانەی دابەزانـدنی بـاری گەورە و گـران لە کاسـتنا خەریـک بـوو. ئۆپەراسـیۆنەکە زۆر سـەخت بـوو. تـا ئەو کـات ئیـدی دوژمـن وشـیار بـووەوە زۆر ئاگـای لەخـۆی بـوو. ئەو ڕێگایـانەی دەچـوونەوە سـەر فڕۆکەخانەکـــان بەردەوام بە هێـــزی گەڕۆک دەپـــارێزران. لە دەوروبەری فڕۆکەخانەکـانیش مـــۆڵگەی گەورەی ســـەربازی لێبـــوو. بـــۆ گەیشـــتن بە ئامانجەکانیـان، دەبـوایە پیاوەکـانی ئـیمە بەڕێگایەکدا بـڕۆن، قـوڕ و لیتـاو کە کەس پێـدا نەچووبـوو، دەبـوایە لەسـەر چۆکـانیش بـۆی بـڕۆن. دەبـوایە لە کێڵگەکـــانەوە کە بەهـــۆی بارانبـــارینی زۆرەوە ببـــوونە زۆنگـــاو ، چەنـــدان سەعاتیان پێچووبایە تا دەگەیشتنە ئامانجەکانیـان. کـاتێکیش لە فڕۆکەخانەکـان نزیکبـــوونەوە، هەمـــوو جەســـتەیان لە ئـــاو هەڵکێشـــرابوو، بە پێخواســـی و ترســـولەرز، بەڵام ئەوان بەتەواوی چەکە هەرە بەهێـــزەکەی ژێرزەمینییـــان لە دەستدابوو، ئەویش تـوخمی لە هیکەوە بەسـەرداان بوو. دوژمنیش تەیار و ئامـــادە بۆیـــان دانیشـــتبوو چاوەڕێیـــان دەکـــرد. لایتـــی زەقـــی تاوەرەکـــان کونپشـکنانەوە هەمـوو بستێکی ئەو نـاوەی ڕوونـاک دەکـردەوە. ئیـدی ئەوان گوێیان لە هاواری ئەفسەرێکی دوژمـن بـوو لەسـەر بـورجی چاودێری لیداوە دەیگوت: "چاوتان بخەنە سەر ڕێگاکەکان. ئەو بێژمۆتانە هاتن."

لەگەڵ ئەوەشـدا هێـزی هەڵمەتـبەر چـالاکییەکەی هەر کـرد. دووبـارە لەوێ هێزەکەیان دابەشکردە سـەر "دەسـتەی شـکێنەر" و دەسـتەی "پشـتگرتن. لەبن گوللەبـارانی دوو ئاراسـتەوە، ئەوان بەرەوپێشـەوە چـوون خۆیـان گەیانـدە

تەلبەندەکە، تەلبەندەکەیان پچڕاند بە سەر فڕۆکەخانەکەیان دادا. ئامادەیی هەموو شتێک تا دوا وردەکاری پێویست کرابوو. تەنانەت پیاوەکانی ئێمە پلیکانەی بچوکیشیان لەگەڵ خۆیان بردبوو، ئەو شتانەشیان زۆر بەکەڵک هات. لە چاوتروکانێکدا پیاوەکان بەپلیکانەکاندا هەڵگەڕان و خۆیان هاویشتە ئەو بەدەنە گەورە ئاسنینەی فڕۆکەکان. تەقەمەنیەکان داندران و وایەریشیان بۆ ڕاچێندرا، ئیدی فڕۆکە هالیفاکسە بۆمبهاوێژە قورسە چوار ماتۆڕەکان هەر زوو وێرانکران، بوونە ئاسنێکی خوردە و لەکەڵک کەوتن.

کشانەوەش بۆ بنکەو بارەگاکانیان لە نزیکبوونەوەیان لە فڕۆکەخانەکە سەختتربوو. ئاخر ڕۆژ ببووەوە. چەکداری دوژمن هەموو ڕێگایەکیان گرتبوو. لە مەزراکانیش پێ تا گوێزینگ دەکەوتە نێو قوڕ، بەڵام دڵی پیاوەکان لەخۆشیان هەر گۆرانی دەگوت. ئەوان دەیانزانی بە تێکوپێکدانی فڕۆکەکان پێگە بونیادەکەی سەربازیی مانداتیان لەرزۆک کرد. کە بەنێو گوندە عەرەبییەکاندا رادەبووردن، هاواری دەستخۆشی ئازایەتیان لێدەکردن. لە گوندە جوونشینەکەشدا بە سۆز و خرۆشەوە باوەشیان بۆ کردنەوە و بەخێرهاتنیان لێکرا. پێشتر دەگوترا "تیرۆرستەکان بۆ دەرەوە. ئێمە ئێوەمان ناوێ." هەنووکەش دڵی دۆستانەیان بۆ کراوەتەوە. لەوێ ئاکنجییەکان جلە پیس و قوڕاویەکانیان بۆ گۆڕین. لەجیاتی نەفرەتاکانی دوێنێ، پیرۆزبایانە و موبارەکبابیان بەسەردا گوتن. دوای ساڵانێک لە چەوساندنەوە و ناوزڕاندن، ئێمە دڵ و خۆشەویستی خەڵکەکەمان بردەوە.

حکوومەتیش بەو ڕووداوە تا ئەوپەڕی شڵەژان. لە ماڵی لۆرد وینتەرتۆندا بە تووڕەییەوە داوای لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونێکی نهێنی ڕووداوەکەی کرد بۆ ئەوەی دەربکەوێ ئاخۆ کێ لە کەمتەرخەمیەکەدا بەرپرسیار بووە، ئەو کەسەی کەمتەرخەم بوو بۆتە مایەی ئەوەی تیرۆرستان بێن و ئەو فڕۆکە گرانبەهایانەمان لێ بتەقێننەوە. سکرتێری دەسەڵاتی کۆلۆنیالی وەڵامێکی تارماویانەی دابووەوە و بەڵێنی دابوو پێوەرەکانی ئاسایشی لە فڕۆکەخانەکاندا توندوبەندتر بکا.

حکوومەتی داگیرکاریش لە ئۆرشەلیم بەیانێکی فەرمی بڵاوکردەوە، بەحەللەق مەللەقەکەی بووە گاڵتەجاڕی دنیای دەرەوە. ئەوان فیزیان بەوە لێدەدا گوایە "تەنها" دوو دەرزەن لە فڕۆکەکانیان تێکچووە، و ڕێگریشیان لە هێرشی سەر

فڕۆکەخانەی رامات دایڤد و ئاکیر کردووە. لە وەڵامدانەوەی ئێمەشدا، ڕۆژانە ئارەزووی ئەو سەرکەوتنانەمان بۆ حکوومەت کرد. ئێمە بیرمان خستنەوە لە میانەی جەنگی جیهانیدا هێزەکانی بەریتانی (٣٠)سی فڕۆکەی دوژمنی خستبووە خوار یان ئەوەندەیان لەسەر زەوی تێکشکاندبوون، ئیدی بەیاننامەیەکی فەرمی تایبەت بەم چالاکییەیان دەرچوو، بە سەرکەوتنێکی مەزنی هەژمار کردبوو. هەرچی دەربارەی رێگرتنیشە لە هێرشی سەر رامات داڤید و ئاکیردا ئەوە تەنها هێرشێکی خەیاڵبازاڕیانە بوو بەو ئامانجە چەند سەرکەوتنێکی خەیاڵیانە نیشانی خەڵک بدەن.

شادمانی خەڵکی جوو گەورەتر بوو لە دڵتەنگی و ترسولەرزی دەسەڵاتدارانی بەریتانی. جاڕدانێک بەوەی ڕێکخراوەکانی ژێرزەمینیی پەلاماری فڕۆکەخانەکانیان داوە، شتێکی تەواو لە ناکاو سەرسامانە بوو. سەرەتا ئێمە لە ئێرگوندا بێدەنگ بووین. هاگاناش داوای لێکردین هیچ بڵاونامەیەک نەدەین کە ڕێکخراوە هەڵمەتبەرەکە بناسێنێ. ئێمەش قایلبووین. نەمری چەکەکانمان لەچاو ئەو ڕاستییەی، کە یەکێتی گەل هەنووکە شەڕی چەوسێنەر دەکا، ئەوەندە گرنگ نەبوو. دواتر هاگانا بیروڕای خۆی گۆڕی، لە تێبینیەکدا داوای لێکردین بەرپرسیارێتییەکەی تێکوپێکشکاندنی فڕۆکەکانی بەریتانی لە ئەستۆ بگرین. ئیدی وای لێهات.

ئێمەش ئامادەی شتەکە بووین. جەماوەریش حەپەسا. لە شەقامەکانی شارەکاندا دەتبینی ریزێکی دوورودرێژ بەدیار خوێندنەوەی بەیاننامەکەمان وەستابوون. خەڵک بە سەرسامییەوە هاواریان دەکرد: "ئاوا هەڵگەڕاوەکان دەتوانن ئەو جۆرە کارانە بکەن!" خۆ ئەوان باکیشیان بەوە نەبوو جۆشوخرۆشەکەیان لەبەر دەسەڵاتدارە بەریتانییەکان بشارنەوە. لە قاوەخانەیەکی تەلئەبیبدا، ئەفسەرێکی بەریتانی داوای حیسابی کردبوو. خاوەنی قاوەخانەکەش لە وەڵامدا پێیگوتبوو: "تۆ هیچی ئێمە قەرزار نی. تۆ دوێنێ بە سی(٣٠) فڕۆکەوە حەقەکەت داوە.

"نەبەردی کاستینا دنەی مایکل ئاشبێلی دا. مایکەکەی ئێمە سەربازێکی تەرکە دنیا و شاعیرێکی خۆشەویست بوو. گۆرانییێکی لەو بارەیەوە نووسیبوو، ئیدی بووە گۆرانی دڵخوازی جەنگاوەرە لاوەکان.

## بەندی 14
## لێکجیابوونەوەی ڕێگاکان
## ۲۰۵ - ۳۰۳

ئەو ئۆپەراسیۆنانەی خوارەوە بە فەرمی لەلای یەکێتی بەرگرییەوە پەسەند کرابوون: هەڵمەتەکەی سەر فڕۆکەخانەکان؛ ئەو زیانە زۆرەی پەلامارەکەی باشوور بەرهەمی هێنابوو؛ تەقاندنەوەی سێ شەمەندەفەری سەر سێ هێڵی سەرەکی لە وڵات؛ پەلامارەکەی F.F.I بۆ سەر کارخانەی ڕێگەی ئاسنینی حەیفا و پەلامارەکەی ئێمە بۆ سەر هوتێلی شا داود. بێ لەوانەش زیاتر لە دوو ئۆپەراسیۆنی دیکە هەر لەو ماوەیەدا لە لایەن 'هەڵگەڕاوەکان' ئەنجامدران، کە تەنها بە نافەرمی لە لایەن هاگاناوە پەسەند کران. یەکێک لەو پەلامارانە لە لایەن یەکەی هەڵمەتبەری ئێمە و F.F.I بوو کرایە سەر گرتووخانەی ئۆرشەلیم، بە نیازی ئازادکردنی ژمارەیەک لە ئەندامە گیراوەکانی هەر دوو ڕێکخراوەکە. ئۆپەراسیۆنەکە لە دنیادا هەرای نایەوە، تەنانەت لە مۆسکۆشدا دەنگی دایەوە. ڕۆژنامەی ئزفیستیا Izvetia لە ژمارە 22ی ینایری 1946دا نووسیبووی:

'دوێنێ شەو ڕادیۆی لەندەن ڕایگەیاند، کە شەوی نۆزدەهەمینی مانگ، ژمارەیەک تەقینەوە لە ئۆرشەلیم بیستران. بەهۆی تەقینەکەوە پەخشی ڕادیۆکە لە سەرتاسەری وڵاتەکە وەستێندرا. لە ناوجەرگەی شاری ئۆرشەلیمیشدا بۆ دوو خولەک دەنگی تەقەی تفەنگ بیسترا. دووەمین هەواڵنامەی ڕادیۆکە، ڕایگەیاند بەیەکدادان لەنێو جەرگەی ئۆرشەلیمدا ڕوویداوە. لایەنێکی جوو پەلاماری وێستگەی وزەی داوە. لە ئاکامی تەقینەوەکێنیشدا لایەکی دیواری گرتووخانەی مەڵبەندیی داڕماوە. لە بەیەکدادانەکەدا یەک جوو کوژراوە و چواری دیکەش بریندار بوون. ئەفسەرێکی بەریتانی و ئەفسەرێکی پۆلیس کوژراون و ئەفسەرێکی دیکەی پۆلیس بریندار بووە.'

ئیدی لەو ڕۆژگارەدا بوو، ڕادیۆی مۆسکۆ دەستی بە بڵاوکردنەوەی هەواڵە خوێناوییەکان دەکرد، تەنانەت ئەوانەی ئێرتز ئیسرائیلیش. لەگەڵ پەرەسەندنی

خەباتی ژێرزەمینیی جودا، هەواڵی ئۆپەراسیۆنەکانی بە بەردەوامی لە یەکێتی سۆڤیەت بڵاودەکرانەوە. ساڵێک دواتر و دوای پەلامارەکەی سەر زیندانی عەککا Acre، ڕادیۆی مۆسکۆ نزیکەی نیو سەعاتی خۆی بۆ وێناکردنی ئۆپەراسیۆنەکان دژی قەڵا و چەپەرەکان بڵاودەکردەوە، ئەو قەڵایانەش بە قەڵاکانی پیترۆپاڤلۆڤسک بەراورد دەکران، نموونەی ئەو ململانێ و خەباتە پێشوەختەی دژی ڕژێمی قەیسەر.

لە ١ی یانیری ١٩٤٦یشدا پراڤدا نووسیبووی:

"کێشەکانی فەلەستین بەردەوامن. ڕادیۆی پاریس لە کۆپلە هەواڵنامەی ڕادیۆی لەندەنی وەرگرتووە، کە دەسەڵاتدارە بەریتانییەکان بڕیاریان داوە بە پۆلیس و هێزی سووپا ئۆپەراسیۆنێکی گشتگیرانە بکەن. لە ماوەی بیست و چوار سەعاتی ڕابردوودا، دوو هەزار کەس گیراون. دوورخستنەوەی چەند کەسایەتییەکی دیاریکراو لە تاوتوێ دایە. هێزی پاڵشت بۆ تەلئەبیب و ئۆرشەلیم نێردراوە. لەوێدا کنەوپشکنین و بەدواداگەڕانێکی زۆر لەناوچەکەدا کراوە، گوایە سەرۆکی ڕێکخراوی ئیرگون زڤای لیومی لەوێدا خۆی شاردۆتەوە."

لە هەمان کات و لە سەرەتای 1946دا، ئێمە پەیوەندی نێوان گەلەکەمان و یەکێتی سۆڤیەتمان شیکردەوە. ئەوان وەک ئێستا نەگۆڕابوون. ڕامانی من بۆ لێکۆڵینەوەکەی لوکیشکی لە وتارێکی سیاسییانە لە ڕۆژنامە سۆڤیەتەکاندا بەرکاربوو. ئێمە نووسیبوومان:

"ئێمە قێزمان لە خەیاڵپلاوی دەبێتەوە و هەرگیزیش باوەشی بۆ ناکەینەوە. ئێمە ڕاستیەکان دەبینین و کردەوە ناوبۆشەکان ڕەتدەکەینەوە و لە بازنەی مەزندەکانماندا دایان نانێین. ***هەر چۆنێک بێ ئێمە بە متمانەی ڕەهاوە دەڵێین ڕووسیاش دەیەوێ ئێرتز ئیسرائیل بکاتە دەوڵەتی جوولەکە.*** چۆن؟ هەرچەندە ئەو لەسەر دژایەتیکردنی خۆی دەربارەی چەوساندنەوەی جووەکان لە نیشتمانی خۆیاندا بەردەوامە، ڕووسیایەک کە توانادارە ڕووداوەکانی ئیندۆنیسیا و داخوازییەکانی لە سوریا و لوبنان بقۆزێتەوە، خوازیاری ئەوەشە گەلی جوو لە دژی مانداتی بەریتانیدا بجەنگێ. دەوڵەتی جوو تەنها وەک بەرهەمێکی خەباتمان دژی دەسەڵاتی بەریتانیا سەرهەڵدەدا و لەو خەباتەشدا ئێمە لەیەکێتی سۆڤیەتەوە کۆمەک دەکرێین."

لەگەڵ ئەوەش کە ئۆپەراسیۆنەکەی ئۆرشەلیم سەرنجی جیهانی بە لای خۆیدا ڕاکێشا، لێ بە ئامانجە کردەنییەکەی خۆی نەگەیشت. ئاخر سەرلێشێوانێکی زۆر بەهۆیەوە لەنێو دەسەڵاتدارانی حکوومەتەوە بەرپا بوو. هەر نووسینگەکانی حکوومەت بوون بە دوای یەکدیدا چۆڵدەکران. ئەفسەری بەریتانی لە ڕۆژنامەیەکی ڕووسیدا ئاماژەی بەوەدا بوو، کە کوژراوەکان هی دەستی پۆلیسی بەریتانین. جارێکی دیکەش دەزگای هەواڵگری بەریتانیی گێژ و حۆل دەرچوو. بەگوێرەی بڵاونامەی فەرمی، گوایە ئێمە هەوڵی تەقاندنەوەی وێستگەی ڕادیۆمان داوە کە هاودیواری گرتووخانەکە بوو.

ئاکامی هەرە جیاواز لە دووهەمین ئۆپەراسیۆنەوە هات، کە هاگانا بە نافەرمەی پەسەندی کرد. ئەو پەلامارەش لە ماوەی یاخیبوونەکەدا، سێهەمین پەلاماری سەر C.I.D بارەگای سەرەکی لە ئۆرشەلیم و یافا بوو. نەخشەکە و فەرماندەیی چالاکیەکە هی ئەفسەرەکانمان بوو، هێرشەکەش لەگەڵ ئەندامانی F.F.I یەوە کرا. تەلارە پەلاماردراوەکە بە یەکەی پۆلیس و سەربازی تایبەت پاسەوانی لێدەکرا، بەرگریکردنەکەشیان دژوارانە بوو. لێ بە پاڵپشتی تفەنگی برێن، بە گوێرەی تاکتیکە هەوڵ بۆ دراوەکان بەشێکی هێزە پەلاماردەرەکە توانی لێینزیک بێتەوە کونێک لە دەرگا بکات و تەقەمەنی تێدا بچێنێ، ئەوسا بە خێراترین کات بکشێتەوە و چاوەڕێی کاری تەقینەوەکە بکەن، بە ئەسپایی خۆیان کێشایەوە و لە ماوەی چەند خولەکێکدا دەنگی تەقینەوەکە ئەوێی هەژاند و دەرگا و دیوارەکەشی لەگەڵ زەویدا تەختکرد. زۆر لە دۆسیەی نهێنی دەزگای هەواڵگری لەو هێرشەدا تێدا چوون. لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی بەریتانیاشدا، ئەندامێکیان بەو جۆرە ڕاپۆرتی دا: "بینیم چۆن تەلاری بنکەی پۆلیس لەگەڵ خاک یەکسان کرا."

تەلاری پۆلیسخانەکە لە ماوەی ڕۆژانی ناکارایی یەکێتی بەرگری لەگەڵ زەویدا تەخت کرا. بەنابەدڵی ئەو ڕۆژانە زۆر نەبوون. ئێمە بەردەوام دادەدادمان بوو لە دەست ئەو وچانە دوورودرێژانە. ئێمە داوای چڕکردنەوەی خەباتەکەمان دەکرد. مایەی سەرنجە، ئێمە نەوەک هەر بانگی ئۆپەراسیۆنی سەربازیانەمان هەڵدەدا، بەڵکو داوای هەڵگەڕانەوە و مانگرتنی مەدەنیانەی سەرتاسەریشمان دەکرد. ئێمە نووسیبوومان:

"ئەو نەتەوەیەی بۆ ئایندە و ژیانی خۆی دەجەنگێ، چەندان جۆرە چەکی پەنایان بۆبەرێ. وەستان لە باجدان بە ڕژێم؛ گوێپێنەدان بە قانون و فەرمانەکانی؛ خۆ بەدوورگرتن لە بەکارهێنانی دامودەزگاکانی، بەلاوەنانی نووسینگەی کاربەدەستانی میری و دادگاکانی؛ دەستبەسەرداگرتنی زەویوزاری حکوومەت- ئەو زەویوزارانەی کە لە ئێمەی بە تالان بردووە- لەگەڵ ڕەتکردنەوەی ڕۆیشتن و بەجێهێشتن؛ دانانی حکوومەتێکی کاتی جوو تا ڕابەرایەتی خەباتی نیشتمانی بکا، هەموو ئەو کردەوە جەنگیانەش..."

لە ڕاستیدا ئێمە واشمان نەکرد، هەرچی دەربارەی هەڵگەڕانەوەی جەماوەری بوو وەک دوا وەڵام هەڵمانگرتبوو. هەروەک گوتمان، "هەموو بەرگرییەکی جەماوەریی، ئەگەر ئامانجێکی جدیی هەبێ، شتێکی حەتمییە لە بن قانونی ئاسنینی ڕووداوەکاندا ڕاپەرینێکی چەکداری بە دوای خۆیدا دێنێ." لێ ئێمە بە هەڵگەڕانەوە و جەماوەری بەرجەستەبوونێکی خەباتی گەل و یەکێتیمان بەرجەستە دەکرد. لە دەرهاوێشتەدا ئێمە هەمیشە پێمان لەسەر ئەو شتە دادەگرت ئەوسا چ ڕاشکاو و جەماوەریانە بووبا یاخود لەو گفتوگۆیانەی لەگەڵ سەرانی هاگانا ، سنێ، گالیلی، شاول مێرۆف و ئەوانی دیکەدا دەمانخستە بەرباس و لێکۆڵینەوە. سنێ و گالیلی بەڵێنی ئەوەیان پێدایێن، بەو زووانە هەڵگەڕانەوەیەکی جەماوەری سەرتاسەری جاڕ بدرێ. من بڕوام وا بوو ئەوان بە ڕاستییان بوو، هەروەک چۆن ئەوان خەباتی سەربازییانە بەرفراوانتر بکەن. بەڵام دەستەکانی ئەوان گیرابوون. دوا بڕیار بە دەستی "دامودەزگا دانپێنراوەکە" بوو، ئیدی دامودەزگا فەرمییەکانی جوولەکەش دابەشببوونە سەر دوو بەرە: "کاراکان" و ئەوانەی بە قەولی کرۆسمانیش بێ "ئەوانەی بەواقیع ڕاستگۆیانە پێیان وابوو بەکارهێنانی هێز هەڵەیە." ئیدی دەمەقاڵێیەکی گەرم لەنێوان ئەو دوو بەرەیەدا ڕوویدابوو.

هەر لەبە ئەو ئاستەنگیانەش بوو هاگانا تووشی داوی ئەو سستی و وەخرانە دوورودرێژە هات. ئێمە مشتومڕی ئەوەمان بوو، ئەوان جەرگی بەڵگەوبەندەکانی ئێمەیان دەرهێنا. ئاخر ڕێککەوتنەکە لەسەر بنەمای کردەوە بوو. دوای دەمەتەقێیەکی دوورودرێژ و چەندان بیروڕا لەمەڕ هەڵپەساردن و دواخستن، سەرانی هاگان پێیان ڕاگەیاندین، دەتوانین چالاکی دژی بارەگاکانی C.ID دا بکەین. پەسەندنامەکەشیان بە شێوەیەکی نافەرمی بوو.

ئەوان گوتیان هەوڵی خۆیان دەدەن و لە ڕاگەیاندندا خۆیان لە سەرکۆنەکردنی ئۆپەراسیۆنەکان بەدوور بگرن، بەڵام گفتی ئەوەش نادەن سەرکۆنەکردنەکان هەر سەرهەڵنەدەن.
ئیدی ئیدانەکردنەکان نەوەک هەر لە ڕاگەیاندنی گشتییدا بەڵکو بەشی خۆی سەریان هەڵدا. بڵاونامەیەکی پروپاگەندەیی کە ناوی لەخۆی نابوو 'دەنگی دڵسۆزانی ئیسرائیل' دەربارەی هێرش و پەلامارەکانی ئێمەی وا نووسیبوو، بۆ ئەوە نەخشەیان بۆ دارێژراوە تا پەیوەندی نێوان بەریتانیا و جوولەکان خراپتر لێبکەن. "ئێمە وا دەدەنێین ئەو ئۆپەراسیۆنانە وەک نەکرابن وان"، ئیدی بەو ڕەفتارە لوتبەرزییانە نووسیبوویان.
ناتان فریدمان و من لای سنێ و گالیلی سکاڵامان لەسەر ئەو تانەوتەشەرە ئاگرینانە کرد. ئەوان لەجیاتی بڵاونامەکانیان لێبوردنامەیان خواست، گوتیان ئاگایان لە ناوەڕۆکی ئەو شتانەی بڵاوبوونەتەوە نەبووە. لێ کێشەکە بەو کۆمێنتە ترشوتاڵانەی "پەسندانە نافەرمییە"کانی سەر پەلامارەکانی ئێمە لە گۆڤاری هاهۆما(دیوارەکە) چارەسەر نەبوو.
ئەو جۆرە جیاوازیی و لەیەک تێنەگەیشتنانەی نێوان ئێمە و هاگانا لە ماوەی بزووتنەوەی یەکێتی بەرگریدا هەبوون.
بۆ کاروباری نێوخۆمان، هەریەکە و نازناوێکمان دابوێ. گالیلی پێی دەگوترا یێرمیا؛ ناتان فریدمان شیمۆن بوو منیش حزقێل بووم. کۆبوونەوەکانیشمان لە ماڵی "جان" لە شەقامە جەنجاڵەکەی بن یەهودا لە تەلئەبیب دەکران. کاتێک بۆ یەکەمجار خانەخوێکەمان بینی، هەستم کرد پێشتر لە شوێنێک بینیومە؛ دواتریش دڵنیا بووینەوە، کە لە زانکۆی وارشۆ بە یەکەوە بووین و دراوسێی ماڵی ئەکادیمیای جوولەکەش بووین لەوێ. ئاخر ڕۆژگاری منداڵیمان بەسەرچوو... هەنووکەش "جان" -یانۆڤسکی- بۆتە ئەندامێکی فەرماندەیی لە هاگانادا. موشێ سنێ خوێندکارێکی دیکەی هەمان سەردەم، بۆتە فەرماندەی نیشتمانی هاگانا؛ ناتان فریدمان، ئەویش کە دراوسێیەکی کۆنی ماڵی ئەکادیمیا و هاوڕێی مێردمنداڵێتیم بوو، بۆتە سەرۆکی F.F.I منیش بوومەتە ڕێبەرساسۆڤەر. قەدەر ئێمەی فڕێدابووە ئاراستەی جیاجیا و بەرەی جیاوازەوە، هەنووکەش بەیەکەوە لە بەردەم مێزێکی خڕدا

دانیشتووین، دڵخۆشین بە خانەخوێی جوامێرەکەمان و بەیەکەوە پرس و ڕا لەسەر خەبات بۆ ئیسرائیل تاوتوێ دەکەین...
سەرانی هاگانا بەردەوام بوون لەسەر ژیانی نیمچە ژێرزەمینیی. ئەو شێوە ژیانەیان بەردەوام بوو تا هێرشەکەیان بۆ سەر هێزەکانی پۆلیسی گەڕۆک و هێرشەکەی ئێمەش بۆ سەر فڕۆکەخانەکان، تا ئەوێ ڕۆژێ ئەوان لە گرتن نەدەترسان. دەمودەستیش دوای ئەو ڕووداوانە ئەوانیش خۆیان شاردەوە. سێ ماڵەکەی خۆی بەجێهێشت، شێوازی پرچی گۆڕی و لە دواییدشدا بەنهێنی چووە پاریس. گالیلیش پرچە جوانەکەی بڕی بە یارمەتی ئەکتەرێکی پرۆفیشیۆناڵ وەک بازرگان، یان ژمێریارێکی لێهات. دەمامکدانەکەی شتێکی باش بوو، لێ تا دوایی سەرینەگرت. چەند مانگێک دواتر، هەر پێش سازدانی کۆنگرەی زایۆنیستەکان لە دیسێمبەری 1946دا، من گالیلیم بەخۆی و پرچە پڕەکەی دیتەوە. من ئاماژەیەکم بەسەری دا و ئەو سەرنجەم بۆ دەربڕی: "ئەوەش نیشانەی ئاگربەستە."

**2**

لە ڕۆژگاری بزووتنەوەی بەرگریدا، کۆمسیۆنی بەدواداچوونی پێکهاتوو لە بەریتانیا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گەیشتە ئێرتز ئیسرائیل. لە ڕێگەیان بۆ وڵات، کاتێک هێشتا هەر لە لەندەن بوون، هەر دوازدە ئەندامی کۆمسیۆنەکە لەگەڵ بێڤین کۆبوونەوە، ئەویش لای خۆی پەیمانی دا، ئەگەر کۆمسیۆنەکە بە کۆدەنگی گەیشتە ئاکام، ئەوانیش پەیڕەوی لێدەکەن و ڕێنماییەکانی جێبەجێ دەکەن. کۆمسیۆنەکە کارێکی زۆری کرد، زۆری لەخۆی کرد تا "گوێی لە هەموو لایەکی کێشەکە" بێ و بگاتە کۆدەنگیش. ئێمە دەربارەی پێواژۆی پەرەسەندنەکانی کاروباری کۆمسیۆنەکە وەک لێبڕاهاتبووین شتی سەیرمان بیست. نوێنەرانی عەرەب ڕاگەیاندنامەی خۆیان دا، قسەکەری ئاژانسی جووەکانیش هەڵوێستی خۆی ڕوون کردەوە، نوێنەری حکوومەتی بەریتانیش داوای کرد وتەکان لە بەردەم کامیرادا بن. ئیدی ڕەوشی گفتوگۆکان بە باشی تومارکرا. هەندێ تێبینی ئەندامان لەسەر یەک ببووە مایەی هەڵچوون لەنێو ئەندامانی کۆمسیۆنەکەدا. هەریەکێک هەوڵی دەدا ئەوە بخەملێنێ کە "کێ لەگەڵ ئێمە" دایە و "کێش دوژمنمانە". شتێکی حەتمیش بوو بەکۆدەنگی کاروباری کۆمسیۆنی بەدواداچوونەکە کۆتایی پێبێ

و ڕاپۆرتەکەی خۆیشی بڵاوبکاتەوە. حکوومەتی بەریتانیش ئەوە بکا کە پێی خۆش بێ. کۆمسیۆنی ئەنگلۆ-ئەمریکایی ڕیزپەڕێک نەبوو لە داڕشتەکانی پێشخۆی. جەمال حوسەینی بە کۆمسیۆنەکەی گوتبوو، ئەگەر بەریتانیا وڵاتەکە جێبێڵێ، ئەوا عەرەب کێشەکانیان لەگەڵ جوودا بەبێ ئاستەنگ چارەسەر دەکەن. نوێنەرانی ئاژانسی جووەکانیش ڕاشکاوانە هێمایان بە دابەشکردنە پێشنیازکراوەکە دابوو، کە پەسەندی دەکەن. هەمووان ساتێکی خەجاڵەتکێشیمان هەبوو، کاتێ جەنابی بنگۆریۆن، چووە ژێر باری پرسیار و وەڵامەکان و ڕایگەیاند گوایە ئەو فەرماندەیی هاگانا ناناسێ، یاخود ئاخۆ کێ فەرماندەکەیەتی، هەروەها ئەویش بەرپرسیاری چالاکییەکانی ئەو ڕێکخراوە نییە...

جەنابی ماکدۆنالد و مستەر گرەم، هەر دوو ئەندامە ئەمریکییەکەی کۆمسیۆنەکە، پێشنیازی دیتنی منیان کردبوو. لە سۆنگەی سەختی باری ئاسایش دیدارەکە سەرینەگرت. بەر لەوەش کۆمسیۆنەکە بچێتە سویسرا، مستەر ماکدۆنالد پەیامیکی بۆ ناردم، تیایدا بیروڕای خۆی دەربڕیبوو بەوەی، "دەرفەتی باشی شەڕ" بۆ مەیسەرکردنی گۆڕانێکی بنەڕەتی لە سیاسەتی بەریتانیدا لە بەرامبەر فەلەستین و زایۆنیزمدا هەیە. ئەو هیوای ئەوەی خواست ئێمە ڕەفتارێکی وا نەنوێنین، دەرفەتی ململانێکە بە فیڕۆ بدەین.

بێ هیچ گومانێک مستەر ماکدۆنالد دۆستێکی گەلەکەمان بوو. من ئەمەم لە فلادیمیر ژابۆتنسکیش بیستبوو، کاتێ مستەر ماکدۆنالد وەک کۆمسیاری پەنابەران بۆ ئەڵمانیای نازی دەستنیشانکرابوو. لێ ئەو لەوەدا شاشبوو کە پێیوابوو ئەگەری باروودۆخێکی ئاسایشیانەی باشتر سەبارەت بە گۆڕانی سیاسەتی بەریتانیا لە ئێرتز ئیسرائیلدا دێتە گۆڕێ. ڕاپۆرتی کۆمسیۆنەکە لە لایەن دوازدە ئەندامە تێکەڵەکەی ئامادە کرا، هەڵبەتە ئەمەش هیچ دەستکەوتێکی بۆ گۆڕان پێنەبوو. ڕاپۆرتەکە بەڵگەنامەیەکی لاوازی پڕ لە دژبەری یەکدی بوو. هیچ شتێکی بەرجەستەکراوی نەدابووە هیچ کام لە جوو یان عەرەبەکان، تەنها ڕەهایانە دانی بەدەسەڵاتی بەریتانییەکان لەوێ نابوو. بە ڕاستیش ئامریکاییەکان هەوڵیاندابوو لە نواڕینی گۆشەنیگای ئاژانسی جووەکانەوە بگەنە سازانێک، لێ ئەوانیش کەوتبوونە پێناساندنێکی چەقبەستو(دۆگما) بەوەی "نە دەکرێ دەوڵەتێکی جوولەکە و نە هی عەرەبیش

لە فەلەستیندا هەبێ." ئەو ئاماژەیە بۆ خۆی بەڵگەیەک بوو؛ کە دەبێ فەلەستین ... دەوڵەتێکی بەریتانی بێ. ئەو چەند سازانە کەمەی کۆمسیۆنەکەش لە بەرامبەر جووەکاندا کردبوونی ڕەوایەتیان لەوەدابوو... کە لەسەر بنەمای "تیرۆرزم" وەک نووسیبوویان:

"... کاتێک جەنگەکە کۆتای پێهات و حکوومەتی کرێکاران گەیشتە دەسەڵات، هێشتا کتێبی سپی هەر دەیخوارد. جووەکان کە چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد دەمودەست حکوومەتی پارتی کار بەرنامە بەڵێنپێدراوەکەی سەبارەت بە زایۆنیزم جێبەجێ بکا، لێ هەستیان بە تورەیی کرد کاتێ بینیان هیچ شتێک لە سیاسەتەکەدا نەگۆڕا. تاڵاوی نامرادییەکە گەیشتە لوتکەی چڕبوونەوە و ئیدی پێگەی نەرمڕەویش بەدەگمەن وەک خۆی مایەوە. ئاژانسی جووەکان ڕاشکاوانە دوای ڕۆژی جەنگاوەرە دێرینەکان ئەوەیان لێ دەبیسترا کە هەموو هەوڵێکیان بۆ هاوکاری ماندات بۆ سەرکوتکردنی چالاکی ناقانونیانە، نەزۆک دەرچوو.

"هەر بڕیارێک لەمەڕ ئایندەی فەلەستین بدرێ نەزۆک و ناواقعی دەردەچێ ئەگەر بە شێوەیەکی وا نەدرێ، کە لێتێگەیشتنێکی تەواو لە گوریسڕاکێشانی سیاسی نێوان جووەکان و هۆکاری بەرپابوونەکەی دیارنەکرێ. لە هەر دوو باردا بەڵگە هەن، ئەوسا چ بەڵگەی جەماوەری یان هی گفتوگۆی سیاسەتوانەکان سەرکردەکان و جەمارەی ڕەشۆک ئەوە دەخاتە ڕوو، ئامۆژگاری ئەوەشمان دەخاتەبەردەست ئەگەر ئەو سیاسەتە هەنووکەیەی ماندات هەروەک خۆی بێ، ڕەوشەکە بەرەو ڕەوشی جەنگ دەڕوا، لەوێشدا توندڕەوەکان پشتگیرییەکی پاسیڤیانەیان لەسەرجەمەم دانیشتوانە جووەکان دەست دەکەوێ و بەڕەش لەبن پێی میانڕەوەکان، ئەوانەی کلیلی بڕیاردانیان بەدەستە، دەردەچێ."

لەسەر ئەو بنچینانە، کۆمسیۆنەکە پێشنیازی هەڵوەشاندنەوەی قانونی زەوی ساڵی 1940ی کردبوو، بەهۆیٔ قانونەکەوە بۆ جووەکان نەبوو لە چوار لەسەر پێنجی ڕۆژئاوای ئێرتز ئیسرائیلدا زەوی بکڕن. هەروەها ڕاپۆرتی کۆمسیۆنەکە ئەو بەشەی کتێبی سپی هی ساڵی 1939، کە وای دانابوو دەبێ هاتنی کۆچبەری جوو بە ڕەزامەندی عەرەبەکان بێ، هەڵبوەشێتەوە. لە دواییدا ڕاسپاردەی ئەوەی دابوو، لە ماوەی ساڵێکدا ڕێگا

به سەد هەزار پەنابەری جوولەکە بدرێ. سەرەک ترومان، بەخۆی دانی بەوەدا نابوو کە دەبێ سەد هەزار پەنابەری جوو ڕێگەی هاتنە فەلەستینی پێبدرێ، ڕەزامەندی خۆی لەسەر پێشنیازەکەی کۆمسیۆن دەربڕی بوو. ڕاپۆرتەکە داوای هەڵوەشاندنەوەی "سووپای تایبەتی"یشی کردبوو، چونکە "ئاشتی جیهانیی" دەخاتە ژێر مەترسییەوە. هەروەها لە پاڵ ئەوەشدا ، پێشنیازی ئەوەشی کردبوو، ئەو سەمایەی لە شوێنێکی دیاری قاوەخانەیەک لەسەر دەریای لە گالیلی(جەلیل) هەیە، قەدەغە بکرێ، لە سۆنگەی ئەوەی گوایە شوێنەکە پیرۆزە. ئیدی لەو دە ڕاسپاردانەی کۆمسیۆنەکە کردبوونی، تەنها ئەمەی دواییان لە لایەن بەریتانییەکانەوە جێبەجێکرا. لە ئاکامیشدا هێزەکانی بەریتانی لە شوێنی سەماکەی گالیلیا مۆڵگەیان لێدا کوتا و ئەو ڕابواردن و خۆشییە بێوەیەیان تێکدا، بەمەش نەفرەت لە کۆمسیۆن و بێڤن کرا.

کاتێک ڕاپۆرتەکە بڵاوکرایەوە، سنێ پێشنیازی کرد، کە ڕادیۆی دەنگی کۆل ئیسرائیل لە لایەن هەموو ڕێکخراوە چەکدارییەکان ڕێگای پێبدرێ ئەوە بڵاوبکاتەوە، ئەگەر ڕێنمایەکانی ڕێگەدانی سەد هەزار پەنابەر جێبەجێ بکرێ، ئەوا هیچ ئۆپەراسیۆنێک نابێ ئەنجامبدرێ، نەبادا ڕێگری لە جێبەجێکردنەکە بکا. تێوەگلانەکە ڕوون و ئاشکرا بوو. ئێمەش بە جدی گومانمان دەربارەی ئەو جۆرە جاڕدانەی "ئاگربەست" هەبوو. لێ لەبەر بەهەندهەڵگرتنی هەلومەرجەکە، بە پێشنیازەکە قایل بووین. ئێمە ڕۆشنانە بڕوامان بە وادە و پەیمانی حکوومەتی بەریتانیا نەبوو، خۆبەخشانە ڕێگە بە سەد هەزار پەنابەری جوو بدا، بەڵام دەمانەویست تا سنووری لوان ڕێگە دەدا، بەدگومانی لەمێشکی خەڵکەکەدا نەمێنێتەوە.

ئێمە لەوەدا هەڵە نەبووین. لەبلەبانێتی حکوومەتی کرێکارانی بەریتانی هاوشانی بۆنەکە بوو. ئاتەلێی لە ئەنجوومەنی گشتیدا ڕایگەیاند، دەبێ بە خێری ڕەفتار لەگەڵ ڕێنماییەکانی کۆمسیۆنەکە بکرێ. ئەوانیش (هەڵبەتە بێجگە لە ڕێنماییەکەی دژی سەماکردن لەسەر کەناری دەریای گالیلی) پابەندن بە شتی دیکە. خۆ ئەگەر جووەکان بیانەوێ 100،000 کۆچبەری جوو ڕێگەیان پێبدرێ بێنە وڵاتەکە، ئەوا دەبێ سووپا چەکدارە ناقانونییەکەیان هەڵبوەشێندرێتەوە و هەموو چەکەکانیشیان ڕادەستی

دەسەلاتدارە قانونییەکان بکەن... ماکدۆنالد و گرەم بە فەرمی بەبیر بێڤینیان هێنابووەوە، کە بەڵێنی بە ئەندامانی کۆمسیۆنەکە داوە، گەر ڕاسپاردەکانی بە کۆدەنگی دەربچێ، جێبەجێیان دەکا. قسەکەرەکەی بێڤینیش هاتە دەنگ، گوتی گوایە وەزیری دەرەوە لە بیریەتی کە پێش ماوەیەک شتێکی گوتووە، بەلام شتێکی بەڵگەنەویستە ئەو ئاماژەی بە ڕاسپاردەکان وەک تێکڕا کردووە، نەوەک بەشێک لە ڕاسپاردەکان یاخود ئەو بەشەی کە مایەی خۆشحاڵی جووەکانی نیویۆرکە یاخود هی سەرەک ترومانە. ڕاسپاردەکان یەکەیەکی لەیەک دانەبڕاون.

لەگەڵ ئەو ڕاگەیاندنامە زەق و زۆڕەی هەڵویستی بەریتانیا، ئێمە فشارمان خستە سەر هاگانا بەڵکو کردەوە سەربازییەکان دەستپێبکەینەوە و نارەزایەتی و هەڵگەڕانەوەی جەماوەریش رابگەیەنین. پێمان وابوو چاوەڕێکردن چی دیکە بەدەردی ئێمە ناخوا. ئێمە وامان گوت؛ دەبێ ئەوە نیشانی حکوومەتی بەریتانی بدرێ، کە ئەوان نابێ چاوەڕوانی چەککردنی ئێمە بن، دەست بۆ هەر پیاوێکی ئێمە ببردرێ، دەبێ بە گوللە وەلامیان بدرێتەوە... هەروەها پێشنیازێکی کردەنی، سەربازیی و سیاسییانەشم بۆ فەرماندەی بزووتنەوەی بەرگری نارد. لە 7ی ئایاریشدا وەلامەکەم وەرگرتەوە (لە دەقەکەدا "مریشکەکان" واتای فڕۆکەخانەکان دەدەن و "ڕۆژنامەوانی چاپکراو" ئاماژەیە بە چاپخانەکانی حکوومەت لە نزیک وێستگەی هێڵی ئاسنین لە ئۆرشەلیم):

"1- لەوێدا لەسەر بنەمای دەستپێکردنەوەی ئۆپەراسیۆنەکان بە بەرفراوانی هیچ رووبەرێکی جیاواز لە بیروڕاکانماندا نییە. لەگەڵ ئەوەشدا بڕیارەکە دەبێ بۆ ماوەی هەفتەیەک بوەخرێندرێ، ئەمەش بۆ مشوورخواردن لە زانیاری کەسەکانمان لە دەرەوەی وڵات. دۆستە ئەمریکییەکانمان داوایان کردووە، ئەوان خەریکی هەڵوەشاندنەوەی هەلومەرجی پشووی پەرلەمانەکەیانن، لەو بارەشدا هەر چالاکیێکی ئێمە دەبێتە مایەی بێئومێدکردنی ئەوان. هەڵبەتە ئەو بڕیارەش پێشتر پەسەندنامەی بۆ دەرچووە (مریشکی زیاتر و چاپەمەنی ڕۆژنامەگەری). لە ماوەی هەفتەیەکدا وا دەخەملێندرێ بڕیاری دەستپێکردنەوەی ئۆپەراسیۆنەکان بدرێ، تۆش لە وەلامی نەخشە وردەکارییەکەت ئاگادار دەکرێیتەوە. بۆیە پێشنیاز دەکەین،

کۆبوونەوەی داهاتوومان لە سێشەممە، 14ی ئایار و لە سەعاتی 20دا و لە شوێنی جارانمان بێ. تکایە گەیشتنەکەی بسەلمێنن.
2- ڕاگەیەندننامەکە بەرپرسیارێتی دەخاتە ئەستۆی حکوومەت. هەروەک بەڕێز Mیش پێشنیازی کردبوو، ڕاگەیەندننامەکە لەگەڵ ئەنجامدانی یەکەمین ئۆپەراسیۆن بڵاودەکرێتەوە..."
لەو کاتەی ئێمە چاوەڕوانی بەسەرچوونی هەفتەکەمان دەکرد تا ئۆپەراسیۆنەکان دەست پێبکەینەوە، لێ چاوەڕوانییەکە زۆری نەخایاند. ژمارەیەک لە نەخشەکانمان پەسەندکران. یەکێک لەو چالاکیانەش تێکشکاندنی شەمەندەفەرەکان بوو، دوای ئەوەی لە سەرجەم سەرنشینان خاڵی دەکران، ئەمەش دەستپێکی زنجیرەیەک ئۆپەراسیۆنی نوێ بوون. چەند ئۆپەراسیۆنێکیی دیکەش لەلای هاگانا و F.F.I دوابەدوای ئۆپەراسیۆنەکەی ئێمە هاتن. هاگانا پردەکانی تەقاندنەوە، F.F.I یش پەلاماری سەر کارخانەکەی هێڵی ئاسنیی لە حەیفادا دا.
مایەی داخێکی زۆر بوو، F.F.I لە کاتی چالاکیە پەلاماردەرانەکەی خۆی هیچ ئاماژەیەکی وریاکردنەوانەی لە لایەن هاگاناوە سەبارەت بە ئۆپەراسیۆنەکەی خۆیان پێنەگەیشتبوو، بۆیە کاتێک پیاوەکانی ڕێکخراوی F.F.I خەریکی پەلاماردانی ووركشۆپەکەی هێڵی ئاسنین بوون لە حەیفا، هێزی دوژمن وریا بووەوە، بۆیان لەسەر پێ بوو. مۆشێ سنێ لەلای من ڕایگەیاند کە تێبینێکی لە ناتام فریدمان پێگەیشتوە گوایە پەلامارەکەیان جارێ وەستاندوە. ئەو گفتوگۆ توند و گرژەش نەیتوانی ئاراستەی ڕاستی مەرگەساتەکە بگۆڕێ، بەوەی کاتێ جەنگاوەرەکان بۆ چالاکیەکە دەست بەکار بوون، لە ڕێی گەڕانەوەیاندا بۆ بنکەکانی خۆیان کەوتنە بۆسەی دوژمنەوە، لە ئەنجامدا یازدە پیاوی F.F.I کوژران و بیستی دیکەشیان لێ گیران، لەنێو گیراوەکانیشدا ژمارەیەکی زۆریان بریندارەکان بوون. هیچ ئاماژە ڕێزلێنانێکی فەرمیش بۆ ئەو قوربانییانەی F.F.I نیشان نەدرا. لە هەمان کاتیشدا ئەندامێکی کوژراوی هاگانا، کە دوای کارەساتی تەقینەوەکانی پردی A.Zib تەرمەکەی دۆزرایەوە، ڕێوڕەسمێکی بە خاکسپاردنی جەماوەریانەی بۆ سازکرا.

هێرشـی سـەر پردەکـان لە ڕووی قەبـارەی خـۆی قەبە بـوو، لە ڕووی سیاسییشەوە گرنگ بوو. پیاوەکانی هاگانا لە هەلومەرجێکی سەختدا قۆڵیان لێهەڵماڵیبوو. ئەوان دەبـوایە ڕێگـایەکی دووردوودرێـژ ببـڕن و بە ڕێگـایەکی لاوەکیشدا بکشێنەوە تا لە گەڕانەوەیاندا ڕووبەڕووی هێزی دوژمن نەبنەوە. لە لای پردەکانیش کە پاسەوانیەکەی بە چەند پۆلیسێکی عەرەب سپێردرابوو، هیچ بەیەکدادانێک نەقەومابوو، لێ ئەو زیانەی بەر پیاوەکانی هاگانا کەوت، چواردە کەسیان لێ کوژران، بە هۆی ڕووداوی تەقینەوە نەزانانەکەی خۆیان بوو، کە شارەزییێکی ئەوتۆیان بە دانان و تەقاندنەوەی مادە تەقێنەرەوەکانەوە نەبوو، لێ ئەرکەکەیان بە تەواوی وردەکاریەکانەوە بەجێ گەیاند. بارستە ئاسن و پۆڵایەکی کەتە و زەبەلاحی پردەکانی باکوور، باشوور و ڕۆژهەلات بە هۆی تەقینەوەکانی پیاوەکانی هاگانا هەرەسیان هێنا و ڕوخێندران.

ئەمەشیان دوا ئۆپەراسیۆنی بزووتنەوەی یەکێتی بەرگری بوو. هێزەکانی بەریتانیش کەوتنە خۆ و دژە پەلامارێکی بەرفراوانیان دەستپێکرد. ناکرێ بگوترێ ئەوان بەرچاوانە لە کاردانەوەی ئۆپەراسیۆنەکانی بەرگریەکە شکستیان هێنا. بە پێچەوانەوە ئەوان بە کەمە ئۆپەراسیۆنێک لە چەند شوێنێکی ولات، لە ریشپەن، جیڤات حایم و تەلئەبیب تۆڵەی خۆیان کردەوە. لەو هەمـوو شـوێنانە بە هەزاران لە خەڵکـی کۆبـوونەوە، بەڵکـو ڕێـگە لە کنەوپشکنینی تۆڵەستێنانە بگرن کە لە سەرتاسەری ولات بەرپابوو. ئاپۆرای خەڵکی بێ پارێزەر بـوو، بـۆ دوژمـن و گوللەکانیـان ئامـانجێکی کـراوە بـوو. لەوێشدا نەوەک هەر پیاوێکی بێ چەک بەڵکو ژن و منداڵیش کوژران، ئەمەش بـووە هـۆی ئەوەی بە بـزووتنەوەی یەکێتـی بەرگـری بڵـێن لەبەر خـاتری پاراستنی گیانەکان، ئەو "ڕاپەڕینە پاسیڤە" دژوارە رابگیرێ.

هێزەکـانی حکـوومەت بە شـێوەیەکی وا دەرچووبـوون، کە بڕبـڕەی پشـتی "تیرۆریزمـی جـوولەکە" بشـکێنن و کۆتـایی بە هەمـوو بەرگریکردنێکیشـیان بهێنن. لە ئاکامیشـدا ئەوان بە وریـاییەوە هێرشـێکی دڕنـدانەیان کـردە سـەر دامەزراو و هێزە جوولەکەییەکان.

پەلامارەکەش لە بەرەبەیـانی 29ی حوزەیرانی 1946دا بـوو. بەدەیـان هەزار لە سەربازە بەریتانییەکان لە مۆڵگەکانیان دەرچوون و بەسەرتاسەری ولات بڵاوبوونەوە، باری نائاسـاییان ڕاگەیاند، هاتوچۆیان قەدەغەکرد، بە هەزاران

کەسیان گرت و راپێچی بەندیخانەکانیان کردن. تەلاری ئاژانسی جووەکانیش دەستی بە سەردا گیرا. سەرانی دامەزراوە فەرمییەکان و ئەندامە کاراکانی هاگانا بە گوێرەی لیستێکی پێشوەختە ئامادەکراو، گیران. بە یارمەتی ئەو لیستە، هێزە بەریتانیەکان بەسەر گوندە هەرەوەزییەکانیشیان دادا، کە یەکەکانی پالماخی تێدا جێگیر ببوو. لیستەکانیش بە شێوەیەکی سەیر دەقاودەق راستودروست بوون. لە راستیشدا لە هەر گوندێکی هەرەوەزییانە کە بەنهێنییەوە یەکەیەکی پالماخی تێدا جێگیر کرابوو، بۆ دەزگای هەواڵگری سەربازی بەریتانی شاراوە نەبوو. بۆیەشە ئەوان لەوەدا سەرسام نەبوون، کە دەرەنجامی کردوکۆی پشکنینەکانیان قەبە و گەورە بێ. ئیسرائیل گالیلی پێیگوتم، ئەو زەبرەی بە پالماخ کەوت کوشندە بوو. نزیکەی نیوەی ئەندامەکانی گیران. پلە باڵاکانی هاگاناش بەتوندی بەر پەلامارەکە کەوتن و گیران.

ئەو رووداوانە بوونە خۆراکێکی زۆر بۆ هزری فەلسەفەی مێژوویمان. ئیدی کەسێک دەبێ پێشبینی ئەو رێگاگرتنەبەرە بکا، کە رزگاربوونی گەلەکەمانی بەدواوەیە. بێ هیچ گومانێک ئاوەدانکردنەوە پێشەنگەکان هۆکارێکی مەزنی پێواژۆی رەگداکوتانی گەلەکەمان بوو لەسەر خاکی ئێرتز ئیسرائیلدا. نشینگە کشتوکاڵیەکانیش وەک بنکەیەکی بەرگری شەڕ بوون دژی عەرەبەکان. ئێمە هەرچەندە توشی چەندان کۆسپ و تەگەرە بیووینەوە، لەوانەش دەرگای ئەو ئاوایی و نشینگانەش لەسەر ئێمە داخرا بوون. ئێمە بە تەنیا نشینگەی ناخلات ژابۆتنسکی و رامات تیۆمکینمان هەبوو، ئەوانیش کۆمەکێکی بەرچاویان لەبارەی مەشقپێدانی مەیدانی بۆ ئەنجامدانی چەندین هەڵمەت و پەلامار کردین. ئای کە چەند باری خەباتی ژێرزەمینیمان ئاسانتر دەبوو، گەر هاتبا ژمارەیەکی یەکلاکەرەوەی نشینگە و دێهاتمان لەبەردەستدا بووبان؟ ئاخر چ جۆرە ئاقارێک بۆ مەشق و راهێنانەکانمان هەڵبژاردبا! لێ گەلۆ دیارە چارەنووس بەرێگای خۆیدا دەڕوا. بەر لەوەی دەوڵەت دابمەزرێ، ئێمە لەسەر زەوی دانەمەزرابووین. ئێمە دەجەنگاین. خۆ ئەگەر خاک و نشینگەمان ئەوێ دەمێ هەبووایە، بارێکی ژێرزەمینی راستەقینە لەو تۆبۆگرافیا سەیرەی هەلومەرجی ئێرتز ئیسرائیلدا نەدەهاتە کایە. ئەوسا

حکـوومەتی بەریتـانی دەیزانـی لە کـوێ خۆمـان حەشـار داوە، زۆریشـی پێنەدەچوو کە بماندۆزێتەوە هەروەک چۆن یەکەکانی پالماخی دۆزیەوە.
لە کنەوپشکنینێکی لەناکاو سەرسامانەدا باری ژێرزەمینی ڕادەماڵدرا، ئیدی خێرا وەک چۆن خەباتی ڕزگاریخوازی دەستپێکردبوو ئاوا زووش کۆتایی پێدەهێندرا. لەبـاری "ئاشـکرایی ژێرزەمینیماندا" دەسـەڵاتداران نەیاندەزانی لە کوێ بەدواماندا بگەڕێن. ئێمە لە هەموو شوێنێک بووین و لە هیچ شـوێنێکیش نەبووین. لە ڕاستیشدا نەبوونی پێگە و بنکەی دیهاتی، ئەرکەکەی ئێمەی زۆر قـورس کردبـوو. پێدەچوو قەدەریـش کـارێکی وا پێشـنۆرەییانەی کردبێ، کە ئەرکی حکوومەتی زۆر ئاستەنگ کردبێ لەوەی دەستیان پێمان ڕابگا...
لێ گەلۆ، لە 29ی حوزەیران کاتی لەسەر پێ وەستان و تێڕامـان نەمابووەوە. پرسـەکەش ئەوێ دەمـێ ئەوە بـوو: باشـە چـی بکـرێ؟ ئـێمە هێشـتا هـۆیەکی لایەقمـان نەبـوو کە دووڵ بـین لە بەردەوامـی بەرگریـی هاگانـا. بە درێژایـی ڕۆژ ئێزگەی Kol Israelی ئاژانسی جووەکان هەر هاتوهاواری بوو:
"بەریتانیا جاڕی شـەڕی دژی گەلی جـوولەکە دا. گەلی جـوولەکەش دەبێ لە بەرامبەریدا بجەنگێ. خۆتان و ڕۆڵە پیسەکانی تیتوس لە نیشتمانی پیرۆزمـان دەرکەون! بڕوخێ ڕژێمی نازی-بەریتانی لە وڵاتەکەمان!"
دەقـی پەخشـانەکانی دەنگـی ئێـزگەکە لە جـاڕدانی دەسـتکردنەوەی پێشـتری هاگانـا دەچـوو، بەڵام بە پێچەوانەی ئەوەی ئێمە، تێبینیێکی دەمارگرژییـانەی لەبـارەوە هەبـوو. لەو ڕۆژەدا ئـێمە هـیچ دروشـمێکمان نەدا. ئـێمە پێشـنیازی بەرنـامەیەکی کردەنیمـان کـرد، ئەو کـاتەش بڵاومـان دەکـردەوە کـاتێ بـۆ سەرکردایەتی بزووتنەوەی یەکێتی بەرگریمان دەنارد.
ئێمە ئەو نۆ پێشنیازانەی خوارەوەمان کردن:
1- دامەزرانـدنی حکـوومەتێکی کـاتی جـوو، تـا کـار بـۆ نەهێشـتنی ڕژێمـی داگیرکاریی بکا.
2- دامەزرانـدنی ئەنجـوومەنێکی بـاڵا بەچەشـنی پەرلەمـانی گەل، بـۆ ئەوەی کاروباری قانونی و دەستنیشانکردنی ئەرک و فەرمانەکان لەئەستۆ بگرێ.
3- بڵاوکردنەوەی جاڕنامەی ئازاد و سەربەخۆییانەی عیبری وەک بناغەیەک بـۆ دەسـتوور، دەشـبێ ئـازادی، یەکسـانی و دادی کـۆمەڵایەتی بـۆ هەمـوو ئاکنجییەکانی وڵات دەستەبەر بکا.

4- دامەزرانــدنی دادگــایەکی دادپەروەر و دادگــا بەریتانییەکــانیش پەرگیــر بخرێن.
5- دامەزرانــدنی خەزێنەیەکــی نیشــتمانی، کە هەمــوو بــاجە پێــدراوەکانی لەخۆبگرێ و ئیدی ئەوە قەدەغە بکرێ کە باج بدرێتە حکوومەتی ماندات.
6- دروستکردنی سووپایەکی یەکگرتوی ڕزگاریخواز کە سوێندی ئەوە بخوا نابێ تا دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ، چەک دابنێ.
7- دامەزراندنی فەرماندەیی باڵای سەربازی کە جاڕی جۆشدانی گشتی بدا و بەڕێوبەرایەتییێکی فریادڕەسانە بۆ بەڕێوەبردنی ژیانی ڕۆژانەی خەڵک و بەڕێوەبردنی خەباتەکە لەئەستۆ بگرێ.
8- لە هەندەران بانگەواز بۆ کۆمەککردن بکرێ.
9- داوا لە گەلانی جیهان -لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، یەکێتی سۆڤیەت، فەڕەنسـا و تەواوی گەلە ئازادەکـان بکـرێ- پاڵپشـت و کـۆمەکی جەنگـاوەرە عیبریەکان بۆ ئازادی بکرێ.

ئەو تــوخمە نــاوهێنراوانەی بەرنــامەکە لە ڕۆژنــامەگەری جیهانیــدا شــوێنی گەورەیان وەک "بڕوانامەی ئیرگون زڤای لیومی بۆ سەربەستی" بەدەستهێنا، لە هاوینی 1946دا جێبەجێنەکرا، بەڵکو دوو ساڵ پاشتر پەیڕەو کرا. دیسان بەهـۆی ئەوەوە ئێمە پـێش مێژوو کەوتـین. ئـاخر لە ڕووادوە مێژووییەکانـدا، هەر دەبێ کەسێک پێشـتر پێشـبینی بکا، بەڵام تۆ بڵێی شـتێکی جەوهەریش نەبێ، کە لەوێدا هەمیشە کەسێک ئەو شتە بە کارلەکار ترازان نەزانێ؟

بازنەی کاربەدەستە فەرمییە جووەکان کەوتبووە بارێکی شڵەژان و پاشەکشە دەستی پێکردبوو. سەرەتا فەرمـان بەسـەر زۆر لە گیراوە جووەکان کرابوو، خۆیـان نەناسێنن. وەڵامە بەردەستەکەیان بۆ لێکۆڵەرەوە بەریتانییەکـان ئەوە بـوو، "جوویـێـک لە فەلەسـتینەوە." بەریتانییەکـانیش ڕایانگەیانـد گەر هــاتوو ناسـنامەکەی خۆیـان نەڵـێن، ئەوا نـابێ باسـی ئازادکردنیـان بکـرێ. فەرمـانی بـزووتنەوەی یەکێتـی بەرگـری لە سـەنگی مەحەک درا، بەڵام شکسـتی هێنـا. تەنهـا چەنـد ڕۆژێکـی کەم بەسـەر چووبـوو بەر لەوەی هـاوار لە ئۆردوگـای گیراوەکـان هەڵبسـتێ: "بمـان ناسـن!" ئیـدی بەریتانییەکـان ناسـنامەی زۆری گیراوەکانی بۆ ئاشکرابوو، لێ هەر ژمارەیەکی کەمیشی ئازاد کردن.

لەنێــو گیراوەکـــان، ســـەرەڕای خۆناساندنیشـــیان، ژمـــارەیەک ســـەرکردەی ناسراوی ئاژانسی جووەکان ڤاد لیومی (دەزگای جێبەجێکاری کۆمەڵگەی جووەکانی ئێرتز ئیسرائیل) وەک رابی فیشمان، ئیزهاق گرەنباوم، موشی شێرتوک، داڤید سپینت، د. دۆڤ یوسف و ئەوانی دیکە ئازاد نەکران. هەر چی پیاوەکانی ئێمەش بوون، کە ساڵانێک بوو لە ئۆردوگای گیراوەکاندا بوون، بەخێرهاتنێکی دۆستانەیان لە هاوزیندانەکانیان کرد. دوو لە سەرکردەکان کە بە لای کوڕەکانی ئێمە باشترینیان بوون، گرەنباوم و ریمز بوون. ریمز تەلمودی فێرکردن و باسی یەکێتی نیشتمانی بۆ کردن، شاریتیش کە بە خۆپارێزی لەسەر داخوازیەکەی مایەوە: "ئێمە دەبێ لێرە وەک جوویکی باشتر دەربچین لەو کاتەی بۆ ئێرە هێنراین." گرەنباوم پەیوەست بوو بە رامانێکی سەرنجراکێشی ئۆردوگای گیراوانی (لاترن). لەبەر هۆکارەکانی سەروو ئەو تەنها بەشی یەکەمی بڵاوکردەوە کە تیایدا ئەوە دەرکەوت، ئەو جەنگاوەرە دێرینە بووە کەسیکی مکوڕی شکستخواردوو بۆ وەستاندنی خەبات و پەسەندکردنی سیاسەتە ئاشتەواییەکەی وایزمەن. چەند مانگێک دواتر ئێمە لەومان زانی ئاخۆ نیازە ڕاستەقینەکەی چی بووە. لە گۆشە نیگای ئەوەی لە 29ی حوزەیراندا قەوما، گرەنباوم گەیشتبووە ئەو ئەنجامە، هاگانا دەبێ مەیدانی بەرگری سەربازیانە جێبلێ، وەک ئەویش زیاتر لەسەری ڕۆیشت، هەروەها دەبێ هەڵگەڕاوەکانیش لەسەر جەنگەکە بەردەوام بن. من دڵنیا نەبووم ئاخۆ ئەو بیرۆکە سەرنجراکێشە ڕاست بوو. ئەوەی دڵنیابوو سەلماندنی زۆر لە کێشەکان و ئاستەنگەکان بوو، کە دەبوایە دورخرابانەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، شتەکە پەسەند نەکرا، ئەو ڕۆژەش هات کە بەڕێز گرەنباوم ڕاستگۆیانە لە کۆبوونەوەیەکی ئەنجوومەنی گشتی زایۆنیزمدا گوتی: "من پشتگیری بەرەی یەکگرتووی بنگۆریۆن و بێڤین دژی بێگن ناکەم."

وێڕای ئەوەش، پەیوەندی دۆستانەی نێوان کەسە زۆر گرنگەکان و جەنگاوەرە دێرینە گیراوەکان کە من سکاڵایەکم لە فەرماندەی بزووتنەوەی بەرگری بەو وشانەی خوارەوە پێگەیشت: "حزقێل، خەڵکی تۆ لە گرتووخانەی لاترندا قرەقرڕ لەگەڵ کەسە زایۆنیستیە گیراوەکاندا دەکەن. ئایا دەکرێ داوایان لێبکەی دەستبەجێ ئەو شتە راگرن. ئەوەی خوازراوە، ئەو شتە بەبێ وەخران ئەنجام بدرێ. من چاوەڕێی وەڵامتم. M-I."

منیش دەمودەست لە ڕێی نامەگۆڕینەوەی باری ژێرزەمینییەوە، کە لەگەڵ هەموو کەسە گیراوەکانمان لە هەر کوێیەک بووبان لەسەر هێڵ بووین، بەدوای سکاڵاکەدا ڕۆیشتم. ئەفسەرەکەی ئێمە پەیوەست بە گیراوەکانی ئێرگون لە لاترن سەرلەبەری تۆمەتەکەی ڕەت کردەوە.
ئەو توخم و ڕەگەزانەی لەسەرکردایەتیدا هەبوون و سنێ و گالیلی پێیان دەگوت شکستخواردووەکان، لە کۆتاییدا "چالاکوانەکانی" بۆڕ پێدا. دوای مشتومڕێکی زۆر ئەوان بڕیاریان دا پشت لە بەرگری سەربازییانە بکەن و هەڵگەڕانەوەی مەدەنییانەش بەرپا نەکەن. ئەوان بڕیاریاندا مەرجەکانی حکوومەتی بەریتانی لەپێناوی ئازادکردنی کەسە گرنگەکانیان پەسەند بکەن. ئیدی ڕاشکاوانە لە بەردەم جەماوەردا بە بڵاونامە، ئیدانەی "تیرۆرزم" کرا و ئەوەشیان لەخۆگرتبوو، کە بە تەواوی لەناو ببرێ. بەمجۆرە کەسە گرنگەکانی جوولەکە دوای سەد ڕۆژ گیران ئازادکران و گواسترانەوە بۆ کۆنفرانسێکی ئەنگلۆ-عەرەب-جوو لە لەندەن بۆ ئەوەی "چارەسەرێکی سازشانە" بۆدۆزی فەلەستین بدۆزنەوە. بۆ ئەوان خەبات هەڵپەسێردرا.

**3**

ئاماژەی بەرچاوی مۆرالیانەی بەرفراوانبوونی گەڕانەوە بۆ وڵاتی ئێرتز ئیسرائیل، کە دەمودەست لەگەڵ وەستانی بزووتنەوەی یەکێتی بەرگری پەیدابوو، نابێ بەکەم سەیر بکرێ. ئەوەش ڕاستییە، ئەم هەڵمەتە بە دژبەری هەوڵوتەقەللای گەڕانەوە بۆ خاکی باوکوباپیران بەرلە جەنگی دووهەمی جیهان، کە لە لایەن جۆزێف کاتزنلسۆن و ئاڤراهان ستاڤسکی درابوو، نەبووە مایەی ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە جووەکان بێنەوە وڵات. دەسەڵاتدارانی بەریتانی ئەو هەزاران پەنابەرەی لە نزیک کەنارەکانی ئێرتز ئیسرائیلدا ئابلۆقەدان و بەزۆریش گەڕاندیانەوە ئۆردوگا زۆرەملێکانی قوبرس. گەڕاوەکانی نێو ئۆردوگا زۆرەملێکانی ئاڵمان بە دەستی بەتاڵ شەڕیان لەگەڵ سەربازەکاندا دەکرد. هەرچەندە لەوێ پیر و ژن و منداڵیش کوژران، هۆڵی سپی (مەبەست حکوومەتی بەریتانیا) بەڵگەوبەندی زێڕینی لەهەمبەر ئەو "ڕەفتارە نەشیاوەی خەڵکەکەدا هێنایەوە، کە هەوڵیان دەدا ژن و منداڵ بخەنە سەر پشتی کەشتییە پیسوپۆخڵەکان." دەکرا حکوومەتی بەریتانیا ڕاوی

کەشتی و گەمی پەنابەراکان بکا، دەکرا سەرنشینەکانیان سنووررداش بکاتەوە، لێ ئەوان بەم کارەیان گوایە قانون دەپارێزن.
لە لای جووەکانیشـەوە، ڕووێکـی مـۆراڵی هاوشـانی ئەو قۆنـاغەی گەڕانەوە بـوو. خەبـاتی هاگانـا لە ئێرتـز ئیسـڕائیلدا گەیشـتبووە بـارێکی تەواو چەقبەستوو. سەرکردەکانی ئازاد کرابوون، پیاوەکانی پالماخیش گەڕابوونەوە بنکە و مۆڵگەکانیان. پیاوەکانی هاگاناش گەڕابوونەوە نێو ماڵ و گوندەکانی خۆیـان. ئیسـڕائیل گـالیلیش قـژی درێـژ کردبـووەوە. دیسـان هاگانـا ببـۆوە ڕێکخراوێکـی نـیمچە قانونییـانە. بـاری ئەمـری واقـع بەتەواوی گەڕابـووەوە شـوێنی جـارانی خـۆی. ئـا لەو کاتەشـدا هەمـوو بەرگرییێکـی بەریتـانی و بە هەموو هێزیشیانەوە ڕووی لە پەنابەرانی ئاڵمـان کردبوو، ڕووی لەو خەڵکە بێـدەرەتان و بێبەرگـرییە، رویـان لەو هەمـوو ژن و منـداڵە بەسـتەزمانانە کردبــوو لێــنەدەگەڕان بێــنە فەلەســتین. ئەو پەنــابەرانە لێیــان درا و سنووررداشـیش کـرانەوە هەندێکیشـیان کەلـوکرۆم کـران و ژمارەیەکیشـیان لێکـوژران. سـەرکردە فەرمیـیە جووەکـانیش گەروویـان دڕا ئەوەنـدەی هەر هاوار و دادەداد بکەن.
ئـێمەش بڕوامـان بە سـکاڵا و نـاڕەزایەتی زارەکـی نەبـوو. دوای هەر سنووررداشـکردنەوەیەک ئـێمەش زەبـری قورسـمان لە حکـوومەت دەدا. جەنگاوەرانی F.F.Iیش لە ئاگرتێبەردانی تـانکە نەوتییەکانی بەنـدەری حەیفـا سـەرکەوتن، کە لەوێـووە کەشـتی و گەمییەکـانی بەریتـانی بـۆ سنووررداشکردنەوەی ئاوارەکان چاوەڕوانی نێچیرەکانیان دەکرد.
بەدڕەفتـاری حکـوومەتی بەریاتنیـا دەرهەق گەڕاوەکـان لە دۆزی کەشـتی ئیکسـیدۆسExodus (کـۆڕەو)دا و لەسـاڵی 1947دا گەیشـتە لـوتکە. ئـاخر بێڤین بڕیاریـدابوو کەشتیەکە بگەڕێنێتەوە ئاڵمان. سکاڵا و تکانامەکـان هـیچ دادیـان نەدا. خەڵکەکەی سـەر پشـتی کەشـتیەکەش کە بـوێرانە ڕووبەڕووی بەریتانییەکان ببوونەوە، سامناکانە زراو و هەترەشیان چوو کاتێ لەبارێکی نارێکدا ئەوان لە حەیفاوە بەرەو هامبورگ دەگەڕێندرانەوە.
لە نـامەیەکی ئاودیوکراوی سـەر پشـتی کەشـتییە دەست بەسـەرداگیراوەکەدا، ئاوارەکان نووسیبوویان:

"خەڵکەکە کەساس و کڵۆڵە... ئێمە وا هەست دەکەین وەک ئەوەی بڕیاری مەرگمان بەسەردا درابێ. دەکرێ ئێمە لە هامبۆرگدا بەرگری بکەین، بەڵام ئایا دادمان دەدا؟ حکوومەتی بەریتانیا بۆ بەسەرخستنی نیازەکەی هەموو شتێک دەکا و جیهانیش لە ئاستیدا هەروەک ڕابردوو قڕوقەپە. لێ گەلۆ برایەکانمان لەملاو ئەولا -جووەکانی ئەمریکا و ئینگلستان و ئێرتز ئیسرائیل- تۆبڵێی بێدەنگ بمێننەوە؟ ئێمە بە نابەدڵی لەبن ئەو باندۆرەین کە ئەوەی پێویست بوو کرابا نەکرا..."

ئێمە ئەو وشە بێئومێدییە تاڵوتفتانەمان بڵاوکردنەوە، بەڵێنیشمان بەو برایانەی سەر شەپۆلی زەریاکان دا، بەناوی یاخیبووان، بەناوی جەنگاوەران کە بە ڕاستی ماونەتەوە، "ئێوە بە تەنیا لە خەباتەکەتان جێ ناهێڵین. ئێمە دەڵێین یان ئێرتز ئیسرائیل یان مردن."

ئێمە دەمودەست کەرەستەی کۆمەکردنی ئەوانمان لەبەردەستدا نەبوو. لەتاو کەموکورتی دووهێندەدا دەمانناڵاند. خەزێنەی ئێمە بەتاڵ بوو هەروەها تەقەمەنیشمان لە عەمبارەکاندا نەمابوو. تۆڵەکردنەوەی ئەو جۆرە ڕووداوە بە تەقەیەک و دوو تەقە نەدەبوو. باشە ئێمە چ زەبرێکیان لێبدەین؟ ئێمە ددانمان لەسەر یەک دەگیرساندن. ڕۆژ و شەو ڕادەبوردن و هێشتاش تۆڵەمان نەکردبۆوە. خەڵکەکە هەدادانیان نەمابوو، سەرسامبوون ئاخۆ چی بەسەر ئێرگوندا هاتووە. شتێکی تایبەتمەندانەبوو، تەنانەت ڕکابەرەکانیشمان، زۆر لەوان بە نهێنی لەدڵی خۆیان موبارەکباییان لێدەکردین، کەچی لەسەر لێوانیشیان توک و نەفرەت دەباری؛ لەو ڕەوشەی ئێمە تێیکەوتبووین تووڕەوتوسن بوون کە بۆچی تۆڵە ناکەینەوە. لێ ئێمە کارایانە وەڵاممان نەدایەوە. ئاخر نە کەرەسەی تەقینەوەکان هەبوو نە پارەش. ئێمە لە داخی بێ ئومێدیدا خۆمان دەخواردەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، بەخت دەستبەرداری ئێمە نەبوو. بەشێوەکی پەرجووئاسا هەندێ پارەمان بە دەست گەیشت. سەرسامانەش و دەستبەجێش داوای نیو تەن مادەی تەقینەوەمان کرد. گیدی پەرجووەکەی تەواو کرد. ئەو بەرمیلە بارودی ناوداری دروستکردن، ئەو بەرمیلەی لەسەر تایە بوو، ئیدی بەیانییەکیان لەسەر ترومبێلێکی زرێپۆش (یەکەم شێوەیان بوو لە ئێرتز ئیسرائیل) فڕێدرا و سەرلەبەری "زۆنی ئاسایشی" حکوومەتی لە حەیفا

هەژاند، بەمەش چاوی دەزگای ئاسایشی بەریتانی لە سەرتاسەری وڵاتدا ترساند. داهێنانەکە تا دوا وردەکاری کاری خۆی کرد، لەگەڵ بەربوونەوەکەی و بەهۆی تایەکانی ژێری نەوەستا تا خۆی بە دیواری قەڵایەکەوە نا. دەسەڵاتدارە سەربازیەکەش وروژا. ئەوان دەوروخولی زۆنە ئاسایشیەکەیان بە باشی بە تەلبەندی چڕوپڕ دوازدە تا پازدە پێ تەنی بوو، کەچی لەوێوە ئەو بەرمیلە فڕێدرا! بەسەر پەرژینە تەلبەندەکەشدا بازی دا. بە ڕاستی بەرمیلێکی دێوانە بوو. دەستبەجێش فەرمانیان پێکرا بەرزی شوورەی تەلبەند بۆ بیست و چوار پێ بەرز بکەنەوە. ئەوەشیان تەڕدەستانە ئەنجام دا. بەڵام گیدی بەسەر ئەمەشدا زاڵ بوو. بەدڵنیایەوە گەر هێزەکانی بەریتانیا نەکشابانەوە، شووره تەلبەندەکەشیان بۆ بەرزی شەست پێ بەرز دەکردەوە، بەڵام ئەوەش هەر دادیان نەدەدا.

باندۆری حکوومەتی بەریتانیاش لەسەر جووە دۆڕاوەکان، مەزن بوو، کە جێپێی خۆیان قایکمرد. لە 29ی حوزەیران بەدواوە، ئەوان بەسەر دامودەزگا فەرمییەکاندا زاڵ بوون. بڕیاریاندا کۆتایی بە بەرەنگاری سەبازیانە بێنن. ئەوان تەنها لەوەدا سەرکەوتن کە کۆتایی بە کردە سەربازییەکانی هاگانا بێنن.

د. وایزمەن، سەرۆکی ڕێکخراوی زایۆنستی داوای کردبوو، دەبێ تا کۆنگرەی دادێ زایۆنستەکان هیچ ئۆپەراسیۆنێکی دیکەی سەربازی نەکرێ. سنێش ڕەتی کردەوە ئەو بەڵێنە بدا. ئاخر ئەو پێشتر پابەند بوو بەو لەخۆگرتنەی ئەفسەرانی هاگانا کە دەبێ بەرگری بەردەوام بێ و دەبێ گەلی جوولەکە دەستبکاتەوە. نەخشە بۆ دەستبەسەرداگرتنی چەک و تەقەمەنی مۆڵگەیەکی سەربازی بەریتانی ئامادەکرابوو. ئەو هەڵمەتەش لە تۆڵەی ئەو دەستبەسەرداگرتنەی جبەخانەی چەکوچۆڵی جووەکان بوو لە باکوور، لەو کاتەی بەریتانییەکان دەستیان بەسەر چەند سەد تفەنگ و سەدان هەزار فیشەک و هەزاران گولله هاوەن و... هتد داگرت. (ڕێکەوتانەش ئێمە لەو بڕوایەدابووین، کە هاگانا بە دەرزەن لەو جبەخانەیان هەیە، بەڵام بەداخەوە ئێمە هەڵە بووین.) د. وایزمەن داوای لە سنێ کرد وەک بەرپرسی هاگانا دەست لەکار بکێشێتەوە، ئەگەر وا نەکا ئەوا وایزمەن خۆی لە سەرۆکایەتی ڕێکخراوی زایۆنستی دەکێشێتەوە. لەنێو ئەو دوو بەربژارەش بۆ دەست

لەکارکێشانەوە، بەدحاڵیبوونێکی سەیر پەیدابوو. د. وایزمەن گلەیی لەوە کرد کەوا پێشــوەخت هــیچ زانیــاری دەربــارەی پەلامــارەکەی ســەر پردەکــان پێنەدرابوو. سنێش دەیگوت کە زانیاری پێگەیشتووە. لە کۆتایشدا واکەوتەوە هەر دووکیان ڕاست بوون: سنێ زانیارییەکانی ناردبوو، بەڵام وایزمەن پێی نەزانیبوو. پەیامەکەی پێنەگەیشتبوو.

وێڕای باری نەخۆشی د. وایزمەن هەر لەسەر هۆشدارینامەکەی سووربوو. "چالاکوانەکان"ی نێو سەرکردە فەرمییەکانی جوو وایان بڕوابوو، دەست لەکارکێشانەوەی وایزمەن ڕاشکاوانە زەبرێکی کوشندە لە ڕێکخراوەکەیان دەدا. هاشۆمەر هاتزایر (زایۆنیستە کۆمۆنیست سۆسیالیستە توندڕەوەکە) خۆی وەک سیاسەتی وایزمەنی دژە توندوتیژی ناساند. هۆبەیەکی گەورەش لە ماپای (پارتی کرێکارانی فەلەستین) داوای ڕاگرتنی تیرۆرستەکانیان دەکرد چونکە بۆتە هەڕەشە بەسەر سەرلەبەری زایۆنیستەکان. ئیدی د. وایزمەن سەرکەوتنێکی بەرچاوی بەدەست هێنا و سنێش دەستی لەکار کێشایەوە.

سنێ ئامادەی کۆبوونەوەیەکی "چارەدرانە"ی بەڕێوبەرایەتی جێبەجێکاری ئاژانستی جووەکان بوو لە پاریس، کۆبوونەوەکە بۆ چەندان هەفتە مشتومڕی لەسەر پرسێکی بنگەیی بوو: خەبات بەردەوام بێ یان نا. لە میانەی دەمەتەقێکاندا بنگۆریۆن وەک شاخ چەقی بوو، پێی لەسەر بەردەوامبوونی خەبات داگرتبوو. سنێش بە سووربوونەوە پشتگیری ئەوی دەکرد، بەو هیوایەی بە بڕیاری یەکلاکەرەوەی "جەنگانەوە" بگەڕێتەوە ئێرتز ئیسرائیل. لێ هەر ئەو کات و لە پڕێکەوە بنگۆریۆن ڕای خۆی گۆڕی و بە فەرمیش بەرگرییەکە وەستێندرا. ئەم وەستانەش تا نۆڤێمبەری 1947دا نەپچڕا، ئەو کاتەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری دابەشکردنی ئێرتز ئیسرائیلی داو عەرەبەکانیش دەستیان بە کوشتنی جووەکان کرد. لێ وێڕای ئەوەی بەرگری فەرمی وەستێندرابوو، ئەمما یاخیبوون هەر بەردەوام بوو.

سەرەڕای ئەو هەموو شتەی کە ڕوویدا، بەلای منەوە ئەو ماوە کەمەی یەکێتی بزووتنەوەی بەرگری، خۆشترین ڕۆژەکانی ژیانم بوون. لەوێدا هەمیشە دوو ڕامان لەبەر چاومدا هەبوون. بە پلەی یەکەم ئێمە گەیشتبووینە خواستی دڵەکانمان؛ لە بەئاگابوونەوەماندا هەموو گەل پاڵی دابووە خەباتی

ڕزگـــاریخوازی وڵات. ئەو ژن و پیـــاوانەی ڕاوەدوو دەنـــران ببـــوونە خۆشەویستی گەل. ئەوانیش بە ڕەوایەتیەکەیان شادمان بوون.
دووهەمـین رامـان "خۆمـانە" بـوو. فەرمانـدەیەک لە جەنگـدا –فەرمانـدەی ڕاسـتەقینە ئەو کەسـەیە کە هەڵگری زۆرترین کێشـەی بەرپرسـیاریتی بـێ، بەرپرسـیاریتی ژیـانی مرۆڤەکـان- دەزانـێ ئـاخۆ بەختـی ئەو چەنـد قورسـە، چەندان گێرەوکێشەی نەبینراوی لە بەردەمدان، بەڵام تۆ بڵێی بەرپرسیاریتی فەرمانـدەی 'دەستلەکارکێشـاوە" لەگەڵ هەسـتی بەرپرسـیاریتی لە دڵەوەی فەرماندەیەکی "هەڵگەڕاوە" بەراورد بکرێ؟ فەرماندەیەکی هەڵگەڕاوە! هەموو سـەرکەوتنێکی وەک نوشسـتی سـەرکۆنەکراوە، شکستیەکەشـی وەک کارەسات، وەک ناپاکی وایە. لە ڕەوشی وەک ئەودا، وشـەی "بەرپرسیاریتی" بەکـردەوە بـێ واتـایە. مـن هەر دەتـوانم ئەو پرسـە دووبـارە بـکەمەوە کە لە ڕۆژەکانی ترس و تەنگەتاویدا دەمکرد: ئایا خەڵکی دەرەوە چی دەزانێ، ئـاخۆ ئەوان چی دەتوانن بزانن؟
لە ڕۆژەکـانی بـزووتنەوەی بەرگریـدا، ئـێمە ڕاشـکاوانە دانپێـدانراو نەبـووین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا هەر ناسـراو بـووین. ئـاخر بەشـێک لە بەرپرسـیاریتی، تەنها بەشێک لەسەر شانمان هەڵگیرا بوو. هەموو گەلیش لەپشتی ئێمە بوو.
لێ گەلۆ ڕۆژانـی شـادمانی تەمەن کورت بوون؛ ڕۆژەکانی ژان و ناسـۆریش دورو درێـژ بـوون. ئـێمە هـیچ بژاردەیەکمـان نەبـوو، خـۆ ئەگەر ئـێمە سەربەستیمان بۆ گەل هێنابا و ژیانی ڕۆڵەکانیانمان دەستەبەر کردبا، دەبوایە یاخیبوون بەردەوام بووبایە. کاتێکیش هاگانا دەستی لە خەبات هەڵگرت، ئێمە وەک بەڵێنمـان دابـوو لەسـەر بەرخـودان بەردەوام بـووین. ئێمە بەیەک جـار کۆڵەپشتەکەمان پڕ لە کێشەی بەرپرسیاریتی هەڵگەڕاوەکـان کـرد، و بە پشـتی خۆشـمان دادا. لەوێـدا شـتێکی جێگەرەوە(ئەلتەرنـاتیڤ) نەبـوو، مەگەر ملـکەچ کردن بـۆ زۆرداری نەبێ، بەڵام خـۆ سەربەستی لەنـاو خوێنمانـدا بـوو؛ بـۆیە ملمان پێ کەچ نەکرا.
لە بزووتنەوەی بەرگریدا خۆشەویستێکی زۆر لەنێوان سـەرکردەکاندا نەبـوو، بەڵام جیابوونەوە بێ داخ و کەسەر نەبوو.
بەتایبەتیش کە شتەکە یاوەری قۆناخی چالاکییەکەی هوتێلی شا داود بوو.

## بەندی 15
## هوتێلی شا داود
٣٢٩ - ٣٥١

لە میانەی جەنگیی دووهەمی جیهاندا لابالّی خوارووی هوتێلی شا داود لە ئۆرشەلیم کرابووە بنکەی دامەزراوە مەلّبەندییەکانی ڕژێمی بەریتانی وەک؛ بارەگای سەرەکی سەربازی، سکرتاریەت، حکوومەتی مەدەنی. لەگەلّ پەرەسەندن و چڕبوونەوەی شۆڕشیش دژی دەسەلاّتی بەریتانی، ئەو هوتێلە مەزنە کرابووە قەلاّیەکی ڕاستەقینەی ئەوان لەنێو دلّی شارەکەدا. لە خانوو و تەلارەکانی دەوروبەری هوتێلەکەش بارەگاکانی پۆلیسی سەربازی بەریتانی و نووسینگەی تایبەتی لێکۆلّینەوە و بەدواداچوون بارگەوبنەیان لێداخستبوو. لەو بۆشایە کراوەی نێوان هەر دوو تەلارەکەشدا یەکەکی بەهێزی سەربازی لێیداکوتابوو. تۆڕی ڕەشاشەکان لەسەر چەند شوێنێکی ئەو ناوە دامەزرێندرابوو. سەرباز، پۆلیس و لێکۆلّەرەوەکان بەردەوام لەنزیک ئەو خانوو و تەلارانەی دەوروبەری مەکۆی سەرەکی دەسەلاّتی بەریتانیەکانی دابوو، خستبووە بن چاودێری خۆیانەوە.

ئاخر دەسەلاّتداران چیدیکە هەر بە پەڕجوو پشتیان لێنەدابۆوە. ئەزموون پەندی پێدادابوون. بەر لەوەی پەلاماری بارەگای پۆلیسیان بدەین، کالتینگ بە فشەکردنەوە دەیگوت: "ئەوان نایانەوێ بێنە سەرمان، بەلاّم خۆ ئەگەر هەر هاتیشن، پێشوازییکی وا گەرمیان لێدەکەین کە ...."

ئێمە چووین؛ بەخێرهێنانەکەی کاتلینگیش بەهەوادا ڕۆیشت. کاتێکیش داروپەردوی تەلارەکە بەهەوادا ڕۆیشت، ئەو و (گیلز)ی سەرۆکی، بەئاستەم توانیان ژیانی خۆیان دەرباز بکەن.

ئەو فرەچاوە چاودێریانەی دەوروبەری هوتێلی شا داود تیژڕۆکانی ئێمەیان نەبینی؛ پەیامی ژێرزەمینیی بە نەبینراوی مایەوە، بەلاّم خۆیشی هەموو شتێک کە بۆ بینین شیابا، دەیدی و هەموو شتێکیشی بکەوتبایە بەرچاو دەیدۆزیەوە. ئیدی سەرهێلّەکانی نەخشەی هەلّمەت کردنە سەر هوتێلی شا داود ڕاچنران.

لە بەهاری 1946دا بۆ یەکەمجار نەخشەکەمان بۆ فەرماندەیی بزووتنەوەی یەکێتی بەرگری ئاشکرا کرد. من سنێ و گالیلیم ئاگادارکردنەوە کە ئێمە ئەوەمان لەخۆگرتووە دزە بکەینە نێو لابالی حکوومەت لە هوتێلی شا داودا و ئۆپەراسیۆنێکی تێکدەرانەی بەرچاو ئەنجام بدەین. بەبێ ڕوونکردنەوەی وردەکارییەکان، لەگەڵ ئەواندا پێم لەسەر ئەوە داگرت، کە ئێمە ئامێرە تەقینەوەیەکی وا بەکاردەهێنین، جیاوازبێ لەوانی دیکە و دەزگاکەش داهێنراوی دەستی گیدییە. لە سەرێکەوە "بنەتەقەکانمان" هەر کاتێک بە گەیەنەرەکەیانەوە پەیوەست کرابان، نەدەتوانرا بیانجوڵێنین نە فتیلەکەشیان لەسەر لابدەین. لە سەرێکی دیکەشەوە دەکرا ئێمە ساتی تەقینەوەکە دەستکاری بکەین، واتە نیو سەعات یان تا سەعاتێکیش دوای بردنە نێو هوتێلەکە قورمیشی بکەین. ئەو ماوەیەش یارمەتیمان دەدا بۆ ئەوەی میوان و کرێکار و کارمەندەکانی هوتێلەکە بگوازنەوە. ئەو ڕێسایەی بۆ خۆمان دانابوو، چۆڵکردنی هوتێلەکە لە مەدەنییەکان شتێکی جەوهەری بوو. ئاخر لەوێدا خەڵکێکی مەدەنی زۆری لێبوون کە بەهەر نرخێک بووبایە، نەماندەویست ئازاریان پێبگا. ئێمە مەراقی ئەوە بووین چۆن چۆنی ئەوان بەسەلامەتی و بێ وەی بەوادەیەکی لەبار بەر لە تەقینەوەکە لەنێو هۆتێلەکەیان دەربێنین.

فەرماندەی هاگاناش دەمودەست نەخشەکەی ئێمەی پەسەند نەکرد. ئەوان وایان دانابوو، هێرشێکی وا بۆ سەر بارەگای سەرەکی دەسەڵاتی بەریتانیا شتێکی زۆر بەرزەفڕانەیە. لە بنەمادا ئەوان دژی هەڵمەتەکە نەبوون. ئەوان مشتومڕیان لەسەر ئەوە بوو، هێشتا کاتی ئەو جۆرە پەلامارانە نەهاتووە، بە جۆرێک داموودەزگا کارگێڕییەکانی بەریتانیی پەک بخا. ئێمەش بە پێچەوانەوە بیرمان دەکردەوە، بەڵام خۆ ئێمە پابەندی ڕێککەوتنەکەمان بووین، بۆیە دەبوایە ملکەچی بڕیارەکەشیان بین. لێ ئێمە بۆ جێبەجێکردنی نەخشەکە هیوابڕ نەبووین. لە گفتوگۆکانماندا لەگەڵ سەرانی هاگانا و پەیامە کۆدەدارەکانمان بۆ "یەرمیا" ئێمە سەرلەنوێ نەخشەکەمان پێشنورە دانا. کۆد(شیفرە)ی ئێمە بۆ هوتێلە مەزنەکەی شا داود لە سەرەتادا

"مالۆنخیک"(هوتێله بچکۆلانەکە)[٧٥] بوو. دواتر بۆ شوێنبزرکردن پێمانگوت "شیک". لە هەمان کاتیشدا F.F.I ئامادەکارییان بۆ نەخشەی پەلاماردانی سەر تەلارێک دەکرد، کە حکوومەت بۆ دەزگایەکی خۆی بەکاردەهێنا، ئەویش بەناوی برایەکانی داود بوو. سەرکردەکانی هاگاناش بۆ جیاکردنەوەی ئەو دوو نەخشە پەلامارانە ناویان لێنابوو، "کۆیلەی تۆ و فریادرەس."

هەر دوو نەخشەکە بۆ چەندان مانگ لە وێستگەی چاوەڕوانیدا بوون، دواجار لە لایەن فەرماندەی هاگانا لە یەکی تەمووزی 1946، بە دوو ڕۆژ دوای هێرشە سەرەکییەکەی ژەنەراڵ بارکەر بۆ سەر هاگانا، پالماخ و ئاژانسی جووەکان، پەسەندکرا. سەرانی هاگانا ئەوەیان ڕون نەکردووەوە، ئاخۆ بۆچی تەنها دوای 29ی حوزەیران ئۆپەراسیۆنی"شیک"یان هاتە بەرچاو. لەوێدا پاشخانی دوو هۆکاری سەرەکی بۆ ئەو بیروڕاگۆڕینە لە ئارادا هەبوون. هاگانا کە لە سییەکانەوە سیاسەتی خۆ جڵەوگرتنی گرتبووە بەر، لەو دوایانەدا و لە چلەکان کەوتبووە بەر گیانی تۆڵەکردنەوە. ئەدەبیاتی نێوخۆی هاگانا و لە وتارەکانیاندا ئەوەیان ڕوون دەکردەوە، هەمیشە دەبێ ئۆپەراسیۆنەکان لە تۆڵەی پەلاماردانەکانەوە بن. تەنانەت ئێلیاهۆ گۆلۆمبیش کاری لەسەر ڕەوایەتیدانی ئەو ڕامانە فەلسەفە مێژوویەی دەکرد. مشتومڕی ئەو لەسەر ئەوە بوو، ئەو شەڕانەی گەلەکەمان لە سەر خاکی نیشتمان کردوونیەتی، بەرگرییەکی جەوهەریانە بوونە. ئەو وایدەگوت، نەخشەدانانی شۆڕش هەر بە کارەسات کۆتایی پێدێ. ڕاستبوو، یاخیبوونی هاشمۆنیان بەسەرکەوتن کۆتایی هات، بەڵام ئەمەیان شتێکی ڕێزپەڕ بوو. ئاخر چۆن لەوە دڵنیابین کە پەرجووەکان دووبارە ببنەوە؟ فەلسەفەی مێژوو بە بیرکارییەوە پاڵپشتە. نووسەرەکانی هاگانا وایان دەبینی، کە جۆرە پەیوەندییەکی ماتماتیکی لەنێوان "پەلاماردان" و "تۆڵەکردنەوە" بنیات بنێن. من یەکێ لەو "هاوکێشانەی" ئەوانم لەیادە.

"مەدای تۆڵەکردنەوە لەگەڵ زەبری پەلاماردانەکە هاوسەنگە." پێوەرێکی ئاشکرا و ڕوون، پەیوەندییەکی جێگیر، جەنگ بە شێوەیەکی بیرکاریانە-لەسەر کاغەز.

---

[٧٥] مالۆن بە عیبری واتە هوتێل؛ شیک بە ڕووسی بچووکرنەوەی بۆ سۆز و خۆشەویستی، بە زمانی یدیشی و عیبری ڕەشۆکیش هەر هەمان شتە.

لەسەر خاکوخۆڵی فەلسەفیدا، بیردۆزەکە چەکەرەی کرد؛ لە ڕۆژەکانی بزووتنەوەی یەکێتی بەرگریشدا ، لە خەباتی بەیەکەوەدا جێبەجێکرا. هەر بۆ نموونە، وێستگەی چاودێری گیڤات ۆلگا خۆی لە کاروباری کۆچبەران هەڵدەقورتێنێ، کەواتە دەبێ وێستگەی چاودێرییەکە تێکوپێک بدرێ. خۆ ئەگەر وێستگەی ڕاداری حەیفا خۆی لە کاروباری کۆچبەران وەربدا، ئەوا دەبێ ئەویش لەناوببرێ. خەڵکی هاشۆمەر هاتزایر، کە بەرپەرچی هەموو خەباتێکی چەکدارەیان دەدایەوە، تەنانەت دژی ئەو ئۆپەراسیۆنانەش ببوونەوە، کە بەقەولی خۆیان "دۆستەکانمان زەبوون و دوژمنەکانیشمان بەهێز دەکا." دەهریبوونی ئەوان سنووری نەما کاتێک ژمارەیەک لەوان وەک ئەندامی هاگانا و پالماخ نێردران تا هێڵە ئاسنینەکان و ئەو دامەزراوانەی هێزەکانی پۆلیسی گەڕۆک تێکوپێک بشکێنن. ئەوان چ لەبازنەی تایبەت و چ بەئاشکرا دەیانپرسی، ئاخر چ پەیوەندییک لەنێو پرسی کۆچبەران و پەلامارەکانی سەر هێڵی ئاسنیندا هەیە؟ ئەوان هاواریان دەکرد، ئاخر چی کۆلۆنیکردنی ئێمە و یەکەکانی پۆلیسی گەڕۆک بەیەکەوە گرێ دەدا؟
سنێش بە ڕەقی وای بۆ شیدەکردنەوە:
"ئەو هێڵە ئاسنینانە شەمەندەفەرەکانی لەسەر دەڕۆن، شەمەندەفەرەکانیش ئەو سەربازانە باردەکەن، کە دێن و کۆچبەران ڕاو دەنێن. ترومبێلە زرێپۆش و چەکدارەکانی هێزی پۆلیسی گەڕۆکیش ئەو پۆلیسانە هەڵدەگرن، کە بە دوای کۆچبەراندا دەگەڕێن و دەیانگرن و دەیانخەنە نشینگە بەکۆمەڵەکان."
ڕوونکردنەوەکەی سنێ نامەنتیقی نەبوو، بەڵام خەڵکی هاشۆمەر هاتازایر ئەویان بە کەسێکی قژ دوولەت دانابوو. ئەوان سووربوون لەسەر "پەیوەندی بێخەوشی خەبات" و بیردۆزی "بەرگری لەپێناو بەرگری"دا یان (بەرگریەکەی خودی هاگانایان) وەک سنووردارکردنێکی کردەوە دانابوو. هەڵبەتە دەکرێ ئەم بیردۆزە تا سنووری بێ کۆتایی لێک بکێشرێتەوە. خۆ ئەگەر تۆ ڕێکخراوێکی بەرگریت هەبێ تا بەرگری لە ڕێکخراوێکی بەرگری بکا، ئەوا تۆ دەبێ پەرە بەئامانجەکان بدەی تا بەرگری لە ڕێکخراوێکی بەرگری بکەی کە خۆی بەرگری لە ڕێکخراوێکی بەرگری دەکا. ئیدی بەمجۆرە. هەڵبەتە ئەم بیردۆزە هەر بە تیۆری دەمێنێتەوە. لە (یاگوری) لە 29ی حوزەیراندا، کاتێک بەریتانییەکان بەسەر جبەخانەی چەکی هاگانایان

دادا، لەوێدا هیچ بەرگرییەکی لە هاگاناوە نەبوو. دواتریش، دوای ئەوە عەرەبەکان لە نۆڤێمبەری 1947دا کەوتنە پەلاماردان، کاتێ هێزەکانی بەریتانیاش سەربازەکانی هاگانایان چەککردن، هیچ دەستیان نەکردەوە.
وێڕای بیردۆزەکەش، هاگانا فەرمانیدا کە "بەرگری لە هاگانا" نەکەن.
شتەکەش بایی خۆی مایەی سەرسوڕمان بوو، هەر ئەو بەشە ڕێسایەش ("مەدای تۆڵەکردنەوە یەکسانە بە گەورەیی هێرشبردن") بووە پەسندکردنی نەخشەی هەڵمەتەکەمان بۆ سەر هوتێلی شا داود. لە 29ی حوزەیرانی 1946دا بەریتانییەکان نووسینگەکانی ئاژانسی جووەکانی داگیرکرد. ئاژانسی جووەکانیش بە بارەگای سەرەکی جووەکان دەژمێردرا. ئیدی بەمجۆرە و بەگوێرەی ڕێسای بەڵگەوبەندەکە ئێمەش دەبوایە هێرشێکمان بکردایەتە سەر بارەگای سەرەکی ئەوان لە هوتێلی شا داوددا.
هۆکاری دووهەم هەرە دژوارەکەیان بوو. هاگانا کە لە باری نەریتیانەی خۆی "نیمچە قانونی" ڕاهاتبوو، ئەوەش ئەو پێگەیان بوو لەچاوی دەسەڵاتدارانی بەریتانی، هەرگیزیش هەنگاوێکی کاریگەری وای نەهاوێشتبوو، کە لە بەردەم ڕێسای چاودێری ئەوان دەربکەوێ. دیاربوو سەرکردەکانی ئاژانسی جووەکان هەموو متمانەی خۆیان لەسەر خەیاڵ و ئەندێشەی "پێگەی نێودەوڵەتیەوە" بنیاتنابوو، بەگەرموگوڕیشەوە لەو بڕوایەدا بوون لە دەستی پۆلیس پارێزراون. لە دەرهاوێشتەی داگیرکردنی بارەگاکەکان، دیاربوو کۆمەڵە بەڵگەیەکی نهێنی لێبوون، بە حیسابی ڕێکخراوێکی هۆشمەند و هۆشیار نەدەبوایە لەو ڕەوشەدا، بەڵگەنامەکان لەوێ هێڵدرابانەوە. ئەو دەستکەوتەی هێزەکانی بەریتانی لە نووسینگەکانی ئاژانسی جووەکان بە دەستیان کەتبوو، زۆر بایەخدار بوو. ئەو ناپەرپرسیارێتیەی ئاژانسی جووەکان لەو بارەیەوە گەیشتبووە خاڵێکی وەرچەرخان، وەک گالیلی بۆی باسکردم، بەریتانییەکان توانیبوویان لە دەق بەشێکی وتاری بەڕێز شێرتۆک کە لە بەردەم ئەنجومەنی گشتی زایۆنزمدا خوێندبوویەوە، لەلای پێتچنەکەیان لە یەکێ لە نووسینگەکانی ئاژانسەکە، دەستبکەوێ. بەڕێز شێرتۆک پەسنی تەقاندنەوەی پردەکانی دابوو، بایەخی لایەنە سیاسییەکەی ئۆپەراسیۆنیەکەشی ڕوون کردبووەوە.

ڕاپۆرتە وتارەکەی شیرتۆک، کە بەرپرسیارێتی ئاژانسی جووەکان لە کاری تێکدەرانەی ئۆپەراسیۆنەکانی هاگانای دەسەلماند، ئەو دڵنیاکردنەوەنای بەڕێز بنگوریۆنی بەدرۆخستەوە کە هەر چەند مانگێک پێشتر لە بەردەم کۆمسیۆنی ئەنگلۆ -ئەمریکیدا خۆی لەبەرپرسیارێتیەکە بواردبوو. ئەوش تاکە بەڵگەنامە نەبوو کە بەریتانیەکان لە گەڵ خۆیان بردبووە هوتێلی شا داود.

مەراقی لەناوبردنی ئەو بەڵگەنامانەش لە باسوخواسی کۆبونەوەی ڕاستەوخۆی نێوان ئیسحاق سادێی ئەفسەری ئۆپەراسیۆنەکانی هاگانا و گیدییەکەی ئێمەدا هەبوو. ئیسحاق سادێ لەگیدی پرسیبوو، ئاخۆ لەنێوان ماوەی بردنەژوورەوەی تەقەمەنییەکان بۆ نێو تەلارەکەوە تەقینەوەکەیان چەندی پێدەچێ. گیدیش ماوەکەی بە چل و پێنج خولەک مەزندە کردبوو. سادێ پێی وابوو "ماوەکە زۆرە بۆ ئەوەی بەریتانییەکان بتوانن نەوەک هەر هوتێلەکە چۆل بکەن ***بەڵکو بتوانن بەڵگەنامەکانیش دەرباز بکەن***." لە ئەنجامیشدا پێشنیازی کردبوو تەنها پازدە خولەک ماوەی چۆڵکردنەکە بدەین. گیدیش دڵنیای کردەوە. وێڕای تەمەنی گەنجی، گیدی لەو جۆرە شەڕانەدا ئەزموونێکی بەرچاوی کردەنی هەبوو، زیاتر لە ئەفسەری ئۆپەراسیۆنەکانی هاگانا. ئەو وەڵامی دابووەوە، کە تاقیکردنەوە فێریکردووە، هەر کاتێک دەسەڵاتداران هۆشدارینامەی تەقینەوەکەیان پێگەیشت، ئەوان بەلەز تەلارەکە چۆڵ دەکەن و کاتی خۆیان بە خڕکردنەوەی بەڵگەنامەکان بە خەسار نادەن. گیدی هەستیکردبوو، ئەو پازدە خولەکە دەرەتانێک بۆ چۆلکردنی تەلارەکە بەدەستەوە نادا. لە دواییدا گەیشتبوونە ڕێکەوتنێکی سازشانە کە بۆ چۆڵکردنەکە مۆڵەتی تەنها نیو سەعات بدرێ.

من دەبێ بگەڕێمەوە سەر ئەو کۆبوونەوەی نێوان گیدی و سادێ. لەو نێوانەدا من دەگەڕێمەوە سەر بەڵگەنامە سەرەکییەکەی پەیوەست بە کردەوەی هوتێلی شا داود.

لە یەکی تەموزی 1946دا، هەر دوو ڕۆژ دوای پەلامارەکەی بارکەر بۆ سەر ئاژانسی جووەکان، ئێمە نامەیەکمان لە فەرماندەی هاگاناوە پێگەیشت، دەقەکەی بەم شێوەی خوارەوە بوو:

"شالۆم!

"(ئا)دەکرێ هەرچی زووە ئێوە (شیک)ی و ماڵی 'کۆیلەی ئێوە و فریادڕەس' بکەن. لە ڕۆژی کردنەکەیدا ئاگادارمان بکەنەوە. وا باشترە هەر ڕۆژێک بێ. ناسنامەی ئەو ڕێکخراوەی بە کردەوە هەڵدەستێ ئاشکرا مەکەن، نە ڕاستەوخۆ و نە بە ئاماژەش.
"(ب) ئێمەش ئامادەکاری شتێک دەکەین، لە کاتی خۆیدا لە وردەکارییەکان ئاگادارتان دەکەینەوە.
"(پ) دەبێ تەلئەبیب و دەوروبەری لە هەموو ئۆپەراسیۆنێک بەدووربگیرێن. ئێمە هەموومان پەرۆشی پاراستنی تەلئەبیبین، کە وەک مەکۆی ژیانی یوشیڤ و کارەکانمانە. خۆ ئەگەر تەلئەبیب بەهۆی قەدەغەکردنی هاتووچۆ گرتنکارییەوە وەک بەرەنجامێکی هەر ئۆپەراسیۆنێک پەکبخرێ، ئەوا ئێمە و نەخشەکانیشمان لە پەلوپۆ دەکەوین. بە ڕێکەوتیش دەمارە گرنگەکانی لایەکەی دیکە لێرەدا چڕ نەبۆتەوە. کەواتە تەلئەبیب لە دەرەوەی بازنەی هێزەکانی جووەوەیە."

**2**

کاتێک ئەو نامەیەمان پێگەیشت، ئێمە خەریکی خۆئامادەکردن بووین بۆ ئۆپەراسیۆنی شیک. نەشدەکرا دەمودەست ئەنجامی بدەین. داوای هاگانا بۆ هێرشکردنەسەر هوتێلی شا داود چەند هەفتەیەک دوای ئەوەی یەکەمین نەخشەکەمانیان لەسەر هەمان بابەت ڕەتکردەوە، پێگەیشت. لەو نێوەشدا هەندێ هەلومەرج گۆڕا. لە ئاکامیشدا دەبوایە سەرلەنوێ بە نەخشەکەماندا بچینەوە، چاودێری تەواوی ڕەوشەکە بکەین و لە وردەکاری جێبەجێکردنەکە دڵنیا بین. دەمانزانی، ئەم چالاکیەمان گەورەترین ئۆپەراسیۆنە تا ئەو کات کردبێتمان، دەشکرێ ببێتە بێ وێنەترین ئۆپەراسیۆن لە مێژووی شەڕی پارتیزانی بۆ ڕزگاربوون. ئاخر شتێکی ئاسان نەبوو دزە بکەیتە نێو دڵی حکوومەتی سەربازی و لەگەڵ ئەو هەموو قەڵاو چەپەرە و چەکە قورسەدا زەبرێکی گورچکبڕی لێبدەی. من گومانم هەیە ئەم ئۆپەراسیۆنە لە مێژوودا پێشینەی هەبێ.
ئێمە نەدەوێراین نوشست بێنین. دوای 29ی حوزەیران، بەشێکی زۆر لە کۆمەڵانی خەڵک تووشی دڵەراوکێ و شڵەژان هاتبوون. زەبرەکەی بارکەر زۆر قورس و کوشندە بوو. بەزینەکە سەرە دژوارییەکەی خۆی بەرز

کردبۆوە. خەڵک خەریک بوو پرسیاری بۆ پەیدا ببێ، ئاخۆ ئێمە دەتوانین دژی ڕژێمی بەریتانی بجەنگینەوە. زۆر کەس نامرادیی خۆی لە ئاکامی خەباتەکە دەردەبڕی: ئاخر ئێمە کێین، بە هێزیمان لە چی دایە، ئاخر بەچ توانایەک لەهەمبەر سووپای بەریتانیدا دەوەستینەوە؟" ئەم پرسانە بە مەترسی ئاوس بوون. ڕەنگدانەوەی هەرەس و بەزین بۆ هەر جەنگێکی ڕزگاری کوشندە و سامناکە. ئێمە لەوە تێگەیشتبووین، خۆباوەڕی و متمانە بەخۆبوون، ئەو کاتە هەڵدەستێ و جێی خۆی دەگرێ، کە وەڵامێکی مەزن و سەرکەوتوو لووتشکێنمان بۆ زەبرە دژوارەکەی بارکەر هەبێ. لەوێدا ئێمە بە وەلامەکەی هاگانا بۆ تۆڵەکردنەوە، دڵمان ئاوی خواردەوە، ئیدی بە تاسە و جۆشەوە بەرەو تاقیکردنەوەی هەموو وردەکارییەکانی نەخشەکە چووین. ئێمە هەمیشە بەوپەڕی وریایی و پارێزەوە بۆ جێبەجێکردنی نەخشەکانمان دەچووین. بەڵام لەو هەموو ئۆپەراسیۆنانەی ئەنجاممان داون، هیچیان بەدەر لە پەلامارەکەی سەر قەڵای عەککا، خۆمان ئەوەندە بە ئەسپایی بە وردەکارییەکانی جێبەجێکردنی نەخشەی (ئۆپەراسیۆنی شیک) تەرخان نەکردبوو.

هەوڵ و داهێنانە بێسنوورەکەی گیدی سەرتۆپی ئامادەکارییەکان بوو. دەببە شیری گەورەی بێ وەی، هەڵگری مادە تەقینەوەکان بوون. کردەوەکەیان دووهێندە پارێزراو سەلامەتیانە بوو. دەزگایەک بڕیاردەری کاتی قورمیشی تەقینەوەکان بوو، ئەویش هەر نیو سەعات دوای ئەوەی دەبە و گالۆنەکان دەگەیەندرانە شوێنی مەبەست؛ هەوڵی دیکەی ئاسایشپارێزانە ئەوە بوو ڕێگە نەدرێ بە هیچ جۆرێک دەببە و گالۆنەکان بگوازرێنەوە یان سەریان لەسەر هەڵبدرێتەوە.

شتە هەرە سەرەکییەکەش کاتبەندی هێرشەکە بوو. لەوێدا دوو پێشنیاز هەبوون: یەکیان بۆ سەعات یازدەی پێش نیوەڕۆ، ئەوی دیکەشیان بۆ نێوان سەعات چوار بۆ پێنجی ئێوارە بوو. هەر دوو نەخشەکەش لە سۆنگەی هەمان هۆکارەوە بوون. بردنە ژوورەوەی دەبە و گالۆنە شیرەکان بۆ نێو لاباڵی حکوومەت لە هوتێلەکە دەبوایە هەر لە ڕێی "قاوەخانەی ڕیگێن"ەوە بوایە، کە دەکەوتە ژێرزەمینی ئەو لاباڵەی کە بارکەر و شوێ تیایدا ئاکنجی بوون. لەو سەعاتانەی بەیانی و ئێوارندا قاوەخانەکە چۆڵ و هۆڵ دەبوو. لە

کاتی ژەمی نیوەڕۆدا ئەوێ پڕی مەعمیل بوو، لەنێو ئەوانیشدا ژن و پیاوی سڤیل ئەفسەرانی سەربازیی هەبوون. شتێکی جەوهەری بوو، پەلامارەکە لە ساتەوەختێکدا بکرێ، قاوەخانەکە کەسی لێ نەبێ.
لەو سەعاتە پێشنیازکراوانەشدا، کە هەر یەکەیان هەلومەرجی خۆی هەبوو، ئێمە لە سەعات یازدەی پێش نیوەڕۆ نزیکتر بووین، چونکە ئاسانتر هاوڕێکی لەنێوان ئێمە و پلانەکەی F.F.Iدا دەبوو بۆ پەلاماردانی سەر تەلاری برایەکان-"ئۆپەراسیۆنی کۆیلە و فریادڕەس"-. ڕوون و ئاشکرا بوو دەبوایە ئەو ئۆپەراسیۆنانە هاوزەمەن بوونایە، بە پێچەوانەوە یەکیان باندۆری لەسەر ئەوی دیکە دادەنا.
دوای ئەوە ئێمە مشووری ئاگادارکردنەوەمان خوارد، تا زیانی گیانی لێنەکەوێتەوە. سەرەتا بۆ ئەوەی ڕێ لە ڕێبواران بگرین بە بەردەم ئەوێدا بڕۆن، بیرمان لە بۆمبێکی بچووکی دەنگی کردەوە کە زیانی بەدواوە نەبێ. ئینجا سێ نووسینگەمان دیاریکردن بۆ ئەوەی زەنگی ئاگادارکردنەوەیان بۆ لێبدەین، ئەوەش لەو کاتەدا بێ، کە پیاوەکانمان لە چاندنی بۆمبەکانی نێو بەرمیلە شیرەکان لە ژێرزەمینەکە بوونەوە و هاتبنە دەرەوە. ئەو سێ نووسینگانەش ئەمانە بوون: بەڕێوبەرایەتی هوتێلی شا داود؛ ڕۆژنامەی فەلەستین پۆست و کونسولخانەی فەڕەنسی کە لەنزیک هوتێلەکەوە بوون. لە کۆتاییشدا پۆستەری ئاگادارکردنەوەمان لە نزیک دەببە و گالۆنە شیرەکان دانان: "ئاگاداربە! بنەتەقەیە. دەستیان لێنەدەی" ئەوەش بۆ ئەوە بوو نەبادا شارەزا بەریتانییەکان دوای تەلەفۆنی ئاگادارکردنەوە هەوڵی پوچەڵکردنەوی تەقینەوەکان بدەن.
ئۆپەراسیۆنی شیک، ڕێک سێ هەفتە دوای وەرگرتنەوەی وەڵامی هاگانا بە ئەنجامدانی چالاکاییەکە ئەنجام درا. لەو نێوەشدا چەندان کۆبوونەوەمان لەگەڵ سەرکردەکانی بزووتنەوەی یەکێتی بەرگریدا کردن. جارێکیان F.F.I داوای وەخراندنی چالاکیەکەیان کرد، چونکە ئەوان هێشتا تەواو ئامادە نەببوون. دووجار بەڵکو سێ جارانیش ئێمە کردەوەکەمان لەسەر داوای فەرماندەی هاگانا دواخست. ئەو دواخستنانەش زۆر دژوار بوون. لە هەر جارێکیاندا ژمارەی ئەو کەسانەی بە کردەوەکەیان دەزانی زیاد دەبوون. هەروەک پێشتریش باسمکردووە، هەر جارێک بەشداربووانی

ئۆپەراسیۆنەکان لە سەرەتاییەکان و وردەکاریی ئەرکەکەیان ئاگادار دەکرانەوە. لە باری ئۆپەراسیۆنی هۆتێلەکەشدا لەچاو ژمارە زۆری بەشداربووان، هەمان ئاگادارکردنەوە درا. ئیدی هەر دواخستنێکیش ئەوا نەوەک هەر نەخشەکە بەڵکو ئەگەر هەبوو ژیانی خودی بەشداربووانیش بخاتە مەترسییەوە. بۆیە بەردەوام هەموو جارێک دژی وەخرانەن دەوەستاینەوە، لێ لەبەر باری ناچاریش ملمان لێنا. لە 19ی تەموزدا ئەو تێبینینانەم لە سنییوە پێگەیشت:

"شالۆم!

"لە دوا گفتوگۆمدا هاورێیانم پێیانگوتم. ئەگەر تۆ تا هەنووکە رێزی رامانمان بگری، بە راستی داوات لێدەکەم نەخشەی ئۆپەراسیۆنەکە بۆ چەند رۆژێکی کەم بوەخرێنە."

ئێمە ئەو داوایەشمان جێبەجێکرد، ئەوەشمان پەژراند کە 22ی تەمووز دوا وادە بێ. لێ F.F.I نەیانتوانی لەو رۆژەدا لەدوا ئامادەکارییەکانیان ببنەوە؛ لە دواییدا وا بڕیاردرا بە تەنیا هێرشەکەی سەر هوتێلی شا داود ئەنجام بدەین. بەهۆی دوا خولەکی راوێژکردنیش، کاتی پەلامارەکە یەک سەعات پالنرا، سەعات 12 جێگەی سەعات 11ی گرتەوە.

یەکەی هەڵمەتبەر لەژێر فەرماندەیی گیدۆنی ئۆرشەیلم (کە جلی کرێکارەکانی هوتێلەکەیان پۆشیبوو) هێرشەکەیان بەوپەڕی ئازایەتییەوە و بێ هیچ هەڵە و کەموکورتیەکەوە جێبەجێکرد. ئەوان توانیان دەببە و گالۆنە شیرەکان نزیکی هوتێلەکە بکەنەوە. لەوێشدا ئەوان بوونە دوو دەستە، یەکێکیان بۆ چوونە ژوور و دزە کردن، هی دووهەمیشیان بۆ پاراستن و داپۆشینی دەستەی یەکەم. دەستەی یەکەم دەببە و گالۆنەکانی شیریان لە رێی قاوەخانەی رێگینس گەیاندە ژێرزەمینەکە. ئەوان لە لایەن کرێکارانی قاوەخانەکە بەخێرهاتنیان لێکرا و رێگایان بۆ کردنەوە. ئەو پازدە عەرەبەی ئەوێ هیچ سەرسامییکیان بەدیتنی پیاوەکانی ئێمە لێپەیدا نەبوو: ئاخر ئەوان خەڵکانێکی بێ وەی مەنجەڵ بەدەست و چێشتلێنەر و گارسۆنەکان بوون -ئەوان لەو کاتەدا تەنها کەسانێک بوون کە لەوێ ئامادەبوون- ئەوەش بەشێک لە نەخشەکە بوو. لێ پیاوەکانی ئێمە لە پڕیکەوە بە دیتنی دوو سەربازی بەریتانی راچڵەکین، سەربازەکان گومانیان لێپەیدا بوو، دەستیان بۆ

دەمانچەکانیان برد. بەیەکدادانەکە شتێکی حەتمی بوو. هەر دوولاش زیانیان پێکەوت. لەوکاتەشدا دەستەی پاڵپشت لە دەرەوە لەگەڵ سەربازانی گەڕۆک بەیەکیان دادا. لەبەر سروشتی ئۆپەراسیۆنەکەش نەدەکرا پیاوەکانمان ڕەشاشیان هەڵگرتبا، بۆیە بە تفەنگی دەستی بڕین و بە دەمانچەکانیان کەوتنە شەڕ. لەگەڵ ئەوەشدا دەستەی یەکەمی دزەکەر، توانی بگەنە شوێنی مەبەست. فەرماندەی ئۆپەراسیۆنەکە قورمیشی کاتبەندیی تەقینەوەکەی بۆ نیو سەعات دانا و پلاستەری ئاگادارکردنەوەشی لە تەنیشت شتەکان دانا. کرێکارە عەرەبەکانیش ئازادکران و پێیان گوترا تا هێزیان تێدایە لەبەر گیانی خۆیان هەڵێن. ئەوانیش لە ڕاکردنەکە دوودڵ نەبوون. دواکەسیش کە لەوێ هاتەدەر، گیدۆن بوو، هەر هاواریشی دەکرد، "ئێرە چۆڵکەن، هوتێلەکە خەریکە دەتەقێتەوە." لە ساتی ئاگادارکردنەوەکەدا، بۆمبە دەنگییە وشیارکەرەوەکەی دەرەوە تەقیەوە، ئیدی لەبن چڕەدووکەڵدا پیاوەکانی ئێمە کشانەوە. دەنگەدەنگەکە لە سۆنگەی بۆمبەکەوە بوو، لێ لە هەمان کاتیشدا دەنگی تەقەکی ناچاوەڕوانکراو هەموو ڕێبوارانی سەر شەقامەکەی راونا.

لە سەعات دوازدە و دە خولەکدا، گیدۆن گەیشتە ئەو خاڵەی کە یارۆی زەنگلێدەرەی تەلەفۆنەکەمان چاوەڕێی دەکرد. ئیدی خانمەکە دەستبەجێ زەنگی بۆ هوتێلی شا داود لێدا و لەوەی ئاگادارکردنەوە کە بناخەی هوتێلەکە مینڕێژکراوە، زۆریش ناخایەنێ هوتێلەکە دەتەقێتەوە. "دەی هەموو تەلارەکە چۆڵ بکەن!" خانمەکە وای هاوار بەسەر دەزگای تەلەفۆن وەرگرەکەی هوتێلەکەدا کرد. پاشان تەلەفۆنیشی بۆ ڕۆژنامەی فەلەستین پۆست کرد کە ژێرزەمینی هوتێلی شا داود بۆمبڕێژ کراوە و بە خەڵکەکەیش گوتراوە چۆڵی بکەن. سێهەمین و دوا تەلەفۆن بۆ کونسولخانەی فەرەنسی بوو، پێیان گوترا جامی پەنجەرەکانیان بکەنەوە نەبادا تەقینەوەکە کاریگەری بەسەریانەوە هەبێ. کارمەندانی کونسولخانەکە دوای ئەوە گوێڕایەڵی ئاگادارکرنەوەکە بوون. پەنجەرەکانی خۆیان کردنەوە، بەمە تەلاری کونسولخانەکەیان هیچ زیانی پێنەگەیشت. ئینجا کات بووە دوازدە و نیو. گیدۆن خولەکەکانی دەژماردن. تا ئەوێ هەموو شتێک بەگوێرەی نەخشەکە دەڕۆیشت، بەدەر لەو زیانانەی کە لە بەیەکدادانە ڕەچاونەکراوەکە توشی هاتبووین، هیچ شاشییەک ڕووینەدابوو. دەببە و گالۆنە شیرەکان لە ژێرزەمینی لاباڵی حکوومەت لە بن

هـوتێلەکە دانـدران. هەمـوو ئاگادارینامەکـانیش بەشـوێنی خۆیـان گەیشـتن. بەریتانییەکانیش گومانیـان نەمـا، دەسـتیان بە چـۆڵکردنی هـوتێلەکە کـرد، خـۆ ئەگەر شـتەکان وەک هەلـومەرجی هاوشـێوەی پێشـوتریان بووبـان، هەمـوو شتێک بە خێرایی کۆتایی دەهات. لەوێدا تەنها یەک پرسیار مێشکی سەری گیدۆنی بردبوو: تـۆ بڵێی مـاددە دانـدراوەکان بتەقنەوە؟ تـۆبڵێی هەڵەیەک لە دەزگـای دانـانەوەی تەقینەوەکانـدا نەکرابـێ؟ تـۆبڵێی هەر بە ڕاسـتی تەلارەکە بەسەر یەکدا بڕووخێ؟ ئایا بەڵگەنامەکانیش لەناودەچن؟

هەر خولەکێک بەقەد ڕۆژێک درێژ بوو. دوازدە و سی و یەک، دوازدە و سی و دوو. سەعاتی سفر نزیک بووەوە. گیدۆن ئۆقرەی نەمابوو. خەریکبوو نیو سەعاتەکە تێدەپەڕی. دوازدە و سی و حەفت.... لەپڕێکەوە قەوما، وەک بڵێی تەواوی شـارەکە بهەژێـتەوە وابـوو. لەوێـدا هـیچ هەڵەیەک نەکـرا. هێـزی تەقینەوەکە لەوەی ڕەچاو دەکرا گەورەتر بـوو. ئیسـحاق سـادێ لە هاگانـاوە گومانی هەبوو لەوەی هێزی تەقینەوەکە بگاتە نهۆمی سێیەم، تەنـانەت نهۆمی دووهەمی هوتێلەکەش. گیدۆنیش گوتی تەنها هێزی 500 lbs لە تەقینەوەی تێکەڵ T.N.T و جەلجەنیت –کە خراوەتە نێو دەببە و گالۆنەکانی شیر- کە لە ژێـرزەمینەکە دانـدراون، ئیـدی بۆشـایی داخـراوەکەی ئەوێـش هێـزی تەقینەوەکە ئەوەنـدە بەرز دەکـاتەوە تـا دەیگەنێتە سـەربان. دەببە و گـالۆنە شیرەکان لە ژێرزەمینەوە گەیشتنە سـەربان، سێ نهۆم لە بەرد و کۆنکرێت و ئاسنیان بە بەرزایی تەلارەکە بڕی. وەک B.B.C گوتی سـەرلەبەری لاباڵی ئەو تەلارە مەزنەی هەروەک شوتییەک بە چەقۆیەک شەق کرد.

**3**

لەگەڵ ئەوەی یەکەی هەڵمەتبەرمان هەموو کارەکانی خۆی بە ڕێکی لە لانەی شێر ئەنجامدا و بایی ئەوەشی تیاهێشتەوە، بتوانرێ لە کـاتی خۆیـدا هـۆتێلەکە چـۆڵ بکرێ، بەڵام ئەوانـی دیکە لەسـەر هێڵێکـی دیکەوە بـۆ پرسـەکە چـوون. لەبەر هەندێک هۆ هوتێلەکە لە کاتی خـۆی، تەنـانەت دوای ئاگادارینامەکـانیش، کە دەتواندرا هەموو زیندەوەرێکی ژێر بنمیچـی هـوتێلەکە بێنەدەر، کەچـی وانە کرا. لەبری ئەوە باجی چۆڵنەکردنەکە زۆر قورس و سـامناکانە بـوو. زیـاتر لە دوو سـەد کەس لەوێدا کـوژران یـان برینـدار بـوون. لەنێـو قوربانیەکانیشـدا ئەفسـەرە پلەباڵاکانی بەریتانی بوون. ئێمە بەتـایبەت بـۆ ئەو قوربـانیە غەوارانە

و ئەو پازدە جووە مەدەنیانەی کە لەنێویاندا دۆستی باشیشیمان هەبوون و بە شێوەیەکی تراژیدیانە سەریان تێدا چوو، کە بە هیچ جۆرێک نەماندەویست پەنجەشیان بەخوێندا بێ، پرسەمان دانا. کەیفخۆشیە زۆرەکەمان بە سەرکەوتنی ئۆپەراسیۆنەکە بەهۆی قوربانییەکان لە کەپوو هاتەوە. دیسان بە چەندان ڕۆژ و شەو کەوتینە باری کەسەر و ناسۆر بۆ ئەو خوێنەی کە پێویست نەبوو برژێ.

ئەرێ بۆچی هوتێلی شا داود چۆل نەکرا؟ لەو بەندە تراژیدیایەدا بەدڵنیایەوە ڕاستی حاشاهەڵنەگر هەبوون. گومان لەوەدانەبوو، ئاگادارینامەکان گەیشتبوونە شوێنی مەبەستی خۆیان. The middle East Mail، ڕۆژنامەی هێزەکانی بەریتانی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، ڕاپۆرتی دا، چەند خولەکێک دوای سەعات دوازدە دەزگای تەلەفۆنی هوتێلەکە گوێی لە دەنگی ئاگادارکردنەوەی ژنێک بووە، کە بۆمب لەژێر هوتێلەکە داندراون و دەبێ دەستبەجێ و بێ وەخران هوتێلەکە لە خەڵکی چۆل بکرێ. دەزگای تەلەفۆن وەرگری ڕۆژنامەی فەلەستین پۆستیش لەژێر سوێندا گەواهی لە بەردەم ئەفسەری پۆلیسدا دا، کە لە سەعات دوازدە و پازدە خولەکدا ئاگادارینامەکەی وەرگرت و دەمودەستیش بە ئەفسەری ئەرکداری بارەگای سەرەکی پۆلیسی ڕاگەیاندووە. (ئیشناب)یش کە ئۆرگانێکی نیمچە قانونی هاگانابوو، ئیفادەی شاهیدێکی باوەڕپێکراوی بڵاوکردنەوە، کە لە کاتی تەقینەوەکەدا لەناو هوتێلەکەدا بوون.

ئەو گوتی:

"کاتێک گوێم لە رمبوهۆڕی تەقینەوە ئاگادارکەرەوەکە بوو، بڕیارمدا، لەنێو هوتێلەکە بچمەدەر. زۆر کەسی دیکەش هەوڵیاندا هەروا بکەن، لێ سەرباز بەری دەرگای دەرچوونیان گرت و تەقەیان لەو کەسانە دەکرد، کە دەیانەویست لە هوتێلەکە بچنە دەرەوە."

دوایی تێگەیشتم لەوەی کاتێ ئاگادارینامەی چۆلکردنی هوتێلەکە گەیشتە ئەفسەرە پلە بالاکان، شاهیدەکە وای ڕوون کردنەوە: "ئێمە بۆ ئەوە لێرە نین فەرمان لە جووەکان وەربگرین. ئێمە بەخۆمان فەرمان دەردەکەین."

لەو بیست و پێنج یان لەو بیست و حەفت خولەکەدا وەک لە ئیفادەی هەموو شاهیدەکاندا هاتبوو، نێوانی ئاگادارینامەکە بوو لەو کاتەی ڕاگەیەندرا تا ئەو

کـــاتەی تەقیـــنەوەکە بەرپـــابوو، ئیـــدی کـــات بـــایی پێویســـت لە بەردەم دەسەڵاتداراندا هەبوو هوتێلەکە لە ئاکنجیەکانی نێوی چۆڵ بکەن. لەکۆتایشدا، هۆیەک هەیە بۆ ئەوەی باوەڕ بەوە بکرێ، فەرمانی دیاریکراو لەلای کەسێکی دەسەڵاتدارەوە دراوە تا هۆشداریینامەی تەقینەوەکە پشتگوێ بخرێ. ئەرێ بۆچی ئەو فەرمانە گەمژەیانە دەرچوو؟ کێ لێی بەرپرسیارە؟

حکـوومەتی بەریتـانی بە دوای ئەو دۆزەدا نەچـوو، لێشـی نەکـۆڵیەوە. بەر لەوەی ژەنەڕاڵ بـارکەر ئەوێ جێبێڵـی و بچێـتە بەریتانیـا، ئەو فەرمـانە بەدناوەی بۆ هێزەکانی بەریتانیا دەرکردبوو.

"من بڕیارمداوە،" ئەو وای نووسیبوو، "کە ئەوان(جووەکان) دەبێ سزا بدرێن و هەستەکانی ئێمە لەمەڕ قێزلێبوونەوە و سوکایەتی رەفتیارەکانیان بزانن. ئـێمە نـابێ بە لایەنـداریی دووڕوویـانەی سـەرکردەکانیان و ئۆرگـانە نوێنەرایەتیەکانیـان هەڵبخەڵەتێن، ئەوان کەسانی بەرپرسیار نین و ناشتوانن جڵەوی تیرۆرستان بکەن. من دووبارەی دەکەمەوە، گەر کۆمەڵگەی جوو بە ڕاستی بیەوێ کۆتـایی بە تاوانەکـان بێنـێ، ئەوا بەهاوکـاری کردنیـان لەگەڵ ئێمەدا دەبێ. هەر بەو بۆنەیەوە بڕیـارم داوە، لە گەیشتنی ئەم نامەیەمدا کە هەموو شوێنەکانی ڕابواردنی جووەکان، قاوەخانە و چێشتخانەکانیان، دوکان و خانووە تایبەتەکانیشیان بازنەی داخراون. هیچ سـەربازێکی بەریتـانی نـابێ پەیوەندی بە هیچ جووێکەوە بکا، ئەو پەیوەندییە پێویستیانەشیان دەبێ زۆر کورت و سنووردار بن. من لەوە تێدەگەم، ئەو پێوەرە بۆ هێزەکان ئاستەنگ دەخـولقێنێ، بەڵام خـۆ ئەوان لە ئەرکەکـانی خۆیـان دەگەن، دەبـێ سـزای جووەکـان بە ناشـرینترین شـێوە بـدرێ: بەوەی بە باشـی بـاجەکەی بـدەن، نمایشی بێزرانی ئێمەشیان بۆ دەربکەوێ."

ئەو فەرمانەی ئاراستەی ئەفسەرە بەریتانیەکانی سەرتاسەری وڵات کرابوو، هەر لە ڕۆژی نووسـینیەوە کەوتە بەردەسـتی دەزگـای زانیـاری ئیرگـون. ئێمەش دەستبەجێ بڵاومـان کردەوە. نـاواخنی ئەو ڕق و کینەش لە دنیـادا دەنگی دایەوە.

لە ڕێـی کـۆکردنەوەی بەڵگەکـان و ئاشـکراکردنی نهێنییەکـان لەلای دەزگـای زانیاری ئیرگونەوە، بە شێوەیەکی بەرفراوان ئەوە مەزندە کرا، ئەفسـەرە پلە باڵاکان بەئەنقەست و لە سۆنگەی هۆکارێکەوە کە هەر خۆیان باشتر دەزانن،

ڕێگەی چۆڵکردنی هوتێلی شا داودیان نەداوە، هەر بۆیەشە ئەو کوێرەوەرییە گەورەیەی لێکەوتەوە.
دوای هەڵسەنگاندنی پرسەکە لە ماوەی ساڵانی ڕابردوودا، من باوەڕم بەوەهێنا، ئەو بیردۆزە پێچەوانەی ڕاستیەکان بوو، بۆیە ڕاست نەبوو. پرسیارە قانونناسە کۆنەکانی ڕۆمای دێرین Qui prodest؟ (کێ سوودمەندە؟) کلیلی دۆزینەوەی تەلیسمەکەی نەدایە دەست. پرسیارەکە هەر بەکراوەیی مایەوە.
هەر چۆنێک بێ، ئەوە ڕوون و ئاشکرایە، ئێمە بە دڵنیاییەوە پێشتر هۆشداریمان بۆ چۆڵکردنی هوتێلەکە دابوو، لە کاتی خۆشیدا بە دەسەڵاتداران گەیشتبوو، ئیدی ئەوان لەماوە دیاریکراوەکەدا دوو جاران دەیانتوانی هوتێلەکە چۆڵ بکەن، بەلام کەسێک بە ئامانجێکی ڕەشەوە واینەکردووە، فەرمانی چۆڵنەکردنی هوتێلەکی داوە، ئەوە شتێکی دیکەیە.
دەمودەستیش هەر دوای ئۆپەراسیۆنەکە دنیا پڕبوو لە درۆی شاخدار. ڕووداوەکەش بۆ پڕوپاگەندە بووە پارویێکی زۆر چەور. ئەرێ ئێمە چیمان هەبوو؟ ڕۆژنامەی ژێرزەمینی (هیروت) نووسیبووی، "شەڕێک بۆ ڕاستی:"
"شەڕەکە بەردەوامە... ئەوەش هەر وەک شەڕە مەزنەکان دەچێتە سەر لاپەڕەی مێژووەکەمان. دژبەرەکان تانک و هێزی چەکداری دوژمن نەبوون. بەڵکو ئەوان دوو دژبەری کۆنینە بوون، کە هەر لە سەرەتاوە لە شەڕدان، ئەوانیش: ڕاستی و درۆن.
"هێزە ڕکابەرەکان ئاساییانە هاوتەریب نین. لە پشت درۆوە دەزگایەکی گەورەی پڕوپاگەندەی ئیمپراتۆریەکی زلهێزی جیهانی وەستاوە؛ وێستگەکانی ڕادیۆ کە دەنگیان دەگاتە هەر چوار کەناری دنیایێ، سەدان ڕۆژنامە، پەرلەمانەکان، حکومەتەکان، باڵوێزخانەکان. بۆ پاڵپشتی درۆش ڕۆژنامە جووەکان کە مایەی بەزەیین، دامودەزگا تۆقیوە جووەکان، کەسانێک کە ئەژنۆیان لەرزیوە، هەڵوەدایانە. هەر هەمووشیان قیژاندیان و هاواریان کرد، هەمووشیان گوێی خۆیان گرتبوو، هەمویان کێبەرکێیان بوو ئاخۆ کێ وشەی بەهێز و بە جۆشی سەرزەنشتکردن و شەرمەزارکردن و سوکایەتی پێکردن بەکاربێنێ. دیاربوو شەڕەکە دۆڕابوو.

دۆران؟ وشەیەکی قورس و توندە. دیاربوو دەرفەتی ئێمە بۆ بردنەوە ئێجگار بچووک بوو. هێشتاش ڕادیۆ نەرمڕۆکان بەسەر دەزگای پڕوپاگەندەی کەتە و زلدا زاڵ بوون. "هەر ڕاستی مەزنە..."

## 4

شەڕی ناوخۆش لەپێناو ڕاستیدا ئاسان نەبوو. هەروەک هاگانا داوای کردبوو، ئێمە بڵاونامەمان لە ڕۆژی هەڵمەتەکە جارنەدا و پەردەشمان ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەسەر ناسنامەی ئۆرگانی جێبەجێکاری چالاکییەکە هەڵنەدایەوە. لێ لەنێو هاگانا خۆشیاندا پشێوی زاڵبوو. ئەفسەرێکیان زنجیرەیەک بڵاونامەی دژبەیەکی بڵاوکردنەوە. سەرەتا ئامۆژگاری بە ڕۆژنامەگەری جوو کرد ئیدانەی ئۆپەراسیۆنەکە نەکەن، بە فراوانیش هێمای بۆ ئەوە کرد، گوایە هاگانا پێشوەخت بە پەلامارەکەی زانیوە. دواتر، کە ئاشکرا بوو ئۆپەراسیۆنەکە زیان و قوربانی زۆری لێکەوتوتەوە، ئامۆژگاری ڕۆژنامەگەری کرد، بە هیچ شێوەیەک بە کۆمێنت چ ئەرێنی یان نەرێنی خۆیان لە قەرەی ئۆپەراسیۆنەکە نەدەن. ڕێنمایی سێهەمی هەمان بڵاوکەرەوە ئەوە بوو، بەبێ پارێزکردن سەرزەنشتی "هەڵگەڕاوەکان" (مەبەست ئیرگون و F.F.I بوو) بکەن.

ئیدی دەرگای سەرزەنشتکردن کەوتە سەر گازەرای پشت! وڵاتە بچکۆلەکەمان هەرگیز پەتای هیستریایەکی خۆبەکەمزانینی ڕۆژنامەوانی لەو جۆرەی بەخۆوە نەبینیبوو. هامیشمار[٧٦] داوای هەڵمەتێکی لەناوبردنی کرد. هارێتز[٧٧]یش وەک ئەوەی مۆتەکەی لەخەودا بینیبێ، هۆنراوەیەکی بڵاوکردەوە، جارێ دا هیچ ڕزگاربوونێک لەو ڕزگاربوونەی گەڕوگولێک هەڵوەدایە باشتر نییە... تەنها دوای زۆر ڕۆژی دیکە هائارێتز بەهێورەیی داوای لێکۆڵینەوەیەکی مەحکەمانەی کرد، ئاخۆ بۆچی هوتێلەکە لە بنیادەمان چۆڵنەکراوە. ئەوسا، بەڵێ هەر بە تەنیا ئەوسا، هائارێتز نووسی، گومان لەوەدا نەبووە بەر لەتەقینەوەکە ئاگادارکردنەوە جارڕدراوە، هەروەها لە نێوبەرکەی بەڕێز یاکوبس[٧٨] ئەفسەری پلە بالای جوو لە بەڕێوبەرایەتی

---

[٧٦] نەل هامیشمار، ئۆرگانی باڵی چەپی کۆمۆنیست سۆسیالیستەکان بوو.

[٧٧] هارێتز، یان وەک ئەوان بە نازناوی "یەکییس" بانگیان دەکرد، ئۆرگانی چینی مامناوەندی جووە ئاڵمانەکان بوو.

[٧٨] برای بەڕێز نۆزمان یاکوبس باوکی زایۆنیستە بەناوبانگەکەی مانشستەر بوو.

هوتێلەکەدا، کە بەهۆی تەقینەوەکە کوژرابوو، هێماگەلێکیان دۆزینەوە، ئەمەش نیشانەی بەخۆکەوتن و ڕۆیشتنی بوە، بەڵام یەکێک ڕێگەی پێگرتووە بڕوا. بەڕێز بنگوریۆنیش فوی بە زوڕنای سەرزەنشتکردنەکاندا کرد، لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەی پاریسی France Soirدا ئەو تیروتوانجە سەیرەی تێگرتبووین: "ئیرگون دوژمنی گەلی جوولەکەیە، هەمیشەش دژبەری من بووە."

لە هەمووشی سەیرتر هەڵوێستی هاگانا بوو. وێڕای داوای پێشتری ئەوان بۆ ڕانەگەیاندنی ناسنامەی بەرپرسیاریتی ئەو ڕێکخراوەی لە پشت ئۆپەراسیۆنەکەوە بووە، من لە ئێوارەی 22ی تەموزدا تێبینینامەیەکم لە گالیلییەوە پێگەیشت، داوای لێکردبووین، جاڕ بدەین کە ئیرگون بوو پەلاماری هوتێلی شا داودی دا. گالیلی ئەوەشی سەربارکردبوو، هاگانا هیچ لێدوانێک بڵاوناکاتەوە. ئێمە داواکاریەکەی ئەومان بەجێهێنا. دەستبەجێ شتێکمان نووسی و بڵاوکردەوە، لێدوانەکانمان ڕاستیەکانی پەلامارەکەی سەر هوتێلەکەی تێدا بەیان کرابوو. تەنها خۆمان لە یەک ڕاستی بواردبوو: کەوا لە 1ی تەموزدا هاگانا داوای لێکردبووین (ئۆپەراسیۆنی شیک) ئەنجام بدەین... بەڵام هاگاناش لەلای خۆیەوە، بەڵێنەکەی نەبردەسەر. ڕۆژی دواتر، لە 23ی تەموز "دەنگی ئیسرائیل" ڕادیۆکەی هاگانا لێدوانێکی سەرنجڕاکێشی بڵاوکردەوە:

"بزووتنەوەی بەرگری عیبری کۆستی قورسی ئەو قوربانیانەی بە هۆی ئۆپەراسیۆنی 'هەڵگەڕاوەکان' بۆ سەر هوتێلی شا داود کەوتەوە، شەرمەزار دەکا."

"سەرکۆنەکردن"..."هەڵگەڕاوەکان"...ئەوەش بۆ یەکەمین جار بوو دوای چەند مانگێکی دوور و بەردرێژ، قسەکەری هاگانا ئەو دەستەواژەی "هەڵگەڕاوەکان" بەکاربێنێ. ئێمەش ڕاهاتبووین تەنانەت لە گۆڕانی تۆنی برگەکانیشیان بگەین، لە ئاماژەکەیان حاڵی بووین. لە ڕاستیشدا وشەکان زۆر ئاماژەداربوون. هەڵاتن لە بەرپرسیاریتی نابەرپرسیاریتیە. ئەوەش دژی هەموو مۆراڵێکە، بە کردار ئەو گوناحە دژی گیان و ورەی جەنگاوەرانە.

هەمان ڕۆژ گالیلی نامەیەکی بۆ ناردم. بۆنی نامەکە دەربارەی ئەوەی لەنێوانماندا ڕوویدابوو، بەرگریکارانە بوو، نمایشی خەم و مەراقێکی زۆریش

بــوو ســەبارەت بە پەرەســەندنەکانی ئاینــدە. گــالیلی، کە جــێگەی ســنێی لە سووپاسالاری هاگانا گرتبووەوە، نووسیبووی:
"بۆ .M، شالۆم!
ئەو لێکەوتە قەبەیەی کردەوەکەتان لە ئۆرشەلیم پێشهاتی چاوەڕواننەکراوی لەگەڵ خۆیدا هێنا. ڕۆژنامەکان خۆیـان لە ڕێنماییەکانمـان بوارد، بۆیە نەکرا خۆ لە هەلومەرجەکە بپارێزین.
"ڕەوشــەکە هــی ئەوەیە ببێــتە مــایەی تراژیــدیا و ئــاڵۆزی و بڵــۆزی لەســەر بەردەوامبــوونی خەبــات. لەپێنــاو دوورخســتنەوەی ئەو شــتە، شــتێکی چارەنووســازانەیە ئەمشــەو 23ی تەمــوز 1946، لە ســەعات 21دا یەکــدی ببینین.
"تکـایە کۆشـش بکە و وەرە. مـن لەوێ لە شـوێنی دوا دیدارمانـدا چاوەڕێـت دەکەم. دیدارەکەی ئەمشەومان دەبێ پێش کۆبوونەوەی بەیانیمان بکەوێ."
مـن چـوومە شـوێن و وادەی کۆبـونەوەکە. دڵـم زۆر قـوڕس و پڕ بـوو، بەڵام گـالیلی وای بـۆ دەرنەکەوت. کاتێـک مـن دەربـارەی هەڵوێسـتی ڕۆژنامەکـان دوام، وەڵامــی دامەوە، ڕۆژنامەکــان لەســەر هێــڵ لایانــداوە و ڕێنماییەکــانی فەرماندەی هاگانایان بەهەند هەڵنەگرتووە، بەڵام من بە شێوەیەکی تایبەتمەنـد گلەیـیم ســەبارەت بە وتــارە سەیروســەمەرەکانی ڕادیـۆی دەنگـی ئیســڕائیل لێکرد.
"ئەرێ ئەوە واتای چی دەگەیەنێ؟" مـن وام لێپرسـی، "ئەرێ تـۆ نـازانی چـی و کێ بووە مایەی ئەو "باجە قوڕسە"؟ ئەرێ بۆچی سەرزەنشتی ئێمەتـان کـرد؟ خۆ نەخشـەکە بە ڕێکەوتنی هـەر دوولامان بـوو، پیاوەکـان کتومـت لەسـەر ئەو ڕێنماییانە ڕۆیشتن کە پێیاندرابوو، ئاگاداریینامەکانیش درابـوون، باشـە بـۆچی ئێوە ڕاستیەکە نالێن؟"
ئیدی هەر ئەو کـات بـوو، گـالیلی باسـی ئەو گفتوگۆیەی نێوان ئەفسـەرێکی پـۆلیس و کارمەنـدێکی هـوتێلەکەی بـۆ کـردم، کە زانیـارییەکە گەیشــتبووە دەســتی دەزگــای هەواڵگـری هاگانـا. ئەوەش دەمەتەقــێکە بــوو، بە فەرمــی ڕاگەیەنـدرابوو: "ئێمە فەرمـان لە جووەکـان وەرنـاگرین." لەسـەر داوای مـن، گـالیلی بەڵێنـی دا لە بەرنـامەی داهـاتووی ڕادیـۆی دەنگـی ئیسـڕائیلدا دەقـی گفتوگۆکە بڵاو بکرێتەوە. ئەو داوای لێکردم کە دڵنیای بکەمەوە هەر شتێکمان

بکەویتە بەردەست لەبەر ئاڵۆزی باردودۆخەکە بڵاوی نەکەینەوە. منیش بەڵینم پێدا. ئیمە نەماندەویست خەڵک زیاتر بتۆقێنین وەک دامودەزگا فەرمییەکان مرازیان بوو. ئەوسا گالیلی تێبینامەیەکی لە گیرفان دەرهێنا و بۆی خوێندمەوە. شتەکەش لە ئیسحاق سادێوە بوو. من خوێندمەوە، دیاربوو هەموو شتێکم لەبەر چاوان تاریک بوو. سادێ بێ کەم و زیاد نووسیبووی کە هەڵخەڵەتێندراوە، گوایە گیدی پێیگوتووە، هێرشەکە لە نێوان سەعات دوو و سێی دوای نیوەڕۆدا دەکرێ، کاتەکەش ساتەوەختی پشووی نانخواردنە و نووسینگەکانی حکوومەتیش خاڵی دەبن.

من دەمودەست ڕاستیەکانی کاتبەندی قورمیشی ئۆپەراسیۆنەکەم بۆ شیکردەوە. فەرماندەیی ئیرگون چەندبارە مشتومڕی لەسەر کاتەکە کردوە و ڕوونی کردۆتەوە ئیمە هەرگیز هیچ کاتێک گوێمان لە پێشنیازێک نەبووە، تا ئۆپەراسیۆنەکە لە کاتی پشووی نانخواردندا ئەنجام بدەین. گیدی دوای بڕیاردان لەسەر هێرشەکە، بە نوێژی نیوەڕۆ ڕۆیشتبوو سادێ ببینێ. دواتر گیدی تەواوی باسوخواسی کۆبوونەوەکەی لەگەڵ سادێدا بۆ گێڕامەوە، گیدیش هەرگیز ناڕاستی پێنەگوتوومە. بەڵام خۆ ئەگەر گالیلیش بڕوا بە گیدی نەکا وەک من بڕوای پێدەکەم، ئاخر حیکمەت لەو گریمانەیە چییە، کە گیدی شتێکی دیکەی بە سادێ گوتبێ، جیاواز لەوەی لەسەر پێشنیازی خۆی بڕیاری لەسەر درابێ.

گالیلی بەڵێنیدا پرسیاری وردەکاری زیاتر لە ئەفسەری ئۆپەراسیۆنەکان بکا و داواشی لە من کرد، لیکۆڵینەوە و بەدواداچوونی خۆم بکەم. من پێم گوتەوە هیچ زەمینەیەکی لەبار بۆ ئەو لێکۆڵینەوەیە نابینم، لەگەڵ ئەوەشدا لە گیدی دەپرسم، خۆ ئەگەر بەڕێز ئیسحاق سادێ هەر مکوڕ بوو لەسەر ڕوانینەکەی، خۆ دوو ئەفسەری ئۆپەراسیۆنمان هەن، دەتوانن لەبەرچاوی ئیمەدا ئەوەی بن بەڕێ بێننە سەر بەڕێ. گالیلیش قایلبوو.

چەند ڕۆژێکی دیکەی پێچوو، تەنها دوای ئەوەی نامەی وەبیرهێنانەوەمان بۆ گالیلی نارد تا ئێزگەی دەنگی ئیسرائیل "دەمەتەقێکەی ناو هوتێلەکە" بڵاوبکاتەوە. ڕۆژنامەگەریش بەردەوام لەسەر "گوێپێنەدان بە ڕێنماییەکانی هاگانا" و ئیمەش لەپێناو خەباتە هاوبەشەکەماندا بێدەنگماینەوە.

لەو نێوەشدا کۆنفرانسێک لەنێوان ئەفسەرانی ئۆپەراسیۆنەکان بەسترا. گالیلی و سادێ نوێنەرایەتی هاگانایان کرد، هەرچی لە لایەن ئێمەشەوە بوو گیدی، ئاڤرام و من نوێنەر بووین. من پێشتر گفتوگۆیەکی دوورودرێژم لەگەڵ گیدیدا کردبوو. کاتێک ئەو بە تێبینینامەی سادێی بیست، حەپەسا. ئەو ڕوونی کردەوە، کە سادێ هەرگیز پرسیاری چرکەساتی پەلامارەکەی لێنەکردووە، ئەوانیش گفتوگۆیان لەو بارەیە هەر نەکردبوو. ئەوان مشتومڕیان لەسەر ماددە تەقینەوەکان و کاریگەرییەکەیان کردبوو. ئەوان باسی ماوەی هۆشدارینامەکەشیان کردبوو، بەشێوەیەک دەرەتانی چۆڵکردنی هوتێلەکە بهێڵدرێتەوە. ئەوان باسی ئۆپەراسیۆنەکەیان بە خڕی کردبوو. ئەوان لە وردەکارییەکانیان نەکۆڵیبووەوە. سادێ هەرگیز مەیلی بەلای وردەکاریەکان نەچووە نەخاسمە لەو ئۆپەراسیۆنە دیاریکراوەدا. ئەو وردەکاریەی سەعاتەوەختی ڕاپەڕاندی چالاکیەکەش هەرگیز ناوی نەهاتبوو.

لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەدا من ڕاستگۆیانە پرسیارم لە هەر دووکیان کرد. دواتریش بەخۆمم گوتەوە، هەر دەبێ بەدحاڵیبوونێک لەگۆڕێدا هەبووبێ. من و گالیلیش پرسیار لە دوای پرسیاری لە سادێ و گیدیمان کرد.

ئەم لێکۆڵینەوە بەراییە بە ئاکامێکی فەرمی نەگەیشت. لە بەرامبەر ئەو دنەدەرانەی هەر دەیان کوتیەوە و داوای دادگایەکی فەرمی لێکۆڵینەوە لەنێوان ئێمە و بزووتنەوەی بەرگریدا کرا. ئێمە پێشنیازمان کرد سەرۆکی دادوەرییەکە بەڕێز ئیسحاق گرەنباومی ئەندامی ئاژانسی جووەکان و بەڕێز د. ماگنس سەرۆکی زانکۆی عیبری یان بەڕێز تۆبنکین ی سەرکردەی ئاخدوت ئاڤۆداهی[79] هاوپارتی خودی بەڕێز گالیلی بن: هەموو ئەوانەش ڕکابەری سیاسی ئیرگون بوون. پێشنیازەکەی ئێمە وەرنەگیرا.

زێدەباری بڵاوکراوە ناڕاستیەکانی دیکە سەبارەت بە هێرشەکەی ئێمە بۆ سەر بنکە و بارەگای سەربازی و مەدەنی بەریتانیا، چیرۆکی سەرەنجامی تووڕەیی هوتێلی شا داود لێکترازانی پەیوەندییەکانی هاگانای لەگەڵ ئێمەدا لێکەوتەوە. بۆ من دیاربوو ئەو پەیوەندییە هەرگیز ئەوەندەی ڕۆژانی دوایی "ئۆپەراسیۆنی شیک" دۆستانە نەبووە. ئێمە بۆ ماوەیەکی بەردرێژ لەسەر

---

[79] ئاخدوت ئاڤۆدا ئەو کات باڵی چەپی کرێکارانی سۆشیالیست بوو، ئەویش بەرلەوەی لەگەڵ هاشۆمەر هاتزایر یەک بگرن و ماپام پێکبهێنن.

خۆئامادەکاری بۆ هاوکاری نەخشەکانمان بەردەوام بووین. لە ئابی 1946دا نەخشەی نقومکردنی کەشتییەکی بەریتانی کە بۆ گەڕاندنەوەی ئاوارەکانی بەریتانیا ئامادەکرابوو، لە بەندەری هەفیاش لەنگەری گرتبوو، خستە پێش. ئێمە ناومان لێنابوو "ئۆپەراسیۆنی قاوەڵتی" و هەندێک جارانیش پێمان دەگوت جەنابی قاوەڵتی.. لە 17ی ئابی 1946دا دوای بەسەرچوونی مانگێک بەسەر "ئۆپەراسیۆنی شیک" گالیلی ئاوای بۆ نووسیبووم:

" بۆ وەڵامی پرسی قاوەڵتییەکە بە پەلەم. من دووبارە لەسەر ئەوە ڕشتم، بابەتی جەنابی قاوەڵتی سەرنجی بەهەندهەڵگیراوەی خۆی وەرگرتووە و ڕاوێژی منیش وایە دژی هەر دەستوەردانێکم لەوانەیە زۆر قورس و کوشندە بکەوێتەوە. هەرچی دەربارەی داواکاری ئێوەشە کە پێشنیازێکی کۆنکرێتییە- ئاخر لە کەیەوە پێشنۆرەیی دراوەتە پێشنیازێک، نەخاسمە ماخۆی پێشنیازەکە ناکرێ بزانێ کە ئەم پێشنیازە عەیامێکە بەر لەوەی ئەو پێشنیازی بکا، کاری لەسەر کراوە؟

"من دەربارەی پرسەکانی دیکە بەبێ وەخران وەڵام دەدەمەوە."

نەخێر، ئەوە هێرشەکەی سەر هوتێلی شا داود نەبوو، پەیوەندییەکانی نێوان هاگان و ئیرگونی پچڕاند. ئەو ڕووداوە تەنها پەردەی لەسەر سیمای ڕاستەقینەی ئەو پەیوەندییە هەڵدایەوە، کە هەر چەند مانگێکی دیکەی خایاند. ئەوان پەیوەندییەکەیان بە کۆتا گەیاند، ئەمەش بە گوێرەی ئەو نامەیەی بەڵگەوبەندەمان بوو، کە دەربارەی بڕیاری ئاگر بەستەکە بوو، ئەمەش لە شەوی پایزدا و لە لایەن گیراوێکی دیاریکراو لە پاریس[80] کە دژی بیروڕای گیراوەکەی دیکەی پاریس بوو.

**5**

هێرشەکەی سەر هوتێلی شا داود دەرەنجامی دیکەشی لێکەوتەوە. دوای خۆئامادەکردنێکی وریایانە سووپای بەریتانی بەهێز و گوڕ و پاڵپشتیەوە هاتە نێو تەلئەبیب، بەنیازی ئەوەی وەک ڕایانگەیاند، زەبرێکی کوشندە لە تیرۆرستان بدات و لە ڕەگوڕیشەوە دەربێنێ.

---

[80] جەنابی بنگۆریۆن لەوکاتەی هاوڕێکانی لە 29ی حوزەیراندا گیران، ئەو لە پاریس بوو. ئەو لەوێ مایەوە تا گیراوەکان ئازاد کران. گیراوەکەی دیکەش لە پاریس بەڕێز سنێ بوو، ئەویش دوای ماوەیەک لە خۆحەشاردان لە بەر ڕووداوەکەی 29ی حوزەیران پەنای بۆ فەرەنسە برد.

تەلئەبیب لە لایەن نزیکەی دوو قۆشەنی هێزی پیادە و یەکەکانی زرێپۆش، بە یاوەری ژمارەیەکی زۆر لە پۆلیس و ئاژانەکانی هەواڵگر داگیرکرا. بە ڕۆژ و شەو هاتووچۆیان لە شارەکەدا قەدەغەکرد. ئاگادارینامەیان بڵاوکردەوە: "هەر کەسێک لە ماڵ دەرچێ بکەوێتە بەر سێرەی تفەنگ، تەقەی لێدەکرێ." لەوێدا ماڵ بەماڵ گەڕان. سندووقی چاودێریان دانان. کەس نەیدەتوانی لە تەونەکەیان دەرباز بێ. هەموو ماڵێک پشکنرا. هەموو تاکێکیش لێپێچینەوەی لەگەڵدا کرا.

ئەوانە فەرمانی ژەنەڕاڵ کاسێل، فەرماندەی هێزەکانی خاوەن شکۆ بوون لە شارە ئابلۆقەدراوەکەدا. ئۆردوگاکانی لاترن و رافیاش لە ژمارەی میوانە بەزۆر نێرداوەکان پڕ کران، تا لەودیو تەلبەندەکان خەیاڵ لێبدەن.

بەڵام خۆ بەکردەوە ئەو شتە نەبوو، کە ژەنەڕاڵ کاسێلس و بارکەر و گیلس و کالتینگی پۆلیس بەدوایدا دەگەڕان. ئەوان دەیانزانی کێیان دەوێ. بۆشی گەڕان. ئای کە چەندیان لێگەڕان! کەچی هەر نەیاندۆزینەوە.

ئێوارەی پێش ڕاگەیاندنی قەدەغەکردنی هاتووچۆوە، لە سەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە ئاگادار کرابینەوە، لەوانەیە بەریتانییەکان دەست بە کنەوپشکنینێکی بەرفروان بکەن. کاتێ ڕووشیدا ئێمە لەگەڵ سەرانی F.F.Iدا لە هەمان شەو لە کۆبوونەوەدا بووین. ئەوانیشمان ئاگادارکردنەوە، بەڵام پێنەدەچوو شتەکە بەتالوکەبێ، بۆیە هیچکامێکمان زۆری لەسەر نەڕۆیشتین. دوای لەیەک جیابوونەوەمان لەگەڵ فریدمان-یەلین و ئیسحاق یسەرنسکی، من گەڕامەوە ماڵ لە شەقامی بن نون. ئەڤراهام وەک جاران منی لە شیپانەی دەرگا بینی و سەعاتی کۆبوونەوەی بەیانیشمان دانا.

بەڵام هەر زوو، دوای نیوە شەو، من بە دەنگ و هەرای زنجیری تانک و ترومبێلە بارقوڕسە سەربازییەکان بێداربوومەوە. هاوسەرەکەشم هەڵسایەوە، ڕۆکیش(سەگەکە) خۆماکیانە بەبێ حەوسەڵەوە دژی بەریتانییەکان دنیای کردە ڕۆژی خۆی.

ئاگادارینامەی لێگەڕانەکە تەنها تیژپەڕانە سەلمێندرابوو. گەر هاتبا و شتەکەمان زیاتر بەهەند هەڵگرتبا، دەبوایە زوو تەلئەبیبمان چۆڵکردبا و لە دوورەوە چاوەڕێی کۆتایی هاتنی گەڕان و پشکنینی ماڵ بە ماڵمان بکردبایە. هەنووکەش لەنێو تەلئەبیبدا گیرمان خواردبوو. بارودۆخەکە پێدەچوو تاریک

بێ. ئەری چی بەسەر کوڕەکاندا دێ؟ هەرچی دەربارەی ئیسرائیل ساسۆڤەریشە[81]، ڕوون و ئاشکرا بوو ئەمجارەیان ریشەکەی دادی نادا. دەزگای هەواڵگریمان بەر لە ماوەیەک بەوەی زانیبوو، بەریتانییەکان زۆر بەلای ئەوانەی ڕیشیان هێشتوتەوە دادەچن، هەر بۆیەشە زۆر لە جووە ئەرسەدۆکسەکان لەبەر ئەو بەدگومانییەدا دەیانناڵاند.

دەی، کەوایە چی کرابا؟

ژوورۆچکەیەکی نهێنی لەنێو خانووە بچکۆلانەکەماندا هەبوو. ئەوەش لە لایەن ئاکۆڤ مێریدۆرەوە بەر لەوەی ڕادەستی بەریتانییەکان بکری، نەخشەی بۆ کێشرابوو. شوێنەکە زۆر سەرەتاییانە بوو، هەر چاوێکی تیژ سەیری کردبا دەیدۆزیەوە. بۆ ماوەی هەژدە مانگیش بوو ژورۆچکەکە بەتاڵ و حەتاڵ بوو. لە ماوەی ئەو کنە و پشکنینەی ڕابردوو، هەرگیز ئەوێ بەکارنەهاتبوو، یان وای لێنەهاتبوو پەنای بۆ ببردرێ، بەڵام ئەوێ شەوێ هەستم کرد، دەبێ لەبەر چاوان ون بم و بچم خۆی تێدا حەشار بدەم.

بۆ زانیاری کوڕەکەم، وام لەگەڵ هاوسەرەکەم ڕێکخست، کە چوومەتە ئۆرشەلیم، ئیدی بازمدا و چوومە ئەو کولانە تەنگەیە و خۆم حەشاردا.

بەریتانییەکان هەر دەهاتن و بە بەردەم ماڵماندا تێدەپەڕین، بۆ سەر لەبەیانیەکەشی هێشتا هەر دەهاتن و دەڕۆیشتن. لە ڕادیۆکەشەوە، کە خێزانەکەم هەموو دەنگی دابوی، تا منیش لە شوێنە حەشاردراوەکەمەوە گوێم لێبێ، دەنگی کابرای هەواڵ خوێن دەهات. باری قەدەغەکردنی هاتووچۆ بۆ چەندان ڕۆژ درێژە دەکێشی. ... ئەوەش مایەی ئۆخژن نەبوو.

هەنووکە سەربازەکان گەیشتنە بەردەم باخەکەمان، هەندێکیان لەوێ مۆڵگەیان هەڵدا. ئەوان هاتن و یەکەمین گەڕان و سوڕانی خۆیان بۆ ماڵەکان لەو خاڵەوە دەستپێکرد. ئەوان هەر بەدرێژایی باسکێک لە منەوە دوور بوون.

ئەفسەرەکە پرسیاری لە هاوسەرەکەم کرد. "ئەرێ مێردەکەت لە کوێیە؟"

خێزانەکەم وای ڕاگەیاند، ئینگلیزی نازانێ، ئیدی بە عیبری وەڵامی دایەوە، کە مێردەکەی چۆتە ئۆرشەلیم.

قسەی لەسەر نەبوو ئەویان بۆ پرسیار و وەڵام برد، ئاخر هیچ بژاردەی دیکە نەمابۆوە، ئەویش پەلی هەر دوو منداڵەکانی گرت و لەگەڵیان ڕۆیشت.

---

[81] لێرەدا مەبەست خودی مناحیم بێگنە. وەرگێڕ

مێــزی لێپرســـینەوە، لەوێ لە لایەن ســـەربازەکانەوە لەســـەر شـــەقامەکە دانـدرابوو، هەر نیـو مایلێـک لە ماڵەکەمـانەوە دوور بـوو. کـاتێکیش ژنەکەم دەگـاتە ئەوێ، ئەوان هەر هیچیـان لێنەپرسـییەوە. ئەفســەری پەیوەندیـدار بە لێکـۆڵینەوەکە ســەیرێکی دەکـات، ئەوســا بە پۆلیسـێکی جـوو کە وەک و دیلجمانیان لەگەڵدابوو دەڵێ:

"پێی بڵێ با بچێتەوە ماڵەوە!"

دواتر خێزانەکەم پێیگوتمەوە، کە نۆتەی دەنگی کابرای پۆلیس سوکایەتییانە بـوو. ئەویـش گەڕایەوە مـاڵەوە، بە قسـەکردنی بە دەنـگ لەگەڵ منداڵەکانـدا، ئاماژەیەکی وای بۆ کردم کە جارێ هیچ شتێکی وا لەگۆڕێدا نییە.

لێ دواتـر سـەربازەکان هـاتنەوە، تـا مـاڵەکە بپشـکنن. ئەوان کەوەنتەرەکەیـان کردەوە. سەیری بن پێخەفەکانیان کرد، تەقەتەقیشیان لە دیوارەکان وەهێنا. لە دیواری ئەو ژوورۆچکەی خۆم تێدا حەشاردابوو، لەوێشیان دا. وا بە هێزیـان پیاکێشا بەئاستەم بەرگەم گرت لەوەی دەنگەدەنگم لێوە نەیەتەوە. ڕۆکسیش حەجمانی لەبەر بڕابوو.

وێـڕای ئەوەی حەشـارگەکەم بەهەشـتێک نەبـوو. لائیـرادیش چاوەزینـدانییە تەنهاییەکەی گرتووخانەی لوکیشکیم بیرکەوتەوە. بە دڵنیـایەوە خـاڵی بەراورد لەنیوان ئەو دوانەدا هەبوون. لە لوکیشکیدا بە ڕۆژ گەرم و بە شەویش سارد بوو. لێرەش بە شـەو سارد و بە ڕۆژیش خـاوێنگە (بەرزەخ، ئەعـراف) بـوو. لەوێـدا نـاوکەوەکە بەرد بـوو، لێـرەش دار بـوو. لەوێ ئێسـقانەکانمان بە ژان بوون، لێرەش ئازاری ئێسقان کەم نەبوو. لەوێ دەتتوانی سـێ شـەنقاو و نیـو بهـاوێی. لێـرە نەدەکرا لە شـوێنی خـۆت ببزوێ. لەوێ لە خۆراکت کەم بـوو، لێرەش لە ئاو.

ئەوەی لە هەمـووش بەدتـر بـوو، نەبـوونی ئـاو بـوو. مـن لە لوکشـکی و شوێنەکانی دیکە بێ خواردن ببووم. لێرەش بۆ یەکەم جار بۆمدەرکەوت، بـێ ئـاوی چـی دەگەیەنـێ. برسـێتی و تێنوێتی هـی ئەوە نـین لەگەڵیـان هەڵبکەی. بەڵام خـۆ ئەگەر هەر بـژاردەیەک لەنێوانیانـدا هەبـێ، بـێ دوودڵـی برسـێتی هەڵدەبژێرم. تێنوێتی بەردرێژ کوشندە و سامناکە.

کاتەکە حوزەیران بوو، حەشارگەکەش خنکێنەر، یەک دڵۆپە ئاویشـی لێنەبوو. ڕۆژ ئاوابوو، شەو هات. هێشـتا مۆڵگەی بەریتانییەکان هەر لە باخچەکەماندا

بوو. ڕۆژێک و شەوێکی دیکەش ڕابردن. منیش بەبێ ئاو لە وێ مابوومەوە. ڕۆژ و شەوی سێیەمیش. سەرم گێژی خوارد. جەستەم بەتەواوی خەریکبوو وشک دەبوو. ئایا چی ڕوودەدا، گەر گوێم لێبووایە ڕادیۆیەکە یادی بخستمایەوە، کە بارەکە هێشتا چەندان ڕۆژی دیکەش دەخایەنێ، چی دەبوو؟
سەربازە بەریتانییەکان بەردەوام هەر چەند خولەکێکی کەم و دەهاتنە ماڵ. هەندێ جار داوای شخارتەیان دەکرد یان هەر شتێک کە دراوسێ داوا لە دراوسێی بکا؛ بەڵام زیاتریش بۆ ئاو دەهاتن. ئەوان ئاوی ئێمەیان دەخواردەوە.
دواتر لە پڕێکەوە هەستم بە گۆڕانی شتێک کرد. ژاوەژاوێیک لە دەرەوە پەیدابوو، دیاربوو خەڵک لە جووڵەدا بوون و دەنگی ماتۆڕی بەنزینیش دەهات. سەربازەکانیش چیدی نەدەهاتنە ماڵەکەمان. تۆبڵێی ئەوە چی بگەیەنێ؟
بێدەنگ! خۆم سەرکۆنەی خۆمم دەکردەوە. لەوانەیە تۆ هەڵە بی. ئاوا خێرا خەنی مەبە بەوەی دەستت بە ئاو ڕابگا!
لێ هەر زوو هەموو دڕدۆنگییەکەم ڕەویەوە. هاوسەرەکەم بانگی کردم، "هەموو شتێک تەواو" هێمایەک بە گەسکەکە و بۆ هەموو شتێک!
کاتێکیش لە کۆتاییدا دەستم بە ئاو گەیشت، نەمخواردەوە. سووکوئاسان سەرم چەند جارێک لەنێو بادی شلەی ژیانەوە وەردا. چوار ڕۆژ تێپەڕیبوون، کە من چووبوومە ژوورە کونبڕەکەم.
باری قەدەغەکردنی هاتووچۆ هەڵگیرا. یەکەمین کەسیش کە سەردانی کردم، گیدی بوو. پرسیارە حەپەساویەکەشی ئەوە بوو:
"ئەرێ بۆ خاتری خوا، چۆن لەو کولانەیەدا هەناسەت دەدا؟"
ئەوەش شتێک بوو نەمدەتوانی وەڵامی بدەمەوە. ئاخر هەرگیز لە چاوە زیندانیەکە خەمی هەوام نەبوو؛ تەنها بیرم لە ئاو دەکردەوە.
دوای گیدیش ئامیتزور و مایەر هاتن، هەر یەکە و بە گێڕانەوەی خۆی، چیرۆکیک بە هەمان ناوەڕۆک. ڕژێم بەو هەموو لەشکر و لێکۆڵەرەوە و ئاژانە هەواڵگرییەکان و بەو هەموو وێنەی تیرۆرستان و هەموو ئەوانەی هاوکاریان دەکردن، دەستکەوتێکی کەمی بەدەستهێنا.

هەمووان خەمی ئەڤراهاممان بوو، ئەویش دواتر گەیشت. ئەو دەنگوباسی کۆ کردبووەوە. ئیسحاق ئیرتزنسکی، فەرماندەی F.F.I لەبن دەمامکی 'رابی شامێر' گیرابوو. لە ئەندامە کاراکانی ئێمەش تەنها یەکێکیان، تەنها زوسیا گیرابوو. هەموو ئەفسەرەکانی دیکەمان ساغ و سەلامەت بۆی دەرچووبوون.
شادمانییەکەمان ئەوەندە گەورەبوو، ڕێسای خۆمان لەبیرچووبووە، بەدەنگی بەرز قسەمان بۆ یەکدی دەکرد. "باوکە، ئەری ئەو هەموو ماوەیە لە کوێ بووی؟" ئیدی لە پڕێکەوە دەنگی ئەو پرسیارە لە بێننی کوڕمەوە هات.
"لە ئۆرشیلیم."
"لە ئۆرشیلیم؟ ئەری چیت بۆ هێناوم؟"
"بۆ هێنان؟ بەڵێ..."
هاوسەرەکەم بووە فریادڕەسم.
"ئەو ترومبێلێکی گەورەی بۆ کڕیوی، بەلام مام سیمۆن (کوڕەکەم بە ئامیتزوری دەگوت مام سیمۆن) لەگەڵ خۆی بۆت دێنێتەوە."
دواتر پێیان گوتم، لە ماوەی قەدەغە مەزنەکەی هاتووچۆ لە تەلئەبیبدا جووە ئەرسەدۆکسەکان لە ژمارەیەک لە سیناگۆگەکانی تەلئەبیب گردببونەوە لەبەر یەزدانی مەزن پاڕابوونەوە، کە لە دەست ئەوانەی بەدوای ژیانمدا دەگەڕێن، بمپارێزی.
ئیدی هیچ شتێک بە قەد ئەو ڕاپۆرتە لە ناخەوە نەیبزواندم.

## بەندی 16
## فەلاقەکان

٢٦٠-٣٥١

تـوخمی دیـاریکراو لەنێـو دامودەزگاکـانی حکـوومەتی بەریتانیـادا مەیلێکـی تایبەتیان بۆ بەکارهێنانی قامچی و دارکاریکردن هەبوو.

لە پێشـهاتی پەرەسـەندنەکانی چەنـد کۆلـۆنیێکی دیـارکراوی بەریتانییـدا، دارکـاریکردن خزمەتـی پرسـی پەروەردەی کـردووە. هەڵبەتە ئەوەش نەوەک هەر بۆ منـداڵە لاسـارەکان بەکارهێـندرابێ، بەڵکو بـۆ خەڵکی هەراشـیش هەر وەک منداڵی چەتون ڕەفتاریان لەگەڵدا کراوە. لە کاتی گەشـتی گەڕانەوەمـدا ، لە ڕێگای ڕووسیا بۆ خاکی ئێرتز ئیسرائیلدا، بەناو ئێراندا تێپەڕیم، لەوێ ئەو هێمایەی دەسەلاتی بەریتانییەکانم بینی. هەرچەندە ئێران، بە هـیچ شـێوەیەکی فەرمـی، کۆلـۆنییێکی بەریتـانی نەبـوو، کەچـی هەر ئەفسـەرێکی بەریتـانی قـوتە دارێکـی[٨٢] قەمچــی ئاســای بەدەســتەوە بــوو، بەردەوامـیش بە هــۆیەوە بە جەختکـردنەوە فەرمـانی بەسـەر هـاولاتییە خۆجێیەکانـدا دەکـرد و بەسـووکی دارەکەی بەسەر سەریاندا رادەوەشاند.

کـاتێکیش ئێرتـز ئیسـرائیل وەک کۆلـۆنیێکی بەریتـانی حـوکم دەکـرا، شـتێکی ئاوەزیانە نەبوو ئەو دارکارییە پەرەوەردەییە نکولی لێبکرێ.

هەر زووش بەدبەختی قوربانییەکانی فەلسـەفەی دارکـارییەکە دوو سـەربازی ئیرگون زڤای لیمی گرتەوە. کاتز و کیمخی دوو گەنجی حەڤدە ساڵانە بـوون، دادگـایەکی سـەربازیی لە تـۆمەتی شـکاندنی ڕێسـای سـەربازی بە هەڵگرتنـی چەک حوکمی پازدە ساڵیان بەسەردا درا، بەلام حوکمەکەیـان بە سزایەکی تەمبێکردن گۆڕدرا، کە هەریەکەیان هەژدە قامچی لێبدرێ.

ئـێمە ئەو سـزایەمان بە سـووکایەتیێکی سـەربار و لەکەدارکردنــی سـزا قوڕسـکەی زانـی، پێشـمان وابـوو کـاریگەری ڕێڕەوشـت و سیاسیانەی زۆری دەبێ. ئاخر ئەو قامچیانە گیانی ئێرتز ئیسـرائیل بریندار دەکەن. حەفتا نەوەیە

---

[٨٢] مەبەست لەداری ئەفسەرانە، کە بەداری شانازیش ناسراوە، درێژییەکەشی 60 سانتیمەترە. هەنووکەش لە سیستمی سەربازیدا ، ئەخاسمە لەکاتی مەشقدا ئەفسەران لە دەستی دەگرن. وەرگێڕ.

و له حه‌فتــا ولاتـــدا ئــێمه هه‌ر له‌بــن قــامچی چه‌وســـێنه‌راندا ده‌نــاڵێنین. بارۆن(خانه‌دان)ه‌ پۆلۆنییه‌کان مسکێنه جووه‌کانیان قامچیکوت ده‌کرد، بارۆنه ئاڵمانه‌کانیش هه‌مان شتیان ده‌رباره‌ی ئه‌و جووانه ده‌کرد که له‌نێو بازنه‌ی پارێزه‌رایه‌تیه‌که‌یانـدا بـوون. ئـاخر لێـره‌ش له ولاّتـی خۆمانـدا چه‌وسـێنه‌ر قامچیکوتمــان بکــا؟ یــاخیبووانی نه‌ســله‌که‌مان، که ئامــاده‌ن ژیــانی خۆیــان له‌پێناوی ئازادیدا به‌خت بکه‌ن، ئایا ڕێگه به‌و شه‌رمه‌زارییه نوێیه ده‌ده‌ن؟
ئایا مه‌به‌ست له‌و جۆره سزا هۆڤیانه چیبوو؟ ئایا ڕژێم ده‌یه‌ویست وا نیشان بـدا، ئـێمه خه‌ڵکێکـی به‌رایـین؛ ئیـدی بـیه‌وێ ئه‌و جـووه سه‌راسـیمه‌یه به شێوازێکی ئه‌رسه‌دۆکسیانه ته‌مبێ بکا تا باشتر له ڕاژه‌ی ئاغاکاندا بێ؟ زه‌قو زۆپ لێره شته‌که هه‌موو خێزانی یاخیبووانی ده‌گرته‌وه. شته‌که په‌یوه‌ست بـوو به هه‌مـوو گه‌ل، ئه‌وه‌ش هه‌ر په‌یوه‌نـدی به هێـز و ده‌ســه‌لاتی ماندات له فه‌له‌ستینه‌وه نه‌بوو، به‌ڵکو په‌یوه‌ندی به هه‌موو گه‌لانی جیهانه‌وه هه‌بوو. ئه‌و سـی و شــه‌ش قه‌مچیـانه، نه‌ده‌بـووا هه‌ر جووه‌کـان هه‌سـتی پێـبکه‌ن، به‌ڵکـو هه‌موو گه‌له چه‌وه‌ساوه‌کانی بن ده‌سه‌ڵاتی بێگانه هه‌ستی پێبکه‌ن. لێره قانونی دارکاری ده‌بێ بگاته دوا دارِسانی خۆی.
به‌خۆیشـم تـاڵترین بیـره‌وه‌ریم له‌گه‌ڵ دارکاریکردنـدا هه‌یه. له 1920دا کـاتێ سووپای ڕووسـیا له پۆله‌ندا کشایه‌وه، زێده‌که‌م، بریسـک له لایه‌ن هێزه‌کانی پۆلـۆنی به فه‌رمانـــده‌یی ژه‌نه‌ڕاڵ بـارۆنی فیــززل و دژه ســـامی، داگیرکــرا. ژه‌نه‌ڕاڵه‌که فه‌رمانی به‌گرتنی ژماره‌یه‌ک جووله‌که‌ی ڕێزلێگیراوی نـاوچه‌که‌ی ده‌رکرد. پاشـان بڕیاریـدا هه‌ریه‌که‌یـان به بیسـت و پێنج قـامچی به‌ت ۆمه‌تـی ئه‌وه‌ی گـوایه لایه‌نگـری به‌لشــه‌فیکه‌کان بـوونه، دارکـاری بکـرێ. جووه‌کـانی دیکه‌شیان وه‌ک مێگه‌ل بردنه پارکه سـه‌ره‌کییه‌که، بۆ ئه‌وه‌ی ناچار بکرێن له دیمه‌نێکی ناوازه‌دا سه‌یری هـاودین و زمانه‌کانیـان بکه‌ن، که چۆن قـامچیکوت ده‌کرێن. یه‌کێـک له قوربانیه‌کـانی قـامچیکوته‌که، هه‌ر چه‌نـد هه‌فته‌یه‌ک دواتـر گیانی له ده‌ست دا، ئه‌وی من گه‌واهی بووم، کابرا زیاتر له‌به‌ر شه‌رم و شکۆ، له حه‌یفی سووکایه‌تیه‌که سـه‌ری نایه‌وه نه‌وه‌ک له‌به‌ر ئازاری جه‌سـته. منیش ئه‌و کات حه‌فت ساڵان بووم، به‌لاّم سامناکی دیمه‌نه‌کانی ئه‌و کات هه‌رگیز له یاده‌وه‌ریمدا نه‌سڕانه‌وه.

کـاتێکیش حـوکمی لێـدانی هەژدە قـامچی بـۆ هەریەک لە دوو لاوەکانمـان ڕاگەیەندرا، من داوای کورتە کۆبونەوەیەکی فەرماندەیی بالاّم کرد. ئەوەم بۆ دەرکەوت کە ڕاوێژکارییەکەم شتێکی زێدە بوو. ئاخر هەر هەمووان هەمان بیرۆکەمان لە مێشکدا بوو. ئەگەر لەشکری بەریتانی کوڕەکانمان قامچیکوت بکا، ئێمەش دەبێ بە دارکاریی وەلامی سەربازە بەریتانییەکان بدەینەوە. ئێمە لەسەر ئەوە گفتوگۆمان کرد ئاخۆ ئاگادارینامە دەر بکەین یان نا. هەندێک پێیان وابوو دەبێ ئێمە سەرەتا هەندێ لە ئەفسەرە سەربازییەکان قامچیکوت بکەینەوە ئەوسا ڕوونکردنەوە بدەین، بەلاّم لە دواییدا ئەوانیش هاتنە قەناعەت، کە دەبێ سەرەتا هۆشداریان بدەینێ: ئەگەر دەسەلاّتدارانی بەریتانی حوکمی قامچیلێدانەکە لەسەر دوو گەنجە جووەکان جێبەجێ بکەن، ئەوا هەر ئەفسەرێکی بەریتانی لە ئێرتز ئیسرائیلدا دەکرێ ڕووبەڕووی هەمان سزا ببێتەوە. بۆ ئەوەی دەسەلاّتدارە بەریتانییەکان و هەمووان لە هۆشدارینامەکەمان ئاگادار بن، هەر وەک چۆن بە عیبری ئاوا بە زمانی ئینگلیزیش بلاّونامەکەمان پەخش کرد. ئاگادارینامەکەش ڕوون و شکۆمەندانە بوو. شمۆئیل کاتز کە بەرپرسی "هۆبەی کاروباری ئینگلیزەکان"ی ڕێکخراوەکەمان بوو، ئەو کات لە ولاّت نەبوو. بۆیە بە خۆم هۆشدارینامەکەم نووسی. بە شێوەیەکی سەرەکی ئینگلیزییم بەهۆی B.B.Cییەوە باش ببوو. هەرچەندە ڕادیۆی B.B.C لە ماوەی ساڵەکانی ژێرزەمینیماندا، زانیاری زۆری ناڕاستی دەربارەی ئۆپەراسیۆنەکانی خۆمان پێدابووم، لێ وێڕای ئەوەش زانیاری ڕاست و دروستی سەبارەت بە زمانی ئینگلیزییەوە پێبەخشیم.

سەرەڕای کەموکورتی ڕەوانی زمان، ناواخنی ئاگادارینامەکەمان بێ گرێوگۆڵ بوو. هەر چۆنێک بێ خۆ فەلاقەکردن، بابەتێکی ڕەوانبێژیانە نییە، ئیدی لە بابەتی ئاگادارینامەیەکی وادا، زمانڕەوانی شتێکی گونجاو نییە. ئەوەی پێویست بوو بگوترێ -"ئەگەر تۆ ئێمە فەلاقە بکەی ئێمەش وات لێدەکەینەوە"- وامان گوت. مەبەستی تایبەتیشمان ئەفسەرەکانیان بوون. فەرمان بۆ فەرماندەیە خۆجێیەکانمان دەرچوو، حەقیان بەسەر سەربازی ئاساییدا نەبێ، بەلاّم ئەوانەی پلەی بالاّیی لایەقیان هەیە، بگیرێن و فەلاقە بکرێن. ئەو جیاکردنەوەیەش ڕوونکردنەوەی کەمێ گەرەک بوو.

پەیوەندییەکانی نێوان ئەفسەران و سەربازەکانیان دۆستایەتییەکی قووڵ نەبوو. ئیدی لێهەڵاوێردکردنەکەی ئێمە سەدایەکی دەروونییانەی هەبوو. سیاسەتەکەمان پلەیەکی باشی لە سۆزداری لەنێو پلەبەندی نێو سووپا گەورەکەی داگیرکەری بەریتانیا بۆ خۆی پەیداکرد. بەڕێکەوت سەربازێکی بەریتانی بە خەتێکی درشت لەسەر یەکێ لە پۆستەرە هۆشدارینامەکانمان نووسیبووی: "تکایە باشچاوەشەکەی sergeant-major منیش فەرامۆش نەکەن."

بە پێچەوانەی سەربازەکەی سەر بە هەنگە لەشکرییەکەی بە ئاسمان گوێزەرەوە، بە خەتی خۆی گەفی کردبوو کە "شەست ملیۆن جوو بکوژێ" ئەو سەربازە سادەیە بە هەموو عەقڵی خۆیەوە ناوی خۆی و یەکەکە و ژمارەی قۆشەنەکەشی یاداشت کردبوو.

ئەوسا پلەبەندییەکانی ریزی سووپای بەریتانی هەر بیرۆکەیەکیان بەرامبەر فەلاقەکردنی ئەفسەرەکانیان بە دەستی ئیرگونەوە هەبووبێ، ڕوون و ئاشکرا بوو پلە باڵاکانی نێو سووپاکەیان باوەڕیان نەدەکرد ئێمە زات بکەین فەلاقە بە فەلاقە تۆڵە بستێنینەوە. لەوانەیە هەر لەبەر ئەوەش بووبێ، لە کۆتایی مانگی دیسێمبەری 1946دا، ئەوان کیمخی لاویان لە زیندانەکەی ئۆرشەلیم دەرهێنا و فەرماننامەکەیان خوێندەوە بەوەی فەلاقەکردن لە ئێرتز ئیسرائیلدا پەیڕەو دەکرێ. ئیدی هەر لەوێ بەگوێرەی قانون هەژدە قامچیان لە گەنجە گیراوەکە دا.

لەبەر ڕۆژی شابات، هەواڵەکە تەنها بیست و چوار سەعات دواتر بە ئێمە گەیشتەوە. ئەو شەوەی شەممە کوڕ و کچانمان لە هێزی بانگەشەی شۆڕشگێرانەدا دوا ژمارەی بڵاوںامەی (هیروت)یان لە دار و دیوارەکان دا، تیایدا دووەمین ئاگادارینامەکەی ئێمە سەبارەت بە پرسی فەلاقەکردنەکە تێدابوو.

"ئەوە چوار سەد ساڵە" ئێمە وامان نووسیبوو، "ئێوە بەبێ ئەوەی تۆڵەتان لێبکرێتەوە، خەڵکی خۆجێی وڵاتە داگیرکراوەکان فەلاقە دەکەن. بەگوێرەی شانازییە گەمژەییەکەتان، پێتان وایە جووەکانی ئێرتز ئیسرائیلیش خەڵکی

سەرەتایی و خۆجێی ئەو کۆلۆنیانەن. ئێوە شاشن. زایۆن[83] تاراوگە نییە. جووەکان زۆلو[84] نین. ئێوە نابێ جووەکان لە نیشتمانەکەی خۆیاندا فەلاقە بکەن. ئەوسا ئەگەر دەسەڵاتدارە بەریتانییەکان ئەوانیان فەلاقە کرد، لە تووڵەدا و لەبەرچاوی خەڵکدا ئەفسەرە بەریتانییەکانیش فەلاقە دەکرێنەوە."

بۆ بەیانییەکەی خەڵک دوو بابەتیان لە رۆژنامەکاندا خوێندەوە. یەکێکیان لە رۆژنامە قانونی و فەرمییەکاندا، کە هەواڵی فەلاقەکردنی کیمخی لاوی تێدابوو، بەوەی هەژدە قەمچی قورسیان لێداون. هەواڵی دووهەمیش ئەو ئاگادارینامە بەشکۆیەی تووڵەکردنەوەبوو، کە لە بڵاونامەکانی ژێرزەمینییەوە دەرچووبوو. بەدەیان هەزار کەس شتەکەیان خوێندبووەوە، مەراقیش مانەوە ئاخۆ ئێمە بەڵێنەکەمان دەبەینە سەر یان نا.

شتەکەش وابوو. سەرباری ئەوەی ئێمە بەوەی ڕوویدا زۆر دەهری بووین، ئیدی هیچ دەرەتانێکمان بۆ هەستەکانمان نەهێشتەوە و فەرمانەکان بۆ هەموو فەرماندە خۆجێیەکان دەرچوو بەوەی: ئەفسەرە بەریتانییەکان بگرن و بۆشیان بسەلمێنن ئەگەر "پەروەردەی دارکاریی" بۆ سەربازە جووەکان شتێکی باش بێ، ئەوا هەر هەمان شتیش بۆ ئەفسەرە بەریتانییەکان باشتر دەبێ.

لە ناتانیا، تەلئەبیب و ریشۆن لێ زایۆندا چەند ئەفسەرێکی بەریتانی گیران، و هەریەکەیان کتومت بەقەد کیمخەکەی ئێمە: بەگوێرەی قانونی تووڵەکردنەوە هەریەکەیان هەژدە قامچیان لێدرا.

هێشتاش دەسەڵاتی ماندات هەڕەشەی دارکاریکردنی دووهەمین گەنجەکەی ئێمە، کاتزیان دەکرد. ئێمە دەستبەجێ بڵاونامەیەکمان سەبارەت بەوەی ڕوویدا بوو، بڵاوکردەوە و گوتبووشمان، هەر هەمان شت ڕوودەداتەوە ئەگەر ئەوان لەسەر دارکارییەکەی خۆیان بەردەوام بن. ئەمەی خوارەوە ئەو شتەبوو کە نووسیبوومان:

"وێڕای ئاگادارکردنەوەکەمان، ژەنەڕاڵ بارکەر حوکمی دارکاریکردنی دادگا ناقانونیەکەی بەریتانی لەسەر سەربازە جووەکە سەلماند. لە ڕۆژی هەینی

[83] زایۆن یان چیای زایۆن لە نزیک ئورشەلیمە، هەندێک جار هێماشە بۆ ئورشەلیم. لەو دەربڕینەدا نووسەر ئاماژە بە خاکی ئیسرائیل دەکا. وەرگێڕ.

[84] مەبەست رەگەزی زۆلو کە لە خوارووی ئەفریقیا بەسەر چەند وڵاتێک دابەش بوونە. وەرگێڕ.

27ی دیسێمبەری 1946دا ئەو سەربازە لاوە لە گرتووخانەی مەڵبەندی ئۆرشەلیم قامچیکوت کرا.
"بەگوێرەی ئەو هۆشداریەی دابوومان و لە تۆڵەی ئەو کارە دڕنانەیەی چەوسێنەردا، لە یەکشەممەی 29ی دیسێمبەریدا و لە ناتانیا، تەلئەبیب و ریشیۆن زایۆندا ئەفسەرانی بەریتانیش قامچی کوت کران. یەکیان ڕائید و سێیەکەی دیکەشیان جێگر ئەفسەر بوون، هەر یەکەشیان هەژدە داری لێدرا، ژمارەی قامچییەکانیش ڕێک بەقەد ئەوانەبوون، کە لە سەربازە گیراوە جووەکە درابوو.
"هەنووکەش ئاگادارتان دەکەینەوە:
"ئەگەر لە ئایندەدا چەوسێنەران بوێرن تەرم و جەستەی بنیادەم و ناموسی نەتەوەیی لاوانی جوو بشێوێنن، ئێمەش بە قامچی وەڵام دەدەینەوە. ***ئێمە بە ئاگریش وەڵام دەدەینەوە.***"
کاتز قامچیکوت نەکرا. دەسەڵاتداران کە بڕوایان وابوو بە دارکاریکردن پەندمان پێدادەدەن، خۆیان پەندە بەسوودەکە فێربوون.
چما ئەو بەڕێوەبەرانەی کۆلۆنیال لە ڕۆژی هەینیدا ئەوەندە بەئاوەز نەبوون، تا خۆیان لە هەموو گۆبەندەکە بە دوور بگرن؟ شتەکە خۆی بۆ لەڕێ لادانی ژەنەڕاڵ بارکەریش سووکایەتی بوو. ئەو قامچیەی دەستی کە بێویژدانانە بڕیاری لەسەردا بوو، لە دەستی خۆیدا شکا.
دوای تۆڵەکردنەوەکەمان، هەوڵیاندا هانی کاتز بدەن بەڵکو بڵێ زۆر لەڕ و لاواز بووە و بەرگەی هەژدە قامچیەکانی نەدەگرت، هەر بۆیە دارکارییان نەکردووە. کەچی ئەوی بە بێزراویەوە وەڵامی دانەوە:
"زۆر لاواز؟ ئێوە زۆر هەڵەن. من ساغ و سەلامەتم. من ئامادەم تەنانەت سی و شەش قامچیشم لێبدرێ."
بەم جۆرە پاکانەی باری تەندروستی دادی نەدان. ئیدی دەسەڵاتی ماندات هیچ بژاردەی بۆ نەمابۆوە لەوەی ڕاشکاوانە دان بە شکستی سیاسەتی دارکاریکردندا نەنێ. لە بۆنەنامەیەکی تایبەتدا کۆمسیاری باڵای بەریتانی حوکمی لە دارکاریکردنی هەڵوەشاندەوە. ئەو گەنجە شازدە ساڵانەی عەرەبیش، کە حوکمی داراکاریکردنەکەی بۆ دەرچووبوو، ئەویش بەر

"لێبوردنەکە" کەوت. هەروەک چۆن ڕێزی نامووسی خۆمان گرت هەروا هی خەڵکی دیکەشمان گرت، بۆیە بۆ گەنجەکەش خۆشحاڵ بووین.
ئیدی ببڕای ببڕ بەریتانییەکان قامچییان لە ئێرتز ئیسرائیلدا بەکار نەهێنایەوە. دەسەڵاتی ماندات قانونەکەی خۆی هەموارکردەوە بەوەی دارکاریکردن هەڵبگیرێ، بەڵام لەوەش گرنگتر هەمووارکردنەوەی ڕەفتارەکەیان بوو. لێکۆڵەرەوەی سەربازی، میجەر باکستەر، لە دادگاییکردنی گەنجێکی دیکەماندا، ئەو وشە ئاوەزیانەی خوارەوەی دەربڕیبوون:
"تۆ هێشتا بۆ لەسێدارەدان زۆر گەنجی و بۆ دارکاریش زۆر پیری."
سەدای قامچی و فەلاقەکان لە دنیاشدا دەنگی دایەوە. شکۆی بەریتانیی تووشی زەبرێکی کوشندە بووەوە. لە پەیامی ماڵئاوایی بۆ هێزەکانی بەریتانی، ژەنەڕاڵ بارکەر نووسیبووی: "ئەفسەرەکانمان لە فەلەستیندا ڕفێندران، کوژران و تەنانەت قامچیکوتیش کران." یەکێکی وەک وینستن چەرچڵیش هەمیشە لە قووڵایی دڵەوە خەمی لە شکۆی بەریتانیا دەخوارد، حکوومەتەکەی خۆی بەوە تۆمەتبار کرد، کە نازانن چۆن "وەک پیاوان ڕەفتار بنوێنن".
"ئێوە جووە تیرۆرستەکان دارکاری دەکەن" ئەو وای هاوار کرد "ئەوانیش ڕائیدێکی بەریتانی و سێ نائیب زابت دەگرن و هەر ڕۆژی پاشتر دارکاریان دەکەنەوە. ئینجا ئێوە سزای دارکاریتان لەسەر تیرۆرستێکی دیکەدا هەڵوەشاندەوە. چما ئێوە دەزانن ئەمە چی دەگەیەنێ؟"
هەرچۆنێ بێ، حکوومەتی بەریتانی واتای شتەکەی زانیبێ یان نا، ئەوە ڕوون و ئاشکرا بوو، کە باقی دنیا لە واتاکەی گەیشت. ئێمە لە ئایرشییەکان، ئەمریکییەکان، کەنەدییەکان، ڕووسییەکان و فەڕەنسییەکان پیرۆزباییمان لێکرا. برا جووەکانیشمان لە کونج و کەلەبەرەکانی دنیادا، شتیان قیتکردەوە. دوای چەند نەسلێک لە سووکایەتی پێکردن بەهۆی دارکاریکردنەوە، هەرخۆیان گەواهیدەربوون لەسەر قۆناغێک کە شکۆ و ڕێزی خۆیان بۆ گەڕابووەوە. ڕەشەکانی ئەفریقا و کرێکارە ناکارامەکانی چین، کە لە دێرزەمان بە قامچی ئاشنا بوون، ئەوانیش لەخۆشیان سەریان بەرزکردەوە. بە ملیۆنان لە خەڵکی ڕووسیا، کە قامچی هێمای ستەمکاریی بوو بە دوو وشەی کورت و پوختی "ئیشێکی باش" سەدای دەنگانەوەیان دەربڕیبوو.

ڕۆژنامەیەکی فەرەنسیش کاریکارتۆنێکی بڵاوکردبووەوە، تییایدا وێنەی سەربازێکی بەریتانی کردبوو، کە خودەکەی(کڵاوە سەربازییە ڕەق و توندەکەی) لەپشت خۆی گرتبوو، لەژێر وێنەکەش ڕوون کرابووەوە، لەو کاتەی ئیرگون قامچی لە سەربازی بەریتانی داوەتەوە، دەسەڵاتداران بڕیاریان داوە ئەو ناوچەیەی هەڕەشەی لەسەرە بە خودەکە قەڵغان بکەن و بیپارێزن، ئیدی لەجیاتی کڵاوە ڕەقەکە بخەنە سەریان ئاوا لەسەر پاشەڵیان دابنێن و لە دەرهاوێشتەشدا سڵاولێکردنەوەش بەهەمان شێوە بگوازرێتەوە. پیاوە فەڕەنسیەکە لەبەر پێکەنین خەنی ببوو. ئەو گاڵتەپێکردنەش دەکرێ زۆر لە بۆمبەی تەقێندراوەکە وێرانکەرتر بێ.
لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە هۆکارێکی شادمانیمان لەو قۆناغەدا نەبینی. ئەوەش بۆ ئێمە مایەی خۆشحاڵی نەبوو کە ئەفسەری بەریتانی بدەینە بەر قەمچییان. بەڵام ئێمە دەبێ دان بەو هەستە دیار و خۆشیە بنێن، کاتێک هەزاران ئەفسەر و پیاوی بەخۆشاناز لەنێو سووپایەکی زلهێزی وەک بەریتانی لە شەوی یەکشەممەی 2ی دیسێمبەردا لە هەموو قاوەخانەکانی ئێرتز ئیسرائیلدا هەڵاتن و شوێن پێی فەرمانی ژەنەڕاڵ بارکەر کەوتن، بەوەی لەشارە جوونشینەکاندا بچنەدەر و لە مۆڵگەی سەربازییدا چاودێر بن. بۆ ئەوەی چاودێر بن؟ ئاخر نەدەکرا بەو فەرمانە خۆشحاڵ نەبین. هێشتاش پرسەکە هی پێکەنین نەبوو. ئێمە نەماندەویست سووکایەتی بە ئەفسەرە گیراوەکان بکەین. ئێمە حەزمان لێ نەبوو سەربازە بەریتانییەکان دارکاری بکەین، لە ڕاستیدا هەرنەمان دەویست لەگەڵیشیان بجەنگین. ئەوەی ئێمە کردمان بەسەرمان سەپێندرابوو. ئاخر ئێمە دەسەڵاتدارنمان ئاگادارکردبوونەوە، هۆشدارینامەکەشمان دووبارە کردبووەوە. دەکرا سەرتاپای گۆبەندە ناخۆشەکە دوور بخرێتەوە. دارکاریکردنەکە بیرۆکەی بەریتانییەکان بوو؛ هی ئێمە نەبوو. ئاخر لەنێو چەکدارەکانماندا دارکاریکردن نەبوو.
یەکێ لە ئەفسەرە دارکاریکراوەکان لە پیاوەکانی ئێمەی پرسیبوو:
"باشە ئێوە بۆ وا لە من دەکەن؟"
سەربازەکانی ئیرگونیش ئەوەی بە کیمخ کرابوو، بۆیان باسکردبوو. دیاربوو بەوەی گوێی لێبوو دڵتەنگ ببوو، پاشان بێدەنگ ببوو. لە دواییدا داوای

گەواهینامەیەکی کردبوو، تیادا ناوی ئیرگون زڤای لیمی تێدا سەلمێندرابێ، کە ئەوان دارکارییان کردووە.

"ئایا تۆ ئەم شتەت بۆ چییە؟"

"پێویستم پێیەتی. خۆ ئەگەر دەبەنگەکانی حکوومەتەکەم خەڵکی ئێوە دارکاری بکەن و ئێوەش وا لە ئێمە بکەنەوە، من دەمەوێ ئەوە ڕوون و ئاشکرا بێ."

بەڵام خۆ ئەو پێویستی بەو گەواهینامەش نەبوو. ئاخر حکوومەتی بەریتانی هەرگیز کەسێکی دیکەی لە ئێرتز ئیسرائیلدا دارکاری نەکردەوە، نە جوو نە عەرەب.

لێ گەلۆ، چارەنووس بۆ ئەو خزمەتەی ئێمە، کە بۆ ڕێزی بنیادەم کردبووی، دەبوایە لە ئاکامدا باجی قورس بدا...

## بەندی 17
## بەڵای سێدارە
## ٣٦٠ - ٣٨٠

سارفەند مەکۆی سەرەکی لەشکری بەریتانی لە بەهاری 1946دا وەک پوورەی هەنگ کارابوو. هەر سەربازبوو بۆی دەهات و و لێوەشی دەردەچوو. دەزگای کارخانەی سەربازی گۆرانی رەنجدانی خۆی دەگوتەوە، تایپیستەکان لە نووسینگەکانیاندا هەر چکەی پیتچنی نامە، فەرمان، پەیام و راپۆرتەکانی بەردەستیان دەهات. جبەخانەیەکی قەبەی چەک گەیشتبوو و لە خەمی شەڕێکدا بوون. عەریفەکانیشیان هەر هاواریان بەسەر دەستە راهێندراوەکەی بەردەستیان دەکرد. ئیدی سارفەند ئەو بنکە گەورەیەی سووپای بەریتانی نەوەک هەر بۆ ئێرتز ئیسرائیل، بەڵکو بۆ هەموو ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کانگای چالاکی سەربازییانە بوو.

سیستمێکی وردکاری پاسەوانییش لە سەربازگە کەتە و زلەکەدا هەبوو. دووقات بەڵکو بە سێ قات شووره و تەیمانی دەوروبەری ئۆردوگا سەربازیەکە تەلبەند کرابوو. چوونە ژوورەوەیشی تەنها لە ڕێی دەرگاکانییەوە بوو، هەر کەسێکیش لێیچووبایە ژوور، دەخرایە ژێر ڕێوشێنێکی توندوتۆڵی پشکنین. هیچ پێواژۆیەکی ئاسایشپارێزانە بەقەد ئەوێ توند و مەحکەم نەبوو. "تیرۆرستەکان" -وەک فەرمانی سووپای نهێنی دەریکردبوو- "فێڵبازو چاوقایمن. ئەوان بە ڕۆژی ڕووناک پەلاماری چەندان مۆڵگەیان دابوو بە دەستکەوتی بڕێکی باشیش لە چەک و تەقەمەنی گەڕابوونەوە. بۆیە نابێ هیچ شتێک بۆ بەخت و شانس جێبهێڵدرێ." ئیدی پێنەدەچوو ئیرگونەکانیش زاتی ئەوە بکەن بەسەر سەربازگەی سارفەندا دابدەن، ئاخر ئەوێ سەربازگەی سەربازگەکان بوو، یەکەکانی شەش هۆبەی بەهەوا گوێزەرەوە و هۆبەی ناوداری هوساریس لێی جێگیر ببوون، کە بە هەزاران لە هێزی چەکدار و ژمارەیەکی زۆری چاوی چاودێری تاوەرەکانیش بێوچان ئێشکچی ئۆردوگا سەربازیەکە بوون. ئیدی شوورەکە، تەلبەند، جبەخانە و چەکەکان... بۆیە ئەو هەموو چاوانە بە بێ هودە لەوێ نەبوون.

لە ڕۆژێکی بەهاری 1946دا لە دەرگای سەرەکی سەربازگەکە یەکەیەکی لەشکری بەریتانی کە لە سەربازە جووەکان پێکهاتبوو، گەیشت. ئەوان هاتبوون فەرمانی تەسریحبوونیان وەربگرنەوە. کاخەز و بەڵگەکانیان بێ خەوش بوون. هاتن و ئامادەبوونیشیان لەوێ شتێکی زۆر ساغلەم و ئاسایی بوو: ئاخر تەسریحکردن لە سووپا لەوپەڕی هەڕمێندا بوو. ئاوا جووە ئەندامەکانی سووپای بەریتانی هاتبوون و بڕوانامەی تەسریحبوونیان وەربگرنەوە. بۆیە هاتنی ئەو یەکەیە هیچ جێی گومان نەبوو.

هەرچەندە ئەو سەربازانە نە ڕۆیشتنە نووسینگەکانی سەربازگەکە، ئەوان ڕێکوپەوان بەرەو لای جبەخانە پڕ چەکەکە ڕۆیشتن. ئەوان خەمی بەڵگەنامەکانیان نەبوو، هەر بۆ ئەوەش نەهاتبوون، بەڵکو بۆ ئەوە هاتبوون چەک لەگەڵ خۆیان ببەنەوە. لێ بەخت یاوەری ئەو جەنگاوەرە ژێرزەمینییانە نەبوو. کۆگای چەکوچۆڵەکە بە ماوەیەکی کەم بەر لەهاتنی ئەوان بەتاڵ کرابوو. ئیدی ئەوان بە دەستی بەتاڵ گەڕابوونەوە. شتێکی سەیریش بوو، کەس ناسنامەی ڕاستەقینەی ئەوانی بۆ دەرنەکەوتبوو، تا دوا ڕۆژی مانداتی بەریتانییەکانیش لە ئێرتز ئیسرائیلدا، دەسەڵاتدارانی سەربازی هەرگیز ئەو کەسە تایبەتیانەی ئیرگونی بۆ دەرنەکەوت کە لەنێو دڵی سەربازگە بەناوبانگەکەی ئەواندا بوون.

هەندێک دواتر، لە ڕۆژێکی دیکەی بەهاری هەمانساڵی 1946دا، ئەو ڕۆژەی کۆمیتەی بەدواداچوونی ئەنگلۆ-ئەمریکی گەیشتە سەر خاکی ئێرتز ئیسرائیل، دیسان ئۆردوگای سەربازی سارفەند مێوانی بۆ هاتنەوە. دیسان پیاوەکانی ئێمە بە دەمامکدراوی وەک یەکەیەکی بەریتانی گەیشتنە دەروازەی سەربازگەکە، ئەمجارەیان وەک جارەکەی دیکە نەبوو، سەربازە جووەکان بۆ وەرگرتنەوەی بڕوانامەی دەرچوون لە سووپا (تەسریحبوون) نەچووبوون. ئەوان وەک سەربازی چەکداری بەریتانیا خۆیان نیشاندا، کڵێتەی سووری لقی شەشەمی سووپای بەهەوا گوێزەرەوەیان لەسەر نابوو، ئەو سووپایەی منداڵە جووەکان ناوی کالۆنیۆت-گوڵاڵە سوورە-یان لێنابوو، ئیدی هەر بەوە ناوەشەرە لە کۆمەڵگە جووەکاندا ناسرابوون. ئەو ترومبێلە باربەری سەربازەکانی هەڵگرتبوو هی سووپای بەریتانی بوو، لە دوا ساتدا لە سەر ڕێی خێرا لە لایەن پیاوەکانمان دەستی بەسەردا گیرابوو. لێخوڕەکە و

سەرنشینانی زیلەکە دیل کرابوون و دەستیش بەسەر بەڵگەنامەکانیدا گیراو واشیان بەکارهێنان تا بەبێ خەمی بتوانن پێی بچنە نێو سەربازگەی سارفەند. کاتێ زیلەکە گەیشتە دەروازەی سەربازگەکە، هیچ جیاواز نەبوو لەگەڵ ئەوانەی خۆیان، بۆیە هیچ گومانی لێنەکرا. هیچ شاشیەک لە ئارادا نەبوو، ئەوانیش هیچ هەڵەیەکیان نەکرد. زیلەکە ڕێگای خۆی بڕی. هەندێک لە سەربازەکان دابەزین و لەوێ لە دەرگاکە مانەوە، چاوەڕێی هاوڕێکانیان دەکرد. ئەوان لەگەڵ پاسەوانەکانی دەرگا کەوتنە قسەکردن. دیاربوو ئەوەش دژی ڕێساکە بوو، بەڵام ئاخۆ چی لەوە سروشتیانەتر بێ، قسەوباسێکی دۆستانە لەنێو سەربازە هەراسانەکاندا بکرێ؟ لەوکاتەش زیلەکە بەردەوام بوو لەسەر ڕۆیشتنەکە تا گەیشتە بەردەم یەکێ لەو جبەخانانەی سندوقی چەک و فیشەک لەسەر یەک کەڵەکە کرابوون. دیاربوو شتێکی ئەوەندە بێمانا و نالەبار بوو، کە هێزەکانی بەریتانی ئەو هەموو چەکوچۆڵەیان هەبێ، لە کاتێکدا لەشکرە بچوکەکەی یاخیبووانیش بە حەسرەتەوە بۆ پارچە چەکێک بناڵێنن. ئاخر دادپەروەری داوای دابەشکردنەوەیەکی باشتری دەکرد!

کردەی بەردەم جبەخانەکە کورت و پوخت بوو. بە خێرایی توانیان بەسەر پاسەوانەکاندا زاڵ بن. پۆلێک لە ئەفسەرە بەریتانیەکان گەیشتبوونە بەردەمیان و بەڵام بە ڕێزەوە داوایان لێکردبوون تا ژووری پاسەوانەکان لەگەڵیاندا بڕۆن. یۆشوا فەرماندەی کوڕەکانمان بوو، چاوی بەسەر ئەوانەوە بوو، ئیدی ئەوانیش هەر لەجێی خۆیان مانەوە.

بەم جۆرە بارکردنی چەکەکان لەجبەخانەی ئەوانەوە بۆ سەر لۆریەکەی ئێمە دەستی پێکرد. سندووق لە دوای سندووق لە کۆگاکە دەردەهێندراو لە لۆریەک بار دەکرایەوە. پیاوەکانمان بەجۆشەوە کاریان دەکرد. کاتێکیش لە ئەرکەکەیاندا ماندوبوون، هەندێ سەرباز بە بەردەمیاندا بۆ خواردنی فراوین ڕۆیشتن. هەر چرکەیەک هی ئەوە بوو بەدگومانی سەرهەڵبدا. لەنێو پیاوەکانماندا یەکێ هەبوو، کەتا دواساتیش هی ئەوە نەبوو بە هیچ شێوەیەک لە سەربازێکی بەریتانی بچێ. جەنگاوەرەکە یەمەنی بوو، خۆ ئەگەر دەستەیەک کڵێتەی سووریشت خستبایە سەر، سەروسیمای هەر نەدەگۆڕا و لە بەریتانی نەدەچوو. پیاوەکان لە کاتی ئیشی بارکردنەکەدا لەنێو خۆیاندا دەدوان. یۆشوا فەرمانی پێکردبوون، بکەن، یان هەر هیچ نەبێ ناوبەناو بە

زمانی ئینگلیزی جوێنێک بدەن، هەڵبەتە گەر وا نەبووایە، هەرگیز قسەیان نەدەکرد. بەڵام هەر لەوێوە لە کاتی ڕاپەڕاندنی کارەکەیان و لە ناوجەرگەی سەرقاڵیان ، خۆیان لەبیرکرد وشەی عیبریشیان لەدەم دەرچوو.

لۆریە قورسەکە پڕ لە چەک و فیشەک کرا. هەندێکیشی مابوو، تا بەسەلامەتی بجوڵێ و بە بارە گرانبهاکە بۆی دەرچێ. تا دەهاتیش ژمارەی ئەوانەی بە بەردەم ئەوێدا ڕەتدەبوون، زیاتر دەبوو؛ لەجاران زیاتر، ئیدی هەر نائیب زابت بوون لە ژەمە خواردنی نیوەڕۆیان دەهاتنەوە. دەستەیەکی بچووک لە پیاوەکانمان لەسەر پێ بوون، چاودێری ئەوێیان دەکرد، لە دووریەکی کەمەوە دەستەیەک سەربازیان لێنزیک بوونەوە و فەرمانیان پێکردن کە لەنێو چاڵە لێدراوەکەدا لەسەر زگ درێژ بن. یەکێ لەوان، باشچاوەشێک بوو، لە پێکەنینان خەریکبوو لەخۆبچێ: "ئای لەو نوکتەیە؟" بەڵام هەر زوو بۆ ئەو باشچاوەشەیە ئیعاشەیە دەرکەوت، کە فەرمانەکە دژوارە، ئیدی خۆی و هاوڕێکانی ملکەچی فەرمانەکە بوون.

بارکردنەکە هەر بەردەوام بوو. لێ یەکێ لە کوڕەکان و بەپرتاو خۆی پێنەگیرا و حەزی لە ڕەشاشێکی ڤیکەرس بوو. یەکسەریش بازیدایە سەر تانکێک کە لەوێ لەلای جبەخانەکە ڕاگیرابوو، هەوڵی دا ڕەشاشەکەی سەری لێبکاتەوە. پەرۆشیەکەی هێمای نانەوەی گێرمەوکێشە بوو. لە کاتی بەرزکردنەوەی ڕەشاشەکەدا، سەرنجی یەکێ لە پاسەوانەکانی بورجێکی چاودێری ڕاکێشا. ئیدی تەقەی کرد و دەستبەجێ سەربازگەکە شێوا و بووە هەرا. تەقەی زیاتر کرا. هیچ کەسێ لە پاسەوانەکان نەیدەزانی کامەیان سەربازی بەریتانی و کامەیان ئەوی دیکەیە. لێ لۆریە بارکراوەکە نیشانەی ئامانجەکانیان بوو. لە هەموو سوچێکەوە سێرەی چەکی تێگیرا. کوڕەکانی ئێمەش بوونە دووبەش. یەکێکیان بەردەوامبوون لەسەر بارکردنی لۆریەکە؛ باقیەکەی دیکەش وەڵامی تەقەی پاسەوانەکانین بە تەقە دایەوە.

شمشون ئەو کەسەی دوای ساڵێک لەو بەروارە فەرماندەیی پەلامارێکی مەزنی بۆ سەر قەڵای ئاکرێ کرد، ئەو کات لەژێر فەرمانی یوشوادا بوو، دەستی دایە ڕەشاشی برێن تا تەقەی بەرەی دوژمن بێدەنگ بکاتەوە و سووریش بوو لەسەر بەردەوامبوون لەسەر باری لۆریەکە تا پڕ دەبێ. لێ یوشوا بە خۆخڕکرنەوە، تاسەمەند بوو، لە ژیانی پیاوەکانیش بەرپرسیاربوو،

پەرۆشبوو چەکەکە بەسەلامەتی دەرباز بکا. جیاوازی نێوان هەر دوو بەرەی سەربازەکان تا دەهات لە دژی ئێمە تەواو دەبوو. بۆیە فەرمانی بە پیاوەکان دا سورای لۆریەکە ببنەوە. ئەویش بەخۆی لە دوای ئەوانەوە بوو. هەندێ ماددەی تەقینەوەی بچووکی بەدەست هەڵگرتبوون. ئەو چووە نێو چادرەی کە بەریتانییەکانی بەبارمتە لەوێ دانابوون. خۆ دەکرا بە بێ نوچدان بیتەقێنێتەوە و لێیان دەرباز بێ، بەڵام خۆ ئەو بەریتانییانە خۆیان بەدەستەوە دابوو. ئیدی یۆشۆوا کە ڕەوشتی شەڕی ئیرگون فێربیوو، خۆی وادادەنا لەژیانی دیلەکانیشی بەرپرسە. ئەوسا هاواری بەسەر دیلەکاندا کرد: "دەی لێرە دەرکەون. من ئەو کۆگایە دەتەقێنمەوە."

سەربازە بەریتانییەکانیش کە بەوە حەپەسابوون بە دەستی هاوڕێکانیان دیلکراون، بەم قسەی یۆشۆوا زیاتر واقوڕماو بوون. ئیدی زانیان هەنووکە بەتەواوی کەوتوونەتە بەر ڕەحمەتی دەستی جەنگاوەرانی ئیرگون... بەڵام کاتی ئەوەشیان نەبوو تا لە هێدمەبوونەکەیان بێدار ببنەوە، کە دیسان یۆشۆوا بەسەریدا نەڕاندن: "دەی دەرکەون و لێرە بڕۆن." ئینجا سەربازەکانیش هیچ کاتیان لە دەست نەدا و ملکەچی فەرمانەکەی بوون. یۆشۆاش تەقینەوەکانی دانانەوە، فتیلەکەی ئاگردا و تا هێزی تێدابوو بە دوای لۆریەکەدا غاری دا. کاتێک بازی دایە نێو لۆریەکە، لۆریەکەش تەکانی خۆی دا. هەر چەندە دوای چەند چرکەیەک تەقینەوەکان لە پشتەوە هورمژنی هێنا، ئاخۆ جبەخانەکەی وێرانکردبێ یان نا، ئەوەش بۆ خۆی هێشتا یارمەتییەکی مەزنی دەستە کشاوەکەمان بوو، لەو کاتەی پەشۆکان و هێدمەگرتنی نێو سەربازگەکە لەزیادبووندا بوو.

لە بەردەم دەرگاکە و لە کاتێکدا ئەو بەیەکدانانەش ڕوویدابوو، هێشتا کوڕەکان هەر لەگەڵ پاسەوانەکانی بەردەم دەرگا لە قسەکردندا بوون. بەڵام هەرکە گوێیان لە تەقەکانی نێوجەرگەی سەربازگەکە بوو، فەرمانیان بەسەر پاسەوانەکاندا کرد، چەکەکانیان دابنێن و یەکسەریش بچنە ژووری پاسەوانەکان. ئیدی کوڕەکان جێگەی سەربازە پاسەوانەکانیان گرتنەوە. هەنووکە پاراستنی ژیانی هاوڕێکانیان لەئەستۆی ئەواندا بوو. خۆ ئەگەر لە دەروازەکەدا تەقە کرابا، ئەوا چارەنووسی تەواوی کوڕەکانمان مۆر دەکرا. بەریتانییەکانیش هەروایان دەبینی. ئەفسەرێکیان دەستی خۆی بۆ دەروازەکە

هەڵکێشا و هاواری کرد: "تەقە لە دەرگاکە بکەن، تەقە لە دەرگاکە بکەن!" گوڵالە سوورەکانیش (مەبەست سەربازە کلێتە سوورەکانن-وەرگێڕ) وەڵامیان دایەوە، "گەورومەم ، زۆرباشە!" بەڵام لە شوێنی خۆشیان نەبزوتن. کاتێکیش ئەفسەرەکەیان بە پرتاو گەیشتێ، ئەوان دەستبەجێ ئەویشیان چەک کرد و خستیانە ژووری پاسەوانە دیلەکان.
لۆریەکە نەبن ڕێژنەی گولەکاندا خێرا بەرە و دەرگاکە دەهاتەوە. گەیشتە دەرگاکە و لێشی تێپەڕی. 'پاسەوانەکان'یشمان خۆیان پێوەکرد. هەموویان ژمێردران. سەرجەمیان هاتبوونەوە. کەسیان لە دەستنەدابوو. کەسیشیان لێ نەکوژرابوو، بەڵام یەکدووێکیان برێندار ببوون. لۆریەکە بەوپەڕی خێراییەوە دەڕۆیشت. بەریتانییەکانیش لە غەفڵەتی هێدمەکەدا بەئاگا هاتبوونەوە. کاروانێکی زیل و زرێپۆشیان کەوتنە دوای لۆریە پڕ چەکە هەڵاتوەکە. بەڵام لە دەرەوەی سەربازگەکە سەریان لێشێوا. ئاخر لەوێدا پۆلە سەربازێکی دیکەی لقی شەشەمی هێزی بەهەوا گوێزەرەوە لەسەر ڕێگا دەڕۆیشتن. "گوڵاڵەسوورە" لەگەڵ "گوڵاڵەسوورە"، تۆ بڵێی کامەیان یار بێ و کامەشیان نەیار. لەوانەیە ئەوانە؟ پیاوەکانمان توانیبوویان لە دەست ڕاوەدونەرەکانیان دەربچن. بەڵام هێشتا ئەگەری ئەوەنەبوو چەکەکە بگەیەننە یەکێ لە جبەخانە سەلامەتەکانمان. ئاخر دەوروبەرەکە بە سەرباز تەنرابوو. یۆشیوا خێرا بڕیاری خۆی دا. فەرمانی بەسەر پیاوەکاندا کرد، دەستبەجێ باری چەک و تەقەمەنیەکان دابەزێنن و لەژێر لمدا بیشارنەوە. وای بڕیاردابوو لە نیوەی شەودا دەستەیەکی دیکە لە پیاوەکانمان بچن و خەزێنەکە لەبن لمەکەدا دەربهێنن. ئەرکەکەش بەوپەڕی خێراییەوە جێبەجێکرا. لەبن تەبەقەیەکی تەنکی لمدا سندووقەکانیان شاردنەوە. کوڕەکان بەرگی سەربازی بەریتانییان داکەند و بوونەوە ئیرگونەکانی جاران. برێندارەکەش هەر زوو پێچرا. تاکسیەک بە تالوکە هات و برێندارەکانیش گواستەوە. پێدەچوو هەموو شتێک بە سەلامەتی کۆتایی پێبێ.
کەچی واش دەرنەچوو. زۆربەی چەک و فیشەکەکان لە لایەن هاگاناوە بەر لەوەی کوڕەکانی ئێمە بۆی بگەڕێنەوە، گوێزرابوونەوە. لی گەلۆ هێشتاش ڕەنج و ماندوبوونیان بەفیڕۆ نەچووبوو. ڕاستییەکەی ڕێکخراوەکەیان لە ڕووی هیوای بە باسک ئەستووربوون نەبوو، بەڵام لە ڕووی سیاسی،

دەروونــی و ورەوە دەســتکەوتەکەیان بە بەخشــەندەیی پاداشــت کــرایەوە.
هەواڵی ئۆپەراسیۆنەکەی سارافەند لە دنیادا دەنگی دایەوە. چاودێرانی بی بی سی دانیـان بەئەوەی لە سـافارند ڕوویدا، نـا و پێیـانوابوو شتێکە لەسـەرووی هەمـوو لـێ تێگەیشـتنێکەوەیە. بی بی سی زیـاتر لەسـەری ڕۆیشـتبوو، دوای هەڵـمەتەکەی سـەر سـەربازگەکە، دەسـەڵاتداران ڕێوشـوێنی ئاسایشـیانەیان تونــدوتۆڵتر کردبــوون. کەچــی هێشــتاش "تیرۆرســـتان" لە هێـــرش و پەلامارەکانیـان نەکەوتـوون هەر جـارە و بەدەسـتکەوتی چەک و تەقەمەنـی زیاتر دەگەڕێنەوە.
چالاکییەکە خۆی لە خۆیدا شایستە بوو. خۆ لە کۆتاییدا چەک و فیشـەکەکان لە خزمەتـی خەڵکەکەمـان بەکارهێنـدران، ئەوەش دوای ئەوەی لە ئەمبـار و جبەخانەی بەریتانییەکان دەرهێندران.
بۆ کوێرەوریمـان هەر بە تەنیـا لە دەسـتدانی خەزێـنەکە مـایەی نیگەرانیمـان نەبـوو. ئەو تاکسـیەی دوو برینـدارەکانی بەنـاوی میشـێل ئاشـبێل و ڕجوسـێف سیمشـــۆن دەگواســـتنەوە لەڕێگـــادا لە لایەن دەوریەیەکـــی بەریتـــانی راوەسـتێندرا. دوای فەرمـان بەسـەرداکردنیان لە تـرومبێلەکە دابەزێنـدران، ئیـدی ئاشـکرابوو کە برینـداری هەڵگرتـووە، ئەوسـا دەسـتبەجێ هەر دوو برینـدارەکانیان لەگەڵ کچەکەی یاوەریـان دەستگیرکران. ئەو کـات بەندی ئەو ڕووداوانەی دیکە دەستپێکرد، وەک ئەوە وابوو قیامەت هەڵستابێ.
لەو سۆنگەیەوە حکوومەتی مانـدات ڕێسـایەکی نـوێی بـاری ناکـاوی دەرکـرد، بەهۆیەوە هەموو هاولاتیێک هی ئەوە بوو تووشی گرتن، سنووورداشـکردنەوە و لەسـێدارەدانیش ببێـتەوە. پسـپۆڕە قانونییەکـان قسـەیان لەسـەر ئەوە بـوو تەنانەت لە ئەڵمانیـای نازیشـدا قـانونی ڕەشـۆکیی گۆترەکاریـانەی لەو جـۆرەدا دەرنەچوبـوو. ڕادیـۆی دەنگـی ئیسـرائیلیش بەنـاوی بـزووتنەوەی بەرگـری بـانگەوازی دەرکـرد، ئەگەر ئەو جـۆرە ڕێسـا و قـانونە دەربچـێ، ئەوا وەک تـاوان لێـی دەڕوانـدرێ، ئەوسـا هەر کەسـێک جێبەجـێ بیکـا وەک تاوانبـار سەودای لەگەڵدا دەکرێ. ئێمە بەو جاڕنامە شکۆدارەی هاگانا دڵشـاد بـووین. لێ مایەی داخمان، شتەکە کارا نەبوو.
بە گـــوێرەی کارنـــامەی ئەو ڕێســـا نـــوێیەی بەریتانییەکـــان، هەر دوو بریندارەکانمان، ئاشبێل و سیمشون خرانە بەردەم دادگای سـەربازی. ئەرکی

ئەو سێ بەریتانییەی وەک دادوەر لە دادگاکەدا دەستبەکاربوون، زۆر ئاسان بوو.
لە شانۆنامەی بێرناردشۆ دەربارەی شەڕی سەربەخۆیی ئەمریکییەکان بەناوی "شاگردی ئەهریمەن"، ژەنەراڵ بورگەن لە بڕیاری مێجەر سویندۆن، ئەفسەری خۆجێی پەیوەست بە لەسێدارەدانی ئەندرسنی وەزیری یاخیبووەکان، بە رەقییەوە گووتی: "... تۆ لای ئێمە بەوە "پابەندی تاوانبارەکە لەسێدارە بدەی؛ چەند زوش بێ ئەوەندە باشتر." سویندۆنیش لەلای خۆیەوە وەڵامی دایەوە، بە کردەوە ئێمە وامان رێکخستووە و سەعات دوازدە وای لێبکەین. هیچ شتێک بەدەر لە سێدارەدانی نەماوەتەوە."
بۆ ئەفسەرە بەریتانییەکانیش کە دادگای ئاشبێل و شمشونیان دەکرد، هیچیان بەدەر لە رێخۆشکردنێکی حەتمی بۆ لە قنارەدانی دوو گیراوە برینداردەکە بۆ نەمابۆوە. ئەوان رێنوێنی هیچ قانونێکی هاوشێوەیان نەبوو. ئەوان دوو تیرۆرستیان لە بەردەم دابوون لەگەڵ بڕگەیەکی تەمومژاوی لە بڵاونامەیەک بە ناونیشانی "رێسا و قانونی باری ناکاو و بەرگری."
ئەو ئەفسەرە فەرماندەیەی کە دادوەرەکانی دەستنیشان کردبوو، هەر هەمان کەسیش بوو حوکمەکەیانی پەسەند دەکرد. پرسیارو وەڵامی دادگایەکە کورت بوون. شایەدەکان هەر دوو کەسەکەیان ناسینەوە کە بەشداری پەلاماردانی سەربازبازگەی سارفەندیان کردبوو. ئیدی دادوەرەکان تەنها بۆ چەند خولەکێکی کەم لەنێو خۆیاندا راوێژیان بە یەکدی کرد. ئەوسا کڵاوەکانیان لەسەر کردەوە و سەرۆکەکەیان حوکمی بڕیارەکەی بە وشەگەلی دابونەریتیەکەی جارانیان خوێندەوە: "دەبێ لە ملەوە بە قنارەوە بکرێن تا دەمردن."
لە فەرماندەیی ئیرگوندا بە دوورودرێژی و بە جدییەوە پرسی ئاشبێل و سیمشونمان تاوتوێ کرد. ئێمە وامان خەمڵاند، حکوومەتی ماندات دەکرێ قانوننامە نوێیەکەی جێبەجێ بکا و هەر دوو کەسەکانمان لەسێدارە بدا، مەبەستەکەش دڵنیاکردنەوەیە بۆ ئەوەی پێیدەگوترێ "یوشیفی رێکخراو" تا لە دەورەی "تیرۆرستەکان" خڕنەبنەوە ، کە ئەوان چیدیکە سەر بە هاگاناوە نین. هەرچەندە ئیرگون پیاوەکانی خۆی فێرکردبوون، لە نێو ڕیزبەندییەکانی خۆیدا، لە کاتی لێقەوماندا ئامادەی هەموو جۆرە قوربانیدانێک بن، ئێمە هیچ

گومانێکیشـمان لە ئامـادەیی ئەو کەسـانەمان بـۆ گیانفیـدایی نەبـوو. بەڵام هەر لەبەر ئەم هۆکارەشەوە، ئەرکی سەرکردایەتی ئیرگون بوو، هەموو ڕێکارێک بۆ ڕزگارکردنی ژیانی ئەو پیاوانە بگرێتەبەر.
لە میانی ڕاوێژەکانمـان گەیشـتینە ئەو ئاکامە، کە بەرگری ڕۆتینیـانە- گرتنی پارێزەرێک و هێنانەوەی بەڵگەوبەندی قانونـانە- بـایی تۆزقـاڵێکیش لە حـوکمی مەرگەکەیان سـووک ناکـاتەوە. بەڵام بڕیارەکەمـان بەلای هێرشـی سیاسـیانەدا لە نێـو ژووری دادگـاکەدا بە باشـی شـکایەوە کە نامەیەکمـان لە سیمشـونەوە پێگەیشت. نامەکە داوایەکی تێدابوو بوو نەدەکرا حاشـایی لێبکەین نە ڕەتیشـی بکەینەوە. لە نامەکەیدا سیمشن نووسیبووی:
"... بڕیارمـــداوە وەک جەنگـــاوەرێکی کـــارای عیبـــری کە لە ئیرگـــونەوە پەروەردەکراوە، ڕەفتار بنوێنم، تەنیاوتەنیا پەرۆشی جێبەجێکردنی ئەرکەکەم لەنێـــو خەبـــاتی ڕزگـــاریخوازانەدا، تەنـــانەت ئەگەر حاشـــایش لە ئەگەری کردەوەی ڕۆژانە بکەم و تەنها ئەو بەرپرسیارێتیەی بۆم دەمێنێتەوە پەیامی بـاڵای ئیرگونە. لەوە زیـاتر، پێموانییە بتـوانم شـتەکان بۆ خـۆم ئاسـان بـکەم، ئەگەر نەتـوانم جاڕنـامەی سیاسـیی نەدەم، مـن حەزم لێیە دادگـاکەم بـخەمە خزمەت ئەو هـزرەی کە مـن بـۆی جەنگـاوم و بۆشـی گیـان لەسـەر دەسـتم. خەمخـواردنی ئێـوە بـۆ ژیـانی مـن لە دەرەوەی بـازنەدایە. مـن گەلێـک جـاران ڕووبەڕووی مەرگ بوومـەوتەوە، هەمـوو جـارێکیش هەسـتم کـردووە ئەرک و کاری خۆم وەک جەنگاوەرێک ڕایی دەکەم. لێرەدا دەرەتانێک بـۆ خەمخـواردن لە چارەنووسـی تـاک نـامێنێتەوە. چارەنووسـی گەلەکەم دەبـێ هەمیشـە جێـی خەمی ئێمە بێ.
"دەمەوێ ئەو ئەفسـەرەی سەردەسـتەم بزانـێ، کە مـن بەشـانازییەوە ئامـادەم حوکمی سزاکەم هەرچییەک بێ بیپەژرێنم. بەڵام خۆ ئەوە بۆ بەرگەگرتنی مـن ئاسـانتر دەبـێ، ئەگەر وەک دیلێـک ئەوە بـزانم، کە مـن ئەرکەکـانم وەک سەربازێکی ئیرگون بەجێهێناوە."
ئیدی بەمشێوەیە، کاتێ ئەو دوو کەسە لەنێو دادگاکەدا دەرکەوتن، وەک دوو دوو تۆمەتبـار نەبـوو، بەڵکـو وەک دوو سـکاڵاکار بـوون. ئاشـبێل بە دادوەرەکانی گوت:

"وێڕای دەرسوپەندەکانی مێژوو، دەسەڵاتدارانی ئێوە ئێمەیان لەسەر خاکی خۆمان تاڵان کرد و قانونی دڕەندان و ستەمکارییان چەسپاند، ئەوەش هەر ئەو واتایە دەگەیەنێ کە یەزدان ئەوانی لە هەستەکانیان کردووە، خودا ئەوانی کوێر کردووە، ڕێی کەوتن و ڕووخانی بۆ هێشتونەتەوە. هەرچیەک دەکەن، ناتوانن گیان و ورەی گەلی جوولەکە تێکبشکێنن و هەرەس بە پەرۆشی و خەمخۆریان بۆ سەربەستی لەنێو دڵ و دەروونی ڕۆڵەکانیان بێبێنی. ئێوە دەتوانن ئەو ڕاگەیاندنەی من وەک وەسیەتنامەیەی ئەو 600.000 هەزار[85] جووە یەکگرتووە بزانن، کە لە خەباتی ئازادی وڵاتەکەیاندان تا لەبن دەستی بێگانەی دەربهێنن."

شیشون بە درێژی ڕوونی کردەوە، ئاخۆ بۆچی دان بەو دادگایە نانێ، ڕایگەیاند: "ئێوە دەتوانن ئێمە بگرن و کۆت و پێوەندیشمان بخەنە دەست و پێ. بەڵام خۆ ئێوە ڕەوایانە ناتوانن داگاییمان بکەن. ئێمە هەرگیز دان بەوەدا نانێین، کە ئێوە دادوەر بن و ئێمەش تۆمەتبار. ئاخر کوا دادپەروەری بە بێ قانون دەکرێ. قانونی مشتەکۆڵەش قانون نییە. هەر کاتێکیش کەوا بجوڵێنەوە، نە دادوەر و نە تۆمەتبار لەگۆڕێدا نین. بەڵکو چەوساندنەوەیەکی دڕەندانەی یەک لایەنە هەیە؛ هەرچی لە لایەکەی دیکەشەوەیە قوربانییەکی بەرهەڵستکارە." ئەو لەسەر قسەکانی سووربوو تا گەیشتە ئەو ئاکامە: "گەلەکەمان زۆر بەر لە ئێوە هاتۆتە سەر سەکۆی مێژوو، دوای ڕۆیشتنی ئێوەش هەروا دەمێنێتەوە."

کاتێکیش بڕیاری حوکمەکە درا، ئاشبێل و شمشون سروودی نەتەوەیی هاتکیڤاهیان خوێندەوە.

ئەو ڕەفتارە شانازییەی ئەوان نواندییان سەرمەشقی نەوەک هەر یەکەم کاردانەوە بوو، بەڵکو شتگەلی زۆرتری بە دوادا هات. لەو ڕۆژ و شەوە دووردرێژانەی زیندانەکەیان، خانەوانەدەکانیان ماتەمبار بوون، چاوەڕێ بوون، هەر چاوەڕێ ئاخۆ هەواڵی لەسێدارەدانەکە کەی دەبیسترێ، یاخود هەواڵی دواخستنەکە، ئەوانیش نیشانەنمای بەرزی ورە و گیان بوون، ئەو مۆراڵەی کە ئیرگون مەشقی پێدابوون.

---

[85] ئاماژەیەکە بۆ ژمارەی جوولەکانی ئەو سەردەم لە ئێرتز ئیسرائیلدا. وەرگێڕ.

"من وای دەبینم" (شیمون لە زیندانەکەوە نووسیبووی) کە لە ماوەی ئەو دوو ڕۆژەی بە حوکمدراوی لە چاوە زیندانەکەمدا بردومەتە سەر، هەرگیز بۆ یەکجاریش بیرم لەو مەرگە نەکردۆتەوە، کە چاوەڕێمە. دەکرێ ئێوە بڵێن، کە من هەستی هاوسەنگیم لە دەستداوە، بەوەی هێزی کێشکردنی ڕەوشەکەم نەمابێ. نەخێر، دۆستەکان. ئەو هێوریەی ناخی دڵم هی ئەو ساڵانەی ئامادەکاریی گیانە، هی ئەو ئامادەکاریەیە بۆ وڵاتەکەمان... من دەزانم چی چاوەڕێی ئێمەیە، بەڵام خاترجەمم لەوەی مردنم هەنگاوێکمان لەسەرکەوتن نزیکتر دەکاتەوە. بە مەرگ و قوربانی ئێمە، وڵاتێکی ئازاد بۆ گەلەکەمان دادەمەزرێنین، کە تیادا مرۆڤ بزانێ چۆن دەژی و بۆ چیش دەژی."
ئاشبێلیش سووکوئاسان نووسیبووی:
"... بیستومە بزووتنەوەی بەرگری هەڕەشەی ئەوەی کردوە، ئەگەر بڕیاری حوکمەکە جێبەجێ بکەن، دەبێتە مایەی خوێن ڕشتن. خۆ ئەگەر مەرگی من خزمەتێک بەو ئامانجە بکا یەکێتی جەنگاوەران لە کۆمەڵگەی یوشیڤدا بەدی بێنێ، بەدڵخۆشییەوە لە هەموو هەوڵێکی سووککردنی حوکمەکەش خۆش دەبم؛ بۆ ئەوەی بزانێ کە چ هێزێک لە جەنگی یوشڤەوە هەیە."
ئاشبێل لە زانیاریەکەیدا هەڵەبوو. بزووتنەوەی بەرگری شتێکی وای لەخۆ نەگرتبوو. ئەو چیرۆکەی گەیشتبووە ئەوان، دیاربوو لەسەر بنەمای ئەو دەربڕینەی پێشو بوو، کە ئاماژەم بۆ کردبوو، بەوەی بزووتنەوەی بەرگری چەسپاندنی ڕێسا و قانونی لەناکاوە نوێیکەی بە تاوان دانابوو، ئەوانەشی جێبەجێی دەکەن بە تاوانباری لە قەڵەم دابوون.
لە ڕاستیدا کاردانەوەی هاگانا و دامەزراوە فەرمییەکان زۆر جیاواز بوو. ڕۆژنامەگەریش کە لەلای ئەوانەوە ڕێنوێنی دەکرا، هاتە پاڵ ئەو کۆرسی سەرزەنشتکردنی ئۆپەراسیۆنی سارفەند، تکاشیان لە حکوومەتی بەریتانیا کرد لە حوکمی مەرگیان خۆش بێ.
سەرانی هاگانا لەوە تێنەگەیشتن، کە ئەو دوو سەربازە گیراوەی ئیرگون، لە لایەن حکوومەتەوە هەڵبژێردراون تا ڕێسانامە نوێیکەی جێبەجێ بکا و کاریگەری سەلماندنە دەستبەجێیەکەشی لەنێو گەنجە جووەکاندا ببینێ. گەفی هاگانا بۆ تۆڵەکردنەوە، وەک دەسەڵاتدارە بەریتانییەکان بیریان خستنەوە، دەکرێ بەگوێرەی ڕێسانامە نوێکە لەگەڵیاندا بجوڵێنەوە. ئیدی، ئەوە بۆ

یەکەمین جار بوو، ئەو هەڕەشە مەردانەیە بخرێتە سەنگی مەحەک، ئەوان نەوەک هیچیان نەگوت و هیچیشیان بۆ جێبەجێکردنەکە نەکرد، بەڵکو ڕوون و ئاشکرا رایانگەیاند لەبەر هۆکاری پارتیزانی، ئەوان ڕەوشی "سەر پەڕژین" لەخۆدەگرن. ئەمەش دەق ئەو شتە بوو، کە دەسەڵاتداران دەیانەویست. خۆ ئەگەر دەسەڵاتداران لەو تاقیکردنەوەیان سەرکەوتو بن، بێ سێ و دوو زۆر جەنگاوەری دیکە بەدوای ئاشبێل و سیمشون دەنێردرێنە سەر پەتی سێدارە. ئێمە زانیاری هاودەقمان لە حکوومەتەوە وەرگرتبوو، کە بەلای کەمی یەکێ لەو دوو کوڕانەمان لەدار بدەن.
هەر چی دەرباری ئێمەش بوو، هەرگیز شتێکی وامان بەمێشکدا نەدەهات، ئەوان هەروا بۆ ویژدانی دەسەڵاتداران لێبگەڕێین. بڕیارەکەی ئێمە لەو کاتەوەی سێبەری قنارە خەریکبوو لەسەر سەرمان دەربکەوێ، رونوئاشکرا بێ گرێوگۆڵ بوو. لەو کاتەی جەنگاوەرەکانمان ئامادەی گیانبازی بوون، ئێمە لە هەوڵی ڕزگارکردنیاندا درێخیمان نەکرد. ئێمە جیاوازیمان لەنێوان جەنگاوەرێک و جەنگاوەرێکی دیکەدا نەدەکرد. کاتێکیش شمولڤیتز لە F.F.I حوکمی مەرگی بەسەردا درا، پێشنیازی نەخشەی پەلاماردانی گرتووخانەی مەڵبەندیی ئۆرشەلیممان بۆ بەمەبەستی ئازادکردنی ناوبراو بۆ ڕێکخراوەکەی کرد. نەخشەکەش وا داندرابوو بە هاوکاری هێزەکانمان جێبەجێ بکرێ، کەچی حوکمی مەرگی سەر شمولێڤیتز هەڵگیرا.
کاتێکیش ئاشبێل و سیمشون حوکمدران، ئێمە بۆ یەکەمین جار ئەو هۆشداریەمان دایە حکوومەتی بەریتانی: "سەربازە گیراوەکان لەسێدارە مەدەن. خۆ ئەگەر وا بکەن، ئێمەش سێدارە بە سێدارە وەڵام دەدەینەوە."
چەند ڕۆژێکیش دواتر ئێمە شەش ئەفسەری بەریتانیمان گرتن. پێنجیان لە یانەی ئەفسەرانی تەلئەبیبەوە گیران. یەکەیەکی ئیرگون دەوروبەری ناوچەکەی گرت و باڵەخانەکەی خستە ژێر چاودێرییەوە. دەستەیەکی بچووکیش ڕۆیشتن و دەستیان بەسەر ژووری تەلەفۆن کردندا گرت. سێ تا چوار کەسیش بە دەمانچەوە فەرمانیان بەسەر ئەو ئەفسەرانەی لە هۆڵەکەدا گردبیونەوە کرد، کە دەستیان بەرز بکەنەوە. ئەفسەرەکانیش بەدوودڵی ملکەچ بوون. ئەفسەرەکەی ئیرگون کە بەرپرسیاری چالاکییەکە بوو، پێنج کەسی لەوان لێگرتن، دیاربوو پلەی ئەفسەرییان لەوانی دیکە باڵاتر بوو، فەرمانی

بەسەرداکردن کە ئەوان دیلی ڕێکخراوی ئیرگونن. ئەوانیش ملیان دا، ئەنجا لە باڵەخانەکە هێندرانەدەر، ترومبێلێک لە دەرەوە چاوەڕوانیان بوو. بە باقی ئەوانەی مابوونەوە گوترا تا پازدە خولەکی دیکە نابێ لە شوێنی خۆیان ببزوون. تا ئەو کاتیش یەکەکانی سەربازی و پۆلیس هاتن، بەڵام تا ئەوان هاتن شوێنەواری پیاوەکانی ئیرگون بە پێنج دیلەکەشەوە نەمابوو.
لە ئۆرشەلیمدا، سەرەتا بەخت یاوەرمان بوو، پاشان دەستبەردارمان بوو. کوڕەکانمان ئەفسەرێکی پلە باڵای دەزگای هەواڵگری سەر بە سووپاسالاری گشتیی گرت. ئەفسەرەکە لە شەقامێک، نزیک هوتێلی شا داودا گیرا، ئەویش لە کاتی گرتنیدا ئەوپەڕی دیسپلینی بەکارهێنا. کاتێکیش هەستیکرد ئەوەی لەسەر کەلەکەی داندراوە دەمانچەیە، سواری ترومبێلە چاوەڕوانکراوەکە بوو. ئالۆن، فەرمانــدەی ئۆرشەلیم، بە خۆشیەکی لەبنەوە پێیڕاگەیاندین: "ماسییێکی گەورەمان گرتووە." بەڵام خۆشیەکە کورتخایەن بوو. ئاخر ماسیەکە ڕایکرد. ئەوش نەخوازراوترین شت بوو، نەدەبوایە ئەوە لە ئیرگون بقەومێ. کابرا پاسەوانەکەی قەناعەت پێهێنابوو، دەستەکانی بکاتەوە. ئەفسەری هەواڵگرییەکە کونێکی لە بنمیچی ژوورەکە دۆزیبووەوە، کە کاتی خۆی بۆ نانەواخانە بەکاردەهات. کاتێکیش بۆ ساتێک پاسەوانەکە ژوورەکە جێدەهێڵێ، ئەفسەرەکە بەختی خۆی تاقیدەکاتەوە و بازێکی گەورە هەڵدەدا، ئیدی بۆی دەردەچێ و تێدەتەقێنێ. پاسەوانەکە بەدرەنگەوە، ڕاکردنی ئەفسەرەکەی بۆ دەردەکەوێ. ئەویش بەدوایدا غاردەدا و لەنێو هێڵەکانی پاسی ئۆرشەلیمی دەگاتێ، بەڵام ئەفسەرەکە باز دەداتە نێو پاسێک و لە دەستی ڕزگاری دەبێ.
شتێکی سەرنجڕاکیش بوو، لەو کاتدا هیچ کەسێک بڕوای نەدەکرد، کە بە ڕاستی ئەفسەرەکە خۆی دەربازکردبێ. مـن بۆ مایەی حەپەسانی خۆم، تەنانەت سەرانی هاگاناش لەو باوەڕەدابوون، گوایە هەر بەخۆمان ڕاکردنەکەی کابرای ئەفسەرمان ڕێک خستووە.
زۆری پێنەچوو ئەفسەرێکی دیکەمان گرت و فەرماندەیی هاگاناش داوای ئازادکردنیان کرد. ئەوان و سەرە سیاسییەکان هۆکارگەلێکی جیاجیان بۆ داوای ڕزگارکردنیان هەبوو. ئەوان لە تۆڵەکردنەوەی بەریتانییەکان ترسان. دیسان هەستیان کرد، ئەو گرتنانە هێزی جیهانی بەلاڕێدا ببەن-هەروەک

بەدڵنیایشەوە وایان کرد- نەخاسمە لە ئۆپەراسیۆنەکەی هاگانا بۆ سەر پردەکان.
لە یەکەمین کۆبونەوەمان دوابەدوای ئۆپەراسیۆنەکە، بۆ خەڵکی هاگانام روونکردنەوە، ئەمەیان ئۆپەراسیۆنێکی سەربازییانە نییە تا بڕیاری بزووتنەوەی بەرگری دوابڕیار و یەکلاکەرەوە بێ. ئێمە ناکرێ لەسەر حیسابی خۆمان لێبگەڕێین پیاوەکانمان لەسێدارە بدرێن.
پێمگوتن، "جوامێران، لەمەیاندا ئێمە ئامادەین تا کۆتاییەکەی لەگەڵیدا برۆین. بەڵکو پێویستیش بەوە نەکا. ئێوە دەبینن بەهۆی فشاری ئێمەوە ژیانی ئەو کوڕانە ڕزگار دەبێ."
دەکرێ سنێ و گالیلی هەستیان بەهاوسۆزییێک کردبێ، لێ ئەوان ڕامانەکەی منیان پەسەند نەبوو. ئەوان سووربوون لەسەر گوشارەکەی خۆیان بۆ ئازادکردنی ئەفسەرە بەریتانییەکان. دواتر سنێ منی بانگهێشتی کۆبوونەوەیەکی دیکە کرد. ئێمە ڕۆژێک دوای هەڵاتنی ئەفسەرەکەی دەستەی سووپاسالاری بەریتانی، یەکدیمان بینی. ئەو ئاخاوتنەکەی بە پەسندانی ڕەفتارەکەی ئێمە کردەوە.
"پێموابێ" ئەو وای گوت: "ئێوە بواری راکردنەکەی ئەوتان رەخساند، بۆ ئەوەی لەگەڵ ڕۆیشتنەوەی ڕاپۆرت بداتە سەرووی خۆی، کە ئێوە ئازاری گیراوەکان نادەن. ئەمەش ڕەفتارێکی هۆشمەندانەیە و پێشدەچێ زۆر کۆمەک بەخشیش بێ..."
من لەگەڵ خۆم ڕووبەڕوو بوومەوە. تۆبڵێی ئێمە دان بە شکستیەکەی خۆماندا بنێین؟ بڕواکردنی ئازادبوونی دیلەکە ئەوەندە قووڵ و بەربڵاو بوو، تەنانەت ناخۆشیش بوو ڕاستیەکە بدرکێنی. بەڵام وام بیردەکردەوە، کە ئێمە بە هاوکاری هاگاناوە دەجەنگاین، ئەوەش نابێ ئەوان لەخۆمان بێئومێد بکەین. بۆیە ئەوەم بۆ باس کرد کە ڕوویدابوو. ئەویش هیچ کەیفخۆشییەکی نیشان نەدا، بەڵام نەشیتوانی حەپەسانەکەشی ئاشکرا بکا.
ئێمە بڕوامان بەوە هێنابوو، ڕێگاکەمان ڕاستە و تاکە ڕێگاشە، لێبراوانەش فشارەکانی هەموو لایەکمان بۆ ئازادکردنی باقی گیراوە بەریتانیەکان ڕەتکردەوە. لەو کۆبوونەوەیەی لەگەڵ نوێنەرانی هاگانا و F.F.Iدا کرا، لە لایەن هەمووانەوە پێمان گوترا، گەر هاتوو دیلەکان ئازاد نەکەین، ئەوا

چارەنووسی پیاوەکانمان مۆری لێدەدرێ. وەک ئەوان رایانگەیاند، ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا بۆ خاتری گیانی چەند ئەفسەرێک، شکۆکەی ناکاتە قوربانی. لە دەرهاوێشتەشدا هاگانا هەستی وابوو، دەبێ ئێمە دیلەکان ئازاد بکەین، ئەوسا بەڵکو هیوایەک بۆ قوتاربوونی ئاشبێل و شیمشن لە ژێر پەتی سێدارە پەیدا ببێ. F.F.Iیش پێیوابوو ئێمە دەبێ دیلەکان لای خۆمان تا دواسات بهێڵینەوە، هەرکاتێ ئەوان کەسەکانی ئێمەیان لەسێدارەدان، ئێمەش ئەوان بە سزای مەرگ بگەیەنین.

ئێمە هەر دوو ڕوانینەکانمان ڕەتکردنەوە. دانیشمان بەوەدا نا، پرسی شکۆ هەر دەبێ شتێکی بەهێز بێ. وێستگەیەکی ڕادیۆ بە بەربڵاو ڕایگەیاند، ڕفاندنی ئەفسەرەکانیان تەختی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیای هەژاندووە. بەڵام ئێمە هەستمان کرد، لەوێدا دوو گەفی سەر شکۆ هەن، کە حکوومەتی بەریتانی ناچار بێ یەکێکیان هەڵبژێرێ. یەکەمینیان ئەگەری ملدان بوو بەو فشارە ڕاستەوخۆیەی کەوتۆتە سەری. لێبژاردەی دووهەمیشیان ئەگەری ئەوەی ئەفسەرە بەریتانییەکان ئاشکرا و ڕاشکاوانە لەدار بدرێن. حکوومەت دەیزانی، ئەگەر ئەوان سەربازەکانی ئێمە لەدار بدەن، ئێمەش کتومت بەهەمان شێوازی ئەوان ڕەفتار دەنوێنین. هەر بۆیە مشتومڕمان لەسەر ئەوە بوو، بەریتانیەکان بژاردەی یەکەمینیان هەڵدەبژێرن چونکە زەبرەکەی لە هی شکۆیەکە سووکترە و خۆیان لەهی دووهەم بەدوور دەگرن چونکە زیانی زۆری لێدەکەوێتەوە. ئیدی هەر تەنها ئەو کات کوڕەکانمان ڕزگاریان دەبێ.

ئێمە ئامادەیی خۆمان بۆ ڕێڕۆیشتن تا دوا خاڵی تاڵوتفت نیشاندا، ئەمەش نەوەک هەر لەپێناو ڕزگارکردنی ژیانی هەر دوو سەربازەکانمان بوو، بەڵکو بۆ ئەوەی جارێکی دی ئەو جۆرە سزایە بەسەر جەنگاوەرە عیبریەکاندا نەدرێتەوە.

ئینجا ئێمە ئەو پێنج دیلانەمان لە دوو شوێنی لەیەک جیا شاردنەوە، سێ کەسیان لە شوێنێک و دووانەکەی دیکەش لە شوێنێکی دیکە. بەڵام هەر لە تەلئەبیبیش بوون. سووپای بەریتانی لە تەلئەبیبدا جاڕی قەدەغەکردنی هاتووچۆی دا، ماڵ بەماڵیش کەوتە کنە و پشکنین. چەند جارێک خەریکبوو بەریتانییەکان بەسەر دیلەکاندا هەڵبنگون. لە کۆتاییدا کەوتنە گومان کەوا هەر لە تەلئەبیب نەبن. ئێمەش هەنگاوێکمان بۆ هاندانی ئەو گومانەیان نا.

کامیۆنێک کە داری نەقالەی تێدابوو، لەوێ لەسەر ڕێگای خێرا، لە دەرەوەی شار بەجێهێڵرا بوو. بەمە دەسەڵاتداران زیاتر پەشۆکان، ئاخر نەیاندەزانی لە کوێ دەست بە گەڕان و سوڕان بۆ هەڵگرتنەوەی شوێنپێی ئەفسەرەکانیان بکەن. ئەوان نەشیان دەزانی، کە ئێمە دیلەکانمان لە شوێنێکی نائاسایش و ئاسان شاردونەتەوە. بەڵام ئەو زەحمەتییە بیرۆکەیەکی پێداین. جوویێکی ناسراو بە شێوەیەکی نافەرمی قسە لەگەڵ دەسەڵاتداران بکا، بۆ ئەوەی لە بەرامبەر هەڵوەشاندنەوەی سزای مەرگی گیراوەکانمان، هەر پێنج ئەفسەرە دیلەکانیان ئازاد بکرێن. ئەو کەسە پێی ڕاگەیاندین، دەسەڵاتدارانی بەریتانی بە بەهەند هەڵگرتن خەریکی هەڵسەندگاندنی پێشنیازەکەمانن، واشی دەربڕی کاریگەری گفتوگۆکانی ئەوە نیشان دەدا، هەوڵەکەی سەربگرێ. هەرچەندە لەو نێوەشدا هاندانی دژایەتیمان پەرەی دەسەند، چەندان چیرۆکیش دەربارەی ئەو پێنج ئەفسەرە دیلانە بڵاوەکرانەوە. لەوەوە ئێمەش گەیشتینە ئاکامێک، بیرۆکەیەکی باش دەبێ، ئەگەر لەو پێنج گیراوە، دوو ئەفسەریان ئازاد بکەین. ئەوەش وا دەکا ئاسانتر سێ کەسەکەی دیکە لای خۆمان بهێڵینەوە، کارێکی وا دەکا بەڵکو هاندەرەکان بێدەنگ بکات و کۆمەکی دانوستانەکانیش بکا.

بۆیە دوو ئەفسەرمان ئازادکردن، ئەوانیش ڕاپۆرتی ئەوەیان دابوو، کە بە جوانی لەگەڵیاندا جولابوونەوە. هێزی سەربازیش -هێشتا هەر لێیان دەگەڕان- بەیەکجاری سەریان لێشێوا، بەتایبەتیش سەبارەت بە بێدەنگییە قڕوقەپەکەیان. ئێمە هەر لە ڕۆژی گرتنی هەر پێنج ئەفسەرەکەوە، هیچ لێدوانمان نەدابوو. دژی هەر کێبەرکێیەکیش بووین لەسەر شکۆ رووشاندن. ئێمە نەماندەویست ئاستەنگی زیاتر بخەینە بەردەم ڕێی کشانەوەی حکوومەت لە نیەتە کوشندەکانی. ئێمە تەنها یەک ئامانجمان هەبوو: ڕزگارکردنی کوڕەکانمان. بۆیە قڕوقەپمان لێکرد، تەنانەت لەو کاتەی ڕۆژنامەوانی جیهانی و ڕادیۆ، ڕۆژی پاشتر جاری ئەوەیاندا، کە ئێمە ئامادەین هەر کاتێک ئەوان هەر دوو کوڕە جووەکە لە سێدارە بدەن، ئێمەش ئەفسەرەکانیان بەهەمان دەردومەرەد ببەین. ئێمەش نە حاشاییمان لە شتەکە کرد و نە سەلماندیشمان.

هەرچەندە هەموو خەم و ڕەنج و ماندوبوونمان خەریکبوو لەبار بچێ و ئاشبێل و سیمشونیش لەسێدارە بدرێن، ئەمەش هەمووی بەهۆی ئەو گەمە گەمژانەی بەدەستپێشخەری هاگاناوە هاتە گۆڕێ. "دەنگی ئیسرائیل" ئێزگەکەی هاگانا، ڕایگەیاند، گوایە ئێمە دوو بەریتانییەکەمان لەسەر داوای بزووتنەوەی بەرگری ئازاد کردووە. سەرانی هاگاناش دڵنیایان کردینەوە، ئەو ڕاگەیاندنە درۆودەلەسانەی ڕادیۆکە بەبێ زانیاری ئەوان پەخشکراوە. بڵاونامەکە هەلومەرجێکی دژواری ئافراند و ناچاری کردین پەردەی بێدەنگی بدڕێنین. گەر هاتباو حکوومەتی بەریتانیا لەو بڕوایەدا بووایە، ئێمە لەژێر جۆرە فەرمانێکی وا دابناین، ئەوا دەگەیشتنە ئاکامێک، کە پێویست نەدەبوو خەم لە سێ گیراوەکەی دیکەیان بخۆن، تەنانەت گەر حوکمی بڕیارلێدراوی ئاشبێل و سیمشۆنیش دوانەخرابا. ئەو ئاکامە سادە و لۆجیکیەی گەوجایەتی هاگانا بەتەواوی لە لایەن ئەو پیاوەی ئەوان کە ڕێکخەر بوو لەگەڵ حکوومەت پشتڕاست کرایەوە. ئەو پێی گوتین کاتێ ناڕاستی وەک ڕاستی بسەلمێندرێ، هیچ شتێک بۆ دانوستان نامێنێتەوە. لە دەرەنجامدا ئێمە بڵاونامەیەکمان پەخشکرد، بەوەی بزووتنەوەی بەرگری هیچ دەسەلاتێکی نییە تا فەرمانمان بەسەردا بکا و ئەوەی ڕادیۆی هاگاناش بڵاوی کردۆتەوە هەمووی دروستکراو و لەخشتەبردنە.

لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا بۆمان دەرکەوت مەزندەکانمان بە ڕاست وەرگەڕاون. بەڕێز ڕۆکا، سەرۆکی شارەوانی تەلئەبیب، بە ئەفسەرە پەیوەندییەکەی ئێمەی ڕاگەیاندبوو، کەوا دەسەلاتدارە بەریتانییەکان مەیلیان لێیە حوکمی دوو گیراوەکانمان هەڵپەسێرن، ئەگەر ئێمە ئەفسەرە دیلەکانی ئەوان ئازاد بکەین. لە 28ی حوزەیرانی 1946دا مۆشی سنێ ئەم پەیامە بە پەلەیەی بۆ ناردم:

"زانیارییم لە ئەندامێکی بەرپرسیاری ڕێکخراوەکەمان لە ئۆرشەلیمەوە هەیە، قسەی لەگەڵ بەرپرسی دەزگای ئاسایشی لەشکری بەریتانی کردووە کە ڕاستەوخۆ لەژێر فەرمانی سووپاسالار دایە. ئەمەی خوارەوەی پێگوتووە: دەکرێ بە برادەرەکانت بڵێی، کە دوو کەسەکان لە سێدارە نادرێن. ئەمەش بڕیارێکی یەکلاکەرەوەیە و پێم ڕاگەیەندراوە، هەرچەندە ئەو بەڵێنە نابێ بە فەرمی جاڕ بدرێ. بەلام پیاوەکە پێیگوتم، ئەو دڵنیایە کە حوکمدراوەکان

لەسێدارە نادرێن. جەختکردنەوەی سروشتی ئەو بەڵێنە نافەرمییە ئەوە دەردەخا، کە شتەکە بۆتە بەڵێن.'
"ئەوەش کۆتایی پەیامەکەیە. بە بیروباوەڕی ئێمە" (تێبینییەکەی سێ وای لەسەر دەڕوا) " کە هیچ گومانێک لەوەدا نەماوەتەوە، کە ئەمە تاکە ڕێگا بێ بەوەی دەسەڵاتداران بەڵێنەکە یان ئەوەی لەخۆیان گرتووە جێبەجێی بکەن. ناکرێ ئێوە چاوەڕوانی شتێکی لەوە زیاتر بن، تەنانەت ئەوان بڕیاری بردنەسەری بەڵێنەکەشیان دابێ.
"لەبەرئەوەیە داواتان لێدەکەین ئەو سێ دیلەی لاتان ماون، ئازادیان بکەن. چەند زووتر بێ ئەوەندە باشتر. M"
منیش بەبێ وەخران وەڵامی پەیامەکەم دایەوە، کە سەلمێندرا ئێمە چەند باش لە حکوومەت گەیشتبووین. لە هەمان ڕۆژدا بۆ فەرماندەیی بزووتنەوەی بەرگریم نووسی:
"هەموو ئەو ماوەیە (ڕۆکا)ی شارەوان لەگەڵ نوێنەرە فەرمییەکانی حکوومەت لە دانوستاندا بوو. ئەویش دڵنیای کردینەوە، لە ماوەی چەند ڕۆژی داهاتودا پرسەکە بە ئاکامی ئەرێیانەی خۆی دەگا. زۆر باشتر و دڵنیایانەترە بەڵێنەکە لە خودی حکوومەتی ناوەندەوە بێ لەوەی لە کەسێکی نەناسراوەوە، چونکە ئەمەی دووهەم هیچ کەسێک پابەند ناکا. هەر چۆنێک بێ بەو زوانە ڕاستی ناوەڕۆکی گفتوگۆکانی ڕۆکا دەردەکەوێ."
لە کۆتاییدا بە سێنێم ڕاگەیاند، ناکرێ سێ ئەفسەرەکە ئازاد بکرێن لە کاتێکدا قەدەغەکردنی هاتووچۆی سەر ڕێگەوبانەکان بەردەوامە، داوای ئەوەشمان کرد ماوەی نێوان ئازادکردن و هەڵوەشاندنەوەی حوکمە بڕیارلێدراوەکەی لەسێدارەدان بۆ هەرە کەمترینیان دابشکێندرێ. "ئێمە دەبێ دەمارگرژی ئەو کوڕانەمان لەبیر بێ، کە چواردە ڕۆژە پۆشاکی سووری مەرگیان پێ پۆشیون."
ئێمە زانیاری دەقاودەقمان بۆ هات، کە دەسەڵاتدارە بەریتانییەکان بەڵێنی وەستاندنی حوکمی دوو پیاوەکانیان داوە. بەڵام خۆشحاڵ نەبووین، داوای بەڵێنێکی بێ گرێوگۆڵمان کرد. ڕۆژی پاشتر بۆنەنامەیەکی فەرمی بەریتانی ئەو شێوە حوکمی مەرگەی بەبێ پێشینەیەک لە مێژووی حکوومەتی کۆلۆنیالیدا، هەڵوەشاندەوە. سووپاسالار حوکمی مردنەکەی پشتڕاستکردەوە،

بەڵام کۆمسیاری باڵا بڕیاری لێخۆشبوونی بۆ دەرکردن، بێئەوەی هەر داواشی لێبکرێ. ئەوسا مەزندەکان کە بوونە مایەی بڕیاردانی هەڵوەشانەوەی حوکمی مەرگ بەسەر دوو کەسەکەمان بەر لەوەی ئێمە ئەفسەرە دیلەکانیان ئازاد بکەین، بەوشێوە سەیرەی کە پەیڕەویان کرد، هەر چۆنێک بێ، هەموو جیهان ئەمەی لەچاوی ئێمەوە زانی دانیان بەودا نا کەلەم خولەی خەباتیشدا ئیرگون بردیەوە.

ئازادکردنی ئەفسەرەکانیش شتێکی ئاسان نەبوو. بە ڕاستیش حکوومەت لەسەر داوای ئێمە قەدەغەی سەر ڕێ و بانەکانی سەر تەلئەبیب و دەوروبەرەکەی هەڵگرت، بەڵام خۆ گیراوەکان لەنێو خودی تەلئەبیبدا بوون، بازگەکانی سووپاش لەبەر ئازادکردنەکە لە هەموو گۆشە و کەنارەکان دەبینـدران، چونکە بەدوای ئەوەدا بوون دیلکەرەکانیان ببینـنەوە. ئیدی گەمەیەکی سەیر دەستیپێکرد. هەرئەوە نەبوو، کە ئێمە دەسەڵاتدارانمان بە هەڵەدا برد. مێردمنداڵە جووەکان ئەوانەی حەزیان لە قۆشمە و پێڕابواردن بوو، لەخۆوە بەهانامانەوە هاتن. ئەوان زەنگی تەلەفۆنیان بۆ هەموو وێستگەکانی پۆلیسی تەلئەبیب لێدا، پێیان گوتن، ئەفسەرەکان لە شوێنێک لە باکوور، لە باشوور، لەسەر کەنار، لەلای بەلەمە سەوڵلێدەرەکان بیندراون. ئیدی سەرباز و پۆلیس لەملا بۆ ئەولا بەپڕتاو بەدوای ڕاوەدونانی خۆیان دەڕۆیشتن.

لەو نێوەشدا گیدی و یۆول ڕووبەڕووی هەموو دژەجوولەیەکی دەسەڵاتداران بوونەوە. ئەفسەرەکان، پاکو خاوێن، ریشتاشراو بەخۆیان و پۆشاکی سەربازیانەیان کە تازە ئوتووکرابوو، خزێندرابوونە نێو سندوقێکی گەورە، کە جێ هەوا گۆڕکێیەکی تایبەتی بۆ کرابووەوە، سندووقەکەش لەسەر لۆرییێک بارکرابوو، بەرەو ناو جەرگەی شار نزیک رۆتشیلد بۆلیڤوار لێیان خوڕی. هەر زووش دەورییەیەکی پۆلیس دوای لۆرییەکە کەوت، بەڵام دوایی کۆڵی داو گەڕایەوە، ئاخر گومانی لەوەدا نەمابۆوە، کە لۆرییەکە مۆبیلیاتی بارکردووە. سندووقە گەورەکە لەسەر شەقامێک دابەزێندرا، قفڵەکانی کرانەوە، پیاوەکانی ئێمەش لەوێ نەمان.

ئاپۆرایەک لە خەڵکی تەلئەبیب لەو دەورەدا خڕبوونەوە و سەیری ئێمەیان دەکرد، سەرەتا سندووقەکە لەخۆیەوە کرایەوە، ئینجا سێ پیاوی کەشخە و

قۆن، سێ ئەفسەرە بەریتانییەکەی لێ هاتنەدەر. یەکێک لەوان -کەسێکی مکوڕ- بەدوای لۆریەکەدا غاریدا، بەڵام هەر زوو بۆی دەرکەوت بێهودەیە، ئینجا کۆڵیدا. ئەو پێکەنینە گشتگیرییەی یاوەری ڕاپۆرتی سەرچڵیەکە بوو هیچ شتێکی لە شکۆی دەسەڵاتی ماندات زیاد نەکرد.

ئێمەش خۆمان میزاجی ئەوەمان نەبوو پێبکەنین. بەڵام دڵمان لە خۆشی ڕزگارکردنی هاوڕێکانمان لە داری قنارە هەر کوتەکوتی بوو. لە دەرهاویشتەی ئەو حیسابە درێژ و ڕوونکردنەوەی پێشهات و پەرەسەندنەکانی بەندی ئاشبێل-سیمشون، کە دابی ئێمە بوو، ئاوا لەنێو ئیرگوندا گێڕامان، وامان نووسی:

"ئەو کێبەرکێ بچکۆلانەیە زۆر ڕووی هەن. ئاشبێل و شیشۆن نموونەی پاڵەوانەتییێکی مەزن بوون؛ گرتنی ئەفسەرەکانیش نمایشێکی ئەوپەڕی هەستی سەروەری عیبریانە بوو، کە خۆی شتێکی ماک و چارەنووسازانە بوو بۆ گەیشتن بەخودی سەرداریتی؛ گرتنەکە و هەموو ئەو پێشهاتانەی بەدوایدا هاتن، ناووڕوومەتی ئیرگونی لەوانەیە زیاتر لە هەر ئۆپەراسیۆنێکی دیکە بەرزتر کرد. نەوەک هەر ئاتێلێ شتەکەی بە "لوتکە" بینی، بەڵکو لە جیهانیشدا بەتایبەتی لێرە کە بۆ ماوەی شازدە ڕۆژ چەقی باس و خواسەکان بوو؛ خودی پێشبڕکێکە بە بەدیهاتنی تەواوی ئامانجەکەمان کۆتایی هات.

"بەڵام لە سەرووی هەمووشیاندا، لەنێو ئەو ڕووداوانەدا یەک دیاردە هەیە، کە لەوانەیە هەر بە تەنیا ئێمە لێی تێبگەین. شتەکەش چۆنایەتییە کە دڵەکانی ئێمەی داگرتووە و تێکەڵی خوێنیشمان بووە. شتەکەش سادە و ئاسان چۆنایەتییە، بەڵام لەوەش جوامێرانەتر پەیدا نابێ، کە ئەوەش چۆنایەتی دڵسۆزییە."

## بەندی 18
## دۆڤ گرەنەر

۳۸۰ - ۳۹٤

هەر چەنــد مانگێــک دوای ئەوە، ئــیمە دیســان تووشــی بەڵای ســێدارەکان هــاتینەوە. ئەم گۆبەنــدەش لە ڕۆژێکــی بەهــاری 1946دا دەســتیپێکرد. ڕۆژەکەش لە قەڵای پۆلیس لە ڕاماتگان ڕۆژێکی زۆر ئاسایی بوو. پۆلیس هەر جرت و فرتی بوو، دەهات و دەچوو، ڕاپۆرتی خۆی دەدا و ڕێنمایشی وەردەگــرت. ترومبێلــی بێــتەل دەگەیشــت، زرێپۆشــیش لەوێ دەردەچــوو. قەڵایەکە بەســەر نــاوچەکەی دەوروبەریــدا دەیڕوانــی و بە چەنــد زاڵــگەی مەحکەمیش دەورە درابوو. شوێنەکە باش پارێزرابوو. ڕەشاشیش لەسەر وێستگەی زاڵگەکان دامەزرێندرابوون و لەوپەڕی ئامادەباشیدا بوون، بۆ هەر تەقەکردنێک پەنجە لەسەر پەلاپیتکە بوو. ڕۆژیش بەرز بوو، لەناوەڕاستی ئاسمان کەلی ببوو، کاتەکەش ئێوارە بوو، بەڵام تۆبڵێی کێ پێشبینی فڕوفێڵی تیرۆریستەکان بکا! ئاخر ئەوان جارێک چووبوونە سەر سارافەند، باشە بۆچی جارێکی دیکە بەختی خۆیان لە قەڵای ڕاماتگان تاقی نەکەنەوە؟
هێزێکــی ســەربازی گەورە بە هێواشــی لە دەرەوەی بینــایەکە بەدەرکەوت. هێزەکە هیچ گومانێکی نەنایەوە. بە هێواشی لەو شوێنە بارگەوبنەی هەڵدا، کە چەنــدان ســەربازی عەرەبــی هەڵاتــووی تێــدا بەنــد کرابــوون. ئەفســەری پەیوەندیدار بە پاســەوانی ســەربازی وەژوور کەوت و ڕاپــۆرتی خــۆی دایە ئەفسەری پۆلیسی ئەرکدار بەوەی چەند عەرەبێکیان بەهۆی تالان و بڕۆوە لە ســەربازگەی تەل لیتڤینســکی گرتــووە. ئیــدی فەرمانــدەی ســەربازگەکە بڕیاریداوە دزەکان بدرێنە دەست پۆلیسی راماتگان بۆ لێکۆڵینەوەی بەرایی و بۆ دادگاییکردنیان. ئەفسەرە ئێشکگرەکەی پۆلیسیش گیراوەکانی وەرگرتن. ئەفســەری پاســەوان لە دەرگــاکە هــاتەدەر و هــاواریکرد: "هــۆی، دەی ئەو گیراوانە بێننە ئێرە!"
فەرمــان بە عەرەبەکــان کــرا بەرەو وێســتگەی پــۆلیس بــڕۆن. ســەربازە پاســەوانەکانیش بەوردی چاودێریــان دەکــردن، دیــاربوو هــیچ دەرەتانێکیــان

نەبوو. پێشتر ئەوان راهێندرابوون لەگەڵ هەر جوڵە و بەپێشدا کەوتنێک چۆن لــــوولەی تفەنگەکانیـــان بشـــارنەوە. دیـــاربوو "عەرەبەکـــان" خۆیـــان بەدەستەوەدابوو، بێ نقەکردن شتەکەیان قبوول بوو.
ئیدی گیراوەکان و پاسەوانەکانیان بەرەو قەڵاکە بە ئاراستەی گرتووخانەکە بردن. پۆلیسێکی عەرەب دەرگا قورسەکەی زیندانەکەی کردەوە، دیاربوو لە چاوانیشیدا هەر خەفەت بۆ برا عەرەبە گیراوەکانی دەباری.
بەڵام لە پــڕێکەوە "عەرەبە گیراوەکـــان" قیتبــوونەوە، لەبــن دژداشـــەکانیاندا دەمانچە و تفەنگەکانیان دەرهێنان. شتێکی سەیر بوو، سەربازە بەریتانییەکان لە پۆلیسە بەریتانییەکانیـان ڕاکێشـایە چەک. هەر چۆنێک بێ بوارێکی وایـان نەدایە پۆلیسە حەپەساوەکان تا بیر لەو ڕەوشە هاوکارییە سەیرەی نێوان عەرەبە دیلەکان و چەکدارە سەردەستەکانیان بکەنەوە. هەر لەوێ ئەفسەری پاســەوان فەرمـــانی خـــۆی دا: "دەســـتەکانتان بەرز بـــکەنەوە و بچـــنە نێـــو زیندانەکەوە."
باشچاوەشـی پۆلیسـەکەش ملکەچی فەرمـانەکە بـوو، بەدوای ئەودا چەنـدان پۆلیسی دیکەش هەمان شتیان کرد و دەرگاکەیـان لەسـەر کڵۆم درا. گاد ئەو ئەفسەرە لاوەی ئیرگون و کوڕی شارەوانی سافەد لەگەڵ سەربازە "عەرەب" و "بەریتانییەکان" دەستیان بەسەر ناوەوەی قەڵای راماتگاندا گرت.
پاشـــان قۆنـــاغی دووهەمـــی ئۆپەراســـیۆنەکە هـــات. جبەخـــانەکەی ئەوێ قفـڵ درابوو. بەدوای کلیلەکەدا گەڕان، بەڵام لە هیـچ شـوێنێکیان نەدۆزیەوە. ئیدی چارەیان بۆنەمابۆوە، دەبوایە دەرگا ئاسنینە کەتەکە بتەقێندرابایەوە. بەمەش مەترسیەکە دژوار دەبـوو. هێشـتا پاسـەوانەکانی سـەر قەڵاکە و دەوروبەری ئەوێ، ئاگایـان لە مەحمـودی بێزەوال نەبـوو، هێشـتا دەسـەڵاتداران بەوەیـان نەزانیبوو، کە چەند چەکدارێک دەستیان بەسەر جبەخانەکەی ئەوێدا گرتـووە.
بە ڕاست خۆ ئیسرائیل، یەکێک لە باشترین ڕەشـاش بەدەستەکانی سـووپای بەریتانی لە دەرەوەیە، ئیسرائیل ئەو ناوەی باش خستبووە بن چاوان، لەسـەر ئەوە مکوڕ بوو، هیچ ئۆپەراسیۆنێک بەبێ تفەنگی برێن سـەرناگرێ، ئەم جارە کردەوەکە چاوەڕێی دەستی ئەو دەکا. بەڵام خۆ نیەت وانەبوو چالاکییەکە بە شـەڕ کۆتـایی پێبێ. چالاکیی بردنی چەک و تەقەمەنی بۆ هێزێکی برسـی و تینوی چەک وەک ئیرگون، دەبوایە بە هێورەیی ئەنجام بدرێ. لەبەر ئەوەش

ئیرگون بە حەسرەتی ئەو چەکانە بوو، هیچ چارەی جێگرەوەی دیکە لە دەستدا نەمابۆوە. داینەمێتەکە داندرایەوە، فتیلەکە ڕاکێشرا، هورمژنی تەقینەوەکە ئەو ناوەی هەژاند و داروپەردوو بۆ ئاسماندا فڕی، بەم جۆرە کونێک لە دەرگاکە کرا و چەکوچۆڵەکەن بە ڕوونی دەبیندران.

دەستبەجێش کردەی بارکردنەکە دەستیپێکرد. ڕەشاشی قورس قورس، ڕەشاشی سووک، تفەنگ، سندووقی فیشەک، بە خێرایی لە لایەن "عەرەبە گیراوەکان" و "سەربازە بەریتانیەکان" بارکران. دەبوایە لە ماوەیەکی کورتیشەوە پاڵپشتی کرابان. ئەفسەرێک وەسەربان کەوت و بە کارایی تفەنگەکەی خۆیی ڕانایێ. ئەو تفەنگە بێرنەکەی خۆی ئاگر دا. خەریک بوو دەستبەجێ نیشانەکانی خۆی بپێکێ. کردەی بارکردنەکەش لەوپەڕی گەرمی خۆیدا بوو. ترومبێلەکە لەبن بارەکەیدا گرەی دەهات، پیاوەکان لەبن ڕێژنەبارانی گوللەکاندا رایاندەکرد، هەنووکە لە هەموو لایەکەوە تەقە بوو، ئیسرائیل بەجۆش و خرۆشەوە گەڕابۆوە.

شەڕەکە بۆ ماوەی زیاتر لە نیو سەعات بەردەوام بوو. مەترسی سەر کورەکانمان تا دەهات زیاتر دەبوو. بەهۆی لەیەک حاڵینەبوونێکەوە هێزی پاڵپشتی بەریتانی لە وێستگەی پۆلیسدا خڕبووەوە. خەریک بوو بقەومێ. ڕادیۆبەگەڕخەرەکەی بنکەکە پۆلیسێکی جوولەکە بوو، دڵی ئەو لەگەڵ یاخیبوواندا بوو. بەڵام خۆ ئەو کەسانەی لە بەردەم دەرگاکەی ئەو پەیدا ببوون عەرەب بوون، لەوەش زیاتر ئەوان بەدەوری خۆیان بە عەرەبی قسەیان لەگەڵدا کرد. سەرسوڕهێنەرانە گەیشتبووە ئەو دەرەنجامە، ئەوەی دەگوزەرێ هێرشی عەرەبەکانە نەک هاونیشتمانەکانی. ئیدی بازیدا و دەرگاکەی داخست و پەیامێکی بە پەلەشی بۆ ئاگادارکردنەوە و یارمەتی نارد.

بەریتانییەکانیش لە سارۆنا و پێتاح تیکڤاوە کەوتنە خۆ، تا هێزی پاڵپشت بنێرن. مەترسی هەرە گەورە لەلای سارۆناوە بوو. بەڵام ئەو هێزە پۆلیسەی لەوێوە بە پرتاو هات، لە ڕێگادا وەخران بەریان پێگیرا و دەستبەجێ نەگەیشتنە راماتگان. ئاخر لەوێ لەسەر ڕێگای سارۆناوە دوو سەربازی ئیرگون لە بۆسەدا بوون، ئاراستەی ڕێگاکەیان گرتبوو ، بۆیە ترافیکێکی زۆری لۆری و ترومبێلیان دروست کردبوو، ڕێگاکە ببووە زیگزاگ، بەمەش

ڕێگرییەکی باش لە بەردەم تێپەڕینی ترومبێلی پۆلیسەکانی بەری سارۆناوە پەیدا بوو. یەکێ لە سەربازەکانی ئیرگون چاویلکە گەورەکەی ڕۆژپارێزی لێ بەربیوۆوە، کە بۆ نەناسینەوە لەچاوی کردبوو، ئیدی عەرەبێک کە سواری پاسێک ببوو، بۆی هەڵگرتبۆوە، بەخەندەشەوە دایەوە دەستی کابرای ئیرگون. بەختی هێزە پاڵپشتیەکەی پیتاه تیکڤا لە گەیشتن باشتر بوو. ئەوان وازیان لە ترومبێلەکانی خۆیان هێنابوو، بەپێ کەوتبوونە ڕێ. خەریکبوو ئەوان بگەن و ڕێگا لە کوڕەکانمان بگرن. لەوەش زیاتر ڕەوشی ڕووبەڕووبوونەوەکە نامرادانە پەرەی دەسەند. جبەخانەکە لە هەموو شتێک چۆڵکرابوو تەنها تۆزوخۆڵ نەبێ. بەڵام تفەنگبەدەستەکەی ئێمە بێدەنگ کرابوو. ئیسرائیل بە مردووی بەسەر لادا کەوتبوو. دووکەسی دیکەش کە چەکە نایابەکانیان هەڵگرتبوو، کوژران. ئەوانی دیکەش بە لێخوڕەکەشەوە بریندار کران. شوفێرەکە لە چەناگە و قۆڵەوە پێکرابوو، بەخوڕ خوێنی لەبەر دەڕۆیشت. بەڵام لەگەڵ فەرمانی (گاد) بۆ کشانەوە، خۆی هەڵدابووە پشت سووکانەکە. هێشتاش کە هەر گولله دەبارین، بەبێ گوێدانە خوێن و ئازار ترووومبێلە بارکراوەکەی چەک و پیاوەکانی گەیاندە بێستانی پرتەقاڵەکان، کە بنکەکەیان لەوێ بوو.

ڕۆژنامەی ژێر زەمینیی ئالف ئەل پیت[86] لەسەر ئۆپەراسیۆنەکەی نووسیبوو، دوای ئەوەی باسی گیانفیدایی سێ پیاوەکەی کردبوو، کە لە چالاکییەکەدا گیانیان لە دەستدا بوو، پاشان بەسەر ئەو خۆپەسەندانەی ئیسرائیل هاوار کردبوو، کە دەیانتوانی ژیانی ئەو گەنجانە لە قوربانیدان ڕزگار بکەن، دەق نووسیبووی: "ئەگەر ئەوان ڕێژەیەکی زۆر کەم ببەخشەنە سووپای ڕزگاری لەوەی کە خۆبەخشانە دەیدەنە چەوسێنەرە بیانییەکان، ئەگەر ئەوان زوو دەستبەرداری ئیرادەیان نەبن، ئێمە ئەو چەکە خوازراوانە بەدەستدێنین کە بۆ خەباتەکەمان چارەنووسازە و کارێکی واش دەکا بەرخودانەکە ئاسانتر و بێوەیتر تێپەڕێ."

سێ لە پیاوەکانمان لە مەیدانی شەڕ کوژرابوون، سێ؟ کاتێکیش پیاوەکان لە بێستانی پرتەقاڵ بەئارامی بەخۆیان دادەچنەوە، بۆیان دەردەکەوێ بێجگە لەسێ کوژراوەکان، یەکێکی دیکەشیان دیار نییە. پێیان وابوو ئەویش

---

[86] ئالف ئەل پیت واتای-هەر چەندە-دەگمێنێ.

کـوژراوه. بەڵام ئەو نەکوژرابـوو. ئەو بە تفەنگـی سـتێنەکەی لە کـاتی بـارکردنەکە پاڵپشـتی دەکـردن، بەسـەختی برینـدار کرابـوو و هەر لەوێشـدا کەوتبوو. ناوەکەشی دۆڤ گرەنەر بوو.
لەوێدا درامـایەکی پاڵەوانـانە بـۆ ئەو برینـدارە بەڕێوەچـوو، شـتێکی بێـوێنە، نەوەک بە تەنیـا لە سـاڵنامەی ئـێمەدا بەڵکـو لە مێـژووی مرۆڤایەتیشـدا، سەرباری هەموو هەوڵەکانی ئێمە بۆ ڕزگارکردن، ئەوپەڕی ژان و ناسۆر و قوربانیدانی بەخۆوە بینی. ئێمە دەمانەویست ڕێ لەو پیاوانەمان بگرین کە بۆ بەر پەتی سێدارەیان دەبـردن؛ ئێمە زۆر قێزمـان لەوە دەبووە لەبـری ئەوان گیراوە بەریتانییەکان هەڵبواسینەوە. ئەوەش وەنەبێ هەر بە تەنیـا (ئۆشـوا) لە سـەربازگەی سـارفانددا فەرمـانی بەسـەر گیـراوە بەریتانییەکانـدا کـرد، بەر لەوەی فتیلەی تەقەمەنیەکەی ئاگردا، ئەوان تـا پێیـان دەکرێ بۆ ڕزگارکردنی گیـانی خۆیـان ڕا بـکەن؛ زۆر جـاران ئـێمە بەریتانیمـان بە دیـل گرتـوون، سێرەمان لێگرتـوون، لێ هەر لەو کاتەی دەسـتیان بەرزکـردۆتەوە و خۆیـان بەدەستەوە داوە، لای ئێمە بە پیرۆز و متمانەوە سـەیر دەکران و لە هەمـوو ئازارپێگەیانـــدنێکیش بەدوور دەگیـــران. بـــۆ بەدواداگەڕانـــی چەک و بەدەسـتهێنانی، لە تەلئەبیبـدا بەسـەر سـەربازگەیەکمان دادا. سـەروبەری چـل سـەربازمان بەدیـل گـرتن. ئەوانیش لێمـان پـاڕانەوە، وایـان جـاڕدا، دۆسـتی جووەکـانن. پیاوەکانیشـمان ڕاشـکاوانە پێیـان گـوتن بـا خۆیـان گەوج نەکەن؛ ئەوان هەنـووکە لەبـن دەسـتی سـەربازە شارسـتانییە عیبرییەکـان دان، کە هەرگیز ئازاری دیلەکانیان نادەن.
بەڵام خـۆ بـۆ ئـێمە ڕوون و ئاشـکرا بـوو، هەروەک چـۆن بـۆ حکـوومەتی بەریتـانیش هەروا بـوو، کەوا دوای جاڕدانەکەی 1944 پێمـان ڕاگەیاندبوون، ئێمە بە هەمـوو شێوە هێزێکی بەردەستمان دەجەنگین تـا وەک سـووپایەکی ژێرزەمینـی بناسـرێین، خـۆ ئەگەر دەسـەڵاتدارە بەریتانیەکـانیش هۆشـداریە بەردەوامەکەی ئـێمە بەهەنـد هەڵنەگـرێ، ئەو پیـاوانەی ئـێمە کە دەکەونە بەردەستیان هەڵبواسێ، ئیدی گیراوەکانی ئەوانیش لەبەردەستی ئێمە تووشی هەمان چارەنووس دەبنەوە.
لە یانیوەری 1947دا دۆڤ گرەنەر بردرایە بەر دادگایەکی سەربازی. ئەویش لە جاڕنامەیەکی جەرگبڕ، بەڵام ژیربێژییانە و شکۆمەندانەدا بە ئەفسـەرەکانی

دادگاکەی گوتبوو، ئاخۆ بۆچی ئەو مافی دادگایی کردنەکەی لەمەڕ ئەوان ڕەتدەکاتەوە. بەریتانیا وەک ئەو گوتبووی، ئەرکە پابەندبووەکانی خۆی کە بە تەنیا لە ئێرتز ئیسرائیلدا زاڵە، بەلاوە ناوە. لەجیاتی ئەرکە سەرەکییەکانی بەریتانیا بڕیاری لیبراوانەی داوە، ولاتەکە بکاتە بنکەیەکی سەربازی تا خەڵکی جوولەکە بڕوتێنێتەوە. ڕوونکردنەوەی ئەو وابوو:

"هیچ شتێک بە بنەمای ڕەوایی بۆ دەسەلاتداریتی ئێوە نەماوەتەوە، ئیدی هەموو شتێک تەنها لەسەر یەک سەرەتا ماوەتەوە: ئەویش هێزی دڕندانەیە. لوولەی تفەنگ و سەرەنێزەی تۆقاندن خۆی لە بن بەرگی قانوندا شاردۆتەوە. ئەو قانونەش لە لایەن هەڵگرانی سەرەنێزە و لوولەی تفەنگەکان دارێژراوە؛ بە پێچەوانەی خواستی دانیشتوانە خۆجێییەکان و بە پێچەوانەی قانونی نێودەوڵەتیش. ڕێسایان بۆ دیاری دەکەن و لە مافە هەرە سەرەتاییەکانیشیان بێبەش دەکەن.

"هەر لەبەر ئەوەشە ناتوانم ڕەوایەتی بۆ دادگایی کردنم بسەلمێنم. ئاخر ڕێسایەکی کۆنینەی ڕۆمانەکان هەیە: هیچ کەس ناتوانێ زیاتر لەو مافەی خۆی هەیەتی بیداتە کەسێکی دیکە. کاتێکیش خۆتان و هەموو ڕژێمەکەتان داگیرکەرێکی ناڕەوا بێ، ئاخر چی وای لێکردوون ئەو هێز و دەسەلاتەتان هەبێ تا منێک، هاوولاتییەکی دیکە لە خاکی داگیرکراوی خۆیدا دادگایی بکەن.

"کاتێک ڕژێم لە هەر ولاتێکدا ببێتە ڕژێمێکی چەوسێنەر، ڕەوایەتی لە دەست دەدا. ئیدی ئەوە مافی هاونیشتمانیەکانی ولاتەکەیە- لەوەش زیاتر، ئەرکیان وایە- دژی سەرەونخوونکردنی ئەو ڕژێمە بجەنگنەوە. هەر ئەو شتەشە کە گەنجە جووەکان پێیهەڵدەستن و بەردەوامیش دەبن تا ئێوە دەڕۆن ولاتەکەش بگەڕێتەوە دەست خاوەنە ڕەواکانی، کە گەلی ئیسرائیلە. بۆ ئەوەش هەقە ئێوە بزانن: هیچ هێزێک لە دنیادا نییە بتوانێ ئەو پەیوەستیەی نێوان گەلی ئیسرائیل و ولاتە تاقانەکەی خۆی بپچڕێنێ. ئەو کەسەش هەوڵێکی لەو جۆرە بدا، دەستی دەبڕدرێتەوە و بۆ هەتا هەتایەش دەکەوێتە بەر نەفرەتی خودا."

کاتێکیش سێ ئەفسەری بەریتانی کلاوەکانیان خستەسەریان، یەکێکیان بە دۆڤ گرەنەری گوت تا گیانی دەردەچێ بەملەوە بەسێدارەوە هەڵدەواسرێ، دۆڤیش بە گۆرانی هاتیکڤا وەلامی دایەوە.

جارێکی دیکە هۆشداریمان دایەوە دەسەڵاتدارە بەریتانییەکان؛ ئەمجارەیان بەو دەستەواژانەی خوارەوە:

"لەسێدارەدانی دیلێکی جەنگ کوشتنێکی بە ئەنقەستە. ئێمە ڕژێمی بەریتانی لە ڕژانی خوێن لە بەرامبەر ئەو تاوانەی دەیکا، ئاگادار دەکەینەوە."

ئێمە نیازمان بوو دەمودەست هەروەک چۆن لە دۆزی ئاشبیل و شیمشوندا کردمان، دەستبکەینەوە. بەڵام بە بڕیارەکەی خۆشماندا چووینەووە. ئاخر بڕیاری لەسێدارەدانەکە خرابووە بەر پەسەندنامەی سووپاسالاری بەریتانی. کەسانێکی گرنگ بە ئەفسەری پاشکۆی ئێمەیان گوتبوو، ئەوان بڕوایان وایە بڕیارەکەی گرەنەر جێبەجێ ناکرێ. ئەوان چەندان هۆکاریان هێنابووەوە. یەکەمین شت ئەو ڕیکۆردێکی باشی وەک ئەفسەری بەرەی پێشەوەی جەنگ لە سووپای بەریتانیدا هەبوو. دووهەمین شتیش ئەو بە سەختی برینداری کراوە. لە کۆتاییشدا، حکوومەتی بەریتانی داخوازە لە لێکەوتە نەخوازراوە توندەکانی ئەو جۆرە لەسێدارەنەدانە دوور بکەوێتەوە.

هەڵبەتە ئێمە بەتەواوی پشتمان بەو لێکدانەوەی بەرەنجامەکان نەبەستبوو، لێ بەدڵنیاییشەوە باندۆری لەسەر بڕیاری ڕاگرتنی نەخشەی هەڵواسینەکانی لای خۆمانیشی هەبوو. خۆ ئەگەر هیچ تیشکێک بۆ ڕزگارکردنی ژیانی گۆڤەر بەدی بکرێ، ئێمە کارێکی وا ناکەین ڕەوشەکەی ئەو بە کارێکی نەشیاو بخەینە مەترسی و واش لێکبدرێتەوە، ئێمە زیاتر شکۆی بەریتانی دەڕووشێنین. لە کاتێکدا ئەو شکۆیەیان ڕوون و ئاشکرا کەوتبووە بەر زەبرەکانمان، بە تەماش نەبووین لەپێناو قوربانییە بێ دیفاعەکانمان لێیدا بشکێنین، نەخاسمە هاوڕێکانمان پێویستیان پێمان هەبوو. لەوە زیاتر ئێمە وامان دانابوو، هەر کاتێک حوکمی لەسێدارەدانی گۆڤنەر پەسەند کرا، ئەوا چەند ڕۆژێکمان لەبەر دەستدا دەبێ تا بڕیاری هەڵواسینەکەیان جێبەجێ بکەن.

یەکەمین مەزندە شاش دەرچوو. ئەو سووپاسالارەی لە لایەن دەسەڵاتدارە مەدەنییەکانی سەرووی خۆی ڕێی لێگیرابوو ئاشبیل و شیمشون هەڵبواسێ، ئەمجارەیان ئەو حوکمەی سێ ئەفسەری بەردەستی واژۆیان کردبوو، ئەویش پەسەندی کرد. دووهەمین مەزندەش ڕاست دەرچوو. بڕیاری مەرگەکە سەلمێندرا، هەرچەندە سەلماندنەکەش ئاشکرا نەکرا –لە ڕۆژی

هەینی 25 یانیوەری 1947 لە کاتێکدا ڕۆژی لەسێدارەدانەکە خرابووە سێشەممەی داهاتوو- ڕۆژی لەسێدارەدانەکە لای دەسەڵاتداران. ئێمە لە ڕێی سەرچاوە زانیارییەکانمان سەلماندنی حوکمەکەمان لە ئێوارەی ڕۆژی هەینییەوە زانی. ئیدی دەمودەست فەرمان بۆ گرتنی ئەفسەرە بەریتانییەکان دەرچوو. لە ڕۆژیی شەممەدا هۆبەی ئۆرشەلیمان میجەر کۆلینس، ئەفسەرێکی هەواڵگری بەریتانییان دەستگیر کرد. هەوڵی دەمودەستی لێگەڕانی دەسەڵاتداران بۆ دۆزینەوەی ئەفسەرەکە بێهودە بوو. بەڵام ژەنەڕاڵ بارکەر هیچ لێدوانێکی نەدا. ئێمە وەک بەرەنجامێک ڕۆژی دواتر دەستبەکاربووینەوە. پیاوەکانی ئێمە بەسەر دادگایەکی تەلئەبیبیان دادا و دادوەر جەستیس ویندهامیان قۆڵبەست کرد. چەند سەعات تێپەڕین، ئەوسا ژەنەڕاڵ بارکەر بێدەنگییەکەی شکاند. لەو شەوەدا ڕاگەیاندنێکی فەرمی لە ئۆرشەلیم چاپ کرا، تیایدا ڕایگەیاندبوو کە سووپاسالار بەنیازە بۆ ماوەیەکی نادیار حوکمی لەسێدارەدانی دۆڤ ڕەنەر دوا بخا، بەڵکو ڕێگەی بدا داوانامەیەک بۆ ئەنجوومەنی تایبەت بەرز بکاتەوە. ئێمەش دەبوایە کردەی لەسێدارەدانەکەمان بۆ کەمێک زیاتر لە دوازدە سەعات دوا خستبا.
بۆ ڕۆژی پاشتر، کۆمسیاری باڵای بەریتانی نوێنەرەکانی ئاژانسی جووەکانی خڕکردەوە و هۆشدارییەکی پێدان. ئەگەر بێت و ئیرگون زڤای لیومی ئەو دوو گیراوەی بەریتانی لە ماوەی بیست و چوار سەعاتدا ئازاد نەکا، ئەوا جاڕی قانونی باری ناکاو دەدرێ. گەف و هەڕەشەکە ترسی خستە دڵی نوێنەرە فەرمییە جووەکان. لە کاتێکدا دوو مانگ دواتر، کتومەت دەستی بۆ چەکی ڕەوشی ئاوارتە و باری ناکاو برد، باری ژێرزەمینی بە بەربڵاوی دژی وەستایەوەوە لەژێر زەبری هەڵمەتە بەردەوامەکان ناچاری کردن کۆتایی بە ڕەوشەکە بهێنن. بەڵام لە یانیوەری 1947دا، چەکەکەیان بەکارنەهێنابوو، تەنها گەف و هەڕەشە بوو. وەک زۆر لە هەڕەشەکانی دیکە، دیار بوو زیاتر بۆ تۆقین بوو لەوەی بە ڕاستی بیسەلمێنن.
دامودەزگا جووەکانیش بە چڕی فشاریان خستینە سەر و سەرکۆنەیان کردین بەڵکو ئەو کەسانە بەربدەین، کە ئەوان ناویان لێنابوون ڕفێندراوەکان. بەڵێن و فشار ئاوێتەی یەکدی ببوون. سەرۆکی رابانیەکان نامەیەکی ڕەوانبێژیانەی بۆ "دڵنەوایییەکەی زایۆن" (ئاخر مێناحیم واتای دڵنەوایی

دەگەیەنێ) نووسی و داوای لێکردم ئەوەی پێویستە بکرێ بۆ ئەوەی بەر بە کارەساتی سەر کۆمەڵگەی جوودا بگیرێ. خانم گۆلدا مایەرسۆن(مەبەست گۆلدا مایەرە -وەرگێڕ) بەرپرسی هۆبەی سیاسی لە ئاژانسی جووەکاندا، گەفی ئەوەی کرد سەرتاپای هاگانا جۆش دەدرێ بۆ شوێنپێهەڵگرتن و دۆزینەوەی ئەو دوو گیراوە ئینگلیزە.

ناتوانم ئەوە بڵێم، ئێمە بە شێوەیەکی تایبەتی کەوتبووینە بن باندۆری ترس یان گەف و هەڕەشەی خانم مایەرسۆن، کە نوێنەرایەتی دامودەزگا فەرمییە جووەکانی دەکرد. دەقاودەق لەو کاتەدا تاقیکردنەوەیەدا ئێمە فێر ببووین بڕیارەکەی خۆمان بەو پەڕی هێورەییەوە هەڵبسەنگێنین. ئێمە بە وریاییەوە هەلومەرجەکەمان بەهەند هەڵگرتبوو. بۆ ئەو کات توانیبوومان گرەنەر لە سزای مەرگ ڕزگار بکەین. ئێمە بەو ئاکامە گەیشتبووین، دوای ڕاگەیاندنی هەڵپەساردنی حوکمی لەسێدارەدانەکە، هیچی دیکەمان بە هێشتنەوەی ئەو دوو دیلە بەریتانییە دەست ناکەوێ. هەروەها لایەنە تەکنیکەکەش کاریگەری لەسەر ئێمە هەبوو، ئەوەش بۆ خۆی شتێکی گرنگ بوو. کۆلینس لە شوێنێک بەندکرابوو کەم تا زۆر سەلامەت بوو، هەرچەندە دۆزینەوەی ئەو لە لایەن بەریتانیەکان یان هاگاناوە ئەگەرێکی ئاسان نەبوو، بەڵام بەڕێز ویندهام کە کەسە گرنگەکە بوو، بە شێوەیەکی پەلە و پڕتاو دەستبەسەر کرابوو، ئەو لە شوێنێکی تا ڕادەیەکی زۆر کراوە دیلکرابوو. گەر هاتباو بەریتانییەکان بە ڕاستی ڕەوشی ئاوارتەو باری ناکاویان جاڕدابا، کۆڵان بە کۆڵان و ماڵ بە ماڵ گەڕابان، ڕێی تێدەچوو ئەو کەسە لەو ماڵە بچوکەی تیادا حەشارمان دابوو، بدۆزنەوە.

ویندهام لە بنەماڵەیەکی دێرینەی ئینگلیز بوو، بێگومان گرتنەکەی وای لە حکوومەتی کرێکارانی بەریتانیا کردبوو، حوکمی لەسێدارەدانی گرەنەر هەڵپەسێرێ. لە کۆتاییشدا گرتنی ئەو دوو کەسە ئینگلیزە سەرنجی هەموو دنیای بۆ دۆزی دۆڤ گرەنەر ڕاکێشا. دەسەڵاتدارە بەریتانیەکان کەوتبوونە هەلومەرجێکی سەخت، ڕەوشێکی واش خوڵقابوو سەرتاپای حوکمەکە هەڵبوشێننەوە. ئیدی لەژێر ڕۆشنایی ئەو بارودۆخەدا بڕیارمان دا دوو گیراوەکان، ویندمان و کۆلینس ئازاد بکەین.

بەڕێز ویندهام بە پێچەوانەی ئەفسەرە گیراوەکانی دیکە، جوامێرانە ڕەفتاری نواند. ئەوان بەڵێنی شەرەفیان پێدابووین، لەگەڵ ئازادکردنیان هیچ شتێک دەربارەی ئەوەی بینیبوویان یان بیستبوویان نەدرکێنن. کەچی کە بەردران ڕاستەوخۆ پۆلیسیان لەگەڵ خۆ هێنابوون، چووبوونە سەر گرتووخانەی ڕافیا و ئەو دوو پیاوەی ئێمەیان بۆ پۆلیس دەستنیشان کردبوون، کە لە کاتی گیرانەکەیاندا پاسەوانێتیان لێدەکردن. هەر دوو کەسەکەش لە لایەن دادگای سەربازی بە پازدە ساڵ حوکم دران. یەکێک لەوان، ئامرام دارای یەمەنی بوو، لە دادگاکەیدا توانیبووی قسەی حەق و ڕەق بە دادوەرەکان بڵێ، لە کاتێکدا دەسەڵاتداران پێیانوابوو ئەو ڕەشئەسمەرە کەسێکی نەخوێندەوار و هیچ نەزان و بەرابیە، چاوەڕوانی ئەوەیان لێنەدەکرد ئەوە بەدادوەرەکان بڵێ کە پێی گوتبوون. کابرا، جووە یەمەنییەکە و هاوڕێ زیندانییەکەی بە حوکمەکەی سەریان پێکەنیبوون، ڕایانگەیاندبوو: "ئەرێ بە ڕاست ئێوە لەو باوەڕەدان تا پازدە ساڵی دیکە هەر لەو وڵاتە بمێننەوە؟" بە ڕاستیش نە هەواڵگەیەنەران و نە دادوەرانیش بەو کارە ناپاکیەی ئەفسەرەکانیان دڵخۆش نەبوون، لێ ئەوان هەر دوای ساڵێک ئەمەیان بۆ دەرکەوت.

بەڕێز ویندهام دەیزانی لە کوێ بەندکراوە. ئەوانەی ئەویان گرتبوو، لەبیریان چووبوو چاوەکانی ببەستن. ئەو هەم ڕێگای هاتن و هەم خانووەکەشی دیتبوو. لەگەڵ ئەوەشدا دوای ئازادکردنی هیچی نەدرکاندبوو.

بەڕێز ویندهام پیاوێکی چاک بوو. پیاوەکانی ئێمەش وەک هەموو دیلەکانی دیکە بە باشی ڕەفتاریان لەگەڵ کردبوو. ئەویش ئەوەی ڕەتکردەوە ئەو ڕەفتارە باشەی پیاوەکان بە ناپاکی وەڵام بداتەوە. ئەو مێملێکی شەرەفمەند بوو.

دوای ئازادکردنی ناوبراو، چیرۆکی خۆش و سەیروسەمەرەیان لە بارەوە بڵاو بووەوە. هۆکاری گرتنی ویندهام، وەک چیرۆکەکە لەسەری دەڕۆیشت، ئەوە بوو کە مێجەر کۆلینس سووربوو ببرێتە بەردەم دادوەرێکی بەریتانی. کاتێکیش قانونی بەریتانی داخوازە هەموو تۆمەتبارێک بخرێتە بەردەم دادوەرێکی بەریتانی لەبری کەسێکی "خۆجێی". ئیدی قانونەکە ئیرگونی وا پابەند کردبوو، نەیدەتوانی خۆی لێلابدا، هەر بۆیە لەسەر خواستی خۆی دادوەر ویندهامی بۆ برد.

دەمودەست، هەر دوای گرتنی کۆلینس و ویندهام دەسەڵاتدارانی بەریتانی فەرمانیان بە کاربەدەستانی خۆیان کرد کە بگوێزنەوە شوێنێکی تایبەتی ئاسایش، کە شوورەی تەلبەند و پاسەوانی چڕوپڕی هەبێ. تەنها لەو بارە ڕێگە بە بەڕێوبەرایەتی دەدرا لە شوێنەکەی خۆیان دەربچن، کە بە کاروانی ترومبێلەکانیان بڕۆن بە شێوەیەکی باشیش بە هێزی چەکدار پاسەوانی بکرێن. کەواتە ئەوان ڕۆژانە بەترس و لەرزەوە بۆی دەردەچون و شەوانیش دەبوایە لەو شوێنە هەراسانەکانیان بمابانەوە. هەرگیز نەبووە لە هیچ وڵاتێکی داگیرکراودا، دەسەڵاتی داگیرکار ئاوا لە قوژبن بپەسترێ. هەروەک ئامرام دارا بە دەسەڵاتدارانی گوتبوو، ئەوان وڵاتیان کردۆتە زیندان و خۆشیان لەنێودا بەند کردووە.

لێ ئێمە خەمی کەممان لە گێتۆکانی حکوومەت دەخوارد. ئاخر دەمانزانی چارەنووسی دەسەڵاتدارێتی ئەوان لە وڵاتدا ختم کراوە. دڵمان هەر لە کوتەکوت و مەڕاق بوو بۆ دۆڤ گرەنەر، چونکە ژیانی لەسەنگی مەحەک دابوو، لە کاتێکدا حکوومەت لە سەروبەندی نەخشەی جووڵانەوەی کردەیەکی دیکە بوو. ئەوان بەنیازبوون لەسێدارەی بدەن، بەڵام وایان بڕیاردابوو جارێ کات بەدەست بێنن، تا ئەو باهۆزەی بەهۆی دۆزی دادگاییکردنەکەی کە بە فراوانی تەنیبووەوە، بنیشێتەوە و بەڵکو گرژی نێوان هاگان و ئیرگونیش لەو نێوەدا بەرەو زیادبوون بڕوا.

لە بەرایی فێبریوەریدا لەنێو پەرلەمانی بەریتانی مشتومڕێک لەسەر فەلەستین پەیدابوو. ئیرگون و دۆڤ گرەنەر ببوونە چەقی بازنەی باسوخواسەکانیان. دیسان وینستن چەرچڵ داوای کشانەوەی هێزەکانی بەریتانیای لە فەلەستین کرد، چونکە مانەوەیان لەوێ هیچ خزمەتێک بە ئامانجە ستراتیژیەکانیان ناکا، بەڵکو مانەوەیان هەر لە باجی خوێن و خەرجی خەزێنەیان زیاد دەکا. دیسان داوای کرد دەست لە مانداتی فەلەستین هەڵبگرن و ئەگەر وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش لەگەڵیان ملی نەدایە بەرپرسیارێتی فەرمانڕەوایی وڵاتەکە لەئەستۆ بگرێ، ئەوا مانداتەکە ڕادەستی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بکەن. بەڵام بەشی هەرە زۆری وتارەکەی دەربارەی بێزاری و سەرزەنشتکردنی سیاسەتی "نەرموشلی حکوومەت بوو لە بەرامبەر تیرۆرستەکاندا".

"ئەوە زۆر ڕوون و ئاشکرایە،" چەرچڵ وای ڕوون کردەوە، "ئەوەی ئێستا لە فەلەستین ڕوو دەدا، ئازارێکی زۆرمان لە سەرتاسەری جیهان پێدەگەیەنێ... من ڕقم لەو شەڕە دەندووکەیە لەگەڵ جووەکان. من ڕقم لە شێوازی تووڕەییەکەیانە. بەڵام ئەگەر ئێوە تێوەگلاون، هەر هیچ نەبێ وەک پیاوان بەرگەی بگرن." ئەو گوتی، حکوومەت ڕایگەیاندووە حوکمەکەی سەر دۆڤ گرەنەر رابگرێ تا بۆ داواکارییک بۆ بەردەمی ئەنجوومەنی تایبەت بەرز بکرێتەوە. ئەوەش خۆی لە خۆیدا پاکانەیە. ئاژانسی جووەکانیش هێنرایە سەر خەت، بەڵام پیاوە بڕیار لەسەردراوەکە واژۆکردنەکەی ڕەتکردەوە. هەڵوێستی پیاوەکە هەرچەندە تاوانبارانەیە، نابێ لە تێبینیەکانی پەرلەمان دەرچێ. هەرچی دەربارەی ڕووبەڕووبوونەوەی گەفی تیرۆریستەکانیشە، چەرچڵ وای بە ئاکام گەیاندبوو، حکوومەت ئەو هێزەی نەدۆزیوەتەوە، قانونە بەڕێوەچووەکەی بسەپێنێ.
مەبەستەکەی ئەو ڕوون و ئاشکرا بوو. دەبوایە گرەنەر هەڵواسرابا، درەنگیش بکرێ باشترە لەوەی هەر نەکرێ. ئەم هەستەش لای یاریدەدەرێکی خۆی ئۆلیڤەر ستانلی بەم جۆرە سەدای دایەوە:
"لە هەر دوو ئەو ڕووداوە دووایییەی ڕفاندندا،" ستانلی بوو وای گوت، "کتومت حکوومەت ئەوەی کرد کە تیرۆرستان وەک ئاکامێکی تۆڵەکردنەوەیان داخوازی بوو. بۆ ئەوەی ئەو وڵاتە زیاتر شەرمەزاریی زیاتری لەو جۆرەی بەخۆوە نەبینێ، پێمباشترە ڕوون و ئاشکرا لە فەلەستین دەربچین و بە جیهانیش بڵێین، ئێمە چیدیکە توانای ماندایتی ئەوێمان نییە."
ئاماژەکردن بە "پەرەسەندنە هەرە خەمناکەکە" کە مەبەستی چەرچڵ لە حوکمی مەرگی سەر گرەنەر بوو، ئەویش ڕفاندنی ویندهام و کۆلینس و ئازادکردنیان بوو بە جۆرێک لەسەر نیەت باشی تیرۆریستیەکان، لە کاتێکدا حکوومەت نەیدتوانی بیاندۆزێتەوە یاخود هیچیان بداتە دەست دادگا، بۆیە ستانلی سەرنجی ئەوەی دا: "من بڕواناکەم لەژێر ئەو سەر هێڵانەدا حکوومەتایەتی لە فەلەستیندا بکرێ. هیچ دەسەڵاتێک خۆی لەبەر زەبری وا ناگرێ." لە کۆتاییشدا دوای باسک بەهێزی سیاسەتی کرد، کە وەک تاکە مەبەستێکی ڕووبەڕووبوونەوە بۆ دەسەڵاتداریتی حکوومەت ببێتەوە.

ئەم هێرشــەی کۆنســەرڤاتیڤان هەنــدێ لە خەمبــارێتی وەزیــری دەرەوەی کەمکردەوە و خستیە بارێکی حەپەساوی دەست لێشوراو، کە بڵێ: "ئێمە هاوبەشی هەستی سووکایەتییەکەین." لەوەش زیاتر لەسەری ڕۆیشت، "ئێمە ئاگامان لەوەیە شکۆی بەریتانییەکانێ لە لایەن کردەی تیرۆرستانە پەلامار دراوە."

ئەو بەردەوام بــوو لە گـــوتە جۆربەجـــۆرە دژ بە ڕاســـتیەکان، بەوەی سووپاسالار بڕیاری هەڵواسینەکەی هەڵپەساردووە نەوەک لەبەر کردەی ڕفاندنەکان، بەڵکو لەبەرئەوەی پارێزەرەکەی دۆڤ گرەنەر خەریکی ئەوە بوو واژۆی ناوبراو بخاتەسەر داوانامەکەی بۆ ئەنجوومەنی تایبەت، ئیدی لەم ڕۆژەشــدا لەبەر "هەرای نێــو گرتووخــانەکە" نەیتوانیبــوو بیگــاتێ.. ئەم چیرۆکەش هەر لە سەرەتاوە تا کۆتاییەکەی هەڵبەستراو بوو. لێ دوای مشتومڕەکەی گریچ –جۆنز و بێڤن و بارکەر بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە ئەوان "پیاون" و دەستوبازوشیان لە هی چەرچڵ و ستانلی بێهێزتر نییە.

لەو ڕۆژانەدا من بە قووڵی بیرم لە و پیاوە پاڵەوانانە دەکردەوە کە بەدیار مەرگەوە لە چــاوە زینــدانییەکانی خۆیــان چــاوەڕوان بــوون. ئەرێ ئەو ڕەفتارەیان لە ئازایەتی مەیدانی جەنگ جوامێرانەتر نەبوو؟ لەوێدا هیچ وەڵامی ئەم پرسیارە نەدرایەوە. بەڵام بە دڵنیاییەوە هێڵێکی ئایرکردنەوە لە نێوان دوو تامی ڕەفتارنواندن کێشرا. ئەو خۆبەخشانەی بۆ مەیدانی شەڕ چــوون، ئەو ســەربازەی لە جەنگــدا ســەری نــایەوە، بەســەر داخــوازی خۆرکێفکردن دا زاڵ بوو بەوەی وەڵامی هەستێکی خۆماکی دیکە بداتەوە، ئەویش هەستی خۆماکی دڵسۆزی و وڵاتپارێزی بوو. خۆبەدەستەوەدانی یەکێک بۆ ئەوی دیکە بۆ خۆبەخشەکە ڕێگەچارەی سروشتی نەبوو. خۆبەخش یاخود یاخیبوو، ئەو کەسەی بەخۆی بڕیار لەسەر ڕێسای جۆشدانی خۆی دەدا، لێبژاردنێکی سەربەستانەی هەیە، ئەو لێبژاردنەش ناکرێ بگیرێتە بەر مەگەر لەوێدا نەجیبزادەیی گیان و ورە، چۆنایەتییکی مرۆ کە پێی دەگوترێ "ئازایەتی" لە گۆڕێدا نەبێ.

بەڵام سەرباز بەخۆی ئەو چەکەی لەشانیەتی دەچێتە شەڕ، زۆر جاریش وایە لەتەک هاوڕێکانیدا ئەوکارە دەکا. لە دڵی ئەو کردەوە هاوبەشەدا مەشخەڵی برایەتی گڕ دراوە. لەم جەنگدا خولیایەک هەیە، کە بەشێوەی نەستیش بێ،

کاریگەریی قووڵی بەسەر سەربازەکەوە هەیە. ئاخر هاورێی لە دەستە چەپ و ڕاستدا هەن، چەکەکەی ساز و ئامادەیە، ئەو بە تەوژمێکەوە لە دوژمن دەچێتە پێش و خۆی لە مەیدانی جەنگدا دەبینێتەوە، کە لە مەیدانیشدا دەکەوێ، وادەکەوێ کە گیانی بدرەوشێتەوە، بە ئاستەمیش هەست بە کاریگەریی دەستی فریشتەی مەرگ دەکا.

لە سەرێکی دیکەشەوە، دەربارەی ئەو پیاوەی، کە حوکمی مەرگی بەسەردا دراوە، ئەو هیچ دوژمنێک لە پێش خۆیدا نابینێ. دوژمنەکەی لەپشت دەرگا داخراوەکاندایە، چاوەڕوانی نێچیرەکەی دەکا... ئاخر لەوێدا هیچ بریقوباقی نەمرێتی جەنگ لەگۆڕێدا نییە، هیچ باهۆزی پەلاماردرانیش نییە. لەوێدا تەنها هزر هەن، بیرکردنەوە لە کات کە لەگەڵ چک چکەی هەر چرکەژمێرێکی سەعاتەکە خێرا تێدەپەڕێ. ئەو بیرکردنەوانەش کات بەزێنن. ڕۆژەکان درێژن، شەوانیش درێژتر. ئاخر کاتی زۆروزەوەند بۆ بیرکردنەوە بەدەستەوەیە. لەوێدا شتێک و کەسێک دێتە پێشەوە. دەنگی پیرە دایک دێ، دەنگی برا بچووکەکە لە دوورەوە دێ، ئەو دەنگانە بە ڕەوانی دەبیسترێن. ئەو جلە قرمزیانەی کە ئەو پیاوەی لەسێدارەیان دەدا، کردوویەتیە بەریان، شتێکن بەردەوام پۆشیویەتی، هەمیشەش ئەو کاتەیان بەبیر دێنێتەوە کە ماویانە، ئەوەیان بیردێنێتەوە، کە ئەو ڕۆژەی لەپشت زیندانەکەوە هەڵدێ، شەوەکە راونانێ، بەڵکو تا دێ کاتی کۆتاییان نزیکتر دەخاتەوە. لێرەدا هیچ شتێک لە خۆماکیی خۆپارێزی زیاتر مایەی سەر بۆدانەواندن نییە. ئیدی ململانێیەکی نەخۆشهێنەر لەگەڵیدا بەردەوام دەستەویەخەیە؛ هەموو بەیانیەک، هەمو سەعات و هەموو خولەکێک لەگەڵ هەر دانیشتن و هەڵستانێکدا لەگەڵ هەموو شەقاوێکی چاوە زیندانیە تەنهاییەکەیدا لەگەڵیدا دەستپێدەکا و دەمێنێتەوە. وەنەبێ هەموو کەسێک، تەنانەت سەربازی زۆر ئازاش، بتوانێ لەو تاقیکردنەوەیە دەربچێ.

سەربازەکانی ئیرگون بە ئارامی بەرگەی ئەوەیان گرت.

## بەندی 19
## بژاردە
## ٣٩٤ - ٤٠٤

چەند مانگێک بەسەر گرتنی دۆڤ گرەنەر رابرد. ئەو بەسەختی لە شەویلاگی بریندار کرابوو. چەندان نەشتەرگەری بۆ کران و ژان و ئازارێکی زۆری کێشا. کەچی نەوەک هەر دوژمن بەڵکو دۆستەکانیشی بە ئازایەتی و بێباکی و خۆرکێفکردنی گیان و ورە بەرزییەکەی سەرسوڕمان کردبوو. جارێکیان نامرادانە لە ئاکامی ئەو چارەسەرییەی لەوێ وەریدەگرت، دەمانەویست دکتۆرێکی پسپۆڕی بۆ بنێرین، بەڵام ئەو لەسەر بنەمای ئەوەی، ئەو شتە زۆر گران لەسەر بودجەی ئیرگون دەکەوێ، ڕەتی کردەوە. بەدانانی لەو چاوەزیندانەی چاوەڕوانی مەرگەدا، ئەو سەربازەی هێڵی پێشەوە دەستبەرداری هەموو هزر و بیرکردنەوەیەکی خۆویستیانە بووەوە. ئەو نەوەک هیچ شتێکی لە هاوڕێکانی داوا نەکرد، بەڵکو حەزیشی لێنەبوو هیچ لە برادەرەکانی وەربگرێ.

(یۆشۆوا) ئەفسەری ئیرگونی پەیوەندیدار بە گیراوەکانی نێو گرتووخانەکانی بەریتانیا، وەک جەنگاوەرێکی دێرین دەیزانی ڕووبەڕوبوونەوەی مەرگ چ واتایەک دەگەیەنێ، هیچ وشەی وای بۆ نەدەهات تا ئەفسەرە پلە باڵاکانی خۆی لە مەزنێتی ئەو دیاردەیەی لەپڕ بەهۆی دۆڤ گرەنەوە سەری هەڵدا، باس بکا. لە تێبینینامەیەکدا، ئەوێ دەمێ یۆشۆوا وای بۆ نووسیبووم:

"...لە کۆتاییدا ئەو خۆی بوو. من هی ئەوە نیم هەستی بەرگری ئەو لەو ڕۆژانەی دواییدا پێناسە بکەم. پێموایە تەنانەت باشترین پێناسەشم دەرۆستی ئەو کاروانە بەجێیە و ڕەفتارە سەقامگیریەکەی نایەت. دەرەقەتی ئازایەتی ئەو، هی گیان و ورە بەرزییەکەی نایەت. هی ئەو گیانە ئارام و ئۆقرەییەی نایەت. ئاخر ئەو ئامادەی هەموو شتێکە؛ ئەو لەو ڕۆژانەدا ئەوەندە هێورە و نەرموونیانە هەر مەپرسە.

"لەو ڕۆژد کەمانەی دوییدا هەستم کرد ئەو بەتەواوی خۆی داوەتە دەست قەدەری خۆی و پێشهاتەکەی وا قبوولە، کە لێکەوتەیەکی ڕاستەوخۆی

جەنگاوەرێکە لەو خەباتە سەخەتەدا. منیش دەمەوێ پێ لەسەر ڕاستیەکی ڕاشکاوانە دابگرم: لەو هەموو ماوەیەدا هەرگیز ئەو شتێکی بۆ خودی خۆی داوا نەکردووە. ئەو هیچ شتێکیشی نەنووسیوە، تەنانەت بۆ خوشکە دورە وڵاتەکەشی، کە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دەژی. لە سەرێکی دیکەشەوە ئەو بەردەوام لە کاروباری بنەماڵەی بەرخودانەکە (مەبەست ڕێکخراوی ئیرگونە-وەرگێڕ) دەپرسێتەوە.

"ئەمڕۆش دوای پشتڕاستکردنەوەی حوکمەکەی، هیچ شتێک نەگۆڕا. (کازما) کە لای ئەو ئامادە بوو، ڕۆژانەش سەری دەدا و دەیبینێ (ئەو دەکارێ وا بکا) ئەمڕۆ وای پێگوتم: 'ئەمڕۆ لە ڕۆژی یەکەمی هێورترە، خاوەنی ورە و گیانێکی بەرزە.' منیش قسەکانی کازمام بەهەند هەڵگرت، چونکە ئەو لەو شتانە لە ئێمە باشتر تێدەگا. ئەوەش برای پاڵەوانی خێزانە جەنگاوەرەکەمانە. منیش هیوادارم خێزانەکە بتوانێ لەپێناوی دوارۆژ... لەپێناوی بەرخودانەکە ژیانی ئەو ڕزگار بکا.

"لەو بارودۆخە خەمناکەدا، من هەموو هیوایەکم بە خێزانەکەیە. لێ ئەگەر هات و خێزانەکە نەیتوانی ڕێ لە پێشهاتە شومەکە بگرێ، ئێمە ڕووبەڕووی تاقیکردنەوەی جەنگاوەرانی تەواوعەیار دەبینەوە."

ئەم هەستە ڕۆحییەی لە چاوە زیندانی گرتووخانەی ئۆرشەلیمەوە، هەموو جیهانی هەژاند. بەڵام دۆڤ گرەنەر هەمووو شتێکی کە بەسەردا هاتبوو زۆر بە سروشتی وەرگرتبوو، ئاخر لەخۆی گەیشتبوو. کاتێکیش حوکمەکەی سەلمێندرا، گوشاری ئەوەی خرایە سەر داوانامەیە بۆ ئەنجوومەنی تایبەتی بەریتانی واژۆ بکا. ئەو سادە و پوخت گوتی: "نەخێر." ئێمە بەخۆشمان دەزانی ئەو جۆرە داواکارییە ژیانی ئەو ڕزگار ناکا؛ بەڵکو بە پێچەوانەوە لەوانەیە بۆ حکوومەت کارەکە ئاسانتر بکا، دەستبەرداربوونەکەی جێبەجێ بکا. ئەرێ دۆڤ گرەنەر لەوە دەگەیشت؟ ئایا دەکرا لێی تێبگا؟ زۆر دەنگ هەبوون وایان ئامۆژگاری دەکرد، گوایە ئەو داوانامەیە هیوایەکی ڕاستەقینەیە بۆ ڕزگارکردنی. ئەو بۆ خاتری ئەوەی هیوا بداتە بەر گەلەکەی، هەموو ئەو دەنگانەی ڕەتکردنەوە. ئەو تەنها باوەڕی بە یەک فریادڕەس هەبوو، ئەویش پابەند بوو بە کردەی ئێمە. ئێمەش بە دووپاتکردنەوە بۆمان ڕوونکردنەوە،

بڕیاری واژۆکردن و نەکردنی داوانامەکە تەنها و تەنها بۆ خۆی دەگەڕێتەوە.
بژاردەکە هی خۆیەتی، بە تەنیا هەر خۆی.
پارێزەرێکی ناسراوی ئۆرشەلیم چوو لە زیندانەکەدا بیبینێ، بە مکوڕییەوە داواشی لێکرد تا داوانەمەی واژۆ بکا، بۆی ڕوون کردبووەوە، داوانامەکە نەوەک هەر دژی خودی حوکمی بڕیارەکەیە، بەڵکو دژی ڕێسا و قانوونامەی باری ناکاویشە. بێگومان نیازی پارێزەرەکە باش بوو، هەرچەندە ئەو شێوازەی گرتبوویە بەر -وەنەبێ بە بێ خواستی ئەو بکرێ- دەقاودەق لە گۆشەنیگای ڕزگارکردنی ژیانی دۆڤەوە هەڵە بوو. لەو دیدارەدا پارێزەرەکە ئەو کۆدەی ئیرگونەی بەکارهێنا کە دۆڤ دەیزانی، هەر ئەو کاتەش، کە پێی ڕاگەیەندرا ئیرگون داخوازە واژۆ بکا، چونکە بەو واژۆکردنە ژیانی کۆمەڵگەی جوو (یۆشیڤ) لە کارەساتی قانونی باری ناکاو دەپارێزێ، ئیدی ئەو دەم ، ۆڤ داوانامەکەی واژۆکرد. ئەو هەر داوانامەیەکی پێداچوونەوەی واژۆ نەکرد، بەڵکو هێزی پارێزەرایەتی بۆ چوونە نێو داوانامەیەک واژۆکرد، کە بەناوی ئەوەوە دژی قانونی باری ناکاو بوەستێتەوە.
بەر لەوەی بۆ نێو چاوە زیندانەکەشی بگەڕێتەوە، بە پاسەوانەکانی گوت:
"هەستێکی وام لا پەیدا بووە هەڵەیەکم کردبێ."
ئەرێ هێڵە تەریبەکانی مێژوو کەمن؟ شتگەلێکی هاوشێوە-هەرچەندە تەنها هاوشێوە بێ- چەند سەد ساڵێک بەر لە ئێستا و لە ماوەی خەباتی گەلێکی دیکە دژی چەوساندنەوە ڕوویداوە. (ژان دارک) جاڕنامەی دانپێدانانی ئەو دادگایەی واژۆکرد، کە دادگای خۆی پێ کرا؛ دەمودەستیش زانی چ هەڵەیەکی کردووە. لێ کچەکە واژۆکەی خۆی هەڵنەوەشاندەوە، لەوانەشە نەیتوانیبێ وا بکا. دۆڤ گرەنەریش دانی بەو دادگایەی چەوسێنەرەی گەلەکەی نەنا، هێشتا بیست و چوار سەعاتیش تێنەپەڕیبوو، کاتێکیش زانی کە ئەو لە بڕیاردانەکەدا سەربەستە، یەکسەر پارێزەرەکەی دەرکرد و ئەو داوانامە و دەسەڵاتنامەی پارێزەرایەتی دڕاند...
هەڵبەتە، ئێمە هەموومان دوای ڕووداوەکە زانیمان ڕێکاری دادگاییەکە شتێک زیاتر بوو لە عەباپۆشینێکی سیاسیانە. بەڵام ئایا دۆڤ ئەوەی دەزانی؟ دەکرا ئەو بزانێ؟ ئایا نەدەکرا بەشتێکی سروشتی هاتبایە بەرچاو، کە داوانامەکە وەک بنەمای ئەگەرێکی ڕزگاربوونی با لە هەڵواسینەکە؟ لەگەڵ

ئەوەشدا، هەر بەدەستەکانی خۆی، ئەو پارچە کاغەزەی دڕاند، کە پێدەچوو دوا تروسکەی هیواشی بێ. ئەو بە بڕوای تەواوە لەسەر ڕێگاکەی ڕۆیی. ئەو ئامادەی هەموو شتێک بوو، بێجگە لە بنەماکان و ڕێبازەکەی.

ئەرێ پێشینەیەکی مێژووی بەو جۆرە هەڵوێستە لە کوێ هەیە؟

من تەنها یەک نامەی ئەوم پێگەیشت، ئەویش چەند دێڕێکن لە کاغەزێکی پەڕپووت. ئەو نووسیویەتی:

'گەورەم،

'من لە ناخی دڵمەوە سوپاست دەکەم بۆ ئەو هاندانە مەزنەی لەو ڕۆژە چارەنووسیانەدا بە منت بەخشی. تۆ تەواو خاترجەم بە، هەرچییەک ڕووبدا، ئەو ڕێبازەی پێی گۆشکراوم لەبیر ناکەم، ئەو ڕێبازەی وات لێدەکا بەخۆتەوە شاناز و بەخشندە و بەهێز بێ[87]، منیش دەزانم چۆن بۆ شەڕەفەکەی خۆم لەسەر پێ بوەستم، بۆ شەڕەفی سەربازێکی جەنگاوەری عیبری.

'دەکرێ ئەو دەستەواژە زوڵاڵە وەک چۆن کۆپلە لاتینیە بەناوبانگەکە دەڵێ، 'Dulce et decorum est pro partia mori' بەکاربێنم. بەڵام لەو ساتەدا پێموایە ئەو دەستەواژەیە خۆی نەوەک هەر هەرزان فرۆش بەڵکو تەوسداریشە: 'تۆ هیچ دەرەتانێکی دیکەت نییە'. لەوانەیە ئەوانیش لەسەر ئەوە هەق بن.

'هەڵبەتە، دەمەوێ بژیم. ئاخر کێ وای ناوێ؟ بەڵام ئەگەر من لە کۆتایی پێهێنانـدا بەداخەوە بم، ئەوا بە شێوەیەکی سەرەکی لەبەر ئەوەیە بایی پێویست ئامادەکاریم بۆ نەکردووە. دەکرا منیش وا بکەم کە 'ئاینده خۆی خۆی بدۆزێتەوە'، جێی ئەوکارەی گرتبایەوە کە بەڵێنم پێدابوو، یاخود لە هەمان کاتدا وڵاتم جێهێشتبا و ئاسایشپارێزانە لە ئەمریکادا ژیابام. بەڵام خۆ ئەوە وەک جوویێک و بەخاترجەمیشەوە وەک زایۆنستێک دڵنەواییم ناداتێ.

'زۆرن ئەو بیردۆزانەی لە لایەن جووەکانەوە بانگەشەیان بۆ کراوە. یەکیان ئەو تـوانەوەیە (ئاسیمیلاسـیۆن) کە خۆبەدەسـتەوادانی نەتەوەیی و وردەوردەش خۆبەدەستەوەدانی دینیشە، ئەمەش بێ سێ و دوو واتای

[87] ئەمە لەو سرووتە وەرگیراوە کە لە لایەن ڤلادیمیر ژابۆتنسکیەوە نووسراوە:
بە خوێن و بە ئارەقە
نەوە دوای نەوە پێدەگا
شاناز و بەخشندە و بەهێز

خۆکوژی گەلی جوولەکە دەگەیەنێ. دووهەمیشیان ئەوەی پێی دەگوترێ زایۆنیستەکان و ئەو ڕێگایەی لە دانوستانەکاندا پشتیان پێبەستووە، بۆ هەموو جیهان ئەوە کاروباری خەڵکە هیچ جیاوازییکی لەگەڵ ئاڵوگۆڕی بیزنسدا نییە. ئەو خەڵکانەی بەو جۆرە ڕامانە قایلن، ئەوا ئامادەی قوربانیدان نین و بەردەوامیش ئامادەی سازشن، لەوانەشە دەمودەست ئاستەنگی بخولقێنێ، بەڵام سەرەنجام گیتۆکان کۆتایی پێدێنێ. ئەوسا با ئێمە ئەوە لەبیرخۆمان نەبەینەوە، تەنانەت لە گیتۆی وارشۆشدا سێ سەد هەزار جوو هەبوون.

"بە گوێرەیی لێکدانەوەی من ڕێگای ڕاست، هەر ڕێگای ئیرگونە، کە هەوڵی سیاسییانە رەت ناکاتەوە و بەڵام لەیەک گەزی وڵاتەکەشمان خۆشنابێ، چونکە نیشتمانی خۆمانە. خۆ ئەگەر هەوڵی سیاسییانە ئاکامە خوازراوەکەی بەدەستەوە نەدا، ئەوا ئامادەباشی بۆ بەرگریکردن لە نیشتمانەکەمان -کە بە تەنیا مایەی دڵنیایی هەبوونی گەلەکەمانە- بە هەموو ئامانج و داردەستێک لەئارادایە. هەر دەبێ ئەوەش ڕێگای گرتنەبەری جووەکان بێ لەو ڕۆژانەماندا؛ بۆ ئەوەی لەسەرپێ بەرامبەر ئەوەی توشمان دەبێ بوەستینەوە و ئامادەی جەنگ بین و لە هەندێ باریشدا ئەو شتە بۆ سێدارەش سەربکێشێ. بۆ جیهانیش ئەوە دەناسرێ کە نیشتمان بە خوێن ڕزگار دەکرێ.

"من ئەو چەند دێرانە چل و هەشت سەعات بەر لەو کاتە دەنووسم، کە چەوسێنەرەکان دێن تا کردەی بکوژییەکەیان ئەنجام بدەن، لەو ساتانەشدا مرۆ درۆ ناکا. من سوێند دەخۆم ، گەر هاتبا و بژاردەیەکم هەبووبایە بۆ ئەوەی سەرلەنوێ دەستم پێکردبایەوە، هەر هەمان ڕێگام هەڵدەبژاردەوە، ئەمەش بێ گوێدانە ئەگەری لێکەوتەکانی لەسەر مندا.

سەربازی دڵسۆزتان

دۆڤ"

لە کۆتاییدا دوو وادەنەمای لێخۆشبوون درانە ئەنجوومەنی تایبەتی، بەڵام هیچ کامیان لە لایەن دۆڤ گرەنەوە پێشکەش نەکرابوون. یەکەمیان لە لایەن بەڕێز فرانک گرەنەری مامی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکاوە پێشکەش کرابوو. داوانەمەکەش لەبەر هۆکاریی بنەمایی تەکنیکییەوە رەتکرابووەوە.

بەڵام ئاماژەیەک لەو حوکمەدا هەبوو کە 'کۆمەڵگەیەکی جوولەکەی سەرنجڕاکیش' دەکرێ داوانامەیەک پێشکەش بکا بەوەی هانی شارەوانی تەلئەبیب بۆ ئەم کارە بدا. ئەم داوانامەشیان دووبارە ڕەتکرایەوە، هەرچەندە ئەمەش دوای ئەوە ڕوویدا، کە گرەنەر هەڵواسراو گەیشتە کاروانی پاڵەوانە نەمرەکانی مێژوو.

شتێکی دیکە لە هەمان قۆناغەکەدا ڕوویدا، ئەنجوومەنی تایبەتی بەریتانی خەریکی یەکلاکردنەوەی دۆزی کۆمەڵکوژییێکی دیکە بوو لە دابونەریتێکی ئەفسانەیی لە کەناری زێڕینی ئەفریقاوە ڕوویدابوو. چەندان ئەفریقانی بڕیاری مەرگیان بەسەردا درابوو، چونکە ژمارەیەک لە هۆزە نەیارەکەی خۆیان کۆمەڵکوژ کردبوو. پارێزەرەکەشیان داوای پێداچوونەوەی بردە بەر ئەنجوومەنی تایبەت، ئیدی جێبەجێکردنی حوکمی لەسێدارەدانەکە چەند جارێک وەخرێندرا. لە کۆتاییشدا دەسەڵاتدارە بەریتانییەکان ڕێسانامەیەکی نوێیان داهێنا: بەوەی داوانامەیەک بۆ بەردەم ئەنجوومەنی تایبەت کار لە وەخراندنی جێبەجێکردنی بڕیاری حوکمە دراوەکە لە هەرێمی ژێر دەسەڵاتی تاجی بەریتانییدا ناکا.

زۆر هەفتە بەسەر پۆشینی جلی قورمزی مەرگ لە لایەن دۆڤ گرەنەرەوە تێپەڕین. لە کۆتایی ئازاردا ئەو چاوە زیندانییە تەنییایەی شکێندرا. سێ سەربازە گیراوی دیکەی ئیرگونیان خستنە ژوورەکەی، کە یشێل درێزنەر (کە بەناوی دۆڤ ڕۆزنباوم و گیراو حوکمدرا)، مۆردەخای ئالکۆشی و ئێلیزنەر کاشانی بوون. ئەوان لە شەوی قامچیلێدانەکە (حەسیر مەیدانکردنەکەدا) گیرابوون. سێ ئەفسەرەکەی دادگای سەربازی کە کڵاوەکانیان لەسەر کرد، یەکێکیان ڕایگەیاند: "تۆ دەبێ بە ملەوە تا مردن هەڵبواسرێی."

ئیدی هەر سێ حوکمدراوەکە سروودی هاتیکڤایان گوتەوە.

سەبارەت بەوە، ئێمە هۆشداریینامەیەکی دیکەی توندمان دایەوە دەسەڵاردارە بەریتانییەکان. بۆمان دووپاتکردنەوە، شتێکی غەشیم و گەوجانەیە وا بزانن بە کوشتنی چەند دیلێکی جەنگ ورەو گیانی گەنجانی گەل بشکێنن. "هەرگیز لە مێژوودا بزووتنەوەیەکی ڕزگاریخوازی وا بەهێز لەنێو خوێن و تووڕەیی

عیبریدا سەریهەڵنەداوە." ئێمە دووبارە پێمان گوتنەوە لە بری ئەودا ئەوانیش دەبێ باجی تاوانەکەیان بدەنەوە.
لە فێبریوەرییێکی زوودا ڕایانگەیاند، ژەنەڕاڵ بارکەر لە پۆست و پایەکەی نەماوە.
بەلای ئێمە بارکەر، کە هەوڵی داپڵۆسینی گەلەکەمانی دەدا، دوژمن بوو. ئێمە بڕیاری کوشتنی ئەومان دابوو، لێ لە جێبەجێکردنی بڕیارەکەدا شکستمان هێنا. چەندین جار خەریکبوو لە پشت شووره و قەڵای تەلبەندا بیگەینێ و لە کونەکەی خۆی دەریبهێنین، بەڵام هەموو کات بەخت یاوەری بوو دەردەچوو. لە 13ی فێبرایریشدا بە دزییەوە وڵاتی بەجێهێشت. ڕۆژی بەر لە دەرچوونیدا، بڕیاری حوکمی مەرگی دریزنەر، ئالکوشی و کاشانی سەلماند و واژۆی کرد.
سووپاسالارە نوێکەی هێزەکانی بەریتانی، ژەنەڕاڵ ماک میلان ڕایگەیاند، جێبەجێکردنی حوکمی هەڵواسینی هەر سێ گیراوەکە ئەنجام نادرێ تا دۆزی دۆڤ گرەنەر لە بەردەم ئەنجوومەنی تایبەتدا یەکلا نەبێتەوە.
ئیدی تا دەهات قورمزی پۆشانی مەرگ لە چاوە زیندانەکەدا، ژمارەیان زیاد دەبوو. لە ئازاریشدا موشێ باتازانی ئەندامی F.F.I یش حوکمی "هەڵواسین بەمل تا مردن"ی بۆ بڕایەوە. لە سەرەتای ئەپریلیشدا دیسان ئەفسەرە بەریتانییەکان کڵاوەکانیان کردەوە سەر، لە کاتێکدا یەکێکیان ئەو کڵێشە حوکمەی بۆ مایەر فاینستاین کە ئەندامێکی ڕێکخراوی ئیرگون بوو، خوێندەوە. ئەو دوو لاوە بە گوتنەوەی سروودی هاتیکڤاوە بە پیر حوکمە خوێندراوەکەیان چوون.
حکوومەتی بەریتانیی ڕایگەیاند جێبەجێکردنی حوکمی ئەو دوو کەسەش تا یەکلابوونەوەی دۆزی دۆڤ گرەنەر لەلای ئەنجوومەنی تایبەتەوە، بەهەڵواسراوی دەمێنێتەوە.
ئێمە پشتمان بەو بەڵێنە فەرمییەی ئەوان نەبەستبوو. خەریکی دانانی نەخشەیەک بووین کە گیراوەکانمان بەهێز ڕزگار بکەین.
ئەو پلانەی هەڵمان بژاردبوو یەکێ بوو لەوانەی بەهەندمان هەڵگرتبوو. ئێمە نە مەیلمان لێبوو کردەوەیەکی نمایشانە نە ئۆپەراسیۆنێکی خۆکوژیانە ئەنجام بدەین. ڕێکورەوان دەمانەویست هاورێکانمان لە دەستی لە داردەرانی ڕزگار

بکەین. هەرچەندە نەخشەکەشمان لە سنووری مەحاڵ دەخشا، بەڵام هێشتاش دەرفەتێکی سەرکەوتنی هەر تێدابوو. ئاخر ئێمە ئەزموونی خۆشئامێزانەمان لەگەڵ ئۆپەراسیۆنە ئەستەمەکاندا هەبوو. سەرەڕای ئەوەی نەخشەکەمان سروشتێکی سەرچڵیانەی مەترسیداری هەبوو، لێ ملمان دایەبەر.
زرێپۆشێکی بەریتانی خەریکبوو دەچووە حەوشەی زیندانەکەی ئۆرشەلیم، ئەو شوێنەی پیاوەکانی تێدا بەندکرابوون. لەوێدا چەند پۆلیسی بەریتانی کۆمەڵێ بەڵگەنامەی فەرمیان هەڵگرتبوو، کە ڕووبەڕووی بەرپرسانی زیندانەکە کرابوو. یەکێک لەو پۆلیسانە-باشچاوەشێک- دەبوایە بچێتە نووسینگەکە، لە کاتێکدا ڕێپۆشەکە سوڕایەوە و ڕووی لە دەرگایەکە کرد. لەو ساتەدا ئاماژەکە درا، دەبوایە ئەو شەش کەسە حوکم بەسەردراوە، کە ئەو کات لە حەوشەکەدا بوون، وادەی بۆ ڕاهێنانە ڕۆژانەییەکەیان بوو، دەبوایە یەکسەر بازیان دابایە نێو ترومبێلە زرێپۆشەکە و دەستیان دابووایە ئەو چەکانەی بۆ ئەو مەبەستە ئامادەکرابوون. پۆلیسیش بەسەر پاسەوانەکانی دەروازەکەدا زاڵ دەبێ. ڕەشاشە قوڕسەکانی نێو زرێپۆشەکە پاڵپشتێکی زۆر باش دەبوو، لە کاتێکدا بتوانێ بەنێو گوللەباران و پەشۆکاوی کاربەدەستانی ئەوێدا بەنێو دەروازەکەدا تێپەڕێ.
هەموو ئیرگون بۆ ئەم چالاکییە جۆشدرابوو. تەنانەت گیدیش هەرگیز ئەوەندە بە جۆشوخرۆشەوە دەستبەکار نەبووبوو. (یۆول) پێداویستییە سەرەکییەکانی لە کاغەز و بەڵگەنامەی فەرمی بەدەستهێنابوو. فەرماندەیەتی چالاکییەکە لەسەر داخوازی ئەفسەرەکاندا تا ئەوپەڕی وردەکاری لێکدرابووەوە. ...
شیمشۆن و پیاوەکانی بە وریاییەوە چاودێر بوون. ئەوان ئەرکە هەرە قوڕسەکەیان لەسەر شان بوو. ئەوان دەبوایە پێشتر دەستبەسەر ترومبێلێکی زرێپۆشدا بگرن. شیمشۆن ئەو جەنگاوەرە کۆماندۆ کارامەیە، چەندان کاری سەختوئاڵۆزی ئازایەتیانەی ئەنجامدابوون، لێ لەو دۆزەدا دوو مەرج هەبوون دەبوایە بەجێی گەیاندبان. شتێکی چارەنووساز بوو، دەبوایە کردەکەی لە سەعاتەوەختێکی گونجاو و بە ڕۆژی ڕووناک بووایە. هەروەها دەبوایە دەستی بەسەر زرێپۆشێک دابگرتبایە بێئەوەی هیچ زیانێک بەر زرێپۆشەکە بکەوێ، بێ ئەوەی ئەوانەی دەستگیر دەکرێن ئازار بدرێن، هەروەها بێ

ئەوەی ئەوانەی لەنێو زرێپۆشەکەشدان دەرفەتی ئەوەیان هەبێ هەڵبێن یان زەنگی ئاگادارکردنەوە لێبدەن. ئاخر گەر وا نەبووایە ئەوا تۆخمی لەپڕ بەسەردادان و لەخشتەبردنیان و دزەکردنە نێو گرتووخانەکە لە دەست دەچوو، هەموو نەخشەکەش بێهودە دەمایەوە.
ئیدی ڕۆژ بەدوای ڕۆژدا شیمشۆن و دەستەکەی چاودێری ڕێگای سەرەکی ئۆرشەلیمیان دەکرد. چاوەڕوانییەکەشیان بێهودە بوو. زرێپۆش تێدەپەڕێ، بەڵام لە هەموو بارێکدا دەبوایە لەگەڵیاندا بکەوتبانایە تەقە و لێکدان. دەکرا شیشمۆش لەو شەڕەشدا براوە بێ، لێ ئەو کات زرێپۆشەکە زۆر زیانی پێدەگەیشت و بەکەڵکی مەبەستەکەی نەدەهات. ئێمە بێهیوا نەبووین. هاوڕێکانمان کە لە ئۆپەراسیۆنەکە ئاگادارکرابوونەوە، چاوەڕێیان دەکرد. ئەوان ئارامگربوون، بەڵام کێ دەتوانێ بچێتە نێو قووڵایی ترسەکەیان؟ ئاخر کێ دەتوانێ بچێتە قوڵایی مەراقی ئەوانەی دەرەوە- هی ژێرزەمینیی؟ ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش باری وریایی و ئامادەباشی ئیرگون بەردەوام بوو. شەو دوای شەو رادەبوورد و تەنها هیوامان بۆ دەمایەوە.
لە 14ی ئەپریلیدا، گرەنەر، درێزنەر، ئالکۆشی و کاشانی لە ئۆرشەلیمەوە گوێزرانەوە بۆ قەڵا زیندانی عەککا.
نەدەکرا خەیاڵ بۆ ئەوە بڕوا ، کە بەریتانییەکان ئەوانیان بۆیە گواستۆتەوە، گوایە بەنیازی ئێمەیان زانیبێ. ئەوان هیچیان لەبارەی نەخشەکەمانەوە نەزانیبوو. سەرانی دەزگای هەواڵگریان هەر ئەوساتە بەو نەخشە دەزانن، کە ئەم دێرانە دەخوێننەوە. خۆ ئەگەر زانیبایان، ئەوا گیراوەکانین هەر لە زیندانی ئۆرشەلیم دەهێشتنەوە و داویشیان بۆ ڕزگارکەرەکانیان دادەنا.
ئەوان پلانی خۆیانیان هەبوو. ئەوان لەبەرئەوەدا بوون، شکۆ داوەشاوەکەیان چاک بکەنەوە. ئەوان خەریکی نمایشکرن و نیشاندانی دەسەڵاتەکەیان بوون. ئەوان ساتی لەباریان دۆزیبووەوە. دامودەزگا جووەکان دیسان باری جەنگیان دژی جەنگی ژێرزەمینیی ڕاگەیاندبوو. ڕاگەیاندنامەی ناو جەماوەریان بە ڕاشکاوی پێشبینی ئەوەی دەکرد بەو زوانە 'تیرۆرستەکان' لەناوبەرن. ئیدی بەریتانییەکانیش تیشکی سەوزیان بینی.
بەڵام لەسێدارەدەرەکە دەترسا. بۆیە کارەکەی خۆی لە تاریکیدا ئەنجامدا، واتە ئیشەکەی، نەوەک لە ئۆرشەلیمدا بکا بەڵکو لە عەککای دوور. تەنانەت دوای

ڕاگواستنی هەر چوار گیراوەکەش بۆ عەککا، ڕایگەیاند، شتەکە هی خەم لێخواردن نییە. (ستەبس) ئەفسەری زانیاری گشتی حکوومەت لە لێدوانێکی ڕۆژنامەوانیدا ڕایگەیاند، دواخرانی جێبەجێکردنی حوکمی هەڵواسینەکان تا یەکلابونەوەی دۆزی بەردەمی ئەنجوومەنی تایبەت هەر دەیخوا. یاریدەدەری کۆمسیاری باڵای، ژەنەڕاڵ کەنینگهام بە تەلەفون بە پارێزەرەکەی گوتبووی: "بڕوام پێبکەن، ئێمە ئەو کوڕە بەستەزمانە لەدار نادەین."

داواکاری گشتیش بڵاونامەی (ستەبەس)ی پشتڕاستکردەوە، بەرپرسی قەڵا زیندانەکەش ڕاگەیاندنامەی داواکاری گشتی سەلماندبوو، بانگی ماکس کریزمان، پارێزەری کوڕەکانیشی کردبوو کە بچێت و سەردانی بریکارەکانی بکا...

## بەندی 20
## بەڵگەنامەیەکی تراژیدی

٤٠٤ - ٤١٤

لەو باوەڕەدام هیچ پێشینەیەکی مێژوویی حکوومەتایەتی وەک ئەوە نەبوو، کە حکوومەتی بەریتانی لە فەلەستین بڕیاری مەرگی بەوشێوە ترسەنۆکانە و نهێنییەوە ئەنجام دابێ. دەسەڵاتداران پەیمانیان دابوو جارێ چاوەڕێی بڕیاری ئەنجوومەنی تایبەت بکەن؛ کەچی لەخشتەیان بردین. ئەوان رایانگەیاندبوو، هێشتا بڕیاری هەڵپەساردنەکە لەگۆڕیدایە، بەڵام دەستخەرۆیان داین.

ئەوان رێگەیان بە هێلین فریدمان، خوشکی دۆڤ گرەنەر دا، کە لە ئەمریکاوە راهاتبوو، سەردانی برایەکەی لە زیندانی عەککادا بکا، دەشیزانی لەوێ چی چاوەڕێی دەکا.

سی و شەش سەعات دوای گواستنەوەیان لە ئۆرشەلیمەوە بۆ زیندانی قەڵای عەککا، رێسایەکی توندی قەدەغەکردنی هاتووچۆ لە سەرتاسەری وڵاتدا گیرایە بەر. حەفت سەد هەزار کەس لە ماڵەکانی خۆیاندا دەستبەسەر کران. تیپ و هەنگی تەواوی لەشکر بە خۆیان و سەرباز و تانک و زرێپۆشەکانیان دەورەی قەڵا کۆنینەکەی عەککایان دا بۆ ئەوەی دڵنیابن لە گەیشتنی ئەو چوار سەربازە جووە دیلەدا.

لە 16ی ئەپریلی 1947دا، دەیان هەزار کەس لە ئێرتز ئیسرائیلدا لە بەرەبەیانێکی زوو میلی رادیۆکەیان بادا تا گوێ لە هەواڵی نوێی پەخشکراودا بگرن. دەنگی هەواڵخوێنەکە هات: لیا پۆرات بڵاونامەی فەرمی خوێندەوە. بەڵام ئەوە دەنگی جاردەرەکە نەبوو. ئەوە دەنگی ژنێکی جوولەکەی گەنج بوو بە هەنسک و فرمێسکەوە.

"ئەم سپێدەیە لە زیندانی عەککادا، دۆڤ گرەنەر، دۆڤ رۆزەنباوم، مۆردەخای ئالکۆشی و ئێلیازەر کاشانی هەڵواسران."

تەنانەت لە کاتی هەڵواسینەکەشیاندا رێگەیان بە رێورەسمی ئۆلییانەش لە لایەن رابایەنەوە نەدرا.

دیاربوو دۆڤ گرەنەر هەموو چۆنایەتییکی جوامێرانەی گیانی مرۆڤایەتی بە جۆش هێنابێ. لە ئێوارەی جەژنی قیامەتدا، کە ئاوسبوو بە یادەوەری، کاتێ هەموو بەندکراوەکان و بەخۆیان و پۆشاکی سووری مەرگەوە لە بەردەم مێزێک دانیشتبوون و رابییەکەش لە زیندانی عەککادا هەقایەتی ئیکسۆدۆسی[88](کۆرەو) بۆ دەخوێندنەوە. دۆڤ رەنەریش چەند جارێک لە چاوە زیندانەکەیدا کورسیەکەی خۆی دابوویە دوو پاسەوانەکانی زیندان. ئاخر ژووری زیندانەکە زۆر بچووک بوو، شوێنی دانیشتن بۆ پاسەوانەکان نەدەبوو، ئیدی دۆڤ گرەنەر لە دوا ئێوارەی جەژنی قیامەتدا، کە مەرگ مێوانی دەبوو، بە شیوەیەکی میواندۆستانەی ئاسایی و نەریتیانە رەفتاری نواند، شوێنی خۆی دەدایە ئەو دوو پاسەوانە بێگانەیە کە لەسەر سەریەوە وەستابوون و نوێنەرایەتی دوژمنەکەی بوون...

کاتێکیش خۆی رووبەرووی دوژمن بووەوە، ئێمە یاخیبوێیکی نەشلەژاومان بینی. لە چاوە زیندانییەکەی مەرگ لە قەلای عەککادا، ئەفسەرە بەریتانییەکان بڕیاری حوکمی مەرگی سەلمێندراوی سووپاسالارەکەیان بۆ خوێندەوە. ئاسایی وا بوو هەر کاتێک حوکمبەسەرداکراو بڕیارەکەی بۆ دەخوێننەوە، دەبێ هەڵسێتە سەر پێ، بەلام دۆڤ گرەنەر رەتی کربووەوە لەبەر بڕیارەکە هەڵبستێ. ئەو رەتی کردبووەوە رێزی "قانونەکانی" ئەوان بگرێ. لەسێدارەدەرەکە هەولی دابوو هەڵیسێنێتە سەر پێ. ئەوان لێشیان دا. کەچی خۆی بەدەستەوە نەدا، خۆی لە گوورە نەبرد؛ ئەو جەنگا، تەنانەت لە دوا ساتیشدا، کە بەرەو پەتی سێدارەیان برد، گۆرانی دەگوت.

لەگەڵ ئەودا لە چاوە زیندانەکەدا بۆ بەردەم پەتی سێدارە بە گۆرانییەوە یشێل درێزنەر، مۆردەخای ئالکوشی و ئێلیازەر کاشانیشیان بردن. ئەرێ دەبێ ئەو جەنگاوەرانە، هەر چواریان بەیەکەوە کاتێ کەوتنە بەردەستی سووپای داگیرکەر چ بەرگەیان گرتبێ؟ ئەمەش ئەو راپۆرتەیە کە لە زیندانەکەیانەوە ئاودیوی دەستی ئەفسەرەکانیان کراوە، کاتێکیش تۆ دەیخوێنیتەوە، سەرنجێکی سەیرت سەبارەت بە دڵی ئەوان بۆ پەیدا دەبێ، کە ئەوێ دەمێ ئەو پارچە کاغەزانەیان ناردووە:

---

[88] دووهەمین کتێبی تەوراتە. ناونیشانەکەشی ئاماژە بە دەرچوونە کۆڕەوەی ڕۆڵەکانی ئیسرائیلە لە میسری فیرعەونیەکان و رزگاربوونیان لە کۆیلایەتی لەسەر دەستی موسادا لە سەدەی سێزدەهەمی پێش زایین. وەرگێر

"پێش ویلهێلما، بڕیارم دابوو ترومبێلەکە بوەستێنم و خۆم فڕێبدەمە نێو بیستانی پرتەقال. بەڵام شوفێرەکە جڵەوی سووکانەکەی لە دەست دا و ترومبێلەکە بەرەو ئاستەنگە تەلبەندەکەی سەر ڕێگا خێرا سووپا ڕۆیشت، کە سووپای لێبوو. تەلبەندەکە لەگەڵ ترومبێلەکە ڕۆیشت و لە دوای خشا، لەوێ نەیوەستاندین بەڵام لە ئاستەنگە تەلبەندەکەی دووهەم رایگرتین. لەو کاتدا تفەنگی برین لە دوامان کەوتە تەقەلێکردنمان و ترمبێلەکەشمان بە دوژمن دەورە درا و لوولەی تفەنگ و دەمانچەکانیان تێگرتین. ئێمە هیچ دەرەتانی دیکەمان بۆ نەمابووە ، لە ترومبێلەکە هاتینە دەر و دەستەکانمان بەرزکردنەوە. ئێلیازەر گوللەیەکی بە پشت کەوتبوو، مۆردەخایش(شوفێرەکە) بەر شانی کەوتبوو. گوللەکەی لێوە دەرچووبوو، برینەکەی کونبەدەر بوو. کاتێکیش لە ترومبێلەکە دابەزین زەبرێکم لە پشتێ درا و و کەوتم و غلۆربوومە نێو چاڵێک. کاتێکش درێژبووم گوێم لە تەقەی دەمانچە بوو، بینیم سەربازێک لوولەکەی لە مۆردەخای کردبوو. ئەو تەقەی کرد ئەمما بەر مۆردەخای نەکەوت بەڵکو بەر برا بەریتانییەکەی کەوت و کوشتی. دەمودەستیش بە دەمانچەکەی لە سەری مۆردەخای دا و فڕێیدایە نێو ئەو چاڵەی منی لێکەوتبووم. لە کاتێکدا ئەوان بە دەمانچەکانیان لە ئێمەیان دەدا، پێلاقەیان تێهەڵ دەدایـن، دەبوایە لە چاڵەکە هەڵبستین. گوێمان لە تەقەی زیاتریش بوو. پێموابوو خەریکبوون هەموومان دەستبەجێ هەر لەوێ تەواو دەکەن. کاتێکیش ئێمەیان گەیاندە نێو زرێپۆشەکە دوو کەسی دیکەشمان دیتنەوە. ئێلیازەر لەوێ نەبوو. دوای ئەوە ئەومان نەبینییەوە. ئەوانی دیکەش نەیان بینیبوو ئاخۆ چی بەسەر ئێلیازەردا هاتووە. ئەو بە ئاستەم دەیتوانی لەنێو ترومبێلەکەی بێتەدەر، ئیدی سەرنجێکی وا پەیدا بوو، دەستبەجێ سەربازەکان لەنێو ترومبێلەکە پێکابێتیان.

"ئینجا بەندی لێدان و تێهەڵدان دەستی پێکرد، کە تەنها ڕۆژی دوایی سەعات پێنجی ئێوارە کۆتایی پێهات، بەم جۆرە بیست سەعاتی بەدوای یەک لێیان داین.

"بە لێدانەوە ئێمەیان بردە نێو زرێپۆشێکی بچکۆلانە، هەر یەک لە ئێمە سەربازێکی پاسەوان بوو. هەر زووش پاسەوانەکان گیرفانەکانی ئێمەیان بەتاڵکردەوە، فەرمانیان پێکردین دەستمان هەر بە بەرزکردنەوە ڕابگرین.

ئەوان هەموو شتێکیان بردین: کاتژمێرەکانمان، نزیکەی پەنجا پاوەن، جوزدان و ڕۆژژمێرەکان، قەڵەم و قەڵەمدارەکان، تەنانەت دەستەسڕ و شانەکانیشیان بردین. کاتێکیش لەوە بوونەوە، ئەوسا بە هەموویان لێیان داین. بەتایبەتیش لە دەموچــاو و زگیــان دەدایــن. کاتێــک زۆریــان لە زگمــان دا و لە دەموچاویشیان سرەواندین تا سەر بەرزبکەینەوە. وەک چۆن ئاو لە شێرەی ئاو بێتە خوار، ئاواش خوێن لە لوتمدا فیچقەی دەکرد، سەربازەکەش بە کەیفخۆشیەوە بانگی دەکرد: "هۆی... کەپووی ئەوم شکاند."

گەشتەکە بە گەیشتنە ئۆردوگایەک کۆتایی هات کە نەمدەزانی. ئەوان ئێمەیان لە ترومبێلەکــان ڕاپێچــایە دەر و لەو مەیــدانە فڕێیانــداین. ئێمەیــان بە ریــز وەستاند، نزیکەی دە سەربازیان لە پێش ئێمە بە ریز دانا و تفەنگەکانیشیان سوارکرد. هەر دەبێ بیرم بۆ ئەوە دەچوو، تاقیمان دەکەنەوە و دەمانترسێنن، بۆیە هیچ کەسێک سەری خۆی نەوی نەکرد. لەو ساتەدا ئەفسەرێک بەغار هات و سەرکۆنەی سەربازەکانی کرد، دیار بوو بە ڕاستی دەیانەویست هەر لەوێدا ساردمان بکەنەوە. ئینجا ئێمەیان بردە ژوورێک. لەو ژوورەدا بۆ ماوەی نیو سەعات ئێمەیان هێشتەوە. هەموو کاتەکەی ئەوێ- هەر لەو کاتەی گیرابووین- ئێمە دەستەکانمان هەر بەرزکردبوونەوە. دوای نیو سەعاتەکە، دوای ئەوەی دەستەکانمان وەک بەرد لێهاتبوون، ئێمەیان خستە نێو لۆرییێکی گەورە و لەسەر بۆدیەکەیان درێژکردین. ئەوان ئەڵقەکەی دەستی مۆردەخایــان بینــی و هەوڵیانــدا لە دەســتی دەربهێــنن. کــاتێکیش ئەڵقەکەی لە قامک دەرنەهات، تا هێزیان تێدابوو قامکەکان ڕاکێشا، وایان زانی پەنجەکەیان شکاندووە، ئەوسا لێیگەڕان. ئێمەیان گەیاندە مۆڵگەیەکی نەناسراوی دیکە، لەوێش ئەفسەرێک فەرمانی پێکردین بمانبەنە یەکێک لە کۆڵیتەکان. ئەوێ ناندینێک بوو، دیاربوو ماوەیەکی زۆربوو بەکار نەهاتبوو، کۆڵیتەکە پازدە بە چل و پێنج پێ بوو. لەوێدا جلەکانیان داکەناندین. هەموو شتێکیان برد... لەبەرئەوی ئێمەیان لەیەکدی بەستبووەوە، جلەکانمان هەر لە دەستدا مانەوە. بۆ ئەوەی جلەکانیان بە دەستەوە بێن دەبوایە بە هەموو هێزی خۆیان ڕابکێشن و دەستەکانیشمان بە هۆیەوە بریندار بوون. کاتێکیش نەیانتوانی بە ڕاکێشان جلەکان لە دەستماندا بدڕێنن، تیخەمووسێکیان هێنا و دڕاندیان. ئێمە لەوێدا ڕوتوقوت بووین وەک ئەو ڕۆژەی لێی لە دایک بووین.

"ئەوان بە شـێوەیەکی رێکخـراو پەلاماریـان دایـن، دیـاربوو فەرمـان و دەسـتووری ئەفسـەرەکانیان پێبـوو. ئەوان بەنـۆرە لێیـان دەدایـن ئینجـا هەموویان بە یەکەوە کەوتنە ویزەمان. چوار یان پێنج سـەرباز ئەم دەردەیان پێکردین: کاتێکیش ماندوو دەبوون، کەسانی دیکە جێگەیان دەگرتنەوە. ئەوان بە مستەکۆڵە، بەکەللە و بە پێلاقە تێیان دەسرەواندین، لە هەموو ئەندامێکیان دەدایـن، لەسـەر تـا بەری پـێ هـیچ شـوێنێکی سـاغیان نەهێشـتینەوە. هـیچ دەرەتـانێکی سـانەوەیان نەدایـن. لەنێـو هەمووشـیاندا دوو پۆلیسـیان لە هەموویان بەدتر بوون، دیاربوو هەر بۆ پاسەوانی ناردبوویانن. یەکێک لەوان دەستی دابووە مەترەقێک، ئیدی پشت و لاق و زگی حەسیرمەیدان کردین. بە یەکێـک لەو لێـدانانە دەسـتی ئێلیـازەر شـکا و پشـتی حـایم گۆلۆرزیشـی پێوەرگەڕا. منیش زەبرێکم بە مل کەوت و بوراندمیەوە. ئەم بەزمە تا شەو درەنگـان بەردەوام بـوو. ئینجـا ئەفسـەرێک هـات و فەرمـانی پێکـردن چـی دیکەمـان لێـنەدەن، ئەوسـا ئێمەیـان شوشـت و پەتۆیـان بـۆ هێنـاین بەڵکـو بخەویـن. ئەوان ئاویـان بەسەرسـەرماندا کـرد، دەبـوایە هەریەکەشـمان ئەوی دیـکە بشـوا. شوشـتنەکەش دادی برینەکانمـانی نەدەدا، ئـاخر هەر خوێنمـان لەبەر دەچۆڕا، دەمودەست پیس بووینەوە. هەر چوارمـان، تەڕو و روت و لە سـەرماش هەڵـدەلەزرین، پەتۆیەکمـان لەسـەر نـاوکەوەکە راخسـتبوو، دوو پەتـۆکەی دیکەشـمان بەخۆمـان دادا. (ئەوەش هەمـوو ئەو شـتانە بـوو کە لەو شەوەدا پێیان داین.) زۆریشی پێنەچوو سەرمان گێژی خوارد، ئینجا پاسەوان هـات، بە پـێلەقە ئـێمەی هەڵسـاندەوە و پەتۆکـانی لەسـەر لابـردین. ئـێمە هەر پازدە خولەک ئەو جۆرە مێوانەمان دەهاتن.

"بەرەبەرەی بەیـانیش فەرمانیـان پێکردین هەڵبسـتین و دەموچاومـان بشـۆین. ئەو پەتۆیانەشیان پێدابوون لەبەر هەمـووی پەڵەی خـوێنی پێدا وشـک و رەق ببـووەوە و رەنگەکەشـی گۆڕابـوو. دوای خۆشوشـتنمان جلیـان بـۆ هێنیـان دەبوایە بمانپۆشیبان. پێڵاوەکانیان سێ لە ئێمەیان نەداینەوە. ئیدی بەم جۆرە پێمـان لە پـارچە قوماشـێکی زبـر وەرپێچـا و راکە بـۆ "ژووری تیمارخـانە". لە رێگاشـدا تووشـی هەر سـەربازێک دەبووین بە مست یـان بە قۆنـداغە تفەنـگ لێیان دەدایـن، پاسەوانەکانیشمان خۆیـان هەر لەگورە نەدەبرد. ئێمە بەدەست بەرزکردنەوە دەبوایە غار بدەین. لە تیمارخانەکەشدا بۆ مـاوەی سـێ چـارەگ

سەعات ڕایان گرتین، بێ ئەوەی هیچمان لێبکەن، تا ئەو کاتەی پزیشکەکە هات.

"پزیشک، پیاوێکی بە تەمەنی کورتە باڵا بوو، برینەکانمانی پشکنی و لە سەربازەکانیشی پرسی ئاخۆ بە نیازن هەر بەو بەزمە لە گەڵماندا بڕۆن. سەربازەکانیش بە گردەبڕی وەڵامیدایەوە، کە وامان لێدەکەنەوە. "زۆر باشە" پزیشکەکە وایگوت، "من دواتر برینەکانیان دەپێچمەوە." (وایان دەزانی لە ئینگلیزی ناگەم.)

"جارێکی دی دەبوایە بە هەمان ڕێگا بۆ ئەو شوێنەی لێی هاتبووین، غاردەینەوە. دیسان جلەکانیان لەبەر داکەندین ئێمەیان بردە دەرەوەی ژوور، چەند دڵۆپەئاوێکیان بەسەردا کردین. ئینجا سەربازەکانمان لە دەوردا گردبوونەوە، داوای خۆبەخشێکیان دەکرد تا لێمان بدا، لەنێویشیاندا خۆبەخشی ئەم کارە کەم نەبوون. ئینجا دووبارە گەڕاندیانەوە نێو ژوورەکە، فەرمانیان بەسەردا کردین ناوکەوەکە پاک بکەینەوە و دیوارەکە لە هەموو پەڵە خوێنێک بسڕینەوە. ئیدی هەر ئەوسا زانیم ئاخۆ ئەو نادینە بەچی دەچێ. لەوێدا پەڵەی وشکەوەبووی خوێن بەدیوارەوە هەبوو، دەبوویایە بە نینوکەکانمان هەڵمانکڕاندبا. لە کاتی کارکردنەکەشماندا هەر لێیان دەداین. لە پریکیشەوە پۆلیس ئێمەی ڕاکێشا و فەرمانی پێکردین کڕنوش بەرین و زەویەکەی بەر پێی ماچ بکەین. کاتێکیش ڕەتمان کردەوە بە دار حەیزەرانێک وەرمانگەڕایی، لێدە ئەمما لێدە. لێ ئێمە ئەوەمان نەکرد کە داوای لێکردین. ئەوان جوتە کەلەپچەیەکی دیکەیان خستە دەستم، دیاربوو تێبینی ئەوەیان کردبوو گوایە من هانی هاوڕێکانم بۆ سەرکێشی و یاخیبوون دەدەم. کاتێکیش کەلەپچەیان کردم، نەمدەویست هیچ شتێکی دیکە بکەم، لێ دیسان بەلێدان کەوتنە وێزەمەوە. لە دواییدا ئەوان کەلەپچە زێدەبارەکەیان لە دەست کردمەوە.

"نزیکەی سەعات نۆش جارێکی دیکە ئێمەیان شوشتەوە... هەریەکەشیان جوتێ پانتلۆنیان پێدان. هەمان دکتۆر هاتەوەوە و پلاستەری لەسەر برینەکانی دوان لە ئێمە دانا. پاشان ئەفسەری پۆلیس هاتە لامان، ئەفسەرەکە ناوی کارلیک بوو، ئەفسەرێکی جوو بوو و چەندان لێکۆڵەرەوەش یاوەری بوون. بە ئاستەمیش لە ئێمەیان پرسی، تەنها پرسیاری ناو و ناونیشانیان

لێکـردین. هەمـوو ڕۆژەکەی هەر جرتـوفرتی پـۆلیس بـوو بـۆ لامـان و لەو نێوەشدا سـەربازەکان لە گەمەی لێدانی خۆیـان بەردەوام بـوون. بەرەبەرەی ئێوارە تاریک تەنها (کارلیک)مان لا مایەوە، لە دەرگەی دیکە وەستا و ئێمەی بـردە ژوورێکـی دیـکە تـا کـاغەزی تۆمەتنامەکەمـان واژۆ بکەیـن. کـاتێکیش (کارلیک) لە ژوورەکەی تەنیشت دانیشتبوو، عەریفێکی کەتە هات و فەرمانی پێکردین، کە هەمـوو شـتێکی نەشـیاو و ڕوشـێنەر و سـوک بکەیـن. کـاتێکیش داواکەیمـان ڕەتکـردەوە، بێویژدانـانە کەوتە سـەر و گوێلاکمـان. منـیش بە کورەکانم گوت، ئیدی ئەمجارە نابێ بێدەنگ بین، بۆ ئەوەی هاوارمان بگاتە گوێی کارلیک. ڕوون و ئاشکرا پێمگوتن کارلیک تاکە جووە ئێمە دەبینێت ، پێویستیشە هەموو شتێکمان بۆ بکا تا لەو بارەمان دەربهێنێ دەنا ئەوان تا مردن هەر تێمان هەڵدەدەن. ئەویش بەڵێنی دا..."

بۆ ماوەیەکی درێژ بوو جەنگاوەرە جووەکانی ئیرگون بەدوای ئەو ئۆردوگا تۆقێنەرە و ئاکنجییەکان و سادیستەکان و دکتۆرەکەیدا دەگەڕان. گەر هاتبا و مۆڵگەکەمـان دۆزیبـایەوە، بە مـادە تەقینەوەکـان تەختمـان دەکـرد، ئادارمـان لەسەر پادار نەدەهێشت، بەڵام هەرگیز بە مۆڵگەکە نەکەوتین. ئێمە ڕاپۆرتمان پێگەیشـتن -کە مـن لەڕەسـەنایەتییان دڵنیـا نەبـووم- کەوا ئەو یەکەی بەم کـارانە هەڵدەسـتا گواسـتراوەتەوە دەرەوەی وڵات. دیـاربوو واشـبوو. بەریتانییەکان دەیانزانی ئێمە لەو جۆرە شتانە خۆش نابین. لە ڕاپۆرتی بەڵای ئەو چوار جەنگاوەرەی لەوێ مابوونەوە، تێبینی (پۆل) ئەمە بوو:

"ئەو پۆلیسـە بەریتـانیەی پەیوەندیـدار بە پرسـەکە، بەردەوام بە دواوەی بـووین، لـێ هەر کاتێک لە سـارۆناوە بە زرێپـۆش دەردەچـوو، ئەسـتەم بـوو دەستمان پێی بگا. چەندان هەفتە دوای ڕووداوەکە ئەو گوازرایەوە، لەوانەشـە هەر وڵاتی بەجێهێشتبێ. ئەو بڕیاری مەرگی بەسەردا درابوو..."

ئەو سـێ جەنگـاوەرە جـووانە دەبـوایە بەرگەی هەمـوو ئەو ژان و ناسـۆرانە بگــرن تەنــانەت بەر لەوەی بەرگــی ســووری مەرگیشــیان بکــرێتەبەر. بەسـەربەرزیش ڕووبەڕووی دادوەرەکانیـان بـوونەوە. ئەوان لەوە مانـدووتر بـوون کە دڵنەوایـی دایبـاب و هاوڕێکانیـان بـدەنەوە لەبـری ئەوەی خۆیـان دڵنەوایـی بـدرێنەوە. ئەوان تـا دوا سـاتی ژیانیـان جەنگـان . ئەوان گۆرانیـان گوت...

هەر دوو هاوڕێکانیشیان، مایەر فاینستاین و موشێ بازارانی، شوێنپێی ئەوانیان هەڵگرتەوە، ڕێرەوی ئەوانیان لە بەردەم دادگا و لەبەرگەگرتنی ڕۆژە تەنگانەکانیان گرتەبەر. لێ ئەوان نەگەیشتنە سەر پەتی سێدارە. ئەوانیش لە دەروازەی مەرگدا گۆرانی برِوابوونیان بە خودا گوتەوە: "ئەی خوای جیهان، ئەی ئەوەی بەر لە ئافەریدەکردنی گەردوونیشدا هەر هەبووی." بەڵام گۆرانییەکەیان بە تەقینەوەیەکی گەورە گەورە کۆتاییپ پێهات کە درِی بەو بێدەنگییەی زیندانی ئۆرشەلیمی داگیرکراودا هێنا.

لە ماوەی شەڕەکەمان بۆ ڕزگارکردنی ژیانی دۆڤ گرەنەر، لەکاتێک هەوڵەکانمان نوشستیان هێنا بیرۆکەی "تەفروتونا بن لەگەڵ فەلەستینییەکان" سەریهەڵدا. لە دۆڤیان پرسی ئاخۆ ئامادەیە ڕێگای "مەرگی سامسۆن" بگرێتەبەر، کاتێک لە داردەرەکەی ئەویان بەرەو پەتی سێدارە برد. سەرەتا دۆڤ سەرنجێکی شاشی بۆ هات بەوەی بیرۆکەکە زۆر سادەیە، کە بە دەستەکانی خۆی بمرێ لەوەی بە دەستی لەسێدارەدەرەکەی سەربنێتەوە. بۆیە بە حەوسەڵەوە دووبارەی کردەوە: "خۆ ئەگەر ئەوە نیازەکە بێ، ئامادەم سەرم بەدیواری زیندانەکە بدەم و وردوهەڕای بکەم."

چەند ڕۆژێک دواتر توانیمان باری سەرنجەکەی ڕاست بکەینەوە. نەخێر، ئێمە پێمان ڕاگەیاند، بیرۆکەکە ئەوە نییە مەرگت لەسەر دەستی خۆت بێ. جەنگاوەر نابێ بەخۆی ژیان لە خۆی بسەنێتەوە. بەڵام خۆ هەموو هیوایەک بە با چووبوو، ئەو پاڵەوانە دێرینەی ئێمە لەبەردەستی فەلەستینییەکاندا ڕێگای نیشاندابووین. لەوێدا هیچ بژاردەیەک غەیری مەرگ نەمابۆوە، دەکرێ جەنگاوەر "دوا زەبر" بداتە دەست دوژمنەکەی.

بەڵام گرەنەر، درێزنەر، ئالکۆشی و کاشانی بەر لەوەی ئامادەکارییەکان بۆ چەقاندنی دارەکانی سێدارە تەواو ببن، گوێزرانەوە قەلازیندانی عەککا. لە زیندانەکەی ئۆرشەلیمدا تەنها مایەر فاینستانی یەک باسک و لە ئیرگون و مۆشێ بازارانی لە F.F.I دا مابۆوە. ئەوانیش وەک لە دوا بیرخەرەوەیاندا نووسیبوویان، گردەبڕانە بڕیاریان دابوو، تۆڵەی خوێنی هاوڕێکانیان بکەنەوە. ئیدی ئەوان هەنووکە لە ژیانی خۆیان ناترسن، بەڵام لەوە دەترسان لەداردانەکەیان زۆر خێرا ئەنجام بدرێ. ئەو ترسە پیرۆزە لە دوا سێ

تێبینینامەکەی فاینستاندا هەبوو، کە بەتاکدەستی بە ناوی هەر دووکیان ئەمەی خوارەوەی نووسیبوو:
"هاوڕێیان ، شالۆم،
ئێوە شتێکی باشتان نەکرد کە شتەکەتان بۆ نەناردین. کێ دەزانێ بەیانی درەنگ نابێ؟ تکایە لێمەگەڕێن کات بەسەر بچێ. بەبێ وەخران بۆمان بنێرن... ئێمە بڕیاری خۆمان داوە. سڵاو لە هەمووان. بەهێز بن. هەروەها ئێمەش."
"شالۆم، هاوڕێ خۆشەویستیەکان: ئێمە ڕۆژنامەکانمان پێگەیشتن، هەموو شتێکمان بۆ ڕوون و ئاشکرایە. ئێمە بەو دوا دەرفەتە دڵشادین، بۆ هاوبەشبوون لە تۆڵەی چوار هاوڕێکانمان. هەرچی دەربارەی ئێمەیە، ئێمە دڵنیاین ڕێکخراوەکەمان دەقاودەق و بە دروستی تۆڵەمان دەکاتەوە. لەوانەشە شتێکی لەناکاو بێ بمانبەنە عەککا. داوا دەکەین ئامادەکاری هەمان شت لە عەککا بکەن، بۆ ئەوەی دڵنیابین لەوەی دەیکەین. ئێمە بەهێزین. م. فاینستاین. م.بازارانی."
"هاوڕێیان، شالۆم: دوا سڵاوی ئێمە قبوڵ بفەرموون و دڵی خۆتان بە لە دەستدانی ژیانی ئێمە لە دەست مەدەن. بەڵام ئێمە دەبێ تۆڵەی خوێنی چوار هاوڕێکانمان بکەینەوە، هیچ هێزێکیش لەسەر گۆی زەوی نییە لەو مەبەستەمان دابڕێ. برایەکان، پەرچەمی یاخیبوون بە ناموسەوە تا ڕزگار دەبین، هەڵبکەن. ئێمە بە شانازییەوە بەرەو مەرگ دەڕۆین. م.ف. م.ب."
شەوێک بەر لەوەی هەڵواسینەکە، -هەفتەیەک دوای لەسێدارەدانی هەر چوار کەسەکە لە عەککا- ئەوەی ئەوان ڕەچاویان دەکرد هاتە دی. نارنجۆکێک لە شێوەی پرتەقال گەیەندرایە دەستیان. شتەکە گەیەندرابووە چاوەزیندانێکی دراوسێیان، هی ئەو جەنگاوەرانەی هێشتا بڕیاری مەرگیان بەسەردا نەدرابوو، ئەوانیش ژیانی خۆیان بۆ ڕزگارکردنی هاوڕێکانیان تەرخان کردبوو. بەڵام کاتێک ساتە تەنگانەییەکە هاتە پێش، هەموو هیوایەک بۆ ڕزگارکردنیان بە با چوو، لەوێدا تەنها یەک شتیان دەتوانی بیکەن: ئامرازێکی مردن بۆ خۆیان و بۆ ئەو کەسەی لەسێدارەی دەدان ئامادە بکەن. ئەو دوو کەسە حوکمبەسەردراوەی نێو چاوە زیندانەکەش چاوەڕێ بوون: "کێ دەزانێ ئاخۆ بۆ بەیانییەکەی کار لە کار ناترازێ؟"

تـا سـاتەوەختێکی درەنگـی شـەویش، رابییـەکە لەچـاوە زینـدانییەکەی مەرگ لەگەڵیاندا مابۆوە. ئەو دڵنەوایی نەدانەوە. ئاخر ئەوان پێویسـتیان بەشتێکی وا نەبوو. ئەوان گۆرانی مەزموریان دەگوتەوە: "خواوەند لەگەڵ مندایە، مـن نـابێ بترسم." ئەوان تەنها لەوە دەترسان ئەوان لە کاتی خۆیاندا نەبەن. رابییـەکەش بە هیچ شتێکی نەدەزانی. ئەو بەڵێنی پێدان لەگەڵ گەزەنگدا بێتەوە لایـان و دواسـاتی بەرلە هەڵواسـینەکەیان لەگەڵدا بـێ. ئەوانـیش، ئەوانەی لە ژیانیانـدا بەسەر مەرگدا زاڵببوون، هەوڵیاندا لەسەر سەردانی دووهەمدا لەگەڵی بکەونە مشتومڕ. لـێ رابییـەکە هەر لەسـەر قسـەکەی مکوڕ بـوو. ئەوانـیش ئەو رازە گرژەی ژیانیان بۆ نەدرکاند...

ئەوان چـاوەڕێ نەبـوون تـا لەسـێدارەدەرەکە بـێ. ئەوان دەترسـان نەوەک رابییـەکە ئامـادەبێ و ئـازاری پێبگـا. ئیدی ئەوان دەسـتیان لە مەرگـی "لەگەڵ فەلەسـتینییەکان"دا هەڵگـرت. لە سـێهەمین بەشـی شـەوەکەدا، ئەوان هەر دووکیـان دواباوەشـی برایەتیـان بەیەکدا کـرد، نارنجۆکەکەشیان لەلای دڵیـان راگرتبوو، دەرزیلەکەیان کشاندەوە و یەکدییان گوشی...

## بەندی 21
## باستیل دەکەوێ
٤١٤ - ٤٣٧

هەر دەمودەست دوای لەداردانی دۆڤ گرەنەر و هەر سێ هاوڕێکانی، بەیاننامەیەکمان دەرکرد و جارماندا ئێمەش باری ناکاومان لەنێو هەموو یەکەکانی سەر بە ئیرگون ڕاگەیاند. هەر سەربازێکمان بکەوێتە دەست، دەبێ وەک چوار هاوڕێکەی ئێمە ئامادەی مردن بن. یەکەکانمان بە ڕێگا و بانەکان، بە شەقامەکانی نێو شاران وەربوون. بەڵام دەستبەجێ کەسانی سەر بە سووپا نەکەوتنە داو. کاتێک ئەوان لە مۆڵگەکانی خۆیان دەردەچوون، بە کاروان و بە یاوەری تانک دەڕۆیشتن. هەڵبەتە دەبوایە ئێمە پەلاماری ئەوانیشمان دابووایە، هەر وەک دواتر هێرشمان کردە سەر قیتارێکی سەربازی کە لە میسرەوە دەهاتن. ئەوەش ئەرکی ئێمە بوو باجی چاوبەچاو بە کابرای لەداردەر بدەینەوە. لەوەدا سەرنەکەوتین.

سووپا لە شوێنە شاراوەکانی خۆیدا خۆپارێزتر بوو. ئێمەش لەسەر هێرشکردنە سەریان کۆڵمان نەدا. بەڵام هێشتا ئەو قەرزە گەورەیەی لەسەریان بوو، لێمان وەرنەگرتنەوە.

لەسەر گردەکەی "شونی" کە بەسەر دۆڵی تیمساحدا دەڕوانی، قەڵایەکی کۆنینە بوو، بینرا کاروانە ترومبێلێک بە هێواشی لە دۆڵەکەدا دەچێتە خوار. هەڵبەتە کاروانەکەش وەک کاروانێکی سەربازی بەریتانی دەهاتە بەرچاو. لە زیلە ڕەنگ سەوزباوەکاندا سەربازەکان دەست لەسەر پەلاپیتکەی تفەنگ بە ئامادەباشی دانیشتبوون. سەرقافڵەی کاروانەکەش جێبێک بوو، ئەفسەرێکی هەڵگرتبوو، فەرماندەی کاروانەکە بوو، پلەکەشی کاپتن (سەرلق) بوو.

لەگەڵ گەیشتنە سەر ڕێگای سەرەکی، خێراتریان لێخوڕی. کێڵگە و مەزرا، ئاوایی و نشینگەکانیان بەلەز دەبڕی. ئەوان لە کاروانێکی دیکە تێپەڕین کە بە ئاراستەی پێچەوانەیان دەهات، ئەوانیش پیاوی چەک لەشانیان پێبوو. سەربازەکان بە خەندەوە سڵاوییان لەیەکدی دەسەندەوە و دەستیشیان بۆ یەکدی ڕادەوەشاند.

سەربازە بەریتانییەکان، کە بەرەو باکوور دەکشان نەدەکرا گوێیان لە هاوڕێکانیان بێ، کە بەرەو باشووز دەکشان و بانگی فەرماندەکەیانیان دەکرد. خۆ ئەگەر گوێیان لێبووبا لە جیاتی خەندە گۆڕینەوە بە گوللە وەڵامیان دەدانەوە. پیاوەکانی کاپتن ناویان لێنابوو شیمشۆن، ئەمەش ناوێکی تەوراتیانە بوو نەوەک ئینگلیزی. ناوەکە نەوەک هەر ناوی خۆی نەبوو، زۆر لەو پیاوانەی لەگەڵیشدا بوون، تەنانەت ناوی دیکەی ئەویان نەدەزانی، کە لە کاتی لەدایکبووندا، باوکی ناوی دۆڤ کۆهنی لێنابوو. ناوەکەش ئینگلیزییانە نەبوو.

هەموو ئەو سەربازانەی بەرەو باکوور دەکشان نەیاندەزانی شیمشۆن، دۆڤ کۆهنە. هیچ کەسیش لەوانەی بەرەو باشوور دەڕۆیشتن نەیاندەزانی دۆڤ کۆهن، شیمشۆنە. بەڵام زۆر لەنێو بەریتانییەکانیان دۆڤ کۆهنیان دەناسی. دۆڤ کۆهن بە چەندان ساڵ لە خزمەتی یەکەی کۆماندۆی سووپای بەریتانیدا بووە. ئەفسەرەکانی پلە بالا و پلەدارەکانی خوار خۆشی پەسنی ئازایەتی و چاونەترسی تەقینەوەکانی ئەویان لە مەیدانی جەنگ و دەستکەوتەکانی لە پشت هێڵەکانی دوژمنەوە وەک یەک دەدا. دەقاودەق ئەو لووتکەکەی دیار کردبوو. لە ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیادا فەرماندەیی شەڕێکی دژی ئیتالییەکان لە زنجیرە چیایەکدا کرد. ئەو ببوە پێشەڕەوڵ و نموونەی پیاوەکانی بوو، هەر بەم جۆرە (کێرن) کەوتە دەست سووپای بەریتانی. ئەو درزەی لە هێڵەکانی بەرگری ئیتالییەکان کەوت، ڕێگای سەرکەوتنی بەریتانییەکانی لە ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیادا کردەوە.

بە کۆمەڵێ پەسننامە و نیشانە و مێدالیاوە لە بەرەی ئەوروپاوە گەڕایەوە ئێرتز ئیسرائیل، هەر ڕۆژی پاشتریش دەستی بە فەرماندەیی ئۆپەراسیۆنەکانی کردەوە. یەکەی هەڵمەتبەری ئیرگون زڤای لیومی فەرماندەیەکی پڕئەزموونی مەیدانی جەنگی بۆ خۆی بینیەوە، بۆ ئەو شەڕ و دژواری ببووە بەشێک لە ژیان. دۆڤ کۆهن جێگەی خۆی گرتەرە، بەڵکو لەوەش زیاتر ئەو خۆی دۆزیەوە. کاتێکیش لەنێو مەیدانی جەنگ و لە شاخی ئەفریقادا بۆ (کێرن) بازی دەدا، هەر هاواری دەکرد، "بەناوی زایۆنەوە." هەنووکەش ئەو لەپێناوی زایۆن و خاکی زایۆندا سەرکردایەتی یەکەکەی دەکا. دەق ئامانجەکە ڕێڕەوەکەی خۆی دۆزیوەتەوە. خەونیش بەدیهات.

دۆڤ کـۆهن لەبـن بەرگـی فەرمـی کـاپتنێکی بەریتـانیی و (کابتـازان) و (شمولیک)یشی لەگەڵ خۆی بـردن: ئەوانیش جلی سـەربازیانەی بەریتانیـان پۆشی بوو، جێبەکە پڕی چەک بوو. بەو ڕێگایەدا دەڕۆیشتن کە بەربەستی بەریتانیی لەسەر داندرابوون. لە یەکێ لەو بەربەستانەدا، کاتێک پاسـەوانەکان هـاتن و سـڵاویان لێبکەن، دۆڤ قایل نەبـوو. ئەو بەتونـدییەوە ئـاوڕێکی لە سەربازەکە دایەوە.

"ئایـا تـۆ ئەمە بە سـڵاو دادەنێـی؟" بەتیـژیەوە لە سـەربازەکەی راخـوڕی.

"سـڵاوەکەت دووبـارە بـکەرەوە!" سـەربازەکەش سـڵاوەکەی بـۆ دووبـارە کردەوە.

"ئەمەیان باشترە" کاپتنەکە بە تیژیەوە وای پێگوتەوە، ئیدی جێبەکە ڕێی خۆی گرتەوەبەر و سەربازە سڵاوکەرەکەی بەجێهێشت.

بەڵام لەو ڕۆژی 4ی مـای 1947دا، خـۆ دۆڤ کـۆهن چەکی نەدەگواسـتەوە. ئەمجارەیـان ئەو مەزنتـرین ئۆپەراسـیۆنی کۆمانـدۆی لەژیـانی خۆیـدا بەڕێ دەکرد. یەکێک لەو ئۆپەراسیۆنانەی لە مێژوویی کۆماندۆیەتیدا دەگمەنن. ئەو پیاوەکانی نەدەبردنە بەیروت، بەڵکو بەرەو قەڵای عەککای دەبردن.

کـاتێکیش کـاروانەکە گەیشـتە عەککـا، پیاوەکـانی کـردنە دەسـتەی بچـووک بچـووک. ئەوان بە هەمـوو ئاراسـتەکان دابەشـبوون. ئەوان زۆر ئەرکیـان لە بەردەمـدا بـوون، بەقەد ئەو ڕێگایـانەی دەگەیشـتنە سـەر عەککا. خـۆ عەککا هەر شارێک نەبوو پڕی ئاکنجی عەرەب بێ. شـارەکە بە زنجیرەیەک مـۆڵگەی سـەربازی دەورە درابـوو. یەکەی کۆمانـدۆکەی ئـێمە وەنەبـێ هەر لە پشـت هێڵەکانی دوژمـنەوە دەسـتبەکار بێ، بەڵکـو ڕاسـت و ڕەوان لەنێـو هێڵەکـانی دوژمنـدا بـوو. پەلامـارەکەش سـەری نەدەگرت مەگەر ڕێ لە دوژمـن نەگیرابـا بۆ ئەوەی هێزی پاڵپشـتی بهێنێ، هەروەهـا مەگەر ئەو هێڵەی بـۆ کشانەوەی پەلاماردەرەکان هەبوو، کراوە نەبووبا.

(گیـدی) نەخشـەی ئۆپەراسـیۆنەکەی بە وردەکـاری تەواوە کێشـابوو. شیمشـونیش بە جێبەجێکردنـی خـاڵ بە خـاڵ خەریـک بـوو. یەکەیەک هاوەنبـارانی مـۆڵگە سـەربازیە نزیکەکەی دەکرد، کـردەوەکە لەخشـتەبردن و ڕێگرتنیش بوو. یەکەکانی دیکەش بنەتەقەیان لەسەر ڕێگادا دانایەوە.

نەخشەکە حیسابی هەموو وردەکارییەکانی کردبوو، ئەوەش وەنەبێ هەر لەسەر نەخشە بەڵکو لەسەر شوێنە دیارکراوەکە کێشرا بوو. گیدی و شیمشۆن بە چەندان سەعات لەسەر زەوی ئەوێیان بەسەربردبوو. چاوگەلێکی زۆر بەر لە ڕۆژی 4ی مانگ چاودێری ئەو ناوەیان کردبوو. هەندێک حار وەک چاوی سوسەکاری عەرەب خۆیان نمایش دەکرد، هەندێ جاری دیکەش وەک بەریتانی! بەڵام هەمیشە ئەوان چاوی جەنگاوەرانی ئیرگون بوون. لە سۆنگەی ئەو سوسەکردنەوە ئەڵقە بەدەوری ئەڵقەدا کێشرا: لەنێو خودی بازنەی پشتێنەی سووپاشدا ئەڵقەیەکی خاڵە ئاسایشییەکانی ئیرگون کێشرا. ئیدی عەککا گەمارۆ درابوو.

ئەوسا هێزە سەرەکییەکەی شیمشۆن بەرەو قەڵاکە وەرگەڕا. لە کۆنەوەش قەڵاکە لە لایەن خاچدارەکانەوە دروستکرابوو، تورکەکانیش نۆژەنیان کربووەوە، لە ئابلۆقە تۆپهاوێژیە بەناوبانگەکەی ناپلیۆن پۆناپارتیش سەلامەت دەرچووبوو. قەڵاکەی عەککا، خەرمانە شەبەنگێکی مێژووی دەوروبەرە، نەمری پاڵەوانیتی و ژانو ناسۆر، لە زیڤ ژابۆتنسکییەوە بۆ دۆڤ گرەننەر. هەنووکەش لە بەردەم دیوارە نەبەزیوەکاندا، شیمشۆن و پیاوەکانی وەستاون. ئەوان هاتوون بیشکێنن و بیکەنەوە و ئازادی بۆ زیندانییەکانی بگەڕێننەوە.

لەودیو دیوارەکانەوە، زیندانەنییەکان بێ ئۆقرانە چاوەڕێ بوون. ئەوان دەیانزانی دەمێکە ئاماژەکە دراوە. باشە ئەم وەخرانە بۆچی؟ ئەو بەربژارانەی سەربەستی، کەسانێکی هەڵاتووی ئاسایی نەبوون. ئەوان دەبوایە ڕۆڵێکی کارا بۆ ڕێگەی ئازادی خۆیان بگێڕن. دەسەڵاتدارانیش هیچیان نەدەزانی. تەنها چەند هەفتەیەکی زووتر بۆیان دەرکەوتبوو، کە هەوڵی لێدانی تونێلێک لە زیندانە مەڵبەندییەکەی ئۆرشەلیمەوە هەیە. حکوومەت ئەمجارەیان خۆشحاڵ بوو، کە بەسەر جەنگاوەرانی ژێرزەمینییدا زاڵ بووە. گوایە ناتوانن "تیرۆرستەکان" ڕا بکەن. لەگەڵ ئەوەشدا "تیرۆرستەکان" رایانکرد، ئەوان لە قەڵای عەککادا هەڵاتن، کەوا دەزاندرا هی دزەکردن نییە.

دواتر ژەنەڕاڵ کەنینگباوم، کۆمسیاری باڵا داوای کۆمیتەیەکی تایبەتی بۆ لێکۆڵینەوە کرد، بە سەرپەرشتی یاریدەدەری بەرپرسی باڵای پۆلیس، بۆ

ئەوەی دەستنیشان بکرێ ئاخۆ چۆن دزە کراوەتە نێو قەڵاکە و چۆنیش زیندانییەکان ڕایانکردووە. سێ ساڵ بەسەر ڕووداوەکە تێپەڕین، تا کۆمیتەکە لە کارەکانی خۆی بووەوە، کۆتاییینامەکەی بووە بنەمای ئەو ڕاپۆرتە دووروودرێژەی کەنینگباوم بۆ لەندەنی ناردبوو، بەڵام هەر هەنووکە دەکرێ ئەندامانی ئەو کۆمیتەیە و ژەنەڕاڵ کەنینگباوم و دەزگای هەواڵگری بەریتانی کە خودی زیندانییەکان بەخۆشیان نەوەک هەر بە پلانی دزەکردنی پەلامارەکەیان دەزانی بەڵکو خۆشیان تێیدا بەشدار بوون. ئەوان بڕە تەقەمەنییێکیان لەبەردەستدا بوو، تەقەمەنییەکەش بە ڕێگای جۆراوجۆر لە لایەن ژێرزەمینییەکانەوە بۆ زیندانییەکان نێردرابوو. هەرچەندە بڕەکەشی زۆر نەبوو، بەڵام کاریگەر بوو، بەشێوەیەک شیشە ئاسنیە ئەستوورەکانی بەربەستەکانی لەو دالانە تاریکەدا تەفروتوناکرد، لەو کاتیشدا دەستەی هەڵمەتبەر دیوارەکەیان لەدیوی دەرەوەدا کونکردبوو. ئەو مەشخەڵە گڕگرتووانەی لە مەیدانی دەرەوەدا دیاربوون وەک ئۆپەراسیۆنێکی یارمەتیدەر نەخشەیان بۆ کێشرابوو، بۆ ئەوەی ڕێگەی هەڵاتنی زیندانییەکان خۆش بکەن. کارە هەرە گرنگ و قورسەکەی زیندانییەکان تارومارکردنی ئەو دەرگا ئاسنینە زەبەلاحەی دەروازەکە بوو، ئۆپەراسیۆنەکەش بەپێی وشەی ژەنەڕاڵی بەریتانی بە شێوەیەکی پیشەیی کارامانە کرا.

تەقینەوە بڕیاردەرە سەرەکییەکە کاریگەری زۆری لە دەرەوەی قەڵاکەشەوە هەبوو. دیوارە بەردینەکە، کە ماوەی چەند سەدەیەک بوو لەجێی خۆیان نەبزوتبوو، لە کۆتاییدا لە بەردەم هەڵمەتی شیمشوندا خۆی نەگرت. یەکە هەڵمەتبەرەکە لە لای دیواری باشوورەوە نزیکبوونەوە، ئەو بەرەوپێشوەچوونەوەی ئەوان و جێپێکردنەوەی خۆیان لە لایەن خاڵە ستراتیژییە دامەزراوەکانی ئەوێ پاڵپشت کرا. ئاخر ڕکابەرییێکی زۆر هەبوو. خۆ ئەگەر ئێمە بڕوامان بە ڕوونکردنەوەی فەرمی بکردبایە، ئەوا زیاتر لە سەد و پەنجا پۆلیسی چەکدار پاسەوانی قەڵاکەیان دەکرد، ئەو ژمارەیەش جیابوو لەو چەکدارانانەی لە خاڵەکانی خۆیان لە دەوروبەری ئەوێ وەک مۆڵگەیەکی سەربازی نزیک قەڵاکە جێگیر کرابوون. قوللە و بورجە باڵا و گەورەکانی قەڵاکەش پڕی پاسەوان بوون، ڕەشاشیان لەسەر داندرابوو، لەلای ئەوانەوە هەموو تەقەیەکی ناو قەڵاکە دیار و بەرچاو بوو.

پەلامارەکەش بە ڕۆژی ڕووناک ئەنجامدرا، بۆ ئەوەی زیندانییەکان بەسەلامەتی بگەنە جێی خۆیان بەر لەوەی ڕێسای قەدەغەکردنی هاتووچۆی شەوانە لەسەر ڕێگا و بانەکان دابندرێ، چونکە سووپای داگیرکەر هەموو ترومبێل و باربەرێکی گوماناوی لەسەر ڕێگاکان ڕا دەگرت و دەپشکنی.

لە سۆنگەی پاڵپشتی دەستە بڵاوبووەکان، پیاوەکانمان بەرەو ئەو خاڵەی دیوار ڕۆیشتن کە بۆ کەلێنتێخستن و کونکردن دەستنیشان کرابوو. گیدی پرسی بە ئیتان کرد، هەرچەندە دەستەکانیشی کەلەپچە کرابوون، چونکە لە زیندان خەریکی بەڕێکردنی حوکمی پازدە ساڵەکەی بوو کە کۆلۆنێل فێل بەتەنگەی دادابوو، دیسان بووەوە بەرپرسی ئۆپەراسیۆنەکان. ئەو بینایە بچکۆلانەی وەک گەرماو وابوو، لە دیوی ناوەوە بە دیوارەکەوە بوو. پیاوەکانمان کشانەوە. ئیدی سەرلەبەری عەککا لەبەر زەبری تەقینەوەکە هەژایەوە. لەنێو بارستایی چڕە دوکەڵدا داروپەردووی دیوارەکە بە هەوادا هەڵچوو. دڵی هەڵمەتبەران کوتەکوتی خێراتر بوو. تۆ بڵێی تەقینەوەکان کاری خۆیان کردبێ یان نا؟ ئاخر خۆ ئەوە دیوارێکی ئاسایی نەبوو، ئەوە دیواری قەڵای عەککا بوو!

تەقینەوەکان کران. لێ کەلێنە شکاوەکە زۆر گەورە نەبوو، ئەمما کاریگەر بوو. لەوێدا ڕێگایەکی تەنگەبەر هەبوو، دەچووە سەر ڕێگای خێرای سەرەکی. هەر لەوێدا دێراوی بچکۆڵەش هەبوون جۆگەئاوی مەزنیان پێدا تێدەپەڕی، بریسکەی درەوشاوەش بە مەشخەڵی قوللەکان زیاتر دەبوو. هەر لەوێشدا درزی بچووک بچووک هەبوون کە ببوونە دەرگای بەرین، دەرگای فریادرەسی لە دەست نیری چەوساندنەوە، ڕێگای ژووری چاوەڕوانی سەربەستی بوو. ئەوەی لە ڕۆژی 4ی مای 1947دا لەوێ کرا، کەلێنێکی بچکۆلانە بوو، بەڵام دروست و پڕ بە پێست بوو. دووهەمین باستیل دوای سەد و پانجا ساڵ لە ڕووخانی یەکەمین باستیل (لە پاریس)، کەوت.

بەڵام بەر لەوەی زیندانییەکان بەسەرکەوتوویی لە تاریکایی بەندییەکە ڕزگاریان ببێ، شەڕێک لەنێوان ڕزگارکەرەکانیان و هێزەکانی بەریتانی ڕوویدا. قوللەکان سێڵاوی ئاگریان باراند؛ دەستە پاڵپشتیەکانیشمان

دەستبەکاربوون. بڕین لە بەرامبەر بڕیندا[89]؛ تفەنگ لە بەرامبەر تفەنگ. شکاندنی دیوارەکە تەنها نیوەی ئەرکە راسپێردراوەکەی هەڵمەتبەران بوو. ڕێگا کردنەوە و ئازادکردنی زیندانیەکان، بەسەلامەتی گەیاندنیانە لای ئەو ترومبێلانەی بۆ ئەو مەبەستە تەرخان کرابوون، تەواوکردنی ئەرکەکەیان بوو. وەک ئەوەی لێراهاتبووین بڵێین: "کشانەوە لەپێناوی بەدیهێنانی سەرکەوتندا دەبێ بپارێزرێ." ئیدی قوولەکان بەسەختی ڕووبەڕووی ئاگری لوولەی چەکەکان بووەوە. لەژێر ئاگری هێزی پاڵپشتدا دەیان لە زیندانییەکان توانینان بەنێو دیوارە کونکراوەکەدا رەت بین.

کاربەدەستانی ئەو قەڵا مەزنە سەرسوڕهێنەرە بانگی هێزی پاڵپشتی خۆیان کرد. پۆلیسخانەکە، کە پێشتر بەقسەی هەواڵنەرێکی عەرەب "ببووە مایەی جوڵەیەکی گوماناوی" لە نزیکی زیندانەکەدا، دەستەیەکی چەکداری نارد. لە نزیکترین مۆڵگەی سەربازیشەوە، بەشێکی هێزە چەکدارەکانیان بە پرتاو کەوتنە خۆ. زیلێکی پڕ لە چەکدار بە خێرایی لە حەیفاوە لە دووری سێزدە مایلەوە لەڕێگادا بوو. بەڵام کاتێک دەسەڵاتدارانی بەریتانی بۆ ڕاپۆرتەکانی خۆیان دەگەڕێنەوە، هیچ کام لەو یەکە سەربازیانەیان لەوەدا سەرنەکەوتن بگەنە شوێنی مەبەست، چجای ڕێگرتن لە کشانەوەی ئێرگونەکان. پۆلیسەکان بەهۆی بنەتەقەکانی سەر ڕێگا وەستێندران. هێزەکانی دیکەش لە لایەن دەستەیەکی بچووکی دێوزمەئاساوە وەستێندران. زیلە تیژڕۆکەی سەر ڕێگاش تێکشکێندرا. ئەو سەربازگەیەی کەوتبووە بەر پەلاماری هاوەنەکانمان (کە هەر تەنها دوو ئینج بوون) ئەوەندە سەریان لێشێوا، نامراد بوون بەدوای فریادڕەسیشدا بنێرن. ئەو ئەڵقە ئاسایشیەی لە لایەن ئێمەوە لەنێو بازنەی سووپادا دامەزرێندرابوو، شێلگیرانە بەرگەگر بوو، بەتایبەتیش کە لە پشتیانەوە جەنگاوەرانێک هەبوون، سوێندیان خواردبوو، بەهەر نرخێک بێ نەیەڵن دوژمن بەلایاندا تێپەڕ بێ مەگەر بەسەر لاشەیاندا نەبێ.

دیاربوو شیمشون لە سەروبەندی ئەوەدا بوو، ئەو پەیمانەی بە ئاقراهامی دابوو، بیگەیەنێتە سەر. "خەم مەخۆ." بەر لەوەی بکەوێتە کار وای پێگوت، "من ئیتان و هەموو کوڕەکانی دیکە بەساغ و سەلامەتی دەگەڕێنمەوە."

---

[89] تفەنگ یان ڕەشاشی برین لەساڵی ١٩٣٠یەوە لە لایەن بەریتانیەکان داهێندراوە تا ساڵی ١٩٩٢دا ڕۆڵی بەرچاوانەی لە شەڕەکاندا گێڕاوە. تفەنگێکی سووک بووە، بە ڕەشاشی سووک LMG )Light machine gun دواتر ئیمتیازەکەی درایە چیکۆسلۆڤاک و لەوێوە چەندان جۆریان لێدروست کردن. وەرگێڕ

بەڵام، بەختی کوێرانە، کە لە ودیو هەموو لێکدانەوەیەکی مرۆڤە، هاواری بەسەر شیمشوندا کرد، کە هەر بەشێکی بەڵێنەکەی بۆ بچێتەسەر نەوەک هەمووی. لە ڕاستیشدا، ئێتان و زۆرینەی گیراوەکانی ئیرگون و F.F.I بەسەلامەتی گەیەندرانە بنکەکانی ژێرزەمینیی، لێ شیمشۆن بە خۆی، لەگەڵ چەند جەنگاوەرێکی یاوەری، کە برووسکەئاسا تامی ئازادییان کردبوو، هەرگیز نەگەڕانەوە.
ئەو ئێوارەی یەکشەممەیە، کۆمەڵە سەرباز و پۆلیسێکی بەریتانی کە چووبوونە گەرماوەکەی باشووری عەککا و چەکیشیان پێبوو. ئیدی بەدەنگی تەقینەوەکە بەئاگاهاتبوونەوە و خۆیان کۆ کردبووە بە پرتاو هاتنە مەیدانی شەڕ، لەسەر ڕێگای سەرەکی ئەوێ بۆسەیەکیان لەنێو پشتێنەی ئاسایشی ئێمەدا نابۆوە. ئەوسا دووەمین ڕووداوی خەفەتبار قەوما: یەکێ لە خاڵە داگیرکراوەکانی ئێمە لە پێشەوە کەرەنای ئاماژەیان بۆ لێنەدرابوو تا سواری لۆریەکەیان ببنەوە، بەمجۆرە ئەوان لەنێو بازنەی دوژمندا مابوونەوە. (هۆمەر بیگرات) لەو کات لە ڕۆژنامەی نیویۆرک هیرالد تریبوونی نووسیبوو، ئۆپەراسیۆنی عەککا جۆشی دابووە بەر دانیشتوە جووەکان، "بەڵام گومانی تێدا نەبوو وێڕای هەستی سەرکەوتن، دڵی فەرماندەی ئیرگون بە هۆی زیانە قورسەکانی تەزاند." لەمەدا هۆمەر بیگارت هەڵەی نەکردبوو. یان لەوانەیە وای کردبێ. ئاخر هەستی کۆستکەوتن زۆر لە خۆشی سەرکەوتنەکە قوڵتر بوو.
ئەوەی لە کاتی کشانەوەکەدا ڕوویدا، وردەکاریەکەمان لە نامەی یەکێ لە زیندانییەکان بۆ دەرکەوت. نامەکە لە لایەن ماتیاهۆ شمولوتز، جەنگاوەری F.F.I ئەوەی بینیبووی بە کورتی بۆ ئێتانی نووسیبوو. نامەکە کۆمێنت هەڵناگرێ. من هەر دەبێ کۆدەی نازناوەکان بکەمەوە: "شیمشۆن" دۆڤ کۆهن بوو، "شیمۆنیش" شیمۆن ئامرامی بوو، ئەو کەسەی لە 1944ەوە لە لایەن بەریتانییەکانەوە بەندکرابوو. "مایک" میشێل ئاشبێل بوو، ئەوەی لەگەڵ شیمۆنەوە لە سێدارەکانەوە ڕزگاری ببوو، تەنها بۆ ئەوەی لە بەربەستی سەر ڕێگاکەدا بکوژرێ. "لە سەر بەربەستەکان" ئەو گۆرانییە بوو کە لە چاوە زیندانی مەرگدا نووسیبووی، تێیدا وەسیەتنامەی بۆ هاوڕێکانی کردبوو، دواتر ببووە گۆرانییە هەرە خۆشەکەی ژێرزەمینیی.

شمولویتز نووسیبووی:

"بیستوومە تۆ چەند بە لە دەستدانی ئەو برادەرە خۆشەویستانە تێکچووی، شتێکم تێدایە ، بەخۆم نییە پاڵم پێوە دەنێ، ئۆقرە ناگرم تا شتێک لەبارەی مەرگەساتەکە و دوا ساتەوەختی پاڵەوانانەی ئەو برادەرانە نەنووسم. هەرچەندە دەشزانم ئەمە مانای کولانەوەی برینەکانە، کە دەبێ سەروبەندی ساڕێژبوونیان بێ. بۆ ئەوەی شتەکە بۆ لەبیرچوونەوە ئاسانتر بێ، بە دڵنەواییەوە کاری لەسەر دەکەم. هەرچەندە ئەوەی بۆت دەنووسم، بۆ ئەوەیە کە هەست دەکەم زانیاری ئەو ئازایەتیەی ئەوان و مەردانە مردنیان لەوانەیە بڕێک لەو هەستە قووڵە ماتەمبارییە کۆستی ئەو برادەر و هاوڕێیانە سووک بکا.

"وەک خۆت دەزانی ئێمە دەمودەست بەرەو ڕێگا گیراو و ئاگربارانەی پشت وێستگەی شەمەندەفەر ڕۆیشتین. چەند چرکەیەک پێشتر شوفێرەکەمان شیمشونی بینیبوو لەسەر ڕێگاکە بەرەو لای ئێمەی غار دەدا و هێمای ئەوەی بۆ دەکردین کە نەچینە سەر ڕێگاکە. لەو کاتدا شوفێرەکە لە ئاماژەکەی گەیشتبوو. ئەو لە دەوری ڕێگا بلۆککراوەکە وەرسوڕایەوە، خێراتر لێیخوڕی، هەوڵیدا ڕاستەوڕاست لۆریەکە لەسەر ڕێگاکە بباتە دەر و بەرەو پەرژینە دارینەکە باژوا. لەوێدا مەکینەی ترومبێلەکە وەستا. ڕەشاشی دوژمنیش لە گەرمەی تەقەکردنی خۆیدا بوو، لێ بەڕوونی گوێمان لە هاواری شیمشون بوو گوتی "بەدوای مندا وەرن!" مایک بریندار بوو، ئێمە هێشتا هەر لەنێو زیلەکەدا بووین، ئەوانی دیکەش کاتێ لە پشتەوەی زیلەکەدا بازیان دا، بریندار کران. بۆ چەند چرکەیەکی کەم ئێمە سوڕاینەوە و چاومان لەسەر ڕێگایەک بوو لە سنووری بازنەی ئاگری تەقەکە دەربچین، بەڵام بۆ هەر لایەک ددسوڕاین هەر ڕووبەڕووی شێلکەی گوللەکانی ڕەشاشەکە دەبووینەوە. کاتێکیش هەموومان بریندارکراین و خەریکی ڕاکردن بووین بەنێو ئەو چاڵەی لە تەنیشت ڕێگاکەدا بوو، لەپڕ بینیمان شیمشون بەرەو زیلە سەربازییەکەی سەرچەقی ڕێگا دەڕوا. ئێمە بەدوای ئەودا غارمان داو بازمان دایە نێو زیلەکە. لەوێدا دوو سەربازی بێچەک و شوفێرەکە هەبوون. شیمشون لێخوڕەکەی ناچار کرد سلف لە ترومبێلەکە بدا و لە بریندارە هەرە سووکەکانی ئێمەش غاریاندایە سەر دوو سەربازە بێچەکەکان و وایان

لێکردن لەسەر زگ ڕابکشێن. ئەو کات ئێمە تەنها نۆ کەس مابووینەوە. حایم بارنەر لە چاڵەکەدا بە گوللەیەک کە بەر ملی کەوتبوو، کوژرابوو. (مێندال)یش فیشەکێکی بە پشت کەوتبوو، نەیدەتوانی زیاتر غار بدا. نیکتاش بە بریندارى لەنێو چاڵەکەدا مابۆوە و ئیسحاق کوزینفسکیشی لەگەڵدا مابۆوە برینەکەی بۆ پێچابوو، ئەویش نەگەیشتە زیلەکەمان.

"پێدەچوو ئێمە ڕزگارمان بووبێ. ئێمە لەبن شێلکەی گوللەکاندا دەرچووبووین و خەریکی بریندارەکانمان بووین. چیدیکە نەماندەتوانی سەربازەکان ڕابگرین چونکە چەکمان پێنەمابوو، زۆربەشمان بریندار ببووین.

"ئێمە گەیشتینە جێبەکەی شیمشون و لەوێدا فەرمانی بە شوفێرەکە کرد بوەستێ. کاتێک بەوەی زانی، شوفێرێکمان لەنێودا هەیە (کە شێمش بوو) ڕوومان لە سەربازەکان کرد و ڕەشاشی برێن و فیشەکەکانمان لە جێبەکە پێگواستنەوە. لەو کاتەدا دیسان سەربازمان لێپەیدابوونەوە و دیسان دایانینەوە بەر دەستڕێژی گوللە. شمێش سووکانەکەی گرت، بۆی دەرکەوت کە ئاگر بۆ مەکینەکەی ناڕوا. ئەو خەریکی چاککردنەوەی بوو، لە هیکەوە زیلێک بەرەو ڕوومان هات. ئێمە بازمان داو بەرەو زیلەکە غارمان دا. شیمشۆن تەقەی بە هەوا بەسەردا کرد، زیلەکە وەستا. شیمەش و ئامۆن لەگەڵ شیمشوندا بوون. من بارکو شموکلەر و شیمۆنم بەدوای خۆدا ڕاکێشا. هەر دووکیان لە لاق و شوێنی دیکەی جەستەیان بریندار ببوون. ئانیشکی ڕاستەی بارکو هەڵوەشابوو، کاتیکیش لەبن گوللەبارانەکەدا غارمان دەدا، پێیگوتم: "بە جەهەننەم. ئای چەند هەوڵمداوە بتوانم بەدەستەی چەپەم بنووسم. ئەوان با بێمنەت بن، خۆ دەتوانن قۆڵی هەر لە بندا ببڕنەوە."

"عەرەبە سەرنشینەکان لە لۆریەکە خۆیان فڕێدا خوارەوە، لە نێویشیاندا سەربازیک بەخۆی و تفەنگەکەی هەبوو. شوفێرەکە لەگەڵ شیمشون لە سەروبەری مشتومڕێکدا بوو کاتێ ئەو بەخۆی و برینەکەیەوە لە دەرگاکە وەستابوو، شیمەشیشی لەتەک بوو. شیمشۆن تەقەی لە برینەکەوە هێنا شوفێرەکە کەوتە ئەو گۆڕە و سەری پێکرا. لەو ساتەدا کارەساتەکە بە مۆرکردنی بەختەکان دەستپێکرد. شیمەش کە بینی شوفێرەکە بەلادا کەوت، بە پرتاو خۆی فڕێدایە شوێنی لێخوڕەکە، لەبەر پرتاوییەکەی کەوتە پێش لوولەی برێن، ئەمەش بەر لەوەی شیمشۆن دەرفەتی هەبێ تەقەکە ڕابگرێ.

ئیدی دەستبەجێ گوللەکان بەشیمەش کەوت و گیانی لە دەست دا. ئێمە ئەوێمان بەبێ شوفێرەوە جێهێشت، (ئامۆن) دەستی بەسووکانەکەوە گرت، هەوڵیدا لۆریەکە بسوڕێنێتەوە، بەڵام پێی نەکرا. ئەو فیشەکی بەر پەراسووەکان و ئانیشکی کەوت. شیمشۆن غاریدایەوە لای جێبەکە، لەوێ لەپشت جێبەکە دامەزراو ڕێگەی لە هاتنە پێشەوەی سەربازەکان گرت. ئیدی لەوێ ئەویش پێکرا و کەوت. من هەرگیز پێشتر ئەوم نەبینیبوو، بەڵام لەو ساتەوە، کە ئەوم وا کارا بینی، پێیەوە سەرسام بووم. بەحەوسەڵەیی و چاونەترسی بێوێنە بوو. تەنانەت کە بەچاوی خۆشی بینی، هەموو شتێک لە دەست چوو، هیچ هەوڵێکی بۆ ڕزگارکردنی گیانی خۆی نەدا، بەڵکو بە مەبەستەوە بەرەو ئاگری ڕەشاشەکەوە ڕۆیشت تا ڕێگەی هەڵاتنی ئێمە بکاتەوە.

"(نسیم کازاس) بە دەستی بەتاڵەوە خۆی هەڵدایە سەر ئەو سەربازەی بە چەکەکەی سێرەی لێگرتبوو، ئەوی فڕێدایە سەر زەوی و کەللە سەرێکی لێدا. حەیف لەوێدا بریندار بوو. مایک، بارکو و شیمۆن زۆریان غارنەدا. هەر سێکیان بەیەکەوە کەوتبوون و بەسەختی لە شانیانەوە بریندار ببوون. موشێ سالامۆن، جۆزێف داهار و من لە ئەوانی دیکە زیاتر ڕۆیشتین. ئێمە گەیشتینە کێڵگەیەکی گەنمەشامی لەوێ خۆمان نەوی کرد و زەویەکەمان پشکنی. لە بەردەم ئێمەدا گەنمەشامی هەبوو، بینیمان چۆن سەرباز بەنێو گەنمەشامیدا غار دەدەن. ڕێگای لایەکەی دیکەی کێڵگەی گەنمەشامییەکە پڕ لە سەرباز و پۆلیس بوو. کێڵگەکە بچکۆلانەبوو، تاکە ڕێگای دەرچوونیش لەوێ هەر دەبوایە لەو مەیدانە کراوەی لاپاڵ ڕێگاکە بوو؛ بەڵام خۆ لەوێ دەمودەست دەبیندراین. بڕیارماندا هەر لەوێ خۆمان مات بکەین تا تاریک دادێ.

"دوای پازدە خولەک سەربازەکان هاتنە کێڵگەکە و ئێمەیان دۆزیەوە. دوای ئەوەی خۆشمان بەدەستەوەدا، ئەوان هەر تەقەیان لێکردین. هەر بە پەرجوو ڕزگارمان بوو. یوسف دیسان بریندار کرایەوە. لەوێ ئێمە لە ڕێی خۆتێهەڵقورتاندنی ئەفسەرێکی پۆلیسەوە ڕزگارمان بوو، کەبە سەربازەکانی گوت نابێ بمانکوژن. شیمۆن، مایک و باروک ئەو بەختەیان نەبوو، ئەوان هەر بە برینداری لەسەر زەوی کەوتبوون و هەریەکەیان سێ گوللەیان لە زگیان درا. پەرجووئاسا گوللە بەر باروک نەکەوت.

"ئەوان، ئێمەیـان بـردە لای زیلێـک. برینـدارەکانیان لەسـەر زەوی بەدوای خۆیاندا ڕاکێشان تا گەیاندیانە زیلێک وەک ئەوەی کالایەک فڕێ بدەیتە سەر یەک. ئـێمە، برینـدارەکان و کوژراوەکـان فڕێـدراینە نێـو ترومبێلکێکـی شڕووڕەوە. تەنها موشێ سالامۆن کە هیچی بەرنەکەوتبوو، منیش کە تەنها لە دەست بریندار ببووم توانیمان یارمەتی ئەوانی دیکە بدەین. سەبارەت بە هەستەکانیشمان هیچ پێویست نییە لێرەدا یاداشتی بکەم.

"دوای ئەوەی توانیمـان مردووەکـان ڕابکێشـین و لە برینـدارەکانیان جیـا بکەینەوە، بەشـی زۆری ڕێگـاکە هەر لەگەڵ شیمۆندا دەدوام. ئەو دەیزانـی دەمرێ. هەوڵمدا نکولی لە مەترسی مردنەکەی بکەم و دڵی بدەمەوە. ئاخر زۆر قورس بوو بڕوا بەوە بکەی، ئەو پیاوە بمرێ. ناوبەناوە هەنسکێکی دەدا، بەڵام بە یەکجاریش ئەمەی لە دەم دەرهات: "من چاک دەبمەوە. خەم مەخۆ." کاتێک ئێمە برینداریکی دیکە، ئامنۆمـان ڕاکێشـا، پاسێک کە پڕی جوولەکە بوو لەسەر ڕێگاکە وەستابوو. مایک لەسەر تەختەکە ڕاکشابوو، ڕووخساری وەستاوەکانی بینی، دەموچاوێکی تۆقاوی بینین و هاواری بۆ کردن: "ئەرێ هۆ جووەکان، ئێمە لەپێناوی ئێوەدا دەمرین."

لە ڕێگـا بـۆ نەخۆشـخانە ئێمەیـان بـردە پۆلیسـخانەی عەککـا. لەوێـدا بریندارەکانیان فڕێدانە سەر شۆستەکە. لەبەر هاوار، تکا و پاڕانەوەی من بەڵکو دکتۆر بێتە سەریان، وەڵامیان هەر ئەوە بوو: "دەمت داخە!"

"یەکەمین کەس شیمون بوو مرد. من هەموو کاتەکەی لەگەڵدا بووم. ئەو تا دواساتی ئاویلکە بێدار بوو. من ناتوانم ئەوەت پێبڵێم، کە بینیم ئەو برادەرە باشەم گیان لە دەست دەدا. گەورەترین خەم و مەراقی ئەوە بوو، مردنەکەی دایباب و برادەرانی ماتەمبار دەکا. 'سڵاوم بگەیەنە تەواوی کوڕەکان. پێیان بڵێ داخ نەخۆن'، ئەو کە بەزەحمەت هەناسەی دەدایەوە وای پێگوتم. "پێیان بڵێ کۆڵ نەدەن. بۆ دایباب و خوشکەکانم بنووسە و دڵنەواییان بدەوە.' دوا وشەشی ئەوە بوو: '(ماتی)[٩٠] تۆڵە، تۆڵـــە.'

"لیڤیش بە دەردەسـەرییەکی سـامناکەوە مـرد. ئەو لەسـییەکانەوە پێکرابـوو، خەریکبوو دەخنکا. ئای ڕەوشەکەم چ ڕەوشێکی سامناک بوو، سەیری هەر لایەک دەکەم هەر هەنسـک و نـوزەی خنکـانە و هیچشـم بۆیـان لە دەسـت

---

[٩٠] ناوی ئەو جەنگاوەرەیە کە سەربردەکە دەگێڕێتەوە. وەرگێڕ.

نەدەهـات. لیڤـی لەسـەر ئەمـلا خـۆی فـڕێ دەدایە ئەولا، هەڵدەسـتا و درێـژ دەبووە ، قیژەی لێهەڵدەستا و حەجمانی لەبەر بڕا بوو، تا لە دواییدا خنکا.
"مایکیش تا دوا ساتی هەر نوکتەی دەکردن. هەمان تەمەنی مایکی هەبوو. من دەستیم گرتبوو، هەستم کرد تـا دەهـات سـارد و سـاردتر دەبێتەوە، هێشتاش بـڕوام نەدەکـرد کە دەمـرێ. ئەو بەردەوام تـا کۆتـاییەکەی دڵـنەوای منـی دەکردەوە. 'خەم مەخۆ، من هێشتا باشم. تۆڵەیان لێ دەکەینەوە.'
"(نیچـۆ)ش بە بێدەنگی لێیکەوتبـوو. کاتێک لەسـەر پشـت ڕادەکشـا، دەمبینـی خـوێن چـۆن لەلاتەنیشـتی فـیچقەی دەکـرد، پێمـدەگوت هـیچ نەبـزوێ. ئەو لە قاچیش زامدار ببوو، بۆیە سـەخت بـوو لەسـەر ئەولای بکەوێ. دوای چەنـد خولەکێـک بەدەنگێکـی خۆبەدەسـتەوەدەرانە گـوتی: 'مـاتی، دەکـرێ خـۆم وەرگێڕم. ئاخر سەختە هەر لەسەر ئەولایە بم.'
"کـاتێکیش پزیشـکەکە هـات، ئەو منـی نـاردە لای ئەوانـی دیـکە و پێیگـوتم ، هەست دەکەم باشم،'
"شتێکی دڵنیـابوو زۆرینەی کوڕەکـان کە لەبەر برینەکانیـان مـردن، دەکرا گەر دەرمانیـان بـدرابایە و تیمـار کرابـان، ژیانیـان ڕزگـار کرابـا. ئەوەی کە کـرا، ئەوان بۆ ماوەی شەش سەعات بەو خوێن لەبەرچوونە بێ هیچ تیمارکردنێک لەو گۆڕە ڕاگیران...."
سێ لەو پێنج پیاوانەی کە لە میانەی شـەڕی عەککـادا گیـران، بردرانە بەردەم دادگـایەکی سـەربازی لە ئۆرشـەلیم. ئـێمە دەمـانزانی گەر هاتبـا و ڕزگارمـان نەکردبان، کەس ڕزگاریان نەدەکردن. لەو کاتەی پێواژۆی دادگاییکردنەکەیـان بەردەوام بـوو، بڕیارمـان دا دەسـتوبرد بکەیـن و بکەوینە خۆ. زانیاریمـان کـۆ کـردەوە. چـاوەڕوانی سـێ ئەفسـەری بەریتـانی بـووین کە لە مەلەوانـگەی راماتگـان بـوون. ئەوان نەهـاتن؛ بەڵام دوو پۆلیسـی بەریتـانی هـاتن. ئـێمە هەستمانکرد بۆ ڕزگارکردنی ئاڤشالۆم هاڤیڤ، مـایەر ناکار و یاکۆڤ وەیس پێویستیمان بە پلەداری بەریتانی یان کەسانی گرنگ هەیە. گرتنی دوو پۆلیس لەوانەیە دەرەقەتی مەبەستەکە نەیەت. بەڵام خۆ نائومێدیەکە هەر بە ئەوەندە کۆتـــایی نەهـــات. ئاژانســـی جووەکـــان هاگانـــای جۆشـــدا بەدوای پیاوە'رفێندراوەکاندا' بگەڕێن. وەک جاران ئەوان گومانیان هەبوو-یان وایان جاڕدا کە گومانیـان لەوە هەبێ- ئـێمە بـۆیە لەبەر ئەو ڕێکـارەداین و خەمـی

دەخۆین، بەڵکو سەرنجی کۆمیتەی نەتەوە یەکگرتووەکان  کە لە سەروبەندی گەیشتنە وڵات بوون، بۆ خۆمان ڕاکێشین. هاگانا هەموو هەوڵێکی دەدا بۆ ئەوەی "پیاوە رفێندراوەکان ڕزگار بکەن". ئەمجارەیان لە هەوڵەکەیاندا سەرکەوتن. چەند ڕۆژێک دواتر دەسەڵاتدارە بەریتانییەکان توانیان ئەو شوێنە بدۆزنەوە، کە پۆلیسەکانیان لێ بەندکرابوون. چەند ڕۆژێکیش دواتر حکوومەتی بەریتانی بڕیاری لێخۆشبوونی بۆ سێ کەس لە پیاوەکانی هاگانا دەرکرد،کە لەسەر "چەکی قاچاخ" حوکمیان بەسەردا درابوو.
سێ پیاوەکەی ئیرگونیش بە جۆش و شکۆوە ڕوویان لە دادوەرەکان کرد. ئاڤشالۆم هاڤیڤ هێڵێکی تەریبانەی لەگەڵ یاخیبووە ئایرشییەکان دژی دەسەڵاتی بەریتانی کێشا:
"کاتێک ڕۆڵەکانی ئیرلەندا دژی ئێوە ڕاپەڕین، کاتێک پیاوانی ژێرزەمینیی ئایریشەکان دژی ئێوە دەستیان دایە چەک، ئێوە هەوڵتان دا ڕاپەڕینەکە بکەنە ڕووباری خوێن. ئێوە سێدارەتان هەڵبەست، ئێوە لە شەقامەکاندا دەستان بە کوشتوبڕی کرد، ئێوە خەڵکتان تاراند و نەفیتان کردن، ئێوە لەسەر دەبەنگییەکەتان ڕۆیشتن، گێلانە بڕواتان وا بوو بەو چەوساندنەوە و سەرکوتکردنە گیانی بەرگری ئیرلەندییە ئازادەکان دەشکێنن، ئاخر ئەو گیانی بەرگرییە خەڵاتێکی خواییە، داویەتە هەموو پیاوێکی شایستە. ئێوە هەڵەبوون. بەرگری ئایرشییەکان چڕتربووەوە. خوێنی جەنگاوەران، ئازار و ئەشکەنجە خەڵکی لە دەورەی ئاڵای یاخیبوون کۆ کردەوە، تا وای لێکردن بە تەواوی ناچاربن بکشێنەوە، بەدوای خۆشتاندا ئەو پەڵە خوێنە سامناک و ئەو یادەوریيە لەبیرنەکراوە بەجێبێڵن. ئیرلەندای سەربەست سەرەڕای ئێوەش هەر سەریهەڵدا...
"خۆ ئەگەر ئێوە عاقڵ بان، ستەمکاری بەریتانی دەبوایە وانە لە مێژوودا فێر بووبا، نموونەی ئیرلەندا و ئەمریکا بەسە بۆ ئەوەی قەناعەتتان پێبهێنێ، خێرا لە وڵاتەکەمان دەربچن، کە هەنووکە بۆتە مەشخەڵێکی پیرۆزی یاخیبوون، مەشخەڵانێک کە ناکوژێتەوە، بەڵکو تا دێ زیاتر بە هەر دڵۆپە خوێنێکی ڕژاوی ئێوە یان دژی ئێوە درەوشاوتر دەبێ. ئەوسا ئێوە دەبێ سەرتان بۆ وشە ئاگادارینامەکانی شۆڕ بکەن، ئەو وشانەی لەسەر زمانی بێرناردشۆ لە

ڕۆژانی ڕاپەڕینی ئایریشییەکان لە 1916دا دوای ئەوەی لەداردەرەکەی ئێوە دیلە جەنگییەکانی ئایرشی لەسێدارە دان، کەوتنە سەر زاری خەڵکی.

بەڕێز بێرناردشۆ نووسیبووی:

"بە بڕوای تایبەتی من، ئەو پیاوانەی، کە بە خوێنساردی تەقەیان لێکرا، ئەمەش دوای گیران و یان خۆبەدەستەوەدانیان، بوونە دیلی جەنگ و ئیدی دروست نییە لەناو ببرێن. ئەو ئایرشیەی دەست دەداتە چەک و مەبەستی سەربەخۆیی وڵاتەکەیەتی، ڕێک هەر ئەو کارە دەکا کە ئینگلیزێک دەیکا، کاتێ بەدبەختی بۆ دێ و کاتێ لە لایەن ئاڵمانەکان هێرشی دەکرێتە سەر و وڵاتەکەی داگیر دەکرێ. ڕاستی ئەوەیە، ئەو دەزانی دوژمنەکەی ڕێزی مافەکانی ناگرێ کاتێ بکەوێتە دەستی، ئیدی هەر بۆیە و پێویستیشە بەو پەتەی کەوتۆتە ملی بجەنگێ، ئەوەش نەوەک هەر سەرچڵییەکەی زیاد دەکا بەڵکو لە چاوی وڵاتپارێزانی جیهان هەمان پێوەری نەمری و کارنگازی و سەروسامانیان لێزیاد دەکا. ئایرشمانی پێکراو شوێنی خۆی لە پاڵ ئێمە دەگرێ و شەهیدانی مانشستەریش لە ئێرلەندا لە پاڵ پاڵەوانەکانی پۆلەندا و سێربیا و بەلژیکن لە ئەوروپا، هیچ شتێکیش نە لە ئاسمان و نە لە زەویدا ڕێگەی ئەوەیان پێناگیرێ..."[910]

"ئەو وشانە لە کۆنەوە لەسەر کالانی شیر و خەنجەدرا بەرجەستە بوون. بەڵام خۆ دەسەڵاتدارانی ئێوە کوێرن و نایانەوێ تێبگەن. کێ دەیزانی؟ بەڵکو ئەوان لە لایەن پەروەردگاری مەزنەوە کوێر کرابن بۆ ئەوەی ئەو خوێن و فرمێسکەی لە وڵاتەکەی من و شوێنانی دیکە بەهۆی ئەوانەوە ڕژێندراوە، تاج و تەختیان سەرەونخون بکاتەوە..."

"ستەمکاران هەرگیز لە گیانی کەسانێکی ئازای وەک دۆڤ گرەنەر و هاوڕێکانی کە بە گۆرانییێکی ناخی دڵیانەوە بەپیر مەرگەوە چوون، ناگەن. دیارە تۆش لەمە تێناگەی: من، لاوێکی جوو، کە ڕووبەڕووی حوکمی مەرگ بوومەتەوە، دڵم بۆ لای خوا بەرزبۆتەوە، پەسنی شوکرانە بژێری ئەوە. بۆ ئەو ژانوناسۆرەی گەل و نیشتمانەکەم و لە کانگای دڵمەوە دەڵێ: "مەزن و

---

[910] نامەیەک بۆ ڕۆژنامەی دەیلی نیوز، 10ی ئایاری ١٩١٦.

پیرۆزی، هۆ خواوەندم، پاشای سەر تەختی بوونەوەر، تۆ ئێمەت لە ژیاندا هێشتۆتەوە، ئێمەت پاراستووە، ئێمەت گەیاندۆتە ئەم وەرزە."[92]
مایەر ناکاری هاورێشی پلارێکی جەرگبڕی لە ڕەوشی سیاسیانەی حکوومەتی مانداتی بەریتانی گرت:
"دەسەڵاتی بەریتانی لە ئێرتز ئیسرائیلدا نابوتە... ئەو حکوومەتەی کاربەدەستەکانی لەپشت گێتۆی شوورە و پەرژینی تەلبەندکراودا بژین، ئایا ئەوە حکوومەتە؟ حکوومەتێک نزیکەی نیوەی بودجەی خۆی لە ئامانجەکانی پۆلیس خەرج بکات و هێشتاش هیچی لەگەڵ تورەیی گەلێکی یاخی پێنەکرێ، ئایا ئەمە حکوومەتە؟"
یاکۆڤ وەیس، ئەو کەسەی لە هەنگاریا سەدان جوولەکەی لە دەستی نازییەکان قوتار کرد، باسی ئەو ڕەفتارە درندانەیەی برینداره دیلەکانی ئیرگون لە قەلازیندانی عەککا کرد و هۆشداری دایە دەسەڵاتداران کە قانونی تۆڵەکردنەوەش دەستبەکاربوو. "هەرچەندە ئێمە بە ئێوە بەراورد ناکرێین" ئەو وای جاڕدا، "لەبارەی ڕەفتارنواندن لەگەڵ بریندااران و لەبارەی سادیزمایەتی، ئێوە بۆ هەموو ئەو شتانە دەبێ باجی تەواوی خۆتان بدەن."
"ئێمە گەفەکانی ئێوە بۆ کوشتوبڕ ڕیسوا دەکەین." ئەو وا لەسەری بەردەوام بوو. "ئێمە دەزانین لەو جەنگەدا تەنها یەک دەرچەڕێگا هەیە: گەلەکەمان بە ئازادی خۆی دەگا و کۆیلایەتیش لە وڵاتدا تەفروتونا دەبێ. هەر بۆیەشە ئێمە ئارامگرتووین. لەوەش زیاتر: ئێمە دڵشادین. شادمانی لەوە زیاتر نابێ کە گیانت لەپێناو سەرمەشقێکی مەزن دابنێی، بۆ ئەوەش بیزانی، بە باشی بیزانە، ئێمە لەنێو ئەو ڕەوشەدا ئاراستەی تەواومان خەریکی جێبەجێکردنی ئەو ئامانجەین."
لە 16ی حوزەیرانی 1947دا، ئەفسەرە بەریتانییەکان سیدارە(شەپقە)یان لەسەر کرد، ئیدی یەکێکیان بە هاڤیف، ناکار و وەیسی ڕاگەیاند: "ئێوە بڕیاری لەسێدارەدانتان دراوە، بە ملەوە تا مردن هەڵدەواسرێن."
هەرسێکیشیان سروودی هاتیکڤایان گوتەوە.
ئەوێ ڕۆژێ کۆمیتە تایبەتیەکەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دەستبەکار بوو. گومانی تێدا نەبوو سەرە دەستڕۆیشتووە سیاسییەکانی

[92] نوێژ و سرووتی شێهەچیایانو، کە جوومکان لە ناهەنگ و بۆنە خۆشەکاندا دەیڵێنەوە.

پشـت پەردەی دادوەرەکـان ڕێکەوتـی حوکمـدانەکەیان وا ڕێکخسـتبوو بـۆ ئەوەی بیسـەلمێنن، کـۆمیتەی بەدواداچـوون هەبێ و نەبێ، هەر حکـوومەتی بەریتانی لە وڵاتەکەدا زاڵە.
ئێمە یاداشتێکمان دایە کـۆمیتە تـایبەتییەکە. بڕیـاڕی دانیشـتنە تـایبەتییەکەی کۆمەڵەی گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانمـان بیرخسـتنەوە، کە داوای لە هەموو لایەنە ناکۆکەکانی فەلەستین کردبوو خۆیـان لە توندوتیژی و گەف و هەڕەشـەوە بە دوور بگـرن. ئـێمە ڕاگەیانـدنی پێشـووی ڕێکخراوەکـانی ژێرزەمینییمان بۆ دووپاتکردنەوە، ئەگەر حکوومەتی بەریتانیش هەمان شت بکـا، ئـێمە ڕێـزی داوانـامەی (ر.ن.ی)[٩٣] دەگـرین. ئـاخر ئەوان بەشـێکی نـاکۆکییەکە بـوون. (ر.ن.ی) داوای لەوانـیش کردبـوو. حـوکمی مەرگ و لەسـێدارەدانەکان کردەوەگەلێکـی نەیـارانە و تونـدوتیژ بـوون، حکـوومەتیش فەرمانبەردار بوو لێیان دوور بکەوێتەوە. لە کۆتاییدا داوامـان کرد، کۆمیتەکە لە بری حوکمبەسـەردادراوەکاندا بەگوێرەی پێشـینەی ڕێککەوتننـامەی گریـک کە لە هەمان کات و هەمان هەلومەرجیش بوو، بکەوێتە نێوانەوە.
لەپێنـاو بەگەڕخسـتنی ئەو ئەگەر و توانسـتە، نـامەیەکیش لە دایبـابی کوڕەکانەوە بۆ کۆمیتە تایبەتیەکە نێردرا. زۆرینەی ئەندامانی کۆمیتەکە وەک بەڕێز گرانـدۆس ئەندامێکی جوامێری کۆمیتەکە پێی ڕاگەیانـدم، مشـتومڕیان لەسەر ئەوە بوو، کۆمیتەکە هەمان داواشی لە حکوومەت کردبوو. کۆمیتەکە لەبن باری ئەو ڕاستیەی کە حکوومەت لەو ڕۆژەدا بڕیـاری حـوکمی مەرگـی بەسەر بەندکراوەکاندا کردبوو، هەستی بە سـووکایەتییک کرد. مقۆمقۆی نێو کۆمیتەکە زۆر گەرموگوڕ و توند بـوو. دکتـۆر گرانـادۆس مامۆسـتای زانکـۆی فابریگـات لە ئۆرۆگـوای و د. بێرلیـژ لە یۆگسـلافیا بە هەمـوو هێزێکیـانەوە شـەڕی ئەوەیـان بـوو چـۆن هاوتایەکانیـان لە ئەنـدامانی کـۆمیتەکە قەنـاعەت پێبهێنن داوای هەڵوەشاندنەوەی بڕیاری حوکمی لەسێدارەدان بکەن.
دوای پێـنج دانیشـتنی تـایبەتی کـۆمیتەکە، ئەم برووسـکەیەی خـوارەوە بـۆ سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان نێردرا.
لەبەر چـاوی ڕاسـتی زۆرینـەی ئەنـدامانی کـۆمیتەکە، کە خەمخـۆری خۆیـان لەهەمـبەر ئەو لـێکەوتە تـاڵەی ڕاگەیانـدنی حـوکمی لەسـێدارەدانی دادگـای

---

[٩٣] ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان.

سەربازی لە ئۆرشەلیمدا لە 16ی حوزەیراندا، ئەو ڕۆژەی یەکەمین دانیشتنی کۆمیتەکە بوو لە ئۆرشەلیمدا، بۆ ئەوەی بەکارەکانی خۆی رابێ کە کۆمەڵەی گشـــتی نەتەوە یەکگرتووەکـــان متمـــانەی داوەتە کـــۆمیتەکە و بیـــروڕای ئەنـدامەکانی لەمەڕ مەودای چارەســەرکردنی پرسـی فەلەســتین کە لە 15ی ئایـاری کـۆمەڵەی گشـتی بەخـۆی هەڵگرتـووە، بەهەنـد هەڵبگـرێ؛ کـۆمیتەکە سـەرۆکەکەی خـۆی راسـپارد دانەیەکـی لەبەرگیـراوەی بڕیـارەکە و نـامەی پێگەیشـتووی لە خزمەکـانی حوکمـدراوەکان بـۆ ئەوەی بـۆ دەسـەڵاتی مانـدات بگوازرێتەوە، بۆ سکرتێری گشتی نەتەوە یەککرتووەکان بنێرێ.
دەمودەسـتیش ئەم بروسـکەیە و وەڵامـی تونـدی گێرنـی، سـکرتێری گشـتی حکوومەتی فەلەستینیشی بۆ ڕای گشتی بڵاوکرایەوە.
بە پشتبەســتن بەو پێشـینەیەی لە دۆزی جەنگـاوەرانی گەریـلای گـریکەوە، ئێمەش بەنـاوی کەسـە حوکمـدراوەکانەوە فشـارمان خسـتە سـەر کـۆمیتەی تـایبەتی نەتەوە یەککگرتووەکـان خـۆی لەپرسـی حوکمـدراوەکان هەڵبقـورتێنێ، بـانگی حوکمدارەوەکان بکـا تـا شـایەدی و ئیفـادە لە بەردەم ئەوانـدا بـدرێ. لە 23ی حوزەیرانـدا نـامەیەکی فەرمیمـان بـۆ کـۆمیتەکە بەم شـێوەیەی خـوارەوە نووسـی:
"لە بیرخەرەوەیەکدا کە لەو چەند ڕۆژانەی دادێ پێشکەشی کۆمیتەی دەکەین، ئێمە لەنێو ئەوانەشدا ڕەفتار لەگەڵ تاوانەکانی حکوومەتی بەریتانیاندا دەکەین کە دژی گەلەکەمانی کردووە ئەوسا چ لە نیشتمان بێ و چ لە هەندەراندا بێ.
"لەنێو ئەو لیستە دووروودرێژەی تاوانەکان کە بۆتـان دەردەکەوێ، بە ئـازار و ئەشـکەنجەدانی دیلەکـان و کوشـتنی بەئەنقەسـتی دیـلە بریندارەکانیشـەوە. بەگـوێرەی پێناسـە فەرمـانبەردارەکەی دادگـای نێـودەوڵەتی لە نیورنبێرگـدا، ئەم تـاوانە یەکـێکە لە 'تاوانەکـانی دژی مرۆڤـایەتی' و یەکـێکە لەو تـاوانە دڕەندە و سامناکانەی دژی ئادەمیزاد دەکرێ.
"ئێمە گومانمـان لە کـۆمیتەکە نییە، بـۆ ئەوە دەستنیشـانکراوە ڕامـانی خـۆی سـەبارەت بە ڕژێمـی بەڕێوەبردن لە وڵاتەکەمانـدا دەربـبڕێ وەک هەر جـۆرە ڕژێمێـک کە هەبـێ، نـابێ ئەو تاوانبـارکردنە مەزنـانەی دژی حکـوومەتی بەریتـانی فەرامـۆش بکـا. لە سـەرێکی دیکەشـەوە وای دادەنێـین، کـۆمیتەکە ناخوازێ خۆی باوەڕ بە بیستنی تاوانبارییەکان بکا، بەڵام دەبێ لەسروشتی

شتەکانەوە ئارەزوومەند بێ ڕاستیەکان جێگیر بکا، کە لەنێویاندا ڕەتدانەوەی تاوانبارکردنەکانیش جێ دەگرێ. هەر بۆیە پێشنیاز دەکەین کۆمیتەکە گوێ لە شاهیدە کێبەرکارەکان بگرێ، کە مادەی ڕاستەقینە دەدەنە بەردەست، ئەوسا بەهۆیەوە کۆمیتەکە دەتوانێ لەپێناوی ڕاستیەکان هەرچیەک بێ، لێکۆڵینەوەی خۆی بکا.

"ئەو شاهیدانەی دەتوانن بێنە بەردەم کۆمیتەکە ڕاستی زۆر گرنگیان سەبارەت بە تاوانبارکردنی ڕژێمی بەریتانی لە لایە ئەمانەن: یاکۆڤ وەیس، مایەر ناکار و ئاڤشالۆم هابیبن، ئەمانە خۆیان گەواهیدەرن و دەربڕی ڕەفتاری تاوانبارانەی 'هێزە ئاسایشییەکانی' بەریتانیین لەگەڵ دیل و بریندارەکاندا.

"ئەم سێ دیلانە هەنووکە لە چاوەزیندانی حوکمبەسەرداکراودان لە زیندانی عەککادا. ئەوان لە لایەن دادگایەکی سەربازی بەریتانییەوە حوکمی مەرگیان بەسەردا دراوە و ئێستا لەژێر هەڕەشەی کوشتن دان. دەسەڵاتدارە داگیرکارەکان خواخوایانە هەرچی زووە پەلە لە جێبەجێکردنی حوکمەکەیان بکەن، بۆ ئەوەی ڕێگە لە ئامادەبوونیان لەبەدەم کۆمیتەکەتاندا بگرن. پرسەکەش لێرەدا ئەوەیە ئایا بۆ ئیفادە و گەواهیدان بانگ دەکرێن کە هی ئەوە نییە چیدییکە بوەخرێندرێ.

"ئێمە بە ڕێزەوە پێشنیازی ئەوە بۆ کۆمیتەکە دەکەین کە داوا لە حکوومەتی داگیرکاری بەریتانیا بکا گەفی کوشتنی دیلەکان هەڵبگرێ و ئەوان وەک شایەت بهێنێتە بەردەم کۆمیتەکەتان بۆ ئەوەی تۆمەتبارکردن و بەدڕەفتاری و کوشتنی بریندارەکان بسەلمێندرێ.

"ئێمە دەبێ ئاماژە بەوە بکەین، ئەم پێشنیازە بەنیەتی جێگرتنەوەی داوانامەی پێشترمان لە کۆمیتەکە نەکراوە -کە هێشتا هەر دەیخوا- بۆ ئەوەی هەنگاوی پێویست بە هەڵوەشاندنەوەی حوکمە نایاساییەکانی دادگا سەربازییەکە بگرێتە بەر.

دڵسۆزتان،

ئیرگون زڤای لیومی لە ئێرتز ئیسرائیل."

بەڵام خۆ نەدەکرا هەر پشت بە کۆمیتەکە ببەستین، نەخاسمە کاتێک بینیمان چۆن حکوومەتی بەریتانی مەیلی لە خۆفشکردنەوە و نمایشکردنی باڵادەستێتی خۆی بەسەر کۆمیتەکەدا هەبوو، هەروەها چۆن حکوومەتەکە خۆی لە بڕیارەکانی کۆمیتەکە نەبان دەکرد، هەروەک سەرۆکەکەیان دادوەر ساندستروم ڕوونی کردبووەوە. بۆیە ئێمە فشاری زیاترمان بۆ گرتنی بەریتانییەکان خستە ڕوو. چەند جارێک لە ئۆرشەلیم و هێرزالیا خەریکبوو چنگمان لە کەسێکی زۆر گرنگیان گیر ببێ، بەڵام بەهەر هۆیەک بێ لە دەستمان دەردەچوو. لە کۆتاییدا تەنها لە ناتانیادا پیاوەکانمان توانیان دوو ئاژانی دەزگای هەواڵگری بەریتانی دەستگیر بکەن، لێ پلەکانیان باڵا نەبوون. ئەوان پلەی چاوەش (سێرجێنت Sergeant) یان هەبوو.

هەر دوای دەستگیرکردنی دوو کەسەکەیان، دەستبەجێ حکوومەت باری ناکاوی لە ناتانیاهۆ ڕاگەیاند، لێبڕاوانە پێی لەسەر ئەوە داگرت، دەبێ گیراوەکانیان بدۆزنەوە. هاگاناش بۆ دۆزینەوەی دوو کەسەکان هاوکارییان کرد. بۆ چەندان هەفتە ماڵ بە ماڵی ناوچەکە گەڕان، هەموو هەوڵێکیان دا، لێ هەڵمەتەکەیان بێهودە بوو.

لە 23ی تەموزیشدا، هاڤیف، ناکار و وەیسیان بردنە سەر پەتی سێدارە.

چۆنیەتی بردنی ئەوان بۆ سەر پەتی سێدارە لە نامەیەکی (ناتهان)ی لە زیندانی عەککا و لە 29ی تەموزی 1947دا ئاوا باسیان دەکا.

"ئەم بەیانییە هەرسێ هاوڕێکانمان پاڵەوانانە چوونە بەر پەتی سێدارە. ئێمە دوێنێ شەو دەمانزانی شتەکە لەنێوان سەعات چوار و پێنجی بەرەبەیاندا ڕوودەدا. کاتێکیش بە هەواڵەکەمان زانی لەپشت شیشەکانی زیندانەوە بە هەناسەسواری هاوارمان کرد و بێئومێدانە لەوەی لە چاوەزیندانی دیکە ڕووی دەدا، دەمانڕوانی. مێجەر چارلتۆن شوێنەکەی بەجێدا بوو، هەر لە ئێوارەوە دیار نەما. لە شەویشدا دەستەی مەرگچێن لە پۆلیس و سەرباز گەیشتن. ئەوان هەموو شتەکانی پیاوە حوکمدراوەکانیان گۆڕی و عەزیز میزراحیش –چوارەمین کەسی حوکمدراو بە مەرگ– لە چاوەزیندانییەکەیان دەرهێنا. پاشان ئەفسەرە بەریتانییەکان پێیانڕاگەیاندن لەنێوان سەعات چوار بۆ پێنجی ئەم بەرەبەیانە لەسێدارە دەدرێن. وەڵامە بە هێزەکەی ئەوانیش گوتنەوەی سروودی هاتیکڤا، "گۆرانی لە بەردەم بەربەستەکان" و

گۆرانییەکانی دیکە بوون. ئەوان هاواریان کرد، هەڵواسینەکەیان لە سەعات چوار بەم ڕیزبەندییە دەست پێدەکا: هاڤیڤ، ناکار، وەیس. ئەوەشیان بۆ زیادکرد: "تۆڵەی خوێنەکەمان بکەنەوە."
ئێمەش هاوارمان کردەوە: "بەهێز بن. ئێمە هەموومان لەگەڵتانین، هەزاران لاوی جور لەگەڵ گیان و ورەتانە."
"ئەوانیش وەڵامیان دایەوە، سوپاس، لەسەر گۆرانیەکانیان بەردەوام بوون.
"لە سەعات دووی دوای نیوەشەودا رابی سیفاردی کە لە دوورەوە نەدەناسرایەوە، هێنرابوو و پازدە خولەک لەگەڵیان لە چاوە زیندانەکەدا مایەوە.
"لە سەعات چواری بەربەیانیشدا ئاڤشالۆم دەستی بە خوێندنەوەی سروودی هاتیکڤا کرد، ئێمە پاڵمان بەشیشەکانی چاوەزیندانیەکانمانەوە نابوو، بەدەنگی بەرزەوە سروودەکەمان لەگەڵ دەگوتنەوە. ئیدی دەستبەجێش پۆلیسی چەکدار هاتە بەردەم شیشەبەندییەکانی هۆڵی سەردانیکردنی نزیک چاوە زیندانییەکەمان. لە سەعات چوار و سێ خولەکدا ئاڤشالۆم لەسێدارە درا. لە 4.25یشدا بەدەنگی بەهێزی مایەر راچڵەکین کە سروودەکەی دەگوتەوە. بەئاستەم دەتواندرا هەناسە بدەین، کەچی ئێمە لەگەڵیدا گوتمانەوە. ئەویش لە 4.28دا هەڵواسرا. لە سەعات پێنجیشدا بە تەنیا دەنگی یاکۆڤ هات، دەنگی ئەو گەیشتە ژوورەکانمان، سروودی هاتیکڤای دەگوتەوە. دیسان لەگەڵمان گوتەوە. دوو خولەک دواتر ئەویش بەملەوە هەڵواسرا. هەر تەرمێکیش بۆ ماوەی بیست خولەک بە هەڵواسروای مایەوە و هەر یەکەشیان بەجیا لە چاوە زیندانەکەدا بردە دەرەوە.
لە داردەرە سەرەکیەکانیش هاکێت، سەرپەرشتیاری زیندانەکە و کاپتن کلەف سەرپەرشتیاری زیندانی نابلس بوون، کە دۆڤ و هاوڕێکانی لەدار دا. لە کازیوەشدا ئێمە لە رێی ئەفسەرێکی عەرەبەوە بە ئەفسەرانی زیندانەکەمان ڕاگەیاند، کە بەرپرس نین لە سەلامەتی ژیانی هەر ئینگلیزێک لە نێو حەوشەی زیندانەکەوە ببینین. ئێمە نوێژمان کرد و جاڕی ڕۆژوگرتنیشمان دا. دواتر بە درەنگەوە نووسینێکی هەڵکەندراومان لەسەر دیواری حوکمداروەکاندا دۆزیەوە. نووسرابوو: "ئەوان ناتوانن بە هەڵواسینەکانیان

گەنجانی عیبری لە نیشتمانەکەیاندا بترسێنن. بە هەزاران هەنگاوەکانمان دەگرنەبەر."

"لەوێدا دروشمی ئیرگون و بە ڕێزبەندیشەوە ناوی هەر سێ لەداردراوەکە لەسەر دیوارەکە هەبوو.

"ئێمە بە ڕۆژمێری ئاقشالۆمەوە نووساین کە بە لەسەر دیوارەوە نووسرا بوو. لە سەرەتای دادگاییکردنەکەدا پرسیبووی خۆ ئەگەر ژیانی ئەو کۆتایی نەهاتبێ، ئەوا بەلای ئەوە کۆتایی هاتووە. داخوازیەکەی دەبێ بێتەدی."

ڕۆژی پاشتر دوو گیراوە بەریتانییەکەش لەداردران. ئێمە بەهەمان شێوە وەلامی دوژمنمان دایەوە. ئاخر ئێمە دووبارە و چەندبارە ئاگادارمان کردبوونەوە. دوژمن زۆر بێباکانە هۆشداریەکەمانی بەهەند هەڵنەگرتبوو. دوژمن ناچاری کردین وەلامی سێدارە بە سێدارە بدەینەوە.

بەڵام ڕۆژەکان وەک شەوی بێ ئەستێرە ڕەش و تاریک بوون.

ئەرێ بۆچی بەریتانییەکان وێڕای هۆشدارییەکانی ئێمە و داوا و تکای ئەوانی دیکە، بێویژدانانە ئەوانەی لەسێدارەدان؟ لەوانەیە هێشتا قسە دەرزی ئاژنینەکەی چەرچڵیان لە گوێدا بزرەنگێتەوە کە پێی گوتبوون: "وەک پیاوان بجوڵێنەوە و بەدوای ئاراستەی قانونیشدا برۆن."

دڵنیا بوو هۆکاری سەرەکی سیاسی و خووپێوەگرتن حکوومەتی بەریتانی بە 'نەخشەی سێدارەکان' ئەو ئامادەکارییە بوو هەڵواسین و لەسەر ڕۆیشتن و بەردەوامی بوو لە کردەی هەڵواسیندا.

ئەمەش نەخشەیەکی فەرمی و بنەڕەتی لەندەن بوو. حکوومەتی بەریتانی لەو بڕوایەدا بوو بەشکاندنی بڕبڕەی پشتی دیلەکانی جەنگ، پشتی بەرگری عیبری دەشکێنێ. هەڵواسین، دیسان هەڵواسین، هێشتا هەڵواسینی دیکە! بەڵام خۆ پرسیارەکە -هەروەک جارێک لینین پرسی- ئەوە بوو کێ پشتی کێ دەشکێنێ؟ لەوێدا گومانی تێدا نییە گەر ئێمە تۆڵەمان نەکردبایەوە، ئەوا ڕیزە سێدارە لە هەموو فەلەستیندا دەچەقێندران و دەسەڵاتی بێگانە تا ڕۆژی ئەمڕۆشمان[٩٤] هەر دەمایەوە. کاتێکیش سێدارەکان تەفروتونا دەکرێن، ئەو ڕژێمەی بەهۆی ئەوانەوە پاڵی لێداوەتەوە شتێکی حەتمییە هەر دەبێ تێکبشکێ.

---

[٩٤] نوسەر ئاماژە بە ڕۆژی چاپکردنی کتێبەکە دەکا، کە لە 1977 بووە. وەرگێڕ.

ئەمەی خوارەوە بێ پێچوپەنا دەستەواژەی کەسێکی سادە نیە، بەڵکو هی سەرۆکی یاریدەدەرانی سکرتێری گشتی حکوومەتی بەریتانیا لە ئێرتز ئیسرائیل، هی کۆلۆنێل ئارچەر کەستە، لە وتارێکی لە کۆمەڵگەی پاشایەتی ئیمپراتۆریدا گوتبووی: "لەسێدارەدانی ئەو دوو چاوەشە(عەریف)ە بەریتانییە زیاتر لە هەموو شتێک کاری لێکردین لەوێ دەربچین."[95]
کاتێکیش نەتەوەیەک رادەهەژێ رۆڵە نازدارەکانی ئامادەن ژیانی خۆیان بە سەربەستی ببەخشن. کاتێکیش ئیمپراتۆریەتەکان گەفی رووخانیان لەسەر بێ، ئامادەن قوربانی بە عەریف و باشچاوەشەکانیان بدەن.

---

[95] United Empiral Journal, november-December, 1949.

## بەندی 22
## کۆبوونەوە لە ژێرزەمیندا

٤٣٧ - ٤٦٠

گۆشەگیری هەلومەرجێکی دەست لێهەڵنەگیراوی باری ژێرزەمینییە. لە ماوەی ساڵەکانی یاخیبووندا، دەبوایە تا ڕادەیەک خۆم لە خۆشیی دەمەتەقێ لەگەڵ دۆستان، کۆبوومەوە لەگەڵ برادەران یان یاوەری خزم و ئاشنایان ببوێرم. قانونی باری ژێرزەمینی ئەو 'کۆبوونەوە ناگرنگانە'ی لێ قەدەغە کردبووم. ئەو کەسە کەمانەی دەمدیتن و هاموشۆیان دەکردم بۆ گفتوگۆکردن بوون لەسەر کاری ڕێکخراوەکە، بۆ باسکردنی پەیوەندییەکانمان لەگەڵ نەتەوەکانی دیکە و پرسەکانی کارانگاز بەسەر خەباتەکەماندا.

یەکێ لە گرنگترین کۆبوونەوە نهێنییەکانی من ئەوێ دەمێ لەگەڵ نوێنەری کۆمیتەی نەتەوە یەکگرتووەکان بوو. خۆشمان لە ڕێکخستنی کۆبوونەوەکەدا دەستپێشخەر نەبووین، بەڵکو ئەندامەکانی خودی کۆمیتەکە بوون. هێشتاش وەک ئەوەی پێشتریش ناوم هێناوە، دامودەزگا فەرمییەکانی جوو، دەیانگوت هەر شتێک، ئێمە لە سەروبەندی هاتنی کۆمیتەکە کردبێتمان، هەر چالاکییەکمان ئەنجام دابێ، گوایە تەنهاوتەنها بۆ سەرنجڕاکێشانی ئەوان بووە، هەر بۆ ئەوە بووە وایان لێبکەین لەگەڵماندا بکەونە دانوستاندن. ئەو ئۆرگانانە وایان نمایش دەکرد، هەر ئەمەش وایکرد تەنانەت خەمی ئۆپەراسیۆنەکەی دژی خانووی سیتروس بخۆین. لە ئاکامیشدا خۆ جێی چاوەڕوانییە، ڕاستی چیرۆکی تونێلە ناودارەکەش بگێڕینەوە.

لە بەرامبەر سیتروس هاوس (ماڵی سیتروس)دا، خانووێکی بچووک کە ژێرزەمینێکی هەبوو هەر بۆ کۆگا دەستی دەدا. لە ڕۆژێکی هاوینی 1947دا بازرگانێکی خاوەن ڕامان بانگی خاوەنەکەی کرد و باسی بەکرێگرتنی ژێرزەمینەکەی لەگەڵ کرد، بەڵکو بیکاتە سارداو و کۆگای فەردە پەتاتە سەربەقەپاغەکان. ئەو بازرگانە سەر ڕووتەڵە ڕەنگ خۆڵەمێشییە، بووە مایەی متمانەی ماخۆی کەللەڕەقە. کرێنامەکەش واژۆ کرا. بازرگانەکە بە

خـۆی و بـاره لۆریەکـانی گەیشـت. دەرگەوانەکـان یەکەمـین هەگبەیـان سـەرەڕۆیانە دابەزانـد، ئیـدی سـەری فەردەکـان بـوونەوە و پەتـاتەش بە شـەقامەکە وەربـوون. بازرگـانەکەش کە ئالێکسـی خۆمـان بـوو، بەسـەریدا قیژاندن، بەڵام دڵخوازانەش لێگەڕا هەندێ لە دراوسێکان پەتاتەکان بۆ خۆیان کـۆ بـکەنەوە. نـاواخنی بـاقی فەردەکـانی دیـکە، بە سـەلامەتی هێنـرانە نێـو ژێرزەمینە بەکرێگیراوەکە.
لە ژێـرزەمینەکەدا دەسـت بەکـار کـرا. لەوێـدا هەر فەردەبـوو پـڕ دەکـرا و باردەکرا و دەڕۆیشت. پەتاتەفرۆشی بە شێوەیەکی بەرچاو هەرمێنی پەیدا کرد. ئەو فەردانەی لەو ژێرزەمینەدا دەبردرانەدەر، پڕی خۆڵی هەڵکۆڵدراوی ئەوێ بوون، ئەوە بوو 'دەرگەوانەکان' خەریکی هەڵکەندنی تونێل بوون بۆ خانووی سیتروس. کردەی هەڵکەندنەکە ڕێک بە گوێرەی نەخشـەکە و لەبەر کەپـووی پاسـەوانانی خـانووی سـیتروس بە باشـی دەڕۆیـی. کـونەکە بە هێواشی دەڕۆیشت بەڵام لێبڕاونەش بوو. هێشتا زۆر ڕۆژ تێنەپەڕیبوون، تا گەیشـتنە سـەر پێتـی نێوەڕاسـتی ڕێگـاکە. چەنـد ڕۆژێکـی دیـکە، ئەوسـا دەگەیشتنە مەبەستەکەیان.
ئەرێ مەبەستەکە چیبوو؟ هەواڵنووسە بیانییەکان دواتر ڕاپۆرتیان دا، گوایە تـونێلێکی زۆر درێـژ لێدراوە و مەبەسـتیش ژێـر قەڵا و بارەگـای حکـوومەت بـووە، تـا لە تـوڵەی لە داردانـی هـاڤیف، ناکـار و وەیسـدا بتەقێنـدرێنەوە. گریمانەکە هەندێ ڕاستی تێدابوو، بەڵام وەک پێشتریش دووپاتم کردبووەوە، سیاسـەتی سـەربازییانەی ئێمە تەنهـا لەسـەر تـوڵەکردنەوە بنیـات نەنرابوو. هەرچـی سـەبارەت بە کردەی هەڵواسینەکانیشـە، خۆ ئێمە هەر لە سـەرەتاوە گردەبڕانە داوای جێبەجێکردنی قانونی توڵەی چاوبەچاومان کردبوو.
نەخشـەی خانووی سیتروس دەمێک بوو جێ مجێزی ئێمە بوو، وردەکـاری تەواوی کارپێکردنیشـی لەبەرچـاوگیرابوو. ئێمە وامـان دانـابوو تـونێلکە بگـاتە بەردەمی قەڵایەکە و ڕێک و ڕەوانیش ئەو بڕە تەقینەوە لەبارە هەڵبگرێ کە بە قورمیشکردنێکی چل و هەشت یان حەفتا و دوو سـەعاتەوە دیاری بکرێ. ئەوسـا دەبـێ دەمـی تـونێلەکە دابخـرێتەوە، بـۆ ئەوەی کەس ڕێوشـوێنی هەڵنەگرێتەوە. چەنـد ئـاکنجییکی دراوسـێی ئەوێ، لە کـاتی پێویسـتدا ئاگـادار دەکـرانەوە بـۆ ئەوەی بـۆ مـاوەیەکی کەم ماڵەکانیـان بەجێبـێڵن. هەرچـی

دەربارەی خانووەکانی دیکەی گەڕەکەکەش بوو، ئەو شتەی بەتەمابووین ئەنجامی بدەین، کارێکی خراپی لەوان نەدەکرد، مەگەر شکاندنی جامی چەند پەنجەرەیەک نەبێ.
چل و هەشت سەعات بەر لە قورمیشکردنی تەقینەوەکان، پەیامێکی تایبەتیمان بۆ دەسەڵاتداران ئامادەکردبوون بڵاوی بکەینەوە. پێمان دەگوتن ڕۆژی ئەوە هاتووە "زۆنی ئاسایشییانەی" داتان مەزراندووە خاپوور ببێ، ئیدی ئاگادارمان دەکردنەوە بەبێ وەخران مۆڵگەکانی ئەوێیان جێبێڵن.
دەسەڵاتی ماندات بۆی هەبوو گوێ بە هۆشدارینامەکەمان بدا یان هەر گوێیشی پێنەدا. بڕیارەکە بۆ بەرپرسیارێتی خۆیان دەگەڕایەوە. ئەزموونەکەمان ئێمەی هێنابووە سەر ئەو بڕوایە، ئەوان ئاگادارینامەکانمان بە هەند هەڵدەگرن. ئەو ڕۆژانەی باڵەخانە و نووسینگەکانی ڕژێمی داگیرکەر بە خێرایی لەسەر قسەی چەند نوکتەیەکی کردەنیی چۆڵ دەکران کە پێیان گوترا "لەنێو تەلار و نووسینگەکانتاندا بۆمب داندراوە". هەنووکە زۆر لە خانوو و نووسینگەکانی حکوومەت پلیکانەیان داناوە بۆ ئەوی لە ترسی تەقینەوەکان بە ئاسانی لێوەسەر نهۆمەکانی سەروو بکەون. ئاخر پەندەکەی هوتێلی شاداود کاریگەری خۆی هەبوو. زێدەباری ئەوەش، ئاگادارینامەکە لە هەلومەرجێکی وا بەناوی ئێمە و بە هاوارنامەی فەرمیمان بڵاو دەکرایەوە، دەسەڵاتدارە بەریتانییەکان تێگەیشتبوون ئیرگون بە دەستی بەتاڵ هۆشداری نادا.
ئەوەش ڕاست بوو، بە کۆتایی هاتنی ئەو چل و هەشت سەعاتە تەنها یەک لە "زۆنە ئاسایشییەکان" دەڕوخێندرا، ئەویش لە تەلئەبیب بوو. گومانیشی تێدا نەبوو دەسەڵاتداران ترسیان لە تەقینەوەی شوێنەکانی دیکەوە هەبوو، بۆیە لە بەر تۆقان نەیاندەوێرا بگەڕێنەوە شوێنە ئاسایشییەکانی خۆیان. ئیدی نەخشەی ماڵی سیتروس بەم جۆرەی خەملێندرابوو، وەک بومەلەرزەیەک وابوو لە دامەزراوەکانی ڕژێمدا بیقەومێنێ. ئەوان هەرگیز نەیاندەزانی ئاخۆ زەبری دادێ لە کوێوەیە.
ئەمە، بەڵێ هەر ئەمە شتێکی کەمتر لەوەیان نا، مەودای ئۆپەراسیۆنی خانووی سیتروس بوو. مخابن هاگانا لە ڕێی ئاژانە هەواڵگرێکی خۆیانەوە، زانی چالاکییەکی وا لە ژێرزەمینەکەی پەتاتەفرۆشیدا هەیە. ئیدی لە

بێئومێدکردنیدا سەرکەوتوو بوون. لەو شەوەی پیاوەکانمان خانووەکەیان جێهێشت، دەستەیەکی هاگان هات و سەری تونێلەکەیان گرت.
بە ئاوڕدانەوە بۆ دواوە، پێدەچی هەر کەمێک داخمان خواردبێ کە خانووەکەی سیتروس نەتەقێندرایەوە. ئەو تەلارە نازدارە هەنووکە هی دەوڵەتی ئیسرائیلە. ڕژێمی بەریتانی وڵاتەکەی جێهێشت و دەسەڵاتەکەشی وەک ئاکامی زنجیرە ئۆپەراسیۆنەکانی دیکە کۆتایی پێهات. بەڵام خۆ لەوێدا هەموو هۆکاری بەجێ بۆ ماتەمی کۆستکەوتنی ئەو لاوە ئەندامەی هاگانا هەبوو، کە لە تونێلە لوغمکراوەکەدا کوژرا. ئاخر کاربەدەستەکانی بەهۆی مۆتەکەوە تۆقابوون، بڕیاریان دا بە هەر نرخێک بێ ڕێ لە زەبری تەقینەوەکە بگرن و پەردەپۆشی کەن.
داوای دامەزراوە فەرمییە جووەکان بەوەی ئۆپەراسیۆنە ناوهێندراوەکە بەریتانییەکانی نەکردبووە ئامانج، بەڵکو بۆ ئەوە داڕێژدرابوو سەرنجی کۆمیتەی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ خۆمان رابکێشێ، لەژێر تیشکی ئەو شتەی خۆیان دەربارەی کۆمیتەکەیان دەگوت، زۆر سەیروسەمەرە بوو. ئەوان ئێمەیان بە هەموو شتێک وێنا دەکرد تەنها ئەو ڕاستییە چارەنووسسازیانە نەبێ کە لە وڵاتەدا خولقاوە. دکتۆر گارسیا گراندۆس، لە کتێبەکەی دەربارەی یادەوەریدا، تەواوی تۆمارە نهێنی کۆبوونەوەکەی بڵاوکردەوە، کە لەسەر داوای هاگانا لە نێوان دادوەر ساندسترۆمی سەرۆکی کۆمیتەکە و نوێنەرایەتی پێنج ئەندامەکەی هاگانا کرا.
لە کۆتایی کۆبوونەوەکەدا، ساندسترۆم دەپرسێ: "چی دیکەتان هەیە بیڵێن؟"
قسەکەرەکەی هاگاناش وەڵامی دەداتەوە: "تیرۆر شتێکی کوشندەیە و بە تەنیا بە حکوومەتی بەریتانیا سەرکوت ناکرێ. چالاکیە تیرۆرستیەکان بەڵگەیەکن دەرەتانی جووەکانن بۆ هەستە بەهێزەکەیان. هاگانا لەو بڕوایە دایە، ئەو کات چارەی چالاکیە تیرۆرستیەکان دەکرێ ئەگەر ئازادانە ڕێگە بە کۆچبەرە جووەکان و نیشینگەکانیان لە فەلەستین بدرێ. هەستەکانی جوویکی فەلەستینی ئەوەیە، کاتی هاتووە چارەنووسی فەلەستین دیار بکرێ."
بەڵام ئەو داخوازییە گەوجانەیە، کە ناوبانگی هاگانای لە چوار کەناری دنیایێ پێ بڵاو ببووەوە، لە سەروبەندی ئۆپەراسیۆنی خانووی سیتروس هەوڵدانێک بوو، خۆ دەرخستنێک بوو، بە شێوەیەکی کاریگەرانە ئاماژەیەکی

لەخشتەبەرانەی بۆ ڕێکەوتی خەریکبوون بە خودی ئۆپەراسیۆنەکە بوو.
ئاخر چالاکی خانووی سیتروس زۆر پێش هاتنی کۆمیتە تایبەتە بۆ ئێرتز ئیسرائیل نەخشەی بۆ کێشرابوو، لە کاتێک کۆبوونەوەی نێوان نوێنەرانی کۆمیتەکە و ئیرگون زڤای لیومی لە 26ی حوزەیرانی 1947دا بەسترا، تەنها هەشت ڕۆژ بەسەر گەیشتنی کۆمیتەکە بۆ ئێرتز ئیسرائیل تێپەڕی بوو.
نێوەندگەری کۆبوونەوەکەش کارتەر داڤیدسۆ، سەرۆکی پەیامنیرانی ئاژانسی ئاسیۆشێتد پرێس بوو. ئەو داڤیدسۆنە گەنجە پرجمووجۆڵە دەرکەوت لایەنگری دەسەڵاتدارنی بەریتانی نەبوو. نەشمدەزانی ئاخۆ جووی خۆشدەویستن یان نا. دواتر پێمگوترا، لە میانەی شەڕ لەگەڵ عەرەبەکاندا، ئەو هیچ هەستێکی لایەنگرانەی بۆ جووەکان نیشان نەدا. هەر چۆنێک بێ، ئەوێ دەمێ، تێبینیمان کرد سەرلەبەری ڕۆژنامەگەری ئەمریکایی لەسەر ئەو ڕێگایە دەڕۆن، کە جەخت لەسەر سەرکەوتنی عەرەبە باڵادەستەکان بکەن و شکشتی جووەکانیشان بە ڕاست یان بە خەیاڵ قەبە نیشان بدەن. هەر چۆنێک بێ، لە ماوەی سالانی یاخیبوونەکەدا، کارتەر داڤیدسون بە شێوەیەکی بەرچاو خۆی بۆ ئۆپەراسیۆنەکانی ئیرگون تەرخان کردبوو، بە زانیاری و لێ تێگەیشتنەوە ڕاپۆرتی لەسەر بڵاو دەکردنەوە. ئەو چەندین جار داوای لێکردین ڕێگەی بدەین ببێتە شاهید بەسەر یەکێ لە ئۆپەراسیۆنەکانمان. ئێمەش بەڵێنمان پێدا، لە قۆناخێکیشدا لە سەروبەندی ئەوەدا بووین بۆ هەڵمەتی سەر قەڵای عەککا بانگهێشتی بکەین. بەڵام بۆ چاوخشاندنەوە بە بڕیارەکەمان فرێد (لای داڤیدسۆن یۆول ناوی فرێد بوو) پێیگوت ئەو کاتە ئێمە تۆ لەگەڵ خۆمان بۆ ئۆپەراسیۆنێکی سەربازی دەبەین، گەر ژنەکەشت قایلبێ. داڤیدسۆن ڕەتی کردەوە، بەڵام ئێمە لەسەر بڕیارەکەی خۆمان پێمان چەقاند، لەبری ئەوەدا ڕاژەکەی ئەومان بۆ ئۆپەراسیۆنێکی دیپلۆماتیانە پەسەند کرد، ئەویش کۆبونەوە لەگەڵ دادوەر ساندسترۆم بوو.
بەرپرسی کۆمیتەی تایبەتی نەتەوە یەککرتووەکان، دادوەر ساندسترۆم، پێی ڕاگەیاندین کە بەیاوەری دکتۆر ڤیکتۆر هوو، یاریدەدەری سکرتێری گشتی (ر.ن.ی) و سکرتێری کۆمیتەکە دێت. ئێمەش قایل بووین. لە دوا ساتیشدا، داڤیدسۆن بەناوی ساندسترۆمەوە لێی پرسین ئاخۆ دەکرێ د. ڕالف بونچە سکرتێری ئەنجوومەنی متمانەداری (ر.ن.ی) کە دەستەڕاستی سکرتێری

کۆمیتەکەیە لە کۆبوونەوەکەدا ئامادەبێ. ئێمە لاریمان لەو پێشنیازەش نەبوو. لە لای خۆشمانەوە، داوامان کرد بەڕێز لیسنکی، ئەندامە چیکیەکەی کۆمیتەکەش بانگهێشت بکرێ. ساندستروم داواکەمانی پەسەند کرد، بەڵام دواتر ڕوونی کردەوە، لەو کاتدا ئەستەم بوو پەیوەندی پێوە بکا. بەتایبەتیش پەیوەندییەکە بۆ ئەو سەخت بوو، ئەو وای پێگوتین، چونکە ئەو و یاوەرەکانی بۆ ئەوەی بەنهێنی بگەن دەبوایە بەو شێوەیە بێن کەهاتن.
کۆبوونەوەکە لە ماڵی د. یاکۆڤ کۆهنی شاعیر بەسترا. یۆول میوانەکانی بە یاوەری کارتەر داڤیدسۆن هێنان. ئێمە هەر وەک پێشەی هەمیشەیمان لە ئاڵۆزی و کەشوفشی ڕێکخستنی کۆبوونەوەکە بەدوور گرت، بۆیە کاتی ئێمە نوێنەرانی ئیرگون چووینە کۆبوونەوەکە، ئەوان لە تەکنیکی سادەی سازدانی دیدارەکەدا حەپەسان. بەڵام خۆ لەو بارەشدا دەبوایە ڕێکاری وریایانەی زیاترمان گرتبایە بەر. ئاخر ئەندامانی کۆمیتە تایبەتیەکە بە سەربازی بەریتانی دەورە درابوون، ئاشکراشە هەر ئەوان پاسەوانیان لێدەکردن. دەسەڵاتداران ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان دەدا یاوەری ئەندامانی کۆمیتەکە بکەن، بۆ هەر کوێییەک بێ لەگەڵیاندا بن، بۆ ئەوەی بەقسەی خۆیان نەکەونە دەستی تیرۆریستەکان، چونکە جێگەی مەترسیە و ژیانیان دەکەوێتە بەر گەف و هەڕەشە، لە کاتێکدا هەندێ لە ئەندامانی کۆمیتەکە دۆستی گەلەکەشمان بوون. لە ڕاستیشدا ئاژانە ئاسایشیەکانی بەریتانی بەردەوام بە دەوری ئەندامانی کۆمیتەکەوە بوون تا چاودێری لێکۆڵینەوەکەیان بکەن.
یۆول و یاریدەدەرەکانی، میوانەکانین بە سواری ترومبێلێک لە دەوری شەقامەکانی تەلئەبیب سوڕاندنەوە، لە کاتێکدا ترومبێلی دووهەمیش بەدوای ئەواندا دەڕۆیی بۆ ئەوەی دڵنیا بێ، کە هیچ چاوێک بە دوایانەوە نییە. بۆ باری ئاسایشپارێزی زیاتر لە جارێک ترومبێلەکە و ئەو شەقامەی پێشیدا دەڕۆیشتن، گۆڕیان.
لە ماڵی یاکۆڤ کۆهنیشدا، ئاڤراهام، شموئێل و من چاومان بە میوانەکان کەوت. من بەناوی ڕاستەقینەی خۆمەوە، خۆم پێناساندن. ئێمە دادوەر ساندسترۆممان لە سەرووی مێزەکە دانا. دیاربوو میوانەکانمان خۆیان بۆ کۆبوونەوەکە ئامادەکردبوو. سەرۆکی کۆمیتەکە یەکەمین پرسیاری بە نووسین خوێندەوە. پرسیارگەلێکی کلێشەدارانەی فەرمی بوون کە لە

شاهیدێکی لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی بکەن. لەوێدا شتێکی خۆش هەبوو، کاتێ لێی پرسیم ئاخۆ من هیچ پلەیەکی وەک ژەنەڕاڵییم هەیە یان نا، منیش بۆم ڕوونکردنەوە، کە هیچ پلەیەکی فەرمییم نییە.
ئەو سێ پیاوانەی لە بەرامبەرماندا بوون کاراکتەری لە یەک جیاوازبوون. دادوەرێکی سوئێدی، دیپلۆماتێکی چینیی و دەوڵەتمەدارێکی ڕەشپێست (نیگرۆ)ی ئەمریکی. هەمووشیان خاوەن کەسایەتییەکی سەرنجڕاکیش بوون. ئێمە زانیاریمان لەبارەی ساندسترۆمەوە هەبوو، دیاربوو بە چالاکییەکانی ئێمە سۆزدار نەبوو. ئەو بۆ ماوەی چەند ساڵانێک سەرۆکی دادگایەکی تێکەڵاو بوو لە میسر، وەک دەشگوترا لەژێر کاریگەری حکوومەتی بەریتانییدا بوو. وێڕای ئەوە و لەگەڵ هاتنەپێشەوەی ئەو ڕاستیانەشدا، نەبووە مایەی گومانمان. ساندسترۆم هیچ جۆشێکی تایبەتیانەی بە دۆزەکەمان نیشان نەدا -هەمووی بەسەریەکەوە کابرایەکی هێمن و بێلایەن بوو- بەهەمان شێوەش لایەنداریێکی بەدژی ئێمە نەنواند. (د. هوو)ش، کوڕی یەکێک لە باڵوێزەکانی چین بوو لە مۆسکۆ، دەگوترا پیاوێکی لە ڕادەبەدەر کارامە و بەتوانایە. هەرچەندە ئەو نەک هەر ئەندامی کۆمیتەکە کە لە سکرتاریەتی (ر.ن.ی) نزیک بێ، بەڵکو وەک ڕێبەرێکی گیانی ڕێکخراوەکە سەیر دەکرا. (د. بونچە)ش دواتر کە بووە ناوبژیوانێکی ڕێکخراوەکە، نازناوێکی جیهانی پەیداکرد. بێ سێ و دوو ئەویش خاوەن ئاوەزێکی درەوشاوە بوو.
گفتوگۆی، نێوان ئەو شەش کەسەمان زیاتر لە سێ سەعاتی خایاند. ئاخر دیداری نێوان قسەکەرانی ڕێکخراوی ژێرزەمینیی و نوێنەرەکانی ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی کەم نەبوو. لەوێدا ساتەوەختی هەستبزوێنی قووڵ هەبوون؛ هەڵبەتە شتێکی سروشتیش بوو، کە ساتەوەختی میزاج خۆشی و پێکەنینیش هەبوون. کاتێکیش دەربارەی مافە دیرۆکیەکانی گەلەکەمان لە ئێرتز ئیسرائیلدا قسەم دەکرد، ڕێکەوتانە(بە بێ ئەنقەست) گفتوگۆکانی دیکەی زیندانی لوکیشکیم[٩٦] بیرکەوتنەوە. بە قوڵیش هەستی بزواندم: ئای بەو چەند کەمە ساڵە، ئێمە گەیشتینە ئەو قۆناغە پێشکەوتووە لە خەبات. لەو بڕوایەدام

[٩٦] مەبەست لە زیندانەکەی پۆلۆنیایە، کە نووسەر لەوێدا گیرابوو لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کرابوو، لە بەندە بەرایییەکاندا بە درێژی باسی کراوە. وەرگێر.

کاتێک باسی ڕەفتاری حکوومەتی بەریتانیام دەرهەق بە گیراوەکانی ئیرگون بۆ دەکردن، باسی ئاشەر ترانتەر، دۆڤ گرەنەر و هاوڕێکانم کە لەسێبەری سێدارەکان چاوەڕوان بوون، دەنگم هەڵێنابێ. گومانی تێدا نەبوو مێوانەکانیش لەگەڵ هەستەکانمدا هاوسۆز بوون، بەڵام ساندستڕۆم بە شێوەیەک لە شێوەکان تێکچوو، دەترسا نەبادا لە دەرەوەی خانووەکە گوێیان لێمان بێ. منیش داوای لێبووردنم لێکرد و دڵنیام کردەوە. ئەو وای مەزندە کردبوو، خانووەکە و گەڕەکەکە لە لایەن ئاپۆرای پیاوە چەکدارەکانی ئیرگونەوە دەورە درابێ. لە ڕاستیشدا هیچ کەس بەدەر لە چەند کوڕ و کچێکی بێ چەک لە دەرەوە نەبوون. ئێمە لای خۆمانەوە لە هەستی مێوانەکانمان گەیشتین. ئاخر ئەوە یەکەمین دیداریان بوو لەگەڵ "تیرۆرستەکان"سازی بدەن. ئای تۆ بڵێی چ چیرۆکی سامناکیان دەربارەی ئێمەوە بیستبێ؟ پاشان دوای ئەوەی بەتەواوی، قسەکان و گفتوگۆکانمان ئێمەی بۆ خۆ بردەوە، بەلای کەمیەوە ئێمە هۆکارێکمان هەبوو لەوە بترسین بێن و لەگەڵ نوێنەرانی (ر.ن.ی)ەوە راپێچمان کەن، بەڵام ئەوانیش دەترسان لەگەڵ ئێمەدا بگیرێن...

ساندستڕۆم چەند جارێک "پرسی سەرەکیی" وروژاندن. ئەرێ چی دەبێ گەر عەرەبەکان دوای کشانەوەی بەریتانییەکان لە وڵات، پەلامارمان بدەن؟ دەمزانی ڕامانی جەنگێکی عەرەب-جوو سەرەکیترین بەڵگەوبەندی حکوومەتی بەریتانیا بوو دژی هەر پرۆژە و پێشنیازێکی چۆڵکردنی وڵات. منیش ئاماژەم بەوەدا، عەرەبەکان هێرشمان ناکەنەسەر مەگەر لایەنی سێهەم دنەیان نەدا و کۆمەکیان پێنەکا. بەڵام -پێشم لەسەر ئەوەدا گرت- ئێمە بڕوامان وایە، دەکرێ پەلامارمان بدەن، ئێمەش لووت و قەپۆزیان دەشکێنین. ئاخر لە شەڕی نوێدا ژمارە بڕیاردەر نییە بەڵکو عەقڵ و ورەیە دەیباتەوە. هەرچی دەربارەی عەقڵیش بوو، هەر پێویستی نەدەکرد وردی بکەمەوە. سەبارەت بە گیان و ورەی شەڕکردنیش، پێمگوت "خۆ بەخۆت پەلامارەکەی سەر قەڵای (عەککا)ت بیست. تۆ ئەوەت خوێندەوە کە پیاوەکان چۆن بەرەو پەتی سێدارە ڕۆیشتن. هیوادارم تۆ ئەو پیاوانەی حوکمی مەرگیان بەسەردا دراوە ببینی و گوێیان لێبگری."

ساندستڕۆم پرسی: "ئایا دۆڤ گرەنەر ئەفسەرێکی پلەباڵای ئیرگون بوو؟"

"نەخێر" منیش وەڵامم دایەوە، "دۆڤ گرەنەر سەربازێکی ئاسایی بوو." دادوەرە پیرەکە نەیدەتوانی حەپەسانەکەی بشارێتەوە.
لە ماوەی گفتوگۆکەدا، دکتۆر هوو پرسی: "وادابنێ ئێوە فەلەستینتان بە هەر دوو دیوی ئوردن وەک دەوڵەتێکی جوو کەوتە دەست و چەندان ملیۆنتان بۆ هێنا، ئایا دوای ئەوە سەبارەت بە زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان چی دەکەن ؟ وڵاتەکە خۆی بچووکە. ئاخر لە ماوەی سێسەد ساڵی دیکەدا چی دەقەومێ؟"
من هەموو پرسیارەکەم بە شتێکی قۆڕ و بێ واتا سەبارەت بە نەخشەی دەوڵەتێکی بچکۆلەی جوو لە بەشێکی وڵاتەکە لێکدایەوە. بەڵام هوو وەڵامە سەرەکیەکەی لە شموئیل کاتز وەرگرتەوە، پێی گوت: "ئەمەیان کێشەیەکی گەردوونییە. ئەرێ تۆ پێتوایە لە وڵاتی چین و دوای سێ سەد ساڵی دیکە چی ڕوو دەدا؟"
د. هوو بابەتەکەی گۆڕی.
لە ماوەی ئەو کۆبوونەوەیە دووروودرێژەدا، د.بونچە تێبینیەکانی دەنووسین. ئاساییانە دەینوسی، بەڵام بەخێراییەکی سەرسوڕهێنەر دەینووسی. لە کاتی نووسینیشدا پرسیاری پەیوەندیداری گرنگی دەکردن، ناوەناوەش سرتەیەکی لەگەڵ ساندستڕۆمدا دەکرد. کاتێک د. هوو کە بە فەرمی بەرپرسی بوو، پێشنیازێکی سەبارەت بە شێوازی تێبینی وەرگرتن کرد، بونچە لێوەشاوانە وەڵامی دایەوە: "من شێوازی تایبەت بەخۆم هەیە!"
من ئەوق مام، تۆبڵێی وەڵامەکە تەنها ئاماژەبێ بۆ د. هوو یاخود بۆ ڕێکخراوەکە.
من دەبوایە سوپاسگوزاری د. بونچە بم بۆ ئەو لێزانی و وردەکاریەی "ڕاپۆرتی کۆنفرانسی نێوان نوێنەرانی کۆمیتەی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە فەلەستین و فەرماندە و دوو نوێنەری ئیرگون زڤای لیومی." لە ماوەی سێ ڕۆژدا ڕاپۆرتەکەی بۆ پەسندکردن بۆ ناردین.
لەو ڕاپۆرتەدا د. بونچە دڵسۆزانە پرسیارە ماکەکانی بۆ ئێمە و ڕونکردنەوەکانی ئێمە و هۆکاری پشتی خەبات و ئامانجەکان و نواڕینی ئیرگون بۆ ئایندەی ئێرتز ئیسرائیلی تێدا دەقنووس کردبوو.
دوا بەشی ڕاپۆرتەکە بەم شێوەیە بوو:

"پرسیار لە فەرماندەکە کرا گەر بتوانێ هۆکاری بەرەنگاربوونەوە و دژایەتیکردنی بەریتانییەکان بەو شێوازەی دەیکەن، ڕوون بکاتەوە ئاخۆ ناچارکردنی هێزەکانە بۆ کشانەوە لە وڵات، بۆ ڕزگارکردنی بەندکراوە جووەکانە یان ئامانجی دیکەیان هەیە. لە وەڵامدا گوتی ئەوەی لە توانای ئێرگوندا هەبێ بیکاتێ، شتێکە لەسەر بنەمای هێزی هاوسەنگی وەستاوە. وەک ئەو گوتی: بەریتانییەکان هێزیان لە ئێمە زیاترە، بەڵام خۆ هەر ئەوانیش دەزانن ئێمە بە ئاسانی سەرکوت ناکرێین. ئەوەی ئێمە خوازیارین، کشانەوەیەکی تەواوی بەریتانییەکانە لە وڵات، نەمانی دەسەڵاتی بەریتانییەکانە، دامەزراندنی حکوومەتێکی کاتی و دامەزراندنی دەوڵەتی جوولەکەیە. بەریتانییەکان، وەک گوتی، پێشتر بە جیهانیان گوتووە، گوایە ئەوان بۆیە لێرەن تا جووەکان لە دەستی عەرەبەکان بپارێزن، بەڵام ژەنەراڵ دارسی بە کۆمیتەی ئەنگلۆ/ئەمریکایی گوتبوو، ئەگەر بەریتانییەکان وڵات بەجێبێڵن، ئەوا جووەکان لە ماوەی بیست و چوار سەعاتدا دەستی بەسەردا دەگرن، کەواتە وا دەکەوێتەوە، بەریتانییەکان بۆ ئەوە لێرە ماون تا عەرەبەکان لە دەستی جووەکان بپارێزن.

"لە وەڵامی بەیاننامەیەکدا، فەرماندەکە پرسی: 'ئاخر ئێمە چۆن دەتوانین بەرگری بکەین و ڕووبەڕووی ئەو ژمارە زۆرەی پۆلیس و هێزی سەربازی بەریتانیا ببینەوە گەر گەل لەپشتمانەوە نەبێ؟ ئێمە لەو بڕوایەداین دەبێ بجەنگین، دەنا گەلی جوولەکە تەفروتونا دەبێ. ئێمە جەنگاوەری پیشەیی نین، ئێمە خۆشی لە تەقەکردن چ لەوانەوە بۆ ئێمە، چ لە ئێمەوە بۆ ئەوان، نابینین. لەبیرت بێ ئێمە تازە شەش ملیۆن کەسمان لە دەستداوە، ئیدی پاراستنی ژیانی هەر جوولەکەیەک بەهایەکی گەورەمانە. لێ گەلۆ ئێمە بۆ ئامانجێک دەجەنگین! بۆ ئەوەی ڕێ لە چەوساندنەوە و قڕکردن و لەناوبردنمان بگرین.

"فەرماندەکە ئاماژەی بەوەدا، شەڕی ڕێکخراوەکەیان کێشەی بۆ گەلی جوولەکە ناوەتەوە وەک قەدەغەکردنی هاتووچۆ، ڕێلێگیران و تۆڵەکردنەوە و هتد. بەڵام ژانوناسۆر، هەموو گەلێک، کە جەنگاوە دەیزانێ شتێکە لە خەبات و بۆ بەدیهێنانی سەربەخۆیی جیا ناکرێتەوە. ئەو لێی زیادکرد و گوتی، ئێمە خۆ هەر کۆمەڵە کەسیکی پەرگیر و، توندڕۆ نین. ئێمە هەین و تەنانەت کە بووینەتە مایەی سەرئێشەش بۆ گەلی جوولەکە، هەر بەهێز دەبین.'

لێرەدا جێی گومان نییە زۆرینەی گەلی جوولەکە بە گەرمییەوە لەگەڵ خەباتەکەدایە. کاتێکیش جوو دەرفەتی نمایشکردنی پشتگیریی بۆ ئەوان هەبێ -کە هەمیشەش ئەمە مەیسەر نابێ- ئەوان پشتگیری خۆیان دەردەبڕن. هەر بۆ نموونە، ئەو ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، کاتێک هاگانا بۆ ماوەیەکی کەم هاوشانی ئەوان ڕووی لە شەڕ کرد، گەلی جوولەکە دەرفەتەکەی قۆستەوە و چەپڵەی بۆ خەبات لێدا.

'فەرماندەکە خاڵێکی ڕەوای هێنا پێشەوە، تەنانەت لەژێر دەسەڵاتی منداتیشدا بە شێوەیەکی ڕەها هیچ مافێک بۆ سازدانی دادگایەکی سەربازی بەریتانی لە فەلەستین لە ئارادا نییە. مەندات وەک ئەو لەسەری ڕۆیشت، جیاوازی لە نێوان هێزە سەرهەڵداوەکانی فەلەستین و هێزەکانی بەریتانیی دەکا. هێزەکانی بەریتانی بە هێزی بێگانە دادەندرێن بۆیە دادگای سەربازی بەریتانی هیچ مافێکی نییە لەسەر بنەمای مەندات لێرە دابندرێ. ئەو لەسەر ئەوەش ڕشت بوو، کە ئەو خاڵە هیچ لە پرسی خەباتەکە ناگۆڕێ، چونکە کاروانەکە بەهەر شێوەیەک بێ دەڕوا، بەڵام شتەکە بۆ کۆمیتەکە سەرنجڕاکێشە.

'فەرماندەکە ڕوونی کردەوە، ئەندامانی ئیرگون خۆیان بە جەنگاوەری ڕەوا (قانونی) دەزانن، تووشی جەنگێکی ڕەوا بوون، ئەوان بەریتانییەکان بەهێزێکی ناڕەوا دەزانن. ئەو گوتیشی، ئیرگون تا ئێستا زۆر پیاوی لێ کوژران و بریندار بوون، ئەوەشیان وەک بەرەنجامێکی حەتمی ئۆپەراسیۆنەکانیان پێقبوڵە. بەریتانییەکان وەک ئەو گوتی، چوار ئەندامی ئەوانیان لەسێدارە داون. هەرچەندە بەهۆی ئەمە چالاکییەکانی ئیرگون نەوەستاوە، بەڵکو چڕتر بوونەتەوە. 'ئەمە وا دەکا دوژمن زیانی قورسی بەر بکەوێ، ئاخر هێشتا باجەکەیان نەداوە.' ئەو ڕوونی کردەوە هەڵواسینەکان ڕوداوی عەککای بە دوادا هات. عەککا، وەک باسی کرد پێگەیەکی بچکۆلانە نەبوو. شەڕیش بەردەوامە. پێشنیازی بەریتانییەکانیش بەوەی ئامادەبن واز لە هەڵواسینی ئەندامانی ئیرگون بهێنن، گەر ئەوانیش واز لە شەڕەکەیان بێنن، ئەمە کەڵەگاییێکی بلچ و ناشیاوە.

'بڕۆ بۆ زیندانی عەککا و لەو سێ حوکمدراوەی بە مەرگ بپرسە، ئاخۆ ئەوان ئامادەن لەسەر حیسابی خەباتەکە ژیانیان بکڕنەوە. ئەوان نامەیەکیان پێداوم، دۆڤ گرەنەر هاوار دەکا: 'هەرچی ڕوبدا، لە بەرخودان بەردەوام بن!'

ئەو ئەوەندەشی لێزیادکرد 'ئێمە هەموومان ئامادەین گیانمان بەخت بکەین.'
وەک ئەو گوتی هیچ ئەندامێکی ئیرگون داوای لێخۆشبوونی لە دەسەلاتداران
نەکردووە
" سەبارەت بە هەڵوێستی ئیرگون لەمەڕ داوای ئەنجوومەنی گشتی نەتەوە
یەکگرتوەکانی بۆ ئاگربەست؛ لە ماوەی لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی نەتەوە
یەکگرتووەکان، لە فەرماندەکە پرسیار کرا. وەڵامەکەی ئەوە بوو، ئەوەی
پەیوەست بەو داوایە، ئیرگون بەڵگەنامەیەکی مەعقولانەی بۆ کۆمیتەکە
ناردووە، ئەوان بە ئاگربەست لە ماوەی دەستنیشانکراودا قایلین، بەمەرجێک
لەو ماوەیەدا بەریتانییەکان خۆیان لە هەموو کردەوەیەکی فشارهێنەرانە
بەدوور بگرن. بۆ ئەوەی وێنەی ئەو هەلومەرجەش وێنا بکەین، ئەو سەرنجی
ئێمەی بۆ هێزی ئاسمانی و دەریایی ڕاکێشا، چۆن بە دوای کەشتیەکانەوەن،
نەبادا جوولەکەیان هەڵگرتبێ و بیانەوێ بێنە فەلەستین، ئیدی بیانگرن و
بڵاویان بکەنەوە، حوکمی مەرگیان بە سەردا بدەن. بۆ ئەوەی ڕێسای
قەدەغەکردنی هاتووچۆیان بە سەردا بسەلمێنن و ماڵەکانیان بپشکنن.
"فەرماندەکە هیوادار بوو، بەڵکو کۆمیتەکە بچێتە ئەوروپا و ئۆردوگا
زۆرەملێکان ببینێ -سەرەتا نازییەکان دایانمەزراند و ئێستاش لە ئۆردوگا
ڕزگارکراوەکان دان- ماوەی حەفت یان هەشت ساڵ دەبێ لەوێ گیریان
خواردووە. ئەو ئەوەشی بۆ زیاد کرد، ئۆردوگاکانی ئەوروپا هەموو کێشەکە
نییە، بەڵکو هەر بەشێکی کێشەکەیە، بەڵام ڕەنگدانەوەی کێشەکەن.
"فەرماندەکە لەوە دەترسا نەبادا کۆمەڵەی گشتی لە مانگی سێپتێمبەردا، ئەو
کاتە تەواوەی لە بەردەستدا نەبێ کێشەکەی پێچارەسەربکا، ئەوسا دەبێ
کۆمیتەی دووهەم دەستنیشان بکرێ و بنێردێتە فەلەستین، لەو هەموو ماوە
بەردرێژەشدا ژن، پیاو و منداڵ لە کوێرەوەری ئۆردوگا زۆرەملێکانی
ئاوروپادا دەمێننەوە.
"ئەو ڕاشکاوانە دەربڕی، ئەگەر بەریتانییەکان پیاوەکانی ئیرگون لە سێدارە
بدەن ئەوانیش پیاوەکانی بەریتانی بە هەمان مەرەد دەبەن و لە داریان
دەدەنەوە. پیاوەکانی ئیرگون وەک فەرماندەکە گوتی، جەنگاوەری ڕەوان.
ئیرگون وەک ئەو گوتی، بە ڕەهاییەوە باوەڕی بەوەیە، کە شەڕەکە نەوەک
هەر بۆ سەربەخۆیی فەلەستینە بەڵکو بۆ مافەکانی مرۆڤی ئازادیشە.

له وەڵامی پرسیارێکدا، فەرماندەکە وەڵامی دایەوە، کۆمیتەی ئەنگلۆ-ئامریکی هیچ پەیوەندییان بە ئیرگونەوە نەکردووە. ئەو باسی ئەوەی کرد، ئیرگون بیرخەرەوەیەکی بۆ ئەندامە ئەمریکییەکانی کۆمیتەکە ناردووە، لێ بۆ ئەندامە بەریتانییەکانی نەناردووە. ئەو ئەوەشی بۆ زیادکرد، هەندێ ئەندامی ئەمریکی لە کۆمیتەکەی ئەنگلۆ-ئەمریکی هەوڵیان داوە پەیوەندی بە ئیرگونەوە بکەن، بەڵام دیدارەکە لە سۆنگەی ئاسایشییەوە تا ئێستا مسۆگەر نەبووە.
'فەرماندەکە ڕوونی کردەوە، گروپی ستێرن لە بنەڕەتەوە لە ئیرگون دەرچوونە. تێبینی ئەوەی دا، ئەوانیش جەنگاوەرن. گروپی ستێرن لە 1940دا وەک کۆمەڵەیەکی سەربەخۆ لەبەر هۆکاری جیاجیا لە ڕێکخراوی ئیرگونەوە جیابوونەتەوە. بە بەربڵاوی بڕوای وا هەبوو، وەک ئەو گوتی، هۆکاری جیابوونەوەیان ئەوە بوو گوایە ئابراهام ستێرن، ئەندامی فەرماندەیی باڵای ئیرگون، دژی جاڕنامەی شەڕوەستانی ئیرگون بووە لە میانی جەنگ دژی هیتلەر. ئەم شتەیان ڕاست نەبوو. ستێرن ئەو کات لەگەڵ ئەندامانی فەماندەیی ئیرگوندا جاڕنامەکەیان دەرهێنابوو. جیابونەوەکە ساڵێک دواتر ڕوویدا. هەنووکەش پەیوەندی نێوانیان باشە. ئیرگون ڕێکخراوێکی قەبەترە لێ ئەو ناتوانێ بڵێ کە ئیرگون لە گروپی ستێرن باشترە.
لە وەڵامی پرسیارێکدا سەبارەت بەوەی ئاخۆ چی بەسەر ئەو لاوە جووانە دێ، کە لەسەر سەرپێچی و بەهەند هەڵنەگرتنی یاسای کارپێکراو رایان دەهێنن، لە وەڵامیشدا فەرماندە گوتی، ئەندامانی ئیرگون ڕاهێندراون بەرهەڵستی ئەوە بن، ئەوەی حکوومەتی بەریتانیی پێی دەڵێ قانون، چونکە ئەوە قانونی داگیرکردن و چەوساندنەوەیە، بەڵام بە ڕامانی ئەو خۆڕێکخستن لەگەڵ دەوڵەتی جوو بۆ ئەوان کارێکی قورس نابێ. لەوانەیە کێشەیەک ببێ، بەڵام کێشەی سەرەکی بە تەنیا دەوڵەتی جووە، چونکە لەوێدا کار و بونیادی ئەوەندە زۆرە پەیدا دەبێ، گەنجەکانی پێوە سەرقاڵ دەبن.
'فەرماندەکە پرسی بەڵکو ئەگەری ئەوە هەبێ کۆمیتە تایبەتیەکە هەڵوێستێکی وا بنوێنێ، لەگەڵ نامەکەی ئیرگون بۆ کۆمیتەکە بێتەوە، بەوەی بانگی ئەو گیراوە ئیرگونییانە بکا کە لە زیندانی بەریتانیدا دان، تا بۆ شاهیدی بهێندرێنە بەردەم کۆمیتەکە. بەڕێز ساندستڕۆم ڕاشکاوانە وەڵامی دایەوە: 'لەوەدا ئەگەرێکی کەم هەیە. ئێمە ئەوەی لە سەرمانە کردوومانە. ئێمە دەپرسین:

باشـه بۆچی ئەو سێ پیاوە باشترین گەواهیدەری بەڵگەنامەی تیرۆر بن لە ئۆردوگاکاندا.'

'فەرماندەکە وەڵامیدایەوە، ئەو پیاوانە پێشتر چوونەتە بەردەم دادگایەکی سەربازی، بۆ خۆیان ئەزموونیان لەسەر بەدرەفتاری بەرامبەر خۆیان و ئەوانی دیکەوە هەیە. ئەوەشی گوت، ئەم کارەش لە مەرجەکانی پێکهاتەی کۆمیتەکە بەدەر نییە، ڕاستیش ئەوەیە کۆمیتەکە فەرمانبەرداره ڕەفتاری وا بنوێنێ، چونکە کۆمیتەکە لە هەموو کێشەکانی فەلەستین دەکۆڵێتەوە. ئەوەش ڕاستی بوو کە ئەو گوتی، بەوەی حکوومەتی داگیرکار لە فەلەستین بە شێوەیەکی دڕندانە ڕەفتار لەگەڵ گیراوەکاندا دەکا. ئیرگون دەتوانێ شاهیدی زیاتر لەو سێ کەسە بەندکراوە پێشکەشی کۆمیتەکە بکا، کاتی ئەوەشی دەبێ گوێیان لێبگیرێ. ئیرگون وەک ئەو لێی زیادکرد، حکوومەتی بەریتانیی بە بەدرەفتاری لەگەڵ زیندانییەکان تاوانبار کرد.

'بەڕێز ساندستروّم پێی وابوو پێویستە شاهیدی زیاتر بۆ سەلماندنی هەمان بەڵگە هەبن، لە کاتێکدا فەرماندەکە دووپاتی کردەوە، دۆزی ئەو سێ کەسە زیندانییە شتێکی تایبەتە. ئەوان دەتوانن باسی ئەو پیاوانە بکەن، کە دوای گرتنیان لە شکاندنی زیندانی عەککا تەقەیان لێکراوە و بریندار کراون؛ ئەو پیاوە بریندارانەی هەر لەوێ زیاتریان لێدراوە بە ئازار و ئەشکەنجە سەریان ناوەتەوە؛ یان بریندارەکانی دیکە کە بە هۆی تیمارنەکردن، گیانیان لە دەستداوە، تەنانەت ئاویشیان نەداونەتێ. ئەو سێ کەسەی لە نامەکەی ئیرگوندا ئاماژەیان پێکراوە، هەر لەو ئۆپەراسیۆنەدا گیراون.

'فەرماندەکە باسی ئەوەی کرد، ئەو دڵنیا نییە ئاخۆ هاتنە نێو کۆمیتەکە هیچ ئاکامێکی دەبێ. هەر دەستوەردانێکی لەو جۆرە، دەبێ بە ڕێگای دیپلۆماسیانەدا بڕوا، کە دەبێتە بڕیارنامەی کۆمیتەکە. ئەوەشی گوت، بە نواڕینی ئەو پێشینەیەکی زامنکاری ئەو داخوازییە هەبووە، ئەوەش لەو لێکۆڵینەوەیەی لە لایەن ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بۆ گریکەکان کراوە.

'لە کۆتایی کۆبوونەوەکەشدا، سەرۆک ڕێککەوتننامەکەی باسکردەوە، کە هەر لە سەرەتاوە پێی گەیشتبوون، بەوەی بەئاشکرا هیچ ڕاپۆرتێک لەسەر ئەو کۆبوونەوەیە نادرێ. فەرماندەکەش وەڵامی دایەوە، 'ئیرگون هەمیشە خاوەن

قسەی خۆی بووە. ئەمەیان لە بەریتانییەکان بپرسە. ئەوان پێت دەڵێن.[1]
ئەویش بەمە قایلبوو، هەرچەندە دواتر کاتێ کۆمیتەکە لە فەلەستین دەرچوو، سەرۆکی کۆمیتەکە بە باشی زانی چیرۆکی کۆبوونەوەکە بڵاو بکاتەوە و ئەو تێبینیانەش کە لە کۆبونەوەکە نووسرابوونەوە بەر لە بڵاوبوونەوەیان چاویان پێدا بخشێندرێتەوە. ئەمەش لە لایەن سەرۆکی کۆمیتەکەوە پەسەند کرا."
بەرەنجامە نافەرمییەکەی کۆبوونەوەکە لە راپۆرتەکەی د. بونچەدا نەهاتبوو.
ساندستروٚم گوتی: "بەداخەم لەوەی ئەندامەکانی دیکەی کۆمیتەکە نەکرا گوێیان لێت بێ. ئێمە راپۆرتیان دەدەینێ، بەڵام هەمیشە جیاوازی لە نێوان کاریگەری ئەوەی خۆی دەیڵێی و ئەوەی لە دەستی دوو وەری دەگری، هەیە."
دکتۆر هووش بەو قسانە خواحافیزی لە ئێمە کرد: "خواحافیز تا لە فەلەستینێکی سەربەخۆ بەیەک دەگەینەوە."
دکتۆر بونچە لە هەموویان گەرموگوڕتر بوو. دەستی منی توند راوەشاند بە هەست و سۆزەوە روونی کردەوە: "من لێت تێدەگەم. منیش ئەندامی کەمینەیەکی چەوساوەم."
کارتەر داڤیدسەن لە ئاژانسی ئاسیۆشییتد پرێسەوە زۆر شادمان بوو. ئاخر ئەو لە کێبەرکێی ئاگالێبوون و دەست بەهەواڵ گەیشتندا و لەو شەوەدا لە کێبەرکارەکانی تێپەڕاندبوو. بەمەش دەستکەوتێکی باشی هەبوو. ئەو کۆبوونەوە نهێنییەی نێوان نوێنەرە فەرمییەکانی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و قسەکەرانی جەنگاوەرە عیبرییەکانی ژێرزەمینی ، ئەو نەوەک هەر تاکە رۆژنامەوانە پێی زانیبێ بەڵکو ئامادەی دیدارەکەش بووە!
بەڵام خۆ هەروا نەکەوتەوە، یەکێک هەبوو خۆشی بڵاوکردنەوەی هەواڵە وروژێنەرەکەی لێتێکدا. ئەو بە ئاگایانە چاودێری دەستکەوتەکەی کرد و هیچ وشەیەکیشی نەوەشاند. ئاخر ئێمە بەڵێنمان دابوو هیچ شتێکی لێ بڵاو نەکەینەوە تا کۆمیتەکە دەگاتە جنێڤ، هەڵبەتە ئێمە قسەکەی خۆشمان بردەسەر. هەنووکە، باری ژێرزەمینی دەیزانی چۆن رازەکانی خۆی هەڵبگرێ؛ بەڵام خۆ ئەوە ئەستەمە کاتێک رازەکەت لەگەڵ یەکێکی دیکەدا هاوبەش بێ و هەر بە پەردەپۆشیش بمێنێتەوە. ئەوێ شەوێ نهێنییەکە ببووە دەنگۆیەکی بڵاوکراوەی گشتی. یەکێک لە نوێنەرەکانی (ر.ن.ی) -من نازانم

کامەیـان بـوو- باسوخواسـی کۆبـوونەوەکەی لەسـەر خـواردنەوەیەک لە قاوەخانەی پیلز بۆ ئەندامێکی دیکەی کۆمیتەکە یان بۆ یەکێ لە سکرتێرەکانی گێڕابـووەوە. ڕۆژنامەنووسـێکی گوێقـوڵاغیش گـوێی لە چیـرۆکەکە دەبـێ و دەسـتبەجێ برووسـکەیەکی هەسـتیارانەی لەسـەر دەدا. لە جیـاتی ئەوەی هەواڵنێرەکەی ئاسیۆشـیێتد پـرێس لەسـەر هەواڵەکە پاداشـت بکرێ، بەڵکـو توشـی حەپەسـان بـوو کـاتێ بـانگی نووسـینگەی سـەرۆکەکەی کـراو لێکۆڵینەوەی لە گەڵدا کرا.
ئەوسا کابرا بە پرتاو چووە لای ساندسترۆم، ئەمجارەیان بەگەرمی داوایکرد کە ڕێـگە پێـدراوە تەواوی ڕاپـۆرتەکە بنێـرێ. بەڵام ساندسـترۆم بڕیاریـدا حاشـاییننامەیەک لە سـەرلەبەری چیـرۆکەکە بـڵاو بکـاتەوە. ئەویـش هۆکـاری خۆی بۆ ئەم کردەوەیەی هەبوو. من دڵنیام ئەوان شەرەفمەندانە جوڵانەوە. تا ئەو مـــاوەیەی ئەو لە ئێرتـــز ئیســـڕائیل بـــوو پەیوەنـــدی لەگەڵ زۆر لە کاربەدەستە بەریتانییەکان هەبوو، بەڵێنیشی بە ئێمە دابوو هیچ وەسـفێکی مـن و هاوڕێکـانم بـۆ هـیچ کەسـێک ئاشـکرا نەکـا. ئەویـش بینـی ئـێمە متمـانەی تەواومان پێی هەیە. ئاخر من ناوی ڕاستەقینەی خۆم پێگوتبوو. ئەویش لە دەرەنجامـدا نەیدەویسـت بکەوێـتە هەڵوێسـتێکی نەخـوازراو، بـۆ سـەلماندنی شـتەکە، تەنـانەت بە بێـدەنگ بـوونیش نەیدەویسـت ئامـاژە بە کۆبـوونەوەی نێوانمـان بکـا. بێ سێ و دوو بەریتانییەکـان لە بـارەی منەوە پرسـیارباریانیان دەکـرد. ئەرێ ئەو لە کـێ دەچـێ؟ ئایـا هـیچ نەشـتەرگەرییکی جوانکاریـت لە ڕووخساردا بەدی کرد؟ ئەرێ ڕەنگی پرچی چۆن بوو؟ چ جـۆرە بۆینبـاخێکی بەسـتبوو؟ دڵنیـابووم ساندسـترۆم وەڵامـی ئەو پرسـیارانەی نەدەدانەوە، بەڵام خۆشـی لەوە دەدزیەوە بکەوێـتە هەڵوێسـتێکی واوە. ڕۆژی دواتـر ئەفسـەری ڕۆژنـامەوانی کـۆمیتەکە بە تونـدییەوە هەواڵـی ڕۆژنامەکـانی سـەبارەت بە کۆبوونەووەکەمان ڕەتکردەوە.
ئـێمە لە لایەن خۆمـانەوە، یەک دوو ڕۆژ دواتـر، ڕازی ئەو نهێنـی بەسـتنی کۆبوونەوەکەمان بە ئەندامەکانی خۆمان گوت. ئێمە بەدەگمەن تێبینیمـان کرد کە بەڵگەنامەکـان "نهێنـی" بـن؛ ئاخر خـۆ هەر هەموویـان نهێنـی بـوون. ئەوەی بەردەوام لە لایەن نووسـینگەکانی حکـوومەتەوە بەکـار دەهـات ئەو مـۆرەی

"زۆر متمانەدار"، "نهێنی" و "ئەوپەڕی نهێنیی" بوو، بەلای منەوە زۆربەی ئەو بەڵگەنامانەی ناوبراو هیچ بەهایەکیان نەبوو.
ئێمە نووسیمان:
"ئەو کۆبوونەوەیەی لەسەر داوای کۆمیتەکە بەسترا، سێ سەعات و نیوی خایاند. هەڵبەتە ڕەچاوی ئەوەمان نەدەکرد کۆمیتەکە داخوازییە سیاسییەکانمان پەسەند بکا. ئەو کەشوهەوا لەبارەی لە ماوەی گفتوگۆکاندا باڵکێش بوو، لەگەڵ باندۆری ئەو قسانەی ئێمە ناکرێ لە ئاست واقیعدا نابینامان بکا. گفتوگۆکانمان باش بوون و نوێنەرانی کۆمیتەکەش بەداخ بوون لەوەی کە ناکرێ هەموو ئەندامانی کۆمیتەکە گوێ لە هاوارنامەمان بگرن، چونکە جیاوازییەکی زۆر لە نێوان کۆکردنەوەی کاریگەری باش و لەبەرچاوگرتنی ڕامانی دروستدا هەیە.
"لەسەر داخوازی ئەندامانی کۆمیتەکە، قسەکەرانی ئیرگون پەیمانی ئەوەیان داوە هیچ بڵاونامەیەکی فەرمی بەر لەوەی کۆمیتەکە بگاتە جنێڤ و خۆی لەوێ بەیاننامەی خۆی بدا، شتێک بڵاو بکاتەوە. هەر لەبەر ئەوەشە ئەم زانیارییەش تەنها بۆ ئەندامانی ئیرگون خراوەتە ڕوو."
بەدەر لەو نامەیە، لە بڵاونامەی نێوخۆیدا لێی بێدەنگ بووین. ئێمە بە شەرەفەوە پابەندی ئەوە بووین ڕاستی کۆبوونەوەکە نەدرکێنین. ئاخر خۆ ئێمە بە هیچ شێوەیەک پابەند نەبووین ڕاستیەکە بە کەس بڵێین. ئێمەش هیچمان نەگوت. پێگەی ئێمە لەهی نوێنەرانی (ر.ن.ی) ئاسانتر بوو. ئێمە لەژێر زەمیندا بووین؛ ئەوانیش لە هوتێلی کادیمادا بوون. ژیان لە ژێرزەمیندا ئاسان نەبوو، بەڵام لایەنێکی چاکی سەلامەتیانەشی هەبوو. لە ژێرزەمیندا تەنها ئەو کەسانە دەبینی کە خوازیاری بیانبینی. لە دەرەوەی ژێرزەمینیشدا بەزۆری وایە ئەو کەسانە دەبینی کە حەزیان لێیە تۆ ببینن. جۆری یەکەمی دیدارەکە هەرچەندە هەمیشەش دڵخواز و سەرنجڕاکیش نییە، بەڵام هەمیشە کەڵک بەخشە. جۆری دووهەمی دیتنەکانیش خاسیەتی پێچەوانەی هەیە. دەکرێ ئێمە لە ناخی دڵەوە بێدەنگی هەڵبژێرین. ئاخر خۆ کەس ناتوانێ پرسیاری هەراسانمان لێبکا.
بەڵام ئێمە لەو پێشهاتەوە تێگەیشتین، کە چەند بە هاوسۆزی حاشالێکردنەوە پەیوەستین. زۆر جاران ئەوان ئەو شتەن کە نکوڵی لێدەکرێ.

ویـڕای ئەوەی کـارتەر داڤیدسـۆن نەوەک بە تەنیـا هەنـدێ دڵنەوایـی لە حاشـایینامەکەی ساندسـترۆمدا دۆزیەوە، بەڵکـو لە تـوڕەیی دەسـەڵاتدارە بەریتانییەکان. ئەوانیش لە لایەن خۆیانە سـەبارەت بەو کۆبوونەوەیە دەهـری بوون. لە نێو پەرلەماندا ڕووبەڕووی پرسیاری توند و جەرگبڕ بوونەوە.
"ئێمە بۆ پێنج سـاڵ دەچین بە دوای ئەوانەوەین،" ئاماژەیەکی وا درا، "بەلام نەمانتوانی هەر لێشیان نزیک ببینەوە، کەچی سـەرۆکی کۆمیتەیەکی (ر.ن.ی) دێ و زۆر بە ئاسانی دەیانگاتێ."
بە خوێنـدنەوەی ئەو تورەیینـامەیە زۆر بەداخـم بـۆ دەزگـای هەواڵگـری بەریتانیی. ئای چەند ناکارام کە پێنج ساڵە لێنەگەڕاوم دەستیان بمگاتێ! ئاخر چۆن لە بـاری ژێرزەمینیدا پێشـوازیم لە ساندسترۆم، هـوو و بونچە کرد و هێشتاش رەتیدەکەمەوە بارکەر و گێرنی و گیلس[٩٧] ببینم؟
2
ئـێمە بە دیتنـی نـوێنەرانی ئەمریکـای باشـووری کـۆمیتەکە د. گرانـدۆس لە گواتیمالا و پرۆفیسۆر فابریگات لە ئۆراگوای بووینە مایەی نانەوەی گۆبەندە شـەرمەزارییەکی نێودەوڵەتی. بە ڕاسـتیش ئەو کۆبـوونەوەیە زۆر هاوئـاوازانە بـوو. فابریگێت و گرانادۆس تـا ڕاددەیەک هـاوڕێی چەک بـوون. لە سـەرەتای کۆبـوونەوەکەوە پێیـان گـوتین لەو کـاتەی دژی سـتەمکارانی وڵاتەکەیـان ببـونەوە لە ژێـرزەمین و هەنـدەرانەوە دەژیـان. گرانـادۆس ڕۆڵەی یەکێـک لە پـاڵەوانە نیشـتمانییەکانی گواتیمـالا بـوو، کە کـۆتەڵەکەی نمایشـنامەیەکی جەماوەریـانەی سـاڵانەیە. هێشـتاش جارێکیـان لە لایەن دەسـەڵاتدارانی ئەو گەلەی کە کوڕی ئەو بـاوکەی یارمەتی ئازادکردنیـان دابـوو، حـوکمی مەرگـی بەسـەردا درابـوو. ئیـدی ناچـارکرابوو لە حەشـارگەیەکەوە بـۆ یەکێکـی دیکە هەڵبـێ و خـۆی لە دەسـت دوژمنەکـانی قوتـار بکـا. دوای سـاڵانێکی زۆر لە ژیانی پڕ لە ئاسـۆر، بینی ڕژێمی وڵاتەکەی گۆڕا و ئەویش کرایە باڵوێزی وڵاتەکەی لە وڵاتە یەکگرتوەکـانی ئەمریکـا و پاشـان لە ڕێکخـراوی نەتەوە یەکگرتوەکان. بێ سێ و دوو گرانـادۆس بە خەبـاتی ڕزگـاریخوازانەی عیبری کارانگـاز بـوو، ئەوەش لەبەر دوو هـۆو، یەکەمیـان بەرخودانێـک بـوو بـۆ ڕزگاری و دووەمیشیان چونکە دژی دەسەڵاتی بەریتانییەکان بوو. بەریتانیا

---

[٩٧] مەبەست لەو سێ ناوانە، ژەنەراڵ و کاربەدەستە باڵاکانی بەریتانیین.وەرگێر.

لە پارزەمین(کیشوەر)ی باشووری ئەمریکا خۆشەویست نەبوو، چونکە بۆ ماوەی چەندان نەوە لە ژێر پاوانگەری بەریتانییەکان دەچەوسێندرانەوە. گواتیمالای بچکۆلانەش هۆکاری خۆی هەبوو بەریتانیەکانی خۆش نەوێ: کۆلۆنی بەریتانی تا ئەمڕۆش هەر لە ڕۆژئاوای هەمپشایردا ماوە، وای دادەنێ خاکی گواتیمالای داگیرکردبێ. خودا لە هندۆراسیشەوە یارمەتیمان بدا.

هەڵبەتە فابریگێتیش دۆستی دۆزەکەمان بوو. بۆ ساڵانێکی زۆر بەر لەوەی بەری ژان و ناسۆرەکەی لە تاراوگەدا بچنێتەوە ، لە بەرازیلدا دەژیا. ئۆراگوای، کە دواتر بەچاوی خۆم بینی، یەکێکە لە وڵاتە هەرە ئازادەکانی سەر زەوی بوو. سیسمی کۆمەڵایەتیەکەی (شۆشیالەکەی) کە لە لایەن سەرەک ڤاگووە پێشکەش کراوە، یەکێکە لە پێشکەوتووخوازترین سیستمی جیهان. هەقە نەتەوە گەورەکان لەو گەلە بچووکەی سەر کەنارەکانی "ڕووباری زیوین" کە خوا پیرۆزی کردوون و دڵێکی پڕ لە زێڕی داونەتێ، شتێک فێر ببن. ئارتیگا، ڕزگارکەری ئۆروگوای، ئەندامێکی هاوبەندی مەزنی سان مارتین، بۆلیڤوار، تیرادێنتاس و ئۆهینگنیسی ڕزگارکەرانی باشووری ئەمریکایە. بەڵام وەک خەسڵەتێکی کتێبە مێژوییەکانی ئینگلیز، ئاماژە بە ئارتیگاس وەک "سەرۆکی چەتەکان" دەکەن. لە مۆنتەڤیدیۆ وە تا تەلئەبیب ماکمیلیانس[٩٨] هەمان فەرهەنگ بەکار دێنێ.

گەلانی ئامریکای باشوور دەزانن چۆن خۆشەویستی و ڕقلێبونەوە بکەن. ئەوان خەڵکانێکی بەخشندە و میواندۆستن. بەرخودانمان دژی دەسەڵاتی بەریتانی، کە لەم سەرەوە بۆ ئەوسەری پارزەمینەکەدا باس دەکرا، دەنگ و سەدای گەیشتبووە کوڵێتی شوانە دوورەدەستەکانیشیان، یاخیبونەکەی کاتی خۆی دژی مەدرید بە بیر پیرەمێردەکانی دەهێنایەوە. گەلانی ئەمریکای باشوور یاخیبوونەکەی ئێمەیان بە بێ شاردنەوەی هاوسۆزیان دەردەبڕی. من ئەمەم بەچاوی خۆم بینی، کاتێک ئەو وڵاتە گرانبەها و زۆر دەوڵەمەندانەم بینین. من لە گرانادۆ و فابریگێتم بیست کە باسی ئەزموون و خەباتی خۆیان بۆ دەکردین.

---

[٩٨] ستۆکتۆن ڤیسکاونت ماکمیلان (1894-1986) دەوڵەتمەداری بەریتانی و لە ساڵانی (1957-1963) سەرۆمەزیری شانشینی یەکگرتوی بووە. وەرگێر.

گرانادۆس وەک جەنگاوەرێکی سیاسییانەی نایاب کاری تێکردین. فابریگێتیش وەک مرۆڤدۆستیک بە جوامێرترین واتای وشە. ئەو لە ناخەوە هەژاندمی کاتێک لە بارودۆخی منداڵانی ناتانیای لە بن باری قانونی ناکاودا دەکۆڵیەوە.
"ئایا منداڵەکانی ناتانیا برسی نابن؟ ئایا شیریان دەست دەکەوێ؟"
لەو بڕوایەدام، خۆشەویستی بۆ منداڵ پێوەری هەستوسۆزی مرۆڤانەیە. لەو بەدواداچونەی لە ئێرتز ئیسرائیل و ئەوروپا، فابریگێت یەکەمین شت کە دەیبینین، منداڵان بوون.
کۆبوونەوەکەمان لە ماڵە خنجیلانەکەی ئیسرائیل واکسی برادەرم بوو. دیسان یۆول کۆبوونەوەکەی رێکخست و بەنێو شەقامەکانی تەلئەبیبدا چەرخێکی لێدا، بەر لەوەی میوانەکە بگەیەنێتە یەکێک لە "نهێنیترین کونجەکان"ی ژێرزەمینی کە لە ڕاستیشدا هەر ژووری ئاسایی بوون و لە لایەن دۆست و برادەرە بوێرەکانمان خرابوونە بەردەست. کەشوهەوای دیدارەکە لایەنی فەرمی پێوە دیار نەبوو، هەر هیچ نەبێ وەک بەشی یەکەمی دیدارەکەمان لەگەڵ ساندسترۆم، بونچە و هوو نەبوو. گرانادۆس لەباتی هەر دووکیان قسەی کرد. ئینگلیزیی فابریگێت بایی ئەوەندە نەبوو، بۆیە بەدڵگەرمییەوە بە زمانی سێرڤانتس[99] ئاخاوت و گانادۆسیش بە ئینگلیزییە ڕەوانەکەی وەری دەگێڕا. من ئالیکس و شموئیلم لەگەڵدا بوون؛ ئەو کاتیش شموئیل بەناوی هەر دووکمانەوە دەدوا.
لەگەڵ گرنادۆسدا دەمەتەقێیەکی سیاسیانەمان کرد. هەوڵمدا وەک دۆستی گەلەگەمان ئەو فابریگێیات بهێنمە سەر ئەو بڕوایە، نەوەک هەر داوای نەهێڵانی ماندانی بەریتانی بکەن-ئەوەش زەمینەیەکی هاوبەش بوو- بەڵکو هەموو وڵاتەکە ببێتە دەوڵەتێکی جوو.
"عەرەب و بەریتانییەکان" من وای لەسەر ڕۆیشتم، "زمانێکی نافەرمییان لەنێو کۆمیتەکەدا هەیە. گەلی جوو هیچی نییە. ئێوە هەر دووکتان هەستەکانتان نەشاردۆتەوە، دەبێ ڕووبەڕووی ئەو داوایە ببنەوە کە فەلەستین ببێتە عەرەب یان بەریتانی، بەو داوایەی کە دەبێ فەلەستین ببێتە دەوڵەتێکی جوو. ئەگەر زۆرینەی کۆمیتەکە بڕیار لەسەر سازش بدا، ئەمەش پرسێکی دیکەیە،

---

[99] مەبەست زمانی ئیسپانییە، چونکە سێرڤانتس(1547-1612) نووسەری ڕۆمانی دۆنکیشۆت کە بە دایکی ڕۆمانەکانی هاوچەرخی ڕۆژئاوایی دادەندرێ. وەرگێڕ.

بەڵام هەر هیچ نەبێ با لەسەر زمانی دوو نوێنەری نێودەوڵەتی دەنگمان ببیسترێ. تەنانەت گەر ئێوە بەنەخشەی دابەشکردنیش قایلبن وەک هەیە، ئەوە زۆر ڕوون و ئاشکرایە، کاتێ پێشنیازەکە لە لایەن ئێوە، ئێوەی دۆست پێشکەش بکرێ، ئەوا ئاکامەکە "سازشێک" دەبێ لە نێوان پێشنیازەکەی ئێوە و هی عەرەب-بەریتانییەکان، بێگومان هی ئەوان حاشا لە مافەکانمان لەسەر ئەو وڵاتە دەکا."

گرانادۆس وەڵامی دایەوە، ناتوانێ بە داواکەمان رازی بێ. ئەو لە ژێر کاریگەریدا بوو، ئەو گوتی: زۆرینەی ئەندامانی کۆمیتەکە مەیلیان لەسەر نەمانی دەسەڵاتی بەریتانی هەیە، بەڵام دەبێ هەبوونی عەرەبەکانیش بەهەند هەڵبگرن. ئەوان ناتوانن تاک لایەنانە بن. لەوەش زیاتر ئەو بە خەندەوە گوتی، "خۆ شتێکی سەیرە من و فابریگێیت لە بەڕێز شێرتۆک[100] زیاتر داوا بکەین. خۆشت دەزانی ئاژانسی جووەکان پێشنیازی دابەشکردنی خستۆتەڕوو."

ئێمە هەرسێکمان خەریکبووین بگەڕێینەوە سەر ئەو خاڵە. مشتومڕمان لەسەر ئەوە بوو، لە کاتێکدا ئێمە ناتوانین لەسەر ئاژانسی جووەکان قسە بکەین، هەستمان کرد تەنانەت ئەوانیش پێشنیازی دەوڵەتێکی جوولەکەیان لە سەرتاپای ئێرتز ئیسرائیل بۆ کۆمیتەکە پێناخۆش نییە. هەر چۆنێک بێ هەوڵ و کۆششی ئێمە بەفیڕۆ چوو. لە کاتێکدا گرانادۆس لەبارەی سەرکردە فەرمییەکانی جوو گەرموگوڕ نەبوو، ئەو بەتەواوی لە ڕێی هەڵوێستیان لەمەڕ پرسی دابەشکردنەوە پێناسە کردبوو. ئێمەش دەبوایە پێ لەوە بنێین، کە دوا بەڵگەوبەندی ئەو بەرەی لەبن پێی ئێمە دەرهێنا. ئاخر هیچ بێگانەیەک هەرچەندە دۆستیش بێ، ناتوانێ داوای شتێک بۆ نەتەوەیەک بکا لە نوێنەرە فەرمییەکانی خۆی زیاتر. ئەو بەڵگەوبەندە ناسادەش چەند مانگێک دواتر لە کاتی بەستنی دانیشتنی کۆمەڵەی گشتی(ر.ن.ی) دووبارە بوویەوە، ئەمجارەشیان لە لایەن تساراپکینەوە[101] بوو. لەو هەلومەرجەدا کلیلی زۆر لە پەردەسەندنەکانی ئێرتز ئیسرائیل لە دەستی نەوەکەی ئێمەدابوو.

---

[100] مەبەست لە شێرتۆک نوێنەری ئاژانسی جووەکانە لای کۆمیتە تایبەتییەکە.

[101] دیپلۆماتێکی پلە بەرزی یەکێتی سۆڤیەت بوو لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە نیوەی دووەمی چلەکان. وەرگێر

دەمەتەقێیەکە سەبارەت بە حوکمی مەرگی سەر سێ کوڕەکانی ئێمە بە جارێک بۆ مشتومڕێکی خەمناک و بە جۆش، سەرکێش بوو. گرانادۆس باسی هەوڵەکانی خۆی و فابریگێتی بۆ کردین کە لەناو کۆمیتەکەدا چۆن جوڵاونەتەوە. منیش پێمگوتنەوە کە چەند سوپاس و پێزانینمان بۆ هەن. هەر دووکیشیان گوتیان شایانی نییە. ئاخر ئەوان تەنها ئەرکی مرۆییانەی خۆیان بەجێگەیاندووە. لە ڕاستیشدا ئەوان بۆیان زیاد کرد، ئێمە سوپاسی ئێوە دەکەین کە ئێمەتان هێنایە فەلەستین.
"هاوڵاتییێکی جوو پێیگوتین" گرانادۆس لەسەر قسەکەی ڕۆیشت، "کە ئەو لە ژێرزەمینییەکان سەبارەت بەهۆی کردەوەکانیان بوونەتە مایەی ئەو هەموو سەرئێشەیە، تووڕە نین، چونکە لە دەرهاوێشتەدا بەهۆی کردەوەی ئەوان بوو کۆمیتەی (ر.ن.ی) دامەزرێندرا. ئێمەش پێمان وایە ئەو ڕاست دەکا."
فابریگێتیش ئەوەی خستە سەر قسەکانی، "من بانگهێشتی سەر خوانێکی ژەنەڕاڵ ماکمیلان کرابووم، بەڵام بەرسڤم دانەوە لەبەر حوکمی مەرگی سەر گیراوەکان، ناچم."
ئای لەو فابریگێتە ڕاستگۆ و شایستەیە! ئاخر خۆ سەرکردە جووەکان هەمان شکۆییان ڕووبەڕووی بکوژە دادوەریەکانی چەوسێنەر نیشان نەدا...
دەرکەوتنەوەی یۆول ئاماژەیەک بوو بۆ کۆتاییهاتنی گفتوگۆکانمان. ئێمەش وەک ئەندامی خێزانی جەنگاوەران بۆ ئازادی بەگەرمییەوە دەستی یەکمان گوشی. کاتێکیش لە سەروبەندی ڕۆیشتندا بوون، گرانادۆس ڕووی تێکردم: "دەکرێ پێم بڵێی ئەمشەو من قسەم لەگەڵ کێ کرد. حەزمان لێیە کە ئێوە نوێنەری ڕێپێدراوی ئیرگون بن."
ئەو لەسەر هەق بوو. ئاخر ئێمە لە سەرەتای گفتوکانماندا هیچمان دەربارەی ناسنامەکانمان نەگوتبوو، ئەوەش هەر لەبەر هۆیەکی سادە، پێمان وابوو یۆول پێیگوتبوو کە من ئامادەی گفتوگۆکان دەبم. هەر چۆنێک بێ ناوی یاوەرەکانم هی ئاشکرا کردن نەبوون.
دیاربوو یۆول پەیڕەوی دەقاودەقی ڕێسای ژێرزەمینی کردبوو. لە ماوەی گفتوکانیشدا میوانەکان دڵنیا نەبوون ڕووی قسەیان لە کامەمان بکەن. گرانادۆس بە زیرەکییەوە هەوڵی دابوو بماندۆزێتەوە. ئەو وای بۆچووبوو کە سەرۆکەکەمان ئالێکسە، ئاخر ئەو بەتەمەنترین کەسمان بوو. هەر جارێک

جگەرەیەکمان دادەگیرساند، گرانادۆس هەوڵی دەدا چەرخی بۆ ڕابگرێ، بەڵام دواتر، ئەو کەسەی لە تەمەنی لاوی خۆیدا، ئەندامی "هاوکاری" خوێندکاران بوو، جگەرەی لە دەم دەرێنا و چەرخ یان شخارتەکەی لە گرانادۆس وەردەگرت و دەیدایە من و پاشان شموئێل و لە کۆتاییدا جگەرەکەی خۆی پێ پێکرد. دەکرێ ئەو هەموو مانۆڕە سوکوئاسان وەک ڕێزلێگرتنێک لێکبدرێتەوە، بەڵام ئالێکس بووە مایەی سەرنجدان لای گرانادۆس کە شتێک تاقی بکاتەوە، بێ ئەوەی سەرودەریشی لێدەربکا.
منیش هیچ هۆکارێکم نەدۆزیەوە ناسنامەی خۆم لە گرانادۆس و فابریگێت بشارمەوە لە کاتێکدا بۆ ساندسترۆمم ئاشکرا کردبوو.
وەڵامی گرانادۆسم دایەوە: "من ناتوانم ناوی هاوکارەکانمت پێبڵێم، نازناوەکانی ئەوانیش هیچ بۆ تۆ ناگەیەنێ. ناوی منیش زانراوە، کەواتە پێویست ناکا لێتی بشارمەوە.."
ئەوسا تێگەیشتم ئەندێشەی ژێرزەمینی چەند بەجۆشە، تەنانەت ئەگەر ناوەڕۆکەکەی زیاتر نەبێ لە ئامادەبوون بۆ ژانوناسۆر و مردن لە پێناوی دۆزەکە. کاتێکیش ناوی خۆم بە گرانادۆس گوت، هەنگاوێک کشایەوە و بەدەنگێکی بەرز گوتی: "کەواتە تو پیاوەکەی!"
بەگەڕانەوە بۆ ئەو لەرە دەنگە بەرزە، کە وشەکانی پێ دەربڕین و منی سەرسام کرد و وشەم بۆ نەدۆزرایەوە، تەنها پێکەنیم. فابریگێت پێنەکەنی. ئەو باوەشێکی پێداکردم وەک ئەوەی یەکێک برا بچووکەکەی لەئامێز بگرێ و شتێکی بە زمانی ئیسپانی گوت.
"ئێمە هاوڕێی چەکین،" کاتێکیش دەنگم بۆ گەڕایەوە پێمگوت. "هەموو جەنگاوەرانی ئازادیخوازی جیهان یەک خێزانن."
دوای زیاتر دەستگوشین و ڕاوەشاندن و دەربڕینی وشەی دۆستانە، یۆول میوانەکانی لەگەڵ خۆ بردن.

## بەندی 23
## کۆبوونەوە لە تاریکییدا
## ٤٦٠ - ٤٧٣

لە ڕۆژگاری هاوکاری نێوان ئاژانسی جووەکان و دەسەڵاتدارانی بەریتانی دژی ئیرگون زڤای لویمی، من چاوم بە ئارسەر کوستلەر کەوت. کوستلەر خۆی بۆ ڕشتەیەکی تایبەتی ئەدەبیات کە دەکرێ پێی بگوترێ "سایکۆلۆژیای سیاسی" تەرخان کردبوو، بە تایبەت بۆ ئەوە هاتبووە ئێرتز ئیسرائیل تا هەواڵی ڕووداوەکان لە دەستی یەکەم وەربگرێ و لێیان بکۆڵێتەوە بیانئاخنێتە نێو کتێبەکەی. ئەو دەستبەجێ هەوڵیدا لەگەڵ ژێرزەمینییەکان پەیوەندی بگرێ، ئەو فریدمان یەللینی لە گروپەکەی ستێرن بینیبوو، هەندێ جاریش بەفشارەوە داوای بینینی منی دەکرد.

ئەو دەمی من ئیسرائیل ساسۆڤەر بووم. ئەو کات لە لایەن هەر دوو لای بەریتانیی و جووەکانیشەوە ڕاوەدوو دەنراین. دەبوایە بە ناچاری وریا و خۆپارێز بووایین. هاوکارەکانم بەردەوام بەدگومان بوون، لەو هەلومەرجەدا بتوانم کوستلەر ببینم. پێمانگوترابوو ئەو ڕۆڵێکی باش لەنێو کۆمەڵگەی بەریتانییدا وازی دەکا. لە کاتێکدا هیچ گومانێک لە پاکی کوستلەردا نەدەکرا، بەڵام زانیارییێک بڵاوبووەوە، گوایە ترسی زۆر لەوەدایە کوستلەر بە نائاگایی لەنێو کۆمەڵگەکەدا شتێک لەسەر ئێمە بدرکێنێ. هەر لەبەر ئەوە بوو بە ڕێزەوە بە کوستلەر گوترا جارێ دیدارەکەمان سەرناگرێ. بەڵام خۆ کوستلەر لەو کەسانە نەبوو بە ئاسانی دەست لە کەرەسەی خاوی بابەتەکەی، سایکۆلۆژیای سیاسەت هەڵبگرێ، منیش بوومە یاریدەدەری.

هەر بە سروشتی شتەکان، من کەمتر خەمی ئاسایشپارێزی خۆم دەخوارد لەوەی کە هاوکارە باشەکانم خەمیان بوو. منیش حەزم دەکرد قسە لەگەڵ کوستلەردا بکەم، وەک پیاوێک کە بیەوێ بچێتە ناخی شتەکان. ئیدی ڕەنجێکی زۆرمدا و دەستڕۆیشتنی خۆم بەکارهێنا تا دیدارێکی وا بڕەخسێندرێ. هاوکارەکانم بە نابەدڵی قایلبوون، بەڵام یەک مەرجیان بۆ دانام: کۆبوونەوەکە دەبێ لە تاریکییدا ببەسترێ؛ نابێ ڕدێنەکەی ئیسرائیل

ساسۆڤەر ببیندرێ. من هەندێ گومانم سەبارەت بەو مەرجە هەبوو. ئاخر خۆش نییە لە تاریکییدا قسە لەگەڵ یەکێکی دیکەدا بکەی. ئەی ئەوە سوکایەتیکردن نییە بە کوستلەر؟ بەڵام هاورێکانم شێلگیرانە لەسەر مەرجەکەی خۆیان نەهاتنەخوار. بەداخەوە بۆ رِدێنە بەستەزمانەکەم! ناچار ملم بۆ مەرجەکە دانا.

کوستلەر زۆر هاوئاواز بوو. کاتێک ئەو بردرایە هۆدەیەکی تاریک، پێموابوو ئەو چاوی بەستراوەتەوە کاتێ بانگی کرد "مێناحیم؟"

ئەو چاوتروکانی منی نەبینی کاتێ وەڵامم دایەوە: "بەڵێ. شالۆم(سڵاو) لە تۆ. فەرموو لە شوێنەکەت دانیشە."

ئەوە زۆر خۆشە کە داوات لێبکرێ لەسەر کورسی دابنیشی، بەڵام چۆن لە تاریکییدا کورسی و مێزەکە دەدۆزیەوە؟ هەرچەندە ئاڤراهام و رێوڤن لەو ژوورە تاریکەدا بوون کە خۆیان دایانهێنابوو، هەر دووکیان ئێمەیان دانیشاند. ئیدی ئێمە لە دەنگی یەکەوە قسەمان بۆ یەکدی دەکرد.

کوستلەر پێیڕاگەیاندم لەنێو بازنەی بەریتانیی 'دۆستایەتی زایۆنیزم' ئەو مەیلە لە گۆڕێدایە کە دوای جەنگ قۆناخێکی دە ساڵەی گواستنەوە بێتە کایە، لەو ماوەیەدا سەد هەزار جوولەکە رێگەی هاتنە نێو وڵاتی پێبدرێ. لە کۆتایی قۆناغەکەشدا دەکرێ کردەی دابەشکردن بێتەگۆڕێ. لە وەڵامدا پێمگوتەوە ئێمە بڕوامان بە "قۆناخە گواستنەوە" جۆربەجۆرەکان نییە، هەروەک چۆن بڕوامان بە دۆستایەتی "بازنە دۆستەکان"یان نییە. کوستلەر ئەو بیروڕاییەی منی رەتدایەوە. ئەو وەک نوێنەرایەتی ئەو بازنانە ناوی توخمە گەنجەکانی پارتی کاری بەریتانی هێنا و نەخاسمە ناوی میشێل فوتی هێنا.

گفتوگۆکەمان لە بابەتێکەوە دەچووە سەر ئەوی دیکە. کوستلەر لێیپرسیم ئاخۆ ئێمە بەردەوام دەبین لەسەر بەکارهێنانی 3-V.

منیش بە واقوڕمانەوە پرسیم، "3-V چییە؟"

"خۆت دەیزانی، ئەو سیستمە هاوەنە ئەلکترۆنییە، کە لە نزیک هوتێلی شا داودا دۆزیانەوە. بەریتانیەکان بەو چەکە دەڵێن 3-V."

منیش پێکەنیم. دیارە داهێنانەکەی گیدی زۆر گرنگ بووە، بەڵام ئایا چ ناوێک بۆ ئەو تەقینەوانە هەبوو؟ هەڵبەتە دەسەڵاتداران هۆکاری خۆیان هەبوو تا

نــاوی لێبنــێن 3-V، بەڵام بە نیــازی نەفرەتلێکردنمــان، هەمــوو ئەوەی لە دروستکردنیدا سەرکەوتووبوون بۆ ئەوە پەسنیان داوە تا هێزی ئێرگون تێکبشکێنێ.
کاتێـک گفتوگۆکانمــان بەڕێـوە دەچـوو، ئەو سـەرنجەم لە لا پەیـدابوو، کە کوستلەر پتر ئەوەی نـاتوانێ ببینـێ سـەرنجی رادەکێشـی لەوەی دەیبیسـێ. هەر دووکیشمان بە چڕی جگەرەمان دەکێشا. بەڵکو بیرمان کردبێتەوە کە دووکەڵەکە تاریکاییەکە ڕاودەنێ. بەڵام چەرخلێدان بۆ پێکردنی جگەرەکان لەو هەلومەرجەدا کارێکی ئاسان نەبوو. "ئەشکەنجەدەرەکانم" بڕیاریان دابوو، نـابێ درز بکەوێتە تـاریکییەکە. نەدەبـوایە هـیچ تروسـکاییەک لە دەرەوە و بەدڵنیاییشیەوە لەنێو ژوورەکە پەیدا بووبا. ئای لەو ریشە خەمناکە! جگەرە پێکـردن لەو تـاریکییەدا ریتـوڵێکی تـایبەتی هەبـوو. مـن دەبـوایە رێگـای ژوورەکەی تەنیشتم بدۆزیبایەوە تا جگەرەکەی لێ پێبکەم. لەو ساتەدا ئاڤراهام یان رێوڤن دەچوونە لای کوستلەر و جگەرەکەیان بۆ دادەگیرساند. کاتێکیش جگەرەکەی هەر دووکمان دادەگیرسا و دوکەڵی تەواوی لێدەهات، دەکرا بگەڕێینەوە شوێنی خۆمان و هەریەکەمان دەنگی ئەوی دیکە "ببینین".
بەڵام کوستلەر بە ئاسانی کەرەستەی خاوی بۆ "سایکۆلۆژیای سیاسەتەکەی" لەبیر نەدەچوو. ئەو بە جۆشێکی نائاسایی جگەرەکەی دەکێشا. ئەو مژێکی درێژی لێدەدا، سەری جگەرەکەی سوور دەکردەوە، پاشان مژێکی درێژی دیکەی لێدەدایەوە، تا ئەو کاتەی هیچی لێنەدەمایەوە. من بە خۆشییەوە سەیری جگەرە لە دوای جگەرەی ئەوم دەکرد، داخم بۆ ئەو جگەرانە نەدەخوارد کە دەسووتان، قەدەریان وابوو ببنە دوکەڵ و بە با بدرێن، بەڵکو داخم بۆ کوستلەر دەخوارد. ئەو ستراتیژی بایەخی مەشخەڵەکەی بە هەڵە لێکدابوویەوە. رەنجەکەی بەبا ڕۆیشت. سووربوونەوەی جگەرەکەی ئەو هی ئەوە نەبوو بتوانێ لەبەر ڕۆشناییەکەی من ببینێ. بەڵکو بە پێچەوانەوە؛ ئەو تروسکاییەی لەسەر پشکۆی جگەرەکەی دەهات، وای لێدەکردم لە شوێنی خۆمەوە سەرووی کەپووی ئەو ببینم. ئەوەی لەسەری بوو بیکا، داوم لێبکا منیش جگەرەکە بە هەموو هێزێکمەوە بکێشم بەڵکو بتوانێ سەری کەپوی من و لەوانەش بوو تروسکاییەک لە ریشەکەم ببینێ! کاتێکیش ئەو داوایەکی وای نەکرد، منیش لەخۆمەوە هیچ خۆم تێکنەدا. ئیدی لەوێ تاریکایی بوو.

دواتــر بۆمــان دەرکەوت کۆبــوونەوەکەم لەگەڵ کوســتلەردا دەنگــۆیەی وا بەهێزکردبوو گوایە من نەشتەرگەری جوانکاریم بۆکراوە، ئەو بەندوباوەش بە بەرفراونــی لەنێو بــازنەی دەســەڵاتدارانی بەریتــانی دەخــولایەوە. مــن لەو باوەڕەدام، ئەوان خۆیان بەمەبەست دەنگۆکەیــان داهێنــابێ، بۆ ئەوەی ڕوونــی بــکەنەوە، کە دەزگــای هەواڵگــری ئەوان، ویــڕای ئەو هەمــوو کنەوپشــکنینەی، ویــڕای ئەو پاداشــتەی بــۆ شــوێنپێهەڵگرتنی مــن دیــار بــخەن، کەچــی لە دۆزینەوەمدا شکستیان هێنــابوو. یــاکۆڤ مێریــدۆریش شــتێکی خۆشــتری لەو بیردۆزە ســەربار کردبــوو. کاتێک ئەفســەری دەزگــای هەواڵگر جارێکیــان لە زیندانی قاهیرەوە لێیپرســی، "ئایــا راســتە بێگین نەشــتەرگەری جوانکــاری بــۆ کــراوە؟" یــاکۆڤیش بە ترســوتۆقین و شــڵەژانێکی نەشــاردراوەوە وەڵامــی داوەتەوە: "نا، نەخێر، ئەو شتە راست نییە!"

ئەفســەری دەزگــای هەواڵگر بەو وەڵامە گەشــاوەتەوە. ئــاخر ئەو دڵنیــابوو کە ڕاستی لەبن سەری یاکۆڤ دەردێنێ.

دیــاربوو کوســتلەر لگبن(خشــت)ێکی دیــکەی خســتبووە ســەر باڵەخــانە ئەندێشــاویەکەی پۆلیس. هەڵبەتە ئەو لەبــن هــیچ پابەنــدبوونێکی وادا نەبــوو، ئەوە دەربخات، من بەو شێوە نەبــووم کە ئەوان وێنایــان کردبــووم. ئــاخر ئەو لەوەدا ئەوق مــابوو کە مــن لە تاریکاییدا لەگەڵــی کۆببــوومەوە. چەنــد ڕۆژێــک بەر لە دیدارەکەمان، ئەو بەرپرسی F.F.I ڕووبەڕوو بینیبوو. باشە بۆچی مــن وانەبینێ؟ ئەو نەیدەزانی ئەوێ دەمــێ ئێرگون هۆکــاری تــایبەخۆی هەبــوو، کە F.F.I بــۆ ئاســایشــپارێزیانەی خۆیــان نەیــانبوو. هەروەهــا ئەوەشــی نەدەزانــی، من بەربژارێکی بەجێ بووم بۆ یاریدەدەری مجێوری سیناگۆگەکەی شــەقامی یۆشۆوا بن نون و ریشەکەشم ئەوەندە گرنگ بوو پڕ بەپێستی پلەکە بــوو. لە بیرکــردنەوە بــۆ هەڵهێنــانی مەتەڵەکە، دەکرا بگــاتە ئەو دەرەنجــامە کە هەنــدێ ڕاســـتی لەو ڕاپۆرتـــانەدا هەبـــوون بەوەی مـــن ویســـتومە ڕووخســـارە ناشــیرینەکەم بە هــۆی نەشــتەرگەرییەوە جــوان نیشــان بــدەم. یــاخود دەکرێ ئەوە دەرهاوێشتەی ئەو کەسانە بێ، ئەو پێیگوتبوون کە ئەو منی لەژێر بــاری جگەرە لەسەر جگەرە پێکردنەوە بینیوە.

هەرچەندە تەوژمێکی دیکەی چیرۆکەکان لە ڕۆژنامەگەری بەریتــانییەوە-لە ڕێــی ئەوانیشــەوە بــۆ سەرتاســەری جیهــان- ســەبارەت بە نەشــتەرگەری

جوانکارییەکە، بڵاوبووەوە، ئێمەش ئەوپەڕی خۆشیمان بەو جۆرە ڕاپۆرتانە هات. ئێمە زیاتر کەیفخۆش بووین کاتێ ئەوەمان لە ڕۆژنامە پڕ خۆشەویست و پڕ خوێنەرەکانی بەریتانییدا خوێندەوە، کەوا من نەوەک تەنها یەکجار نەشتەرگەری جوانکاریم بۆ کراوە بەڵکو چوار جاران. کاتێکیش ئێمە لەباری ژێرزەمینییەوە دەرچووین، بە شێوەیەکی سەرەکی لە ڕۆژنامەگەری ئەمریکییەوە پرسیارم لێکرا، ئاخۆ ئەو چیرۆکانە ڕاست بوونە، هەستێکی واش لای من پەیدا ببوو، بەوە وەڵامیان بدەمەوە: "زۆر ڕاستە". بەڵێ من چوار جاران نەشتەرگەری جوانکاریم کردووە، بەڵام بەر لە ڕۆیشتن و جێهێڵانی بەریتانییەکان، پێنجەمین جوانکاریشیم بۆ کرا، هەر بۆ ئەوەی ڕووخسارە ڕاستەقینەکەم وەربگرمەوە.

من دەبێ داوای لێبوردن لە ئارسەر کوستلەر بکەم، چونکە لە تاریکیدا دامنیشاد و بوومە مایەی ئەوەندە جگەرەیەش بکێشی. هیوادارم ئەویش وەک ئیڤان گرینبێرگی دۆستی باشمان، لێم خۆش بێ، ئاخر ئەو دۆستەشم هەر لەتاریکاییدا بینی و بەڵێنیشیم پێدا لە ڕووناکیشدا ببینمەوە. ڕووناکیش داهات.[102]

ئەوەش دژبەیەکبوون (پارادۆکس)ێکی ژیانی هەموو پیاوێکی جەنگاوەرە لە دۆزە ڕەواکەیدا.

ئاخر ئەو قورساییەک، هەندێ جار نیرێکی زۆر قورس دەخاتە سەرشانی بۆ ئەوەی نیری بێگاری فڕێ بدا. ئەو شەڕێک بەرپا دەکا بۆ ئەوەی ئاشتی بسازێنێ. بە شێوەیەکی وا خۆی ئازار دەدا تا لە دواییدا هیچ ئەشکەنجەیەک ڕوونەدا. ئەو هێزە فیزیکییەکان بەکاردێنێ و باوەڕیشی بە هێزی مۆراڵە. ئەو خوێن دەرێژێ بۆ ئەوەی چیدیکە خوێن نەڕژێتەوە. ئەو لەپێناوی ئازادییدا کۆیلایەتی -لە زیندان و ئۆردوگا زۆرەملێکاندا- دەپەژرێنێ. ئەو ماڵباتە خۆشەویستەکەی لەپێناوی ئەوەی لەبارێەک هەڵنەوەشێ، جێ دێڵێ. ئەو لەپێناو دڵنیایی ژیان، ژیانی خۆی بەخت دەکا. ئەو لەپێناو چاکبوونەوە، خۆی

---

[102] لە بۆنەیەکدا بەرێز بێگن بەهۆی تاریکبوونێکی خۆپارێزییەوە داوای لێبوردنی لێکردم، ئەوکات شتێکی ژابۆتنسکی بیرکەوتەوە، کە جارێک هەولیاندابوو نهێنییەکی نیرگونی پێبڵێن، ئەویش گوتبووی: "پێم مەڵێن، پێم مەڵێن. بەدڵنیاییەوە، ئەوەی نایزانم ، دەکرێ پشتی لێبکەمەوە کە تا دەمردم لەژێر ئەشکەنجەشدا بێ نایدرکێنم!"

بە میکرۆبەکان دەکوتێ. ئەو لە تاریکییدا دەژی بۆ ئەوەی ڕووناکی پەخش بێ.

ئەمەش ڕێگای جیهانە. ڕێگایەکی زۆر کوێرەوەریانە کە تیرۆرستان شێواندویانە. ئاخر دەرەتانێکی دیکە لە ئارادا نییە.

بە درەنگێکی 1946 بەڕێز کلارک بالدوین کۆنگرێسمانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە لەسەر پەسەندنامەی سەرەک ترومان ،سەردانی بەریتانیا و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی کردبوو، گەیشتە ئێرتز ئیسرائیل. لە ڕێگایدا چاوی بە ئاتیلێ و کابینەی وەزیرەکانی بەریتانی کەوتبوو. بەڕێز بالدوین هاوسۆزی دەربارەی بەرخودانەکەمان دەربڕیبوو، داوای بینینی منی کردبوو. دیسان گومانەکانی جاران و پێشنیازەکان بۆ دانیشتن لەنێو تاریکییدا یان لەپشت پەردە گەڕانەوە. لێ ئەمجارەیان من یاخیبووم، ئیدی بڕیار درا، سیاسەتوانە ئەمریکاییەکە لە بارێکی "ژێرزەمینیی کراوەدا" ببینم.

کۆبوونەوەکە لە ئەپارتمانەکەی ئالێکس سازدرا. هەڵبەتە ئەم ئەپارتمانەش کەوتبووە ژێر کنەوپشکنی بەریتانییەکان. دوای تەقینەوەکانی هوتێلی شا داود پۆلە سەربازێکی بەریتانی گەیشتنە ئەپارتمانەکەی بەڕێز شلۆمنیکی. بەڕێز شلۆمنیکیش بەخۆی بەرهەڵبێنەیەکی سپی کە کێردێکی(چەقۆیەکی گەورە)ی ناندینی بەدەستەوە بوو، لێیان هاتەدەر و قاپییەکەی بۆ کردنەوە. ئەو پیاوێکی توندوبەندی ڕێزلێگیراو بوو، لەبەر باری قەدەغەی هاتووچۆ، لە ئاشپەزخانەکەی خەریکی چێشت و شتی وا بوو. هەر بۆیەشە لێکۆڵینەوەوەیەکی کورتی لەگەڵدا کرا. ئالێکسیش بەخۆی هەر لە کورتی بڕیەوە. "بەڕێزان ، بمبوورن،" ئەو وای پێگوتن، "بەلام خەریکی پەتاتە سوورکردنەوەم، خەریکە بەتاوەکەوە دەسوتێن." ئیدی سەربازەکانیش چێشتلینەرەکەیان مەرەخەس دا تا بگەڕێتەوە سەر کاری سوورکردنەوەی پەتاتەکانی. ئاخر خۆ ئەو جێگایانە هی ئەوە نەبوون تیرۆرستانی لێ بدۆزنەوە. لە ژوورێکی نێو ئەپارتمانەکەشدا گەنجێک لەبەر ئەوەی شەو نەخەوتبوو، هەنووکە لە حەفت خەوان ڕاست ببۆوە. کوڕە گەنجەکەش گیدی بوو.

هەر لە هەمان ژوور کە بە ڕاز و نهێنی، بە ناخۆشی، بە خۆشی و شادمانی ژێرزەمینییەوە لێوڕێژ بوو، من چاوم بە کلارک بالدوین کەوت. بۆ بەدبەختیم ئەوێ دەمێ هەر لە ئێوارەکەیەوە نەساغ بووم، ئەویش دەبوایە لە ماوەی ڕۆژێک یان دووان ولاتەکە جێبێلێ، بۆیە لەسەر جێگا ئەوم بینی.
بەڕێز بالدوین زۆر دۆستانە بوو. ئەو باسی کۆبوونەوەکانی لەگەڵ دەوڵەتمەدارانی بەریتانیای بۆکردم، دوپاتیشیکردەوە بەتەواوی لە خەباتەکەمان دەگا، تەنانەت پێکێکی ئەوەشی هەڵدا کە بەو زوانە دەوڵەتی سەربەخۆی جوو دێتە کایە. ئەو لێیپرسین ئاخۆ دەکرێ ئێمە جاری ئۆپەراسیۆنەکانمان رابگرین بەڵکو حکوومەتی ئەمریکا دەروازەی کردەوەیەکی ئاسایشیانە لەسەر ئێرتز ئیسرائیلدا بکاتەوە. وەلامی ئێمەش ڕوون و ئاشکرا بوو. بەلام بەڕێز بالدوین دواتر داوانامەیەکی ئاشکرایانەی کرد بۆ ئەوەی بەدحاڵیبونێک لە ئارادا نەمێنێ، ئێمەش ناچاربووین وەلامی خۆمان بلاوبکەینەوە. ئێمە وەلامەکەمان بەمجۆرە پوختکردەوە:
"... ئێمە بەداخین چونکە ناتوانین داخوازییەکەت جێبەجێ بکەین. ئێمە ناتوانین چیدیکە پشت بە بەڵێنگەلێک ببەستین، هەرچەندە مەبەستەکانیشیان ڕاستگۆیانە بێ. ئەوەی گەلە ئەشکەنجەدراوەکەمان داخوازە، کۆمەکێکی بەرچاوڕوونی کۆنکریتیانەیە. کاتێکیش ئەوە بەدی نەیەت، ئەوا هیچ ڕێگەیەک لە بەردەم ڕۆڵەکانی نامێنێتەوە، بەدەر لەوەی خۆیان یارمەتی یەکدی بدەن و پشت بە گیانی جەنگاوەرانە و گیانی خۆبەختکەرانەی خۆیان ببەستن.
"لەو بەرخودانە ڕەوایەدا، بە دڵنیاییەوە ئێمە پشتبەستووین بە کۆمەکی پیاو ژنە ئازادیخوازەکانی ولاتە مەزنەکەی خۆتان و تەواوی جیهان."
لەگەڕانەوەیدا بۆ ولاتە یەکگرتووەکان، بەڕێز بالدوین ڕاپۆرتێکی وردی بۆ سەرەک ترومان نارد و دواتریش بلاوکرایەوە. ئێمە لەو ڕاپۆرتەوە سەبارەت بە باری ژێرزەمینییەوە زۆر شت فێربووین. بەڕێز بالدوین نووسیبووی، بۆ ئەوەی ڕووخسارەکەم بشارمەوە، ریشەکەم هەموو ڕوومەتی گرتبووەوە و لەسەر پێخەفەکەشمدا پالکەوتبووم بۆ ئەوەی بالام بشارمەوە. ئەو هزرە داهێندراوانە هەرگیز بەبیری ئێمەدا نەدەهاتن. ژێر زەمین ئاگری خەیاڵ و ئەندێشەی لە دەرەوە جۆشدا. تەنانەت نەخۆشی و لەسەر جێ کەوتنیش بە

فیـڵ و تەڵەکەبـازی دادەنـدرا. هەرچـی دەربـارەی ڕیشەکەشـەوە بـوو، سوکوئاسان دەکرا شتێکی دەستکرد بێ. من لە بەڕێز بالدوین سەبارەت بە بەدگومـانی نەخۆشـیەکەم دەبـورم، بەڵام زۆر سـەختە لە گومـانکردنی لە ڕیشەکەم ببوردرێ.
لە ژێرزەمینـدا بە دیـداری چەنـد ڕۆژنامەنووسـێک گەیشـتم. تەنهـا لە دوا قۆناخیشـدا هەنـدێ لە پەیـامنێرانم دەبینـین. ریچـارد مـۆورەر زۆر لەگەڵمـان هەڵسـوڕاو بـوو. ئەو لە تەقینەوەکەی هـوتێلی شـا داودیشـدا برینـدار ببـوو، منیش نامەیەکم لە نەخۆشخانە بۆ نارد، داخ و پەژارەیی خۆمانمـان سـەبارەت بە زامداربوونی دەربڕیبوو، بۆمان ڕوون کردبووەوە، حەزمـان لێنەبوو کە نە ئەو نە کەسـی دیـکە ئـازاری پێبگـا. وێـڕای ئەوەی بـۆ چەنـد مانگێـک لەبەر برینەکەی دەیناڵاند، لـێ هەرگیـز قینـی لێهەڵنەگـرتین، لێمـان بەداخ نەبوو. ئەو پێزانینی بۆ بەرخودانەکەمان هەبوو، نووسیبووی، ئێمە تیرۆرسـت نین بەڵکو جەنگاوەری ڕێگای ئازادین و بە چاوی کراوەوە دەجەنگین.
تـورنەریش، پەیـامنێری نیویـۆرک هیرالـد تریبیـونی لە کـاتی تەقانـدنەوەی باڵەخانەی ڕۆژنامەی فەلەستین پۆست، ئازایەتی نیشـان دا. بەچاوپۆشیکردن لە مەترسیی بەنێو چرە دووکەڵەکە و لێ بە ژوور کەوت تا ئەو کەسـانەی لە باڵەخـانەکەدا گیریـان خواردبـوو، ڕزگـار بکـا. کـاتێکیش لە دوای ڕووداوەکە یەکدیمان بینی، دیاربوو جارێ دڵنیا نەبوو کە ئەو کەسەی لە بەرامبەریەتـی ڕێـک ئەو کەسـە داخـوازەیە، کە دەیەویسـت چـاوپێکەوتنی لەگەڵـدا سـاز بـدا. بەڵام هەروەک زۆر لەوانی دیکە، وێنەیەکی زەینی لە مێشـکدا بـوو، کاتێکیش منی بینی بە دەربڕینێکی تێکەڵ لە سەرسامی و هێدمەگرتنەوە گوتی: "تۆ هەر دەبێ بێگن بی!"
منیش پرسیم: "بە ماسولکە و قۆچی گەورەوە!" هەر دووکمـان پێکەنین. ئـاخر ئەندێشە باڵی هەن. ڕاستیش بێ قۆچە.
لۆرا لیندسی نووسەر هاوسۆزییکی گەرم و دایکانەی بـۆ سـەربازانی ئیرگون دەربـڕی. ئەو خۆشـی بەهـۆی مەرگەسـاتێکەوە تووشـی هێدمەگرتن ببـوو. کیژەکەی خۆی، کە چووبووە ریزی هێزە ئازادیخوازەکانی فەڕەنسا، ڕۆژێک بەر لە کۆتاییهـاتنی جەنگی دووهەمـی جیهان کوژرابـوو. ئەو زۆر دەربـارەی

کچەکەی قسەی بۆکردم. منیش دەربارەی پیاوەکانمان و خۆشەویستیان بۆ ئازادی دوام. هەستی دوو لایەنی کۆست کەوتوەکانمان ئێمەی لەیەک نزیکتر کردەوە. ئیدی چاوپێکەوتنەکە بووە گفتوگۆیەکی دۆستانە. من بۆ دایکێک قسەم دەکرد، کە لێم تێدەگەیشت.

دووجارانیش دوای ڕووداوەکەی "ئالتالێنا"، ڕۆبەرت سەنت یۆهنی[١٠٣] نووسەرم بینی. ئەو بە درێژی دەربارەی ئالتالێنا نووسینی، سەبارەت بە کتێبەکەشی بەناوی "شالۆم واتای ئاشتی دەگەیەنێ" قسەی کرد. گفتوگۆی من دەربارەی کتێبەکەی ئەو نییە. ئەو بەندانە شوێنێکی لەبار نییە بۆ ڕەخنەی ئەدەبی. بەڵام هەر دەبێ ئەوە بڵێم: بە خوێندنەوەی وێناکردنەکەی لە واتای وروژانخوازی-هەستپەرەستی (sensationalism) گەیشتم. بۆ نموونە سەنت یۆهن نویسیبووی، لەرێگای هاتنەژوورەوە بۆ هۆدەکەم دوو پاسەوانی بینیبوو، سوکوئاسان دەکرا پیاوەکانی S.S[١٠٤]بن. منیش لەخۆم پرسی: تۆبڵێی مەبەستی لەو مەزندە سوکایەتیپێکردنە چیی بێ؟ من تەنها بە خواستی هەستەکان شتەکەم پێ ڕوون دەکرێتەوە. لەوەش زیاتر ئاخۆ بیرۆکەی پاسەوانی بەردەرگاکەم لە کوێوە هاتووە؟ هەر چۆنێک بێ سەنت یۆهن ئەوانی لەبەر دەرگادا نەبینی، ئەمەش لەبەر هۆکارێکی زۆر سادە، ئاخر پێشتر ئەوەم ڕوون کردۆتەوە، هەرگیز من هیچ پاسەوانم نەبوونە. کاتێک ئەدەبیش دەیەوێ کاریگەری خۆی بنوێنێ ئەوا لەسەر حیسابی هزری بەهادار و بەزۆریش لەسەر حیسابی ڕاستی بەمەبەستەکەی دەگا.

دوای دەستبەسەرداگرتنی یافاش، کوینتین رینۆلدسم بینی. ئەو دۆستێکی دێرینەی بەرخودانی ژێرزەمینیی بوو، یەکێک لە کاراترین هاوبەندی ئەمریکایی بۆ فەلەستینێکی سەربەست. تێبینی ئەوەم لێکرد، ئەو لەو کۆمەکەکەی لە نمایشنامەی بێن هێچ "ئالا لەدایک بوو" پەشیمان نەبوو.

رینۆلدس سەری خۆی هەژاند و لە وەڵامدا گوتی: "من شانازی پێوە دەکەم. لەسەر داخوازی خۆی، بەخۆشییەوە ئێمەش تفەنگێکی ستێن کە دەستکردنی

---

[١٠٣] سەنت یۆهن، ئەو نووسەرەیە کە پێشتر من کتێبەکەی ئەوم لە زمانی هۆڵەندییەوە بە ناوی "داود بگنوریۆن، دامەزرێنەری دەوڵەتی ئیسرائیل" وەرگێڕاو بڵاوکردۆتەوە. وەرگێڕ.

[١٠٤] پیاوانی ئێس ئێس هێزە دڵسۆزە تایبەتەکەی هیتلەر بوو، کە وێنەی کەللەسەر لەسەر شەپقەکانیان بوو، هێماکەشیان دەبل ئێس S.S. بوو. وەرگێڕ.

کارخانەی هێزی ئیرگون بوو، لەسەر قۆنداخەکەش شتێکمان هەڵکەندبوو، وەک یادگارییەک پێمان بەخشی. ئەو لە کاتی گەڕانەوەی بۆ ئەمریکا، لەو ڕێگا دوورەدرێژەیدا تفەنگەکەی هەر پێبوو.

لە ڕۆژە بەراییەکانی یاخیبوونەکە، من چاوم بەیەکێ لە ئەفسەرە گرنگەکانی هاگانا، مۆشێ دایان کەوت، کە پێشنیازی ڕامان گۆڕینەوەی بۆ کردم. بیستبووم ئەو لە کەسە هەرە کاراکانی نێو هاگانایە. ئەو باسی ڕەنج و ماندوبوونی خۆی لە سوریا بۆکردم، کە لە ڕۆژگاری حکوومەتی ڤیشیەوە دژەی کردۆتە نێو خاکی دوژمن و چالاکی تێکوپێکدانی پێگە سەربازییە گرنگەکانی سووپای بەرامبەری داوە. ئەو فشەی نەدەکرد، خۆی هەڵنەدەنا، بەڵام لەچاوی ڕاستی ئەو شتانەی وەسفی دەکردن، پێیوە دیاربوو کە پیاوێکی مەردە. ئەو لە شەڕی سووریادا چاوێکی لە دەستدا بوو. ئاشکراوڕوونە هیچ ئازایەتی لە دەست نەدابوو.

من دەربارەی خەباتەکەمان و خاڵە پێشچاوە سیاسییەکان باسم بۆ کرد. لەسەر ڕامانەکانمان کۆک بووین، هەر هیچ نەبێ لە گفتوگۆکەدا هاوڕابووین. لەوەش زیاتر ئەو چەند تێبینی بوێرانەی دان. دوای ئۆپەراسیۆنەکانیشمان، ئەو گوتی، کرێکاران دەستیان بەوە کردووە ئیرگون بە مەیل و خۆشەویستیەوە دابنێن. تێبینی کردبوو، کە ئێمە هەموو شتێک لەپێناوی خۆبەدوورگرتن لە ئازاردانی جوولەکە دەکەین، هەنووکەش بۆ ئەو و زۆرکەسی دیکەش ڕوون و ئاشکرا بوو، کە ئۆپەراسیۆن و چالاکییەکانی ئێمە تەنها دژی ڕژێمی ماندات بوون. ئەو خۆی لەقەرەی هەڵسەنگاندنی لێکەوتەی سیاسیی بەرخودانەکەمان نەدا. لەبارەی ئەوانیشەوە، گوتی هەمیشە دوو بیروڕا هەن. بەڵام ئەو کردەوکانی ئێمە بەرز دەنرخێنێ بە تایبەتیش کە دەرسەکان توندوبەندن. ئێمە بۆ هەموو لاوە جووەکانمان سەلماند، ئەگەری لەناوبردنی بەڵای دەسەڵاتی زاڵ نزیکە.

لە ماوەی بزووتنەوەی بەرگریدا، کورتە دیدارێکم لەگەڵ سەرکردەی زایۆنیستی ناوداری ئەمریکی، د. ئابا هیلال سیلڤەر ئەنجام دا.

ئێمە لە ژوورێک لەسەر کەنار، لە خانوویک کە بۆ ماوەیەکی کاتی لە لایەن ئالێکسەوە بەکرێ گیرابوو، یەکمان بینی. من لەوێ لە دوای بڵاوکردنەوەی

ڕاپۆرتەکانی گەڕەکی یۆشوا بن نون، زۆر ڕۆژم لەوێ بەسەربردن. من لەوێ کرێگرتەیەکی دەستی دووی قاچاخ بووم، بۆ خاوەن موڵکەکە قاچاخ نەبووم، بەڵکو لەبەرچاوی دەسەڵاتداران قاچاخ بووم. ئالێکس وای دەبینی کە خانمی خانەخوێی خانووەکە نامبینێ. هەموو سپێدەیەک بۆ کاروبارەکان دەبوایە لە ژوورەکە دەرچووبایەن. بەڵام خۆ ئەو دوو کرێگرتەیە ناقانونیە بە ڕۆژی ڕوناک بۆ کوێ سەری خۆیان هەڵدەگرن؟ ئێمە بە زەحمەت بەنێو ئاپۆرای سەر شەقامەکەدا دەڕۆیشتین. ئاخر هیچ دەرەتانی دیکەمان نەبوو، ئێمە دەچووینە نزیک حەشارگەکەی سەر کەنار. بەدڵنیاییشەوە ئەوێ خۆش بوو. چەند ڕۆژێک بوو خەمسین(با گراویەکەی بیابان) هەڵیکردبوو. پیاوە بە ڕیشەکە و پیاوە سەر رووتەڵەکە گەرماوێکی ژێرزەمینییان کرد. ڕیشەکەم ئاستەنگی زۆری بۆ دروستکردم. ئاخر پێشتر هەرگیز بە ڕیشەوە مەلەم نەکردووە. ئاخر نەمدەزانی چی لەو کڵاوە بکەم کە بەردەوام لەسەر سەری ئیسرائیل ساسۆڤەروە بوو. خۆ ئەگەر لای بدەم، لەوانەیە ببێتە مایەی پلارتێگرتن؛ ڕیش بەبێ کڵاو.[105] بەڵام خۆ ئەگەر کڵاوەکەم هەر لەسەر بێ، بێ سێودرو شەپۆلەکان لەگەڵ خۆی دەیبا. بە ڕاستی کڵاوەکە کێشە بوو. من ئاریشەکەم بە شێوەیەکی سادەییانە چارەسەر کرد، هەروەک چۆن خەڵکانێکی سادە لە بەردەم دووڕیانێکی کۆمەڵایەتیدا دەبن و لەسەر مێزێکی بەشکۆدا دانیشتوون و چەندان کەوچک و چەنگاڵیان لە بەردەم دایە، ناشزانن یەکەمجار دەست بۆ کامەیان بەرن. ئیدی ئەوان بە تیلەی چاو سەیری دەوروپشتیان دەکەن. کڵاوەکە لە تۆقی سەر، دەستێکیش بەکڵاوەکە تا شەپۆلەکان نەیبەن، ئیدی سەیری دەوروبەرم کرد. بۆ مایەی بەختیاریم ریشداری دیکەش لەوێ هەبوون، ئەوان نەوەک هەر چووبوونە نێو ئاوەکە بەڵکو خۆشیان لەبەر تینی ڕۆژەکە هەڵخستبوو، بێ ئەوەی کڵاوەکەشیان لەسەر بێ، مەگەر لە کاتی نانخواردندا نەبێ. منیش وەک ئەوانم کرد و هیچ سەرنجێکی تایبەتیشم لەسەر خۆم نەوروژاند. ئەوەش شتە سەرەکییەکەی

---

[105] دابونەریتی جوو وا دەخوازێ کڵاو بخرێتە سەر، ئەمەش زیاتر بۆ ڕێزگرتنە، بە تایبەتیش کاتێ نوێژدەکا یان لە کەسانێک دەفرێسمی. گردەبڕانەش جووە ئەرسەدۆکسەکان سەریان دادەپۆشن. بەڵام خۆ زۆر پلە لەنێو جووە ئەرسەدۆکسەکانێشدا هەن.

ژێرزەمینی بوو. خۆ ئەگەر لەوەدا سەرکەوتی، دەکرێ تیشکی ڕۆژ بە شکۆوە بتسوتێنێتەوە. دەکرێ دەزگای هەواڵگری بەریتانی لەژێر زەمیندا بەدواتدا بگەڕێ، لە کاتێکدا تۆ لەسەر کەنار کەیفی خۆت دەکەی!
لە ژوورەکەی ئالێکس د. سیلڤەرم بینی. ئاخاوتنەکەمان زۆر جدیی بوو. ئەو کارتێکردنەی د. سیلڤەر لەسەر منی هەبوو، بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ مایەوە. بۆ ماوەیەک بەختم هەبوو کە لە ڤلادیمیر ژابۆتنسکی مەزنەوە نزیک بووم، ئاخر من بە ئاسانی بەخەسڵەتی کەسێکەوە نانوسێم. من ناتوانم ئەوەشتان پێبڵێم-لەوانەیە کەسیش نەتوانێ شتەکە پێناسە بکا- کە "پیاوی مەزن" واتای چی دەدا. بەڵام دەزانم هەستێکی وام لە هەموو ژیانمدا هەبووە، کە ژابۆتنسکی مەزن بوو، ئەو پێشچاوی خۆی بە باشی دەبینی، ئەو تێکەڵەیەکی جوامێری گیان و ورە و لۆژیکێکی ئاسنین بوو. هەر لەو کاتەوە ئاسان نەبوو بکەومە ژێر باندۆری ئەو کەسانەی لەنێو خەڵکدا بە "مەزن" دەزاندران، بە تایبەتیش بەو کەسایەتیانەی کە پلەوپایەی گرنگیان هەبوو. بەڵام دەبێ پێ لەوەبنێم، لەگەڵ یەکەمین دیتنی سیلڤەر، بە شێوەیەکی بەرچاو کاری، لێکردم. "ئەو کەسایەتییێکە،" ئاوام بە هاوکارەکانم گوت.
د. سیلڤەر یەکەمین سەرکردەی زایۆنیستی بوو، کە گوێم لێ بوو بە وشەکانی لەجیاتی ئەوەی سەرکۆنەی جیابووەکەکان(لادەرەکان) بکا، هانی بەرخودانەکەمانی دا. ئەو هیوایەی دەربڕی کە یەکێتی جەنگان لە بزووتنەوەی بەرگریدا پێیگەیشتبوو، دەشکرێ بەردەوام بێ. هەستی وابوو دەبێ شتەکە بەردەوام بێ. بیروڕای جەماوەری ئەمریکی لەگەڵ جەنگاوەراندا هاوسۆز بوو، ئەو گوتی، "ئەوانیش دەبوایە بە ئامانجی هەرە رەوا دژی بەریتانیەکان بوەستنەوە."
دەگوترا د. سیلڤەر بەردەوام لەسەر شتێک نەدەمایەوە. نازانم ئاخۆ ئەمە تا چەندی ڕاستە. ئەوەندە دەزانم لە خەملاندنی بۆ یاخیبوون وەک هۆکارێکی ڕزگاری لەسەر ڕای خۆی بەردەوام بوو، هەرچەندە لە هەموو لایەکیشەوە فشاری لەسەر بوو. کاتێکیش سەردانی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکام کرد، لە زۆر گۆشەو کەنارەوە داوای لێکرا بەناوی ئەنجوومەنی فریادڕەسی زایۆنستیدا بچێتە پاڵ جاڕنامەی سەرزەنشتکردنی "لادەرەکان". هەمان

لایەنەکان پاڵەپەستۆیان خستە سەر شاعیری مەزن، زێلمان سخنێور بۆ ئەوەی لە کۆمیتەی پێشوازییەکە بکشێتەوە. (سخنیور رەتنامەیەکی وروژێنەری بڵاوکردەوە). سیلڤەریش بە سووربوونەوە هەموو پێشنیاز و پرۆژەیەکی سەرزەنشتکردنانەی رەتکردەوە، رێگریش بوو رێکخراوە زایۆنستەکەی سەرزەنشتنامەکە بپەژرێنێ. لە ماوەی دەمەتەقێکانیشدا بە سەرزەنشتکارانی ئێمەی گوتبوو:

"ئیرگون وەک هۆکارێک دەچێتە مێژووەوە، بەبێ بوونی ئەو دەوڵەتی ئیسرائیل سەر هەڵنادا."

## بەندی 24
## ڕێگای سەرکەوتن

٤٧٣- ٤٨٢

لە ماوەیەکی وادا تەنانەت بەگوێرەی هەواداره پڕجۆشەکانیشمان کورتر بوو لەوەی چاوەڕوانیان دەکرد، توانیمان ببینە مایەی سەروبەندی ڕووخانی ڕژێمی داگیرکەر و ئەوەی دەقاودەق و زانستیانە لە بەرامبەر دیاردەی ڕووخانەکەدا بە "نابووتبوونی دەسەڵاتی بەریتانی لە فەلەستین" وێنا دەکرا. وەرچەرخانی ڕووداوە دیرۆکییەکان وەنەبێ تەنها بەرەنجامی یەک ئۆپەراسیۆن بووبێ بەڵکو کۆی کاریگەری کەڵەکەبووی هەموو ئەو زنجیرە ئۆپەراسیۆنانەی ژێرزەمینی بوون کە ڕۆژی ئازادی هێنایە دی.

لەو پوختە کردنەوەیەمدا، هەوڵ نادەم خۆم بە لێکدانەوەکان خەریک بکەم، بەڵکو باسەکە بۆ بەڵگەنامەکان لێدەگەڕێین، نەخاسمە بەڵگەنامە بەریتانییەکان کە خۆیان بێنە گۆ. ئەوان ڕەوانبێژیانە پەردە لەسەر ئەوە هەڵدەدەنەوە، کە چۆن حکوومەتی بەریتانی لەدوا قۆناخی یاخیبوونەکەدا، هەوڵیداوە دەست بە وڵاتەکەمانەوە بگرێ، چۆنیش یاخیبووە عیبرییەکان هەنگاو بە هەنگاو سەرکەوتوانە توانیویانە شکست بە دوژمن بێنن؛ چۆن ئێمە ئەوانمان ناچارکرد پەنا بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان ببەن و لە کۆتایشدا هەر بڕۆن و دەفن بن.

دوای ئەوەی پێشنیازی "فیدراسیۆنێکی ئۆتۆنۆمیدار"(نەخشەکەی مۆریسۆن) لە لایەن هەر دوو لایەنی عەرەب و جوو ڕەتکرایەوە، بیڤن "نەخشەیەکی نوێی" بۆ چارەسەرکردنی کێشەی فەلەستین خستەڕوو. ئەوەش لە 10ی یانیوەری 1947دا لە کۆنفرانسی سێ قۆڵی فەلەستین لە لەندەن پێشکەش کرا. بەریتانییەکان بە نەخشەکەیان دەگوت "بە کانتۆنکردن". بیڤن پێشنیازی کردبوو وڵاتەکە دەبێ دابەش ببێتە سەر ژمارەیەک دەڤەر(زۆن) و دەکرێ پلەیەکی دیاری ئۆتۆنۆمییان لە ڕاپەڕاندنی کاروباری ناوخۆ لەژێر سەرپەرشتی حکوومەتی ناوەندا پێبدرێ. قۆناخی گواستنەوەکەش پێنج ساڵ بخایەنێ. لە ماوەی دوو ساڵدا ڕێگە بە سەد هەزار کۆچبەر بدرێ بێنە

دەڤەری جووەکان. مانگانە 4000مۆڵەتنامەی ڕێپێدانی کۆچبەرە جووەکان بدرێ. هەر بۆیەشە دەبێ کۆمسیاری باڵای بەریتانیی بڕیاردەری بابەتی کۆچبەرە جووەکان بێ.
عەرەبەکان هەروەک چۆن بێ دوودڵی پلانە بنەڕەتیەکەی مۆریسۆنیان ڕەتکردەوە، ئاواش نەخشە نوێکەی بێڤنیشیان تورفڕێدا. ئاخر ئەوان بە هیچ کۆچبەرێکی دیکەی جوو قایل نەبوون، چجای دابەشکردنی فەلەستین. ئەوان بەیەکجار داوای فەلەستینێکی سەربەخۆیان دەکرد. ئاژانسی جووەکانیش نەخشەکەی ڕەتکردەوە. ئیدی بەریتانییەکان لە قایلکردنی هەر دوولای کێشەکە بۆ نەخشەی لایەنی سێهەم شکستیان هێنا، بۆیە کۆنفرانسەکەش سەری نەگرت.
بە ئیمە گوترا، ئاژانسی جووەکان نەخشەکەیان لەبەر هۆکاری بنەمایی ڕەتنەکردبووەوە. ئەوان نەیاندەتوانی بەو ڕووبەرەی بۆ جووەکان تەرخانکرابوو لەگەڵ ئەو ژمارە ڕێپێدراوەی کۆچبەرانیش قایلبن. ئاژانسەکە لەسەر ئەوە سووربوو جڵەوی ڕێپێدانی کۆچبەرانیان بدرێتە دەست. بەو جۆرە هەمووارکردنە دەکرا ئاژانسی جووەکان ئامادەی پەژراندنی "دابەشکردنەکە" لە ژێر سەرپەرشتی بەریتانیادا بووبایە. بەڕێز شێرتۆک لە 11ی فێبرایەری 1947دا بۆ کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانی ڕوونی کردەوە، ئاژانسی جووەکان داوا دەکا: یەکەم، ڕووبەرێکی شایستە بۆ جووەکان لەگەڵ دەسەڵاتی تەواو؛ دووەم، کۆچکردن بۆ ناوچەکە؛ سێهەم، دانپێدانانێکی کۆتایی بە سەربەخۆیی جووەکان هەر هیچ نەبێ لە بەشێک لە خاکی ئێرتز ئیسرائیلدا. شێرتۆک ئەوەی ڕوون نەکردەوە ئاخۆ مەبەستیان لە "ڕووبەرێکی شایستە" چییە. لە سەرێکی دیکەشەوە ئەو سەبارەت بە واتای "دەسەڵاتی تەواوی جوولەکە" زۆر ئاشکراوڕوون بوو. دووهەمین مەرجیشی ئەوە بوو دەبێ "ڕێکەوتنێک" لەسەر کۆچبەران بۆ ناوچەکە بکرێ. بەڵام کاتێک دەسەڵاتی جووەکان "تەواوعەیار" بێ، باشە پێویستی ڕێکەوتنی بەریتانیەکان بۆ کۆچبەران لەپای چی؟
مۆریسۆن گوتبووی، پێشنیازی فیدراسیۆنەکەی لە دواجاردا دابەشکردنی نێوان "دەوڵەتی عەرەب" و "دەوڵەتی جوو"ی لێدەکەوتەوە.

گەلـو، سـەرڕەقی دوژمنەکەمـان ئـێمەی ڕزگـار کـرد. بێڤـین دەسـتی لە مۆڵەتنامەی ڕێپێدانی چوار هەزار کۆچبەر مانگانە زیاتر بەرنەبوو. هەرچی سـەبارەت بە عەرەبەکانیشـە، سووکوئاسـان دەیـانگوت: "هەمـوو خـاکەکە هـی ئێمەیە؛ تەنانەت تەلئەبیبیش...."

بەڵام بە کەللەڕەقـی عەرەب و بەریتانییەکـان -یـان ئەنگلـۆ-عەرەب- ئـێمەی جووەکانی فەلەستین دەبوایە ئەمڕۆ لە "گیتۆی مۆریسـۆن"دا بژیابـاین، مەگەر ئێمە، یاخیبووەکان بمانتوانیبا تەنانەت نەخشەکە شکست پێبێنین.

لە 14ی فێبرایـــری 1947د، کۆنفرانســـی لەنـــدەن کۆتاییهـــات. بـــێڤن بە عەرەبەکـانی ڕاگەیانـدبوو، لەو کـاتەی هەر دوولایـان مەیلـی سازشـیان بـۆ یەکدی نەبووە، ئەوا کێشـەی فەلەستین دەدرێتە دەستی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان.

بێڤن لێـدوانێکی دوورودرێـژی سـەبارەت بە ڕەتکـردنەوەی پڕۆژەپێشـنیاری بەریتانیەکـان لە لایەن عەرەب و جووەکـان و بڕیـاری ئەوەی کێشـەی فەلەسـتین لە مـانگی سـێپتێمبەردا بـداتە دەسـتی نەتەوە یەکگرتووەکـان، لە پەرلەمـان دا. ئەو ڕایگەیانـد کـۆچبەرانی جـوو بە ڕێژەی 1.500 مۆڵەتنـامەی مانگانە بەردەوام دەبێ.

وینستن .چەرچڵ سـکاڵای دژ بە "وەخـرانە درێژخـایەنەکە" هەبـوو. پرسـیاری ئەوەی کـرد ئـاخۆ واتـای چییە، بەریتانیا سـاڵێکی دیکە بەرگەی ڕاگرتنـی 100000 سووپا لە فەلەستیندا بگرێ، کە تێچوونەکەی 30-40 ملیۆن پاوەن دەبێ. ریچارد کرۆسمانیش گوتی: دەکرێ وا دابنرێ لە ماوەی کەمتر لە دوو ساڵدا نەگەنە هیچ بڕیارێک.

هەمـوو کەس تێگەیشـت، کە بێڤـین دەیەوێ کـات بەدەسـت بێنـێ. لە 25ی فیبـرایەردا، سـکرتاریەتی کۆلۆنییەکـان ڕوونـی کـردەوە کە ڕۆچـوون بەرەو نەتەوە یەکگرتووەکـان واتـای ئەوە ناگەیەنێـت، بەریتانیـا دەسـتبەرداری مانـداتەکە بـووبێ: بەڵکـو بەریتانیـا تەنهـا داوای ڕاوتەگبیـر لە (ر.ن.ی) دەکـا بەوەی ئاخۆ مانداتەکە چۆن بەڕێوە ببردرێ.

بەڵام لە ڕۆژی شـەممە، ڕێکەوتـی 1ی مارتـدا، ئیرگـون زڤـای لیـومی هەمـوو حیساباتەکانی .بێڤنی هەڵوەشاندەوە. شـەپۆلە پەلامـارێکی نوێ، زەبری زۆر و بەهێز، قووڵ بۆ دزەکردنە نێو دوژمـن جارڕدرا. لە ئۆرشـەلیمدا نـاوچە(زۆنی)

ئاسایشیانەی بەریتانیامان بڕی. یانەی ئەفسەران کە بە پەرژینی تێلدڕ و ڕەشاش دەورە درابوو تەقێندرایەوە. یەکەی دزەکردنەکە بە بێ ئاستەنگی ڕێپێگرتن ناوجەرگی دوژمنی دڕی. یەکەی پاڵپشتیش بە فەرماندەیی ئاقشالۆم هاڤیف ئازایەتییەکی کارامەی نواند، کاریگەریانە توانی بەرگری دوژمن تێکوپێک بشکێنێ بەر لەوەی هەڵمەتە سەرەکیەکەش بەڕێوە بچێ. دەورییەکی پۆلیسی بەریتانی بە خۆیان و زرێپۆشەکانەوە گەیشتنە شوێنەکە و لەگەڵ پیاوەکانمان کەوتنە شەڕ، بەڵام هێزی هەڵمەتبەرمان لە دەستکردنەوەکە سەرکەوتوانە دەرچوو، تەنها چەند زیانێکی کەمی لێکەوت. زیانەکانی بەریتانییەکانیش بە ڕەفتاری دێوانەییانەوە دیاربوو.

چەند سەعاتێک دواتر، لە ئێوارەی شەممەدا، یەکەکانی سەر بەهێزی هەڵمەتبەر دە پەلاماریان لە سەرتاپای وڵات ئەنجام دا، بە چالاکییەکانی مۆڵگەی دەریایی لە حەیفاوە، سەربازگەکەی بەیت لید، مۆڵگەکانی پاردس هاننا و ڕێهۆڤت، کاروانی گواستنەوەی سەربازی لە ناوچەی تولکەرەم، پیتا تێکفا، کفر شکرین و کریات حایم. لە بەرەبەیانی یەکشەممەشدا لەسەر ئۆپەراسیۆنەکانمان بەردەوام بووین. هەمووشیان سەرکەوتوانا بوون. دوژمنیش بەو زەبرانە حەپەسا.

هەواڵنێری هائارێتز لە لەندەنەوە ڕاپۆرتی دا: "هێرشەکەی ئورشەلیم لە پشووی کۆتایی هەفتەدا وەک هێدمەیەک بوو بۆ لەندەن. ڕۆژنامەکانی ئێوارە بە سەرهێڵی تۆخ و قەبە هەموو هەواڵێکی نوێی پێگەیشتوییان بڵاوکردەوە. ڕۆژنامەکان جەختیان کردەوە، ئەمە یەکەمین جارە تیرۆرستەکان بە ڕۆژی شەممە پەلامار بدەن، هەروەها هێڵیان بەژێر ئەودا هێنابوو، کە هێرشەکان لەنێو ناوچەی ئاسایشدا کراون. سەندەی ئێکسپریشیش سەروتارەکەی بۆ دوا کردەوەی تیرۆرزمی لە فەلەستین تەرخان کردبوو، ڕاشکاوانەش نوسیوبووی، پێویستە بەریتانییەکان لە فەلەستین دەربچن. "بەریتانیا وەکی ئاڵمانی نازی نییە" ڕۆژنامەکە وای لەسەر ڕۆیشتبوو، "ناکرێ وەڵامی تیرۆر بە دژەتیرۆر بدرێتەوە، بەڵکو دەکرێ داوای سەلماندنی دادپەروەری و چارەسەرییەکی بێ وەخران بۆ کێشەکە بکەین. ئێمە دەبێ دەمودەست بە جیهان بڵێین، ئێمە بەنیازین بە زوترین کات لە وڵات دەردەچین و دەست لە بەرپرسیاریتی هەڵدەگرین، ئێمە دەبێ لەوێ بڕۆین."

وێڕای داخوازی سەندەی ئێکسپرێس، دەسەلاتدارانی بەریتانی وەلامی "تیرۆریان بە دژە تیرۆر" دایەوە. لە ماوەی بیست و چوار سەعاتی هێرشەکانمان، ئەوان قانونی باری ناکاو، کە بۆ ماوەی مانگەلێکی دوورودرێژ بوو گەفیان لێدەکردین، سەپاند. نەخشەکە، بەگوێرەی ئەو لێدوانەی لەندەن، لە لایەن فیلد مارشال مۆنتگۆمری ئامادەکراوە، کەلە 2ی مارسدا دەچێتە بواری جێبەجێکردنەوە. ئەری چەند کەس دەزانێ واتای قانونی ڕەوشی ئاوارتە چییە؟ مەزندەی بەندەکانی نەخشەکە ئەمانە بوون:

1- هەر ناوچەیەک قانونەکە بیگرێتەوە دەکەوێتە بەردەستی سووپا، ئەفسەری فەرماندەی هەر هەرێمێک لە لایەن کۆمسیاری بالاوە وەک حوکمڕانی سەربازی دیاریکراوە.

2- هەموو نووسینگە حکومییەکان دادەخرێن و خزمەتگوزاریان بۆ جەماوەر هەلدەسپێردرێت.

3- داداگا مەدەنییەکان هەلدەپەسێردرێن.

4- دەمودەست لە لایەن حاکمی سەربازییەوە دادگای سەربازی دادەمەزرێ.

5- حاکمی سەربازی دەسەلاتی داخستنی بانکەکانی هەیە.

6- خزمەتگوزاری پۆستە و گەیاندن دەستبەجێ هەلدەسەپێردرێ.

7- خزمەتگوزاری تەلەفۆنی بە گوێرەی ئەو لیستەی لە لایەن حاکمی سەربازییەوە دەردەکرێ، سنووردار دەکرێ.

8- هاتووچۆ لە ناوچە دیاریکراوەکان بەدەر لە گواستنەوەی کەلوپەلی پێویست ئەویش بە مۆلەتنامەیەکی تایبەت کە لە حاکمی سەربازییەوە دەرچووبێ، قەدەغە دەکرا.

9- حاکمی سەربازی دەسەلاتی هەیە دەست بەسەر زەوی و خانوودا بگرێ و فەرمانی گواستنەوی شتەکان بدا.

10- پۆلیس دەخرێتە ژێر فەرماندەیی حاکمی سەربازییەوە.

11- هەموو سەربازێک بە چەشنی پۆلیس دەسەلاتپێدراوە خەلک بگرێ و دەستبەسەریان بکا. 12- فەماندەی سەربازیی دەسەلاتدارە بەپەلە دادگا دابمەزرێنێ.

13- جوولەی پاسەکان و هەموو ترومبێلە باربەرێکی دیکە لەنێو ناوچەکەدا قەدەغەیە مەگەر مۆلەتی تایبەتی پێدرابێ.

له 3ی مارســدا، ســکرتاریەتی کۆلۆنیــالی له بەردەم پەرلەمانــدا لێــدوانێکی نوێیان سەبارەت بە "ئاستەنگەکان"له فەلەستین دا. بەڕێز کریچ جۆنز ئەوەی ڕوونکردەوە، کە حکوومەتی بەریتانی لەچەند ناوچەیەکی دیاراکراوەوە بـاری قــانونی ناکــاوی ڕاگەیانــدووە. ئەوەشــی خستەســەر، "کە دەســەلاتدارانی فەلەستین هەمـوو پشتیوانییەکی حکوومەتیـان بـۆ هەر کردەوەیەکـی پێویست پێدەگا."

مستەر چەرچیلیش هەلسا و پرسـی: "ئەرێ بۆچی ئەو ڕێکارانەی هەنووکە گیراونەتەبەر، کاراترن لەوانەی ماوەی دوانزدە مانگی ڕابردوو دوای هەمان بارودۆخ تەقینەوەکە گیرابوونە بەر؟"

سکرتێری کۆلۆنیالیش وەلامیدایەوە ئەوەی ئێستا ڕویداوە جاڕدانی ستاتوتی قانونی باری ناکاوە. ئەوەش وەنەبێ هەموو کونوکەلەبەری ولاتـی گرتبێتەوە، تەنهــا ئەو ناوچــانەی بەچــڕی گرتــۆتەوە کە مــایەی سەرئێشــەن. قــانونی مەدەنیش لەو ماوەیەدا هەلپەسێردرا.

مستەر سیمۆر کۆکس له وەزیرەکەی پرسی ئەو هێلە تەریبە مێژووییانەی بــارودۆخی ئێرلەنــدای 27ســال لەمەوبەر بەهەنــد هەلبگــرێ. وەزیــریش له وەلامدا گوتی ئەمە بۆ لێکدانەوەی حکوومەت زۆرە.

پرســیا و وەلامەکـانی وەک مشـتومڕ و دەمەتەقێیکـانی نێـو پەرلەمــان گرنـگ نەبوون، کە ئەمەش له دەرهاوێشتەی زەبرەکانی 1ی مارتمان بـوو. وینسـتۆن چەرچل له وێستمینستەر و لێیک سوکسێس[١٠٦] له نەتەوە یەکگرتووەکاندا له بنـی هەمبــانەی دا. بە گـوێرەی ئاژانســی ڕۆیــتەر دەمەتەقــێ دیـرۆکییەکە له پەرمان بەمجۆرە بوو:

"بە توڕەیی هاوارکردن و بەتوندی وەلانانی فـایلی بەردەمـی، مسـتەر چەرچل هەر ئەمرۆ داوای له پەرلەمــان کـرد پێویسـتە بزانـێ ئــاخۆ چەنـدی دیکە ئەو دەولەتە "شەڕانگێزە قێزەونە" له فەلەستین، لەنێو ئەو خوێنڕشـتنەدا دەردەچـێ بەر لەودی بگاتە بڕیارێکی بەجێ. ئەو گوتی ڕەوشـەکە سـالانە سـی تـا چـل ملیـۆن پـاوەنی ئەسـتەرلینی لەســەر دەولەت دەکەوێ بەوەی ئەو 100.000 هێزی سەربازیەی له سەربازگەکانی دوورخستونەتەوە.

[١٠٦] شوێنەکە لە نیویۆرک و لە سالەکانی (145-1951) بارەگای کاتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان بووە. وەرگێر.

مستەر کریچ جۆنیش، تازە ڕاپۆرتی لەسەر ئەو هەرایەی شەممە دابوو کە 18 کەس کوژرابوون و 26کەسی دیکەش زامدار ببوون، دووبارەی کردبووە کە حکوومەت لە بەردەم بارودۆخێکی دژوار دایە لە فەلستین و دەبێ بە زوترین کات کۆتایی بەم دۆخە بهێنێ. کردەوەی دەمودەستیش وەک مستەر کریچ جۆنز داوای کردبوو لە دەستی فەرماندەی سەربازی و بەهاوکاری کۆمسیاری بالا دایە. حکوومەتیش گیرخواردوو نییە لەوەی دەرچەڕێگایەک بۆ ئەو کێشەیە بدۆزێتەوە.
مستەر چەرچڵ خۆشحاڵ نەبوو. "ئەرێ ئەوە چەند دەخایەنێ؟"ئەو بەدەنگێکی بەرزەوە ئەو داوایەی خۆی دووپاتکردەوە. "ئەرێ هیچ دەرەتانێک نییە بۆ پەلەکردن لە هانابردن بۆ ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، یان هەر دەبێ مانگ لە دوای مانگ لەو دۆخەدا بچەقین و ڕووبەڕووی ئەو هەموو تووڕەیی و تەقینەوە و دژە کردەوانە ببینەوە، کە پێویستن بەڵام ناپەسەندن، پێویستن بەڵام بەئازارن؟ ئەرێ چەندی دیکە بەردەوام دەبێ؟ ئەرێ شتێک ناکرێ بۆ ئەوەی ڕوو لە (ر.ن.ی) خێراتر بکرێ؟"
مستەر کریچ جۆنزیش وەڵامیدایەوە کە ئەمە پرسێکی جیاوازە. حکوومەت لە پەلەیی و پێویستییتی بابەتەکەدا زۆر وریا و زرنگە. هەنگاوی گونجاو شایستە بە ئاقاری ئەگەری خێراترکردنی پێواژۆی ڕووکردنە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان هەڵهێندراوە.
بەڵام هێشتاش مستەر چەرچڵ خۆشحاڵ نەبوو. "ئەرێ کەی ئەو چاوەڕێی ئەوە دەکا، کە حکوومەتەکەی ڕابگەیەنێ دەبێ دۆزەکە بە شێوەیەکی لەبار بخاتە بەردەم نەتەوە یەکگرتووەکان؟"
مستەر کریچ لە وەڵامدا: "لەوساتە وەختەدا ناتوانم بەرسڤی پرسەکەت بدەمەوە، بەڵام دڵنیات دەکەمەوە بەو پەڕی خێراییەکەوە ڕێکاری داخوازیەکانمان بۆ نیویۆرک (بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان) گرتۆتەبەر. هیوادارم لە میانەی هەفتەیەکدا هەندێ ڕێکار بۆ پەلەکردن لەو بابەتەدا بێنەگۆڕێ."
مستەر چەرچڵ: "ئەگەر بکرێ بپرسم، لە ماوەیەی هەفتەیەکدا..."
کریچ جۆنز: "هەموو هەوڵێک دەدەم وەڵام بدەمەوە."

ئیدی روون و ئاشکرا بوو زەبرەکانی رۆژی یەکی مارتی 1947، سەربازەکانی هێزی هەڵمەتبەری ئیرگون، توانیان رەورەوە لەسەرخۆ و ئازاربەخشەکەی بەریتانی و نێونەتەوەی بخولێننەوە و جوڵەکەی خێراتر بکەن. سەرجەم رۆژنامە بەریتانییەکان هەنووکە خواخوای ئەوەیان بوو حکوومەتەکەیان پەلە بکا لە پەنابردن بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان. 4 لەی مارتیشدا لە لەندەنەوە راگەیەندرا، حکوومەتی بەریتانی تێبینینامەیەکی پێویست و بەپەلەی بۆ مستەر تریگڤ لی[107] ناردووە، داوایکردوە نەتەوە یەکگرتووکان کۆمیتەیەکی لێکۆڵینەوەی تایبەت تا بەر لە خولی دانیشتنی پایزەی کۆمەڵەی گشتیدا بنێرێتە فەلەستین.

مستەر چەرچلیش هەدادانی لە حکوومەت نەهێشت. تەنانەت لە دەمەتەقێ دەربارەی کاروباری هیندستانیشدا ئاماژەی بە پرسی فەلەستین دەکرد، ئەوسا بەو خەسڵەتە رەخناوییە سەررەقانەی، کە پێشتر لە زۆر بۆنەنامەدا دەربیبڕیون.

لە 6ی مارتدا گوتی: "لەو فەلەستینە بچووکەدا... ئێمە دەبێ هەموو خەزێنەمان هەڵبگوشێن و ئەو 100.000 سەربازەمان لەوێ بەهەراسانی و ئازارەوە لە هەلومەرجەیکدا بسوڕێنەوە کە لە راستیدا هیچ دۆزێکی بەرژەوەندخوازانەی لێ نییە." ئەوەشی لێزیاد کرد کە لە رابردوودا فشاری لەسەر حکوومەت نواندووە بەڵکو مانداتەکەی فەلەستین رادەستی نەتەوە یەکگرتووەکان بکا، ئیدی هەوڵی یارمەتیانەی خۆی بۆ پاراستنی ئارامی لەوێدا بەکاربێنێ.

لەو نێوەدا هەرچەندە دەسەڵاتدارە بەریتانییەکان هەوڵیان داوە ئابڕویان بپارێزن. لێ قانونی رەوشی ئاوارتەیان لە ئۆرشەلیم، تەلئەبیب و ناوچەی پیتا تیکڤا بۆ پازدە رۆژ درێژە پێدا.

پێویستە ئاماژە بەوە بدرێ، لەو رۆژە تەنگانەدا کۆمەڵانی خەڵک ئازایەتیکی مەدەنییانەی نایابانەیان نواند. دیاربوو سەرکردە فەرمیەکان حەپەسابوون؛

---

[107] **تریگڤ لی** Trygve Lie (١٨٩٦-١٩٦٨) سیاسەتوانێکی بەلژیکی و وەزیری دەرەوەیان بووە. لە ماوەی ساڵەکانی (١٩٤٦-١٩٥٢)یەکەمین سکرتێری گشتی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بووە. وەرگێر.

بەلام گیان و ورەی خەڵک زۆر باش بوو. دەسەلاتدارە بەریتانییەکان هاتووچۆکردنیان بە پاس لێ قەدەغە کردبوون؛ بۆیە گالیسکە و پایسکلیان بەکاردەهێنا یان بەپێ دەڕۆیشتن و هایهویان لە حکوومەت دەکێشا. ئیدی ترسێکی گشتی لەگۆڕێدا نەمابوو. تۆ دەتتوانی پیاو ژنان ببینی، لەودیو پەرژینە تەلبەندەکانەوە پێدەکەنین. منداڵەکانیش بەدەنگەوە گۆرانییان دەگوتن، "گولالە سوورەکان، گولاڵەسوورە،" ئەو گۆرانییە جەماورەیە تەوساویە دەربارەی لقی هەفتەمی هێزی ئاسمانی بەسەر هەموو زمانانەوە بوو.

هەرچی دەربارەی ژێرزەمینییشەوەیە، وەک باسم کردووە، بە جیا کاری خۆیان کرد. لە سەپاندنی باری ناکاو دا، حکوومەت دوو ئامانجی جێگرەوانەی هەبوو: "هەرە زۆر" و "هەرەکەم".

یەکەمیان ئەوە بوو ببینن ژێرزەمین بتەپێ و هەرەسبێنێ و هەڵبوەشێتەوە، فەرماندەکانی بگەنە سەر پەتی سێدارە و سەربازەکانیشیان بترنجێنە ئۆردوگا زیندانییەکەی لاترون. ئەم خەونەشیان خێرا ڕەوایەوە. ئەوسا هیوایان وا بوو "ڕێکاری نوێ" بسەلمێنن، بەشێوەیەک ژێرزەمینیی پەکبخا. ئەوەش دەکرا بە مەرامی خۆی بگا، گەر هاتباو جاڕدانی قانونی ناکاو بیتوانیبا ڕێی لە "تیرۆرستان" بگرتبایە چی دیکە پەلامار نەدەن و دەستیان نەکەنەوە. ئێمەش سووربوین لەسەر ئەوەی هەرچییەک لە دەستمان بێ بیکەین بۆ ئەوەی نەخشەی مۆنتگۆمری "هەرەکەمەکە" بە مەرەدی "هەرە زۆرەکە" ببەین و پوچەڵی بکەینەوە. لە میانەی ئەو دوو هەفتەیە دژوارەدا هێزی هەڵمەتبەری ئیرگون و F.F.I بەخەستی زەبرمان سرەواندە دوژمن. وەنەبێ هەر بریگادێر داڤیس باسی لە "زەبری کۆماندۆیانە"ی ئۆردوگای سخنیللەری سەربازی کردبێ، بەڵکو ڕۆژنامەی بەریتانی و ئەمریکایش بە شێوەیەکی بەرچاو وێنای هێرشەکانی "کۆماندوە جووەکانی لە ئۆرشەلیم" کرد.

لە ڕاستیشدا هێزی هەڵمەتبەری ئیرگون کۆماندۆی پلە یەک بوون. زۆر کەم هاوشیانیان هەبوون. لەو ماوەی هەرایەکەدا ئێمە شێوە ژیانی ئەوانمان گۆڕی. دوای هەڵمەتەکانیان ئەوان نەدەگەڕانەوە سەر ماڵ و کاری خۆیان. ئەوان بە دەستەی بچووک و لەیەک جیا لە نێو کێڵگەکان، ڕەزوباخی

پرتەقال و نێودارەکاندا دەمانەوە، لە شوێنی درکپێنەکراودا بە پەلامارەکانیان سەریان لە دوژمن شێواند.
لەگەڵ هەڵگرتنی باری ناکاویشدا، کە بەدەر لە بێزیزی بە هیچ ئەنجامێکی دیکە نەگەیشت، ئێمە هەستمان بە سەرکەوتنێکی ڕاستەقینە کرد. کاتێکیش گیدی شەو لە دوای شەو دوای هەڵمەتە نەپساوەکانی بە ماندووی بەلام بەکەیفخۆشی هات بمبینێ، بۆ یەکەم جار هەستەکانم بۆی هەڵڕشتن. گیدی بەگوێرەی دابی ژێرزەمینیانەمان، وەستاو سەرنجی لێدام تا دەرگای گفتوگۆ بکەمەوە. بەلام بۆ چەند خولەکێکی کەم، من عەبا قورسەکەی "فەرماندەکەم" لەشان کرد و بەسەر شانی ئەوم دادا و بردەبردێکیشم لێوە هات: ***"تۆ بردتەوە، گیدی تۆ بردتەوە. کوڕەکانمان بردیانەوە."***
بەگوێرەی داوانامەی بەریتانییەکان بۆ مستەر تریگف لی، بۆ ئەوەی کۆمەڵەی گشتی (ن.ی) پەلە گفتوگۆکاندا بکا، ئاڵوگۆڕێکی دیپلۆماتیانەی دوورودرێژ لەنێوان لەندەن و واشنتن، لێیک سوکسێس، مۆسکۆ، پاریس و چونگکینگ پەیدا بوو. ڕووسیای سۆڤییتی و دیارە هەندێ دەوڵەتی دیکەش دژی وادە دانەوەی کۆمیتەی بەدواداچوون بوون. ئەوان خوازیاربوون دانیشتنێکی تایبەتی کۆمەڵەی گشتی (ن.ی) بۆ ئەو "پرسە زۆر بەپەلە و پێویستە" ساز بدرێ. لە بەرایی ئەپریلەوە مستەر تریگف لی تێبینینامەی بەپەلەی بەریتانییەکانی بۆ هەموو ئەندامانی (ر.ن.ی) نارد. وەلامەکانیش دەستبەجێ هاتنەوە، ئیدی ڕاگەیەندرا نەتەوە یەکگرتووکان پرسی ئێرتز ئیسرائیل لە خولە دانیشتنی ئاسایی سێپتێمبەر تاوتوێ ناکا، بەڵکو دانیشتنێکی تایبەتی لە 28ی ئەپریلی 1947 بۆ ساز دەدا.

## بەندی 25
## دووڕیانەکانی مێژوو
## ٤٨٣ - ٤٩٢

ئێمە دەبێ لێرە وچانێک بدەین. ئاخر, لەسەر دەروازەی خاڵە وەرچەرخانێکی پڕ بڕوای مێژووی ئێرتز ئیسرائیل وەستاوین. مکوڕبوونە کەللەڕەقیەکەی بیڤن بەوەی نەیدەبینی چۆن نەتەوە یەکگرتووەکان پێش سێپتێمبەر کێشەی فەلەستین تاوتوێ دەکا، تێبینی بێمەبەست نەبوون. ئەو خەریکی مانۆڕ بوو. خوازیار بوو کات بەدەست بێنێ، گەر کرابا ساڵێک، تا لەو ماوەیەدا بیتوانیبا پەیوەندی لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و حکوومەتەکانی دیکەدا پەیدا بکا. گەر کاتی زیاتری بە دەستەوە ببوایە، بەڵکو لەسەر ئێرتز ئیسرائیل بیتوانیبا لەگەڵ نەتەوە یەکگرتوەکاندا بگاتە ڕێککەوتنێک. ئەوەش خاترجەم بوو، بە پەیداکردنی کات، عەرەبەکان چ لە ڕووی پێکهاتە و چ چەکەوە باسکیان بەهێز دەبوو. ئایا ئەو کات لەو جۆرە پەلاماردانەدا ڕەوشەکەمان بەچی دەگەیشت؟

لەوانەیە ئەوەش گوترابێ، کە جووەکانیش ماوە درێژکردنەوەکە بۆ خۆئامادەکردن بۆ ئۆپەراسیۆنی چڕوپڕتر، بقۆزنەوە. من بەداخم بڵێم، مەودایەکی کەم بۆ ئەو گریمانەیە لە ئارادا بوو. کەتنە چارەنووسازیەکەی سەرانی زایۆنیستی لە بەد نیازییەوە سەرچاوەیان نەگرتبوو، بەڵکو لە بیرکردنەوە پڕخوازی و خەیاڵپلاویەوە بوو. سەرکردەکان بەو باوەڕەوە خۆیان لەخشتە دەبرد گوایە دابەشکردنەکە "بەبێ شێواندنێکی ناڕەوا" سەردەگرێ. تەنانەت لە یانیوەری 1947یشدا، کاتێک وڵات لە سەروبەندی ئەوەدابوو بکەوێتە بەر هێرش و پەلاماری عەرەب، یەکێ لە ئەندامە گرنگەکانی ئاژانسی جووەکان بە من و هاوڕێکانمی گوت: "ئێمە هێشتا دڵنیا نین ئاخۆ بەریتانییەکان لەگەڵ ئێمەن یان دژمانن!" لە 22ی ئایاری 1947دا جەنابی بنگوریۆن لە دوانێکی دورودرێژدا، مشتومڕی لەسەر ئەوە بوو، داخوازی دەوڵەتی جوو لە هەموو ڕۆژئاوای خاکی ئێرتز ئیسرائیلدا هەنووکە داوایەکی ئەکادیمیانە(تیۆریانە)یە و لە لێکەوتەشدا دەبێ ئێمە داوای

دامەزراندنی دەوڵەت لەسەر بەشێکی خاکی ئێرتز ئیسرائیلدا بکەین، گێچەڵیش بە *مانداتەکە* نەفرۆشین. ئەو سەرکردە فەرمییە ئەندێشەی دیکەی بەلاوەنا: کە هێزێکی نێودەوڵەتی لە (ر.ن.ی) پێکبێ تاکو دابەشکردنەکە بچەسپێنێ و ئیدی نەتەوە یەکگرتوەکان بتوانێ لە ماوەی گواستنەوەدا ئاشتی لە ئێرتز ئیسرائیلدا بپارێزێ.

لە یاداشتنامەکەیدا بۆ ئەنجوومەنی ئاسایشی (ن.ی)دا، ئاژانسی جووەکان پشتگیر بوو بۆ پێشنیازی لەباربردنی دامەزراندنی کۆمیتەی نەتەوە یەکگرتووەکان بەوەی هێزێکی نێودەوڵەتی بە کاری دابەشکردنەکە هەڵبستێ. لە یانیوەری 1948یشدا، کاتێک شەڕی عەرەبە خۆجێیەکان گەرم بوو، جەنابی بنگۆریۆن لێدوانێکی وریایانەی دایە ڕۆژنامەگەری، گوتبووی:

"وەک مافێک داوا دەکەین، ئێمە بەبێ ڕامانێکی باش سەیری یارمەتی نەتەوە یەکگرتوەکان ناکەین."

"وەک ماف" دەستەبەرە. بەڵام "ڕامانەکان؟"

سەرکردە فەرمییە جووەکان لە دەریاییەکی ڕاستەقینەی خەیاڵ و ئەندێشەدا هەڵنگوتبوون. هەر لەبەر ئەوەشە کە نەدەتواندرا وا دابندرێ لە ماوەی ساڵە زیادەکەدا –ساڵی بەرقەرارکردنی ئاشتیدا– بەو ڕکێفە توندەی بەریتانییەکان لەسەر ئۆرشەلیم، جووەکان لەژێر لەخشەبردنی کوێرانەی سەرکردەکاندا نەتوانن ئامادەکاری سەربازییانەی شایستە بەوەی کە بەریتانییەکان لە نابلس، عەممان، بەغدا، دیمەشق و لوبنان گرتویانەبەر، بکەن. نەوەی دوارۆژ دەکرێ ئەوە بزانێ، لە شەممە ڕووناکەکەی 1ی مارتی 1947دا، ئێمە لە سەروبەندی وەرچەرخانێکی مێژووییدا بووین بۆ خاک و خەڵکەکەمان. ئێمە بەرمان لە بەرپێی دوژمن دەرکێشا و بوارمان نەدان کاتی وا بەدەستبێنن تا بە نهێنی ئامادەکارییەکانی خۆیان بکەن؛ ئێمە بەدرێژایی ساڵەکە ڕەوتی ڕووداوەکانمان خێراتر کرد. کێ بەوە دەزانێ کە ساڵەکە چ واتایەکی بۆ ئێمە دەگەیاند، ئەو کەسە دەبێ پەی بەوە ببا کە خەڵکی جوو قەرزباری ڕۆڵەکانییەتی، ڕۆڵەکانی هێزی هەڵمەتبەری ئێرگون زڤای لیومی. ئەوان لە ڕۆژی یەکەمی مارتەوە هەڵمەتەکانیان بۆ سەر گۆلدسمیت هاوس لە ئۆرشەلیم دەستپێکرد، فراژیبوونەکەشی لە ڕۆژی دووهەمەوە لە پیتا تکڤاوە

بوو، ئەنجا زەبرەکان لە لەندەن، لێیک هاوس(بارەگای ن.ی.ی)، لە واشنتن، مۆسکۆ و پاریسیەوە سەدایان دایەوە.

2

تۆبڵێی نوێنەرە بەریتانییەکان کاتێ لە 28ی ئەپریلدا لە بەردەم کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکاندا ئامادە دەبن، چ جۆرە پەیامێکی پوختیان پێیە؟ حکوومەت لەبارێکی بێپەردەیی خۆبەدەستەوەدانە بۆ "تیرۆرستەکان". بیڤن دەیەویست گفتوگۆکان لە سێپتێمبەردا بکرێن؛ کەچی ئیرگون ناچاری کرد گفتوگۆکان لە ئەپریلدا بکا. مۆنتیگۆمری و ماکمیلان قانونی باری ناکاویان سەپاندبوو؛ ژێر زەمینیش هەر دوو فیلد مارشاڵ و ژەنەراڵی بەزاندبوو. بارکەریش قامچی بەرزکردبوو، لە ئەفسەرەکانی خۆی دەدایەوە. دەسەلاتی حکوومەتی بەریتانی خۆی کردبووە بابەتی قەشمەری، ڤیزەوێنێکی جیهانیی. "ئایا ئەوە چ جۆرە حکوومەتێکە؟" ئەو پرسیارە بنێشتە خۆشەی سەر زاری خەڵک بور. "ئەرێ ئەو جۆرە حکوومەتە چۆن دەتوانێ کاروباری فەلەستین بەڕێوەبەرێ؟" ئەرێ کریچ جۆنز چی هەیە تا بەخۆی بڵێتەوە؟ لە مەڕ هەڵگرتنی قانونی باری ناکاویش بە پرتاو و تورەیەکی ڕاشکاوانە بە پەرلەمانی گوتبوو: "ئێمە هەرگیز رەچاومان نەدەکرد قانونی باری ناکاو کۆتایی بە تیرۆریزم بهێنێ."

بۆ دۆزێک کە بووبێتە "دادوەرییەک بۆ جیهان" پاشخانێکی کەساسانە بوو. هەر بۆیە دەسەلاتدارە بەریتانییەکان کەوتنە خۆ، بڕیاریان دا کردەوە بنوێنن. ئاخر ئەوان لە جەنگدا بەزی بوون، بەلام لە نمایشەکەیاندا هێشتا سێدارەکان مابوون. ئەوان بڕیاریاندا-نەوەک لە ئۆرشەلیم، بەڵکو لەندەن- شکۆ تێکشکاوەکەی ڕژێمەکەیان بە پەتی سێدارەوە تۆڵە بکەنەوە. لە بەرەبەیانی 17ی ئەپریلی 1947دا، گرەنەر، درێزنەر، ئالکۆشی و کاشانی لەدار دران. حکوومەت بە تالوکەیێکی گرگرتووەوە حوکمی لە سێدارەدانەکانی جێبەجێ کرد. ئیدی ئەمرۆ دەزاندرێ، ئاخۆ ئەوان بۆچی پەلەیان بوو، ئاخۆ ئاینوئۆینەکان بەوەی ڕای گشتی بە چاوەڕوانی ئەنجامی بڕیاری ئەنجوومەنی تایبەت بخاپێنن. ئەوان کاتیان بەدەستەوە نەمابوو. لە 28ی ئەپریلدا دانیشتنێکی تایبەتی نەتەوە یەکگرتوەکان لە گۆڕێدا بوو. شاهیدەکانی سێدارەکانیش دەبوایە بڕوایان بە جیهان بهێنابا، کە باسکی ڕاستەی

حکوومەت هێشتا ئەستوور و بەهێزە. هێزی حکوومەتی بەریتانی دەبوایە لەگەڵ پەردەهەڵدانەوەی پێواژۆی دانیشتنەکانی کۆمەڵەی گشتییەوە، نمایشی خۆی کردبا. هەر چۆنێک بێ، کاتبەندییکی لەبار نەبوو لە کاتێکدا کۆمەڵەی گشتی پرسی فەلەستینی تاوتوێ دەکرد، ئەوان هەر چوار گیراوەکەیان وەک خۆی هێشتبایەوە.
کەواتە کاتێ نوێنەرانی نەتەوەکان دە ساڵ دواتر لەبارەی فەلەستینەوە گفتوگۆ دەکەن، کەس ناتوانێ بڵێ، ڕژێمی بێڤن خۆی دابووە دەست تیرۆرستەکان، کەوا بەلاوازی حوکمی فەلەستینیان کردووە. هەڵواسینی ئەو چوار کەسەش هەر هیچ نەبووە. شتگەلی دیکە لە ڕێگادا بوو. فاینستاین و بازارانی دابون، لەداردانی ئەوانیش لە 25ی ئەپریلدا ڕێکخرا. ئەرێ ئۆلیڤەر ستانلی چی بە فەلەستین گوت؟ "دەسەڵاتێکی گردەبڕانە و تۆکمە" وەک ئەوەی بەهەر شێوەیەک بێ سیاسەتی حکوومەت بسەپێنێ. سێدارەکان وەک نیشانەنمای "لێبڕاویی و تۆکمەیی دەسەڵات" بوون.
بەڵام لە 4ی ئایاردا، کاتێک کۆمەڵەی گشتی ن.ی لە گفتوگۆدا بوو ئاخۆ نوێنەرانی جوو بانگێشتی کۆبوونەوەکە بکەن یان نا، ئێمە تریانە سێوەکەی بێڤنمان سەرەونخوون کرد. هێزی هەڵمەتبەرمان کوتەکی ڕێگای خۆی بەرەو نێو قەڵای عەککا شکاند...
ڕۆژی پاشتر هەواڵنێری هائارێتز لە لەندەنەوە نووسی: "پەلاماردانەکەی سەر زیندانی عەککا لێرە وەک زەبرێکی کوشندە بۆ سەر شکۆی بەریتانی دوای لەسێدارەدانەکانی ئێوارەی دانیشتنی نەتەوە یەکگرتووەکان داندرا، کە تیایدا وا نیشاندەدرا بەریتانیا باردودۆخەکەی بەتەواوی لەژێر ڕکێفدایە. بارزنە سەربازییەکانیش پەلامارەکەیان بە "شاکارێکی سەربازییانە" وێنا کرد. منیش لەگەڵ چەند کەسێکی سەر شەقام دوام، یەکێک گوتی: "کاتی ئەوە هاتووە بێینە دەر". هەواڵی دانیشتنەکەی ن.ی بەئاستەم لە ڕۆژنامەکان بڵاوکرایەوە، مەگەر تەنها لە ڕۆژنامەکانی تایمز و مانشستەر گاردیان نەبێ، کەچی هەواڵی ڕووداوەکەی عەککا بە خەتی درشتەوە نیوەی لاپەڕەکانی سەرجەم ڕۆژنامەکانی داگرتبوو، لەگەڵیشیدا وێنە و نەخشەی جوگرافی بڵاوکرابوونەوە. هەندێکیان نووسیبوویان 'مەزنترین زیندان لە مێژوودا شکێندراوە'، ئەوەیان خستبووەسەر کە حکوومەت گوتبووی زیندانی عەککا

لەشـــکان نـــایەت. بروســـکەکانی ئاژانســـی رۆیـــتەریش نووســـیبوویان، "دەســـەڵاتدارانی فەلەســـتین بەهـــۆی راکردنـــی گیـــراوە ســـەرەکییەکان تەواو تووشـی سـەرلێشـێوان بـوون. ڕەنجـی چەنـدان مـانگی دورودرێـژ، گەڕان و سـوڕان، کنەوپشـکنین، گـرتن و دادگـاییکردن و لێکـۆڵینەوە، هـەر هەمـووی بە فیـڕۆ ڕۆی، ئیـدی ئیرگـونیش بەهـۆی ئەو ژمـارە راکـردووە دەستوەشـانەوە بەهێزتر بوو."

لە 6ی ئایـاردا، راپـۆرتی پەیـامنێرە تـایبەتییەکەی هائـارێتز لە کزبـونەوە تـایبەتیەکەی کـۆمەڵەی گشـتی (ن.ی) بەمجـۆرە بـوو: "ڕووداوەکـانی عەککـا بوونەتە مایەی هەستیاریەتێکی زۆر قەبە لێرە."

بازنە سیاسییەکان لە لەندەن پەشۆکان. لە پەرلەماندا، ئەندامێک بەوشێوە تەوژمییە هـاتە گـۆ: "هەرگیـز شـتێکی وەک ئەوە لە مێـژووی ئیمپراتـۆریەتی بەریتانیادا نەقەوماوە." لە 13ی ئاياریشدا مێجەر ڕاینەر سەرنجی حکوومەتی لە هەڕەشـەکانی ئیرگـون بـۆ سـەر سـەربازە بەریتانییەکـان ڕاکێشـا. (ئەو ئامـاژەی بـۆ لێـدوانەکەمان دابـوو کە هەر سـەربازێکی بەریتـانی بکەوێـتە دەستمان، دەستبەجێ لە مەیداندا ڕووبەڕووی دادگای سەربازیمان دەبێتەوە.) وتەبێژی وەزارەت وەڵامیدایەوە، کە دەسەڵاتدارە فەلەستینییەکان دەمودەست وەزارەتی جەنگیان لە هەڕەشەکە ئاگادارکردۆتەوە و داوای یارمەرتیشـیان لە جووەکـــان کـــردووە. "مـــن خـــاترجەمم،" ئەو وای گـــوت، "کە جـــووە بەرپرسـیارەکان دەیـانەوێ بەرەهـایی خۆیـان لەو گەف و هەرەشـانە بێبەری بکەن. کاراترین پێوەر و ڕێکار بۆ ئەوە دەگیـرێتە بەر کە هەر تیرۆرسـتێک بیەوێ سەربازێکی بەریتانی بڕفێنی یان بکوژێ، بگیرێ و بهێندرێتە بەردەم دادگا."

ئەم گەفانە هێشتا دەبوایە بخرێنە سەر سەنگی مەحەک.

لەبەر سـێبەرە هەڵواسـیوەکەی ئۆپەراسـیۆنی عەککا -گەورەتـرین شـکاندنی زینـــدان لە مێـــژوودا- کە کـــۆمەڵەی گشـــتی نەتەوە یەکگرتووەکـــان کۆبـوونەوەیەکی تـایبەتی بەوە کۆتـایی پێهێنـا کە کـۆمیتەیەکی تـایبەتی لێپێچینەوە بۆ پرسـەکە دەستنیشـان بکا. بەر لەوەی کۆبوونەوەکەش کۆتایی پێبێ، جەنابی گرۆمیکۆ، نوێنەری یەکێتی سۆڤیەت، دوانێکی بەناوبانگی دا، کە گۆڕانکارییێکی چارەنووسسازییانەی هەم سەبارەت بە هەڵوێستی سۆڤیەت و

هەمیش بە تێکۆشانی جووەکان بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی تێدابوو. قسەی لەبارەی نابوتبوونی دەسەلاتی بەریتانی لە ئێرتز ئیسرائیلدا کرد، گرۆمیکۆ لەسەر ئەوە ڕشت بوو: "هەنووکە ڕووداوە خوێناوییەکانی فەلەستین تا دێ هەر گەورەدەبن و پەرەسەدێنێ. هەر ئەوەشە نمایش دەکرێ، وەک ڕاستێکیش حکوومەتی بەریتانیا پرسی فەلەستینی ڕادەستی نەتەوە یەکگرتووەکان کرد."

لە 4ی حوزەیرانیشدا، نابووتبوونی ڕژێمی ماندات لە ئێرتز ئیسرائیلدا لە لایەن سەرچاوە فەرمییە بەریتانییەکانەوە سەلمێندرا. ئەوێ ڕۆژێ ڕاپۆرتەکەی کۆمسیاری بالا دەربارەی هێرشەکەی سەر عەککا بلاوکرایەوە. ژەنەڕاڵ کەنینگهان نووسیبووی:

"هیچ زیادەیەکی ژمارەی سەرباز یان پۆلیس دەستەبەرێکی ئاسایشپارێزانە دژی نەکردنی هێرش بۆ سەر ئەو هەزاران باڵەخانە، پرد و بەڵێنکارییە (مقاوەلات) مەدەنییانەی وەک نووسینگەکانی پۆست، هەزاران مایلی ڕێگاوبان، هێڵی ئاسنین و لوولە نەوتییەکان ناکا... پاراستن و بەرگری کردنێکی تەواوی ئەو هەموو دامەزراوانە دژی هێرشێکی ڕێکخراو بە شەو و بە ڕۆژ لە هەر جێییەک بێ و بۆ سالانێکی بەردرێژ لە هیچ مەزەندەیەکی تایبەتمەندا جێگەی نابێتەوە.

"دانانی تەقینەوە لە بن دیواری باڵەخانەیەک لەژێر چەتری پاڵپشتی تەقە و ئاگر شێوازێکی سەرکەوتوانەی هێرشبردنی ئەڵمانەکان بوو، کە لە 1940ەوە لە دژی قەلا و سەنگەرە هەرە قایمەکانی پەیرەوکراو، شێوازەکەش گەر هاتبا و بەکارامەیی و لێبڕاوانە بێ حیسابکردنی قوربانییەکان جێبەجێ کرابا، دەکرا لە بنباری هەر هەلومەرجێکدا بەرهەمی خۆی ببوایە. ڕامانی سەرکەوتنی ئەو جۆرە هێرشانە لە شوێنێکی وەک فەلەستین مەزنتر دەبیندران، چونکە لە شوێنێک ئەنجام دەدران کە قانونی پابەندبوونی کۆمەڵگەکەی بەهۆکاری سیاسییانەی تەواوعەیارەوە، ئەوەی دەسەلماند کە خۆیان لە هێرشبەرەکان جیا نەدەکردەوە، ئەمەش هەمیشە دەرەتانێکی گەورەی بەرەوپێشڕەچوونی جەنگاوەرە هەڵمەتبەرەکان بوو...

"هەروەک پێشتر پێم لەسەر داگرتووە، هۆبەی تایبەت لەبن بارێکی تەواو ناتوانابیدا لەو هەلومەرجە هەنووکەییەی فەلەستین دەستبەکاربووە. من

ناتوانم بەوە قایل بم، کە دەزگای هەواڵگری بە شێوەیەکی ڕاشکاوانە شکستی خوارد، یاخود لە ئەگەری ئەوەی ڕەوشەکە وەک مەزندە دەکرێ بە هی بەنگالی سییەکان بەراورد بکرێ. هەر دەبێ ئەوەم لە مێشکدا بچەقێ کە لادەرەکان لە فەلەستین لەسەر تاکتیکی ژێرزەمینیدا لە لایەن ژێرزەمینی ئەوروپی لە جەنگە تازەکە ڕاهێندرابن..."

جارێکی دیکە حکوومەت پەتی سێدارەی بۆ بەرزکردنەوەی شکۆکەی بەکارهێنایەوە، هەرچەندە دوای مەترسیەکەی پەلاماری سەر عەککا خۆی لە خاڵی سفر دەدا. سێ لە هێرشبەرەکانی سەر عەککا بە مەرگ حوکمدران. ئاڤشالۆم هاڤیف، مایر ناکار و یاکۆڤ وەیس لە 29ی تەموزی 1947دا لەسێدارە دران. ڕژێمی بێڤن وێرای زەبرەکان هەوڵیدایەوە ئەوە بسەلمێنێ، کە ئەوان "دەسەلاتی زاڵ" ماونەتەوە. ئەوان دەیانەویست بەهەر شێوازێکی بەردەستیان بێ -وەک ڕۆژنامەی دیلی تێلیگراف نووسیبووی- چالاکیە قاچاخەکان سەرکوت بکەن.

بەڵام ئەوان داخبارانە نامراد بوون. ئەوەی بینیان ئەوە بوو، کە سێ قولاپی لەنگەری هیوا بۆیان بوو بەداوێکی کوشندە. ئەوان پەتیان چاند و سێدارەیان چنییەوە. لە 30ی تەمموزدا، بە جێبەجێکردنی ئاگادارینامەی ئێمە سەبارەت بە دژە سێدارەوە، هەموو ئیمپراتۆریەتی بەریتانی هەژایەوە. لەنێو توک و نەفرەت لە "تیرۆرستە دەغەڵەکان" هاوارێکی مەزنیش لە بەریتانیا هەڵسا. "بۆ دەرەوە! ئێمە دەبێ لە فەلەستین دەرچین! سەربازەکانمان لە فەلەستین بێنینەوە!" چەند بەریتانییێکی تێکدەریش هەر لە تەلئەبیبەوە تا گلاسکۆ دەستیان بە توندوتیژی کرد، بەلام ئەوان هەر ئەوەندەیان پێما، ببنە بارگرانی و ئاستەنگ بۆ "دەسەلاتی شارستان!"

سیاسەتی "دەسەلاتی ڕەها" لە ڕێی پەتی سێدارەوە شکستی هێنا. کوشتنی قانونییانە دنەی تۆڵەکردنەوەی دا.

بە لای کەمیەوە گەلی بەریتانیا لە دەبەنگی بەرهەڵستکردنی لەدایکبوونی نەتەوەیەک تێگەیشتن.

شەش هەفتە دواتر لەژێر کاریگەری دەنگەدەنگی ڕای گشتیدا، نوێنەرەکانی بەریتانیا بەرەو کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕۆیشتن. لەگەڵ بەرێکەوتنی بەڕێز کریچ جۆنز بۆ نیویۆرک، کۆرسی ڕۆژنامەگەری بەریتانی

لەسەر هەمان ئاواز دەیخوێند: "لە فەلستین وەرەدەر!" لە 12ی ئەیلولیشدا وەزیری کۆلۆنیالی بەریتانی ڕایگەیاند، نەتەوە یەکگرتووەکان چارەسەرێکی وای نەدۆزیوەتەوە کە هەر دوولای عەرەب و جوو پێی قایل بن، بەریتانییەکان دەیانەوێ هێز و کارگێڕییان لەوێ بکشێننەوە. ڕۆژی دواتریش ڕۆژنامەی جیهانیی بڵاویکردەوە، ڕاگەیاندنی کشانەوە بە "ئۆخەی و خۆشحاڵییەکی نەشاراوە" لە لایەن سەرجەم خەڵکی بەریتانییەوە پێشوازی لێکراوە.

هەڵبەتە ئەمەشیان تاکتیکە مانۆڕێک بوو. حکوومەت هیوای وابوو کار لە وڵاتە یەکگرتوەکان و حکوومەتەکانی دیکە بکا، هەروەک چۆن دەیەویست کاریگەری بە سەرعەرەب و جووەکانەوە هەبێ. باشە بۆچی ڕێککەوتن چارەسەرێک نەبێ؟ بۆچی بەشداری ئەمریکییەکان بۆ هەڵگرتنی "بەرپرسیاریەتیەکە" بە دەست نەهێنێ؟ بەلام مانۆڕەکەش نەزۆک دەرچوو. وشە سەرسوڕهێنەرەکەی "کشانەوە (چۆڵکردن)" باشتر دەرد،ەبڕدرا؛ ئەستەمبوو وشەکە لە لەکاریگەرییە ئەفسووناوییەکەی بەتاڵ بکرێتەوە.

قانونناسەکان خۆزاییانە "ڕێسای ژیانی" قانوننامەیان دەزانی. هەر قانونێک بەرهەمی ڕەنج و بیری مرۆڤە. هەر کاتێکیش بانگی دەرچوونی درا، خۆی لە دەست دانەرەکانی دەردەچێ، هەروەک چۆن هەراشێک لە دەست دایبابی خۆی رادەپسکێنێ. قانون دەست بەژیانی خۆی دەکا. هەندێ جاریش دەرهاوێشتەکەی زۆر جیاواز لە مەبەستی ئەوانەی دایانڕشتووە دەکەوێتەوە. بە ڕاستی ئەم ڕێسایە هاوشانی جاڕنامە سیاسییە مێژووییەکان بوو. بەلەبەرچاوگرتنی مەبەستی دەستنیشانکراو، لەگەڵ چاوەڵێنانیشی بەدنیاوە، ئەوان هێزێکی بزوێنیان هەبوو کە دانەرەکانیان پێشبینییان نەکردبوو. لە بنیاری جاڕدانی کشانەوەیان لە ئێرتز ئیسرائیلدا، حکوومەتی بەریتانی چەندان نیازی لە مێشکدا هەبوو. بەلام وشەی "چۆڵکردن" دەستبەجێ و لەخۆیەوە خەریکبوو هەبوونی سەربەخۆیانەی خۆی بسەلمێنێ. ئاخر هەنووکە بەرزاو (بەرزاو و نیشتاو)ەکە ناگەڕێتەوە دواوە. گیان و ورەی دەسەلاتارە بەریتانییەکان شەکەت بوو، زۆریش شەکەت. ئەوان چیدیکە دەربەستی نۆژەنبوونەوی گەمەکەیان نەمابوو: لە تیرۆر لە ڕۆژ و ترسیش لە شەو، لە گێتۆکان، بارمتەکردن، پەلامارە لەپڕەکان، فەلاقەکان و سێدارەکان

هەترەشیان چووبوو. لەنێو ئەو دەیان هەزار سەربازەی سووپای داگیرکەر ورەبەردانی چۆڵکردنە ئانوساتەکە، لە ماوەی شەوێکدا بڵاوبووەوە. ساڵانێک بوو لەوێ لێیان داکوتابوو، کەچی شادمانیش بوون بە هەواڵە خۆشەکەی زوو دەرچوون، ئەمەش بۆ باری دەروونی و مۆرالییان خەنیبوون بوو. ئاخر چۆن مۆڕالی سووپایەکی وا شێواو ڕاست دەکرێتەوە؟ هەمان کاردانەوەش لە دوورگە بەریتانییەکانەوە هات. لەوێش، خەڵک بە هەواڵە خۆشەکەی کشانەوەی "ڕۆڵەکانیان" شادمان بوون. ئیدی ئەستەم بوو ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەو ملیۆنان بەریتانییە بپرسرێ ئاخۆ مەیلیان بەلای قەدەری ڕۆڵەکانیان لە سووپای بەریتانیادا دەچێ، کە خۆیان لەگەڵ نۆژەنکردنەوەی بێهیوایی "شەڕە قێزەونەکەیان" ئاشت بینەوە.
وەزارەتی دەرەوە لەسەر مانۆر بەردەوام بوو. حکوومەتی وڵاتە یەکگرتوەکانیش چەندین جار بیروڕای خۆی گۆڕی. ئەوان داوای کۆبوونەوەی زیاتری کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکانیان کرد، لەوێشدا پێشنیازی ڕژێمێکی "راسپێردراو"یان دەکرد جێگەی دابەشکردن بگرێتەوە. ئەوان پێشنیازیان وابوو بەریتانییەکان ببنە ئەو راسپێردراوە. بەڵام خۆ ئەو مانۆڕانەش دەرەقەتی بارودۆخەکە نەهاتن. حکوومەت دەیزانی، ئەگەر ڕێسا و دەسەڵاتەکەی هەر ناوێکی لێبندرێ، ڕێگەی پێنادرێ. ئاخر باری ژێرزەمینی هەردەمێنێ و لەسەر دژایەتیشیان بەردەوام دەبێ. بازنە شوومەکە هەر دەبێ تەونی سەرسوڕان بچنێتەوە. ئەو کاتیش هیچ ڕامانێکی "دەسەڵاتێکی بە هێز و ڕەها" نامێنێتەوە.
لە 15ی ئایاری 1948دا، کۆمسیاری باڵای بەریتانی سواری کەشتی جەنگی بەریتانیی بوو. پاسەوانانی شەرەف لەسەر شەرەفی ئەو نمایشی پێشکەشکردنی چەکەکانیان بۆ کرد، هەر لەسەر شەرەفی ئەویش ئاڵاکە تا نیوە نەویکرا.
یاخیبوونەکەش سەرکەوتوو بوو.

## بەندی 26
## گەفێکی نوێ

٥٠٢ - ٤٩٢

پێشتریش لە ماوەی دانیشتنەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە پایزی 1947دا، ئێمە گەلەکەمان لە پلانێکی نهێنی بۆ "کارتێکردنەسەر" پەلاماردان لە لایەن عەرەبەکانەوە، ئاگادار کردبووەوە. ئەوێ ڕۆژێ خەڵکێکی زۆر، تەنانەت لە دەرەوەی بازنەی سەرکردایەتیە فەرمییەکەش پێیانوابوو "سازانی" دابەشکردنەکە دەکرێ لە لایەن "دەسەڵاتی زلهێزی" نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بە شێوەیەکی ئاسایشپارێزانە سەربگری و جێبەجێ بکرێ. کەچی ئێمە ڕوون و ئاشکرا مەترسیەکی کوشندەمان لەو گەشبینییە ساویلکەییەدا دەبینی. ئێمە هیچ خەیاڵپلاوییەکمان دەربارەی نیازەکانی حکوومەتەوە نەبوو، هەروەها هیچ ئەندێشەیەکی وێناکراویشمان سەبارەت بە ڕێکسختنی جەنابی تریگیڤ لییشەوە نەبوو. بەڵام ئەو دوو ئەندێشانە، کە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بە شێوەیەکی فەرمی هەروەک چۆن بە شێوەیەکی نافەرمی لەنێو جووەکاندا زاڵ بوون، ئاسۆیان بە پەڵەهەور داگرت، و چارەسەریشیان کەمبایەخ کرد و سەرکێشیش بوون بۆ کوشندەترین کوێرەوەری. لەو بەرمەودا دوورەی کات و لەژێر ڕۆشنایی لێکەوتەی ڕووداوەکاندا، ئەم خەیاڵ و ئەندێشانە پێدەچوون سەرسامهێن بن؛ ئەوەندە سەرسامانە، لە ڕاستیدا بە زەحمەت هەرس دەکران، کە چۆن لەبیری مێشکی ڕۆشنبیرێکی ئاسایی هەبووە. بەڵام ئەو حەپەسانە خۆزاییە ڕاستییە واقیعیەکانی نەگۆڕی کە پێیەوە پەیوەست بوون. ڕاستییەکە ئەوە بوو، ئیرگون زڤای لیومی ناچاربوو هەموو شێوازە بەردەستەکانی ژێرزەمینیی خۆی بۆ بەرچاوڕوونی بەکاربێنێ تا ئەو گەشبینییە گەوجانەیە بڕەوێنێتەوە. ناشبێ بگوترێ کە ڕەنجمان بە با دا؛ بەڵام لە سەرێکی دیکەشەوە ناتوانم هاوار بکەم، ئێمە بەتەواوی سەرکەوتوو بووین. تەنها خودی ڕووداوە هەرە تاڵەکان، ئاگادارینامەکانی ئێمەیان سەلماند، دووربینی خەڵکیان بۆ نواڕینە ئاسۆ ڕوونکردنەوە هەر وەک چۆن پێشتر بە ئاگر و خوێن سوور ببووەوە.

له 1ی ئۆکتۆبەری 1947دا، ئێمە له "دەنگی بەرخودانی زایۆندا" شتمان لەسەر جەنابی کریچ جۆنز له ڕاگەیاندنی کشانەوەی حکوومەتی بەریتانی و ئەگەری دامەزراندنی هێزێکی نێودەوڵەتی بۆ چەسپاندنی دابەشکردنەکەدا شی کردەوە. ڕادیۆی ژێرزەمینیی بە کۆمەڵانی خەڵکی ڕاگەیاند:

"بەریتانیا دەزانێ، نەتەوە یەکگرتوەکان هێزی سەربازی تایبەت بەخۆی نییە بۆ ئەوەی بەلای زۆرەوە کۆمەڵەی گشتی ڕێنمایی بۆ دامەزراندنی ڕژێمێکی نێودەوڵەتی و هێزی پۆلیسی نێودەوڵەتی دەر بکا... بەلام لەیەک شت دڵنیاییە، بڕیاری کۆمەڵەی گشتی ی.ن ناکرێ ببێتە مایەی بەرکەنارکردنی یەکێتی سۆڤیەت له بەشداریکردنی هێزی نێودەوڵەتی. یەکێتی سۆڤیەت لەنێو کۆمیتە تایبەتیەکەی نەتەوە یەکگرتوەکاندا نەبوو، ئەمەش بەهۆی ئەو ئاینوئۆینەی له بڕیاری پێکهێنانی کۆمیتەکەدا کرا بەوەی نەدەبوایە کۆمیتەکە هیچ ئەندامێکی هەمیشەیی ئەنجوومەنی ئاسایشی لەخۆگرتبایە. هەمان بڕیاریش لەمەڕ پێکهاتەی هێزێکی نێودەوڵەتی ئاشتیپارێز ناجسنانە بوو. لێ تەنانەت گەر ئەو شتە نابەجێیەش بپەژرێندرابا، نەدەکرا ڕێ لەبەشداری هەندێ دەوڵەت وەک پۆلەندا، یۆگسلافیا یان چیکۆسلۆڤاکیا بگیرێ. بەریتانیەکانیش مەزەندەیان کردبوو، کە ئەم خەملاندنە جێی پەسەندنامەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نییە. بە وشەگەلێکی دیکەوە، ئەستەم بوو بڕیار لەسەر پێکهێنانی هێزێکی نێودەوڵەتییانە بەبێ بەشدرای ڕووسیا بدرێ و ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش نەیدەویست ڕووسیا له هێزێکی وادا بەشدار بێ..."

له 12ی ئۆکتۆبەردا، دووبارە دەنگی ئاگاداركردنەوە له ڕادیۆی ژێرزەمینییەوە بیسترایەوە.

"پیلانی حکوومەتی بەریتانیا" ڕادیۆکە وای بلاوکردەوە، "بۆ هەمووان ئاشکرایە... تەنانەت ئەمڕۆش دوژمن هەوڵدەدا ئێمە بە پەسەندکردنی پلانەکەی بێڤن ناچار بکا... لەشکری داگیرکەر دەیەوێ ناوچە سنوورییەکانی دەوڵەتە عەرەبییەکان چۆڵ بکا تا ڕێ بە باندە هاوکارەکانیان بدا دژی ئێمە لەسەر پێ بن. ئابلۆقەی دەریایش بەردەوام دەبێ..."

له 16ی نۆڤێمبەردا، هەر دوو هەفتە بەر له بڕیاری نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ دابەشکردنی ئێرتز ئیسرائیل، دیسان ئێمە له دەنگی"بەرخودانی زایۆندا" هاوارمان کردەوە.

"کۆمەڵانی خەڵک سێ ئەندێشەی برەوپێدراوی سەرکردەکانیان لە بەردەم دایە. خەیاڵ و ئەندێشەی ژمارە 1: دابەشکردنی وڵات، ئەگەر لە لایەن دوو سێیەکی زۆرینەی کۆمەڵەی گشتی ن.ی پەسەند بکرێ، ئەوا بەشێوازێکی ئاشتیپارێزانە دەچێتەسەر.

خەیاڵ و ئەندێشەی ژمارە 2: ئەگەر لە ئێرتز ئیسرائیلدا شەڕ وەک دەرهاویشتەی پەلامارێکی ئاژانەکانی حکوومەتی بەریتانی هەڵگیرسا، ئەوا کۆمیتەی تایبەتی نەتەوە یەکگرتوەکان، کە لە ئۆرشەلیم دانیشتووە، هەر زوو ئاشتی دەگەڕێنێتەوە.

خەیاڵ و ئەندێشەی ژمارە 3: ئەگەر نوێنەرانی ن.ی لە ئەرکەکەیان وەک فریشتەی ئاشتیهێن شکست بێنن، ئەوا ئەنجوومەنی ئاسایش دێتە وەڵام، بە ئاماژەیەکی دەست، شەڕەکە دەوەستێنێ و بڕیاری خۆی دەردەکا.

"هەموو ئەو خەیاڵ و ئەندێشانە زۆر مەترسیدارن. 'گەشبینی فەرمیی' کە لەسەر مەرگەساتی مێژوویی دابەشکردنی وڵات بیناکراوە، هیچ بنگەیەکی واقعی نییە. هەروەک هەیە ئادەمیزاد بڕوای بەوەبێ "هەموو شتێک باش دێتەوە" لەبری ئەوەی بە چاوێکی کراوەوە ڕووبەڕووی ڕاستییەکان بێتەوە، ئەوە مایەی مەترسییەکەی دەست لە پەلوپۆ دەخا و کاتێکیش پێشهاتی چارەنووسساز بە سەرمان دادەدا و ئێمەش خۆمان لە ڕووی مۆڕال، ڕێکخستن و ئامرازەکانەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوە ئامادە نەکردبێ.

"هەر بۆیە زۆر گرنگە ئەو خەیاڵبازییە وردوخاش بکرێ. ئەوە چارەنووسسازانەیە کە ڕاستییەکان بە گەل بگوترێن. زۆر گرنگە خەڵک بۆ خۆئامادەکردن بۆ جەنگ نەوەک بۆ لێپاڵدانەوە ئامادەبکرێ، بۆ شەڕ و قوربانیدان نەوەک بۆ نمایش و میهرەجان. با ئەوە ئاشکراو،ون بێ: نەخشەی دابەشکردن پلانێک نییە بۆ ئاشتی، وێڕای دەستلێبەربوون لە هەرێمەکە، دەستلێهەڵگرتنێک کە هیچ ڕەوایەتی نییە. تەنانەت دامەزراندنی 'گێتۆکە' لە نێو نیشتمانەکەماندا دەکرێ لەنێو مەشەخەڵی ئاگر و ڕووباری خوێنیشدا بێتە دی..."

دوو ڕۆژ دواتر، "دەنگی بەرخودانی زایۆن" دووبارە هۆشداری دایەوە: "تەنانەت ئافراندنی ئەو دەوڵەتەش دەبێ باجێکی قورسی بە گیانی ڕۆڵە هەرە باشەکانمان دەبێ. ئەو شتە دڵنیا بۆتەوە کە خوێنڕژان لەو ڕۆژانەدا بۆ

چەسپاندنی دابەشکردن کەمتر نییە لەو باجەی کە بۆ ڕزگارکردنی سەرلەبەری نیشتمان دەیدەین..."

لە 23ی نۆڤێمبەردا، دیسان وا چارەی نەخشەی حکوومەتی بەریتانیامان کرد. دەنگی بەرخودانی زایۆن گوتی:

1- ئابلۆقەی زەریا بەردەوام دەبێ.

2- گەڕانەوە بۆ خاکی نیشتمان و چ کەرەسەکانی جەنگ دەبێ بە ڕێپێدان بێ.

3- سنوورەکانی وڵات بە کراوەیی دەمێننەوە و کەرەسە و تفاقی عەرەبەکان لەگەڵ چەکی بەریتانی بەنێویدا دەڕژێ بۆ ئەوەی پەلاماری گوند و شارەکانمانی پێبدرێ.

4- سوپای داگیرکار بەردەوام دەبێ لەسەر بندەست هێشتنەوەی پێگە ستراتیژیەکان و ئازادی کردەی هێزەکانی جوولەکەکانیش سنووردار دەکا..."

چەند ڕۆژێکیش دواتر لە ڕۆژنامەی (گەلاکان-دانیم) هاتبوو:

"بەرهەڵستی عەرەبەکان بەپاڵپشتی بەریتانییەکان بۆ چەندان شێوە پەرەدەسێنێ. عەرەبەکان نایەنەوێ هیچ حکوومەتێک لەو ناوچانەی کە بە بڕیاری ن.ی بۆ ئەوان دەبێ، چونکە دامەزراندنی حکوومەتێکی لەو جۆرە ئەوەی لێ دەخوێندرێتەوە، کە ئەوان بە دابەشکردنەکە قایلن. بێدەچی عەبدوڵلا[108]ش نەتوانێ حکوومەتێکی لەو جۆرە دابمەزرێنێ. جارێ بە پلەی یەکەم، بەریتانییەکانیش ڕێگەی ئەوەی پێنادەن؛ دووهەمیش، ئەو نە حەز دەکا و نەدەشتوانێ وەک "هاوپەیمانێکی جوو" دژی هەموو جیهانی عەرەب( کە زۆربەیان ڕقیان لێیەتی) بوەستێتەوە و یارمەتی پلانی دابەشکردنەکە بدا. ئەگەر لەشکرەکانی عەرەب لە ماوەی مانگەکانی داهاتوودا بکەونە کار، ئەوا کاری تێکدەرانەی وا دەکرێ بۆ ئەوەی عەبدوڵلا وەک "بەرگریکارێکی برا عەرەبەکان" نیشان بدرێ.

لێرەدا شیاوە ئەم لێکدانەوەیە لەگەڵ قسەکانی جەنابی بنگۆریۆن بەراورد بکرێن، تەنانەت ئەویش سەروەختایەک بەم دواییانە بڕوای خۆی لەمەڕ نیازی ئاشتیخوازانەی شا عەبدوڵلا وەک "پیاوە هۆشمەندەکە" دەربڕیبوو:

---

[108] مەبەست عبداللە کوری حسینی(1882-1951) یەکەمین پاشای نوردن بوو. وەرگێر

له 29ی نۆڤێمبەردا، کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان پرۆژە پێشنیازێکی پەسەند کرد بەوەی لە ئێرتز ئیسرائیلدا دەوڵەتێکی جوولەکە لە پاڵ دەوڵەتی عەرەب دابمەزرێ، هەر دووکیشیان یەکێتییەکی ئابووری پێکبهێنن و شاری ئۆرشەلیمیش وەک "شارێکی نێودەوڵەتی" لە هەر دووکیان جیا بکرێتەوە. گەلەکەمان بەمە کەوتە هەلەکەسەما. لێ گەلۆ، ئیرگون بیری خستنەوە کە نیشتمان قاشکرا و ئاگاداری کردنەوە کە شەڕ لە دەرگایان دەدا. سەرەتا ئێمە هاوارنامەی جەنگاوەرانی ژێرزەمینیمان دووپاتکردەوە:

"دابەشکردنی خاکی نیشتمان نارەوایە. نابێ هەرگیز دانی پێدابندرێ. واژۆی دامەزراو و تاکەکانی سەر رێککەوتننامەی دابەشکردن ناخوا. دابەشکردنەکە نابێ گەلی جوو پابەند بکا. ئۆرشەلیم هەمیشە هەر پایتەختی ئێمەبووە و هەرواش دەمێنێتەوە. دەبێ ئێرتز ئیسرائیل بۆ گەلی ئیسرائیل نۆژەن ببێتەوە. هەر هەموو خاکەکە و هەمیشەش دەبێ وا بمێنێتەوە."

ئێمە لەسەر روونکردوەکەمان وا بەردەوام بووین:

"دابەشکردن، ئاشتی لە وڵاتەکەماندا مسۆگەر ناکا. لە گۆشەنیگای عەرەبەکانەوە تەنها دوو ئەگەر هەن: ئەوسا ئەوان چ ویستیان و توانیان دژی دەسەڵاتی جوولەکە چەکدارانە بوەستنەوە یان نەیانتوانی. بەپلەی یەکەم ئەوان تەنانەت دژی دەوڵەتی دابەشبووش دەوەستنەوە. بە پلەی دووهەمیش ئەوان تەنانەت دژی دەسەڵاتی جووەکان لە سەرلەبەری وڵاتدا دەوەستنەوە.

"خەونی هێزێکی نێودەوڵەتی لەژێر ناوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ سەپاندنی دابەشکردنەکە، هەروەک چەند مانگێک لەمەوبەر هۆشداریمان دا، بەبا دەڕوا. لەو جەنگەی کە بە دڵنیاییەوە لەپێشە، ئێمە دەبێ تەنها بوەستینەوە، لەکاتێک کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان داوای ئاشتی دەکا، ئەو داخوازەی کە بەها کردەییەکانی پێشتر لە شوێنێکی دیکەدا تاقیکردونەتەوە.

"بەڵام ئەوەی مایەی دڵنیاییە، هەرکاتێ شەڕەکە قەوما -حکوومەتی بەریتانی هەموو شتێکی لەتوانای دابێ بۆ روودانی ئەو شتە دەکا- ئەوا جەنگەکە بۆ مان و ئایندەیە. لەو جەنگەشدا دەبێ سەرجەم هێزە جووەکان یەکبگرن. ئەم جۆرە جەنگە لەتوانایدا هەیە هەموو شتێک بگۆڕێ..."

هەمان رۆژ ئێمە فەرمانێکی تایبەتمان بەو رۆژە بۆ سەربازەکانی ئیرگون زڤای لیومی دەرکرد:

"رامانی دەوڵەت، حکوومەت، سووپا کە ساڵانێکە لە بەرامبەر حاشایی لێکردن و گاڵتەپێکردنی ئەو کەسانەی ئەمڕۆکە شێت و دێوانەی بیرۆکەی دەوڵەتن، بانگەشـەمان بـۆ کـردووە، بـۆتە خەونێکـی هەرە شـیرینی گەلـی جـوولەکە. کـاتێکیش بە خەڵکەکە دەگـوترێ، بە ڕاسـتی خەونەکە دەبێـتە ڕاسـتی، ئەوان خۆزاییانە باوەشی خۆشی بۆ دەکەنەوە..."
"ئێمە نابێ لۆمەی خەڵک بکەین.
"بەڵام لـێگەڕێ بـا بە سـەربەرزییەوە پێیـان بڵێـین: ئـێمە کە ژیانمـان بـۆ ئەم ڕۆژەی ئـازادی بەخشـیبوو، دڵخـۆش نـین. دڵخۆشـنین بـۆ نیشـتمان کە ڕزگارنەکراوە بەڵکو شێوێندراوە. بۆ دەوڵەتێک کە هەر لە گەنجێتیـدا ـان بۆی تێکۆشاوین، دەوڵەتێک کە ئازادی بداتە گەل و پاشەڕۆژی ڕۆڵەکانی مسۆگەر بکا، ئەو دەوڵەتە هێشتا هەر بە ئامانجی نەوەکەمان ماوەتەوە!"
بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان لە 29ی نۆڤێمبەردا پلەی کەشی گەشبینی لە ئێرتـز ئیسـڕائیلدا بەرزکـردەوە. بە ڕاسـتیش بـۆ بەیـانی بڕیـارەکە هێرشـی بکـوژانە لە لایەن عەرەبەکـانەوە لە شـارەکان و ڕێگاوبانەکـانەوە کـرا. بەڵام جەمـاوەر و سـەرکردە فەرمییەکـان دڵنەوایـی خۆیـان بەوە دایەوە گـوایە ئەم ڕووداوانە لە "نمایشـێکی تورەبـوون" زیـاتر نـین. گریمـانەی گشـتی وا بـوو، ترسێکی وا بۆ شەڕێکی بەهەند هەڵگیراو لە گۆڕێدا نییە. دەنگی ئاگادارینـامەی ئیرگـونیش کە تـا دەهـات چڕتـر دەبـووەوە و دەکـرا بە پەلامـاری سـووپای نیزامـی عەرەبەکـان کۆتـای پـێ بـێ، هەر بە تەنیـا تـاکە دەنـگ بـوو لەنێـو دەشتودەردا مایەوە.
سەرکردەکانی ئاژانسی جووەکان بە بڕوایەکی منداڵکارانەوە بڕوایان بەخشـتە کاتبەندییەکەی بڕیاری نەتەوە یەکگرتوەکان هەبوو. حکوومەتی بەریتانیا ئەو بڕوایەی لە باوەش گرت. نوێنەرەکانی لە لێیک سەکسیس(بارەگای ن.ی) سێر ئەلێکسـاندەر کادۆگـان و سـکرتێری کۆلۆنیـان جەنـابی کـریچ جۆنز کتومـت بێگرێوگۆڵ گوتیان "دادوەری دەزگا نێودەڵەتیە باڵادەستەکە دەپەژرێنن."
تەنـانەت لە دیسـێمبەری 1947دا، سـەرانی ئاژانسـی جووەکـان پێیـانگوتین، ئەوان بڕوایـان بە 1ی فێبرایـر هەیە، ئیـدی گـوایە بەگـوێرەی ڕێنماییـنـامە بەرجەسـتەبووەکانی بڕیـاری 29ی نـوڤێمبەر دەرووبەک لەسـەر ئـێمە دەکـرێتەوە. ئاژانسـەکە بـێ خەتایانە(بێوەییـانە) بڕوایـان وابـوو، بەنێـو ئەو

دەرووپەدا، کە سەرلەبەری لەسەر ڕۆژە پێشنیازی ئێمە دەبێ، ئێمە لە ئیسرائیلدا ڕێگەمان پێدەدرێ ژمارەیەکی زۆری چەک و تفاق بێنین.
ئیرگۆنیش بە هەموو تواناکانیەوە تێکۆشا بڕوایان پێ بێنێ، کە ئەوان سەرچیخ ڕۆیشتوون. ئێمە بە درێژی بۆمان روون کردنەوە، ئەگەر بەریتانیا دەروازەیەکمان لەسەر بکاتەوە، وەک ئەوە وایە کۆمەکێکی ڕاستەوخۆی خەباتمان دژی عەرەبەکان بکا، لە کاتێکدا ڕاستیەکەی ئەوە بوو، تاکە یارمەتی حکوومەتی بەریتانیا کە ویستبێتی بەئێمە ڕەوابیبینێ، هەر ئەوە بوو کاتێک ئێمە نغرۆ دەبین نەیەڵێ هەڵسینەوە. مخابن بەڵگەوبەندەکانمان نەیتوانی ئەو خەیاڵپلاوییە جوانەی دەستیان پێوەگرتبوو، بڕەوێنێتەوە.
لێکەوتەکەشی لە ماوەی مانگەکانی دیسێمبەر و یانیوەریدا ئەو هەڵوەدابوونە پێویستیە بوو بەدوای چەک و تفاقی جەنگیدا بگەڕێین کە نەکرا، هەرچەندە ئەوێ دەمێ دەرفەتی داخوازی جبەخانە زۆر گەورەبوو. ئەو مانگە پڕبایەخانە؛ ئەو باجەی بەلە دەستدانی ئەو کات دامان، بە شێوەیەکی کارەساتبارانە بەرز بوو. یەکێ لە نوێنەرەکانی دەزگا نیشتمانییەکان، کە ئەوێ ڕۆژێ لە پایەتەختێکی بێگانەدا بوو، بە تالاوییەکی ڕاستگۆیانە بە نوێنەرایەتی ئیرگن زڤای لیومی ڕاگەیاند: "ئەمە کەمتەرخەمییەکی سامناک بوو. ئەو کەسانەی بەرپرسیاری شتەکە بوون پێویستە دادگایی بکرێن."
لە سەرەتای دیسێمبەردا، ئێمە بانگەوازێکمان بۆ گەل کرد، کە من وایدەبینم یەکێک بێ لە گرنگرین پرسەکان کە ئیرگون پێیهەڵسابێ. ناونیشانەکەشی "ئێمە هۆشداری دەدەین" بوو. لەو بانگەوازەدا گوتمان:
"مەزنترین دژوارییی کە ڕووبەڕوومان بێتەوە ئەوەیە، ئێمە لە کاتی خۆیدا تێنەگەین کە کوشندەترین مەترسیمان لەسەرە. گەل دەبێ ڕاستیەکە بزانێ، هەر بە زانیارییەکەی دەکرێ خۆی لە کارەساتەکە بپارێزێ.
"ئابلۆقەی دەریایی تا پێنج مانگی دیکەش درێژە دەکێشێ. بەریتانییەکان ڕێگەی هیچ هێزە پاڵپشتێکی پیاو و چەک و تەقەمەنی نادەن. خوێنی جوو دەبێ بڕژێ... چەکەکانیش دەبردرێن و فیشەکانیش تەقێندران. جەنگاوەرە جووەکان و بەرگریکاران دەبێ بگیرێن، یاخود لە لایەن ئاژاوەگێرە هاندراوەکان بکوژرێن. ئابووریەکەشمان ئەگەر وێران نەکرێ، زۆر کز و زەبوون دەکرێ. پەیوەندیەکانیش لەباریەک هەڵدەوەشێندرێ.

"هەموو ئەو شتانە بۆ ماوەی پێنج مانگی ڕەبەقی دیکە بەردەوام دەبن. ئەوسا لە شێوەی 15ی ئایاری 1948دا بەکۆتاییهاتنی دەسەڵاتی بەریتانی، سەنگەرەکانی بەرەی پێشەوەی وڵات دەکەون. ئاخر سنوورەکان لە لایەن پاسەوانانی جوو نەپارێزراون، چونکە زۆر لەو ناوچە سنوورییانە بەهۆی بڕیارە نەخشە کاولکارییەکەی دابەشکردن بەر دەوڵەتە عەرەبییەکان کەوتوون. ئیدی لە ڕێی ئەو سنوورانەوە، هەزاران بکوژ بە چەکی بەریتانییەوە دێنە ژوور.

"بۆیە تا کاتی ماوە، ئێمە دەبێ خۆمان ئامادە بکەین. سەرەتا و پێش هەموو شتێک ئێمە دەبێ کۆتایی بە باری بەرگریمان بێنین. ئێمە دەبێ هەڵمەت ببەین. ئێمە دەبێ پەلاماری بنکەی بکوژەکان بدەین.

"ئەوەی ئێمە ئامادەکاری بۆ بکەین نەخشەی پلانێکی خۆجێی نییە، بەڵکو نەخشەی ستراتیژێکی بەرفراوان و خۆسازدانە بۆ بەرپەرچدانەوەی پەلامارەکان و خۆتەیارکردنیش بۆ هێرشی سوپای ڕزگاری عیبری. خۆئامادەکردنەکە دەبێ لە دەرەوە بکرێ. دەبێ پێکهاتەی جەنگاوەرانی بەئەزموون جۆش بدرێن و ڕێک بخرێن.

"هەموو ئەمەش دەبێ لە لایەن هێزە یەکگرتووەکانەوە بکرێن. ئاخر هەمووان بێ هیچ ڕیزپەڕی و هەڵاواردنێک، ڕووبەڕووی هەمان مەترسی دەبینەوە. ڕەوشەکە تا بڵێی سامناکە. جەنگ سەختە و قوربانی زۆری دەوێ. بەڵام پێویستە نەتۆقێین. خۆ ئەگەر هەمووان تێبگەن کە پێویستە چی بکەین، ئەوا قەپۆزی دوژمن دەشکێنین."

هەروەک جاران، ئێمە بڕوامان بە داخوازی نەبوو. ئەو بانگەوازییەش-کە بەهۆی ڕووداوەکان بەرجەستە بوو- کردەوەی لەگەڵدابوو. دوای دوو هەفتە لە پەلاماری عەرەبەکان، سەربازەکانی ئیرگون دەستیان کردەوە و یەکەمین دژە هێرشی هێزی جووانەیان ئەنجام دا. بۆ ماوەی سێ ڕۆژ، لە 11 بۆ 13ی دیسێمبەر، یەکەکانمان سەری ئاژاوەگێڕ و بنکە و بارەگاکانی ئەوانیان دەکوتایەوە. ئێمە لە هەیفا و یافا، تیرە و یازودا هێرشمان برد. ئێمە دووبارە و سێبارە لە ئۆرشەلیم هەڵمەتمان برد. ئێمە چووینە سەر ئەو گوندە شەڕانگێزییەی (شافات) کە لەسەر ڕێگای زانستگەی عیبری بوو. دزەمان کردە نێو یەهودیا و بەشایستەیی چارەی ئەو باندە چەکدارەی کە بنکەیان

لەوێ لە گوندێکدا دانابوو، کرد. زیانەکانی دوژمن لە کوژراو و بریندار زۆر سەخت و قورس بوون.
هێرشەکان لە لایەن هائارێتزەوە بەم شێوە هەڵسەنگێندران: "گۆڕانێکی ریشەیی لە ڕەوشەکەدا لەسەر دەستی ئۆپەراسیۆنەکانی ئیرگون بە بەرفراوانی دەستپێکرد." هەڵبەتە، ئەمە گۆڕانکارییکی ریشەیی بوو. پێشتر هەموو هێزەکانی جوو -بە یەکەکانی ئێمەشەوە- لە پێگە بەرگریەکانی خۆیان داندرابوون. بەڵام تۆ لەو پێگانە هەر دەبێ بەرگری کار بێ، ناتوانی دەستیان بەسەردا بگری. رێکارەکانی بەرگری بەر بەزیانلێکەوتن ناگرن. ئەوان(مەبەست رێکارە بەرگرییەکانە) هەر بوار بە دەستدرێژیکاران دەدا بەدەستپێشخەری بمێننەوە. ئەوان تۆ دەخەنە بەر باری ناکاوی پەلاماردان. رێکارەکان مۆرالی هێزی دوژمن زیاد دەکەن و بە شێوەیەکی سیستماتیکیش هی بەرگریکاران لاواز دەکەن. هیچ گومانیشی تێدا نییە، کە هەڵمەتبردن تاکە بەرگرییکی کاریگەرە. هێڵی ماگینۆت ئەم شتەی لە هەموو دەقە کتێبەکانی ستراتیژی لە جیهاندا زیاتر سەلماند.
ئەو دژە هێرشانەمان بەیەکبار کە لە مەدایان بەرفراوان و لە چڕبوونەوەشیان کارانگاز، رێژەی متمانە بەخۆبوونیان لەبەر چاوی عەرەب و خۆمانە بەرز و ڕاست کردەوە. پەلامارەکە چاودێرە بیانییەکانیشی فێرکرد، کاتێک دەربارەی خاڵە لاوازەکانی جوولەکە دەنووسن، ئارەزوومەندانە دەرینەبڕن.
گۆڕانکارییەکە بنەماییانە بوون. دوابەدوای دژە پەلامارەکانمان هەموو هێزە جووەکانیش لەباری بەرگری پەڕینەوە بۆ هێرشکردنە سەر بارگەوبنەی دوژمن. تەنانەت جەنابی بنگۆریۆنیش وشەگەلی وای دۆزینەوە کە پەسنی ئۆپەراسیۆنەکانمان بدا، هەرچەندە کاتێ ئەوەی دەربڕی بەخۆیشی نەیدەزانی، کە ئێمە بووین ئەو چالاکییانەمان کردوون. ڕۆژی پاش پەلامارە سەرکەوتووەکەمان بۆ سەر (تیرە)، ئەو بە ڕۆژنامەوانەکانی گوت: "ئەرێ دەبینین کە ڕۆڵەکانمان چەند بەتوانان؟" ئەو لەژێر ئەو باندۆرەدا بوو گوایە پەلامارەکان لە لایەن ئەندامانی هاگاناوە کراون.
وەک دەسانبینی تا دەهات شەڕ و پێکدادانمان لەگەڵ هێزە عەرەبییەکان نزیک دەبوونەوە، ئیدی ئێمە کارمان لەسەر ڕێکخستنەوەی ئۆرگانی جەنگییەکەمان

کرد. گۆڕانکاریمان لە پێکهاتەی ژێرزەمینیی یەکە سەربازییەکانمان کرد. یەکەی نیزامی شەڕکەرمان دامەزراند. ئێمە پلەکانمان بۆ خۆبەخشەکان کردەوە، بە هەزاران بە پیرمانەوە هاتن. یەکەیەکی پلاندانانی تایبەتمان بەسەرپەرشتی گیدی دامەزراند. لە ڕەزوباخە پرتەقالەکانی پیتا تیکڤا و ڕامات گاندا، یەکەمین بنکەی سەربازیمان دامەزراند. لە شێوازی مەشقەکانمان لادا: لە مەشقپێدانی شانەی پارتیزانی بچووک بچووکەوە بۆ ڕاهێنانی مەیدانی کراوەی جەنگ پێمان هەڵێنا. خەم و مشورخواردنی پەیداکردنی چەک و تفاقی شەڕ باڵی بەسەر هەموو ئامادەکارییەکانمان داگرتبوو. بە جیاوازی دامودەزگا فەرمیەکانی جوو، نەدەکرا خۆمان بە کەمتەرخەم تۆمەتبار بکەین. ئەو برە پارە کەمەی هەشمان بوو، هەمیشە هەر بە چەکمان دەدا، برە چەکە کەمەکەی بەردەستیشمان لە ماوەی ساڵەکانی خەباتی ڕزگاریخوازانەمان دژی سووپای داگیرکەر بەدەستهێنابوو. دامودەزگا فەرمییەکانی جوو ئەگەری جبەخانەیەکی باشی چەکیان لەبەردەستدا هەبوو. لە ئابی 1946دا، هاگانا دوای شەش مانگ لە بەرخودان دژی بەریتانییەکان، دوایی دەستبەرداری خەباتەکە بوون. بۆ ئەوان ساڵانی یاخیبوون ساڵانی خامۆشی و ئاشتی بوون بۆ مەشق و خۆئامادەکردنەکانیان. بەڵام کاتێک ڕۆژی تەنگانەش هات، ئەم 'خۆئامادەکردنانە' نەزۆکی خۆیان نمایش کرد. ناگانا کە بۆ پڕچەککردنی سەرچاوەی دارایی و توانا و هەوڵی هەموو گەلی جوولەکەی بۆ بەگەڕخرابوو، کەچی هەر خاوەنی چەند تفەنگ و ڕەشاشێکی کەم و چەند ڕەتڵە هاوەنێک بوو. هەڵبەتە ئەندامانی هاگانا، هەروەک ئەوانەی ئیرگون و F.F.I ئازایانە بەرامبەر عەرەبەکان وەستانەوە؛ تێکرای گەنجە جووەکان کە زۆربەیان هەر چەکی سووک و لاوەکییان پێبوو، لەمەیداندا قایم لە بەرامبەر تانک و تفەنگەکانی دوژمندا چەقین. ئای لەو باجە قورسەی گیانەکان کە دەکرا بپارێزرابان، لەو خاکە گران بەهایە دەبوایە بەدەستبهێندرێتەوە، ئەرێ هەمووشی هی ڕۆژانی پاڵێدانەوەی کەمتەرخەمییەکانی "ئامادەکارییەکان" نەبوو کە ڕاستەوخۆ بناوانیان بۆ ڕامانی کورتهێنی بەستەزمانی سیاسییانە دەگەڕایەوە؟

# بەندی 27
# گیانی سەرکەوتن
٥٠٨ - ٥١٢

خەمی سەرەکیمان دەستەبەرکردنی چەک بوو بۆ جەنگاوەرەکانی ئیرگون. ئێمە گیان و ورەی بەرخودانی ئەوانمان دەبینی و لە خەفەتانیش بە ددان لێوەکانی خۆمان دەکرۆشت کە نەمان دەتوانی پێداویستیەکانی چەک و تفاقیان بۆ دەستەبەر بکەین. هێشتا هێزەکانی بەریتانیا لە وڵات مابوون. ئاژان و سەربازە بەریتانیەکان چاویان هەر لەسەر ئەندامانی ئیرگون بوو. ئێمە دەبوایە لە هەموو هەنگاوێکماندا وریا باین. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە کۆششێکی لە تاقەتبەدەرمان بۆ کارخانەی چەکسازی دا. بەرهەمهێنانی تفاقی شەڕ، رێکارێکی پیشەسازیانەی زۆر ئاڵوز بوو. ئای بەر لەوەی یەکەمجار کارخانەی چەکمان دابمەزرێنین و یەکەمین ڕەشاشی لێ بەرهەم بهێنین چ تاڵاوییکیمان چەشت! ئای چ نامرادیێکی دڵتەزێنانەبوو، کە رۆڵەکانمان تەنها بە تفەنگی ستێن دەناردنە بەرەکانی جەنگ. سەرباری ئەوەش، بەماوەی چەند مانگێکی کەم توانیمان لە دروستکردنی چەند هەزار ڕەشاش، چەندان هەزار نارنجۆکی دەست، ژمارەیەک هاوەنی دوو ئینجی بیبنەوە و لەگەڵ تێپەڕینی کاتیشدا توانیمان هاوەنی سێ ئینجیش بەرهەم بێنین. بەڵام لە بەرهەمهێنانی بۆمباکاندا هەر سەرەتامان بوو، دەست بەسەرداگرتنی بارە قەتاری پڕ لە بۆمباش هێشتا دوورەدەست بوو.

بەرهەمهێنانی ئەو چەکانە و بەردەوام ڕاگرتنی لەبارێکی گونجاو لە جبەخانەکاندا هەمیشە لەو برە پارەیەی زۆرتر دەویست کە لە بەردەستماندا بوو. دوای بیرکردنەوەیەکی شایستە بڕیارمان دا ڕاستەوخۆ داوای کۆمەک لە جەماوەر بکەین، بەوەی بەشداری هەوڵەکانی جەنگی ئیرگون بکەن. ئەمەش بڕیارێکی ئاسان نەبوو. شتەکە واتای ئەوەی دەگەیاند، کە پەردە لەسەر سەدان کەسی ژێرزەمینییدا هەڵبدرێتەوە. لەبارەی کاریگەرییشەوە واتای ئەوەی دەگەیاند، بە تەواوی دەستبەرداری نهێنیبوون ببین، ئێمە دەبوایە ئەوە هەڵبسەنگێنین کە بۆ بڕیارەکەمان زوو نەبوو.

ئاخرچارەیەکی دیکەمان لە بەردەستدا نەبوو. پێمان باشتربوو ئەو ریسکە بەهەندهەڵگیراوەی داخستنی وۆرکشۆپەکانی ئیرگون بکەین، ئەو هەنگاوەی دەکرا مەترسیدارتر بێ لە توشکردنی گەلی جوولەکە بە شەڕ. ئاوا، بۆ یەکەمجار نوێنەرانی ژێرزەمین خۆیان بە جەماوەر ناساند، کە پێشتر تەنها چاوەکانیان لەسەر ئەو پۆستەرانەی بۆ پاداشتکردنەوەی خەبەرلێدانیان بە دیوارەکانەوە هەڵواسرابوو، دیبوو. ئێمە داوامان لە خەڵک کرد بەڵکو کۆمەکی "فەندی ئاسنین" بکەن. کاردانەوەی جەماوەریش نەوەک هەر بۆ ئێمە بەڵکو بۆ ناحەزانیشمان، سەرسوڕهێنەرانە بوو.

بەبێ هیچ جیاوازییەک، هاندان بەهۆی شتی بێبەهاش بەرهەمی هەبوو. لە گۆڕەپانی، مۆگرابی لە ناوجەرگەی تەلئەبیبدا، ئەفسەرێکی هاگانا فەرمانی بەسەر پیاوەکانیدا کرد، نارنجۆکە دەستیەکان فڕێ بدەنە نێو ئاپۆرایەکی گەورەی خەڵک، کە لە دەوری بڵنگۆیەکی ڕاگەیەندراوی ئیرگون بۆ کۆمەککردنی "فەندی ئاسنین" گردببوونەوە. ژمارەیەکی زۆر بریندار بوون، هەندێکیان بەسووکی و ئەوانی دیکەش برینەکەیان قورس بوو. ئیدی هاتوهاوار و تووڕەیی خەڵک بێسنوور پەرەی سەند. ئەرێ هەر بۆ ئەوە چەک دراوەتە دەستی هاگانا؟

ئەوێ شەوێ من چوومە جادەی ئەلنبی. ئەوەش بۆ ماوەی چەندان ساڵ بوو، یەکەم جارم بوو هەر بە پیاسە بەڕێگادا بڕۆم. ئەوەش شکاندنێکی خۆماکیانەی ڕێسا تۆکمەکان بوو. کەسم لەگەڵدا نەبوو. خۆ زۆرکەسیش دەکرا بمناسنەوە. هێشتاش بەریتانییەکان وڵاتیان لەبن دەستدا بوو.

شەوەکەی ڕاستەوخۆ، تاک لایەنە پەیوەندیم لەگەڵ هەزاران هاونیشتمانی عیبری کرد. من لەنێو دەیان کۆمەڵەی گفتوگۆکار وەستام. لێرە و لەوێ نیگا و نیشانەی پرسیاری سەرسامانەی هاوڕێیانم بینی کە منیان ناسیبووەوە. بەڵام هەر زوو نیگای چاوەکانم لەسەر لاکەوتن وەک ئەوە هەر نەیاندیتبم. بۆ باقیەکەش من هەر وەک پیادەڕۆیەکی پرسن بووم، خوازیاربوو لە هەموو ڕوویێکەوە گوێی لەوەی لە گۆڕەپانی مۆگرابی قەومابوو، بێ.

ئەوێ شەوێ بۆم دەرکەوت، کە گیانی ئازادی چۆن گەلەکەمانی خرۆشاندووە. ئەو نارنجۆکانەی فڕێدرابوونە نێو ئەو ئاپۆرا قەبەیەی خەڵک، نەیترساندبوون، لەبری ئەوە تووڕەی کردبوون. هەموو ئەوانەی لەسەر شەقام

دەمەتەقێیان بوو دۆستی ئیرگون نەبوون، بەڵام تا ڕادەیەک هەر هەمووان سەرکۆنەی ئەو کردەوە ترسنۆکە چارەسەکەرەیان دەکرد. ئەرێ ئەوان دەیانتوانی بە نارنجۆکەکانیان دەمی هەموو کەسێک لە ئیسرائیل دابخەن؟ پرسیاری ڕەوان بە لەلای جوویێکی ساردەخەمی ئاڵمان و جوویێکی میزاج ئاسایی یەمەنی وەک یەک بوو.

هەر هەمان شەو ئەوەشم بینی، ئەو خەڵکە نە ڕێگە بە چەوساندنەوەی دەرەکی و نە بۆ ماوەیەکی دووردودرێژیش بواری ستەمکاریی نێوخۆ دەدا. خەڵکێکی مل ڕەقە، ئازادی لە خوێنی نێو دەمارەکانی دایە.

لە کاتێکدا دیمەنە بێویژدانەکانی شەقامی مۆگرابی بینران، ئێمە لەگەڵ نوێنەرانی ئاژانسی جوولەکان سەبارەت بە ڕێکەوتن لەنێو ڕێکخراوی جەنگیی هەر دوولا لە گەرمەی دانوستاندا بووین. دانوستاندنەکان لە ناوەڕاستی دیسێمبەردا دەستیان پێکرد و بۆ ماوەی دوو مانگ درێژەیان کێشا. جەنابی ئیسحاق گرەنباویش دەستپێشخەرێکی بەرایی بوو. بەدەر لە بەڕێز گرەنباوم، موشێ شاپیرۆ کە پارێزەرێکی بەتین و تاوی ڕێکەوتنامەکە بوو، رابی فیشەرمان (کە تەنها پێشتر یەکجار دیبووم، کاتێک من کوڕێکی دە ساڵان بووم، سەردانی قوتابخانەی بریکسی کردبوو، بەخێرهاتنم لێکردبوو)؛ بەڕێز داڤید ڕێمز، سەرکردەی ماپای و هیستادروت، ئەو کەسەی لە بەرهەڵستی جەنابی بنگۆریۆندا بە چاکەی ڕێککەوتنەکە قاچی لە زەوی گیرکردبوو؛ بەڕێز پینکەس، یەکێ لە سەرکردەکانی (میزراحی) کە لە ماڵە مێواندۆستییەکەیدا گفتوگۆ بەراییەکان کران،؛ لەگەڵ گەورە راباین د. لویس رابینۆویتز لە باشووری ئەفریقاوە، ئەوەی لە ڕۆژە گرژەکانی "فەندی ئاسنین" و گۆڕەپانی مۆگرابیدا گەیشتنەوە وڵات. ئاڤراهام، شمۆئیل و منیش نوێنەرایەتی ئیرگونمان دەکرد.

هەموو دانوستاندنەکانیش لە بەرپرسیارێتییە قورسەکەیان لێوانلێو بوون. ڕۆژانە هێرش و پەلاماری عەرەبەکان پتر دەبوو. لەو قۆناخەدا، ئەوەش ڕاستبوو، کە هێشتا ئاژانسی جوولەکان دڵنیا نەبوون لە هەبوونی "نەخشەی بەریتانییەکان." هەرچەندە زۆریش زوو بۆیان دەرکەوت، هەڵوێستەکەمان تا ڕادەیەک بەقاودەقی ڕاست بوو. لەو وادەنامەیەی بڕیارەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە 29ی نۆڤێمبەردا دابووی، خەریکبوو بەند بەبەند بەلاوە

دەندرا. هیچ بەندەرێک لە ڕۆژی 1ی فێبرایری 1948دا نەکرایەوە، چونکە حکوومەتی بەریتانی بواری پێنەدا. "ئەنجوومەنی کاتی حکوومەت"ی "دوو دەوڵەتی سەربەخۆ" بە گوێرەی کۆمیتەی جێبەجێکاری (ر.ن.ی) کە دەبوایە بەر لە 1ی ئەپریل بهاتبا کایە، دانەمەزرا، چونکە عەرەبەکان لەسەر ڕاوێژی نوێنەرانی بەریتانیا ڕەتیان کردوە دەستوورنامەیەک بۆ ئەنجوومەنێکی وا دابندرێ، لەبەر ئەوەش حکوومەتی بەریتانیا بڕیاریدابوو کە کۆمیتەیەکی جێبەجێکاری وا لە ئێرتز ئیسرائیلدا نەیەتە کایە. ئاژانسی جووەکانیش دوای ماوەیەکی درێژ دەرکیان بەوە کرد، کە یوشیف(کۆمەڵگەی جوو) نەدەما گەر -وەک ڕۆژنامەی هیروتی ژێرزەمین وای دەقرێژکردبوو- "ئاسنو پۆلای خۆمان نەرم نەکەین، هێزەکانمان یەک نەخەین و بەخۆمان لەپێناو ئایندەمان قۆڵی مەردانەی لێ هەڵنەماڵین."

هەرچەندە هەڵمەتی ڕاوەدونانی و ناوزڕاندی لایەنە سیاسییەکان دژی ئیرگون باڵی بەسەر کەشوهەوای دانوستاندنەکاندا کێشابوو، کەچی ئێمە لە درێژکردنی دەستی تۆقە بۆ نەیارەکانمان، دوودڵ نەبووین. بۆ ئێمە شتێکی چارەنووسساز بوو، بەرەیەکی بەرخودانی یەکگرتوو پێکبێ. وێڕای ئەوەش لە ناوەڕاستی یانیوەردا، گەفی لەبارچوونی دانوستانەکان و جێگرتنەوەی بە ململانێیەکی کوشندە لەپێش بوو. یەدیدا سیگال، یەکێ لە باشترین ئەفسەرەکانمان لە حەیفا لە لایەن یەکەیەکی هاگاناوە ڕفێندرا.

یەدیدا کوڕی ماڵباتێکی پێشەنگ[109] کە تیایدا تێکەڵە پێکهاتەیەکی ئەریستۆکراسی بە بڕوایەکی ئۆلییانە و دڵسۆز بۆ خەباتی ئازادی بوو، ڕفێندرا. ئەمەش دوای چاردەڕۆژ لەوەی بەرپرسی هاگان بەخۆی بەڵێنی بە ئەندامانی دانوسانکارەکانی ئاژانسی جووەکان دابوو، کە هیچ ڕفاندنێک لەئارادا نامێنێ. ئەم بەڵێنەش بەڕێزان گرەنباوم و شاپیرۆ دوابەدوای یەکەمین کردەی ڕفاندن بە ئێمەیان دابوو.

بەگوێرەی هۆشدارینامەکەشمان، ئەندامەکانمان دەستیان کردەوە. ئەوانیش بەرپرسی هەواڵگری هاگانایین لە حەیفا گرت. هەموو کۆششی هاگانا بۆ دۆزینەوەی ئەندامەکەیان بەفیڕۆچوو بوو.

---

[109] پێشەنگ، مەبەست لەوکەسە بەرایییانەبوون کە لە هەندەرانەوە بەرەو فەلەستین و بۆ خزمەتی زایۆنیزم گەڕابوونەوە. وەرگێڕ.

له12ی یانیوەریشـدا، ئـامۆنی فەرمانـدە لە حەیفـا، نـامەیەکی لە فەرمانـدەی خۆجێی هاگانا سەبارەت بە گۆڕینەوەی دیلەکان پێگەیشت. ئامۆنیش قایلبوو. پیاوە هەواڵگرەکەی هاگانـا ئازاد کرا و ڕاپۆرتی خـۆی بـۆ سـەرووی خـۆی بەرزکـردەوە، کە بە شـێوەیەکی جـوان ڕەفتـاری لەگەڵـدا کـراوە. یەکـێ لە ئەندامانی ئیرگونی دەستبەسەر لای هاگانا ئازاد بوو، گەڕایەوە ماڵی خـۆی. بەگوێرەی هاگانا دووهەمین گیراوی بەردەستیشیان ئازاد کرابوو. بەڵام ئەو نە گەڕابۆوە بنکەکەی نە مـاڵی خۆیشی. بە ڕاستیش ئەو هەرگیـز نەگەڕایەوە. پیـاوەکەش یەدیـدا سـیگال بـوو. تەرمەکەی لە گونـدێکی عەرەب لە تیـرێ بە مەودایەکی دوور لەو شوێنەی لێرفێندرابوو، دۆزرایەوە.

دایکی، نابەڵەد بە چارەنووسەکەی هەر بەدوایدا دەگەڕا. بۆ مـاوەی سـێ ڕۆژ لە کارمەندێکی گشتییەوە بۆ ئەوی دیکە، لە فەرمانـدەیەکی هاگانـاوە بـۆ لای ئەوی دیـکە بەدوای سەروسـۆراغی کوڕەکەیـدا وێـڵ بـوو. هەمـووان پێیـان گوتبـوو گـوایە یـدیا ئـازادکراوە؛ بەڵام پێشـیان نەگوتبـوو ئـاخۆ بـۆچی نەگەڕاوەتەوە ماڵ.

تەنها لە 16ی یانیوەریدا هاگانا بڵاونامەیەکی "ڕوونکردنەوەی" دا، کەوا یەدیـا لە گرتووخـانەکەی هەڵاتـووە و لە ئـاوایی تیـریش بە دەسـتی عەرەبەکـان کوژراوە.

ئـێمە دیسـان لە بەردەم دوڕیانێکـدا بـووین. ئـێمە هێشـتا وردەکـاری بکوژەکەیمـان نەدەزانـی. بـانگەوازی تـۆڵەکردنەوەش گشـتیی بـوو. ئیـدی لە هیکەوە خۆمان —هەر هەموومان- لەسەر لێواری دۆزەخ دیتەوە. ئاخر گەلی جـوولەکە لەپێنـاوی مـانەوەی خـۆی دەجەنگـا. هەمـوو ڕۆژێـک بـاجێکی قورستری قوربانییەکانی بۆ دەهاتەوە. ئایا قەدەر وا دەکەوێتەوە کە براکـان وەرچەرخێن و یەکدی بکوژن؟

***دایکە ئازاکە بەهانامانەوە هات. پێیگوتین، "نامەوێ خوێنڕژانی کوڕەکەم ببێتە هۆی براکوژی."***

دیسان ئێمە لەسەر خەرەندی لێقەومان، بازنە تراژیدیەکە، کە نۆزدە سەدە پێشتر نێوچەوانی ئۆرشەلیمی گەمارۆدراوی مۆرکردبوو، گەڕاینەوە.

بەڵام بە سـەرکردەکانی ئاژانسـی جووەکانمـان ڕاگەیانـد، کە ئـێمە لەسـەر پێواژۆی دانوستاندنەکان نـاڕۆین تـا کۆمیتەیەکی بەدواداچوونی ئاشکرا بـۆ

بەرپرسیارێتی بکوژەکە پێک نەیەت. لەسەر داوامان، کۆمیتەیەکی لەو جۆرە لە رابی فیشەرمان، بەڕێز گرەنباوم و شاپیرۆ پێکهات.
ئەوان زۆر بەخاوی کاریان دەکرد. چوار مانگ دواتر، لە 15ی ئایاری 1948دا، هێشتا نەگەیشتبوونە دوا دەرەنجام. لەگەڵ دەستپێکردنی لەشکرکێشییەکەی عەرەبیش، بەڕێز گرەنباوم لە ئۆرشەلیمدا مایەوە و کاروباری کۆمیتەکەش هەڵپەسێردرا. ئەوە بوو تەنها لە کۆتایی حوزەیراندا گرەنباوم تەلەفوونی بۆ کردین، بەگوێرەی رای تایبەتیانەی خۆی هاگانا یدیدا سیگالی نەکوشتووە.

## بەندی 28
## ڕێککەوتنەکە
٥١٢ - ٥٠٨

بە دامەزراندنی کۆمیتەیەکی لێپێچینەوە، دانوستاندەکانمان لەگەڵ ئاژانسی جووەکان دەستپێکردەوە. ئاستەنگە کردەییەکان لە هی دەروونییەکان، سەختر نەبوون.
ئێمە دەمانتوانی دوو بەرە ببینین نەوەک یەک. ئامانجی سەرەکی یاخیبوونەکەمان - نەمانی دەسەڵاتی بەریتانی و دەرچوونی سووپای داگیرکەر- لە سەروبەندی ئەوەدا بوو بێتە دی. بەڵام کتومت لەو ساتەدا، هێزە بەریتانییەکان ڕکێفی خۆیان لە دەستدابوو. پەلامارەکان دەگمەن نەبوون. ئێمەش دەستمان کردەوە، تۆڵەی ئەو گەلە کوشتارە بە ئەنقەستەی سەر مەدەنییەکانمان کردەوە کە بە تەقینەوە لە شەقامی بێن یەهودا ڕوویدابوو. ئێمە ئەگەری مەترسیێکی کوشندە-سیاسیانە-مان لەو سەربازانە دەبینییەوە، کە بە جەڵەو لە دەستدەرچوون دەڕۆیشتنەوە. وەک دەرهاوێشتەیەکیش، ئێمە تۆڵەکردنەوەی هەموو هێرشێکمان بە بنەما گرتبوو.
ئێمە بەوەش قایلبووین، کە سەربازەکانمان لەژێر فەرماندەیی ڕاستەوخۆی ئەفسەرەکانی خۆجێی هاگاناوە بەردەوام بچنە ریزی سەنگەر و چەپەرەکانی بەرگریی. بەڵام ئەوەمان پێ قبوڵ نەدەکرا بە بەرچاوی ئێمەوە هێزەکانی بەریتانی بێن و جوولەکەیەک چەک بکەن. هاگانا لەسەر سیاسەتی خۆی، بەوەی چەکەکان بداتە بەریتانیا بۆ ماوەی شەش مانگ بەردەوام بوو. لە سەرەتای هێرش و پەلاماری عەرەبەکانەوە تا نەمانی بەڕێوبەرایەتی بەریتانییەکان، بە سەدان چەک لە لایەن بەریتانییەکان لە ئەندامانی هاگاناوە وەرگیرانەوە. هێزەکانی بەریتانی هەشت ئەندامی هاگانایان کە لە وێستگەی کارخانەی هایۆستیک لەنزیک تەلئەبیب جێگیرببوون، چەککردن؛ ئیدی هەر لەوێ بە دەستی بەتاڵ بەرامبەر بە پەلاماری عەرەبەکانیان جێهێشتن، هەر زووش هەر هەموویان کوشتن. ڕووداوگەلی هاوشێوەش لە ئۆرشەلیم و چەند جێگایەکی دیکەدا قەومان.

ئەوەش مایەی بیرلێکردنەوە نەبوو کە پیاوەکانمان خۆبەخشانە چەکەکانی خۆیان بەدەستەوە بدەن. لە چەند ڕووداوێکدا، پیاوەکانمان چەکەکانیان بەر لەوەی هێزی پشکنینیان بگاتە سەر دەشاردنەوە. جارێکیشیان مێزەکەیان هەڵگێڕایەوە و چەند تفەنگ و ڕەشاشی بەریتانییان برد، کە لە بنەڕەتدا بۆ چەککردنی پیاوەکانمان هاتبوون. ئێمە لە ئەزموونی خۆمانەوە دەمانزانی دەسەڵاتدارانی بەریتانی پەییان بەوەبردبوو، چەککردنی جوو بە گوللە و خوێن وەڵام دەدرێتەوە، ئەوسا ئەو ئاڵوگۆڕە زیانبەخشەیەیان فەرامۆش کرد. بۆیە وامان کرد کە هاگاناش سیاسەتەکەی خۆی بگۆڕێ فەرمانی بەرهەڵستی بۆ ئەندامەکانی دەربکا. ئەرێ -ئێمە پرسیمان- بنەماکانی بەرگری چیان لێ بەسەر هات؟ بەڵام خۆ نە وەڵام و نە گۆڕانکاری لە هەڵوێستیان تا ئێوارەی بەر لە لەشکرکێشی عەرەبەکان ڕوینەدا. هەرچەندە ئێمە ڕاشکاوانە دەمانگوت، دەبێ سەربازانی هاگانا بەرەنگاری هەر هەوڵێکی بەریتانی بدەنەوە کە بیانەوێ چەکیان بکەن.
بەهەمان شێوەش، هەروەک لە ڕۆژگاری بزووتنەوەی بەرگریدا، سووربووین لەسەر ئەو بنەمایەی تا بکرێ دەست بەسەر چەکی بەریتانی بگرین. ئێمە دەمانزانی لەگەڵ واژۆکردنی ڕێککەوتنەکە و گفتوگۆ بەوەی دان بە هێزەکانی ئیرگوندا بندرێ، دەستمان بە فەندی گشتی چ بۆ چەک چ بۆ پارە بۆ کڕینی چەک نەدەکەوت. بۆیە داوامانکرد، بەلای کەمییەوە ئازادبین کە دەست بەسەر چەکی سووپای داگیرکەردا بگرین.
پرسی چوونەڕیزی خەبات دژی دەستدرێژکاری عەرەبەکان بارودۆخی قورسی سەرشانی سوکنەکردین. هاگاناش چووە بنباری بنەمای بەرگریێکی هەڵمەتبەرانە، ئێمەش سیستمی جوڵانەوەی بەرگریمان سەلماند، کە بەهۆیەوە پێمان لەوەنا نەخشەی ئۆپەراسیۆنەکە و جێبەجێکردنی لە لایەن فەرماندەیی هاگانەوە پەسەند بکرێ.
لەژێر ئەم سەرهێڵانە و دوای دانوستانێکی وەڕەز، ڕێککەوتن لەنێوان ئاژانسی جووەکان وەک دەسەڵاتی سەرووی هاگانا و ئیرگون زڤای لیومی بەسترا. ڕۆژنامەی هائارێتز ڕاپۆرتی خۆی دا، کاتێک واژۆکەی سەر ڕێککەوتننامەکە ئاشکرا کرا، پێکی یەکێتی بەرخودان لە سەرتاسەری وڵات هەڵدرا.

له ڕێککەوتنی نێوان هاگان و ئیرگون زڤای لیومیدا مەرجی نهێنی هەبوون:
1- خاڵە بەرگرییەکانی ئیرگون دەبێ بکەونە ژێر فەرمانده‌ی هاگاناوە، کە فەرمانەکان لە ڕێی ئەفسەرێک کە لە لایەن ئیرگونەوە دیار کرابێ، دەگەیەنرێ.
2- پلانی پەلامارەکان بۆ سەر (a)بەرەی عەرەب و نەخشەکانی (b) تۆڵەکردنەوە لە بەریتانییەکان دەبێ پێشتر پەسەندنامەی هاگانای لەسەر بدرێ. وردەکاریەکانی پەیوەست بە بابەتەکە و کاتبەندیی لە کۆبوونەوەی نوێنەران و شارەزا تەکنیکیەکانەوە تاوتوێ دەکرێ. وێڕای ئەوە، ئیرگون دەبێ ئامادەبێ ئەو نەخشانەی واژۆ کراون، جێبەجێ بکا.
3- بە بنەما ئەندامانی ئیرگون پابەندن بە ڕەتکردنەوەی هەر هەوڵێکی چەککردنیان. لە هەلومەرجی تایبەتیشدا ئەندامانی ئیرگون لە خاڵەکانی بەرگرییەوە دەبێ ئاگایان لە ڕەوشی خاڵە نزیکەکانی خۆیان بێ کە گاهانای تێدایە.
4- هیچ ئۆپەراسیۆنیک بۆ دەستبەسەرداگرتنی پارە لەو ناوچانەدا ناکرێ کە لە لایەن پۆلیسی جووەوە چاودێری دەکرێ. لە سەرێکی دیکەشەوە، ئیرگون نابێ ڕێ نە کۆکردنەوەی باربوی ئازادانە بگرێ و دامودەزگا نیشتمانییەکان دەبێ لە دەرەوە و ناوەوەی وڵاتدا ئەوە بسەلمێنن کە ئیرگون لە هەڵمەتی باربوی گشتییەوە بۆ داخوازی ئاسایشی گشتییەوە هیچی بۆ تەرخان نەکرێ.
5- نەخشەی چەک گرتن(دەستبەسەرچەکدا گرتن) دەبێ بەڕاوێژ بێ و جێبەجێکردنەکەشی به ڕێکەوتنی دوولایەنە بێ.
6- لەبنەمادا ڕێککەوتنەکە دەکەوێتە بنباری ڕوونکردنەوەی وردەکارییەکان بەر لەوەی بکەوێتە بواری جێبەجێکردنەوە. نوێنەران و شارەزایان وردەکارییەکان ڕوون دەکەنەوە.
"پیاوە هەرە گرنگەکان" خاترمەندی ئامۆژگاریەکەی ژەنەڕال مارشال بوون بەوەی لەبری حکوومەتێکی جوو "پلانی ڕاسپاردەیی" رابگەیەنن. جەنابی بنگۆریۆن کە مەیلی لەسەر دامەزراندنی حکوومەتێکی جوولەکە بوو، ڕووبەڕووی ئاستەنگەکانی نێو پارتەکەی(ماپای) بووەوە .
ئێمەش بڕیارماندا سەنگی خۆمان لە مەحەک بدەین. ئێمە بێباک بووین لەوەی کێ ببێتە سەرۆکی حکوومەت و چۆنیش پێکبێ. تا ڕادەیەک ڕۆژانە جارمان

دەدا: "حکـوومەتی عیبـری هەر سـەرهەڵدەدا، تەنـانەت گەر سـەرکردایەتی فەرمیش داینەمەزرێنێ بەڵام هەر دێتە بوون."

ئیدی هەر لەو ڕۆژە چارەنووسسازانەدا بوو، کە بەڕێز ئێلیازەر لیبینسـتاین، یەکێک لە یاریدەدەرەکانی جەنابی بنگۆریۆن هاتە لام. پێیڕاگەیاندم، جەنابی بنگۆریـۆن "پێزانینـی زۆری" بـۆ ڕاگەیانـدنامەی داخوازیمـان بـۆ دامەزرانـدنی حکوومەتی جوو هەیە؛ ئەوەش یارمەتی دەدا بەسەر ئەو فشارانەی لە هەموو لایەکەوە بـۆی دێـن، زاڵ بـێ. بەڵام داواشـی لێکـردین کە لە لێـدوانەکانی ئایندەماندا لەسەر خاڵە **ئەرێنییەکە** سووربین بەوەی، کە حکوومەتەکە پێکهات بە هەموو توانایەکەوە پشتگیری بکەین.

منـیش بـێ دوودڵـی چـوومە ریـزی داخـوازییەکە. پـاش چەنـد ڕۆژێـک لەو گفتوگۆیەدا، ئێمە ئەم لێدوانەمان بڵاوکردەوە:

"بە دڵنیـاییەوە حکـوومەتی عیبـری پێکدێ. هـیچ "لەوانەیەکیش" لەگۆڕێدا نیە. هەر پێکـدێ. ئەگەر سـەرکردە فەرمییەکـان دایانمەزرانـد، ***ئـێمە بە هەمـوو هێزێکەوە پشتگیری دەکەین***. بەڵام ئەگەر ئەوان خۆ بەدەست هەڕەشەکانەوە بـدەن یـاخود ڕێبەخۆیـان بـدەن هەڵبخەڵەتێنـدرێن، پاڵپشـتی هێـزی ئـێمە و زۆریـنەی لاوانـی جەنگـاوەر دەچێـتە پـاڵ حکـوومەتی ئـازاد کە لە قـوڵایی ژێرزەمینییەوە سـەرهەڵدەدا و دەبێتە ڕێبەری گەل بۆ سەرکەوتن لە جەنگی ڕزگارییاندا."

ئەم لێدوانەی ئیرگون زڤای لیومی لە بەرایی ئایاری 1948دا بڵاوکرایەوە.

## بەندی 29
## گرتنی یافا

٥٤٩ - ٥١٢

لەو مانگـــانەی پـــێش لەشکرکێشـــی عەرەب و لە کاتێکـــدا پێـــنج دەوڵەت (میسر،عێراق، سوریا، لوبنان و ڕۆژهەلاتی ئوردن) خۆیان بۆ دەستدرێژی و هەڵکوتانەسەرمان ئامادە دەکرد، ئێمە بەردەوامبووین لەسەر کشان بەرەو ناوچە عەرەبییەکان. لە ڕۆژە بەراییەکانی 1948دا، هەرچەندە هێشتا هەر بەس نەبوو، لێ ئێمە ئەو شتەمان بۆ ئەفسەر و پیاوەکانمان ڕوون کردنەوە. پەلامارەکانی لەو جۆرە کە لە لایەن هەر هێزێکی جووەوە بکرێ، بە ڕاستی بایەخێکی دەروونی مەزنی دەبێ؛ باندۆری سەربازیانەیان کە مەدای بەرەی عەرەب فراوان دەکا و دوژمن ناچار دەکا, بکەوێتە باری بەرگرییەوە، بێ بایەخ نەبوو. لێ گەلۆ ، ئەوە بۆ ئێمە ڕوون و ئاشکرا بوو، کە ئەو کشان و ڕۆچوونە مەزنانەش کە لە لایەن هێزەکانی پارتیزانیەوە دەکران، نەیاندەتوانی بڕیاردەری دۆزەکە بن. هیوامان بەند بوو بە دەستبەسەرداگرتن و بە دەستهێنانی هەرێمەوە.

لە کۆتایی یانیوەری 1948دا، لە کۆبوونەوەی فەرماندەیی ئێرگوندا، کە تیایدا هۆبەی پلاندانانیش بەشداربوو هێڵمان بەژێر چوار بابەتی ستراتیژیدا کێشا: (1) ئۆرشەلیم؛ (2) یافا؛ (3) دەشتی لیدا –ڕامەللا (4) سێگۆشەکە[110].

دەمانزانی بەدیهێنانی ئەو ئامانجە بەرچاوانەمان بەند بوو بە زۆر هۆکار، بەڵام بە شێوەیەکی سەرەکی دەکەوتە سەر بەهێزی و چەکی پیاوەکانمان نەخاسمە ئەوەی لە بەردەستماندا بوو. لە دەرهاوێشتەشدا بڕیارماندا وەک "جێگرەوە" سەیری پلانەکان بکەین: ئێمە دەبێ ئەوە بکەین کە پێمان هەڵدەسوڕێ. وەک رووشیدا، لەو چوار بەشە ستراتیژیەی دامانڕشتبوو، تەنها خاڵی دووهەممان بە تەواوعەیاری جێبەجێکرد.

[110] بمگشتی ناوێک بوو بۆ نمو ناوچە عمرەب نشینیەی دمکموتە ناوجمرگەی ڕۆژئاوای ئێرتز ئیسرائیل کە وەک سێگۆشمیمک همڵدمکموت و خاڵە سمرەکییمکانیشی شارمکانی نابلس، جمنین و توللکمرم بوون، کە ناوچە نابیابانمکانی ڕۆژئاوای نوردنیشی لمخۆدمگرت، کە لە دەرموەی دەوڵمتی ئیسرائیل بوو.

لە بەشی یەکەم و سێهەمیشدا توانیمان سەرکەوتنی مەزن لە گۆڕەپانی جەنگدا بەدی بێنین، بەڵام نەگەیشتینە سەرکەوتنی یەکجارەکی.
هەرچی دەربارەی چوارەم بەشی ستراتیژیەکەشمان بوو، هەرگیز ئەو دەرفەتەمان پێنەدرا کە هەر لە سەرەتاوە نەخشەی ئۆپەراسیۆنەکەی بۆ دابنێین. هەرچەندە کردەی دەستبەسەرداگرتنی یافا وەک ڕووداوێکی گرنگی پلە یەک لە خەباتی سەربەخۆیانەی عیبریدا خۆی نواند.
لەو کاتەی بڕیاری "ستراتیژی دەستبەسەرداگرتنەکەمان" دا، بایی پێویستیش چەکمان بۆ هیچ ئۆپەراسیۆنێکی ستراتیژی لەبەردەستدا نەبوو. لە فیبرایر و مارتدا ئێمە هیچ بڕە تەقەمەنییکمان لەبەردەستدا نەبوو، کەچی لە ئەپریلدا توانیمان لە کارخانەکانمان چەندان تەن مادەی زۆر هێزدار و کاریگەر پەیدا بکەین. لە مارتدا تەنها ژمارەیەکی کەمی (نابەرچاو)ی ڕەشاشمان هەبوون، بەڵام لە ئەپریلدا لە دوو هەڵمەتی دەستبەسەرداگرتندا توانیمان کەلێن و کەموکورتیەکانی یەکەکانمانی پێ پڕ بکەینەوە. لەو کاتەشدا توانای ئاگری هاوەنەکانمان لەوەی هاگانا هەیبوو، پتر کردبوو.
لە 4ی ئەپریلی 1948دا گیدی لەژێر فەرماندەیی ڕاستەوخۆی یۆشوادا سەرکرایەتی هەڵمەتێکی یەکەی هەڵمەتبەری بۆ سەر سەربازگەی بەریتانی ژمارە 80ی لە نزیک (پاردێس هاننا)وە کرد، کە تۆپخانەی تانکشکێنی لێ دامەزرابوو. ئەم پەرەسەندنەی بەدوای ئەو پەلامارەدا هات، کە گرتنی هەنگێکی تۆپخانەی بەریتانی و ژمارەیەکی بەرامبەر بە سەدان کەس بوو، زۆر مەزن بوو.
هەر زووش هەموو سەربازگەکە تۆپخانەی تانکشکێن بە تەواوی تاقمەکەیەوە کەوتنە بەردەستمان.
دەستبەجێش جبەخانەکە کرایەوە و کردەی بارکردن دەستپێکرد. لەوێدا تفەنگ، ڕەشاش، ڕەشاشی برێن، چەکی تانکشکێن و فیشەک هەبوون و بارکران. بەڵام لەو ئانوساتەدا و لە پڕێکەوە دوژمن لە دەرەوەی سەربازگەکەوە دژەهێرشی کردەوە. دژەهێرشەکەیان بە پاڵپشتی زرێپۆشێک بوو، کە خەریک بوو بەرەو ناوەڕاستی ستوونی بەرگریەکەمان دەهات. مەترسییەکە زۆر کوشندەبوو، هێشتاش ئەنجامەکەی دوورەدەست بوو. خۆ ئەگەر ئەو هێڵە کەمەرەییە پاڵپشتیەیان تێکبشکاندبا، دەکرا هەموو

ئۆپەراسیۆنەکە لەبارچووبا و هەموو ئەوانەی لە هەڵمەتەکەشدا بەشداربوون، بگیرابان. لێ گەلۆ، پیاوێک، بەڵێ جاکسۆنی بوێر، کە زۆر جاران ئەکسێنتە سکۆتلەندییەکەی بۆ کەڵک وەرگرتن بەکاردەهێنا، ڕەوشەکەی ڕزگار کرد. ئەو خۆی فڕێدایە لایەکی زرێپۆشەکە و بە تەقینەوەی دەستی دەرگاکەی کردەوە، ئەوسا دەستی بەسەر زرێپۆشەکە و تاقمەکەیدا گرت، بەمە زرێپۆشێکی دیکەشی بۆ ئێرگون پەیداکرد. هەرچەندە لەو کاتیشدا هێزێکی دوژمنی گەورەی پاڵپشت بە تفەنگ و ڕەشاشەوە بە هانای سەربازگە گیراوەکەدا هاتن و هێزەکەی ئێمەش بە چەکی قورسەوە بەرەنگاریان بوونەوە. وێڕای ئەوەی تەقەکردنەکەش کوێرانە بوو، لێ پیاوەکانمان توانیان (تانکی ***شێرمان***) پەکبخەن. بەرامبەرەکانمان کۆلۆنێلێک و حەفت پیاوی دیکەیان لێکوژران و چەندان برینداریشیان هەبوو. زیانەکانی ئێمەش کوژراوێک و چەند بریندار بوون. لە کاتێکدا شەڕەکە لەوپەڕی گەرمیدا بوو، کردەی چەک بارکردن بەردەوام بوو. بارەکەش زۆر بایەخدار بوو، بەتایبەتی تفەنگ و ڕەشاشی برێن و فیشەکەکان. هەروەها چەند گوللە هاوەنێکی تانکبڕیشی لێبوو، دواتر لە چالاکی بەرەی یافا دژی تانک‌کانیان بەکارهێندران. ئای ئەگەر چەند دانەیەکی زیاترمان دەبوو...

دوو هەفتە دواتر، دیسان سەری ناوچەی پارادێس هانمان دایەوە. ئەمجارەیان مەبەستی گیدی بارە قەتارە فیشەکێکی بەریتانی بوو، کە لە حەیفاوە ڕێگای خۆی بەرەو سێگۆشەکە دەبڕی، قەتارەکە چەندان تۆن لە چەک و فیشەکی نازداری هەڵگرتبوو بۆ شێخە مێزەربەسەرە چەکدارەکانی عەرەب دەڕۆیشت. لێ قەتارەکە نەگەیشتە شوێنی مەبەست. لە دوای 41ی کیۆمەتر لەنێوان هادێرا و بینیامینیادا راگیرا؛ لەچاوی ئەوە برێکی باشی گوللە و تەقەمەنیمان دەستکەوت، کە چارەنووسی گرتنی یافای یەکلاکردەوە. بەڵام خۆ ئۆپەراسیۆنەکە شتێکی ئاسان نەبوو.

بنەتەقەیەکی سووک، وا خەمڵێندرابوو هەر بۆ وەستاندنی قەتارەکە بێ، نەوەک بۆ تێکشکاندن و خاپوورکردنی، لەو شوێنە داندرابوو کە یەکەی هەڵمەتبەرمان لەوێوە لە بۆسەدا بوو. مەزندەکردنەکە کتومت وەک خۆی هاتەوە. قەتارەکە هەژا، بەڵام لەوە زیاتر نا. ئیدی وەستا. پیاوەکانیشمان بازیان بۆ دا.

بەڵام خۆ وەستاندنی قەتارێک ئاسانتر بوو لەوەی دەستی بەسەردا بگری. لە خولەکەکانی بەراییدا شێلکە هاوەنێک ترومبێلە رادیۆکەمانی بۆمباباران کرد، چەندان پیاوی لێ بریندار کردین و پەیوەندیشی بە هێزەکانی ئەو ناوەمان پچڕاند. پیاوەکانیش وەڵامی تەقەکانیان بە تەقە دایەوە، بەڵام هیچیان پێ لەگەڵ زرێپۆشەکەی دوژمن نەکرا. ئاخر بەرامبەرەکانمان لە ئێمە بەتواناتر و چەکدراتر بوون. ئەوان لەپشت دیوارە بەرگرییەکی بەرزو قایمدا بوون، هەرچی ئەوانەی ئێمەش بوون بە تەواوی لەو دەشتەدابوون، تەواو بەرەو گوللەی دوژمن کراوە بوون.

دووبارە هەوڵی بازدانە نێو قەتارەکە شکێندرا. لەو نێوەشدا ئێمە چەکە هەرە بایەخدارەکەمان لە دەست دەدا. لەو نزیکانەش مۆڵگەیەکی سەربازی بەریتانی هەبوو. دەکرا بە زووی هێزی پاڵپشتیان بگاتێ، ئیدی لە هەموو لایەکەوە ئابڵوقە بدا و باڵادەستیتی خۆی بسەلمێنێ. خەریکبوو هەموو شتێک لە دەست بدرێ.

لێ گەلۆ، خۆ گیدی کەسێک نەبوو لێبگەڕێ ئەو بارە چەکە نازدارەی سەر قەتارەکە بە ئاسانی لە دەست دەربچێ. ئاخر چۆن دەبێ دەرفەتێکی بەهاداری وا بەفیڕۆ بدرێ! کاتێک لەسەر زگ لە دەوری پیاوەکاندا خشا، بۆ مایەی سەرسامی، بینی دەستەیەک لە پیاوەکانی، سەربازێکی بەریتانیان گرتووە. دیاربوو لەگەڵ تەقینەوەکە خۆی لە قەتارەکە فڕێدابوو، بەم جۆرە کەوتبووە دەست پیاوەکانمان. بروسکەئاسا بیرێک بەمێشکی گیدیدا هات: ئەو تۆمییە[111] دەکرێ لە دەستبەسەرداگرتنی قەتارەکەدا کۆمەکمان بکا.

"ئێمە تۆ ئازاد دەکەین،" گیدی وای بە تۆمی گوت. "بڕۆ بگەڕێوە لای ئەفسەرەکەت و پێیبڵێ کەوا هێزی شەرکەری ئیرگون زڤای لیومی لە هەموو لایەکەوە ئابڵوقەی قەتارەکەی داوە. پێی بڵێ، پێنج خولەکی مۆڵەت دەدەم کە خۆی بەدەستەوە بدا. ئەگەر خۆی بەدەستەوە دا، هیچ ئازار نە بە ئەو نە بە پیاوەکانی ناگا. لێ ئەگەر ڕەتی کردەوە، ئەوا قەتارەکە بە سەرنشینەکانیەوە دەتەقێنینەوە. ئێمە چەکی تانکبڕمان پێیە..."

تۆمیەکە، کە هەرگیز خەونی بە ئەرکێکی ناوەندگیری "ئاشتییانە"ی وا نەدەبینی، بە پەلەپروزی گەڕایەوە نێو قەتارەکە.

[111] تۆمی واتە سەربازی ئاسایی بەریتانی. وەرگێڕ.

خولەکەکـان زوو تێـپەڕین. گیـدیش چـاوەڕێ بـوو. بەڵام هـیچ وەڵامێـک نەدرایەوە. لە هەمووشی پۆلکتر ئەوە بوو، هیچ شتێکی وای لە دەستدا نەبوو بێـدەنگییەکەی مـێجەرە بەریتـانییەکە بشـکێنێ: ئـاخر نە چەکـی تـانکبڕ و نە تەقەمەنیشی پێبوو.

گیـدی تـا سـەر چـاوەڕێی ئەوەی نەدەکـرد، وادەی هۆشـدارینامەکەی بەسـەربچێ. ئەو خـۆی ئاشـکرا کـرد، لە فـارگۆنە زرێدارەکە نزیـک بـووەوە. لەپـڕێکەوە خـۆی فرێـدایە سـەر لـمەکە. سـەربازێکی بەریتـانیش ڕاسـتەوخۆ سێرەی تفەنگی لیگرتبوو؛ گوللەکە دەرچوو، بە ئاستەم بەنێو پرچی لاسەری تێپەڕی.

ئەو شـوێنێکی سـەلامەترانەی گـرت و تـا هێـزی تێـدابوو هـاواری بەسـەردا کـردن: "گـوێم لێبگـرن! ئەوە فەرمانـدەی یەکەیەکـی ئیرگـون زڤـای لیـومییە قسـەتان بـۆ دەکـا. ئێـوە لە هەمـوو لایەکەوە گەمـارۆدراون. ئـێمە نیازمـان بارەچەکەکەی سەر پشتی شەمەندەفەرەکەیە، بەڵام ئێمە نیازمـان نییە ئـازاری کەسـتان بـدەین. لە کابینەی لێخـوڕینی شـەمەندەفەرەوکە دەرچـن و دەسـتان بەرزبـکەنەوە. ئەگەر خۆتـان بەدەسـتەوە بـدەن بە سـەلامەتی دەتـوانن بگەڕێنەوە یەکەکەتـان. بەڵام گەر هەر ملیش نەدەن، هیچ پیاوێکتـان بە سـاغی دەرنـاچێ. مـن فەرمـان بە تەقانـدنەوەی قەتـارەکە دەدەم. ئەگەر خۆتـان بە دەستەوە نەدەن، قەتارەکە دەتەقێنمەوە. ئەمەش دوا ئاگاداردکردنەوەمە."

چەکە دەروونـیەکە کـاری خـۆی کـرد. ئەفسـەر و سـەربازەکان لە فـارگۆنی قەتارەکە هاتنەدەر. گیدی ئاهێکی پێداهاتەوە.

بەڵام چوار لە پیاوەکانمان لەسەر لمەکە بەکوژراوی کەوتبوون. دیسـان ئـێمە خوێنمان لەبری ئاسن دا. لەنێو کوژراوەکانیشدا ئاڤتالیۆن بوو، ئەو کەسەی لە چـالاکییە پـارتیزانییەکەی 1944دا گیرابـوو، سـامناکانە ئەشـکەنجە درابـوو، دوای چەند ساڵێک لە زیندانمان ئازاد کردبوو.

ئیدی پیاوەکـان دەسـتیان بە داگرتن و بـارکردنەوەی بـارە فیشـەکەکە بەسـەر لۆریەکە کرد، کە لە دووری 41 کیلۆمەترەوە هێنابوومـان. ئەرکەکە ئەرکێکی درێژ بوو، خەریکیش بوو درەنگ دادەدهات.

پیاوەکانمـان هەروەک جـاران، لەو جـۆرە هەڵـومەرجەدا، بەوپەڕی جۆشـەوە دەسـتبەکاربوون. لـێ تەنـانەت لەگەڵ ئەو ورەبەرزیەشـدا نەدەکـرا ئەو چەکە

نازداره، که چەندین تەن بوو به خێراییەکی پێویست دابگرن و بار بکەنەوە.
گیدی برپاریدا پەنا بۆ کۆمەکی بەریتانیە دیلەکان ببا. گیدی بانگی سێرجینتەکەیان کرد: "دەی پیاوەکانت کۆ بکەرەوە. پێویستیم به یارمەتییه!"
مێجەریش(رائید) دردۆنگ بوو.
"ئایا تۆ دەیانکوژی؟" ئەو وای پرسی.
"خۆت گێل مەکه." گیدیش به توورەیەوە وەڵامی دایەوە، "ئێمه سەربازی عیبرین خۆ درندە نین. ئێمه دیلەکان ناکوژین. بەڵێنمان داوە ئازارتان پێنەگەیەنین. هەمیشە پیاوەکانی ئیرگون زۆای لیویمی خاوەنی قسە و بەڵێنی خۆیانن. ئازار به هیچ پیاوێکتان ناگا. تەنها دەمەوێ له کارەکه یارمەتیم بدەن."
ئیدی ئەفسەرەکه حەپەسا و ئاهێکی هاتەوەبەر. به ڕاستیش، تیمی تیمارکەری "تیرۆرستەکان" برینی برینـدارەکانی چارەکرد و یەکێکیش لەوانەی که بەسەختی بریندار کرابوو گەیاندە نەخۆشخانە. بەڵام ئەو پێیوابوو، له هەر ئانوساتێکدا بیرۆکەکەی خۆیان سەبارەت به ئەوان بگۆڕن.
بۆ ماوەی چوار سەعات سەربازە بەریتانییەکان یارمەتی پیاوەکانی ئێمەیان له داگرتن و بارکردنی چەک و فیشەکەکان له قەتارەکەوە بۆ سەر پشتی لۆریەکە دا. لەوەش زیاتر، ئەوان شانبەشانی سەربازانی ئیرگون کاریان کرد. ئەرکەکەش زۆر قورس بوو. نزیکەی بیست تەن له تەقەمەنی دەبوایە بارکرابا. گیدیش بۆ هەر سەعاتێکی کار، پێنج خولەک پشوی دەدانێ و پرتەقاڵی بەسەر سەربازەکاندا دابەش دەکرد. ئەوان ئیشێکی زەحمەت و دڵسۆزانەیان کرد. سندوق له دوای سندوق بار دەکران. لۆری له دوای لۆری فول دەکرا، تا له تەواوی کارەکەیان بوونەوە.
لۆریە بارکراوەکان ڕەوانە کران. بۆمب و هاوەنەکان به شەو شوێنی کاتییان لای سارداوەکانی شەڕابی زیخرۆف یاکۆڤ و ماڵی خانەوادەی ئارۆنسۆن[112] کرایەوە. مەڕاقبووم ئەگەر بارۆن ڕۆتشیلدی پیاوچاک و خانەدان ڕۆژێک له

[112] ئارۆن و سارا ئارانسۆن (نیلی Nili)یان گروپی هەواڵگری جوو له سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانیی پێکهێنابوو، که بەهۆیەوە کۆمەکێکی مەزنی هێزی سەربازی بەریتانییان له پلانی پەلاماردان دژی تورکەکان کردبوو. سارا ئارۆنسۆن له لایەن تورکەکان گیراو لەبن ئەشکەنجەداندا خۆی کوشت.

ڕۆژان خەونی بەوە بدیبایە، کە سەربازە عیبرییەکان لەجیاتی شەراب گوللە و هاوەن لە ڕەز و بێستانەکان بشارنەوە.
بەریتانییە دیلەکانیش ئازاد کران. هەر زووش دوای ڕووداوەکە هەموو ناوچەکە لە لایەن ئەوانەوە بۆ بە دواداگەڕانی چەکە گیراوەکەدا پشکێندرا. گەڕان و سووڕانەکەشیان بە فیڕۆ چوو. ئاکنجیەکانی بنیامینا، زیخرۆف یاکۆف و پاردێس ئارامیان نەمابوو. تۆ بڵێی باری قەدەخەکردنی هاتووچۆ ڕابگەیەندرێ؟ تۆبڵێی سزایەکی بە کۆمەڵیان بەسەردا بسەپێندرێ؟
ئەو پرسیارانە لە ئەفسەرێکی بەریتانی دیکە کرا کە سەرپەرشتی کردەی بەدواداچوونەکەی دەکرد. ئەویش وەڵامێکی خەسڵەتئامێزانەی گیان و ورەی بەریتانی دایەوە: "هیچ سزایەک لەگۆڕێدا نییە. ئەوە شەڕێکی ڕەوا بوو."
سەربازگەی ژمارە 80، تەقەمەنیەکانی سەر پشتی قەتارەکە و بەرهەمی خۆماڵیشمان لە کارخانەکانی چەکسازیماندا بوونە ئەگەری سەرکەوتنی هەڵمەتی یافا. لە ماوەی مانگی ئەپریلدا لە نەخشەی هێرشەکە بووینەوە، یەکەکان دەستنیشانکران، ئەو ڕۆژانە دەکەوتنە جەژنی قیامەت، سێ هەفتە بەر لە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل، ئێمە دەرچوین تا تەلئەبیب بپارێزین، لەوەش زیاتر تا شارەکە لە دەست خاپوورکردن ڕزگار بکەین.
پلانی پەلامارەکەی ئێمە لەو دەروازە تەنگەبەرە کە شارە سەرەکیەکەی بە گەڕەکی مانشی دەبەستەوە دەستپێکرد، ئەوێش بەرەو باکوور بوو، لەوێ وەک دورگەیەکی بەرەو تەلئەبیبی جووەکان لێهاتبوو. ئامانجی تەکتیکەمان شکاندنی "ملی بوتڵەکە"بوو تا بگەینە دەریا، بۆ ئەوەی ناوچەی مانشی لە یافا داببڕین. ئامانجە ستراتیژیەکەشمان دەستبەسەرداگرتنی یافا و ڕزگارکردنی تەلئەبیب بوو لە هەموو ئەو تفەنگە سوارکراوانەی کە سێرەیان لە دڵی دەگرت.
بەر لەوەی هێرش بکەین، تەلئەبیب تووشی سزایەکی قورس ببووەوە کە لە یافاوە بەتایبەتی لەلای گەڕەکی مانشی دەهات. لە ماوەی مانگە کەمەکانی بەرایی پشێوی عەرەبەکان، نزیکەی هەزار پیاو، ژن و منداڵی جوو لەو هێرشانەی ڕاستەوخۆ لە مزگەوتی حەسەن بەگی نزیک گەڕەکی مانشی دەکرا، کوژران و بریندار بوون. تیرهاوێژە(قەناسەکان)ی عەرەب بە ئاسانی لە زۆر شوێنی گرنگی تەلئەبیبەوە دەیانتوانی قوربانیەکانیان بپێکن،

زیادکردنی ژمارەی خاڵە بەرگرییەکانیش.ڕێگەیان لە ڕوودانی ئەو جۆرە قوربانیانە نەدەگرت. ڕۆژنامەی بیانیش دەربارەی شەڕی ڕۆتشیلد بولیڤاری نووسیبوو. یافا دادەڕسێتە تەلئەبیب. تەلئەبیبیش هەر بەرگریکار دەمێنێتەوە. هەزاران لە ڕۆڵەکانی بۆ بەرگری لە شارەکەی ڕژابوونەوە بەرەکانی پێشەوە.
لە شەوی 25ی ئەپریلدا کۆتاییمان بە بارە شەرمەزار و ترسناکەکە هێنا. لە رامات گانەوە لە سەربازگەیەک کە بەناوی دۆڤ گرەنەر، سەربازگەی دۆڤ ناونرا، یەکە جەنگییەکان هێزی خزمەتگوزاری پاڵپشت کۆبوونەوە. لە ماوەی ڕۆژەکەدا نزیکەی سەد لۆری بەو تاکە شێوازەی لەژێرزەمیندا لە سەرەتای یاخیبوونەکە بە شێوەیەکی کاتی دەستیانبەسەردا گیرابوو بەردەست بوو، کۆکرانەوە. ئەوەش ڕێگایەکی دڵخۆشکەر نەبوو. بەڵام خاوەنەکانیان بە ئەزموونی ئەوانی دیکە، دەیانزانی هەموو هەوڵێک دەدەین دوای چالاکییەکە، ماشێنەکانیان بۆ بگەڕێنینەوە، یان لە کاتێک گەر تێکبشکێ یان لە دەست بچێ، قەرەبوویان بکەینەوە. ئەوان لە سەرووی هەموو شتێکەوە، دەیانزانی، کە لۆری و باربەرەکانیان بۆ ئامانجی شەڕێکی چارەنووسساز دەبردرێن، زۆریشیان بە مەیل و خواستی خۆیان لۆریەکانیان دابوینە دەست. ئاخر چارەیەکی دیکەمان لەبەردەستدا نەبوو. بۆ پیاوانی ژێرزەمینی نەدەکرا و نە دەشوێران هەمیشە هەر هەمان لۆری و باربەر بەکاربێننەوە. تایەکان جێشوێن جێدەهێڵن. ئێمەش لە کوێ ئەو برە پارە قەبەیەمان لەبەردەستدا بوو تا ئەو هەموو لۆریە پێویستەی پێبکڕین؟
لە شەوی 25ی ئەپریلی 1948دا، کاروانە لۆرییێکی دوورودرێژ لەسەر ڕێگای تەلئەبیب-رامات گان وەستابوون، هەندێکیان لە دەسەڵاتدارە بەریتانییەکان ستێندرابوون و دەستیان بەسەرداگیرابوو، هەندێکیشی بۆ ماوەیەکی کاتی لە خاوەنە جووەکانیان وەرگیرابوون، هەندێکیش لە دۆستەکان خوازرابوونەوە. لە نزیک ڕێگای سەرەکی، لە سەربازگەی دۆڤدا، سەدان سەربازی ئیرگون چاوەڕوانی ئاماژەی جەنگ بەرپابوونیان دەکرد.
بەڵام ئاماژەکە دواخرا.
لەسەر بانی خانوویێکی بچکۆلانە کە بارەگای سەرەکی فەرماندەیی تێدا جێگیر ببوو، کۆنگرە لە ڕێکاری خۆیدا بوو. بە غاردان هەواڵی پشێوئامێز لە

شــارەکەوە دەهــات. هاگانــا وەک هەواڵهێنەکــان گوتیــان، بــاری ناکاویــان ڕاگەیانـدووە، خەریکـی خۆئامـادەکردنن کە ڕێ لە ئۆپەراسـیۆنەکەمان بگـرن. هەندێک پێشـنیازیان کـرد، ئۆپەراسـیۆنەکە بـۆ ڕۆژێـک یـان دووان دوابخـرێ. گفتوگۆکــان جــدیی و دوورودرێــژ بــوون: بەڵام لە کۆتاییــدا بڕیــار درا، هەر شەوەکەی هێرشەکە بکرێ.
لەوشەوە مەیدانەکە لە هێزی هەڵمەتبەر کە لەسـەر پێ بوو، جمەی دەهات، یەکەمین هێزی ئامادە بریتی بوو لە شـەش سـەد ئەفسـەر و پیاوی ئیرگون. ڕۆژەکـانی پەلامـاری پارتیزانـانە بەسـەر چـوو؛ ڕۆژی شـەڕی بەرەی کـراوە هاتە گۆڕێ. ژێر زەمینی بە تۆکمەیی هاتە دوان، لەوە زیاتر نا.
لەوێ ئەوان ڕیــز لە دوای ڕیــز وەســتان. یاخیبووەکــان، بە کەلــوپەلی گواستنەوەی خۆیان، بە دامودەزگای تیماری خۆیان، بە فیشـەکی مەیدانیانەی خۆیان، بەهێزی خزمەتگوزاری خۆیان، لە سەرووی هەمووشیانەوە پڕ بڕوا بەرەو مەیدانی جەنگ ڕۆیشتن. ئای چ ساتەوەختێکی مەزن بوو.
مـن لەگەڵ گیدیـدا چـوومە "گۆرەپـانەکە" کە پیاوەکـانی لێبـوون، تـا چەنـد وشـەیەکیان بەر لە هەڵگیرسـانی شـەڕەکە ئاراسـتە بـکەم. ئەوە هەشـت سـاڵ بەسـەر یەکەمـین دووانـی ئاشـکرام تێپەڕی بـوو. بەڵکو لە ژیانمـدا بـۆ یەکەم جـارم بـووبێ تیـژتێپەڕانە بە دەسـت "ترسـی لە سـەکۆی دوان" ناڵانـدبێتم.
زۆربەی پیاوەکان بەدەر لە ناو و هێما منیان نەدەناسی. منیش پێم گوتن:
"ئەی پیـاوانی ئیرگون! ئێمە بەرەو گرتنی یافا دەڕۆیـن. ئێمە بەرەو شـەڕێکی بڕیـاردەری سـەربەخۆیی ئیرتـز ئیسـرائیل هەنگـاو دەنێیـن. ئەوەی لەپـێش ئێوەدایە بیناسن، ئەوی لەدواشـتان بەجێ دەمێنێ جێری لێبکەنەوە. ئەوەی لە پێشـتان دایە دوژمنێکـی دڕنـدەیە کە بـۆ تێکوپێکشـکاندنتان هـاتوتە سـەرپێ. ئەوەی لەدواشـتانە دایبـاب، خوشـک و بـرا و منـداڵەکانن. قەپـۆزی دوژمـن بشکێنن. سێرەی نیشـانەتان ڕاست بێ. دەست بە فیشـەکەکانتانەوە بگرن. لە جەنگدا، ایخۆشبوونێک بەرامبەر دوژمن مەنوێنن، کە ئەو بەرامبەر گەلەکەمان نـانوێنێ. بەڵام ئاگاتــان لە ژن و منــداڵەکان بــێ، دەســتیان بــۆ مەبەن. هەر کەسێک دەستی خۆبەدەستەوەدان بەرز بکاتەوە، ژیـانی بپارێزن. ئێوە نـابێ ئازاریـان بـدەن. مـلازم گیـدون سـەرکردەی هەڵمەتەکەتـانە. ئێوە تەنهـا یەک ئاراستەتان لە بەردەمدایە، ئەویش بۆ پێشەوە ڕۆیشتنە."

گیدیش ڕێنماییەکانی خۆی بۆ دان. ئەویش بە شێوەیەکی تایبەت لەسەر دەست بە فیشەکەوەگرتن ڕشت بوو، کە ئێمە هەرگیز بایی پێویست نەمان بوو. ڕیز لە دوای ریز پیاوەکان بە بێدەنگی رژانە سەر ڕێگای سەرەکی.
ئەو کاروانە دوورودرێژەی لۆرییەکان بەرەو تەلئەبیب بەڕێکەوت تا لەوێش بە ئاراستەی یافا ڕێچکەی خۆی بگرێ. ئێمە لە سێباری(سێیەکی) شەودا گەیشتینە تەلئەبیب. ئەو جادە تەسکانەی بەرەو یافا دەچوون چۆڵ و هۆڵ بوون. لەو خانووە وێرانەیەی قوتابخانەی هاوپەیمانان بارەگای سووپاسالاریی خۆمان لێداکوتا. لە خەستەخانە چۆڵکراوەکەی فرۆیدشدا تیمارخانەی مەیدانیمان دامەزراند. پیاوەکانیش لە خانووەکانی دەوروبەردا جێی خۆیان گرت.
نەخشەکەمان ئەوەبوو، لە شەو پەلاماریان بدەین. بەلام ئەو ڕاوێژە پێویستییەی لە سەربازگەی دۆڤ کردمان کاتی لێخواردین. دواخران بۆ وەخرانێکی دیکە سەرکێش بوو. ئەستەمیش بوو، دەمودەست لەگەڵ گەیشتمان هەڵمەت بەرین. ئاخر هێشتا زۆر شت مابوو بکرێ. دەبوایە رادەی ئامادەباشی یەکەکان بەسەر بکرێنەوە. فەرماندەکانیان دوا پەیام و ڕێنماییان بۆ بدەن. سیستمی تەلەفۆنی مەیدانی ببەسترابا. لە هەمووشی گرنگتر، ڕەتڵی هاوەنەکان دابمەزرێندرابا.
ئێمە هاوەنی دوو سێ ئینجیمان هەبوو: کتومت دوو دانەش بوون. هاوەنەکان دەستکردەی بەریتانییەکان بوون. پێش دوو ساڵ لە ئۆپەراسیۆنەکانی "دەست بەسەرداگرتندا" لێمانخواستبوونەوە. قەتیش بەکارمان نەهێنابوون، چونکە گوللەهاوەنی تەواومان لەبەردەستدا نەبوون. هاوەنیش بە بێ گولە هەروەک پاندانی بی مەرەکەب وایە.
بۆ ماوەی دوو ساڵ بوو، ئەو دوو هاوەنە "فیلە سپییەکان"ی نێو کۆگاکانمان بوون. بەلام هەنووکە 25ی ئەپریلە و شتێکی دیکەیە. هەفتەیەک پێشتر قەتارێکی سەربازیمان پێراگرت، ئەو کات لە گوللەکانی بێئومێد بووین، بەلام کاتێ بارەکەمان داگرت، گوللە لەسەر گوللەمان کەوتە بەردەست، ئیدی هەنووکە لێی بێئومێد نین. ئێمە گوللەکانمان بە هاوەنەکان تاقیکردنەوە. لە ڕاستیشدا تەنها دوو هاوەن، بەلام بە هەزاران گوللە.

هـاوەن و گوللەکـان دەکرێ لە ئاسـمان هاوسـەر بـن، بەڵام خـۆ ئەوانـیش پێویستیان بە قەشەیەک هەیە، پێویستیان بەگڕدەرێک هەیە تا لێکیان مارەبکا. ئێمە سێ هاوەن گڕدەرمان لەبەرەی یافا هەبوون. سـەعات لە دوای سـەعات، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئـــاو بوەســـتابایە دەســـتەکانی ئەوان کـــۆڵنەدەرانە ڕانەدەوەسـتان. مـایەی سەرسـامی نەبـوو، هاگانـاش لەو بـارەیەوە داوای یارمەتیمان لێبکا.

لە ڕۆژی سـێهەمی شـەڕەکەدا، فەرمانـدەی هاگانـا داوای لێکـردین لـوولەی هاوەنەکانمـان بە ئاراسـتەی تەل عەریـش بسـوڕێنینەوە، بـۆ ئەوەی پاڵپشـتی یەکە تێکشـکاوەکەی هاگانـا بکەیـن، بتـوانێ بکشـێتەوە. دوای شـەڕی یافـاش، ئـیمە هاوەنەکـان و گڕدەرەکانیمـان ڕەوانەی لای هاگانـا کـردن، تـا گونـدە شومەکەی (سەلامە) پاک بکەنەوە، کە ئەو کات بەهۆی هاوەنەکانەوە بە بێ تەقەی زیـاتر و بەبـێ زیـانلێکەوتنێکی دیـکە کەوتە بەردەسـتی هێزەکـانی هاگاناوە.

لە پەنـجەرەی ئەو خـانووەی کردبوومـانە بارەگـای سـەرەکی، سـەیری پیاوەکانمـان دەکـرد کە دەچـوونە مەیـدانی جەنـگ. سـەرەتا ڕیزێـک بە فەرمانـدەیی یۆشـۆوا بە بێدەنگی ڕێی خۆی دەبڕی، ئینجا ڕیزێکی دیکە بە فەرمانـدەیی ئـالی (Ali) کە مامۆسـتا و ئەفسـەرێکی بەئەزمـوون بـوو، ئەوسـا پەلەکەی "کـابتزان" (گەدایەکە) ئەو کەسـەی لە بـواری دارایـیدا نـاوێکی پەسندراوی هەبوو، بەڵام لە ئازایەتی و خۆشویسـتنی پیاوەکانیدا بێ هاوتـا بـوو. یەکە لە دوای یەکە، ڕیـز لە دوای ڕیـز، ئەو شـەوە بێـدارە هـیچ شـــوێنەوارێکی بەجـــێ نەهێشـــت. ئەوان پیـــادەی گورجوگـــۆڵ و لەڕێڕۆیشتنەکەشیاندا سروودی جەنگییان دەگوت. کاتێکیش ئەو پۆلە جاحێڵە نـازدارانەم دەبینـی و گـوێم لە گۆرانیەکانیـان دەبـوو، بە بێـدەنگی نـوێژم بـۆ خوداوەنـد، هێـزداری مەیـدانی جەنـگ دەکـرد، بەڵکـو سـەریان بخـا و بە سەلامەتیش بیانگەڕێنێتەوە.

ئیدی شەڕی یافا هەڵگیرسا.

ئـاگری گـوللەی هاوەنەکـان یەکسـەر بـۆ پشـتەوەی دوژمـن، کـارێکی وای بەسـەرهێنان، ورەیان بەربدەن. لە مەیدانە تەنگەبەرەکەش بەخۆی، شەڕەکە بەزۆری شـەڕی یەک بە یەکـی (شمشـێربازی) ڕەشـاش بـوو. برینەکانمـان

کاری خۆیان بە باشی کرد. بەڵام خۆ هەر دەنگی ئەوان بە تەنیا سیمفۆنیای جەنگەکەی پێک نەدەهێنا. ئەدی چی بوو؟ دەستبەجێ گیدی شتەکەی بۆ دەرکەوت. ئاخر دوژمن دۆشکەی سپانداوس(Spandaus)ی بەکار دەهێنا، کە ئاگری گوللەکەی زۆر لە هی برێن گەورەتر بوو. دیاربوو دوژمن لە فیشەکی ئەو جۆرە چەکانەشی کەم نەبوو. تەقە لە دوای تەقە، شێلکە لە دوای شێلکە. خەریکبوو گولله وەک ڕێژنەی باران بەسەر کوڕەکان لە مەیداندا دابارن. بەمجۆرە دوژمن زاڵتر بوو. لە گەروە تەنگەکەی مانشیدا ئێمە لەوە تێگەیشتین، کە وەک هەموو سووپاکان لە جەنگی یەکەمی جیهان تێگەیشتن: لەوێدا چەند کەمە سەنگەرێکی مەحکەم لە ڕیزە خانوویکی وێرانە باشترە. ئەو خانووانەی لە بەرەی پێشەوە بوون، لە ماوەی پشێوی و ئاشووبدا ببوونە "خاکی بۆ هیچ کەس نەبوو" کە زۆربەیان کەلاوە و وێرانە بوون. لەنێو ئەو خانووە وێرانانە و لەسەر بەرزاییەکانیدا دوژمن خۆی بەو ژمارە زۆر ڕەشاشانەی بەردەست و فیشەکی لەبن نەهاتووی، خۆی باش دامەزراندبوو. هێڵی بەرگری یافا قوڵ و ئەستور بوو. دیاربوو عەرەبەکان لەژێر ڕاوێژێکی کارامەدا مەشق درابوون. سەنگەر و چەپەرەکانیان لێزانانە قایمکرابوون و چەپەری قوڵی بەرگری "ژێژک"ئاسایان لێدابوو.

لەپشت هێڵی یەکەمیشەوە، هێڵێک بەئەستورایی سێ یان پێنج قاتیان لێدابوو، لەوێدا نەوەک هەر هێزی عێراقی و جەنگاوەرە عەرەبەکان هەبوون. لەپشت ئەوان هێزەکانی بەریتانی بەتانک و چەکی قورسەوە وەستابوون، پێگەی خۆیان وا دامەزراندبوو، تا ڕێ لە پەلاماردەرەکان بگرن نەگەنە دەریا.

ئیدی زیانی یەکەممان پێکەوت. (تزادۆک) لەنێو قوربانییەکاندا بوو، لە سەنگەرێکی بەرزی چاودێریدا بوو، گوللەیەکی بەر سەر کەوت. زۆریان لێ برینداربوون. بەشی تیمارگەکەمان -کەلە مەیدانی جەنگدا قورسترین خزمەتگوزارییە- بە دەستی خوێناوی پێ ڕانەدەگەیشتن. موشێ ئاتلێت، ئەو پیاوە دیندارە بەکاکۆڵێکی درێژو تفەنگێک بەدەست، بە پرتاو بە فریای زامدارەکانەوە ڕۆیشت. موشێ "تۆپسی" کیژە یەمەنییەکە کە لە شەڕی فرۆکەخانەی لیداشدا بەشداربوو، لەگەڵدابوو. لە پاڵ ئەویشدا (نیتزها) هەبوو کە لە ماڵباتێکی شەهیدی هیبرۆب بوو. ئەوان و هاوڕێکانیان خۆیان گەیاندە

ڕیزەکانی پێشــەوەی تەقە و ئاگربـاران، تـا بە فریـای برینـدارەکان ڕابـگەن و بیانگوازنەوە هێڵەکانی دواوە لای تیمارگەکە.
بەڵام خـۆ پیاوەکانمـان نەدەشـکان. لە یەکەم بەیەکداداندا دوژمنیـان هەڵبـڕی. ئێمە چەنـد سـەنگەرێکی گرنگی دوژمنمـان گرتن، بەڵام هێشـتا نەمـانتوانیبوو هێڵـی دوژمـن بشـکێنین و سـەرکەوتنێکی بەرچـاو تۆمـار بکەیـن و شـەڕەکە ببەینەوە. ئێمە هێشتا ملی دوژمنمان لە مەیدان نەشکاندبوو. ستراتیژنووسـان، بە تێکڕایـی خەملێنەرانـی ئەو بـوارە دەبـێ سـەری خۆیـان بلەقێنن: هەڵـبەتە؛ ئەرێ بۆچی لە مەیدانی شەڕدا خۆت بـۆ مـلە تەنگەبەری بـوتڵەکە هەڵدەکوتی لە کاتێکدا ڕەچـاوی ئەوە دەکەی لە بـاکوور و باشـوورەوە تەقەت لێبکـرێ؟ هەر سووپایەک کە بەدبەختی بەرەو ملێ بوتڵەکەی بردبێ، هەولی داوە لێی بێتەدەر. هێشتاش تۆ، کە خۆت پارتیزانی، هەر بە خواستی خۆت بۆ ئەوێ دەڕۆی. ئاخر چۆن چاوەڕێی سەرکەوتن دەکەی؟
هۆ ستراتیژ داڕێژەرەکەم، جارێ پەلە مەکە!
ڕێز و پێزانین بۆ کتێبەکان، ئاخر خـۆ تۆ گیـان و ورەی سـەربازانی ئێرگـون نازانی.

**3**

لە کـۆنگرەیەکی ئەفســەراندا ئــێمە ڕەوشـــەکەمان وا کــورت کــردەوە کە سـەرکەوتوو نەبـووین. ئـێمە دەبـوایە لە پێشـەنگی دوژمـن و هێـزی ئـاگری چەکەکەیـان بگەیشـتباین. نـاوچەکەش بەرتەنـگ بـوو. ئەگەری هەر جـوڵەیەک سـنووردار‌بوو. تـڕۆمبێلە زرێکانمـان نەیانـدەتوانی دەوری دوژمـن بگـرن و لە پشتەوە پەلاماریان بدەن. دیاربوو هێرشی بەرەی پێشەوە بە ژمارەیەکی زۆر و هیچ کاریگەری لەسـەر شکانی سـەنگەرەکانی بەرامبەر نەبێ. ئێمە دەبـوایە سەنگی خۆمان لەوێ بکێشابایەوە و تەنها هێزە پێویستییەکەمان بەجێ هێڵابـا و لەو شوێنانەی لێیبوون خۆیان قایم کردبا، ئیدی بە دوای ڕێگە پەلامـارێکی دیکەدا گەڕابـاین. ڕێگاکەی دیکەش شتێکی نوێ نەبوو. ئەویش نموونەیەکی تـاکتیکی ئێرگونـانە بـوو؛ پێشـەوەت بشـکێنە و بە ناویـدا بـڕۆ و لاباڵەکـانیش بپارێزە. بەرەوپێشـچوون لەژێـر تیشکی تەقینەوەکـان، بە خێرایـی کشـانەوە؛ تەقانـدنەوەی پێگەکـانی دوژمـن؛ ئـابڵوقەدان و بەردەوامـیش پێشـڕەویکردن. تەقینەوەی دیکە –کشانەوە– و پێشڕەوی کردن.

شێوازەکە هەندێ خاو بوو. ئەوەش لە شەڕی پارتیزانی دژی هێزەکانی حکوومەت کاریگەر بوو. ئەو کات ئەوەی پێویست بوو بە شێوەیەکی کاتی زاڵ بوون بوو، تێکشاندنێکی بەرچاوی ئەو مەبەستەی لەبەرچاو گیرابوو. ئێمە لێرەدا نەوەک هەر دەبوایە هەڵمەت بەرین و ئامانجەکان تێکبشکێنین، بەڵکو دەستیشی بەسەردابگرین و ئەوەی گرتوشمانە بیپارێزین. تۆبڵێی تاکتیکەکانمان لەو هەلومەرجەدا سەرکەوتو بووان؟

لەوێدا چارەی دیکەمان بۆ نەمابۆوە. گیدی دیسان دوای پشوێیک هێزەکانی بۆ شەڕێکی نوێ بەگەڕخستەوە. لەو نێوەشدا گرتێبەردەرانی هاوەنەکان بەردەوام بوون لە هاوەنبارانکردنی خودی یافا. سوپاس بۆ خوا گوللە هاوەنە بەریتانیا، بێژمار لەبەردەستدا بوون. لە ماوەی نیو دانە ڕۆژدا ئێمە ئەوەندەمان بەسەر یافا دادایەوە، کە ئەوان لە ماوەی مانگەکانی پێشتر بەسەر تەلئەبیبیان دادابوو. هاوەنبارانەکە بەگەلاڵەکردنی ئێمە، دەبوایە هێڵەکانی پەیوەندی ڕیزەکانی دوژمن لەباریەک بترازێنێ و پەیوەندییان لەگەڵ بەرەی پێشەوە بپچڕێنێ. دیسان گیان و ورەمان بەرز بووەوە.

لە ئێوارەشدا شەڕەکە بەخەستی گەرم بووەوە. ئەندازیارەکانمان بەخۆیان قوتووی تەقینەوەکانیان بەرەو پێشەوە چوون. لە ناوجەرگەی مەیدانی شەڕەکەدا ژمارەیەک پێگە و سەنگەر هەبوون، بە قایمی ڕاگیرابوون، بەربەستی سەختیان بۆ بەرەوپێشوەچوونیان داناربوو. دەبوایە ئەندازیارە سەربازییەکان بیانتوانیبا بە ڕێگا تەنگەبەرەدا ڕۆیشتبان و ئەو سەنگەرانەیان بتەقاندبایەوە و ڕێگاکەیان فراوان بکردبایە.

بەلام دوژمن زۆر وشیار بوو. تانکەکانی بەریتانی و چەکی سپانداوسی عەرەبەکان هەموو ناوچەکەی خستبووە ژێر ڕکێفی ئاگری لوولەی چەکەکانیان. بەریتانییەکان چەکی دژەتانکیان فڕێدا، کە زۆرمان پێویست پێی بوو. ئیدی چیدیکە توخمی غافڵگیری لایەنگرمان نەبوو. ئێمە دەبوایە بۆ هەر بستە زەمینێک، باجی قورس بدەین.

لە هێڵی پێشەوە ئێمە دەبوایە دەست و بازووی خۆمان بەکاربێنین؛ شەڕی دەستەویەخە بکەین، لەبری تفەنگ، مرۆ؛ بوێری و خۆبەختکردن لەبری خاوبوونەوەی بۆمباران؛ هەموو شتێک بەخوێن لەسەرمان دەوەستا. بەگوێرەی داخوازی چەک خوێنی دەویست؛ خودی شەڕەکە خوێنی

دەخواست؛ یەکەمین سەنگەرشکاندن خوێنی دەخواست؛ تەنانەت هەر خاوبوونەوەیەکیش کە لەشکرەکان تەنها ئارەقەیان بۆ دەڕشت، کەچی بۆ ئێمە هەر داخوازی خوێن بوو. قوربانیگەی یەزدان داوای قوربانی بێژماری لێ دەکردین. هەنووکە ئێمە باشترین کوڕەکانمان وەک قوربانی جەژنی پەسڵان دەبەخشی، بۆ ئەوەی دڵنیابین کە ڕۆژەکانی ئایندەمان وەک هی سەردەمی شکۆی بەرێی لێبێتەوە.

بۆ دەنگی هورمەی هاوەن و تەقەی شێلکەی ڕەشاشەکان گرمەی مەزنی تەقینەوەکانیش سەربار بوو. تۆبڵێی ئەندازیارەکان مان کاری خۆیان کردبێ؟ تۆبڵێی سەنگەری سەرەکی دوژمن تێکشکابێ؟ ئیدی هەر تەقینەوە بەدوای تەقینەوەدا دەهات. تۆبڵێی ڕێگە شکێندرابێ؟ تۆبڵێی ڕێگا بۆ هێزی سەرەکی کرابێتەوە؟ هەر زوو ئاشکرابوو کە، تەنها یەک چەپەری دوژمن تێکشکاوە، لە کاتێکدا سەنگەرە سەرەکییە قایمەکەیان کە بەسەر هەموو ناوچەکەی دەڕوانی، هێشتا دەستی لێنەدرابوو. تەقینەوەکان هی ئەوە نەبوون، ئەو بینایە قایمە و مەحکەمە لەباریەک هەڵوەشێنی. ئەندازیارەکان ئەوەی لەتوانایاندا بوو بەو ئاگرە هەڵقرچاوە کردیان؛ لێ ئەوان بەو تەقینەوانەی بەردەستیان نەیانتوانی دیواری سەنگەرەکەی پێشیان بتەقیننەوە، ئەوان تەنها دیوارەکەیان لێستەوە نەوەک هەژاندەوە. دیسان ئێمە هەڵبڕاینەوە.

ڕاوێژێکی دیکەی ئەفسەران. ئێمە لەسەر تەختەی ژوورێکی قوتابخانەی هاوپەیمانان دانیشتبوین، کاری ڕۆژەکەمان پوختەدەکردەوە. خودی هاوەنبارانکردنی یافا کاریگەر بوو. هیچ گومانێک لەو بارەیەوە نەبوو. ئێمە سەدان گوولە هاوەنی دیکەمان ڕەوانەکرد، چاوەکانیش ڕاستەوخۆ ڕاپۆرتی خۆیان لەسەر نیشانەشکاندنەکان دا، پەیوەندی و هێڵی گواستنەوەی شمەکانی دوژمن تێکشکێندرا، پەیوەندییەکانیان پچڕا و پشێوی کەوتە نێو هێزەکانیان. هێرشی بەرەی پێشەوە هاوسەنگ نەبوو لەگەڵ سەنگەکەی، بەڵام لەسەریشی بەردەوام بووین. پرسی بێئومێدی لەگۆڕێدا نەبوو. شەڕەکە تازە سەرەتا بوو. بە ڕاستیش، یەکەمین هەڵمەتمان شکستی خوارد؛ لێ ئێمە دەبوو هەوڵی بۆ بدەینەوە، ئینجا سەرکەوتن. ئێمە دەبوایە هێزەکانمان ڕێکخستبایەوە. بۆ بەیانی هێرشمان دەستی پێدەکردەوە و دەبوایە سەنگەرەکانی دوژمن بگرین.

لە بنچینەدا ڕای گشتی لە کۆنگرەی دەستەی سووپاسالار لە بارەگای سەرەکیدا دەنگی دا. گیدی ڕوونی کردەوە، شتێکی پێویستە کە پێگە پێشڕەوییەکانمان "پەردەپۆش" بکەین، ئەویش قایمکردنی بە کیسەی لم هتد. هەر پێشڕەوییێکمان، هەر سەنگەرێک دەیگرین واقایمی بکەین، بپارێزدرێ. ئەمەش بەلایی کەمی کوڕەکان لە دژە ئاگری دوژمن دەپارێزێ، کارێکی واش دەکا لەڕێگەی ئەو سەنگەرە قایمکراوانەی پێشەوە گورزی گورچکبڕ لە دوژمن بدرێ.
کۆنگرەکە تەواو بوو. بڕیارەکە درا، دڵمان بە ئومێد و متمانەی نوێوە پڕبوو.
سەربازگەکە چووە خەو. سەربازە ماندووەکان هەندێکیان لەسەر جادە و حەوشەکان، هەندێکیشیان لە خانووە کەلاوەکان، پشوویان دا. زەمین یان ناوکەوی کەلاوەکان بووە دۆشەکیان. کوڕەکان هەرگیز بەناز نەبوون. چەند جاران لەسەر بەردە ڕەقوتەقەکانی زیندانەکان سەرخەویان شکاندووە چ جای لەوەی لەبەرەی جەنگ لەسەر زەوی و لەژێر ئاسماندا رابکشێن و تفەنگیشیان لە گۆلمەدا بێ؟ لە ڕاستیدا ئەوان دڵخۆش بوون. هەرچی دەربارەی مەیدانی جەنگیش بوو، بێ هیچ دوودڵی و منگەمنگێک بۆی دەچوون. ئەمڕۆ شکستیان خوارد، بەڵام خۆ بەیانی هەر دادێ و سەردەکەون. پاشەکشەکردن هی بیرلێکردنەوەش نەبوو.
پیاوەکانی ئیرگون و بە قوڵی و ئاسوودەیی خەوتن. تەنها ئەفسەرە پلەباڵاکان بوون چاویان لەسەر یەک نەنا. هەر خولەکێک لەو شەودا ڕادەبورد، نەخشەیەکی گرتنی ئەو ملە باریکەی مەیدانی جەنگ دایدەگرتن.

## 4

لەگەڵ شەبەقی بەیانیش، ڕۆژنامەکان دەرکەوتن.
کاتێک دەمانخوێندنەوە هەموو شتێک تاریک داهات. ڕۆژنامەیەکیان ڕاپۆرتی لەسەر پەلامارێکی "لەبارچووی" ئیرگون بوو بۆ سەر یافا؛ ڕۆژنامەی دووهەمیان باسی هۆشدارینامەیەکی "نمایشێکی هێرشبەرانە"ی ئیرگون بوو لە یافا؛ سێهەمیشیان باسی "هێرشێکی نەزۆکانە"ی ئیرگون بوو بۆ سەر یافا. نمایشکەرانە، لەبارچوو، نەزۆک زاراوەگەلێکی هاوواتان. هەر دەبێ یەکێک ئەنقەستانە "ڕێنوێنی" دابێتە ڕۆژنامە فەرمییەکان. فەرماندەیی هاگاناش

ڕاگەیاندنامەیەکی بەهەمان زاراوەی "لەبارچوو"، "نەزۆک" بڵاوکردەوە. بەڵام ئەوان لەوەشیان تێپەڕاندبوو. ئەوان زانیاریان دابووە ڕۆژنامەکان -بە ڕۆژنامەی بیانیشەوە- کەوا ئیرگون لە سەرلەبەری وڵات هێزی کێشاوەتەوە تا لە پەلاماری یافا بدا. ئەمەش هەر هیچ نەبێ جۆرە زانیاری بەخشینێک بوو بە دوژمن.

بەڵام خۆ هەر ئەوەندەش نەبوو. نوسەرانی لێدوانەکە دابەزیبوونە ئاستێکی نزم، کە پێشنیازی ئەوە بکەن گوایە ئیرگون کەمتر خەمی دەستبەسەرداگرتنی ڕێگەی بوستروس لە یافایەتی لەوەی ڕێگای ئەلەنبی[112] لە تەلئەبیب.

ئێمە لێدوانەکەی هاگانامان سەرلەنوێ خوێندەوە و هەڕەشەمان لەنێو چیرۆکەکەیدا بۆ دەرکەوت: "هاگانا بەخشندە نابێ" تاد. ئێمە بە وشیارییەوە وتارەکانی نێو ڕۆژنامەکانمان خوێندەوە، وشەکانی "لەبارچوو" و "نەزۆکیان" کە سەرهێڵ بوون، لێکدەدایەوە ڕەوایەتیشیان پێدەدان. ئیدی دڵمان لەوە دەتۆقا، کە بەنیازبوون بمانڕوخێنن. بەڵێ لەوێ، لە پشتەوە ڕۆژنامەنووسە جووەکان و "فەرماندەکان" چاوەڕێی شکستی گەنجە جووەکان بوون، ئەوانەی دوای ئەوەی ئەو شارە مەزنە دوای شەش مانگ لە تەقەلێکردن و نیشانە لێگرتنەوە، دوای بۆمباران و کوشتن، هاتن و بەرەنگاری دوژمنێکی بێویژدان و سەرسەخت بوونەتەوە. لێرە، لەبەرەی پێشەوەی جەنگ، خوێنی ڕۆڵەکانمان لەپێناوی گەلەکەمان، لەپێناوی ڕزگارکردنی ئایندە دەڕژێ؛ لێرە لەبەرەی پێشەوەی شەڕ، ئێمە بۆ ئەوە دەجەنگین گەلەکەمان (بە بوختانچییەکانیشەوە)، بتوانن بژین، بتوانن ئاسایشپارێزانە بە ڕۆژ بچنە سەرکاری خۆیان و شەوانەش ئاسوودە لێی پاڵکەون و برازین.

کەچی هێشتاش، لەوێ لە پشتەوە، هەندێ خەڵک دانیشتون، لە دوای یەکەمین ڕۆژی هێرشبردندا، فشەی ئەوە دەکەن گوایە "ئیرگون شکستی خواردووە."

---

[112] ڕێگای ئەلنبی ناوێکی دیکە بوو بۆ دەنگدەرانی تەلئەبیب. لە ماوەی ساڵەکانی بەر لە دامەزراندنی دەوڵەتی جوو، سەرکردەکانی پارتی کریکارانی سۆسیالیست (ماپای) ڕیکخراوە سیاسییەکەیان زیاتر پەرەپێدابوو، بە شێوەیەکی وا کاریگەرانە لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەتدا خۆیان گروپی زاڵی نێو حکوومەت بوون. ئەو پیاوانە لە ناسنامەی داخوازیەکانی نووسینگە سیاسییەکانیان، هەمیشە ئیرگونیان بە هەرەشەیەکی مەترسیداری دەتسرۆیشتنی سیاسیانەیان دادەنا. کەواتە لەوکاتەی ئیرگون خەونی دەبینی، بەدوای هێزەکانیدا دەڕۆیشت، "بنیاکانەش لەسەر قوربانیگەی خودادا قوربانی دەدا" ئەو پیاوانەی بەسەر ناژانسی جووەکان زاڵبوون، لەوێوە هاگانا و پاشان حکوومەتی ئیسرائیل، بە زەمانێکی گەلێک جیاواز دەدوان، زمانی ڕۆژانەی سیاسیی.

ئەرێ دەکرێ هەڵوێستێکی یاخیبوانەی زیاتر لەوە هەبێ؟ ئایا ئەمە نموونەیەکی دیکەی شەرمەزاری "ڕق لەخۆبوونەوە" نییە، لەو کاتەی ئێمە نزیکەی دوو هەزار ساڵە دەربەدەر بووین، بەرۆکمانی گرتووە؟
من قسەم بۆ کۆمەڵە گەنجێک کرد کە ئامادەی دەستپێکردنەوەی هەڵمەتەکەیان بوون. ئەوان لێدوانەکەی هاگانا و ڕاپۆرتی ڕۆژنامەکانیان خوێندبووەوە. بەڵام سەیر لەوەدابوو هیچ نیشانەیەکی تووڕەبوونیان پێوە دیارنەبوو. ئەوان، کە بەرەو هێڵی بەرەی پێشەوەی جەنگ دەڕۆیشتن، لەو کردەوەیاندا ئەگەری مەرگیش یەکجار زۆر بوو، کەچی ئەو بەدکارییەی بەرامبەریان وەک پەیامێکی نیازپاکی پێ قبووڵ بوو.
تاکە کاریگەریی ئەو لە کەدارکردنە، هێزو گوڕی ئیرادەیان بوو بۆ سەرکەوتن.
لە قووڵایی ناخمدا بەشدارییەکی خاکەڕایانەم بۆ مەزنێتی ئەو خێزانە جەنگاوەرانە کرد. ئەوان خۆبەخشانە بە ورە بەرزییەوە هەروەک تاکتیکەکەیان بەرەو ملە تەنگەبەرەکەی مەیدانی جەنگ هاتبوون. ڕوویان لە ئاگری دوژمن کردبوو؛ لە پشت خۆشیان ئەو ناوزڕاندنەی خەڵکی خۆمانە بوو. ئاخر لە کوێی مێژوودا لەشکرێک لە بن هەلومەرجێکی وادا پێی لەسەر بەرخودانددا چەقاندبێ؟
شایەد، لەو کات ئێمە لەسەر پەلامارێکی دوانەیی ڕاهاتبین: گوللە لە ئاراستەیەک و بەدڕەفتاریش لە ئاراستەکەی دیکەوە. لە ماوەی ساڵەکانی بەرخوداندا، ئێمە ناومان دەزڕاو و لە لایەن دەزگا "فەرمییەکانیشەوە" بەرهەڵستیمان دەکرا، کەچی هێشتاش لەسەر بەرخودان بەردەوام بووین.
لە بەرامبەر ئەو سووکایەتییە فەرمییە قێزەونەشدا، شتێکی ناسروشتی نەبوو، کە کوڕەکان لە فەرماندەکانیان بپرسن: "ئەرێ بۆ ئێوە ڕابەرایەتی ئێمەتان بۆ ئەم بارە کرد؟ ئاخر ئێمە چیمان کردووە؟ ئەرێ گیانمان بۆ کێ بەخت دەکەین؟" ئاخر ئەرێ ئەوان لەسەر هەق نەبوون گەر بیانگوتبایە: "ئەو گەلە شایستەی قوربانیدان نییە. دەڵێگەرێ با ئەو پاڵەوانانەی لە پشتەوە لێیان پاڵداوەتەوە بێنە ڕیزەکانی پێشەوە و سینگی خۆیان بەرامبەر گوللەی دوژمن ڕابگرن. باشە بۆچی ئێمە بەرامبەر گوللەی عەرەب و بەریتانییەکان وەستاوین، هەر بۆ ئەوەی ئاوا بەر نەفرەتی جووش بکەوین؟"

کەچی هێشتاش هیچ کەسێک شتێکی وای نەپرسی. ئەوان ڕۆژنامەکانی تەلئەبیبیان خوێندەوە و خەندە دایانگرت، یاخود ددانیان جیڕکردنەوە. کاردانەوەیان کۆدەنگیانە بوو؛ ئێمە سەرباری دوژمن و بەدنیازە جووەکانی بەرەی پشتەوە دەجەنگین و سەزیش دەکەوین.

لە سپێدەی کارەساتباری 28 ئەپڕیلدی 1948دا، دەستەیەکی بچووکی جەنگاوەرانی ئیرگون لەبەرەی یافا نمایشێکی وا ئازاو ورەبەرزی بێرادەیان نواند، سەرچڵی نییە کە بڵێم لە مێژووی ئازایەتی بنیادەمدا بێوێنەبوو.

لێ گەلۆ، بواری ئەوەم بدەن، بەپەلە ئەوە تۆمار بکەم، کە ئەوێ ڕۆژێ ئەو دەستە جەنگاوەرە بە بێدەنگی هاوئاوازی هەڵوێستی ئاپۆرای دانیشتوانی تەلئەبیب بوون. لە ماوەی ئەو ڕۆژە و ڕۆژەکانی بە دوایدا هاتن، ئەوە ڕوون و ئاشکرابوو، کە سەرزەنشتکارە قێزەونەکان، دنەدەری ڕۆژنامەکان و هاگانا، زۆر دوربوون لە هەستی ڕاستیی خەڵک هەروەک چۆن لە ڕاستییشەوە دوور بوون.

**5**

لەکاتێک لە تەلئەبیب ئەو ڕووداونانە لە پەرەسەندندا بوو، گیدی هێرشێکی لە نۆژەنەوە بۆ سەر یافا دەستپێکردەوە. هاوەنەکان بە سەدان گوللەیان فڕێدا، سێرەی نیشانەکانیش بەگوێرەی نەخشە و خاڵە چاودێرییەکان بوون. گردەرەکانی هاوەنەکان، فەرمانیان پێکرابوو، خەستەخانەکان، نوێژگاکان و ئەو تەلارانەی ئاڵای بێگانەیان لەسەردا هەڵدراوە لە گوللەباراکانیان ببوێرن. ڕۆژی پێشتر کونسولی فەڕەنسی سەردانی بارەگای سەرەکی کردبووین، داوای لێکردبووین بەڵکو ئەو دەزگا خێرخوازییەی فەڕەنسییەکان لە یافادا لە گوللەی چەکەکانیان بەدوور بگرن. هەڵبەتە ئێمەش داواکەیمان پەسەندکرد، بەڵام سووربووین لەسەر ئەوەی کە بینایەکە ئاڵای فەڕەنسی لەسەر هەڵبدرێ. دەزگاکانی دیکەش وەک فەڕەنسییەکانیان کرد و سەلامەت دەرچوون.

تا دەهاتیش هاوانبارانکردنەکە خەستر و کاراتر دەبوو. ئەوسا یەکەکانمان بەرەو پێشەوە تەکانیان دا و داباریبنە سەر پێگە هەرە هەستیارەکەی دوژمن. شەڕ و ململانێکە چەندان سەعاتی خایاند، تا نزیکەی تاریکداهاتن، ئەمەشیان زۆر لە هێرشی ڕۆژی یەکەم گەرمتر بوو. لەبن فشاری هەڵمەتە

هەڵچووەکانی ئێمەدا هێزەکانی دوژمن لەچەندان پێگەی بنەڕەتی خۆیاندا کشانەوە. لە کۆتاییشدا ئەوان پشێویان تێکەوت و پاشەکشەیان کرد.
بەڵام دیسان هێزە بەریتانیەکانیان بەهانایانەوە هاتن. هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە ئەفسەرێکی بەریتانی داوای لە بازنەیەکی دیاریکراوی جوولەکە کردبوو، کە کاریگەری بەسەر ئێمەوە هەبوو، بەڵکو پەلاماری هێزەکانی بەریتانی نەدەین کە لە ویستگەی شەمەندەفەر و ناوچەی ئارامدا جێگیر ببوون. ئەفسەرەکە بەڵێنی دابوو، گەر پەلاماریان نەدەین، ئەوانیش بێلایەنانە لە مۆڵگەکانی خۆیان دەمێننەوە. بەڵام بێشەرمانەوە هەر لە یەکەم ڕۆژی شەڕەوە بەڵێنەکەیان شکاند. "لاشەڕێی"(بێلایەنیی) جۆرێکی زۆر تایبەتمەند بوو: لوولەی تانکەکان وەرسوڕان، دەست لەسەر پەلاپیتکەی ڕەشاش و تۆپەکانیان نرا، ئیدی مەرگی بێلایەنانەیان لەنێو هێزی جووەکاندا چاند. لە ڕۆژی دووەمی شەڕەکەشدا، ئەو لاشەڕێیە سەیرەی ئەوان سەرسامانەتر بوو. کۆمسیاری بەریتانی لە دەڤەری لیدیا(کە یافاشی لەخۆ دەگرت) بە شارەوانی تەلئەبیبی ڕاگەیاند، سووپای بەریتانی بڕیاری داوە نەهێڵێ یافا بکەوێ، خۆگەر پێویست بکا هێزیش بەکاردێنێ، لە کاتێک گەر دامودەزگای فەرمی جوولەکە هێرشی هێزەکانی ئیرگون نەوەستێنێ، ئەوا لەشکری بەریتانی لە دژی ئێمە دەستبەکار دەبێ.
هەڵبەتە ڕاستیەکەش ئەوە بوو، کە هێزەکانی بەریتانی لە کردەوەکەدا دەستبەکار نەبوون، چونکە ئەوان هەرگیز دەستیان لێهەڵنەگرتبوو تا دەستبەکار ببنەوە. تاکە گۆڕانکاریش ئەوە بوو لە ڕۆژی دووهەمی شەڕەکەدا هێزە بەریتانییەکان چالاکییەکانی خۆیان لە دژی ئێمەدا زیاترکرد، مەبەستیشیان ئەوە بوو نەبادا بەرەی عەرەب تێکبشکێ؛ لە سەرێکی دیکەشەوە تا لەسەر نەخشەکەیان کە لە 15ی ئایارەوە دایاننابوو، بڕۆن و دەست بە یافاوە بگرن.
لە ئەنجامیشدا شەڕەکەی بۆ ئێمە سەختر بوو. بەڵام گوشاری وچاندانی سەربازەکانمان کە دەیانەویست دۆخەکە چارەسەر بکەن، لەو پابەندبوونەی دوژمن گەورەتر بوو، کە بەنیاز بوو پاشەکشەمان پێبکا. ئیدی زۆر لە پێگە و سەنگەرەکانی ئەوانمان وەرگرتەوە. بەڵام بەر لەوەی کوڕەکانمان جێپێی خۆیان لەوێ بکەنەوە، دژە هێرشێکی خەست و دژوارانەی ئەنگلۆ-عەرەب، بە

پاڵپشتی تۆپخانەی قورس دەستی پێکرد و ناچاریان کردین پاشەکشە بکەین. بەم شێوەیە پێگەکان گۆڕان و هەر دەگۆڕان. شەڕیش تا دەهات گەرمتر دەبوو.

دیسان زیانی گەورەمان لێکەوت. بەڵام هەر پیاوێکمان کە لە مەیداندا دەکەوت، یەکێکی دیکە جێگەی دەگرتەوە. ڕووداوە لاتەریکەکان دوکەڵی جەنگەکەیان دەبڕی و گیان و ورەیان ڕووناک دەکردەوە. (نیتزا) ئەو کچەی دارەبەستی زامدارەکانی مەیدانی جەنگی دەگواستەوە، بینی تەقەکەرەکەی پشت ڕەشاش برینەکە بەلادا کەوت و کوژرا، دەستبەجێ بازیدایە نێو سەنگەرەکەی و دەستی لەسەر پەلاپیتکەی برینەکە هەڵنەگرت تا یەکێکی دیکە جێگەی گرتەوە. دیسان هەڵمەتمان بردەوە و جێپێی دوژمنمان گرت، دیسان پێشڕەویمان کردەوە. بەڵام هێشتا تێکمان نەشکاندبوون.

ئینجا دیاردەیەکی سەیر کەوتە بەرچاومان: کۆرەو لە یافا ڕوویدا. لە هێکەوە عەرەبە مەدەنییەکان و "جەنگاوەرە" جۆربەجۆرە عەرەبەکان بە تۆقاوی خەریکی شاربەجێهێشتن بوون.

دوو هۆکار بۆ ئەو هەڵاتنە تۆقاوییە هەبوون. یەکیان ناوی هێرشکاران و ناوڕومەتی ئەو پڕوپاگەندەیە بوو کە دەربارەیان بڵاو کرابووەوە. پەیامنێری بەیروتی یونایتد پرێس لەو کاتەی یەکەمین کەشتی لە یافا لە پەنابەران پڕ کرا و بەگەیشتینیان هەواڵی ئەوەیان بڵاوکردەوە گوایە ئەو هێرشەی کراوەتە سەریان لە لایەن ئیرگونەوە بووە و خەڵکەکەیان فڕێداوەتە دۆخی ترسێکی تۆقێنەر. هۆکاری دووهەمیش قورسایی بۆردومانەکەمان بوو. من دەقاودەق نازانم ئاخۆ چەند گوللەمان ڕەوانەی یافا کرد. یگال یادین[114]، ئەفسەری ئۆپەراسیۆنەکانی هاگانا دواتر پێیگوتم، ئێمە دەستمان بە گوللە نازدارەکانمان نەگرتبوو. سەرجەم بارە گوللەکان زۆر قورس بوون. ئێمە هەر هەموومان دانا: ئاخر لێبژاردنەکە لەنێوان بندەستکردنی یافا و خاپووربوونی تەلئەبیب بوو؛ چارەسەریش ئەوە بوو بە گیانمان ڕێ لە ڕوونەدانی ئەوەی دووهەم بگرین.

بۆمبارانەکەمان جڵەوی هێزەکانی دوژمنی پەکخست، ناچاری کردن بە گومانەوە لەنێو خانووەکاندا بەدوای پەناگەیەکدا بگەڕێن. ئاخر بۆمباردمانەکە

[114] دواتر بووە سووپاسالاری لەشکری ئیسرائیل.

هێڵی پەیوندی تەلەفۆنەکەیان بڕی، تەزووی کارەبای پچڕاند و لوولەکێشی ئاوی سەرەکیشی لەسەر شکاندن. پشێوی و تۆقین کاری خۆی بەچاکی کرد. کەواتە ورەی دوژمن شکا، ئیدی هەڵاتن، کۆڕەوی گەورە بەسەر وشکانی و دەریاوە، بە ترمبێل و بەپێ دەستیپێکرد. هەڵاتنی کۆڕەوەکە سەرەتا بە هەزاران کەس دەستی پێکرد، لێ هەر خێرا ژمارەکەی خۆی لە دەیان هەزار عەرەبی تۆقاوی هەڵاتوو دا. سەرچاوە بەریتانییەکان باسی زیانی بێژماری عەرەبەکانی لە هەموو بەشەکانی شارەکەدا دەکرد. هێزە خۆبەخشەکانی عێراقیش زەبرێکی کوشندەی ڕاستەوخۆیان پێکەوت و زیاتر لەسەد کەسیان لێ کوژرا و بریندار بوو. ئاخر بوار بە دوژمن نەدرا و نەیدەتوانی پەناگەیەک بۆ خۆحەشاردان بدۆزێتەوە.
دەسەڵاتدارە سەربازییەکانی بەریتانی هەوڵیاندا عەرەبە هەڵاتووە تۆقیوەکان هێور بکەنەوە. پشێوی بە سەرلەبەری یافاوە دیار بوو. شەقامەکان جمەیان دەهات، خانووەکان کرابوونەوە، تاڵانوبڕۆ و کوشتن باڵکێش بوو. ئاخر هیچ دەسەڵاتێک نەبوو تا ڕێ لە چۆڵبوونی تەواوی شارەکە بگرێ.
کۆڕەوی هەڵاتنەکە نەوەک هەر لەنێو خەڵکی مەدەنی ڕوویدا بەڵکو کاری لە شەڕکەرانیش کرد، ئەوەش وەنەبێ هەر لەخودی شاری یافاوە بەرپا بووبێ بەڵکو دەوروبەرەکەشی گرتەوە. لە پاڵ هێرشەکەمان بۆ سەر یافا ناوچەی ئەبو کەبیر بەبێ تەقە کەوتە بەردەستی جوو. دواتر ئەفسەرێکی هاگانا پێی ڕاگەیاندم، کە سەنگەر و چەپەرەکانی ئەبو کەبیر ئەوەندە مەحکەم و بەهێز بوون، گەر شەڕی تێداکرابایە، بۆ ماوەیەکی یەکجار زۆر بەرگەی دەگرت.

## 6

لە کاتێکدا ڕۆژی دووهەمی جەنگ لە گەرمەدا بوو، لەگەڵ ئاڤراهامدا و لەسەر بانگهێشتنی ئاژانسی جووەکان لەگەڵ گالیلی و یگال یادین کۆبووینەوە بۆ ئەوەی "وردەکارییە ناسراوەکان" ڕوون بکەینەوە کە ڕێککەوتنەکەمان لەگەڵ هاگانا لەسەر بەند بوو. چەندیش کۆبوونەکەوە دواخرا، ئەوەندەش ڕۆژی کۆتاییهاتنی دەسەڵاتی بەریتانیی نزیک دەبووەوە، ئیدی شتێکی ئەوتۆ نەمابۆوە ڕوون بکرێتەوە. پێشنیازمان کرد ئەو دەستەواژەیەی ئاماژە بە دەستبەسەرداگرتنی چەکی بەریتانی دەکا، نابێ ڕاستەوخۆ بە نەسەلماندنی پێشوەختە هەڵبوەشێتەوە، بەڵکو دەبێ بە ڕێکەوتنێکی دووقۆڵی جێبەجێ

بکرێ. ئێمە دیسان نەخشەی ئۆپەراسیۆنەکانی دژ بە عەرەبەکانمان شەنوکەو کردەوە. ئەم کۆبوونەوەشیان یەکەمین دیدارم بوو لەگەڵ یگال یادین. چەند رۆژێکیش دواتر، دوای کەوتنی یافا، کۆبوونەوەیەکم لەنێوان ئەو و گیدی رێکخست. ئەو دوو لاوە ئەفسەرەی ئۆپەراسیۆنەکان بەیەکجار لەیەک نزیکبوونەوە. گیدی پەسنی یادینی دا: "ئەو گەنجە" گیدی وای لەسەر رۆیشت، "دەزانێ چی دەوێ و هەمووشی پڕ لەو وزەیە. ئەو بە یەکێکی خۆمانە دەچێ." یادینیش شانازیانە بە گیدی کارانگاز بوو. "ئەگەر گیدی نەخشەی ئۆپەراسیۆنێک دابرێژێ،" یادینیش وای گوت، "ئەوا بە موو لەو نەخشانەی من دایاندەرێژم کەمتر نییە. من بەتەواویەوە پێیوە پابەندم."

لە یەکەمین دیداردا باسوخواسی یافامان هێنایە گۆڕێ. پەلاماری یافا، کە بە تەوژمەوە لە لایەن "بارەگای فەرمییەوە" بەدرەفتاریمان لەگەڵدا کرا و ئێستاش بە ئۆپەراسیۆنەکە لە لایەن هاگاناوە "سەلمێندراوە".

لە رۆژی دووهەمەوە، کە شەڕەکە بەرەو کۆتایی دەڕۆیشت، گەڕامەوە بارەگای سەرەکی خۆمان. ئەوەش بێسەرکەوتن نەبوو. ئێمە چەند سەرهێڵێکی سەرەکیمان گرتبوو کە رێگای سەرکەوتنی یەکجارەکی بۆ خۆشکردین. ئەفسەر و پیاوەکانمان باش دوژمن و ناوچەکەیان ناسیبوو. ئەوەش فێرببوون کە خۆیان لە هەڵەی رۆژەکەی پێشتر بەدوور بگرن. بەڵام هێشتاش ئامانجەکە بەدی نەهاتبوو. هێشتا یافا "نەکرابۆوە". هێشتا نەگەیشتبووینە دەریا. هێشتا ملی شوشەکە بانەدرابوو.

من داوای کۆنگرەیەکی ئەفسەرانم کرد. باسی کۆبوونەوەی سەرانی هاگانم بۆ کردن کە چۆن ئەوانیش قایلبوون هێرشەکەمان بەردەوام بێ بەوەی لە ماوەی بیست و چوار سەعات دەرفەتێک بۆ شکانی سەنگەرەکانی دوژمن و چوونە نێو یافا پەیدا بێ.

"بەڵام،" لەوێدا پێمگوتن، "لەو باوەڕەدا نیم پێویست بێ سەری خۆمان لە سەنگەرە قایم و مەحکەمەکانی دوژمن بدەین، کە هەر چۆنێک بێ بە تانکی بەریتانی پارێزگاریان لێدەکرێ. ئێمە لە ماوەی ئەو دوو رۆژەدا ئەوەی پێمانکرا، کردمان. لەو دۆخەدا، مایەی شەرمەزاری نییە -تەنانەت بۆ ئیرگونیش- کە هێرشە راستەوخۆیەکە هەڵپەسێرین. ئێمە دەبێ بەرگری لەو

هێڵە بکەین و یەکەی بەهێزی لێ دابمەزرێنین. باقی هێزەکانیش بکێشینەوە دواوە."
ئیدی کەشوهەوای ژووری کۆبوونەوەکە گرژ بوو. گیدی بۆ ماوەیەکی درێژ بێدەنگ بوو. ئەفسەرەکانی دیکە ڕامانی خۆیان خستەڕوو، هەندێک لایەنگر و هەندێکیشیان دژی وتەکەی من بوون.
لە کۆتاییدا ئەو بڕیارمان دا زۆرینەی یەکەکانمان بکێشینەوە و هێزێکی سنووردار لە بنکەی قوتابخانەی هاوپەیمانان جێبێڵین. ئەوەش واتای هەڵپەساردنی هێرشی ڕاستەوخۆی دەگەیاند.
بۆ شەوەکەش شتێکی سەیر ڕوویدا. بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا، سەربازانی ئیرگون "هەڵگەڕانەوە". ئەوان ڕاشکاوانە فەرمانی کشانەوەیان ڕەتکردەوە. ئیدی "نێردەکان" گەیشتنە ژووری نەخشەکە. ئەوان بە شێوازی جۆراوجۆر بەڵام بەهەمان کاریگەر دوان: "ئێمە مەیدانی شەڕ جێناهێڵین. نابێ زەبون بین. ئێمە ڕاستەوڕاست تێکیان دەشکێنین."
گیدیش لە بەسەرکردنەوەی هێڵە دووروودرێژەکەی پێشەوە گەڕابۆوە. شەکەت ڕەنگ بڕکاو بوو. ئەو لە بەرامبەرم وەستا، بەهۆی لەسەر سنگ خشان، سەردەستە و ئەژنۆکانی پیسوپۆخڵ ببوون، بەڵام چاوە گەشەکانی بە بڕوایەکی نوێ دەبریسکانەوە.
"من چەند خاڵێکی لاوازی پێگەی دوژمنم دۆزیوەتەوە،" ئەو وای پێگوتم، "دڵنیام دەتوانین بەناویدا تێپەڕین."
لە بەرەی پێشەوە دەنگی هەندێ تەقەی لابەلای ڕەشاشی و گڕدانی هەندێ گوللە هاوەن هات، ئیدی، کشوماتییەکی پێش هەڵکردنی باهۆزی شەڕ. من لە ژوورە خەفەکەی نەخشەکە دانیشتبووم، بەقوڵی بیرم لەو دیاردە پەرجوئاسایەی نێوان فەرماندە و پیاوەکانی دەکردەوە.
مشتومڕەکە کۆتایی پێهات. "هەڵگەڕانەوە"ی پیاوەکان سەرکەوت. نابێ پاشەکشە بکرێ. هێرشەکە دەست پێدەکرێتەوە.

## 7

درەنگانێکی شەو بوو. دەبوایە پیاوەکان خەوتبان تا بۆ سبەینێ هەندێ وزەیان تێکەڕابایەوە، بەڵام خۆ ئەو شەوە سەربازگەکە هەر بێدار بوو. پەرجوئاسا هێزو گوڕ بەر ماسولکەی ئەوانەدا گەڕابۆوە کە بەتەواوی شپرزە

ببـوون. ئەفسـەرەکان سـەریان بەسـەر نەخشـەکاندا شـۆڕ کردبـووەوە، دوا وردەکاریەکانیـان لێکدەدایەوە. لێرەوە یۆشـۆوا[115] پێرەوە، لەوێش ئەلـی[116]، لێروکـانە کـابتزان[117] دەکۆشـێ بەنێوایانـدا بـڕوا. ئەدی ئەنـدازایارانی تەقینەوەکان؟ ئاخر ئەوان پێویستن، 'تۆپخانەیەکی زیندوو' دەکارێ خانوو لە دوای خانوو، سەنگەر لە دوای سەنگەر لە باریەک هەڵتەکێنێ. ئەمەش نەوەک هەر ئازایەتی دەوێ بەڵکو لێزانی تەکنیکی و دەستوبرد و کۆڵنەدانی دەوێ. لەوێدا ژمـارەیەکی زۆری خـۆبەخش هەبـوون. کـابتزان ڕێنمـایی ژمـارەیەکی لەوان دەکرد کە (راهامین)یان سـەرکردە بوو، راهـامین[118] ئەو لاوە یەمەنییە دووچـاوی رەشـی گەورە، کەشـخە وەک شـازادە بـوو، زوریـش ئـارام و لەسەرخۆ، کەسێکی خۆکرد و خاوەن خەندەیەک شایستەی ئەرکەکەی بوو.

ئاماداکارییەکـان بەوپەڕی جـۆش و خرۆشـەوە تـا سـەعاتەکانی بەرەبەیـان بەردەوامبـوون، بەڵام شـەڕەکە تـا دوای ئێـوارە هەڵنەگیرسـایەوە. هاوەنەکـان دیسان سەنگەرەکانی دوژمنی کوتایەوە، لە لوولە گەرمەکانییەوە سەدان گولە هاون هاوێژران. مەشخەڵی مەزنی شەڕە یەکلاکەرەوەکەی یافا گڕ درا.

لەو پێگە ـ سەنگەرانەی پێشتر گرتبوومان و بە کیسە خۆڵ قایمـمان کردبوو، یەکە شـەڕکەرەکانمان هەر لە پێشـڕەویدا بـوون. ڕێگاکەشـیان بەهـۆی تۆپخانەی زیندی و کاری ئەندازیارانی تەقینەوە بۆ داتاشـرابوو. لەنێوان دوو دیـواری ئاگرینـدا ـئـاگری چەکـی دوژمـن و ئـاگری پاڵپشـتی داپۆشـین- ئەندازیارانی تەقەمەنی بە زگەخشکی و لەسـەر چۆکان، ڕێگای خۆیـان بەرەو هێڵـی پێشـەوی دوژمـن دەکـردەوە تـا مـاددە تەقینەوەکـانی خۆیانیـان لـێ دابنێنەوە، ئیدی فتیلەی دینامیتەکەیان دانایەوە و گڕیـان تێبەردەداو، بەلەزیش دەکشـانەوە، ئینجـا دیسـان بـۆ پێشـەوە هەڵمەتیـان دەبـردەوە. ئیـدی هورمژن(گرمە)ی تەقینەوەکان گوێی کەڕ دەکرد. هەنگاو بە هەنگاو، بست بە بست، پێ بە پێ، پاڵ بە دوژمنەوە دەنرا لە پێگەی خـۆی پاشەکشـە بکـا و بگەڕێتەوە دوا.

---

[115] Joshua
[116] Ali
[117] Kabtzan
[118] Rahamin

ئەمجارەیان پاڵپشتی بەریتانییەکان و ئەو ئاگرەی لە لوولەی تانکەکانیانەوە دەهات، نەیتوانی بەر بە پێشرەویەکانمان بگرێ. بە ڕاستیش ئەوان هێڵەکانی پێشەوەی ئێمەیان بە ئاگری چڕوپڕی تانکەکانیان هەراسان کرد، لێ هێڵەکانمان بەرگەیان گرت. ئەو پێگە بەهێزەی ئەوان کە بۆ دوو ڕۆژ بەری زێیان لێگرتبووین، لە کۆتاییدا کەوتە بەردەستمان.
هەروەک ئەوەی بەنێو هێزێکی نادیاردا بڕوا، ڕاهامین و هاوڕێکانی لە خاڵێکەوە دەچوونە خاڵێکی دیکە، لە تەقینەوەیەک بۆ تەقینەوەیەکی دی، بەمجۆرە ڕێگای سەرکەوتنیان بۆ هاوڕێکانیان کردەوە.
لێ ڕێگاکردنەوە بە نێو ئۆردوی دوژمندا، هەر بەهۆی تەقینەوەکان نەبوو کە کرایەوە. چەکێکی نوێ لە مەیدانی شەڕەکەدا بەکارهێندرا: قوڵنگ. قوڵنگ و باریە ئەو جۆرە چەکە بوون کە کوڕەکان بۆ ڕێکردنەوە بەنێو کەلاوەی خانووەکاندا کردیانەوە.
گیدی گوێڕایەڵی ڕێسای ستراتیژێکی نوێ بوو: **هەڵکەندن و جێپێ قایمکردنی هەر خاڵ و پێگەیەک کە دەستی بەسەردا دەگیرێ.**
لەنێو "تونێل"ەکەدا، کە جێگەی زنجیرە پێکهاتەیەکی زیندووی لێکرابۆوە. یەکەمیان، بۆ هەڵمەتبردن، لە ئەندازیارانی تەقەمەنی و سەربازەکان پێکهاتبوو؛ دووهەمیان، بۆ برینداران و تیمی تیمارکردن و داودەرمان؛ سێهەمیان، بۆ ئازووقە، لە هەڵگرانی فیشەک، کەلوپەل و ئاو پێکهاتبوو، چوارەمیان، بۆ چەپەرلێدان و خۆقایمکردن لە هەڵگرانی کیسە خۆڵ کەرەسەی پێویست، ئیدی هەر زنجیرەبوو بە ئەوی دیکە گرێ دەدرا. هەندێ جاران کەلوپەلهەڵگرەکان دەچونە مەیدانی شەڕ، هەنێ جارانیش کارمەندانی فریاگوزاری دەبوونە ڕەشاش تەقێن و پێچەوانەکەشی هەر ڕاست بوو. گرنگ ئەوە بوو زنجیرەکان نەشکان. کردەی زیندوانەیان بەکردنەوە و دەستبەسەرداگرتنی سەنگەر لە دوای سەنگەر بوو، لە سەنگەرێک خۆیان قایم دەکرد، لەوە هەڵمەتیان بۆ یەکێکی دەبرد و دەیانگرت. لە خانوو بۆ خانوو دەیانگواستەوە لە گەڕەکیش بۆ گەڕەک، ئیدی بەم جۆرە، زنجیرەکان بەیەکەوە هەم درێژدەبوونەوە و هەم بەیەکیشەوە گرێدەدران. جومگەی پێگەیشتنیشیان بە ڕەشاش دەپارێزران. لە بەرەی یافاوە شتێکی تایبەت نەبوو بەناوی "زۆنی مردوو" کە بتوانی بە ئاسانی و بێ ترس سەرچڵی

بەناویدا تێبپەڕی. خۆ ئەگەر یەکێ لە جومگە پەیوەستیەکان بکەوتبایە، کەلێنەکە دەستبەجێ بە یەکێکی دیکە پڕ دەکرایەوە. ئیدی زنجیرەکان یەک لە دوای یەک لە بەرەی پێشەوە و پشتەوە لە ڕیزبەندییان بەردەوام بوون.

لە هیکەوەش بڕی پێویستی گونیە خۆڵەکانمان لێبڕان. ئیدی لەو شەوەدا هەندێ "تالانکەر"ی نائاسایی لە تەلئەبیب دەستبەکاربون. خۆیان گەیاندە کۆگا و دوکانەکان و شکاندنیان. بەڵام دەستیان نە بۆ زێڕ و زیو نە بۆپارە نەبرد. هیچ شتێکیان بەدەر لە گونیەی بەتاڵ دەست نەدایێ. ئاخر ئەو "تالانچییانە" سەیر بوون. ئەوان خودی پۆلیسی جوو بوون، ئەوان چەسپێنەری یاساو ڕێسا بوون. گونیە، گونیە، بە هەزاران کیس و تەلیس و گونیەیان بۆ بەرەی یافا خڕکردەوە!

بەمجۆرە زنجیرەی گڕی ئاگر و خوێن و ڕەنج و ماندوبوون و لە جەنگەکە و دەرهاوێشتەکانی هەربەخۆیان لێککشانەوە و بەرەو پێشەوە چوون. ئەم قۆناخەی شەڕیش لە ئێوارەی سێشەمەوە دەستپێک بوو بە بەیانی چوارشەممەش کۆتاییهات. چواردە سەعاتی ڕەبەق بێ نوچدان شەڕ گەرم بوو. پێشڕەویش لە نێوان دوو دیوارە ئاگرینەکەدا هەر لەتەکانی خۆیدا بوو. تونێلێکیش لەناو جەرگەی شەڕدا؛ تونێلێکی ڕەشی سووتاو. شێوازێکی نوێی شەڕی شەقام سەریهەڵدا. ئەوپەڕی کاریگەری مێشک، جەستە و گیان. سەنگەر و چەپەرە "ژیشک ئاساکان" دادی دوژمنیان نەدا. هەروەها سەنگەرەکان نە بەکەڵکی پێشڕەوییە ستراتیژییەکیان و نە هێزی ئاگری چڕوخەست و بێویژدانانەی لوولەی چەکەکەیان هات. دوژمن ناچار کرا باکوور و باشوور بەرەو دەریا پاشەکشە بکا. پێگەکانی تەقێندرانەوە و داروپەردوویان بە ئاسماندا ڕۆیشت. لەسەر وێرانە و کەلاوەکانیشدا دوکەڵ بەسەر ئەندازیارانی تەقاندنەوە سەربازەکاندا بەرزبووەوە. ئەوان تەنها یەک ئاراستەیان دەناسیەوە، ئەویش بەرەوپێشچوون بوو؛ تەنها تاکە مەبەستێکیان لەپێشچاو بوو: ئەویش دەریا بوو. تەنها یەک هاندەریشی دڵی ئەوانی ختوکە دەدا: سەرکەوتن. ئیدی بەمجۆرە بردیانەوە.

سەعات نۆی بەیانی بوو. لەگەڵ تێکشکانی ئەو هێڵە قایمەی پشتەوەی دوژمن، کوڕەکان دوای زەحمەتێکی زۆر، ئاخریەکەی گەیشتنە کەناری دەریا. گیدیش بەسەری بەرز و بڕاوە لەوێ لە پێشیاندا بوو. ئای کە دەریاش

نـــازدارانه ئـــارام و هێـــور بـــوو، ورده شـــەپۆلی کەنـــاراوەکەی لەپێـــی جەنگاوەرەکانی دەدا، ئەمەش بەخێرهێنان و 'پێشوازی لێکردن بوو.
کاتێک پیاوەکانمـان گەیشـتنە دەریـاکە، لەخۆشـیان شـێت و هـار بـوون. ئیدی کەوتنە هەڵـپەڕین و گـۆرانی گـوتن، دەسـت و باڵیـان بـۆیەک هەڵدەوەشـاند، فیشـەکیان بە هەوادا خەسـار دەکـرد. ئـاخر دوای ئەو هەمـوو مانـدەبوون و ژانـو ناسـۆرەی چەشـتبویان، شـادمانییەکەیان مـایەی لێبوردن بـوو. هەنووکە یافا بێ بەرگری، لە بەردەمیان کەوتە سەر چۆک.
تەنها گیدی بوو لە خۆشـیان هەڵنەدەپەڕی. ئەویش پێزانینی بۆ دەسـتکەوتە بەدیهاتووەکە هەبوو، توانیان ئەوێ بگرن و بیبەنەوە. بەڵام وەک فەرمانـدەی جەنـگ، دەیزانـی هەرچەنـدە هێڵـی بەرگـری بەرامبەرەکەیـان تێکشـکاوە و دوژمنـیش بەزیـوە، لـێ شـەڕەکە کۆتـایی نەهـاتووە، لەوانەیە دژە هێرشـی دوژمن لە هەر ئانوساتێکدا بکرێتەوە سەریان.
بە دڵنیاییشـــەوە دوژمـــن دژە هێرشـــی کـــردەوە و بـــۆ مـــاوەی دوو ڕۆژی ڕەبەقیش بەردەوام بوو. هەنووکە هێزەکانی بەریتانی نەوەک هەر قەناعەتیان بەخۆیـــان هێنـــا کە بە هانـــای عەرەبەکـــانەوە بچـــن، بەڵکـــو ئەوان بـــوونە دەهۆڵکوتی خودی شەڕەکەش. تانک، ڕەشاشی قورس، هـاوەنی قوڕسی دوو ئینج و زیاتریش، تفەنگ و تەنانەت فڕۆکەکانیشیان خستنە کار، هەمووش بۆ ئەوەی بەرهەمی سەرکەوتنەکەمان لەمەیدانی جەنگ لێ بسەننەوە نەیەڵن یافا بگرین، هەروەک چۆن کۆمسیاری ناوچەی لیدیا هۆشداری دابووە جووەکان و بەڵێنیشـــی بە عەرەبەکـــان دابـــوو کە یافـــا دەبـــێ هەر لە دەسـت ئەوانـدا بمێنێتەوە.
دژە هێرشەکە خۆی لە خۆیدا 'پەلامارێکی بەرگریانەش' بوو. لە پێنجشـەممە، پێنجەمین ڕۆژی شەڕی یافا، هێزەکانی بەریتانی بە چەکی هەرە قورس پێگە و سـەنگەرەکانی ئێمەی کوتـا. زۆر لە پیاوەکانمـان کوژران و برینـدار بـوون. لەنێو ئەوانەی بەهـۆی بـۆمبی بەریتانییەکان کـوژرا و جەسـتەی هەلا بەهەلا بـوو، ئەفسـەری مـلازم یوشـوا، یەکێ لە فەرمانـدە هەرە باشـەکانمان بـوو. بـێجگە لەو، هەر بەهـۆی گـوللەی چەکەکـانی بەریتـانی مـلازم یـوری[119]، فەرمانـدەی خـۆجێی تەلئەبیـب کـوژرا. ئەو ئەفســەرە ئـازایە کە هەر بەرەو

---

[119] Uri

پێشـەوە تەکـانی دەدا، لە خـانووێکەوە بـۆ یەکێکـی دیـکە ، تـا ئەوەی خـۆی گەیانـدبووە زرێپۆشـێک، ئیـدی هەر لەوێ بە گـوللەی زرێپۆشـەکە سـارد کرایەوە.
دوای گـولله و بۆمبـای پەلامـاری هێزەکـانی بەریتـانی، دەسـەلاتدارەکانیان رایانگەیـان گـوایە نیـازی ئەوان پەلامـاردانی تەلئەبیـب نەبـووە، بەڵکـو "رێگریکردن بووە لە پێشڕەوییەکانی ئیرگون زڤای لیوی لە یافاوە." لەڕوی سـەربازییەوە لە سـپێدەی 27ی ئەپریلـدا، یافـای عەرەب کەوتە بندەسـتی ئیرگون زڤای لیومی. دەستبەجێ کەوتنی یافا لە لایەن تانک و ڕەشـاش و هـاوەنی "بەریتانییەکـانی یافـا" و هەڕەشـەکردنیان لەوەی تەلئەبیبیـش ویـران بـکەن، بەرپێگیـرا. بەڵام خـۆ دواوادەی هۆشـدارینامەی گرتنـی یافـا لە لایەن جووەکانەوە بەری پێ نەدەگیرا.
ئەوەش ڕاسـتی بـوو، هەر لەبەر ئەوە، هێزەکـانی بەریتـانی بەهێـزی چەک بەریان بە هێزەکانمان گرت لەوەی پێشڕەوی زیاتر بۆ نێو شـارە مردووەکە بگـرن. بەڵام خـۆ دەسـەلاتدارانی بەریتـانی لەوە زیاتریـان دەویسـت؛ ئەوان خوازیاربوون ناوچەی ماشیا بگەڕێتەوە بندەستی ئەوان. ئێمە بۆ مـاوەی دوو ڕۆژ لە پێگەی خۆمـان، لە هێڵە نوێکـان پێمـان داچەقانـد، دژە هێـرش لەسـەر دژەهێرشی دوژمنمان بەرپەرچ دەدایەوە. هێڵەکەی هەرگیز نەشکا.
لە کاتێکدا دژەهێرش هەر بەردەوامبوو، یەکەکانمان بەسـەر خودی مانشیدا[120] کشـان. وێسـتگەی پۆلیسـی ئەوێ بەبـێ تەقە کەوت. خـاڵە بەرگرییەکمـان لە ڕاسـتی مزگەوتـی حەسـەن بەگ[121] توشـهات، لـێ هەر زوو چـارەکرا. زیـان بەمـزگەوتەکەش نەگەیشـت. لەسـەر منارەکەیدا بەیداخمان هەڵدا. ئیـدی ئەو بەیانیەی چوارشەمە ئاڵاکەمان لە هەمـوو تەلئەبیبەوە دیـار بـوو. ئەوێ ڕۆژێ ژمـارەیەکی یەکجـار زۆری خەڵـک بە ئـاهەنگەوە سـەیری دیـمەنە سەرسوڕهێنەرەکەیان کرد. ئـاخر بـۆ مـاوەی شـەش مـانگ بـوو، ئەو تـاوەرە منـارەیە لە ڕێـی نیشـانەشـکێنەکانیەوە، لە شـەقامەکانی تەلئەبیـبەوە ڕێبـواری بەردەدایەوە، هەنووکەش لە کۆتاییدا، فریادڕەس هات.

---

[120] Manshieh
[121] Hassan Bek Mosque

لە ماوەی ئۆپەراسۆنی خاوێنکردنەوەکەدا ڕووداوێکی سامناک قەوما. پۆلە عەرەبێک دەستی خۆبەدەستەوەدانیان بەرز کردوە. کاتێکیش یەکەکەمانیان لێیان نزیکبوونەوە، یەکێ لە عەرەبەکان دەمانچەی لە فەرماندەکەمان ڕاکێشا و کوشتی. ئیدی و یەکجێ عەرەبەکە ساردکرایەوە. بەڵام پیاوەکانمان لە دەهریبوونـدا دەکـولان، کـارێکی ئاسـانیش نەبـوو جـڵەو بکـرێن و ڕێ لە تۆڵەکردنەوەیان بگیرێ.

8

لەکاتێک دیلگرتن هەبوو، ناوچە ئابڵوقەدراوەکە گەسک دەدرا و دژەپەلاماری بەریتانییەکـانیش پەرەی دەسـەند، لە ژووی نەخشـەکەدا داوای کـۆنگرەیەکی ڕۆژنەمەوانیمـان کـرد: دوای سـالانێک لە بەرخـودان و جەنـگ یەکەمـین کـۆنگرەی ڕۆژنامەنووسـی بـوو. ڕۆژنامەنووسـەکان، بە خـۆجێی و بینایەکانیشـەوە لە ڕۆژەکانی شـەڕەوە بێ هەدادان پرسیارکوتیان دەکردین: زانیارییـان دەربارەی شـەڕ دەویست. گوللە هاوەنێک بەر مەیدانەکە کەوت، هەر بیست سی گەزێک لە ژووری کۆ نەخشەکەوە دووربوو. ئەوێ دەێ دژە پەلامـار لە کڵپەی خۆیدا بـوو. هەندێک لە مێوانەکـان داوای ڕوونکـردنەوەی کورتیان لێکردین.

لە کـردنەوەی کۆبـوونەوەکەدا منـیش بەرگەی زانیـاری دژە پەلامـارەکەم نەدەگرت.

"بەڕێزان،" مـن وام پێگـوتن، "ئێمە بانگهێشـتمان کـردوون، تـا ئاکـامە نەزۆک، نمایشنامە و لەبارچووی هێرشی ئیرگون زڤای لیومی ببینن."

هەموویان بە واقوڕمانەوە سەیریان کرد.

تەلئەبیـب لەبـارێکی ڕاگواسـتنی شـادمانیدا بـوو. ئـاپۆرای قەبەقەبە دارژانە شـەقامەکان، دروشـمی دڵخۆشـانەی سـەرکەوتنیان دەکێشـا. هەسـتێکی بێسنوری ئاسودە بوون لە گوللەهاوەنی کوشندە –ترسێک بەسەر هەموو پیـاو، ژن و منداڵ- بـاڵکێش بـوو. ئاخر یافا چیدی نەیدەتوانی هێرش بکاتە سەر تەلئەبیب. بە هەزاران پەناخواز، کە لەسەر جادەوبەر لەژێر ئاسمانێکی ڕەقوتەقدا دەنوستن، دەیانتوانی بگەڕێنەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان.

بارەگای سەرەکی بەریتانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ڕایگەیاند کە هێرشی یافای ئیرگون زڤای لیومی لە دەرەوەی ناوچە تەرخانکراوەکەی جووەکانە، ئەمەش بەگوێرەی بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان، ڕەوشەکەی لە ڕەگوڕیشەوە گۆڕی و دەبێ هێزەکانی بەریتانیا لە ناوچەکەدا ڕێکبخرێنەوە. بی بی سیش ئەوەی بۆ خستەسەر، کە هێزە بەریتانییەکان بەپرتاو لە قوبرس و ماڵتاوە دابەزینە یافا بۆ ئەوەی نەبادا شارەکە بکەوێتە بندەستی جووەکان.

ئەم لێدوانە بۆ ترساندنی جووەکان و دڵدانەوەی عەرەبەکان داڕێژرابوو؛ بەڵام ئەوەشیان هەر بێ ئەنجام بوو.

ئێمەش وەڵامی هەڕەشەکانی دەسەڵاتدارە بەریتانییەکانمان بە ئاماژەی تایبەت بە خۆمان دایەوە: "**هێشتا ئیرگون بە هەزاران گولله هاوەنی دوو ئینچی هەیە و هێشتاش سەربازگەی بەریتانی لە ئێرتز ئیسرائیلدا ماون. ئێمە لە نیگەرانی کاریگەری بەریتانییەکان لە کشانەوەی هێزەکانیان بەبێ زیانی زیاتر تێگەیشتووین. دەی با بەریتانییەکان بیری لێبکەنەوە.**"

دامودەزگا کانی جوو مەیلیان لێ نەبوو بەلای ڕاوێژەکەی ئێمەدا بشکێنەوە. بەڵام ئێمە بە شێوازی دیکە لە خزمەتیاندا بووین. ئێمە لە سۆنگەی ماددە تەقینەوەکاندا، وێستگەی پۆلیسی مانشی، کە بەریتانییەکان بۆ خۆیان داوایان دەکرد، کردە گردۆڵکەیەکی وێرانە لە داروپەردو و خاشاک. بە تەقاندەوەی خانوو بەخانووی هەر دوو بەری جادەی سەرەکی، کارایانە ڕێگەی هاتووچۆمان بۆ تەلەبیب داخست. بەریتانیەکانیش ئەو کات، کە لە باری قورسی چاکردنەوە تێگەیشتن، بە "هێڵی نوێ" قایلبوون، هێڵەکە لە ڕێی سەربازانی ئیرگونەوە چاک کرا. هەڵبەتەکە، هێڵەکە، سەلامەت و لەبار، ڕادەستی هاگانامان کرد.

ئیدی چارەنووسی یافا سەرمۆر کرا. پاش چەند ڕۆژێکی کەم، "کۆمیتەی تەنگانە" کە نوێنەرایەتی دانیشتووانە جێماوەکەیان دەکرد، داوای مەرجیان کرد. لە ئایارێکی زوشدا –لە ئێوارەی دەستپێکی لەشکرکێشی پێنج دەوڵەتە عەرەبییەکەدا- کۆمیتەی تەنگانە خۆبەدەستەوەدانانامەی شارەکەیان واژۆ کرد. ئەویش گەیشتە دەستی فەرماندەی خۆجێی هاگانای تەلئەبیب. شارەکە لە لایەن هاگانا و یەکەکانی ئیرگون بەیەکەوە دەستی بەسەردا گیرا.

9

دەکرێ وا ببیندرێ کە دەستبەسەرداگرتنی یافا پەیوەندی بە ڕاپەڕینی جووەکان لە دژی دەسەڵاتی بەریتانیەکانەوە نەبێ. بەڵام لەگۆشەنیگای سیاسیی و دیرۆکیانەوە بێ بەشێکی ڕاستی شتەکەیە. ئاخر لە گۆترە و ڕێکەوت نەبوو کە بەریتانیەکان بەهەر نرخێک بووابا دەستیان لە یافا بەر نەدەبوو. ئەوەش بۆ مێخکێشان بوو لە دڵی تەلئەبیب هەر وەک نەخشەی بۆ کێشرابوو، هەرواش لەڕاژەی پلانی ماندات دابوو بۆ "دەرچوون و سەرلەنوێ هاتنەوە." مەبەست لە یافا دوای 15ی ئایار هەڕەشەکردن بوو لە تەلئەبیب، نەخاسمە دوای 15ی ئایار. یافا وای نەخشە بۆکێشرابوو کە تەلئەبیب پەکبخا و هێزەکانی جوولەکەش سەرکوت بکا. یافا داردەستێک - بەڵکو داردەستێکی سەرەکیش بوو- بۆ هەوڵی سەرکوتکردنی جوو، بۆ ئەوەی ناچار بکرێن داوای فریادرەسی و "سەرپەرشتیکردن" لە بەریتانیەکان بکەن. ئەم نەخشەیەش پوچەڵکرایەوە؛ ئێمە پێراگەیشتین لە کاتی خۆی، لە کۆتایی مانگی ئەپریلدا پوچەڵی بکەینەوە.

لە ماوەی سێ هەفتەی بەر لە شکرکێشی پێنج دەوڵەتە عەرەبییەکەدا، عەرەبەکانی ژێر دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی سەربازی بەریتانیا، بە هێزی زیاترەوە ترێنجێندرانە یافا، بە چەکی زیاتر و قورستر تا بۆمبارانی تەلئەبیب بکەن. ئەوەش مایەی دڵنیابوون نەبوو، ئاخۆ هێزەکانی بەریتانیا بەر لە 15ی ئایار یافایان بەجێدەهێشت. لە بەشەکانی دیکەی وڵاتەکەدا، هێزەکانیان تا ناوەڕاستی تەموزیش مانەوە.

بەڵام با وا دابنێین، کە حکوومەتی بەریتانی خاوەنی قسەی خۆی دەبوو، لە 15ی ئایاریشدا ئەوێی چۆڵ دەکرد. ئەو کات ئێمە نەوەک هەر دژی هێزێکی دوژمنی تۆکمە دەجەنگاین، بەڵکو هەلومەرجێکی تەواو جیاواز دەبوو. با لە دەستپێکی سپێدەی 15ی ئایار دەستپێبکەین کە میسرییەکان لە ئاسمانەوە تەلئەبیبیان بۆمبارانکرد و هاتووچۆشیان لەنێوشاردا پەکخست. لەو بارودۆخەشدا دەبوایە هێزەکانمان بجوڵێنین، هێزی پاڵپشت، کەرەستە و تەقەمەنی، ئازووقە و فیشەک بۆ زۆر لە بەرەکانی تەلئەبیب بنێرین کە کەمتر نەدەبوون لەوانەی دەورەی یافایان دابوو.

خۆ ئەمەش هەر هەموو ڕەوشەکە نەبوو. ئاخر غەززەش لە ڕێی دەریاوە زۆر لە یافا دوور نەبوو. هێزەکانی میسری لە غەززە دابەزیبوون، خۆ دەیانتوانی ئاسوودەیانەتر لە یافاش دابەزن. ئێمە لە 15ی ئایاردا نە هێزی دەریایی و نە ئاسمانیشمان نەبوو.
دیسان پەرجووی بیرجیاکان (لادەرەکان) گەلەکەمانیان ڕزگار کرد. هێرشەکەی یافامان لە سەعاتی یازدەدا نەوەک هەر بە تەنیا تەلئەبیبی لە بارودۆخێکی دڵنیایانەی وێرانکردن قوتارکرد، بەڵکو پەلامارە پێشوەختەکەی ئێمە کە یافای ملنەدەری هێنایە سەرچۆک بەر لەوەی پێڕا بگا وێرانمان بکا، هەموو بەرەکانی شەڕی جوولەکەی لە تێکشکان پاراست. داگیرکردنی یافا یەکێک بوو لە ڕووداوە چارەنووسسازەکانی جەنگی ڕزگاریخوازانەی عیبری.

## بەندی 30
## بەرەبەیان

٥٥٢-٥٤٥

لە 10 یان 11مینی ئایاری 1948دا، بەرپرسەکەی هاگانا پێی ڕاگەیاندم، کەوا لە کۆتاییدا زۆرینەی دامودەزگا فەرمییەکانی جوو بەسەر بەدگومانییە زۆرەکەیاندا زاڵبوون و لەسەر ئەوە کۆکبوون، هەر دوای کشانەوەی هێزی ماندات جاڕی حکوومەتێکی کاتی عیبری بدەن. منیش پێمگوتەوە، ئێمەش دان بەو حکوومەتە کاتییەدا دەنێین و بەبێ ڕەچاوکردنی پێگەکەش، پشتیوانی دەکەین. بەلام ئەوە هۆشدارییە دژوارەشم بۆ زیادکرد: "ئەگەر حکوومەتی جوو لە ڕۆژی هەینی، 14ی ئایاردا جاڕ بدرێ، ئەوا لە بەرەبەیانی ڕۆژی شەممەدا یەکەمین ڕەوە فڕۆکەی جەنگی دوژمن بەسەر تەلئەبیبدا دەدەن."

هزر و بیری ئێمە زیاتر تیشکۆی خستبووە سەر پەرەسەندەکانی جەنگی سەربەخۆیی، جەنگی مانەوەمان کە لە زۆر لە بەرەکانەوە لە باکوور، لە باشوور، لە وشکانی، لە ئاو و ئاسمانەوە خەریکبوو دەرگاکەی بخرێتە سەر گازەرای پشت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەستەم بوو لەو پەرجووەی کە لە بەرچاومدا ڕووی دەدا، ڕانەمێنی. ئەو ڕژێمەی خاوەنی سەد هەزار سەرە نیزە بوو، ڕووخا؛ لە شوێنە وێرانەکەشیدا خەریکبوو ڕژێمێکی نوێ بەرپا دەبوو؛ نەتەوەیەک دەبوژایەوە؛ نەتەوەیەکی زۆر دێرین، کە کەوتبووە نێوچاڵی وێرانەیی، لە نوژەنەوە لەدایک بووەوە.

هیچ گومانی تێدا نەبوو، کە بوژانەوەی سەربەخۆیی نەتەوەیی عیبریی لە وەچەکەماندا لە مێژووی ئادەمیزاددا بێ پێشینە بوو. نەتەوەیەک دوای ئازادی و شکستی هەڵسانەوەی لە وڵاتەکەی دەربەر کرابێ، نەتەوەیەک نزیکەی دوو هەزار ساڵ بەسەر گۆی زەویدا ئاوارە و دەربەر بووبێ، ئاخر وایلێهاتبوو، ئاوارەیی لەگەڵ خوێنیدا تێکەڵ ببوو؛ ئیدی هەنووکە، لە نەوەی حەفتا و یەکی تاراوگەدا، ئەو گەلە ئاوارەیە دەگەڕێتەوە سەر زێد و نیشتمانی خۆی. گەڕانە سەیروسەمەرەکە کۆتاییپێهات. زنجیرەی گەڕان و دەربەدەری داخرا و نەتەوەکە گەڕایەوە نیشتمان کە لێی لەدایک ببوو.

پەرجووی گەڕانەوە یاوەری پەرجووی بوژانەوەی بوو. لە ماوەی نەوەیەکدا، لەنێو گەلی جوودا پەرەسەندنەکان بەشێوەیەک بوون، کە هێزی پەیداکرد و دەستی دایە چەک، لە هەمبەر دەسەڵاتی بێگانە ڕاپەڕی، نیری بێگاری چەوساندنەوەی سەر ملی دوور فڕێدا. ئای ساڵەکانی تاراوگە چەند دوورودرێژ بوون، هەر نەدەبڕانەوە، پڕبوون لە سووکایەتی و تێکشکان. بە بەراوردیش، ئای کە ساڵەکانی بووژانەوە، بەگوڕکەوتن، دەستدانەچەک و هەڵسانەوە چەند کورت بوون. ئاخر مێژوو لەگەڵ تۆمارەکەی هاوتەرتیب نەبوو.

لە شەوی شەممە، ڕێکەوتی 15ی ئایار، من چوومە نێو وێستگەی نهێنی ڕادیۆی ئیرگون زڤای لیومی کە لە نێوجەرگەی تەلئەبیب، لە بەرامبەر پارکی مایەردا بوو. هەستم بە ترسولەرز نەدەکرد. ئاخر من لەنێو هاوڕێکانمدا بووم، لە "ماڵی خۆم" لە وێستگەی ڕادیۆدا کە دەنگی بەرخودان و ئازادی بوو، ساڵانێکیش بوو لە هەموو شارو لادێکانی وڵاتەکەماندا دەبیسترا. بەڵام شکۆی ئەو سەعاتە هەژاندمی:

"دوای ساڵانێکی دوورودرێژ لە جەنگی ژێرزەمینییدا،" (من وام بە گوێگرەکان گوت)، "ساڵانێک لە چەوساندنەوە و ژانوناسۆری فیزیکی و دەروونییدا، یاخیبووان بە شوکرانە بژێری سەرلێو، نزا و درووودی نێو دڵیان لە پێناو ئێوەدا دژی چەوسێنەر وەستانەوە؛ بەو پیرۆزی و فەڕەی لەدێر زەمانەوە کە باوباپیرانمان هەمیشە ڕۆژە پیرۆزەکانیان پێ بەڕێ کردووون. هەر بەو فەڕ و پیرۆزیەوەش بوو، ئەوان یەکەمین جار تامی میوەکانی وەرزیان کردووە. ئەمڕۆش هەر بە ڕاستی ڕۆژی جەژن و پشووە، ڕۆژێکی پیرۆزە، میوەیەکی نوێی دیار و بینراو لەبەرچاومانە. بەرخودانی عیبری لە 1944-1948 بەسەرکەوتوویی پیرۆز کرا، ئەوەش لە دوای یاخیبوونی (هاشومۆنیان)، یەکەمین یاخیبونێک بوو، سەربکەوێ. دەسەڵاتی چەوساندنەوە لە وڵاتەکەماندا تێکشکێندرا، لە ڕەگوڕیشەوە دەرهێندرا؛ لەباریەک هەڵوەشا و تەفروتونا کرا. دەوڵەتی ئیسرائیل لە هەناوی جەنگێکی خوێناویدا لەدایک بوو. ڕێگای پانوپۆڕی گەڕانەوەی ئاپۆرای خەڵک بۆ زایۆن لێدرا.

"بناغە-تەنها بناغە- بۆ سەربەخۆییێکی ڕاستەقینە لێدرا. قۆناخێکی جەنگی ئازادی، جەنگی گەڕانەوەی گەلی پیرۆزی ئسرائیل بۆ زێدەکەی، بۆ

ئــاوەدانکردنەوەی وڵاتــی پیــرۆزی ئیســڕائیلی پەیمانپێــدراوی خــودا بــۆ خاوەنەکانی کۆتایی هات. بەڵام هەر بەتها یەک قۆناغ...

"دەوڵەتـی ئیسـڕائیل بەرپـابوو. دەوڵەتەکەش "تەنهـا بەم ڕەنـگە"[١٢٢] هاتەکـایە: بەنێو خوێن، بەنێو ئاگر بە چەکی نێو گۆلمە، بە ژانوناسۆر و قوربانی. ئاخر نەدەکرا شـتێکی دیکە بێ. تەنـانەت، هەنـووکەش بەر لەوەی دەوڵەت بتـوانێ دامەزراوە نیشـتمانییە فەرمییەکـان دابمەزرێنـێ، ئەو ناچـاربوو بجەنگـێ یـان بەردەوام بـــێ لە ڕووبەڕووبـــوونەوی دوژمـــنە ئەهریمەنەکـــان و جەردە خوێنخۆرەکـــان، کـــاتی خـــۆی هۆشـــداریناميەیەک لە لایەن ســـەرۆکێکی فەیلەسـووفەوە، تۆمـاس ماسـاریک[١٢٣] درایە نەتەوەکەی، ئەمەش دوای سـێ سەد ساڵ لە کۆیلایەتی ئازاد بوون، ئەو لە بەردەم وێستگەی بەرچاوەکەی (پراگ)ەوە ڕووی دەمی لە هـاولاتییە شـادمانەکانی کرد: ***"سـەختە دەوڵەتێک دابمەزرێنی؛ بەڵام لەوەش سەختر درێژەپێدان و پاراستنیەتی."*** لە ڕاستیشدا، بۆ ئێمە سەخت بوو دەوڵەتمـان دابمەزرێنین. بەدەیـان لە نەوەکـان و ملیۆنـان لە ئاوارەکـان لە وڵاتێکـی کوشـتارگە بـۆ ئەوی دیـکە، بە ناچـاری ددربەدەری وڵاتــی غەریبــی کــران، دەســتبەجێ ســوتێندران و لە زینــدانی کوشــندەدا ئاخنــدران؛ ئــێمە دەبــوایە تــاڵاوی نــامرادی بچێــژین؛ ئــێمە پێویســـتمان بە ئاگـــادارکردنەوەیەکی -زۆر جـــاران بێهـــودەش دەبـــوو- پەیـــامبەران و پێشـبینیکەران هەبـوو؛ پێویسـتمان بە ئارەقە و ڕەنجی وەچەکانی پێشـەنگ و دامەزرێنەران هەبـوو؛ ئێمە دەبوایە ڕاپەڕیـاین تـا دوژمـن تێکبشـکێنین؛ ئێمە دەبوایە سێدارەمان هەبووایە، دەبوایە دەربەدەری ئەودیو زەریاکان ببووایـن، بەدیل گیرابـاین و خرابـاینە نێو قەفەزی چەپەک، هەمـوو ئەو شـتانە پێویسـت بــوون بــۆ ئەوەی بگەیشــتباینە ئەو قۆنــاغەی، شــەش ســەد هەزار جــوو لە نیشـتنماندا بمێننـەوە، کە دەسـەڵاتی ڕاسـتەوخۆی چەوسـاندەوە بەدەربنـێن و ســـەربەخۆیی عیبــری هــیچ هەر نەبــێ لەبەشــێکی وڵاتەکەدا جــاڕ بــدەن، کە سەرلەبەریشی هی خۆمانە.

---

[١٢٢] "تەنها بەم ڕەنگە" نەفسانەیەکی ژێر دروشمی ئیرگون زڤای لیومی بوو، بالسکی ڕاستڕەویان کە دەستی دایەوە چەک. ئەم داردەستەش دەگەڕێتەوە بۆ دامەزرێنەرەکەی، ڤلادیمیر ژابۆتنسکی، ئەو تا سەر ئێستقان لە لایەن جووە فەرمییەکانەوە دەبیزرا، ئەو گەلی جوولەکەی فێرکرد کە دەبێ بۆ سەربەستی نەتەوەییان بجەنگن، هەر "تەنها بەم جۆرە" ش دەگمەنە ئامانجەکیان. پێشبینییەکەشی بە دروستی هاتە دی.

[١٢٣] Thomas Masaryk(1850-1937) فەیلەسووف، کۆمەڵناس و سیاسەتوانی چیکۆسلۆڤاک، لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهان بووە دامەزرێنەر و یەکەمین سەرۆکی دەوڵەتی چیکۆسلۆڤاکیا. وەرگێڕ.

"بەڵێ، سەخت بوو دەوڵەتی خۆمان هەبێ. بەڵام هێشتاش لەوە سەختترە کە بیپارێزین. ئێمە بە دوژمنگەلێک دەورەدراوین، خوازیارن لەناومان بەرن. هەر هەمان دوژمنیش کە ڕاستەوخۆ لەسەر دەستی ئێمە بەزی، ناڕاستەوخۆ هەوڵدەدا لە ڕێی چەتە و نۆکەرەکانی لە باکوور و باشوور و ڕۆژهەڵات بینەقاقامان بگرێ. دەوڵەتی یەک ڕۆژەمان لەنێو ئاگر و چرەدووکەڵی شەڕدا ڕۆنا. هەر لەبەر ئەوەیە دینگەی یەکەمی دەوڵەتەکەمان دەبێ سەرکەوتوانە دابندرێ، سەرکەوتنێکی تەواو لەو شەڕەی باڵی بەسەر تەواوی وڵاتدا کێشاوە. بۆ ئەم سەرکەوتنەش، کە بەبێ ئەوە، ئێمە نە سەربەستیمان دەبێ نە ژیان، ئەوا پێویستمان بە چەکە؛ چەکێک لە هەموو جۆرێک، بۆ ئەوەی لەدوژمنی بدەینەوە، تاکو پەلاماردەران ڕاو بنێین، بۆ ئەوەی وڵات بە درێژی و پانییەکەی لە ڕووخان و خاپوورکردن بپارێزین.

"لێ گەلۆ، سەرباری ئەو چەکەش، هەر یەکێک لە ئێمە پێویستی بە چەکێکی دیکە هەیە، چەکی گیان و ورە؛ چەکێک وابکات بەرگە بگرین و پێ لەسەر زەمین دابکوتین؛ چەکێک پێی ڕووبەڕووی کوێرەوری و شکستە کاتییەکان ببینەوە؛ بەرگەگرییەکی شێلگیرانە تا ڕووبەڕووی هەموو گەف و هەڵخەڵەتاندنێک ببینەوە. ئەگەر لە ماوەی ڕۆژ و هەفتەکانی ئایندەدا زریی نەتەوە نەمرەکە ببوژێنینەوە، ئەوا دەتوانین چەکە پیرۆزکراوەکەش بەدەستبێنین تا دوژمنی پێ دوور بخەینەوە و ئازادی و ئاشتی بۆ نەتەوە و نیشتمانەکەمان بگەڕێنینەوە.

"بەڵام، تەنانەت دوای بە دیارکەوتنی سەرکەوتنەکانی ئەم هەڵمەتەش-هەر دەشبێ سەربکەوین- ئێمە هەر دەبێ توانایەکی مرۆیی لە ڕادەبەدەر لەپێناوی مانەوەی سەربەخۆییدا، لەپێناو ئازادی وڵاتەکەماندا خەرج بکەین. جارێ لە بەرایییەوە، پێویستە باسکی جەنگیی ئیسرائیل هەم بەهێز و هەم گەورە بکەین، چونکە بەبێ ئەمە نە ئازادی بە دەستدێ و نە نیشتمانەکەشمان دەمێنێ...

ئێمە پێویستمان بە سیاسەتێکی هۆشمەندانەی دەرەکی دەبێ بۆ ئەوەی وڵاتەکەمان ئازاد بکەین و دەوڵەتەکەشمان بەردەوام بێ. دەبێ جاڕنامەی سەربەخۆییمان بە ڕاست وەربگێڕین. ئێمە دەبێ ئەو دەرفەتە لە دەست نەدەین: هەرچەندە تەنانەت یەک بەریتانی یان هەر سەربازێکی بیانی پێ

لەسەر خاکی وڵاتەکەمان دابنێ، ئەوا سەروەری سەربەخۆییمان هیچی پێوە نامێنێ، تەنها نیازمەندی دەمێنێ، بۆ ئەوەی نیازمەندییەکەش بەتەواوی بەدی بێنین، دەبێ ئامادەی بەرخودان بین، جەنگەکەش نەوەک هەر لە گۆڕەپانی شەڕدا بێ، بەڵکو لەسەر گۆڕەپانی نێودەوڵەتیشدا. دووهەمین شتیش، ئێمە دەبێ بنەمای پەیوەندی ئاڵوگۆڕکردن لەگەڵ نەتەوەکانی جیهاندا دابمەزرێنین و بشیان پارێزین. نابێ بەخۆمان خۆمان ڕیسوا بکەین. نابێ چیدیکە نە خۆبەدەستەوەدان و نەخاتروخۆتر(جیاکاری) بمێنێ. دەبێ گۆڕینەوە (دانوستان) هەبێ. دوژمنایەتی بە دوژمنایەتی. کۆمەک بە کۆمەک. دۆستایەتی دەبێ هەر بە دۆستایەتی پاداشت بدرێتەوە....

"ئێمە دەبێ باوەش بۆ دۆستایەتی و لەیەک تێگەیشتن لەنێو خۆمان و هەموو نەتەوەیەکدا[١٢٤] بکەینەوە، ئەوسا چ گەورە بێ یان بچووک، بەهێز یان زەبوون، نزیک یان دوور، کە دان بە سەربەخۆییماندا بنێ و پشتی بوژانەودی نەتەوەییمان بگرێ، وەک ئێمە بەرژەوەندی و مەیلی لەسەر دادپەروەری نێودەوڵەتی و ئاشتی نێوان نەتەوەکاندا هەبێ.

"سیاسەتی ناوەخۆش لە هی دەرەوە کەمبایەختر نییە. یەکەمین کۆڵەگەی سیساتەکەش گەڕانەوەیە بۆ زایۆن. کەشتی! بۆ خاتری خوا لێگەڕێن با کەشتیگەلمان هەبێ! لێمەگەڕێن دیلی تەمبەڵی و تەوەزەلی بین. لێمەگەڕێن قسەی پوچ و بەتاڵ دەربارەی توانستی توانەوە و هەڵمژین بین. لێمەگەڕێن لەپێناوی ئەوەی پێیدەگوترێ فەرمان، کۆتوبەند بکرێین. خێرا! خێرا! ئاخر نەتەوەکەمان کاتی بەدەستەوە نەماوە! سەدان و هەزاران بێنن... ئێمە ئێستا لەنێو جەرگەی شەڕێکی مان و نەمان داین؛ سپێدەی ئێمە و ئەوان بەندە بە تیشکۆ خستنەسەر خێرایی هێنانەوەی خەڵکەکەمان لە تاراوگە.

"لەنێو نیشتمانەکەشماندا دەبێ دادپەروەری باڵادەست بێ، دەسەڵاتێک بێ بەسەر هەموو دەسەڵاتاندا بشکێ. لەوێشدا نابێ ستەمکاری هەبێ. وەزیر و گزیرەکان دەبێ خزمەتکاری نەتەوە بن و بەسەریاندا نەبنە کەڵەگا. لەوێدا نابێ چەوساندنەوە هەبێ. لە وڵاتەکەماندا نابێ هیچ پیاوێک -هاوڵاتی یان بێگانە- برسی بکرێ، نابێ هەنوانێکی لە ژوور سەر نەبێ و لە پەروەردە و

---

[١٢٤] لێرەدا مەبەست لە نەتەوە کە وەرگێڕانی وشەی nation، هەر واتا کۆمەڵایەتییەکەی ناگرێتەوە، بەڵکو مەبەست دەوڵەتە، دەوڵەتی نەتەوەیی. وەرگێڕ.

فێرکردنی سەرەتایش بێبەش بکرێ. دەی، ئێوە باری غوربەتی خۆتان لە میسر بیر بکەوێتەوە، ئەم ڕێسا باڵکێشە بە بەردەوامی دەبێ بەرچاوتان لە پەیوەندییەکان لەگەڵ غەریبە و لایەدەکانی نێو نیشتماندا ڕۆشن بکاتەوە. ڕستەڕێ بوون، هەر دەبێ بەدوای ڕاستی و ڕەوایەتیدا بگەڕێین. ڕاستەڕێبوون ئەو سەرەتایەیە، دەبێ لە پەیوەندیەکانی نێوخۆماندا ڕێبەرمان بێ...

ئێرگون زڤای لیومی لەنێو سنوورەکانی دەوڵەتی سەربەخۆی عیبریدا، واز لەباری ژێرزەمینیی دێنێ. ئێمە چووبووینە ژێر زەمین، ئێمە لە ژێرزەمیندا لەبن دەسەلاتی چەوسێنەردا ڕاپەڕین، بۆ ئەوەی شەقێک لە چەوسانەوە بدەین و بیڕوخێنین. بە ڕاستیش بەرهەڵەستیەکەمان لەسەر هەق بوو. هەنووکەش ئێمە دەسەلاتی عیبریانەمان لە بەشێکی نیشتمانەکەماندا هەیە. لەو بەشەدا کە ڕێسا و قانونی عیبری هەبێ-ئەمەش قانونی ڕەوایە لە ولات- ئیدی پێویست بە باری ژێرزەمینی عیبرییانە ناکا. لە نێو دەوڵەتی ئیسرائیلدا ئێمە دەبینە سەرباز و بنیاتنەر. ڕێز لە حکوومەتەکەی دەگرین، چونکە حکوومەت، حکوومەتی خۆمانە...

'دەوڵەتی ئیسرائیل سەریهەڵدا، لێ دەبێ لەبیرمان نەچێ، کە هێشتا ولاتەکەمان بەتەواوی ڕزگار نەکراوە. جەنگەکە بەردەوامە، ئێوەش دەزانن، کە وتەی جەنگاوەرانی ئێرگون وشەی بۆش و بەتاڵ نین: ئەوە هەر سوپای عیبرییە بڕیاردەری سنوورەکانی دەوڵەتەکەیەتی. بۆیە هەنووکە لە شەڕ دایە؛ لە ئایندەشدا هەروا دەبێ. خواوەند ولاتی وەک یەکەیەک پێبەخشیوین. هەوڵی پارچەپارچەکردنی نەوەک بە تەنیا هەر تاوانە بەڵکو کفر و لەباربردنیشە. هەر کەسێک دان بە مافی سروشتیمان لە سەرلەبەری ولاتەکدا نەنێ، ئەوا دان بە مافەکەمان لە هیچ پارچەیەکیشیدا نانێ. ئێمە نابێ هەرگیز ئەو مافە سروشتیە فەرامۆش بکەین. ئێمە دەبێ بەردەوام چاومان لەسەر سەربەخۆییێکی تەواوعەیار بێ.

'ئەی هاولاتیانی دەوڵەتی عیبری، سەربازانی ئیسرائیل، ئێمە لە نێوەڕاستی جەنگەکان داین. ڕۆژانی سەختمان لە پێشن... ئێمە ناتوانین بە قایلکردن، ئاشتی لە دوژنمان بکڕین. ئاخر تەنها یەک چەشنە 'ئاشتی' هەیە کە دەکرێ

بکرێدرێ، ئەویش ئاشتی گۆڕستانە، ئاشتی تریبلینکییە[125]. لەدڵ و دەروندا ئازابە و ئامادەی کوێرەوەری زیاتریش بە. ئاخر ئێمە هەر بەرگە دەگرین. پەروەردگاری مەزن دەستمان بەباڵەوە دەگرێ؛ ئەو پشتی لاوە عیبریە ئازاکان دەگرێ، پشتی ئازایەتی دایکە عیبرییەکان ئەوانەی وەک (هانا)[126] ڕۆڵەکانی بەخشیوەتە قوربانیگەی خودا.

"ئێوەش ئەی برایان، خێزانی بەرخودان، ئەرێ لەبیرتانە چۆن دەستتانپێکرد؟ بەچی دەستتان پێکرد؟ ئێوە تەنهابوون و ڕاوەدووش دەنران، ڕەتدەکرانەوە، دەبێزران و بە لاسار لە قەڵەم دەدران. بەڵام ئێوە بە بڕوایەکی قووڵەوە جەنگان و نەبەزین؛ ئەشکەنجەدران بەڵام خۆتان بەدەستەوە نەدا؛ ئاخندرانە کونجی زیندان بەڵام نەکڕوزانەوە و دەستەمۆ نەکران؛ وڵاتبەدەر کران کەچی گیان و ورەتان تێکنەشکا؛ ئێوە بەزۆر بردرانە سەر پەتی سێدارە، بەڵام بە سروود و گۆرانیەوە ڕێگەتان دەبڕی. ئێوە لاپەڕەی نەمریتان لە مێژوودا تۆمارکرد...

"بەڵام لێگەڕێن با بۆ ماوەیەک بیر لە جەنگ بکەینەوە، هەر بە تەنیا ئاکامی جەنگەکەیە بڕیار لەسەر قەدەر و چارەنووسمان دەدا. ئێمە دەبێ بەڕێی خۆمان بۆ گۆڕەپانی جەنگ بڕۆین. ئەی سەبازانی خوداوەند، ئەی ئەوانەی لە گیان و ورەی پاڵەوانە دێرینەکەنان و بەزێنەرانی (کەنعان) تا یاخیبووانی (جودا)تان تێدایە. ئێمە بە یاوەری گیانی ئەوانەی نەتەوەکەمانیان بوژاندەوە، بە گیانی (زیڤ بینیامێن هێرتزل)، (ماکس نۆرداو)، (جوزێف ترومپێڵدۆر) و مامۆتکی نۆژەنکەرەوەی پاڵەوانێتی عیبری (زیڤ ژاۆتنسکی) دەڕۆینە پێشەوە. ئێمە بەیاوەری گیانی دایڤید رازیل، فەرماندەی هەرە مەزنی عیبری ئەو ڕۆژانەمان، گیانی دۆڤ گرەنەر، یەکێ لە سەبازانی عیبری هەنگاو دەنێن. ئێمە بە گیان و ورەی ئەو پاڵەوانانەی چوونە سەر پەتی سێدارە دەچینە جەنگ، ئەو کەسانەی لە مەرگیان بردەوە. هەروەها ئێمە بە یاوەری گیانی ملیۆنان لە شەهیدەکانمان، باب و باپیرانمان کە لەسەر بیروڕایان ئەشکەنجەدران و سوتێنران، بە یاوەری گیانی برا کوژراوەکانمان و منداڵە گیرۆدەکان، دەڕۆین. دەبێ لەم جەنگەدا دوژمن بشکێنین، ڕزگاریش بۆ

---

[125] Treblinki: ناوی ئەو ئۆردوگا زۆرملێیە کە نازییەکان لەمیانەی جەنگی دووهەمی جیهاندا بۆ خەڵکی جوو لە گوندی تریبلینکا لە باکووری ڕۆژهەڵاتی وارشۆ دروست کردبوو.

[126] Hanna

گەلەکەمان بەدەست بێنین، ئەوانەی لە تونی مەرگ و ڕاوەدوونان بێزار بوون، ئەوان تەنها تینوی ئازادین، تینوی ڕەوایەتی و دادپەروەرین...

* * *

لە شەودا چوومەدەر. شەقامەکانی تەلئەبیب چۆڵ و هۆڵ بوون. لە بەیانیشدا شارەکە لە هەواوە بۆمباران کرا.

ئەو کات هاوڕێکانمان پێیانگوتم، نزیکەی هەموو ماڵێکی جوو گوێیان لە دووانەکەم بوو کە لە ڕادیۆ پێشکەشم کردبوو، منیش شوکرانەبژێر بووم، بەڵکو بە وتەکانم خەڵکم هاندابێ.

تاریکایی بەسەر هەموو لایەک باڵکێش بوو. سەرتاپای ڕەش و تاریک. هیچ تروسکە چرایەکیش نەبوو. تاریکستانەکە بەردەوام دەبێ. هێشتا هەر خوێنە و دەڕژێندرێ. بەڵام خۆ لەودیوی ژانوناسۆر و تاریکستاندا، شەبەقی کازیوە بەڕێوەیە و دڕ بە تاریکی دەدا. ئێمە لە کۆیلایەتی بەرەو ئازادی هەنگاومان دەنا. سبەینێش ڕۆژ هەڵدێ.

ئیدی جارێکی دیکە منداڵە جووەکان دەکەونەوە پێکەنین..

## بەندی ۳۱
## سەری نەوازشمان دانەواند
## ۵۵۷ - ۵۵۳

ئەوە مێژووی یاخیبوونی جووەکان نییە دژی دەسەڵاتی ماندات لە ئێرتز ئیسرائیلدا. ئاخر یاخیبونەکە -نەوەک ڕاپەڕینە چەکدارییە ڕاستەوخۆکە، بەڵکو یاخیبوونی گیانی و سیاسیانە- لە ۱۹٤٤دا سەریهەڵدا. لە ڕامانی دیرۆکیدا یاخیبوونەکە لە ۱۹۲۰دا بەرپابوو، ئەو کاتەی ژابۆتنسکی یەکەمین گوللەی بەرگری لە ئۆرشەلیم، لە شارە دێرینەکەدا تەقاند. هەرچەندە ئامانجی دەستبەجێی تەقەکە، ئاژاوەچییێکی عەرەب بوو، لێ ڕاستەوخۆ بەر ڕژێم و پلانەکەی کەوت، ئیدی بڕیارێکی هۆڤیانە بەسەر ژابۆنسکی درا و شوێنکەوتوانیشی ڕێگاکەیان بەرنەدا. لە ماوەی چارەگە سەدەیەک، کە بەدوای ڕووداوەکەدا هات، دیاردەی بێژماری یاخیبوون لە ناوەوەی ئێرتز ئیسرائیل و دەرەوەیدا بە گۆرانی و کردار، بە بیر و خۆپیشاندان، بە گاسن و تفەنگ تا ئەو کاتەی یاخیبوونەکە بەوپەڕی گەرمییەوە لە هەموو لایەکەوە سەریهەڵدا، هەبوو. لە ماوەی نێوان ساڵەکانی ۱۹٤٤و۱۹٤۷دا، ڕەوشەکە بە ڕاپەڕینێکی چەکداری دژی دەسەڵاتی بەریتانی وەرگەڕا.

ئەمەش وەنەبێ دیرۆکی ئیرگون زڤای لیومی بێ. ڕێکخراوی ژێرزەمینیی بۆ ئازادی، کە پێی دەگوترا ئیرگون زڤای لیومی لە ئێرتز ئیسرائیلدا بەر لە یاخیبوونە چەکدارییەکە ساڵانێکی زۆر پێشتر لە خەباتدا بوو. دەکرێ بەڕایی ئیرگون زڤای لیومی بۆ لەشکر (قۆشەن، ئوردوی سووپا)ی جوو بگەڕێتەوە، کە ژابۆتنسکی و جۆزێف ترەمپلدۆر لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهانیدا دایان مەزراند. ئەو کانیاوەی بووە دەراوی ئیرگون، بیتار[۱۲۷] بوو.

لە 1938دا، کاتێ کۆمەڵە عەرەبێکی دیار، بەدنەدانی دەسەڵاتداران، هێرشێکی ڕێکخراویان کردە سەر جووەکان، ئیرگون زڤای لیومی لەژێر سەرکردایەتی باڵای ڤلادیمیر ژابۆتنسکی و فەرماندەیی ڕاستەوخۆی دایڤید رازیلدا،

---

[۱۲۷] Betar، بزووتنەوەی لاوانی ڕیڤیژیۆنستی زایۆنیزم بوو، کە ژابۆتنسکی لە 1923دا ، دایمەزراند. وەرگێڕ

کردەوەیەکـی گردەبـڕانەی نوانـد: ئەوان دژی میراتـی بۆمـاوەیی تـاراوگە یاخیبوون و سیاسەتی "دانبەخۆداگرتنیان" شکاند و کەوتنە باری هەڵمەتبردن. پـاڵەوانێتی و گیانفیـدایی خەسـڵەتی ئەو جەنگـاوەرە بەراییـانە بـوو، ئەوانەی ڕێگەی ساڵانی دواتریان بۆ یاخیبووان خۆشکرد.

مـن نە مێـژووی یـاخیبوونەکە و نەهـی ئیرگـونم نووسـیوەتەوە. هەروەهـا نە دیرۆکی ڕاستەوخۆی ڕاپەڕینی چەکداریشـم تۆمـار کردووە، تەنـانەت باسـی هەمـوو هۆکارەکـانی پاشـخانی یاخیبوونەکەشـم نەکـردووە، یـاخود هەمـوو ئەوانەی دەستیان تێدا هەبووە. زۆرن ئەو کەسانەی ناوم نەهێناون، هێشـتاش ئەوان نـاوگەلێکن دەبـێ لە یـادەوەری گەلەکەمانـدا تۆمـار بکـرێن. تەنـانەت ئەوانەی ناویشم هێناون –زۆریشـیان لەژێر پێشناوی ژێرزەمینییدان– مـن بە تەنیـا چەردەیەکـی شـتە ناوازەکـانم نووسـیوە، کە دەکـرێ زۆر شـتی دیـکە دەربـارەی خۆیـان و کردەوەکانیـان بنووسـرێ. ئـاخر خـۆ مـن نە مێـژووم نووسـیوەتەوە نە خۆشـم بەوە هەڵـداوەتەوە تەنـانەت وێنەیەکـی گشتیشـم کێشـابێ. مـن بە تەنیـا چەنـد بەنـدێکی کەمـی ڕووداوە هەرە گرنگەکـانی ئەو قۆناغەی یادەوەرییە کەسیەکانم هێناونەتەوە.

مێژووی سـەرلەبەری یـاخیبوونەکە، مێژووی ئیرگون و ڕاپەڕینی چەکداری دژی دەسەڵاتی ماندات، هێشتا دەبێ بنوسرێتەوە. ئەوەی ڕاسـتییە، هەر دەبێ نمایشـێکی ئـازادیخوازانەی گەلەکەمـان تۆمـار بکـرێ و بیـر بخـرێتەوە. هەر کەسـێک بە ڕێگـایەک لە ڕێگاکـان بـۆ بەهێزکردنـی ڕابـوونەوەی عیبریـانە تێکۆشـابێ و هاوکـاری خەبـاتی ڕزگـاریکردن بـووبێ، دەبێ جێپەنجەی دیـار بکرێ و یـاد بکرێتەوە. ئەوەی ئـێمە پێیـدەڵێن مێـژوو، ئەوە نـادادپەروەرییێکی بەرچاوانەیە. ئـاخر خـۆ مێژوو، نەخاسـمە هەر کاتبەنـدی جەنـگ و یـاخیبوون، تۆمـارکردنی ناوەکـانی ئەو چەنـد کەسـە کەمـانەی کە پێشـەنگ بـوون، نیـیە. ڕاسـتیەکە ئەوەیە، کـاری سـەرەکی لە لایەن "لێهاتووەکـان"، لە لایەن ڕیـزی پلەدارەکـان، لە لایەن سـەربازە ونەکـانەوە کـراوە. لـێمەگەڕێن خۆمـان لەگەڵ ئەو نـادایپەروەرییەی مێـژوو ئاشـت بکەیـنەوە. کاتبەنـدی خەبـاتی جـوو بـۆ ئـازادی دەبـێ سـەرلەبەری بنووسـرێتەوە. بـا لێنەگەڕێن ئەوانەی کارەکەیـان

لەسەرشان بوو، سەربازە ونەکان بەمەرەدی چارەنووسی کۆهێلت "پیاوە هۆشمەندە بەستەزمانەکە"[١٢٨] بچن.

من دڵنیام سەرجەم تۆماری یاخیبوون دەنووسرێتەوە. بۆ گەلەکەمان زۆر گرنگە وا بکرێ، وەنەبێ ئەم کارەش هەر لەپێناوی دادپەروەری و نموونە پێهێنانەوەی بێ، بەڵکو بۆ ئایندە زۆر بەبایەخە، بۆ پەروەردەی خەڵک، تا وەک پیاوانی ئازاد رەفتار بنوێنن. ئێمە بە نێو جیهانی زەبروزەنگدا وێڵ بووین، لە مەیدانی درندایەتیدا بووین، کاتێکیش لەو جیهانەدا نەتەوەیەکی مەزن هەست بە ئاسوودەیی سەربەخۆیی ئایندەکەی نەکا، تۆبڵێی نەتەوە بچووکەکان چەند پێویستی چاودێری رەوشی خۆیان بن؟

ئێمە نەتەوەیەکی بچووکین، کە بنەمای سەربەستی خۆی دارشت. دوژمنەکانیشمان زۆرن؛ دۆستەکانیشمان زۆر کەم. ئاخر کێ دەزانێ سبەینێ چیمان لێ دەقەومێ، کێ دەڵێ بەیانیش هەوڵی سەرکوتکردنەوەمان نادرێتەوە؟

مێژووی یاخیبوونەکە و راستی سەرکەوتنەکەی، دەبێ بۆ ئایندەیەکی نەزانراو رێبەرمان بێ. دەبێ فێرمان بکا هەرگیز هیوابڕاو نەبین، بەتایبەت لە هەلومەرجی کۆیلایەتیدا. بۆ نەتەوەیەک، کۆیلەکردن، بێئومێدی، بەزین، فەلاکەت، چوونەسەر خەرەندی دارمان، دەکرێ هێشتاش وا لە یاخیبووەکانی بکا لەهەمبەر قەدەرەکەی رابینەوە و دیسان ژیانێکی دیکەیان بێتەوەبەر. کەم دژی زۆر. زەبوون بەرامبەر بەهێز. راوەدونراو، پەراوێزخراو، پشتگوێخراو، دوورخراو، چی لەبن سەری ئەوانەدایە؟ بێ چەکی؟ ئەوانە گەر پێویست بکا لە دوژمنەوە داخوازن. نەبوونی هێز؟ ئەوان دەکارن هەڵسنەوە. نەبوونی ئامادەکاری؟ خودی بەرخودانەکە مەشق و فێرکردنە. بە تەنیا هەموو گیان (رۆحیانەت) دەبێ خۆی بۆ پێشەنگەکەی تەرخان بکا، دەشبێ ئامادەی گیان بەختکردنیش بێ. لەوانەیە هەر ئەمە تاکە مەرجەکە بێ. باقی شتەکانی دیکەش هەر بەخۆیان دێنە بەردەست. خۆ ئەگەر تۆ سندان (خۆشەویستی بۆ

---

[١٢٨] ئاماژەیە بە سورەتی تەوراتیانە نۆیەم بەشی چاردە و پازدە. (14- لەوێ شارێکی بچکۆلانە هەبوو، خەڵکێکی کەمی تێدا دەژیا. پاشایەک لە دژیان پەیدابوو. ئابڵوقەی دان و قەڵایەکی لە بەرامبەردا بۆ گەمارۆدانیان دروستکرد. 15- لەوێدا پیاوێکی هەژار بەڵام هۆشمەند دەژیا. پیاوەکە بە ئاوەزی خۆی شارەکەی رزگار کرد. بەڵام کەسیش ناوی ئەو پیاوە بەستەزمانەی نەهێنا.)

نیشتمان) و چەکوچ (سەرمەشقێک بۆ ئازادی)ت هەبێ، بێ سێ و دوو ئەو ئاسنە دەدۆزیەوە، کە چەکی خەباتەکەی لێ دابتاشی.

هەر ئەوەشە دابێ یاخیبوون. هەموو خەڵکیش ئەمەیان خوێندۆتەوە. لای گەلەکەشمان ئەم شتە پێویستییێکی پێشنورەییە. ئەگەر ئێمە فێربین و بەبیرمان بێ، ئەوا دەتوانین بەسەر دوژمندا زاڵ بین. ئەوان هەرگیز ناتوانن جارێکی دیکە بمانکەنەوە کۆیلە. هەرگیز وایان پێناکرێتەوە. تەنانەت گەر بەسەریشماندا زاڵ بن، ئەوا نیری بێگارییەکەیان فڕێ دەدەین. خۆ ئەگەر چەکیشمان نەبێ، پەیدای دەکەین. گەر ئێمە هێزیشمان نەبێ، دروستی دەکەین. ئەوان ناتوانن بمان شکێنن. دابێ یاخیبوون و گیانی ئازادی پشتی ئێمە و ڕۆڵەکانمان دەگرێ.

لەو بەندانەدا هەوڵدراوە پەردە لەسەر ئەو گیانە هەڵبدرێتەوە، شۆڕببنەوە نێو ناخی بڕوای توانستی پچڕاندنی کۆتوبەند، گەر نووسەر لەمەدا سەرکەوتوو بێ، هەقی پەسندانە.

لێ گەلۆ، نووسەر دەزانێ، کە ئەو شایستەی ئەو دەستکەوتە نییە. هەر بۆیە ئەرکی ئەو لەوەدایە، بە شێوەیەکی خاکییانە ئەوانە بەشایستە بزانێ کە بە ڕاستی دەستکەوتەکەیان هێناوەتە دی، هەموو ئەوانەی ژیانی خۆیان لەڕێی گەلەکەمان و بوژاندنەوەی شکۆی ڕۆژە دێرینەکانمان دانا.

لەگەڵ ئەوەشدا، هیوام وایە ڕێگەم پێبدرێ، لە کۆتایی ئەو بەندانەدا، دوا ڕێز و ستایشی تایبەتیانەی خۆم بۆ پاڵەوان و شەهیدەکانی ئیرگون زڤای لیونی بنوێنم.

ژیانی ئەوان بەرخودان بوو؛ مردنیان پاڵەوانانە بوو؛ قوربانیان پیرۆز؛ یادەوریشیان نەمر.

## کۆتایی

## وشەدان

**ئـ**

**ئەوقمان:** حەپەسان، سەرسوڕمان.

**ئافراندن:** خولّقاندن، دروستکردن.

**ئاوس:** زگپڕ

**ئۆل:** دیین، ئایین.

**بـ**

**بەرزاو و نیشتاو:** هەڵکشان و داکشان(المد والجزر)ی دەریا.

**بەکاوەخۆ:** لەسەرەخۆ، بە هێواشی.

بەڕەوانی: ناوبژیکردن

**بەڵگەوبەند:** ئەرگومێنت

**بەلاش:** بێ بەرامبەر، بە خۆڕایی.

**بە مەرەدچوون: بە هەمان دەردچوون، وەک ئەو لێهاتن.**

**بنەتەقە:** مین، لوغم.

**بنەچەکە:** بنجوبناوان، سەرچاوە، بنەڕەت.

**بناوان:** سەروچاوە.

**بڕەتێنن:** ببەزێنن، دوورخەنەوە.

**بزۆت:** ژیلەمۆ، پشکۆ.

**بیچم:** ڕووخسار، سیما.

**بارگەوبنە:** شوێن، ماڵ، بارەگا.

**بەیداخ:** ئاڵا.

**بکەونەخۆ:** خۆئامادەکردن.

**بولێل:** تاریک و ڕوون.
**بندین:** بنی بیر(حەوز).
**بیژمۆت:** بیژی، زۆل.

**پ**
**پەرچەکردار:** کاردانەوە.
**پاقژ:** خاوێن
**پانوپۆڕ:** بەرفراوان.
**پرسن، پرسنی:** کەسێک حەزی لە زانیاریزانینی بێ، حب الاستطلاع
**پۆلکتر:** خراپتر، بەدتر.
**پێشنۆره:** الافضلیة.
**پێوەربوون:** چوونە شوێنێک، نەخاسمە بۆ هێزی سەربازی(اکتساح).

**ت**
**تەفروتوناکردن:** لەناوبردن. قڕاکردن.
**تەوەزەل:** تەمبەڵ.
**تخوونکەوتن:** نزیککەوتن.
**توک:** نزالێکردن.
**تاوسەندن:** گڕسەندن، جۆشسەندن.
**ترێنجاندن:** ئاخنین، تێخزاندن.
**تریان:** سەبەتە.
**تەواوعەیار:** کامل، بێوێنە.
**تێپەستان:** تێئاخنین. ترنجاندن.

**ج**
**جاحێل:** گەنج، لاو.
**جانەوەر:** ئاژەڵ، دەعبا.

**چ**
**چۆک:** ئەژنۆ.

**چەنگ:** دەست.
**چۆڵەوار:** شوێنێک ئاوەدانی لێنەبێ، بیابان.

خ
**خۆمانە:** دژەواتای بێگانە.
**خڕبوونەوە:** کۆبوونەوە، گردبوونەوە.
**خۆراپسکاندن:** تەکاندان بۆخۆڕزگارکردن.
**خۆزایی:** سروشتی. خۆکردی.
**خاترمەند:** لەبەر خاتری یەکێک.
**خاپاندن:** لەخشتەبردن، هەڵخەڵەتاندن.
خڕکردنەوە: کۆکردنەوە، گردکردنەوە.
**خەنی:** شادمان، دڵشاد.
**خۆ لێنەبانکردن:** خۆ لێدزینەوە.
**خۆماک:** غەریزە.

د
**داتەکاندن:** داوەشاندن.
دەفنبوون: ونبوون، لەکۆڵبوونەوە.
**داڕسان:** تەحەدا.
**درشت:** گەورە، فرە.
**دینگە:** کۆڵەگە.
**دەغەڵ:** پیس و چەتوون.
**دەرەقەت:** دەروەست، دەڕۆست.
**دەعبا:** جانەوەر.
**دەمریبوون:** توڕەبوونێکی زۆر.

ڕ
**ڕازان:** خەوتن، نوستن.
**ڕشت:** سووربوون لەسەر شتێک.
**ڕیزپەڕ:** هەڵاوێردراو، شاز.
**ڕێرەوشت:** سلوک.

**ڕووتەن**: ئەبستراکت، مجرد.

ز

**زات نەکردن**: نەوێران.

**زێدەبار**: وێڕای شتێک.

**زیل**: ترومبێلێکی باربەری سەربازی.

**زیخەڵان**: کەناری دەریا(ڕوبار) کە پڕلە زیخ(چەولم) بێ.

س

**سەنگرانەوە**: هێوربوونەوە.

**ساتمەبردن**: سەرپەلۆچوون، بەلاداهاتن.

**سفتوسۆ**: بە ئازار

**سێودوو لێنەکردن**: بێ دوودڵی.

**سەراسیمە**: سەر لێتێکچوون.

**سەرچیخ**: بە هەڵە(شاشی)دا چوون.

**ساردبووەوە**: ساردکردنەوە، لێرەدا بەواتای کوشتن دێ.

**سێباری شەو**: سێدانگی، سێیەکی شەو.

**سم**: سم(پێی) ولاخ.

**سوسەکاریی**: جاسوسی، شۆفاری.

ش

**شەکەت**: زۆرماندوو، هەراسان.

**شەپرێو**: تاقەتلێبڕاو، شڕ، پەڕپووت.

**شتاقیان**: هیچ کامیان.

**شێلکە**: چەند دانەیەک بەدوای یەک بەتایبەتی لە تەقەکردندا.

ف

**فراژیبوون**: کامڵ بوون.

**فەلاکەت**: کوێرەوەری.

**فامکردن**: لێحاڵیبوون، تێگەیشتن.
**فەوتا**: نەما، لەناوچوو.
**فەرمانبەردار**: پابەند، مولتەزیم.

ق
**قەپەنگ**: هەورەبان، بەیتونە.
**قەپێلک**: توێکڵ، بەرگ.
**قەرەبرووت**: خۆڵەمێش.
**قەلاقوپکردن**: بێدەنگی لێکردن.
**قرێژ**: پیسی، چڵک.
**قنارە**: سێدارە.
**قوتاربوون**: دەربازبوون، ڕزگاربوون.

ک
**کردەنی**: عەمەلی.
**کەوتنەخۆ**: بەئاگاهاتنەوە و دەستوبردکردن.
**کەلیبوون**: لێلادان.
**کارانگاز**: کاریگەر.
**کڕووزانەوە**: لالانەوە، پاڕانەوە.
**کاوێژ**: جووینەوەی شتێک.
**کشتتر**: کاتیک پەتێک لە دوو سەردا توند ڕابکێشرێ.
**کوتەک**: ئەو کوتک، یان داردەستەی ڕێگای شەختەی پێدەشکێنێ.
**کسۆک**: سەگ.

گ
**گەپجاڕ**: گاڵتەجاڕ.
**گەف**: هەڕەشە.
**گردەبڕانە**: یەکلاکەرەوانە، قاطع، حاسم.
**گۆلمەز**: گۆبەند، کەتن.

**گۆڕەوشار**: شاردنەوە، خەفەکردن.

ل

**لەبلەبان**: زۆرزان، زیرەک.

**لە گرێژنە**: لە شیرازە.

**لە گوینە**: نزیکە، لەوانەیە.

**لگبن**: خشت، بلۆک.

**لە خۆبوونەوە**: لێبووەوە، کۆتایی هاتن.

**لە هیکەوە**: لەپرێکەوە.

**لە پەلوپۆکەوتن**: پەککەوتن، دۆش دامان.

**لایەق**: شایستە.

**لاوەکی**: لابەلا، کەمبایەخ.

**لاشەڕ**: دوورەپەرێز لە شەڕ.

**لێقەومان**: کارەسات، تەنگانە.

**لێداکوتان**: خۆهێشتنەوە لە شوێنێک.

م

**مەعلان**: زیرەک.

**ماخۆ**: خاوەن.

**مالم**: قەشەی جوو.

**مایەپووچ**: نابووت.

**مەتەرێز**: سەنگەر.

**مل بە مل**: شان بە شان.

**مراز**: نیەت، مەبەست.

**مەترەق**: دارێکی ئەستور بۆ لێدان و دارکاریکردن.

**ماممۆتک**: عەڕاب.

**مەرەخەس**: مۆڵەت، ڕێگەدراو.

**ماک**: بنەڕەت، بنچینە.

**موفەڕک:** تفەڕک، موبارەک، پیرۆز.
**مێگەل:** ران.
**مێمڵ:** ناحەز، دوژمن، نەیار.

**ن**
ناجسن: نارەسەن.
**ناوکەو:** ئەرزیەی خانوو.
**ناندین:** مەتبەخ.
**نەسل:** نەوە، وەچە.

**هـ**
**هەلەکەسەما:** زۆر کەیفخۆش.
**هەلابەهەلا:** پارچە بە پارچە.
**هەڵنگوتن:** تێئالآن لە شتێک و کەوتن.
**هەترەشی چوو:** زەندەقی چوو، ترسا.
**هەداران:** ئۆقرە.
**هەڕەت:** هەرەتیەتی، وەختیەتی، سەردەمیەتی.
**هورمژن:** گرمژن، دەنگی بۆمبا.
**هاتیوەبوو:** دڵگەرم بوو. بە مشووربوو.
**هاموشۆکردن:** هاتووچۆکردن، پەیوەندی، ئاشنایەتی.
**هەمەزان:** هەموو شت زان، لێزان.
**هەر بینا:** هەر زوو، زۆری دیکەی پێناچێ.
**هەنگامە:** هەراو هوریا.
**هەنوان:** شوێنێک کە بنمیچی هەبێ، نیشتاک.
**هۆڤییانە:** درەندانە، ئاژەڵاییانە.
**هێدمە:** شۆک.

**و**
**وەخران:** دواکەوتن.
**وچان:** پشوو.

ی

**یدیشی**: زمانی تایبەتی جووەکانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات، تێکەڵ لە عیبری و زمانەکانی ئەوروپای ڕۆژهەڵات.

## چەند سەردێڕێک لە ژیاننامەی وەرگێڕ

- لە ١٩٦٨ لە گوندی گرتک لە دۆڵی ڕوستێی دەڤەری باڵەکایەتی لە دایکبووە.
- لە ١٩٨٨دا بە کالۆریۆسی لە قانون لە زانکۆی بەغدا وەرگرتووە.
- لە ١٩٩٧ەوە تا ٢٠١٢ ئاوارەی ئەوروپا (هۆڵەندا و بەریتانیا) بووە.
- لەپاڵ زمانی زگماکدا؛ زمانەکانی عارەبی، هۆڵەندی و ئینگلیزی دەزانێ.
- لە ١٩٨٦ەوە هەوڵی نوسینی داوە. تا ئێستا دە کتێبی لە زمانەکانی هۆڵەندی و ئینگلیزییەوە وەرگێڕاون. دەیان وتار و لێکۆڵینەوەی قانونی- سیاسیشی بڵاوکردونەتەوە.

